# گوڵاوی سەرمۆر

## ژیننامەی پێغەمبەری مەزن




نووسینی : صفی الرحمن المبارکفوری

وەرگێڕانی : بکر حمە

مبارک فوری، صفی الرحمن، ۱۹۴۳-
Mubarak Puri, Safial - Rahman
گولاوی سەرمور / نووسینی صفی الرحمن المبارکفوری؛ وەرگیراتی بکرحمە صدیق عارف.ـ تهران: احسان، ۱۳۸۲.
۶۱۳ ص.
ISBN 964-356-150-X
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
عنوان اصلی:الرحیق المختوم.
کتابنامە به صورت زیرنویس.
۱. محمد (ص)، پیامبر اسلام، ۵۳ قبل از هجرت - ۱۱ق.-- سرگذشتنامه. ۲. اسلام -- تاریخ -- از آغاز تا ۴۱ ق. الف. عارف، بکر محمد صدیق، مترجم، ب. عنوان. ج. عنوان: سیره رسول الله (الرحیق المختوم).
BP ۲۲/۹/م۲ر۳.۴۷ ۲۹۷/۹۳
۱۳۸۲
کتابخانه ملی ایران ۸۲-۴۰۰۴۵م

نشر احسان
تاران ـ ناصر خسرو ـ تەلەفوون: ۳۹۰۲۷۵۰
ناوی کتێب : گوڵاوی‌سەرمۆر (ژیننامەی پێغەمبەری‌مەزن)
نووسینی : صفی الرحمن المبارکفوری
وەرگێرانی : بکرحمە صدیق عارف
بڵاوکار : نەشری ئێحسان
نۆرەی چاپی یەکەم : ۱۳۸۲ هـ ش ١٤٢٤ هـ ق ۲۰۰۳ م
تیراژ : ۳۰۰۰ دانە
ژمارەی نێونەتەوایەتی X - ۹٦٤-۳٥٦-۱٥۰ 964-356-150-X
قیمەت: ۳٥۰۰ تمەن

**وتەی بەڕێز:**

## شێخ محمد علی حەرەکان

## ئەمینداری گشتی ڕابیطەی جیهانی ئیسلامی

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان ، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەمین ، دانەری تاریکایی و ڕۆشنایی‌یەکان ، خوای گەورە سلاوات بدات لەسەر سەروەرمان محمد ﷺ دوایینی هەموو پێغەمبەران ، بەڕاستی مرۆڤگەلی مژدەداو ئاگادارکردەوە ، بەڵێنیداو هەڕەشەکانی گەیاند ، بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە مرۆڤایەتی لە سەرلێشێواوی ڕزگارکرد ، هیدایەتیدان بۆ ڕێگای ڕاست، ڕێگای ئەو پەروەردگارەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندایە موڵکی ئەوە ، بێگومان هەموو کارو کردەوەیەك بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ، پاشان:

کەخوای گەورە تکاو پلەبەرزەکەی بەخشی بەموحەممەد ﷺ و ڕێنومایی موسڵمانانی کرد بۆ خۆشەویستی ئەوزاتەو شوێنکەوتنی کرد بەبەشێك لە خۆشەویستی خۆی ، وەکو فەرمووپەتی: ﴿ قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴾ آل عمران/٣١.

واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خوای گەورەتان خۆش دەوێت ئەوا شوێن من بکەون ، لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت . ئەمە یەکێك بوو لەو هۆیانەی دڵەکانی تامەزرۆی ئەو خۆشەویستی‌یە دەکرد ، دەستی دەگرت بەو هۆیانەوە کەئەو پەیوەندیە بەهێزتر دەکات . هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە موسڵمانان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ دەرخستنی سیما جوانەکانی و بلاوکردنەوەی سیرەتی بۆنخۆشی ، ئەو سیرەتەی کە بریتی‌یە لەوتەو کردەوەو ڕەوشتە بەرزەکانی ، هەروەکو عائشەی هاوسەری ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕەوشتی قورئان بوو، قورئانیش پەڕاوی خوای گەورەو وشە تەواوەکانیەتی ، کێ بتوانێت وەهابێت بێگومان دەبێتە کاملترین و خۆشەویسترین کەس لای بەندەکانی خوا.

موسـڵمانان بەبـەردەوامی وابەسـتەی ئـەم خۆشەویسـتی‌یە بـوون کـە لەئاکامدا کـۆنگرەی ئیسـلامیی یەکـەمی (سـیرەتی پێغەمبـەری ﷺ لـە پاکسـتان ساڵی ١٣٩٦ کۆچی لیٚ هاتە کایـەوە ، لـەو کۆنگرەیـەدا (رابطـە) چـەند خـەڵاتێکی ماددی تەرخان کـرد بـەبڕی (١٥٠) هـەزار ڕیـاڵی سـعودی بـۆ باشـترین (٥) باسـی یەکەم سەبارەت بەسیرەتی پێغەمبەر ﷺ بەم مەرجانەی خوارەوە:

(١) باسـەکە تێروتـەواو بێـت لەگـەڵ ڕیزکردنـی ڕووداوە مێژوویيـەکان بـەپێی ڕوودانیان.

(٢) باسێکی باش بێت و پێشتر بلاْونەکرابێتەوە.

(٣) لێکوڵەر ئاماژە بکات بەهـەموو ئـەو دەسـتنووس و سەرچاوە زانستیانەی کە لە باسەکەیدا پشتی پیٚ بەستون.

(٤) لێکوڵەر باسێکی تێروتەسەلی ژیانی خۆی بنووسێت و باس لە پلەوپایـەو لێهاتنـــە زانســـتی‌یەکانی خـــۆی بکـــات و، ئەگـــەر هـــەیبوو ئامـــاژە بەنووسراوەکانی تری بکات.

(٥) باسەکەی بەنووسینێکی ڕوون بنووسێت و بەئاسانی فۆتۆ کۆپی بکرێت.

(٦) باسەکانی بەزمانی عەرەبی و زمانە زیندوەکانی تر وەربگێڕێت.

(٧) باسەکان لەسەرەتای مـانگی ڕەبیعـی دووەمـی سـاڵی (١٣٩٦)ی کۆچیەوە وەردەگیرێـن و لەسـەرەتای مـانگی موحـەڕڕەمی سـاڵی (١٣٩٧) کۆچـیدا کۆتاییان دێت.

(٨) باســەکە تەسـلیم بەئەمینـدارێتی گشـتی ڕابیطــەی جیهـانی ئیسـلامی دەکرێـت لـەزەرفێکی داخـراوداو ئەمینـدارێتی گشـتی ژمارەیـەکی یـەك لـە دوای یەکی تایبەتی بۆ دادەنێت.

(٩) باسەکان لەلایەن دەستەیەك لە زانایانی گەورەوە پێداچوونەوەی لەسـەر دەکرێت.

ئـەم ئاگادارینامەیـە پاڵپێوەنـەرێکی گـەورەبوو بـۆ ئـەو زانایانـەی کـە خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﷺ لە دڵیانـدا بـوو بـۆ ئـەوەی پێشبڕکیٚ بکەن لەو

بوارەداو ، (رابطە)ش خۆی ئامادە کرد بۆ وەرگرتنی باسەکان بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی و ئۆردی و چەند زمانێکی تر.

هەندێك برای بەڕێز باسەکانیان بەو زمانانە نارد ، ژمارەیان گەیشتە (١٧١) باس ، لەوانە:

(٨٤) باس بەزمانی عەرەبی، (٦٤) باس بەزمانی ئۆردی ، (٢١) باس بەزمانی ئینگلیزی ، تەنها یەك باس بەزمانی فەرەنسی و باسێکیش بەزمانی (هوسادی).

رابیطە هەستا بەپێکهێنانی لیژنەیەك لەگەورە زانایان بۆ لێکۆلینەوەی باسەکان و ڕێکخستنیان بەپێی شیاوبوونیان، بۆ سەرکەوتن و وەرگرتنی خەلاَتەکە، ناوی سەرکەوتوەکانیش بەم شێوەیە بوو:

(١) وەرگری خەلاَتی یەکەم ( **شێخ صفی الرحمن المبارکفوری** ) لەزانکۆی سەلەفی . هیندستان . بڕی خەلاَتەکەی پەنجاهەزار ڕیاڵی سعودی بوو.

(٢) وەرگری خەلاَتی دووەم ( **دکتۆر مەجید عەلی خان** ) لەزانکۆی ناوخۆیی ئیسلامیی نیودلهی . هیندستان . بڕی خەلاَتەکەی چل هەزار ڕیاڵی سعودی بوو.

(٣) وەرگری خەلاَتی سیٚهەم ( **دکتۆر نەسیر ئەحمەد ناسر** ) سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی پاکستان ، بڕی خەلاَتەکەی سی هەزار ڕیاڵی سعودی بوو.

(٤) وەرگری خەلاَتی چوارەم ، ( **پرۆفیسۆر حامید محمد مەنصور لیٚمود** ) لەکۆماری میسری عەرەبی ، بڕی خەلاَتەکەی بیست هەزار ڕیاڵی سعودی بوو.

(٥) وەرگری خەلاَتی پێنجەم ( **پرۆفیسۆر عبدالسلام هاشم حافز** ) لە مەدینەی مونەوەرەی میرنشینی عەرەبی سعودی ، بڕی خەلاَتەکەی دە هەزار ڕیاڵی سعودی بوو.

رابیطە لەکۆنگرەی ئاسیایی یەکەم لە شەعبانی ساڵی ١٣٩٨ کۆچی لە شاری کەراچی ناوی سەرکەوتوەکانی ئاشکرا کردو لەکاتی خۆیدا ناویان لە ڕۆژنامەکاندا بلاَو کرایەوە.

بەو بۆنەیەوە ئەمینداریێتی گشتی رابیطە لە مەککەی موکەڕڕەمە ئاهەنگێکی گەورەی ساز کرد بە سەرپەرشتی خاوەن شکۆی مەلەکی ، ( میر سعودی کوڕی عبدالمحسن کوڕی عەبدولعزیز ) جێگری میرنشینی ناوچەی مەککەی موکەڕڕەمە ، لەجیاتی خاوەن شکۆ ( میر فەوازی کوڕی عەبدولعەزیز ) میری ناوچەی مەککەی موکەڕڕەمە .

بەڕێزیان هەستان بە دابەش کردنی خەڵاتەکان بەسەر خاوەنەکانیاندا لە ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی (١٢)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٣٩٩ کۆچی ، لەو ئاهەنگەدا ئەمینداریێتی گشتی ئاشکرای کرد کە هەڵدەستێت بەچاپ کردنی باسە سەرکەوتووەکان و بڵاوکردنەوەی بەچەند زمانێك ، بۆ جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارە نۆبەرەی ئەو چاپە دەخەینە بەردەم خوێنەری بەڕێز بەچەند زمانێکی جیاواز ، ئەمەش باسەکەی ( شێخ صفی الرحمان المومبارکفوری ) یە، لە زانکۆی سەلەفی - هیندستان - کە پلەی یەکەمی وەدەست هێناوە ، دوای چاپی ئەم باسە ، باسەکانی تریش سەرەیان دێت .

لەخوا دەپاڕێینەوە بەرەزامەندی خۆی هەموو کردەوەکانمان لێ وەربگرێت ، بەڕاستی خودا گەورەترین پشتیوان و فریادڕەسە ، دروود لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیت و هاوەڵەکانی .

# ووتــەی نــووســـەر

سوپاس بۆ ئەو خوایەی پێغەمبەرەکەی بەڕێنمویی و ئاییینی ڕاستەقینە نـارد بـۆ ئـەوەی سـەروەربێت بەسـەر ئایینـەکانی تـرداو کـردی بەشـایەت و مژدەدەرو بێدارکەرەوەی خەڵك و بانگخوازی ڕێگـەی خـوداو چرای درەخشـان و سەرقافڵەی چاکەخوازی بۆ هـەموو ئەو کەسـانەی ئومێدیان بەڕەزامەنـدی خـواو ڕۆژی دوایی هەیەو زۆر یادی خوا دەکەن و کانیاوەکانی ڕەحمـەت و ڕەزامەنـدی خۆی بۆ دەرهێنان.

مایـەی خۆشـحاڵی و خۆشـنوودیە کـە ڕابیگـەی جیهـانی ئیسـلامی دوای کۆنگرەی سیرەتی پێغەمبـەر ﷺ لەمانگی ڕەبیعـی یەکـەمی سـاڵی١٣٩٦ کۆچیدا لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی هەستا بەسازدانی ئـەو پێشبڕکێیە بـۆ سیرەتی پێغەمبــەر ﷺ و بـە مەبەسـتی گورجکردنـەوەی نووسـەرەکان و ڕێکخسـتنەوەی چالاکی فیکریـان، مـن بەڕاستی بەبایـەخێکی زۆرەوە سـەیری دەکـەم ، لەوانەیـە زمان نەتوانێت وەسفی بەهاکەی بکات.

سـیرەتی پێغەمبــەر ﷺ و پێشـڕەوێتی ئـەو پێشـەوا مەزنـە ﷺ ، ئەگـەر بەووردی سـەرنجی لـێ بـدەین تـەنها تاکە سەرچاوەیە : کە کانیاوەکانی ژیـانی موسـڵمانانێ جیهـانی ئیسـلامی لێـوە هەڵـدەقوڵێت و ئاسـوودەیی کۆمـەڵگای تێدایە.

ئـەوە مایــەی خۆشـحاڵی و خۆشـبەختیمە کەلـەم پێشـبڕکێ پـیرۆزەدا بەشـداری بکـەم ، بـەڵام مـن لەکوێـدام هـەتا بتـوانم تیشـك بخەمـە سـەر ژیـانی سـەروەری هـەمووان ﷺ ، مـن پیـاوێکم ئاسـوودە دەبم کـە لـەو ڕووناکیيـە وەردەگرم، هەتاکو لە تاریکستانی ئەنگوستە چاودا تێدانەچم و بەئوممەتی ئـەو بـژیم و لەئوممـەتی ئـەوبم ، کـە دەشمـرم خـوا لـە گوناهـەکانم خـۆش ببێـت بەشەفاعەتی ئەو بم بەخشێت.

ووتەیەکیش هەیە پێویستە بیڵێم سەبارەت بەبەرنامەی من لەم باسەدا " من پێش ئەوەی دەست بکەم نووسینی ئەم باسە پێم باشبوو کە لە قەوارەیەکی

مامناوەندیدا بینووسم و خۆم لە درێژەپێدانی بێسوودو کورتکردنەوەی بێمانا دوور بخەمەوە . بەڵام تێبینیم کرد ڕاجیاوازی زۆرهەیە لەنێوان سەرچاوەکاندا لەسەر ڕیزکردنی ڕووداوەکان ، یان لە وردو درشتی باسەکاندا ، لەو جێگایانەدا لێکۆڵینەوەی وردم کردوەو چاوم گێڕاوەتەوە بەهەموولایەکی باسەکەدا ، پاشان ڕای پەسەندم نووسیوەو خۆم پاراستووە و لەهێنانەوەی بەڵگەی زۆر ، چونکە دەبێتە هۆی درێژە پێدانێکی بێزارکەر ، بەڵێ!

لەهەرشوێنێکدا خوێنەر هەست بەناموێیی باسەکە بکات بەڵگەم هێناوەتەوە ، یان بینیبێتم کە نووسەرانی تر ڕای جیاوازیان هەیە هەمان شتم کردووە.

خوایە لە دونیاو ئاخیرەتدا لەخێر بەشم بدە. تەنها تۆ بەڕەحم و بەبەزەییت ، خاوەن عەرشی مەجید هەرخۆتیت.

ڕۆژی هەینی ١٣٩٦/٧/٢٤ کۆچی

١٩٧٦/٧/٢٣ زایینی.

**سەفی ڕەحمان ئەلموبارەکفوری**

**زانکۆی سەلەفی / هیندستان**

## جێگـەوتەی عـەرەب و تیرەکـانی

سیرەتی پێغەمبەر ﷺ لەڕاستیدا بریتی‌یە: لەو پەیامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هێنای و لەتاریکییەوە بەرەو ڕووناکی ڕزگاری کردن ، لە کۆیلایەتی کردن بۆ مرۆڤ ، ڕزگاری کردن بەرەو عەبدایەتی کردن بۆ خوا ، کەواتە ناتوانین وێنەی ڕاستەقینەی بهێنینە پێش چاومان هەتاکو لەنێوان ڕۆژگاری پێشهاتنی پەیامەکەو دوای هاتنیدا بەراوردێك نەکەین ، بۆ ئەو مەبەستە بەشێك تەرخان دەکەین بۆ تیشك خستنەسەر تیرەکانیعەرەب و گۆڕانکاریەکانی ژیانیان لە پێش ئیسلامداو ئەو بارودۆخەی موحەممەدی تێدا کرا بەپێغەمبەر ﷺ.

## شـوێنـی عـەرەب

عەرەب لەزمانەوانیدا: بریتی‌یە لە ساراو بیابان و ئەو دەشتە وشکەی هیچ ئاوێکی تێدانیەو ڕووەکی تێدا ناڕوێت. لەدێر زەمانەوە ئەو ناوە بڕاوە بەسەر دورگەی عەرەبدا ، هەروەکو بەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیەشدا بڕاوە کە لەوێدا نیشتەجێ بوون.

دوورگەی عەرەب لە ڕۆژئاواوە دەریای سوورو نیمچە دورگەی سەیناء و لە ڕۆژهەڵاتەوە کەنداوی عەرەبی و بەشێکی زۆری باشووری عێراق و لە باشورەوە دەریای عەرەب و لە باکوورەوە وولاتی شام و بەشێك لە وولاتی عێراق دەورەیان داوە ، ڕووبەرەکەی لەنێوان یەك ملیۆن میلی چوارگۆشە هەتا ملیۆنێك و سێسەد هەزار میلی چوارگۆشە دەبێت.

دورگەی عەرەب گرنگیەکی تایبەتی هەیە بەتایبەتی لەڕووی جێگەوتەی سروشتی جوگرافیەوە" بەڵام لەناوەوە بەبیابانێکی لماوی چواردەوری دراوە ئەمەش بووەتە بەربەستێکی سروشتی سەخت و نەیهێڵاوە بێگانە داگیری بکات و بەئاسانی دەستی بەسەردا بگرێت ، بۆیە دەبینین لەمێژەوە خەڵکی دوورگەی عەرەب ئازادانە ژیانیان بەسەر بردوە، لەکاتێکدا کە لەدوولاوە دووئیمپراتۆریەتی گەورە لێیانەوە نزیك بوون ، ئەگەر ئەو بەربەستە سروشتی‌یە نەبوایە هەرگیز نەیاندەتوانی بەرگە بگرن.

لەڕووی دەرەکیشەوە ، کەوتۆتە نێوان ئەوچەند کیشوەرە ناسراوەی دونیای ئەوساوە ، کە بەدەریایی و ووشکایی پێکەوە گرێی داون ، باکووری

دوورگـەی عـەرەب دەروازەی چـوونە ژوورەوەیـە بـۆ کیشـوەری ئـەفریقا، بـاکووری ڕۆژهەڵاتیشی کلیلی دەروازەی ئەورووپایە، ڕۆژهەڵاتی دەریای عەجەم و ڕۆژهـەڵاتـی ناوەڕاسـت و دووری لێ دەکاتـەوەو بـەرەو هیندسـتان و وولاتـی چـین دەڕوات ، هەروەها لەڕێگەی دەریاوە بەهەموو کیشوەرەکانەوە بەستراوە، ڕاستەوخۆ کەشتی ئەو کیشوەرانە دەتوانن لەبەندەرەکانی دوورگەی عەرەبیدا لەنگەر بگرن.

لەبەرئـەوە بـاکوورو باشـووری دورگەکـە لـەدێرەوە جێگەوتـەی گـەلان و سەنتەری ئالووێری بازرگانی و ڕۆشنبیری و ئایین و هونەرەکان بووە.

## تـیرەکـانی عـەرەب

مێژوونووسان تیرەکانی عەرەبیان بەپێی بنەماڵە کردوە بە سێ بەشەوە:

١ . **عەرەبی بائیدە (العرب البائدة):** بریتین لەو عەرەبە کۆنانەی کە زانیـاری ووردو تەواو لەبارەی ژیانیانەوە نازانرێت وەکو تیرەکانی (عاد) و (ثمود) و (طسم) و (جديس) و (عملاق) و... هتد.

٢ . **عەرەبی عاربە (العرب العاربة):** بریتین لەو تیرە عەرەبانە کە لەپشتی (یعرب)ی کوڕی (یشجب)ی کوڕی (قحطان) کەوتوونەتەوەو بە عـەرەبی قەحطانی ناسراون.

٣ . **عـــەرەبی موســـتەعرەبە (العـرب المسـتعربة):** ئەوتیرانـەن کـە لەپشـتی ئیسـماعیل کەوتونەتـەوە ـ خێـڵ و تـیرەی زۆریـان لێبۆتـەوە ، بەعـەرەبی عـەدنانی ناسراون ، عەرەبی عاریبەش ـ کە خێڵی قەحتانن ـ خـەڵکی ولاتـی یەمەنن ، تیرەو خێڵەکانیان پەرش و بڵاو بونەتەوە ، تەنها دوانیان ناسراون :

أ ـ **حیمیـــەر** : ئـەم لقانـە یـان نـاودارن (زەیـد) ، (جـەمهور) ، (قەزاعـە) ، (سەکاسك).

ب. **کـــەهلان** ، بـەناوبانگترین لقـەکانی: (هەمـدان) ، (ئـەنمار) ، (طـیء) ، (مـذحج) ، (کنـدة) ، (لخـم) ، (جـذام) ، (ئـەزد) ، (ئـەوس) ، (خـەزرەج) ، لـە کـوڕانی (جفنە) میرەکانی شام .

لقەکانی (کەهلان) کۆچیان کرد بۆ یەمەن و لەدوورگەی عەرەبیدا بڵاوەیان لێ کـرد ، کۆچـی زۆربـەیان پـێش لافاوەکـە بـوو لەوکاتـەدا بـەهۆی فشـارو زەبـری ڕۆمەکانەوەو دەست بەسـەراگرتنیانەوە بەسـەر ڕێگا بازرگانیە دەریاییەکانـدا هیـچ بازرگانیەکی ئەمان سوودی نەبوو.

لەدواییشدا کێبڕکێی نێوان (کەهلان)و(حیمیەر) بووەهۆی ئەوەی (کەهلان) ناوچەکە بەجێبهێڵن و تەنها (حیمیەر) ی تێدا بمێنێتەوە.

دەتوانین کۆچکردوەکانی لقی (کەهلان) بکەین بە چوار بەشەوە:

١. ئوزد: ئەم کۆمەڵە لەسەر ڕای گەورەکەیان (عەمران)ی کوڕی (عەمر) ی (مزیقباء) کۆچیان کردوە بۆ وولاتی (یەمەن)و لەوێ بەخەڵکانی تر گەیشتوون ، پاشان بەرەو باکور هەڵکشاون ، ئەمەش ناوی ئەو شوێنانەیە کە لەدوا ئارامگەیاندا نیشتەجێی بوون .

(ثعلبة)ی کوڕی (عەمر) بەرەو حیجاز لای داوە ، لەنێوان (ثعلبیة) و (ذیقار) دا کۆچ و باری خستووە ، کە کوڕەکەی گەورەبوو دەسەلاّتی پەیداکرد ، بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ ، لەوێ نیشتەجێ بوون و کردیان بەشوێنی خۆیان ، (ئەوس) و (خەزرەج) هەردوکیان کوڕی (حارثة)ی کوڕی (ثعلبة)ن و لەم خێڵەن.

(حارثة)ی کوڕی (عەمر) کە (خزاعە)یی‌یەو کوڕانی لەناوچەی حیجازە ، لەناوچەی (مر الظهران) دابەزیون ، پاشان هاتن (حەرەم)یان کردەوەو لە (مەککە) دا نیشتەجێ بوون (جەرهەمی)یەکانیان لێ دەرکردن.

(عمران)ی کوڕی (عەمر) لە (عومان) دابەزین ، خۆی و کوڕەکانی لەوێ نیشتەجێ بوون ، بە(أزد)ی (شنوءة) ناسران.

(جفنە)ی کوڕی (عەمر) بەرەو شام کەوتەڕێ، خۆی و کوڕەکانی لەوێ هەواریان هەڵداو مانەوە. ئەم کابرایە باوکی میری (غەسانی) یەکانە ، ئەم ناوە ، لە بنەڕەتدا ناوی ئاوێکە لە حیجاز ناسراوە بە (غسان) ، پێش ئەوەی بەرەو شام بکەونە ڕێ لە سەرەتادا لەوێ دابەزیون و ئەو ناوەیان بەسەردا براوە.

٢ . (لخم) و (جذام): (نصر)ی کوڕی (ربیعە) بابە گەورەی مەلیکەکانی (مناذرة) و (حیرة) لەماندا هەڵکەوتووە.

٣ . خێڵی (طیء): لەدوای کۆچ ورەوی (ئوزد) بەرەو باکوور، ئەمانیش کەوتنەڕێ لەهەردوو شاخی (أجا) و (سلمی) هەواریان خست ، هەتا دوو شاخەکە ناویاننرا (طیء).

٤ . (کندە): ئەمان لە (بحرین) دابەزین ، پاشان بەناچاری ڕۆشتن بۆ (حضر موت) لەوێش ئۆقرەیان نەگرت ، چوونە (نجد)، لەوێ حکومەتیان پێکەوەنا ، بەلاّم پاشان ڕووخا.

تیرەیەکی تر هەیە لە (حیمیەر) هەرچەندە ڕاجیایی هەیە لە بنەچەیاندا . لە ڕەگ و ڕیشەدا (قضاعة)یین ، ئەمانیش یەمەنیان بەجێهێشت ، لەدەشتی (سەماوە)ی عێراق نیشتەجێ بوون.[1]

بەلاَم عەرەبی (مستعربە) باپیرە گەورەیان ، سەروەرمان ئیبراهیمە ﷺ کە خەڵکی عێراقە ، خەڵکی شوێنێکە بەناوی (ئور) دەکەوێتە کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری فورات ، لەنزیك کوفە ، پشکنین و هەڵکۆڵین و لێکۆلینەوەی شوێنەوار ناسەکان زانیارییەکی زۆرفراوانیان دەرخستووە لەبارەی ئەم شوێنەو بنەماڵەی ئیبراهیم ﷺ و بارودۆخی ئایینی و کۆمەلاَیەتی لەو وولاَتەدا [2].

وەك زانراوە ، ئیبراهیم ﷺ لەوێوە کۆچی کردوە بۆ(حەران) و لەوێشەوە بۆ (فەلەستین) ، ئەو شوێنەی کردە بنکەی بانگەوازەکەی و گەشتی بەهەر چوارلادا دەکرد[3]، جارێکیان چووە (میصر) لەوکاتەدا (فیرعەون)ی میصر ویستی دەست درێژی بکاتە سەر (سارە)ی خێزانی، بەلاَم خوای گەورە پاراستی، (فیرعەون) زانی کە (سارە) پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ خوادا هەیە ، وەکو ڕێزێك بۆ ئەو، هاجەرەی کچی خۆی کردە کارەکەری[4]، (سارە) خانیش خواستی بۆ (ئیبراهیم) ﷺ[5].

ئیبراهیم ﷺ گەڕایەوە بۆ فەلەستین ، لە (هاجەرە) ئیسماعیلی بوو، ئەوجا (سارە) غیرە گرتی ، بۆیە (ئیبراهیم) ، (هاجەر)و کوڕەکەی دورخستەوە بۆ حجازو لە شیوێکی بیٚ ئاوی بیٚکشتوکاڵی نزیك کەعبەدا نیشتەجێی کردن ، ئەو کاتە ئەو شوێنە تەپۆلکەیەکی ڕووت بوو سێلاَوی باراناو لە هەردوولاوە لێی کەندڕ دەکرد ، هەردووکیانی لەلای سەرووی مزگەوتەکەوە لەسەر زەمزەم دانا، لەو ڕۆژەدا (مەککە) کەسی تێدا نەبوو ، شوێنێکی ووشکی بیٚ ئاو، ئیبراهیم پریاسکەیەك خورماو جەوەنەیەك ئاوی لەلا دانان و خۆی گەڕایەوە بۆ فەلەستین ، چەند ڕۆژێك

---

1 / بۆ ئەم مەبەستە سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:(محاضرات تاریخ الأمم الإسلامیة) نووسینی (خضری بەگ) ١/١١-١٢، (جەرگەی دوورگەی عەرەب) لاپەڕە (٢٣١-٢٣٥) - چاوگە مێژووییەکان سەبارەت بەکات و شوێنی کۆچ کردنی ئەم تیرانە ڕاجیاوازی زۆریان هەیە. ئێمەش پاش ڕامان و هەڵسەنگاندنی ڕایەکان، ئەوەمان پەسەندکرد کە بەڵگەی بەهێز پشتیوانی لێ دەکات.

2 / سەرچاوە: (تفهیم القرآن) نووسنیی (ئەبوئەعلای مەودودی) ١/٥٥٣/ ، ٥٥٤- ٥٥٥- ٥٥٦ (هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن (إبراهیم - ع - کوردەو خەڵکی ناوچەی نەینەوای عێراقە . وەرگێڕ).

3 / هەمان سەرچاوە (١/١٠٨) ...

4 / ئەوەی دەزانرێت، هاجەر ژنەکۆیلە بووە، بەلاَم زانای گەورە قازی محمد سلێمان مەنصورفوری لێکۆڵینەیەکی لەو مەسەلەیەدا کردووەو دەڵێت (هاجەر) ژنێکی ئازاد بووەو کچی فیرعەون بووە ، سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە (رحمه للعالمین ٢/٣٦-٣٧)...

5 / هەمان سەرچاوە ٢/٣٤، بۆ مانای دووروودرێژی بەسەرهاتەکە سەیری (صحیح البخاری ١/ ٤٧٤ بکە).

گوزەری کردو توێشوی ژن و منالەکە تەواو بوو ، لەوێدا بەفەزڵی خواوە ئاوی زەمزەم تەقی و بوو بەقووتێکی ڕۆژانەیان تاماوەیەکی تر بڕی پێکردن ، ئەو بەسەرهاتەش باسی لێوە کراوە بەدرێژی[1].

پاشان خێلێکی یەمانی هاتن کە (جورهم)ی دووەم بوون ، پاش وەرگرتنی مۆڵەت لەدایکی ئیسماعیل لە مەککە نیشتەجێ بوون ، دەڵێن : ئەوانە پێش ئەو دەمە لەشێوو دۆڵەکانی دەوروبەری مەککەدا بوون ، ڕیوایەتەکەی (بوخاری) ڕاشکاوانە دەڵێ : ئەم خێڵە دوای (ئیسماعیل) هاتوونەتە مەککەو پێش ئەوەی ببێتە لاو ، بەڵام هاتوچۆی شیوەکەیان کردوە[2].

ئیبراهیم چەند جارێك سەردانی مەککەی دەکرد تا هەواڵی (هاجەر)و کوڕەکەی بزانێت ، وە لێ نازانرێت ژمارەی هاتوچۆکانی چەند بوون ، ڕیوایەتە مێژووییەکان دەڵێن : چوارجار بووە.

خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەوە دەکات کە لەخەودا پیشانی ئیبراهیمی داوە دەبێت ئیسماعیلی کوڕی سەرببڕێت ، ئیبراهیم ﷺ لەخۆ بوردوانە هەستا بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکەی خوا ﴿ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ {١٠٣} وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ {١٠٤} قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ {١٠٥} إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاء الْمُبِينُ {١٠٦} وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ {١٠٧}﴾ الصآفات .

لە (سفر التكوين)دا هاتووە: ئیسماعیل سیانزە ساڵ لە ئیسحاق گەورەتر بووە ، ڕەوتی چیرۆکەکەش واپیشان دەدات ، ئەم ڕووداوە پێش لەدایك بوونی (ئیسحاق) بووبێت ، چونکە مژدەدان بە لەدایك بوونی (ئیسحاق) بەدوای چیرۆکەکە هاتووە.

ئەم بەسەرهاتە بەلایەنی کەمەوە باسی یەك گەشت دەکات ، پێش ئەوەی ئیسماعیل ببێتە لاو، بەڵام گەشتەکانی تر، (بوخاری) بەدوورو درێژی لە (ابن عباس)ە وە[3] دەیگێرێتەوە ، کورتەکەی ئەمەیە ، کاتێك ئیسماعیل پێگەیشت و لە (جرهم)ە وە فێری عەرەبی بوو، خۆشیانویست و ژنیان دایە ، پاشان دایکی وەفاتی کرد ، ئیبراهیم هەستی کرد کەدەبێت سەر بداتەوە لە ئیسماعیل بەتایبەتی

---

[1] / سەیری (صحيح البخاري) بکە (كتاب الأنبياء -١/٤٧٤ - ٤٧٥ ).

[2] / هەمان سەرچاوە .

[3] / (ج) ١/٤٧٥ ، ٤٧٦ ..

پاش ژنهێنانی ، کە سەری دایەوە ئیسماعیل لەماڵەوە نەبوو، ژنەکەی دەرگای لێ کردەوە پرسیاری ژیانی لێ کردن ، ژنەکە زۆر سکاڵای کردو وتی: ژیانمان تاڵەو کەم دەستین ، ئەنجا ئیبراهیم وەسیەتی کرد بۆ ئیسماعیل: کە لاشیپانی دەرگای ماڵەکەی بگۆڕێت ، کە ئیسماعیل هاتەوە لەقسەکەی باوکی حاڵی بوو ژنەکەی تەڵاق داو ژنێکی تری هێنا کچی (مضاض)ی کوڕی (عەمر) بوو، گەورەو سەرداری (جرهم)ە [1].

دوای ئەم ژنهێنانەش جارێکی‌تر ئیبراهیم سەری دایەوە ، ئەمجارەش ئیسماعیلی نەبینیەوە ، پرسیاری حاڵی ماڵەکەی لە ژنەکەی کرد ، ئەویش زۆر وەسف و سەنای کردو ڕازی بوو ، ئیبراهیم وەسیەتی کرد بۆ ئیسماعیل کە لاشیپانی دەرگاکەی قایم بکات و نەیگۆڕێت .

جاری سێیەم کەهاتەوە ئیسماعیلی بینی لەژێر خێوەتەکەیدا خەریکی دروست کردنی تیربوو لەنزیك ئاوی زەمزەمەوە ، کەبینی خێرا لەبەری هەستاو بەئەرکی باوك و کوڕایەتی هەستا، ئەم بەیەکگەیشتنەیان دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژ بوو، کەم باوك هەیە بتوانێت ئەوەندە ئارام بگرێت لەسەر نەبینینی ڕۆڵەکەی ، ڕۆڵەیەکی چاکی هۆشیارو ژیر، هەرلەو ماوەیەدا پێکەوە کابەیان بنیاتنا ، پاشان بانگی خەڵکی کرد بۆ حەجی ماڵی خوا بەو شێوەیەی خوای گەورە فەرمانی پێ دابوو.

لە کچەکەی (مضاض) خوای گەورە دوانزە کوڕی بە ئیسماعیل بەخشی [2] کە بریتی بوون لە :

( نابت یان أبنالوط ، قیدار ، ئەدبائیل ، مبشام ، مشماع ، دوما ، میشا ، حدد، یتما ، یطور ، نفیس ، قیدمان) لەو دوانزە کوڕە ، دوانزە خێڵی گەورە دروست بوو ، هەموویان لەمەککەدا نیشتەجێ بوون ، بۆ ماوەیەك ، ژیانیان لەسەر بازرگانی بەڕێوە دەچوو، لەیەمەنەوە بۆ شام و میصر، پاشان ئەم خێڵانە بڵاوبوونەوە بەهەموو شوێنێکی دوورگەی عەرەبداو هەندێکیشیان لێچووە دەرەوەی دورگە ، پاشان نەبەتیەکان جگە لە ڕۆڵەکانی (نابت) و(قیدار) ئەوانی دیکە هەواڵیان نەما.

---

[1] / قلب جزیرة العرب ص ٢٣٠..
[2] / هەمان سەرچاوەی پێشوو ..

شارستانێتی نەبەتیەکان لەباکوری حیجاز دەرکەوت ، دەسەلاتێکی بەهێزیان دروست کردو دەوروبەر سەریان بۆ نەوی کردن ، (بطراء) یان کردە پایتەختی خۆیان ، هەتا هاتنی رۆمەکان کەس نەیتوانی ڕووبەڕوویان بوەستێت ، کە ڕۆمەکان هاتن دەوڵەتەکەیان لەناو بردن .

مامۆستا (سليمان الندوی) پاش لێکۆلینەوەیەکی وورد دەڵێت: مەلیکەکانی غەسان و ئەنصاریەکانی ئەوس و خەزرەج لە (آل قحطان) نین، بەڵکو لەکوڕانی (نابت) کوڕی (ئیسماعیل)ن ، ئەوەش نەوەی ئەوانە لەناوچەکەدا ماوەتەوە[1] .

بەلاّم (قیدار)ی کوری (ئیسماعیل) ، کوڕەکانی لە مەککەدا مانەوەو وەچەی تریان لێکەوتەوە هەتا سەر (عدنان) بیست و یەکەمین باپیرەی زنجیرەی پشتاو پشتی پێغەمبەرە ﷺ .

دەگێڕنەوە لەپێغەمبەر ﷺ کەباسی ڕەچەڵەکی خۆی دەکرد هەتا دەگەیشتە (عدنان) نەدەوەستا ، کە دەگەیشتە عەدنان ، دەوەستا دەیفەرموو خزمناسەکان بەهەڵەدا چوون[2] ، هەندێك لە زانایان لەگەڵ ئەوەدان کە دەکرێت نەسەبی پێغەمبەر ﷺ لە پێش عەدنانیشەوە بێت بۆیە ئەو باسەی پێشەوە بەلاواز دەزانن و دەڵێن: لەنێوان (عەدنان) و (ئیبراهیم) دا عليه السلام بەڕاست و دروستی چل باوك هەیە[3] .

بەشەکانی (معد) لە (نزار)ە وە بوون بە چەند لقێکەوە ، وتراوە (معد) کوری تری نەبووە ، (نزار)یش چوار کوری بووە ، چوارخێڵی گەورەیان لێکەوتۆتەوە: (إیاد) و (انمار) و (ربیعە) و (مضر) ، ئەم دوانەی دواوەیان لق و پۆپی زۆریان لێ بوەتەوە ، لە (ربیعە) ئەم لقانە کەوتووەتەوە :

(اسد بن ربیعە) و (عنزە) و (عبد القیس) و هەردوو کوڕەکەی (وائل و بکر) ، (تغلب) و (حنیفە) و هتد .

تیرەکانی (مضر) بوون بەدوو بەشی گەورەوە:

(قیس عیلان بن مضر) ، بەشەکانی (إلیاس بن مضر) ،

لە قەیسی عیلان : (بنو سلیم) و (بنو زهران) و (بنو غطفان) و ، لە (غطفان) یش ، (عبس) و (ذبیان) و(أشجع) و (غنی) و کوڕی (أعصر) کەوتنەوە.

---

1 / تاريخ ارض القرآن ٢/٧٨-٨٦ ..

2 / الطبري ج ٢/١٩١-١٩٤. الأعلام ٥/٦

3 / رحمة للعالمين ج ٢/٧. ١٧، ١٦، ١٥، ١٤، ٨.

له (إلياس)ی کوڕی (مضر) : (تميم بن مره) و (هذيل بن مدركة) و (بنو أسد) و بەشەکانی (كنانه بن خزيمه) و له (كنانه)ش (قريش) که کوڕەکانی فەهری کوڕی (مالك)ن کەوتنەوە.

(قريش) بوون بەچەند تیرەیەکی جیاجیا بەناوبانگترینیان:

(جمح) و (سهم) و (عدی) و (مخزوم) و (تيم) و (زهره) و بەشەکانی (قصی بن كلاب) و (عبدالدار بن قصی) و (أسد بن عبدالعزى) و (عبد مناف بن قصی).

(عبد مناف) چوار لقی لێ بوەوە : (عبد شمس) و (نوفل) و (المطلب) و (هاشم) ، پێغەمبەرمان ﷺ له بنەماڵەی (هاشم)ە[1].

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خوای گەورە لە ڕۆڵەی ئیبراهیم ئیسماعیلی هەڵبژارد ، له ڕۆڵەی ئیسماعیل (كنانه)ی هەڵبژارد ، لە ڕۆڵەکانی کنانە قوڕەیشی هەڵبژارد، لەقوڕەیش بەنوهاشمی هەڵبژارد، منیشی له (بنو هاشم) دا هەڵبژارد[2].

هەروەها له (العباس بن عبد المطلب)ە وە دەڵێت:

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( خوای گەورە هەموو مەخلوقاتی دروست کرد ، منی لەباشترینیاندا داناو لەباشترینی هەردوو تاقمەکەشدا هەڵی بژاردم ، پاشان هۆزەکانی دەستەبژێر کرد منی لەناو باشترین هۆز دانا، پاشان دەستەبژێری بنەماڵەکانی کردو منی لەباشترین بنەماڵەدا دانا ، من باشترین گیانم و لە باشترین بنەماڵەیانم))[3] ، کاتێك نەوەکانی (عەدنان) زۆربوون پەرش و بڵاوبوونەوە بە هەموو لایەکی ناوچەکانی عەرەبدا بڵاوبوونەوەو بەدوای شوێنی تەڕایی و لەوەڕدا دەگەڕان.

خێڵی (عبد القيس) و لقەکانی (بەکر)ی کوڕی (وائل) و (تميم) کۆچیان کرد بۆ (بەحرەین) و لەوێ نیشتەجێ بوون.

خێڵی (بەنو حەنیفە)ی کوڕی (مصعب)ی کوڕی (عەلی)ی کوڕی (بەکر) بەرەو (یەمامە) چوون و لە (حجر) نیشتەجێ بوون ، پاشماوەی (بەکر)ی کوڕی (وائل) بەدرێژایی زەوی لە (یەمامە)وە هەتا (بەحرەین) و(سيف كاظمة) و بەرەو کەناری دەریاو دەوروبەری ڕەشەخاکی عێراق و (أبله) و (هيت) بارگەیان لێ خست ، (تغلب) یش لە دورگەی (فراتی) نیشتەجێ بوون ، هەندێك تیرەیان هاوماڵی خێڵی (بەکر) بوون. (بەنو تەمیم) لەسارای (بەسرە) نیشتەجێ بوون ، (بەنو سەلیم)

---

[1] / محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية ، نووسینی (الخضري)١/١٥،١٤.

[2] / مسلم له (وائله)ی کوڕی (أسقع)ەوە ریوایەتی کردووە ، ٢/٢٤٥، هەروەها (ترمذي)٢/٢٠١.

[3] / ترمذي ریوایەتی کردووە ٢/٢٠١.

یش چوونە نزیك مەدینە ، لە (وادی القری) وە هەتا خەیبەرو ڕۆژهەلاتی مەدینەو سنوری (جبلین) و کۆتای (الحرّة) درێژ بوونەوە.

(ثقیف) لە تائیف نیشتەجیّ بوون ، (هوازن)یش لە ناوچەکانی (أوطاس)ی ڕۆژهەلاتی مەککەو لەسەرە ڕێگەی نێوان مەککە و (بەصرە)دا نیشتەجیّ بوون.

(بەنو ئەسەد) لە ڕۆژهەلاتی (تیماء) و ڕۆژئاوای (کوفە)دا نیشتەجیّ بوون ، لەنێوان ئەوان و (تیماء)دا ، ئاواییەکانی (بحتر)ی (طیيء)دا هەبوون ، دووری نێوان ئەوان و (کوفە) (٥) پێنج شەو ڕێگە بوو ، (ذبیان) لە نزیك (تیماء) ەوە هەتا (حوران) بارگەیان لێخست .

لقەکانی (کنانە) لە (تهامە) مانەوە ، (قوڕەیش) لەناو مەککەو دەوروبەریدا مانەوە ، لەناو خۆیاندا پەرش و بلاّوو ناکۆك بوون ، هەتا (قصی) کوڕی (کلاب) یان تێدا هەلّکەوت ، کۆی کردنەوە ، کردنی بەیەك ، ئەم کارە ڕێزو حورمەتی پێدان و بەرزی کردنەوە لەناو خەلّکیدا [1].

## حوکمداریی و میرنشینایەتی لەناو عەرەبدا

کاتێك دەمانەوێت باسی عەرەب لەپێشهاتنی ئیسلامدا بکەین ، پێویستە وێنەیەکی بچوکی مێژووی حوکمدارێتی و میرنشینایەتی و هۆزو تیرەو ئایینەکان لەناو عەرەبدا بخەینەڕوو ، هەتاکو بتوانین بەئاسانی لەو بارودۆخە تیّ بگەین کە هاوکاتی هاتنی ئایینی ئیسلام بووە .

لەکاتی هاتنی ئایینی ئیسلامدا دەسەلاّتدارانی جەزیرە دووبەش بوون: هەندێکیان مەلیکی دانراوبوون، لەڕاستیدا سەربەخۆ نەبوون ، هەندێکیان سەرۆکی خێلّ و تیرەکان بوون ، وەکو مەلیکەکان مافی تایبەتی و مزەی خۆیان هەبوو، زۆرینەی ئەوانە سەربەخۆبوون ، لەوانەشە هەندێکیان سەر بەمەلیکە دانراوەکان بووبن، مەلیکەکانیش بریتی بوون لە (آل غسان) و مەلیکەکانی (حیرە) ، جگە لەمانە ئەوانی تر داروعەسای مەلیکایەتیان نەبووە.

---

[1] کتێبی (محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية) نووسینی (الخضري)١/١٥-١٦.

## مـەلیـکی یـەمـەن

کۆنترین گەلێك لەیەمەندا بووبن خێڵی (سبأ)ن ، کە لەعەرەبی (عاربە)ن ، باس و خواسیان بەهۆی لێکۆلینەوەیەکی ئاسەوارناسی‌یەوە دۆزراوەتەوە کە پێش (٢٥) سەدە پێش زایین کراوە ، شارستانێتی و هەژموونی دەسەلاٚتیان (١١) سەدە پێش زایین دەستی پێ کردووە ، دەکرێت ڕۆڵی دەرکەوتنیان بەم شێوەیە ئەژمار بکرێت:

١ـ سەدەکانی پێش ساڵی (٦٥٠) پ.ز ، لەو ماوەیەدا بە مەلیکەکان دەوترا: (مەکرەب سەبەء) شاری (صرواح) پایتەختیان بووە ، دووریی ئاسەواری ئەو شارە ڕۆژە ڕێیەکە لەبەشی ڕۆژئاوای ناوچەی (مأرب)ەوە ، بەعەرەبی پێی دەڵێن: (خریبە) لە زەمانی ئەواندا بەنداوی گەورەی (مأرب) دروست کراوە ، ئەم بەنداوە گرنگی‌یەکی تایبەتی هەیە لە مێژووی یەمەندا ، ووتراوە :ـ (سبأ)یەکان ئەوەندە دەسەلاٚتیان هەبووە زۆر ناوچەی عەرەبیان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیان و ژێر دەستەیان کردوون .

٢ـ لەساڵی (٦٥٠) پ.ز هەتا ساڵی (١١٥) پ.ز ، وازیان لە شۆرەتی (مکرب) هێناو خۆیان بەمەلیکەکانی (سبأ) ناوزەد کردو لەجیاتی (صرواح) ، (مأرب)یان کردە پایتەختی خۆیان ، ئێستا کەلاوەی (مأرب) لە ڕۆژهەلاٚتی شاری (صنعاء)ی پایتەختی یەمەنەوە (٦٠) میل دوورە .

٣. لەساڵی (١١٥) پ.ز هەتا ساڵی (٣٠٠) زایین، لەو دەمەدا خێڵی (حمیر) دەستیان گرت بەسەر مەملەکەتی (سبأ)دا، ئەوانیش لەجیاتی (مأرب)، (ریدان) یان کرد بەپایتەختی خۆیان، لە دواییدا ناوی (ریدان) یان گۆڕی بۆ(ظفار) ئاسەواری ئەم شارە ئێستاکە لەسەرچیای (مدور)ە لەنزیك (بریم)دا ، لەو ساتەنەدا دەوڵەتی (حمیر) بەرەو هەرەسهێنان و لێکهەڵوەشان ملی‌نا، هەرچی جموجوڵی بازرگانیشە تووشی شکست و زیان دەبوو، ئەوەش چەند هۆیەکی هەبوو:

یەکەم / کۆنترۆڵ کردنی بەشی باکور لەلایەن (أنباط) یەکانەوە .

دووەم / داگیرکردنی ڕێگای بازرگانی دەریایی لەلایەن ڕۆمەکانەوە بە تایبەتی پاش دەست بەسەراگرتنی (میصر) و(سوریا) و باکوری (حیجاز) .

سـێهەم / نـاكۆكی و دووبـەرەكی نێـوان تیرەكـانی خۆیـان ، ئـەم هۆیانـە كارێكیـان كـرد (آل قحطـان) یـان پەرتـەوازە كـردو ناچـاربوون كـۆچ ڕەوبكـەن و بەوولاْتاندا ! بلاْوەی لێ بكەن.

٤. لەساڵی (٣٠٠) زایینەوە هەتا ئەوكاتەی ئایینی ئیسلام چووە یەمەنەوە ، لەو كاتانەدا كۆمەڵێ ڕووداوو ئاڵۆزیی ڕوویانداو چەند جەنگێكی ئەهلی بەرپابوو ئەمەش وای لێكردن ببنە شوێنی چاوتێبڕینی بێگانەو لە كۆتاییشدا سەربەخۆیی خۆیان لە دەست بدەن ، لەو سەردەمەدا ڕۆمەكان چوونە شاری (عەدەن)ەوە ، بە كۆمـەكی ئـەوان ، حەبەشیەكان توانیـان بـۆ یەكـەمجار لـە سـاڵی (٣٤٠)ی زاییـندا یەمەن داگیر بكەن ، هۆی ئەو داگیركردنەش ناكۆكی نێوان هـەردوو خێڵـی (همدان) و(حمیر) بوو، تا ساڵی (٣٧٨)ی زایین بەردەوام بوو پاشـان یەمـەن سـەربەخۆیی وەرگرتــەوە، دوای ئــەوە درزكەوتــە بەنداوەكــەی (مــأرب) ە وە، هــەتا ئــەوەبوو كارەساتی هەرەسـە گەورەكـەی بەسـەردا هـات ، كـە لەقورئانـدا بـە (سـیل العـرم) ناوبانگی هەیە ، ئەم هەرەسە لەساڵی (٤٥٠) زاییندا هـەتا (٤٥١) ی زاییندا بووەو بۆتـە هـۆی وێرانكردنـی زەوی وزارو مـەزرای ناوچـەكەو ژێـرەو ژووری كـردوەو گـەلانی دەورو بەریشـی ئـاوارە كـردووە ، لەسـاڵی (٥٢٣)ی زاییـندا (ذونـواس)ی جولەكە شالاْوێكی ناڕەوای كردە سەر گاورەكانی (نجران)و ویستی بە زۆر لەسـەر ئایینی گاورایەتی وەریان بگێڕێت ، كاتێك بەگوێیان نـەكرد ئـەویش شیوێكی زۆر گەورەی بۆ هەڵكەندن و ئاگری تێ بەرداو هەموویانی فڕێدایە ناوی ، ئەم ڕووداوە لە سوورەتی (البروج) دا ئاماژەی پێكـراوە كـە دەفـەرموێت : ﴿ قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ ﴾، لەتوێڵەی ئەوەدا (نەصرانی) یەكان كەوتنە چالاكی و حەزی پاوان خوازیان تێدا بزواو كەوتنە داگیركردن و فراوانكردنی ناوچەكانی ژێر دەسـەلاْت بەسـەركردایەتی ئیمپراتۆری ڕۆمەكان ، حەبەشیەكانیان دژ بە عەرەب هانداو گەلـە كەشتیەكیان بۆ ئامادەكردن ، (٧٠) حەفتا هەزار سەربازی حەبەشی لەكەنارەكانی یەمەن دابەزین و بۆ جاری دووەم داگیریان كرد بەسـەركردایەتی (أربـاط) لەسـاڵی (٥٢٥) ی زاییندا ، ماوەیەك (أرباط) حاكمی یەمەن بوو، هەتا یەكێك لەسەركردەكانی سوپاكەی بەناوی (ئەبرەهــە) كوشـتی و چـووە شـوێنەكەی و مـەلیكی حەبەشەشـی ڕازی كـرد ، (ئەبرەهە) ئەو كەسـەیە كـە خـەڵكی خـڕ كـردەوە بۆ ڕووخاندنی كابەی شـەریف و، خۆی و سەربازەكانی لە قورئاندا بە (اصحاب الفیل) ناسراون.

پاش ڕووداوی (الفیل) یەمەنیەکان داوای کۆمەکییان لە (فارسەکان) کرد ، ئەوانیش یارمەتیاندان هەتاکو لەیەمەن دەریانپەڕاندن و لەساڵی (٥٧٥)ی زایینـدا بەسـەرکردایەتی (معـد یکـرب) کـوڕی (سـیف ذی یـزن الحمـیری) سـەربەخۆییان وەرگرتـەوەو بـوو بەمـەلیکیان ، (معـد یکـرب) هەنـدێك لـە حەبەشـیەکانی وەکـو خزمەتگوزار لەدەوروبەری خۆیدا هێشتبۆوە ، تاڕۆژێکیـان کوشتیان ، بەکوشتنی ئەو ئیتر مەلیکایەتی لە بنەماڵەکەیدا پووکایەوە ، (کیسرا)ی فارس کاربەدەستێکی فارسی تێدا هێشتەوە، لەو کاتەوە دەسەڵات لە یەمەندا بەدەست فارسەکانەوە بوو، یـەك لـەدوای یـەك دەسـەڵاتدارە فارسـەکان فـەرمانڕەواییان دەکـردن ، هەتا دوایـین سەرکردەیان کە ناوی (بازان) بوو ، ئەم پیاوە لەساڵی (٦٢٨)ی زایینـدا، باوەڕی بەئیسلام هێناو موسوڵمان بوو، بە موسوڵمان بوونی (بازان) هـەژموونی دەسـەڵاتی فارسەکان لە یەمەندا کۆتایی پێهات.[1]

[1] لەم بارەیەوە سەیری ئەم سەرچاوانە بکە، (تفهیم القرآن) ١٩٨/٤، ١٩٧، ١٩٦، ١٩٥. هەروەها (تاریخ ارض القرآن) ج١ لە لاپەڕە (١٣٣) هەتا کۆتایی، لەبارەی دیاری کردنی ساڵەکانەوە ڕاجیاوازیەکی زۆر لە سەرچاوە مێژوویەکاندا هەیە . کار گەیشتۆتە ڕادەیەك هەندێ لەو نووسەرانە وتوویانە : ئەم باسانە جگە لە ئەفسانە شتێکی تر نیە.

# مەلیکی حیرە

فارسەکان فەرمانڕەوایی عێراق و دەورووبەریان دەکرد تا لە (٥٥٧ ـ ٥٢٩) پ.ز دا کە (کۆرشی گەورە) بوو بەمەلیك و هەموویانی یەکخست ، کەس نەیدەتوانی ململانێیان لەگەڵدا بکات ، هەتاکو ساڵی (٣٢٦) پ.ز لەو کاتەدا ئەسکەندەری مەقدۆنی هات دەسەڵات و شەوکەتی نەهێشتن و (دارای یەکەم)ی پاشای فارسەکانی شکاند ، دوای ئەوە وولات پارچەپارچە بوو هەرپارچەی کەوتەدەست مەلیکی خێلێك، ئەم شێوازە بەردەوام بوو تاساڵی (٢٣٠) زایین ، لە سەردەمی ئەو مەلیکانەدا (قەحطانی) یەکان کۆچیان کردو بەشێك لە گوندەکانی ناوچەی عێراقیان داگیرکرد ، بەدوای ئەواندا ئەو (عەدنان)یانەی کۆچیان کردبوو هاتن و کەوتنە ململانیٚ لەگەڵیاندا هەتا بەشێك لە دورگەی فوراتیان داگیر کردو تیایدا نیشتەجیٚ بوون .

لەساڵی (٢٢٦ز) داو لەسەردەمی (ئەردەشێر)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانیدا ، جارێکی تر فارسەکان هێزیان پەیدا کردەوەو ، هەرچی عەرەبی نیشتەجێی سنووری فارس هەبوو هەموویانی خستەوە ژێر ڕکێفی خۆیانەوەو ئەمە بووە هۆی ملکەچ کردنی خەڵکی (حیرە) و (ئەنبار) ، بەلاّم (قضاعة) کۆچیان کرد بۆ شام ، هەر لە سەردەمی (ئەردەشێر)دا (جذیمة الوضاح) بوو بە سەرپەرشتیاری (حیرە)و شوێنەکانی تری وەك بیابانی عێراق و دورگەو خێڵەکانی (ربیعە) و (مضر) ، (ئەردەشێر) بڕوای وابوو کەناتوانێت ڕاستەوخۆ حوکمی خێڵە عەرەبەکان بکات و نەهێڵێت توخنی سنوورەکانی بکەون و، دەبێت لە خۆیان یەکێکی عەرەب بکاتە سەرۆکیان ، بۆ ئەوەی عەرەبەکان نەتوانن دەستدرێژی بکەنە سەریان و لەلایەکی ترەوە ڕۆمەکانیان پیٚ بترسێنێت ، لەولاشەوە کە ڕۆمەکان عەرەبەکانی شامیان وابەستەی خۆیان کردبوو ، فارسەکانیش عەرەبی عێراقیان کردە دۆستی خۆیان بۆئەوەی بەربەستی عەرەبی شام بکەن ، لەلای مەلیکی (حیرە)ش کۆمەڵێك سەربازی فارسیان هێشتبۆوە ، بۆ تەمیٚ کردنی ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی نیازخراپیان دەکرد ، ساڵی (٢٦٨ ز) (جذیمة) مرد.

لەدوای مردنی (جذیمة) (عەمر)ی کوڕی (عدی) کوڕی (نفر اللخمی) بووە سەرپەرشتیار ، ئەمە یەکەم سەرکردەی (لەخمی)یەکان بوو لەسەردەمی کیسرا (سابور)ی کوڕی (ئەردەشێر)دا ، میرایەتی (حیرە) لەبنەماڵەی (لەخمی)یەکاندا بەردەوام بوو ، هەتا فارسەکان خۆیان (قباذ)ی کوڕی (فیروز) یان دانا ، لە سەردەمی ئەمدا (مەزدەك) دەرکەوت ، کە بانگەشەی بۆ بەرەڵلایی سێکسی دەکرد ، (قباذ)و کۆمەڵێکی زۆر لە ڕەعیەتەکەی شوێنی کەوتن ، بەوەشەوە نەوەستا نامەی نارد بۆ (منذر) کوڕی (ماء السماء) ، کە میری (حیرە) بوو، داوای لێ کردبوو شوێنی ئەو ڕێبازە بکەوێت ، بەلاَم ئەو پیاوێکی گرژ بوو قەبووڵی نەکرد ، (قباذ) لە میرایەتی (حیرە) لای بردو ، (حارث)ی کوڕی (عەمر)ی کوڕی (حجر)ی کندی لە جێگەیدا دانا ، پاش ئەوەی ڕازی بوو ئەو ڕێبازە بەرەڵلاییيە وەربگرێت .

پاش (قباذ)ی کیسرا ، (نەوشیروان) جێگەی گرتەوە زۆر ڕقی لە بەرەڵلایی بوو ، بۆیە (مەزدەك)و زۆرێك لە شوێنکەوتوەکانی کوشت و لەناوی بردن و(منذر)ی گێرایەوە بۆ میرایەتی (حیرە) ، داوای کرد لە (حارث)ی کوڕی (عمرو) بگەڕێتەوە بۆ لای ، بەلاَم ئەو نەگەڕایەوەو پەنای برد بۆ (دار الكلب) و لەوێ مایەوە ، هەتا مرد.

مەلیکایەتی دوای (منذر) لە (عقبە)دا مایەوە هەتا گەیشتە (نعمان)ی کوڕی (منذر)، (کسری) بەهۆی پڕوپاگەندەکەیەوە کە (زید)ی کوڕی (عدی العبادی) هەڵی بەستبوو، لە (نعمان) تووڕەبوو، ناردی بەشوێنیدا، (نعمان) خۆی و ماڵ و منداڵەکانی بە نهێنی ڕوویان کردە لای (هانیء) کوڕی (مسعود) سەرۆکی (آل شیبان) لەوێ ژن و منداڵەکانی داناو خۆی چوو بۆلای کیسرا، ئەویش بەندی کرد هەتا مرد، دوای ئەو (إیاس)ی کوڕی (قبیصە)ی (طائی) کردە میری (حیرە)و فەرمانی پێدا کە ژن و منداڵەکانی (نعمان)ی لە (هانیء) وەربگرێتەوە ، (هانیء) غیرەتی جوڵاو نەیدایەوە، مەلیك فەرمانی شەڕی ڕاگەیاند، ماوەیەکی نەبرد کۆمەڵێك سەربازی کیسرا گەیشتن و بوونە پشتیوانی (إیاس) ، لە (ذی قار)دا شەڕی زۆر قورس ڕوویدا ، لەئاکامدا هۆزی (شەیبان)ی سەرکەوتن و ئەمە یەکەم جار بوو (عەرەب) بەسەر (فارس)دا سەربکەون، ئەم شەڕە پاش ماوەیەکی کەم لە لە دایك بوونی پێغەمبەر ﷺ ڕووی داوە، چونکە (٨) هەشت مانگ بەسەر ویلایەتی (إیاس)دا گوزەرا بوو، کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەدایك بوو.

دوای (إياس) كيسرای فارس ، سەركردەيەكی فارسی لەسەر يەمەن دانا، لەساڵی (٦٣٢) زاييندا مەليكايەتی گەڕايەوە بۆ بنەماڵەی عەرەبی (لەخم) ، (منذر)ی ناسراو بە (معرور) ميری (حيرە) بوو، تەنها (٨)مانگ بەسەر ئەم[1] ميرايەتيەدا گوزەرابوو (خاليد)ی كوڕی (وەليد) بەخۆی و سوپای ئيسلامەوە هەڵيان كوتايە سەری.

## مەليكی شام

لەو كاتەدا كە عەرەب سەرقاڵ بوون بە كۆچ و ڕەوی خێڵەكانەوە ، چەند لق و پۆپێكی خێڵی(قضاعة) نزيك شام بووبونەوەو نيشتەجێ بووبوون ، ئەوانە (سليح)ی كوڕی (حلوان) كە(ضجعم) لەوانەو بە(ضجاعمة) ناسراون ، ئەمانە هەموويان ڕۆمەكان پێكيان هێنان بۆ ئەوەی نەهێڵن عەرەبی دەشتەكی تر نزيكی ناوچەكە بكەونەوەو لەلايەكی تريشەوە ئامادەی كردن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی فارسەكان ، مەليكێكيان بۆ دانان ، ئەمە چەند ساڵێك دەوامی هەبوو ، (زياد)ی كوڕی (هبولە) بەناوبانگترين ميريان بوو ، ڕۆژگاری دەسەڵاتيان بەسەرەتاكانی سەدەی دووەمی زايين هەتا كۆتاييەكەی مەزەندە ئەكرێت ، دەسەڵاتيان بەهاتنی (آل غسان) كۆتايی هات ، (آل غسان) بەسەر (ضجاعمة)دا سەركەوتن و ڕۆمەكانيش كرديانن بەمەليكی شام ، بنكەو بارەگايان يان لە (دومە الجندل) بوو ، (غساسنە)كان كاربەدەستی ڕۆمەكان بوون ، هەتا شەڕی (يەرموك) ڕوویدا لە ساڵی (١٣)ی كۆچيداو دوا مەليكيان كە (جبلە)ی كوڕی (أيهم) بوو، ملی بۆ ئيسلام كەچ كردو لەسەردەمی ميری موسوڵمانان (عمر)ی كوڕی (خطاب)دا (خوای لێ ڕازی بێت) موسوڵمان بوو.[1]

---

[1] / بڕوانە كتێبی (محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية) نووسينی (الخضری) ١/٣٢،٣١،٣٠،٢٩.
[1] / هەمان سەرچاوەی پێشوو ٣٤١، كتێبی (ارض القرآن )٢/٨٢،٨١،٨٠..

## میرنشینی لە حیجازدا

(ئیسماعیل عليه السلام) بەدرێژایی هەموو تەمەنی زێوانی کابەی پیرۆزی بەدەست بوو[1]، لە تەمەنی (١٣٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد[2]، پاشان دوان لە کوڕەکانی (نابت) دوای ئەو (قیدار) هەندێك دەڵێن بەپێچەوانەوە ، زێوانیان کرد ، دوای ئەوان ، باپیرەیان (مضاض)ی کوڕی (عمرو)ی (جورهومی) وەری گرت و لەدەست ئەواندا بوو ، ڕۆڵەکانی ئیسماعیل پلەو پایەیەکی بەرزیان هەبوو ، چونکە باوکیان لە بیناکردنی کابەدا کاری کردبوو ، لە کاتێکدا هیچ دەسەڵاتێکیشیان نەبوو [3].

ڕۆژگار تێپەڕی دەوری ڕۆڵەکانی ئیسماعیل عليه السلام بەرەو کزی و لاوازی دەچوو ، پێش (بختنصر) ڕۆڵی (جرهم) تەواو لاواز بوو ، ئەستێرەی سیاسی (عەدنان) یش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەدرەوشایەوە لەئاسمانی مەککەدا ، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێك (بختنصر) لە (ذات عرق)دا دای بەسەر عەرەبەکاندا، سەرکردەی عەرەب لەو کاتەدا (جرهمی) نەبوو[4].

لە شەڕی دووەمی (بختنصر) دا (ساڵی٥٨٧ پ.ز) (بنو عدنان) بڵاوەیان لێ کردو هەندێکیان چون بۆ یەمەن ، (برمیاه)ی پێغەمبەریش (معد)ی برد بۆ شام ، کە فشارو زەبرو زەنگی (بختنصر) نەما ، (معد) گەڕایەوە بۆ (مەککە) و لەوێ جگە لە (جرشم)ی کوڕی (جرهم) کەسی نەبینیەوە ، بۆیە کچەکەی خواست کە ناوی (معانە) بوو ، کوڕێکی لێ بوو ناویان نا (نزار)[5].

دوای ئەوە کاروباری (جرهم) لەمەککەدا خراپ بوو ، تەنگەتاو بوون ، کەوتنە زوڵم کردن لەوانەی دەهاتن بۆ مەککەو ماڵی کابەیان بۆ خۆیان حەڵاڵ کردبوو[6]، ئەم کارە ڕقی (عدنانی)یەکانی هەستاند ، ڕقیان لێ دەخواردنەوە ، کاتێك (خزاعە) لە (مر الظهران) نیشتەجێ بوون ، بینیان عەدنانیەکان لە (جرهم)یەکان

---

1 / قلب جزيرة العرب . لاثقرة /٢٣٠-٢٣٧..
2 / سفر التكوين ٢٥ : ١٧ .
3 /قلب جزيرة العرب لاپەرە٢٣٠_٢٣٧ (ابن هشام) ١١١/١_١١٣ ، (ابن هشام) تەنها باسی ویلایەتی(نابت)ی کوڕی (إسماعیل) دەکات.
4 / هەمان سەرچاوە ..
5 / رحمة للعالمين ٤٨/٢ .
6 / قلب جزيرة العرب ل ٢٣١.

بێزارن ئەمەیان بەهەلزانی بە یارمەتی چەند لقێکی (عدنان) کە بریتی بوون لە (بنو بکر بن عبدمناف بن کنانە) کەوتنە دژایەتی کردنی (جرهم)و توانیان لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی زاییندا لە شاری مەککە دەریان بکەن و دەسەلآت بگرنە دەست.

لەوکاتەدا کە (جرهم)یەکان پاشەکشەیان دەکرد بیری زەمزەمیان پڕ کردەوە و لەگەڵ زەوی تەختیان کردو هەندێك شتیان تێدا شاردەوە، (ابن اسحاق) دەڵێت: (عمر)ی کوڕی (حارث)ی کوڕی (مضاض الجرهمی)[1] هەردوو ئاسکە ئاڵتونیەکەی کابەو[2] بەردەکەی (الرکن الأسود)ی لەبیری زەمزەمدا شاردەوە، خۆی و هەرچی (جرهمی) هەیە لەگەڵیدا بەرەو یەمەن هەلآتن ، دوای ئەوە بەهۆی جێ هێشتنی مەککەوە تووشی خەم و پەژارەیەکی زۆربوون لەوبارەیەوە (عمرو) ووتوویەتی[3]:

كأنْ لَم يكنْ بينَ الحَجونِ إلى الصَفا  أنيسُ ولم يسمُر بـمكَّةَ سامرُ
بلى نحنُ كُنا أهلَها فأبادنا  صروفُ الليالي والجدودُ العواثرُ

ڕۆژگاری ئیسماعیل ﷺ بە (١٠) سەدە پێش زایین مەزەندە دەکرێت . بۆیە سەقامگیر بوونی (جرهم)یەکان لە مەککەدا نزیکەی (٢١) سەدەیە ، بۆ ماوەی (٢٠) سەدە حوکمڕانی مەککەیان کردووە ، خوزاعە تەنها خۆیان حوکمیان دەکردو بواریان نەدەدا (بنو بکر) هیچ دەسەلآتێکیان هەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا تیرەکانی (مضر) سێ بواریان هەبوو:

**یەکەم/** خەڵکیان لەعەرەفەوە بەرەو موزدەلیفە دەبرد ، ڕۆژی (نفر)یش لە (مینا) ئیجازەیان پێدەکردن، دوای ئەوان (بنو غوث)ی کوڕی (مره) لەتیرەکانی (الیاس)ی کوڕی (مضر) دەهاتن و پێیان دەوترا: (صوفە)، واتای (اجازە) ئەوە بوو، ڕۆژی (نفر) کەس ڕەجمی نەدەکرد هەتاکو پیاوێك لە (صوفە) ڕەجم نەکات ، کە خەڵك لە ڕەجم دەبوونەوە ، بیانویستایە (نفر) بکەن لە (مینا)وە ، (صوفە) ئەمبەرو ئەوبەری عەقەبەیان دەگرت و نەیاندەهێشت کەس بگوزەرێت هەتا خۆیان

---

[1] / ئەم پیاوە (مضاض الجرهمي) گەورە نییە کە پێشتر لەچیرۆکی (إسماعیل) دا (ع) باسی هات .
[2] / مسعودی دەڵێت: فارسەکان لەسەرەتای هەموو ساڵێکدا ماڵ و سامان و گەوهەرێکی زۆریان دەبەخشی بەکابە ، ساسانی کوڕی بابەك دووئاسکی ئاڵتونی و شمشێرێك و بڕێکی زۆر ئاڵتونی لەکابە دانا ، کەچی (عمر) هەمووی فڕێدایە بیری زەمزەمەوە ، بڕوانە (مروج الذهب) ١/٢٠٥.
[3] / ابن هشام ١/١١٤-١١٥.

تێنەپەڕینایە ، دوای‌ئەوە ڕێگەی خەڵکی تریان دەدا ، کە (صوفە)ەکان نەمان (بنو سعد)ی کوڕی (زید مناة) لە (تمیم) جێیان گرتنەوە.

دووەم/ ئیفازە (الأفاضة) هەر لەبەرەبەیانی قوربانییەوە هەتاکو (مینا) بە دەست (بنی عدوان) وە بوو .

سێیەم/ دواخستنی مانگە حەرامەکان بۆ تیرەی (بنو تمیم)ی کوڕی (عدی) بوو[1] لە (بنی کنانە).

دەسەلاتی (خزاعە) بەسەر مەککەدا(٣٠٠) ساڵی خایاند[2]، لەکاتی حوکمڕانی ئەماندا (عدنانی)یەکان لەناوچەی (نجد) و (عێراق) و (بەحرەین)دا بڵاوبونەوە، لە ناوچەی مەککەدا چەند تیرەیەکی قورەیش مانەوە کە بریتی بوون لە (حلول) و (حرم) و چەند بنەماڵەیەکی خۆیان لە(بنی کنانە)دا ، ئەمانە لەکاروباری مەککەو (بیت الحرام)دا هیچ دەسەلاتێکیان نەبوو، هەتا سەردەمی (قصی) کوڕی (کلاب) هات[3].

لەبارەی (قصی)یەوە دەڵێن: شیرەخۆرە بووە کەباوکی مردووە ، دایکی شووی کردووە بەپیاوێکی تیرەی (بنی غدرە) ناوی (ربیعە)ی کوڕی (حرام)ە و بردوویەتی بەرەو وولاتی شام کە ماڵی لەوێ بووە ، کاتێك (قصی) گەورە دەبێت دەگەڕێتەوە بۆ (مەککە) ، لەو کاتەدا (حلیل)ی کوڕی (حبشە) لەخێڵی (خوزاعە) والی مەککە بوو ، (قصی)ی داوای (حبی) کچی (حلیل)ی کرد ، (حلیل) ڕازی بوو لێی مارە کرد[4] ، کە (حلیل) مرد شەڕێك لەنێوان (خزاعە) و (قریش)دا قەوما ، کۆتایی بەوە هات کە (قصی) بووە سەرکاری مەککەو (بیت) پێکەوە ، لەبارەی ئەم جەنگەوە سێ گێڕانەوە هەیە:

یەکەم: کاتێك (قصی) ماڵ ومناڵی زۆربوو ، کوڕەکانی زۆربوون و پلەو پایەی بەرز بووەوەو (حلیل) لاواز بوو ، بڕوایان وابوو ئەوان شایستەترین کەسن بۆ کابە لە (خزاعە)و(بکر)یش ، چونکە قوڕەیش سەروبەندی (آل إسماعیل)ن ، بۆیە

---

1 / ابن هشام ١/٤٤-١١٩-١٢٠-١٢٢.

2 / معجم البلدان و یاقوت مادة (مكة).

3 / محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية للخضري ١/٣٥،وإبن هشام ١/١١٧.

4 / ابن هشام ١/١١٧-١١٨

کاتێك لەبارەی دەرکردنی خێڵی (بنو بکر) و (خزاعە)وە قسەیان کرد لەگەڵ هەندێك پیاوی قورەیشی و(بنی کنانە)دا، هاتن بە دەمیانەوەو لە مەککە دەریانپەڕاندن .[1]

دووەم : بەپێی ڕیوایەتێك (خزاعە) وەسیێتی کرد بۆ (قصی) پاش مردنی خۆی ببێتە سەروکاری کابەو شاری مەککە.[2]

سێیەم: (حلیل) ویلایەتی ماڵی خوای دابوو بە(حبی) کچی ، ئەویش (أبو غبشان)ی خزاعی کرد بە وەکیلی خۆی ، (أبوغبشان) زێوانی کابەی دەکرد (حلیل) مردو (قصی) سەروکاری (بیت) یان لە (ابوغبشان) بە جامێك (خمر) کڕیەوە ، (خزاعە) بەم کڕین و فرۆشتنە ڕازی نەبوون ویستیان (قصی) یش دور بخەنەوە ، (قصی) قورەیش و (بنی کنانە) ی لێ کۆکردنەوەو لە مەککە دەری پەڕاندن.

هەرچۆنێك بووبێت ، کە حلیل مردوە، (صوفە) ئەوەیان کردوە کە کردویانە ، (قصی) و هەرچی قورەیشی (بنی کنانە)ی لەگەڵدا بووە ، پێیان دەڵێن: ئێمە لە ئێوە شیاوترین بۆ ئەم کارە ، شەڕدەقەومێت ، (قصی) هێز کۆدەکاتەوە ، لەو لاشەوە (خزاعە) و (بنو بکر) خۆیان دژ بە (قصی) ئامادە دەکەن ، (قصی) دەڕواتە سەریان و شەڕیان لەگەڵ دەکات ، جەنگێکی زۆر قورس بەرپا دەبێت و لە یەکتری دەکوژن ، پاشان سوڵح دەکەن ، بڕیار دەدەنە دەست (عەمر)ی کوڕی (عوف) کە یەکێکە لە (بنو بکر) ، ئەویش بڕیار ئەدا کە (قصی) شیاوترە لە (خزاعە) بۆ سەروکاری کابەومەککە ، هەرخوێنێکیش (قصی) ڕشتبێتی وەك زامێکەو دەخرێتە ژێر پێیەوە ، ئەو خوێنەش (خزاعە) و (بنو بەکر) ڕشتویانە دەبێت خوێنەکەی بدەن ، دەبێت لەوەودواش بوار بدرێت (قصی) حوکمداری کابە بکات ، لەو ڕۆژە بەدواوە (عمرو) ناونرا بە (شداخ)[3] ، ئەم ڕووداوی دەست بەسەرا گرتنەی مەککەو کابەی شەریف لەلایەن (قصی)یەوە لەناوەڕاستی سەدەی (٥)ی زایینیدا سالی (٤٤٠ز)[4] بوو ، بەم جۆرە دەسەلاتی تەواوی مەککەو کابە کەوتە دەست (قصی)و خێڵی قورەیشەوە ، لەڕووی ئاینیشەوە قورەیش بوون بەخاوەنی مەککەو عەرەب لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکردن ، ئەوەی (قصی) کردی بریتی

---

[1] / هەمان سەرچاوەی پێشوو ١/١١٧-١١٨

[2] / هەمان سەرچاوە ١/١٨٨.

[3] / ابن هشام ١/١٢٣-١٢٤.

[4] / قلب جزيرة العرب ل ٢٣٢

بوو لە کۆ کردنەوەی خێڵەکەی لەناو مەککەداو ئەو شارەی بۆکردن بە چوار بەشەوە هەر تیرەیەکیانی لە شوێنێکدا نیشتەجێ کرد، دانی‌نا بەمانگەکانی حەرامداو بە (آل صفوان) ڕازی بوو، هەروەها (عدوان)و(مرە)ی کوڕی (عوف)ی لەجێگەو مەقامی خۆیاندا هێشتەوە ، چونکە ئەوەی بە (دین) دەزانی و ڕێگەی نەدا بە گۆڕانی[1].

یەکێکی تر لەکارەکانی (قصی) دامەزراندنی (دارالندوە) بوو لەبەشی سەرەوەی کابەداو دەرگاکەی خستەسەر کابە ، ئەم جێگەیە شوێنی کۆبونەوەی قوڕەیش بوو ، بڕیاری گرنگی تێدا ئەدرا ، ئەو (دار الندوە)یە چاکەی زۆری بەسەر قوڕەیشەوە هەیە ، چونکە یەکێتی بڕیارو هەڵوێستیانی پاراستبوو هەموو کێشەکانی بەئاشتی بۆ یەکلا دەکردنەوە[2]، (قصی) چەند دیمەنێکی بەشان و شەوکەت و تەشریفاتی هەبوو ، لەوانە:

(١) سەرۆکایەتی (دار الندوە) ، لەم (دار)ە دا کۆدەبونەوەو بڕیاری گرنگیان دەداو ژن و ژنخوازیان تێدا دەکرد.

(٢) ئالآ ، هیچ ئالآیەکی جەنگ نەدەبەسترا بەدەستی (قصی)یەوە نەبێت.

(٣) دەرگاوانی کابە تەنها بەو دەکرایەوە، هەرئەوخزمەتی دەکردو خزمەت گوزاری بۆ دادەنا.

(٤) زێوانی کابە ، ژمارەیەك بیروچاڵاویان بۆحاجیان دروست دەکردو پڕیان دەکرد لە ئاو، هەندێك خورماو ترێیان بۆدادەنان، خەڵکی کەدەهاتن بۆ مەککە لێیان دەخوارد[3].

(٥) میوانداری حاجیان ، ئەمەش بەشێوەیەك بوو خواردنیان بۆ دروست دەکردن ، (قصی) بۆ دابینکردنی ئەم میوانداریە ، باجی لەسەر ماڵ و موڵکی قوڕەیش دانابوو ، بە نرخەکەی ئەو خواردنەی دابین دەکرد بۆ حاجیان ، بە تایبەتی ئەو کەسانەی لێیان دەخوارد کە بژێویان لاوازو نەدار بوون[4].

---

[1] / ابن هشام ١/١٢٤-١٢٥
[2] / ابن هشام ١/١٢٥. محاضرات تأريخ الأمم الإسلامية . نووسینی الخضري ١/٣٦، وة (أخبار الكرام) ل ١٢٥ .
[3] / محاضرات تأريخ الأمم الإسلامية ، نووسینی الخضري ١/٣٦
[4] / ابن هشام ١/١٢٠ و دوای ئەوە .

(قصى) خاوەنى هەموو ئەمانە بوو ، (عبد المناف)ى كوڕى هەر لە ژيانى خۆيدا شانو شەوكەتى پەيداكرد ، هەروەها (عبد الدار بكره)ش كە براى بوو ، جارێكيان (قصى) پێى ووت : دەتگەيەنم بەم خێڵە ، بائەوان لەتۆ زياتريش بن ، وەسيەتى كرد كە هەرچيەكى هەيە لە بەرژەوەندييەكانى قورەيش بيدرێتى ، (دارالندوه) و (دەرگاوانى) و (ئالآ) و (زێوانى) و (ميواندارى) پێبەخشى ، (قصى) لە ژيانيدا هيچ كارێكى (عبد المناف)ى ڕەت نەدەكردەوە ، كاروفرمانەكانى هەر لە ژيانى خۆيدا وەكو دينێكى پيرۆزى لێهات، كە (قصى) لەناوچوو ، كوڕەكانى برياريااندا هيچ ناكۆكيەكيان لەنێواندا نەبێت ، بەلآم كە (عبدمناف) مرد كوڕەكانى لەگەڵ ئامۆزاكانياندا كە كوڕى (عبدالدار) بوون كرديانە كێبڕكێ لەسەر پلەوپايە ، لێرەوە قورەيش بوو بەدوو تاقمەوە، خەريكبوو شەڕ لەنێوانياندا بقەومێت ، بەلآم سوڵحيان كردو پلەو پايەكانيان لەنێوان خۆياندا دابەش كرد ، (زێوانى) و (ميوانداريى) درايە دەست كوڕانى (عبد مناف) ، (دارالندوه)و (ئالآ)و (دەرگاوانى) يش كەوتەدەست كوڕانى (عبدالدار)، پاشان كوڕانى (عبدمناف) تيروپشكيان كرد بۆ (هاشم)ى كوڕى (عبدمناف) دەرچوو ، بەدرێژايى تەمەنى (هاشم) زێوانى و ميوانداريى حاجيانى دەكرد ، كە مرد (مطلب)ى براى چووە جێگەكەى ، دواى ئەو (عبد المطلب)ى كوڕى (هاشم)ى كوڕى (عبد مناف) باپيرى پێغەمبەر ﷺ چووە جێگەكەى ، بەوشێوەيە كوڕانى ئەوكارەيان دەكرد، هەتا ئەو كاتەى ئيسلام هات سەروكارى كابە بەدەست (عباس)ى كوڕى (عبد المطلب)ەوە بوو [1].

جگە لەو دەسەلآتانە ، قورەيش كۆمەڵێك دەسەلآتى ترى بۆ خۆى پاوەن كردبوو، لەنێوان خۆيان دەوڵەتێكى بچوكيان دروست كردبوو يان بە دەستەواژەيەكى ڕاستتر نيمچە دەوڵەتێكى ديموكراتى ، كۆمەڵێك دەزگاو دامەزراوى حكوميى تێدابوو وەك شێوازى پەرلەمانى ئێستاو دام ودەزگاكانى ، ئەوەش نمونەيەك لەو پلەوپايانە :

(١) (إيسار) واتە دانانى تيروپشك بۆ (إستقسام) قيسمەت وەرگرتن ئەم كارەيان بە دەست (بنى جمح)ە وە بوو .

---

[1] / هەمان سەرچاوە .

(٢) ماڵ و سامان کۆکردنەوەو دەست بەسەراگرتنی بەمەبەستی ڕێکخستنی (نذر) و (قربات) کە بۆ بتەکانیان تەرخان کرابوو ، هەروەها چارەسەری کێشەکان خەڵك و دادبینی ، ئەمەیان کاری (بنی سهم) بوو .

(٣) شورا ، لەناو خێڵی (بنی أسد)دا بوو .

(٤) (الأشناق) واتە ڕێکخستنی کاری خوێن خۆش کردن بەپارەو دانانی باج ، ئەویش لەناو خێڵی (بنی تیم)دا بوو.

(٥) (العقاب) واتە هەڵگرتنی ئاڵای خێڵ ، ئەمەش لەناو خێڵی (بنی أمیه) دابوو.

(٦) (القبه) واتە ڕێکخستنی کاری سەربازی و سەرکاری وولاّخ وئەسپی جەنگی ، ئەوەش بەدەست خێڵی (بنی مخزوم)ە وە بوو.

(٧) (السفارە) وەکو باڵوێزی ئێستا لەناو (بنی عدی)دا بوو[1] .

---

[1] / / تاریخ ارض القرآن ٢/١٠٦،١٠٥،١٠٤.

## فەرمانڕەوایی لەناوچەکانی تری عەرەبنشیندا

پێشتر باسی کۆچی خێڵە قەحتانی و عەدنانیەکانمان کردو ، ووتمان کە ناوچە عەرەبنشینەکان لەنێوان خۆیاندا دابەشبوون ، خێڵەکانی نزیك (حیرە) سەر بەمەلیکی (حیرە) بوون کە عەرەب بوو ، ئەوانەشیان کە لە شام بوون سەر بە (غەسان) یەکان بوون ، ئەم وابەستەییەش کردەیی نەبوو بەڵکو زیاتر شەکڵی و ڕواڵەتی بوو ، ئەو خێڵانەش لەناو قوڵایی بیاباندا ئازاد بوون ، هەموو ئەو خێڵانەش خێڵێك بەڕێوەی دەبردن ، خێڵ حوکومەتێکی بچوك بوو، بنەمای قەوارەی سیاسیان بریتی بوو لە یەکێتی دەمارگیری ، بەرژەوەندی هاوبەش بۆ پاراستنی زەوی و خاك و پاراستنی لە دەستدرێژی خەڵك.

سەرۆکی خێڵەکان لەپلەی مەلیکدا بوون لەناو شوێنکەوتوانیاندا ، هەموو خێڵ لە شەڕو ئاشتیدا بەگوێی سەرۆکەکەیان دەکردو بۆساتێکیش لەقسەی دەرنەدەچون ، سەرەك خێڵ ئەوەندە لە حوکمدا تاکڕەوبوو بەئەندازەی دکتاتۆرێکی بەهێز ، کە توڕە دەبوو هەزاران شمشێر بەدەست لەگەڵیدا تووڕە دەبوون بێ ئەوەی پرسیار بکەن هۆی توڕەبوونەکە چییە ، هەندێ جاریش کێبڕکێی نێوان ئامۆزاکان وای دەکرد کە لەڕووی خەڵکیدا کاری باش بکەن وەکو، بەخشندەیی‌و ڕێزگرتنی میوان و سەخاوەتمەندی و ئارامی و ئازایەتی نواندن و بەرگری کردن لەخەڵکی ، ئەمانەش بۆئەوە بوو خەڵکی بە چاکە باسیان بکەن و سوپاسیان بکەن ، بەتایبەتی شاعیرەکان کە زمانحاڵی خێڵ بوون لەو زەمانەدا، بەشێوەیەك پلەوپایەیان تائاستی ڕکەبەرەکان بەرز دەبۆوە.

سەرکردەو پیاوماقوڵەکان مافی تایبەتیان هەبوو، لە هەموو تالانی و دەسکەوتێکی جەنگی چواریەکیان دەبردو هەرچییەکیشیان بە دڵ بوایە پێش دابەش کردن دەستیان بەسەردا دەگرت ، هەر تالانیەکیش پێش گەیشتن بەناو جەرگەی خێڵەکەی تر دەست بکەوتایە دەبووە موڵکی ئەوان ، هەر جۆرە تالانیەکیش بەکەڵکی دابەش کردن نەهاتایە هەر بۆ سەرۆك خێڵ دادەنرا وەکو وشترو ئەسپ وشتی تر. شاعیرێکی عەرەب بە سەرەك خێڵەکەی دەڵێت:

لك المربـــاع فينـــا والصفـــايـــا وحكمك والنشيطـــة و الفضـــول[1]

---

١ / ئەی سەرەك خێڵ (مرباع)ی ئێمەو (صفی)و (حوکم)و (نشیطة)و (فضول) هەرهی تۆیە، مرباع: چواریەکی تالانیە، (صفی) هەرتالانیەك پێش دابەشکردنی بەئارەزووی سەرۆك خێڵ هەڵبژێرێت، (النشیطة) تالانی پێش گەیشتن بە ناوجەرگەی خێڵ، (فضول) تالانیەکە لەتواناد نەبێ دابەش بکرێ وەکو ووشترو ئەسپ.

## بـاردۆخـی سیـاسـی

باســی فــەرمانڕەوا عەرەبــەکانمان کــرد ، ئێســتاش باســی بــاردۆخی ڕامیاریان دەکەین ، هەرسێ ناوچە هاوسنوورەکەی بێگانە لە ڕووی سیاسیەوە لە حاڵەتی دارمان و هەرەسی تەواودا بوون ، خەڵکی بووبوون بەدوو چینەوە (ئاغا) و (کۆیلە) ، یان دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات ، ئاغایان بەتایبەتی بێگانەکان هەموو دەستکەوتێك بۆ ئەوان بوو ، کۆیلەکانیش هەرچی باری نەهامەتی‌یە لەسەر شانیان بوو ، بە دەستەواژەیەکی تر خەڵکی بوو بوونە مەزرایەك و بەروبومیان بۆ حوکمدارەکان بەرهەم دەهێنا ، ئەوانیش لەئارەزوو شەهوەتبازیدا بەکاریان دەهێنا و زوڵمیان پێ دەکردو دەستدرێژیان پێ دەکردە سەر خەڵك ، خەڵکیش لە کوێرەوەریدا گێنگڵیان ئەدا ، باری نەهامەتی‌و ستەمەیەك لەدوای یەکەکان بەسەریاندا دەباری و نەیان دەتوانی سکاڵاوگازەندە بکەن ، زوڵم و ئازارو ئەشکەنجەی هەمەجۆر بێزاری‌کردبوون ، چونکە دەسەڵات تاکڕەوی بوو ، مافەکان ژێرپێ خرابوون ، خێڵە دراوسێکانی ناوچەکە لەناو شەپۆلی خواست و ئارەزوەکانیاندا ئەمسەرو ئەوسەریان دەکرد ، جارێك دەیاندایە پاڵ خەڵکی عێراق ، جارێکی تر بایان دەدایەوە بەلای خەڵکی شام دا، لەناوجەرگەی دورگەی عەرەبیشدا خێڵەکان پەرتەوازەو پەرشوبڵاو بووبوونەوە، شەڕی خێڵ و تیرەگەرێتی هەناوی خواردبوون، هەروەکو شاعیرێکیان وتوویەتی:

وَما أنــا إلا مِنْ غُــزِيَةِ إنْ غَــوَتْ     غَوَيْتُ وَإنْ تَــرشُدْ غُــزِيَةُ أرشُــدِ *

مەلیکێك نەبوو پشتیوانی لەو سەربەخۆییەیان بکات ، یان هیچ مەرجەعێکیان نەبوو کە لەکاتی لێقەوماندا پشت و پەنایان بدات و بەهانایانەوە بچێت .

حوکومەتی حیجازیش لەلایەن عەرەبەوە بەچاوی ڕێزەوە سەیر دەکرا ، زیاد لەوەش جگە لەسەرکردەیەك وەکو زێوان و کلیلدارێکی ئایینی سەیریان دەکردن ، لەڕاستیدا ئەو حکومەتە تێکەڵەیەکی دووسەرە بوو لەنێوان سەرۆکایەتی دنیایی و سەرۆکایەتی ئایینیدا ، بەناوی ئایینەوە حوکمی عەرەبی دەکرد لەبەردەم

* / واتە: من هیچ نیم جگە لەتاکێکی خێڵی(غزیە) شوێنی ئەو کەوتووم. ئەگەر خێڵی(غزیە) سەری لێ بشێوێت منیش سەرم لێدەشێوێت. خۆ ئەگەر خێڵی(غزیە) سەرفرازو هۆشمەند بن منیش وەك ئەو سەرفرازو هۆشمەند دەبم.

حاجیان و دیدەنیکەرانی کابەدا خۆی بەحوکمداری حەرەم دادەناو سەرپەرشتی کارو فرمانی دەکردن ، شەریعەتی ئیبراهیمیان ﷺ جێبەجێ دەکرد ، وەکو پێکهاتی ئێستای پەرلەمان دامودەزگایان دامەزراند بوو بەڵام ئەم حکومەتە لاوازو بێ دەسەڵات بوو نەیدەتوانی بەئەرکەکانی خۆی هەستێت ، ئەمەش بەئاشکرا لە شاڵاوی حەبەشیەکاندا دەرکەوت.

## ئاایینەکانی عەرەب

لەکاتێکدا کە ئیسماعیل ﷺ بانگەشەی عەرەبی کرد بۆ ئاایینیەکەی باوکی ﷺ ، زۆرینەی عەرەبەکان بەدەمیەوە هاتن و خوای تاك و تەنهایان دەپەرست و ملیان بۆ کەچ کرد ، رۆژگارێکی زۆر بەسەریاندا گوزەرا ئەوەی بیستبویان لە بیریان چوەوە ، بەلاّم یەکتاپەرستی و هەندێك دروشمی ئاایینی ئیبراهیمیان تێدا مابوو ، هەتا ئەوکاتەی (عەمر)ی کوڕی (لحی) سەرۆکی (خزاعە) هاتە ناویان ، ئەم کابرایە زۆر چاکەخوازو خێرکەرو وابەستەی کاروباری ئایین بوو، بۆیە خەڵکی خۆشیان ویست ، ملیان بۆ کەچ کردو وایاندەزانی کە ئەم پیاوە زانایەکی بەرزەو یەکێکە لە وەلیەکان ، پاشان (عەمر) سەفەرێکی کرد بۆ شام ، سەیری کرد ئەوان بت پەرستن ، ئەمیش بەچاکی زانی ، چونکە وولاّتی شام مەنزڵگای هاتنە خوارەوەی کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ، بۆیە بتێکی بەناوی (هبل) لەگەڵ خۆیدا هێنایەوەو لەناوەڕاستی کابەدا داینا ، دوای ئەوە کەوتە بانگەشەکردنی خەڵکی مەککە بۆ بت پەرستی، ئەوانیش هاتن بەدەمیەوەو شوێنی کەوتن ، پاشان خەڵکی (حیجاز)یش شوێن مەککەییەکان کەوتن ، چونکە ئەوان چاودێری کابەو خەڵکی حەرەم بوون.[1]

(مناة) لەکۆنترین بتەکانیان بوو ، لەناوچەی (مشلل) بوو لەسەر کەناری دەریای سوور لەنزیك (قدید)ەوە ، پاشان خەڵکی (طائف) (لات) یان هەڵبژارد ، (وادی النخلە)ش (عزی)یان کردە خوای خۆیان ، ئەم سیانە گەورەترین بت بوون ، پاشان بتپەرستی زیادی کرد، بت و بتخانە ژمارەیان لە (حجاز)دا هەمووجێیەکی گرتەوە ، دەگێڕنەوە گوایە (عەمر) لەلایەن پەریەوە هەواڵی پێدراوە کە بتەکانی

[1] / کتیبی (مختصر سیرة الرسول) ، نووسینی شێخ (محمد عبد الوهاب) ل ١٢

خێڵی نوح عليه السلام (وەد)و (سواع)و (یغوث)و (یعوق)و (نسر) لە (جدە) کراون بەژێر گڵەوە هات و دەریهێنان و بردنی بۆ (تهامە)، کەوەرزی حاجیان هات هەریەکەیانیدا بە خێڵێك و بردیانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان ، ناوچەکە وای لێهات هەموو ماڵێك بتێکی تێدابوو، مزگەوتی (حەرام)یان پڕ کردبوو لە بت ، کە پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەککەی کرد لە دەوروبەری کابەدا (٣٦٠) بتی لێبوو ، هەموویانی خست و پاشان فەرمانیدا فڕێ درانە دەرەوە و سوتێنران [1].

بەو شێوەیە شیرك وبتپەرستی بوونە دیارترین سیمای ئایینی خەڵکی سەردەمی نەفامی، ئەو خەڵکە نەفامە وایاندەزانی هێشتا لەسەر ئایینی ئیبراهیمن.

عەرەبە موشریکەکان دابونەریت و مەراسیمی تایبەتیان هەبوو لەبت پەرستیدا ، زۆربەیان (عەمر) دای هێنابوون ، عەرەبەکان وایاندەزانی هەرچی (عەمر)ی کوڕی (لحی) دای بهێنێت بیدعەیەکی چاکەو دەستکاری کردنی دینی ئیبراهیم نییە ، ئەمەش چەند شێوەیەکە لە ڕێ و ڕەسمی بتپەرستی :

(١) پەنایان بۆ ئەو بتانە دەبردو بەندایەتیان بۆ دەکردن ، هاواریان بۆ دەبردن ، نزاو لالانەوەیان لەبەردەمدا دەکردن لەکاتی پێگیراندا ، بۆ پێویستی ڕۆژانە داوایان لێ ئەکردن ، بڕوایان وەهابوو ئەو بتانە لای خوا تکایان بۆ دەکەن ، ئاواتەکانیان بۆ بەدی دەهێنن.

(٢) لە دورەوە حەجیان بۆ دەکردن و تەوافیان بەدەوردا دەکردن ، ملیان بۆ کەچ دەکردن و سوژدەیان بۆ دەبردن .

(٣) چەندین جۆر قوربانیان بۆ سەر دەبڕین ، بەمەبەستی نزیك بوونەوە ، بەناوی ئەوانەوە ئاژەڵەکانیان سەردەبڕی و دەیانکردە قوربانی ، ئەم دوو جۆرە سەر بڕینە، خوای گەورە لەقورئاندا باسی فەرمووە ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ المائدة/٣ [2] ، هەروەها ئایەتی ﴿ وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ الأنعام: ١٢١ [3].

(٤) جۆرێکی تری خۆ لەخوا نزیك کردنەوە ئەوەبوو، هەندێك خواردن و خواردنەوەیان تەرخان دەکرد بۆ بتەکانیان ، هەروەها هەندێك بەروبومی

---

[1] / کتێبی (مختصر سیرة الرسول) ، نووسینی شێخ (محمد عبد الوهاب) ل ١٣، ٥٤،٥٢،٥١،٥٠.

[2] / واتە : ئەو ئاژەڵانەی لەبەردەم بتەکاندا و بۆ ئەوان سەر بڕرابێ.

[3] / واتە لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە.

ئـاژەڵ و کشـتوکاڵیان بـۆ دادەنـان ، بـۆ خۆشـیش بەشـێکیان دادەنـا بـۆ پـەروەردگار! زۆربـەی جـار بەهـەر هۆیـەك شـتێك بۆخـوا بووبێـت دەیانـدا بەبتەکانیان ، بەڵام شتێك بۆ بتەکانیان دانابێت نەیان ئەدا بەخوای گەورە! خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ مِمِّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعَامِ نَصِيبًا فَقَالُواْ هَذَا لِلّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَذَا لِشُرَكَآئِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلاَ يَصِلُ إِلَى اللّهِ وَمَا كَانَ لِلّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَى شُرَكَآئِهِمْ سَاء مَا يَحْكُمُونَ﴾ الأنعام/ ١٣٦ [1].

(٥) نەزرکردن جۆرێکی تر بوو لەخۆ نزیك کردنەوە، ئەویش نەزر کـردن لـە بـەروبوم و ئاژەڵدا ، ﴿ وَقَالُواْ هَـــذِهِ أَنْعَامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لاَّ يَطْعَمُهَا إِلاَّ مَن نّشَاء بِـــزَعْمِهِمْ وَأَنْعَامٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَامٌ لاَّ يَذْكُرُونَ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهَا افْتِرَاء عَلَيْهِ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾ الأنعام/١٣٨ [2].

(٦) ئەو قوربانیانە (**بحيرة**)و (**سائبة**)و (**وصيلة**)و (**حام**) بوو، (ابن إسحاق) دەڵێت:

(**بحـيرة**) ڕۆڵـەی سائبەیە ، کە بریتـی‌یە لـە وشـترێك دوای دە وشـتری مـێ هاتبێت بێ ئەوەی نێریان تێدابێت ، ئەم وشترە نە کەس سواری بـووە ، نـە تـووکی براوەتەوە ، جگە لە میوان کەس شیرەکەی نەخواردوە ، هەرچی مێیەك دوای ئەوە دروست ئەبێت گوێی کەل دەکەن ، پاشان دەخرێتە دوای دایکی ، ئەمـە (**بحـيرة**)ی کچی (**سائبة**)یە ،

(**وصـيلة**)ش مـەڕێکی مـێیـە بـە (٥) سـك مـێی بـوو بێـت و لەنێویانـدا نێـر نـەبێت پێـی دەڵـێن (**وصـيلة**) دوای ئـەوە هەرچـی لـەدایك دەبێـت تـەنها نێرینـە لێـی دەخوات مەگەر مێیەك مردار بوایەتەوە ئەوجا نێرومێ لێیان دەخوارد.

(**حام**)یش وشـترێکە (دە) بێچووی مێینـەی لەسـەریەك بوو بێـت بـێ ئـەوە نێرینەیان لەنێواندا هەبێت و پشتی ئەستور بووبێت بۆ بار ، نەبڕابێتـەوە ، بەڕەڵڵا کرابێتە ناو ووشترگەلەکەی ، لەو بارەیەوە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ مَا جَعَلَ اللّهُ

---

[1] / واتـە: لـە بـەروبووم و ئاژەڵـەکانیان پشکیان بۆ خوا دانابوو، بەحسابی خۆیان دەیانووت ئەمـەیان بۆ خـواو ئەمەشیان بۆ بتەکانیان، ئەوەی بۆ بتەکانیان بوو ناگاتە لای خوا، ئەوەش بۆ خوایە هەردەچێ بۆلای بتـەکانیان، خراپ حوکمیان دەکرد.

[2] / واتـە: دەیـانوت ئەمانـە ئاژەڵ و بـەروبومن تـەنها بەکەسـێکی دەرخـوارد ئـەدەین خۆمـان ئارەزوومـان لێ بـێ، هەنـدێ ئاژەڵیشـیان سـواربوونی قەدەغـەبوو، هەنـدێ تریشـیان لـەکاتی سـەربڕیندا ناویخوایـان لێنـەدەهێنان، پێیانەوە هەڵدەبەست.

من بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ وَلَـكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ ﴾ المائدة/١٠٣، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَـذِهِ الأَنْعَامِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَى أَزْوَاجِنَا وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَاء سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ إِنَّهُ حِكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾ الأنعام/١٣٩ ، وە لەبارەی (انعام) شتی تریش وتراوە[1] ، ( سعيد)ی کوڕی (مسيب) دەڵێت: ئەم ئاژەڵانە بۆ (طاغوت)ەکانیان دادەنران[2] ، لە فەرموودەی (صحيح)دا هاتووە بە (مرفوع)یی کە (عمرو)ی کوڕی (لحی) یەکەم کەس بوو ئاژەڵی بەرەڵڵای تەرخان کرد بۆ بتەکان[3]، عەرەب ئەوکارەیان دەکرد لەگەڵ بتەکانیاندا ، بۆچونیان وابوو ئەوە لە خوایان نزیك دەکاتەوەو تکایان بۆ دەکات ، هەروەکو لەقورئاندا هاتووە ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ الزمر/٣، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَيَعْبُدُونَ من دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَـؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ ﴾ يونس/١٨.

عەرەب تیروپشکیان هەبووە (الأزلام) ، (زلم) دەفرێکە هیچ پشکێکی لەسەر نیە ، (ازلام) لەکاتی خۆیدا سێ جۆر بووە ، جۆرێکیان (بەڵێ) و (نا)ی تێدابوو ، هەرکارێکیان بویستایە وەکو سەفەر ، یان ژنهێنان ، ئەگەر (بەڵێ) بەدەستدا بهاتایە کارەکەیان دەکرد ، وەئەگەر (نا) بهاتایە ئەوا کارەکەیان دوا دەخست بۆ ساڵێکیتر و رایاندەکێشایەوە، جۆرێکی تریان (ئاو) و (خوێنبایی) تێدا بوو، جۆرێکی تریان (لە ئێوە) یان (لە غەیری ئێوە) یان (ملصق)ی تێدابوو، لەمەدا ئەگەر گومانیان لەوەچەو ئەسڵی هەرکەسێك ببوایە دەچونە لای (هبل) بە سەد ووشترەوە ، دەچوونە بەردەم خاوەن دەفرەکەو دەیاندایە ، ئەگەر (لە ئێوە) دەرچوایە دەبوە ناوەند، ئەگەر لە (غەیری ئێوە) دەرچوایە دەبووە هاوپەیمان ، ئەگەر (ملصق) دەرچوایە وەك خۆی دەمایەوە نەڕەچەڵەکی هەبوو نەپشتیوان[4].

(میسر) و (قداح)یش لەم کارەوە نزیك بوون و جۆرێك بوون لە قومارکردن ، بەو قومارە گۆشتی وشترەکانیان دابەش ئەکرد ، عەرەب باوەڕیان بەهەواڵدانی

---

[1] / ابن هشام ١/٨٩، ٩٠.
[2] / صحيح بخاري ١/٤٩٩
[3] / هەمان سەرچاوە.
[4] / محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية ، نووسينی (خضري بەگ) ١/٥٦، هەروەها / ابن هشام ١/١٥٢ ـ ١٥٣.

کـاهن وعـەراف و ئەستێرەناسـەکان هـەبوو، (کـاهن) بـەکوردی بـە – کـاهین– دەگوترێت (کولەوەنانی) : ئەوکەسە بوو هەواڵی داهاتووی گـەردوونی بـە خـەڵك دەداو دەیـوت غـەیب دەزانم ، هەنـدێك لـەو کاهینانـە دەیـانوت: جنۆکـەمان هەیـەو هەواڵمان دەداتێ ، هەندێکیان بانگەشەی زانینـی غەیبیان دەکـرد ، هەندێکیشـیان دەیـانوت: بـەهۆی پیشـەکی و سـەرەتای شـتەکانەوە دەتـوانن هـەواڵ بـدەن بـەو کەسەی کە پرسیاریان لێ دەکەن یان کارێك دەکـەن ئەمانـەیان (عـەراف) بوون ، بۆ نموونە:

عــەرافێك دەیـوت مـن دەزانم فـلانـــە شــت کـێ دزیویـەتی و لـەکـوێدا شـاردویەتیەوە ، (منجم – ئەسـتێرەناس)یـش ئـەو کەسـە بـوو کـە لـە ئەسـتێرەکان وورد ئەبوەوە ، کاتی جولانـەوەو دەرکەوتنی دەزانین و بۆ ئـەوەی هـەواڵی دونیـاو ڕووداوەکـانی گەردوون لـەداهـاتودا بـەخـەڵك ڕابـگەیەنێت[1]، باوەڕ کردن بەهـەواڵی ئەستێرەناسەکان باوەڕ کردنە بە ئەستێرەکان ، لە ئیمان بەئەستێرەوە باوەڕیان بە (انواء) هەبوو ، واتە هەڵهاتن و نیشتنی ئەستێرە لە بەرەبەیاندا ، دەیانوت: بەهۆی هەڵهاتنی فلانـە ئەستێرەوە باران باری ، یان بـەهۆی ئاوا بونی فلانـە ئەسـتێرەوە باران باری[2]، هەروەها (طيرة)یان هەبوو ، واتە ڕەشـبینی ، لـەوەوە هـاتبوو، ئـەهاتن باڵندەیەکـیان هەڵدەفرانـد، یـان ئاسکێکیـان، ڕاودەنـا ئـەگـەر بـەلای ڕاسـتدا بڕۆشتایە ، کارەکـەی خۆیـان دەکـردو بەباشـیان دەزانـی ، خـۆ ئەگـەر بەلای چەپدا هەڵبهاتایە ئـەوا وازیان لێ دەهێناو بەڕەشبینیەوە سەیریان دەکـرد، خۆ ئەگـەر لـە بەردەمیانـەوە بڕۆشـتایە، بەهـەمان شـێوە ڕەشـبین دەبـوون و دڵیـان دادەگـیرا، هەروەهـا بـە قـاچ هەڵواسـینی کەروێشکیان بەڕەشـبینی دەزانـی ، هەنـدێك ڕۆژو مـانگ و ئـاژەڵ و گـەڕەك و ژنیـان بـە شـووم دەزانـی ، باوەڕیـان بەتەنینـەوەی بـەلاّ هەبوو ، باوەڕیان وابوو کوژراو لەگۆڕدا ناحەسێتەوە هەتاکو تۆڵەی دەسەنرێتەوە ، ڕۆحی کوژراو دەبێتە بایەقوش و لـەچۆلەوانیدا ڕۆژانە دەخوێنێت و دەڵێـت: ئـاوم بدەنێ ، ئاوم بدەنێ ، کە تۆڵەی سەندرایەوە ئیتر دەحەوێتەوە[3].

---

[1] / مرقاة المفاتيح . شرح مشكاة المصابيح ٢/٢ ، ٣

[2] / (صحيح مسلم) بەشی (كفر من قال : مطرنا بالنوء ، كتاب الإيمان ٥٩/١)

[3] / صحيح البخاري ٨٥١/٢ ، ٨٥٧ . بەپەراوێزی ( شێخ ئەحمەد عەلی سەهارەنفوری)

خەڵکی سەردەمی نەفامی لەسەر ئەوحاڵەتە بوون و هەندێك لە پاشماوەی ئایینی ئیبراهیمیان دەست پێوە گرتبوو ، وەکو بەگەورە زانینی (بیت) و تەواف کردن و حەج وعەمرەو وەستان لە عەرەفەداو ، موزدەلیفەو هەدیەکردنی قوربانی و، بەڵێ لەو بوارە چەندین جۆر داهێنانیان کردبوو ، لەوانە قورەیش دەیان وت : ئێمە ڕۆڵەی ئیبراهیم و خەڵکی حەرەم و خاوەنی بەیت و دانیشوانی مەککەین ، ئەوەی مافی ڕەوای ئێمەیە ، ئەو مافە بۆ عەرەب ڕەوا نییە ، خۆیان ناونابوو (الحمس) جێگەیەکی تایبەتیان بۆ خۆیان دانابوو ، دەیانوت: ئێمە لە حەرەم ناچینە دەرەوە ، لەکێوی عەرەفە نەدەوەستان و (إفاضة) یان نەدەکرد ، بەڵکو بەجیا دەهاتنەوە بۆ (مزدلفە)و لەوێ (إفاضة) یان دەکرد ، ئەم ئایەتە لەسەر ئەوان هاتە خوارەوە ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ﴾ البقرة/١٩٩[1] ، واتە: ئەی خەڵکی قورەیش ئێوەش (إفاضة) بکەن هەروەکو خەڵك (إفاضة) دەکات.

هەروەها دەیانوت: پێویستە (حمس)ەکان لەکاتی (إحرام)دا شیری وشتر بخۆنەوەو چەورایی دروست نەکەن و نەچنە دەوارێکەوە لەتاڵی موو دروست کرا بێت و دەبێت نەچنە ژێر سێبەریشەوە ، ئەگەر چوونە ژێرسێبەر دەبێت بچنە ژێر سێبەری خانووی گڵەوە[2].

هەروەها دەیانوت: ئەوانەی کە دێن نابێت لەو خواردنە بخۆن لەکاتی ئیحرامدا، کەپێش ئیحرام بەستن هێناویانە ئەگەر بۆحەج یان بۆ عەمرە هاتبوون[3].

هەروەها ئەمریان دەکرد بەسەر خێڵەکانی تردا کە دەبێت بەجلی (حمس)ەوە (احرام) ببەستن و تەواف بکەن، ئەگەر هیچیان دەست نەکەوت ئەوا پیاوان بە ڕووتی و ژنانیش بەزنجیر بەندێکی کون کونەوە تەوافیان دەکرد ، ژنان لە تەوافدا دەیانوت :

اليوم يبدو بعضه أو كله          وما بدا منه فلا أحله

کە ژن و پیاو بەم شێوەیان دەکرد ، ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴾ الأعراف/٣١، واتە: ئادەمیزاد، لەتەواف و هاتووچۆی

---

[1] / ابن هشام ١٩٩/١ صحيح البخاري ٢٢٦/١
[2] / سەرچاوەی یەکەم ..
[3] / سەرچاوەی یەکەم

مزگەوتدا خۆتان جوانکەن ، ئەگەر پیاوێك یان ژنێك زاتی بکردایە بەو جلەی خۆیەوە تەوافی بکردایە کە پێوەی هاتووە بۆ مەککە ، ئەوا دەبوایە دوای تەوافەکە فڕێی بدات و کەسیش سوودی لێ نەدەبینی[1].

هەروەها لەکاتی (إحرام)دا قورەیش لە دەرگاوە نەدەهاتنە ماڵی خۆیان ، بەڵکو لە پشتی ماڵەکەیانەوە کونێکیان دەکردە دیوارەکەو لەوێوە هاتوچۆیان دەکرد ، ئەم ووشکی و خۆڕەتاندنەیان بەخواپەرستی و چاکە دەزانی ، ئەوە بوو قورئانی پیرۆز لێی قەدەغە کردن.

ئایینی شیرك و بتپەرستی و باوەڕبوون بەخورافەو شتی پڕوپوچ ئایینی زۆرینەی عەرەب بوو، جولەکەو گاورو ئاگرپەرست و سائبەکان توانیبوویان بێنە ناو خاکی عەرەبەوە.

جولەکە دوو ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو – کە بەلایەنی کەمەوە – لە دورگەی عەرەبیدا دەیانبینی:

یەکـــــەم: لەســەردەمی ڕزگــارکردنی فەلەســتینەوە بەدەســتی بــابلی و ئاشووریەکان جوولەکە کۆچیان کرد ، ئەو کۆچە بەهۆی فشارەوە بوو ، وولاتیان وێران و پەیکەرەکەیان بەدەستی (بوختەنەسر) لەساڵی (٥٨٧ پ.ن) تێکشکێنرا ، زۆربەیان کرانە کۆیلەو بران بۆ بابل ، هەندێکیان فەلەستینیان بەجێهێشت و چون بەرەو (حیجان)و لەبەشی سەرەوەیدا نیشتەجێ بوون[2].

دووەم : لە داگیرکردنی (فلسطين) لەلایەن ڕۆمەکانەوە دەست پێدەکات ، بە سەرکردایەتی (بنطس)ی ڕۆمانی لە ساڵی (٧٠) زاییندا ، لەئەنجامی ئەو فشارەدا لەسەر جولەکەو ڕوخاندنی پەیکەرەکەیان هەندێك هۆزی جوولەکە چوون بەرەو حیجاز ، لە (يثرب) و(خيبر) و(تيماء) جێگیر بوون ، گوندو قوللەو قەڵاو بینایان دروست کرد ، لە ڕێگەی ئەم کۆچەریانەوە ئایینی جوولەکە بەناو هەندێك هۆزی عەرەبدا بڵاوبوەوە ، بە شێوەیەك شان و شەوکەتی سیاسیان هەبوو پێش هاتنی ئیسلام و لەکاتی هاتنیدا ، کە ئایینی ئیسلام هات ، خێڵە ناودارەکانی جوولەکە بریتـی بـوون لـە (خيـبر) و (بنونضـير) و (المصـطلق) و (قريظـة) و (قينقـاع) ،

---

[1] / ابن هشام ٢٠٢،٢٠٣/١– صحيح البخاري ٢٢٦/١ .

[2] / (قلب جزيرة العرب) ل ١٥١.

(السمهودي) له (وفاء الوفا)دا (ل ١١٦) دەڵێت: ژمارەی تیرەو هۆزەکانی جوولەکە له (بیست) زیاتر بوون[1].

بەهۆی (تبان أسعد ابی کرب)ه وه ئایینی جوولەکە گەیشتە یەمەن ، ئەم پیاوه بۆ شەڕ بەرەو (یثرب) چوو بوو، لەوێ بوو بوو بەجولەکەو لەگەڵ خۆیدا دوو زانای جوولەکەی لە (بنو قریظة)ەوه هێنا بۆ یەمەن ، بەوهۆیەوه لە یەمەندا جوولەکایەتی بڵاوبۆوه، دوای خۆی کە (یوسف ذونواس)ی کوڕی بوو بە سەرداری یەمەن ، هێرشی کردە سەر گاورەکانی (نەجران)و بانگی کردن بۆ ئایینی جولەکە ، کە بەگوێیان نەکرد ، شیوێکی پڕ لەئاگری بۆ دروستکردن و ژن و منداڵ و گەورەو بچوك و پیرو گەنجی گاوری تێ فرێدا ، دەڵێن ژمارەی کوژراوەکان لە (٢٠ ـ ٤٠) هەزارە ، ئەم ڕووداوه لە ئەکتۆبەری ساڵی (٥٢٣) زاییندا ڕووی داوه[2]، قورئان لە سورەتی (البروج)دا بەشێك لەم کارەساتەی باس کردووه .

سەبارەت بەئایینی نەسرانی (گاورایەتی) لەڕێگەی داگیرکردنی (حەبەشە) و (ڕۆمەکان)ەوه بۆ وولاتی عەرەب هاتووه ، یەکەم داگیرکردنی یەمەن لە لایەن (حەبەشەوه) ه وه ساڵی (٣٤٠)ی زایین بوو، تا ساڵی (٣٧٨)ی زایین بەردەوام بوو[3] لەو زەمانەدا مژدەی ئایینی مەسیحی لەیەمەندا دەنگی دایەوەو بڵاوبوەوه ، لەو رۆژگارانەدا ، پیاوێکی خواپەرستی زاهیدی دۆعاگیرای خاوەن کەرامەت بەناوی (فیمیون) دێتە نەجران ، خەڵکی ناوچەکە بانگ دەکات بۆ ئایینی گاورێتی (مەسیحی) ، کە خەڵکی نەجران دەبینن پیاوێکی ڕاستگۆو دیندارە زوو بەدەمیەوه چوون و باوەڕیان بەئایینی مەسیحیەت هێنا[4].

کەحەبەشیەکان لەدژە کارەکانی (ذونواس)دا یەمەنیان داگیرکرد، ئەبرەهە توانی دەسەڵاتی تێدا دابمەزرێنێت و بەچالاکیەکی زۆرەوه ئایینی مەسیحی بڵاو بکاتەوه، ئەوەندە چالاکی زۆربوو (کابە)یەکی لە رکابەری (کابەی شەریفدا) لە یەمەن دروستکرد، بۆ ئەوەی ڕووی خەڵکی لەماڵی خوا وەرچەرخێنێت بەرەو یەمەن و (کابەی شەریفە)ش بڕوخێنێت ، ئەوەبوو خوای گەورە کردی بەپەندی زەمانە.

---

[1] / (قلب جزیرة العرب) ل ١٥١.

[2] / تفهیم القرآن ٢٩٧،٢٩٨/٦ ـ هەروەها (ابن هشام) ٣٦/٢٠،٢١،٢٢،٢٧،٣١،٣٥/١.

[3] / تفهیم القرآن ٢٩٧/٦

[4] / (قلب جزیرة العرب) ل ١٥١

هەروەها عەرەبە غەسسانییەکانی دراوسێی ڕۆمان بەهۆی هاوسێیەتی و نزیکیانەوە بوون بەمەسیحی ، لەگەڵ هۆزەکانی (تغلب) و (طیء)دا ، نەك هەر ئەوە ، بەڵکو هەندێك لە میرەکانی (حیرەش) بوون بە گاور.

سەبارەت بەئایینی ئاگرپەرستی تەنها لەناو ئەوخێڵە عەرەبانەدا هەبوو کە دراوسێ و نزیکی فارسەکان بوون ، لە عێراقی (عەرەب) و لە بەحرەین (الأحساء) و (هجر)و هەموو دراوسێ نزیکەکانیان لەکەناری کەنداوی عەرەبدا، هەروەها کۆمەڵێك پیاوی تریش لەسەردەمی دەسەلاتی فارسەکاندا چوونەسەر باوەڕی ئاگر پەرستی.

سابئی‌یەکانیش ، بەپێی قسەی ئاسەوارناس و لێکۆینەوە مێژوییەکان دەڵێن: ئەوە ئایینی کلدانیەکانی گەلی ئیبراهیم بوە ، زۆرێك لە خەڵکی شام سابئی بوون ، بەهەمان شێوە یەمەنی‌یە کۆنەکان، بەهاتنی ئایینی (جولەکە)و (مەسیحی) ی بونیادو بنەمای ئایینەکە کەوتۆتە لەرزین و لەسەرپێ نەوەستاوەو چالاکیەکانی خامۆش بۆتەوە ، بەلام هەندێکیان بەتێکەلاوی لەگەڵ ئاگرپەرستەکاندا مانەوە یان دراوسێیەتیان دەکردن ، لەوانە خەڵکی ڕەشەخاکی عێراق و کەنارەکانی کەنداوی عەرەب[1].

---

[1] / تاریخ ارض القرآن ٢/١٩٣-٢٠٨

## بــارودۆخــی ئــایینی

کاتێك ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات ، ئەوە حاڵی ئایینـەکانی عـەرەب بـوو ، هـەموو ئـەو ئایینانـە تووشـی لێـك هەڵوەشـان هـاتبوون و عـەمبارەپۆ بووبـوون ، موشریکەکان دەیانوت: ئێمـە لەسـەر ئایینی ئیبراهیمین ﷺ ، لەکاتێکدا کـە هـیچ پابەندی بنەما ڕەوشتی‌یەکانی ئەو ئایینـە نەبوون ، لادان و تاوانەکانیان گـەلێ زۆر بوو، بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار خورافەی ئایینی و داب و نەریتی بتپەرستەکانیان تێدا بـڵاو بووبـووەوە ، بەشـێوەیەك کاریگەریـەکی زۆری لەسـەر ژیـانی کۆمەڵایـەتی و سیاسی یان بەجێ هێشتبوو.

جولەکـەش دەسـتیان دابـوە ڕیابـازی و خۆسـەپاندن ، سـەرکردەکانیان کرابوونە خواو دەپەرستران ، دەستیان وەردەدایە کاروباری خەڵکی و لەسەر چپەی سـەرلێوان و خورپـەی دڵیشـیان سەرزەنشـتیان دەکـردن، هـەموو خـەمێکیان خـڕ کردنـەوەی ماڵ و سامان و سەرۆکایەتی بـوو ، با ئاینیش زایـەبێت و کـوفرو بـێ باوەڕی و سوکایەتی بەفەرمانە پیرۆزەکانی خوای تێدا بێت.

نەصرانیەتیش (مەسیحایەتی) یان (گاورایەتی) وەك بتپەرستی لێ هـاتبوو کـەس لێـی حـاڵی نـەدەبوو ، تێکەڵەیـەکی نامۆیـان لـەنێوان خـواو مرۆڤدا دروست کردبوو ، لەناخی عەرەبە دیندارەکاندا ئەم بۆچوونانە هیچ کاریگەریەکی نەبوو ، نە دەگونجان و نەیانـدەتوانی واز لـەژیانی خۆیـان بهێـنن بـۆ ئـەو ژیانـەی مەسـیحیەت داوایان لێ دەکات.

حـاڵی ئایینـــەکانی تـــری عـــەرەب وەکـــو موشـــریکەکان وەهـــابوو، بـــیر کردنەوەیـەکی هاوچەشـن بـوو، یـەك عەقیـدەیان هـەبوو، داب و نەریتیشـیان لەیـەك دەچوو.

## چەند دیمەنێک
## لە کۆمەڵگای عەرەبی
## سەردەمی نەفامیی

دوای قسەوباس لەسەر دورگەی عەرەبی و باری ئایین تێیدا ، ئەوە ماوە کە قسەیەك لەسەر باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕەوشتی بکەین ، بەکورتی لەسەر ئەوەش دەدوێین:

## باری کۆمەڵایەتی

لەناو عەرەبدا چەند ناوەندێکی هەمەچەشن هەبوو ، حاڵی هەندێکیان لە هەندێکی تریان جیابوو ، لەناو (أشراف)دا پەیوەندی پیاو لەگەڵ کەسوکاریدا لە بەرزترین پلەی پێشکەوتن دابوو، ژن ئازادی و ئیرادەیەکی سەربەخۆی هەبوو ، ڕێزی لێدەگیرا لەپێناویدا شیر هەڵدەکێشراو خوێن دەڕژێرا ، ئەگەر پیاوێك بیویستایە لەناو عەرەبدا پلەوپایەیەکی چاك و ڕێزێکی هەبێت ، دەبوایە زۆربەی کات گوتاری لەگەڵ ژندا بێت ، ئەگەر ژن خواستی لەسەربوایە خێڵەکانی لەسەر ئاشتی کۆ دەکردەوە ، یان فیتنەو ئاژاوەیەکی گەورەی تێدا دروست ئەکردن و دەیدان بە شەڕ ، لەگەڵ ئەمانەشدا بەبێ ململانێ پیاو سەرداری ماڵ بوو، خاوەنی بڕیاری کۆتایی بوو ، لەهەڵبژاردنی هاوسەردا دەبوایە ژن بێدەنگ بێت و لەقسەی کەسوکاری دەرنەچێت و لەژێر چاودێری ئەواندا شووی بکردایە ، ئەوەحاڵی (اشراف) پیاوماقوڵان بوو، لەناوەندەکانی تردا جۆرێك لەتێکەڵاوی هەبوو ، لەنێوان ژن و پیاودا ، دەتوانین بڵێین گەیشتبووە ئاستی بەدڕەوشتی و بەڕەڵلایی ، (ابو داود) لە عائشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ، کە ژن هێنان لەجاهیلیەتدا بەچوار شێوە بووە ، یەکێکیان بەوشێوەیە بووە کە ئێستا هەیە ، پیاوێك لەپیاوەکەی تر داوای خوشکەکەی یان کچەکەی دەکرد ڕازی دەبوو مارەی دەکرد ، جۆرێکی تر: پێی دەوترا ژن هێنانی (استبضاع) واتە: کاتێك ژن لە (عادە)ی مانگانەی خۆی پاك دەبۆوە ، پیاوەکە پێی دەوت بڕۆ لەگەڵ فلانە پیاو (بنوو) ، ئەو ماوەیە مێردەکەی نەدەچووە لای ، هەتا دەرئەکەوت کە ژنەکە دوو گیانە ، ئەوجا ئەگەر مێرد بیویستایە دەچووە لای ، ئەمەیان بۆیە دەکرد تاڕۆڵەیەکی وەجاخ زادەیان لێ بکەوێتەوە ، جۆرێکی تر لە هاوسەرێتی بریتی بوو

لەوەی ژمارەیەك لە پیاو (کەمتر لە دە کەس) دەچوونە لای ژنێك و هەموویان لەگەڵی دەنوستن ، ئەگەر سکی پڕ بوایەو منداڵەکەی ببوایە ، چەند ڕۆژێك چاوەڕوانیان دەکرد ، پاشان ژنەکە دەینارد بەدوای پیاوەکاندا ، ئەوانیش نەیاندەتوانی نەیەن ، ئەوسا ژنەکە پێی دەوتن: ئێوە دەزانن چیتان کردووە ، ئەمە ڕۆڵەی تۆیە فلانە کەس ، بە ئارەزووی خۆی یەکێکیانی هەڵدەبژاردو دەبو بەباوکی منداڵەکە ، جۆری چوارەمی هاوسەرگرتن بریتی بوو لەوەی کۆمەڵێك پیاو دەچوونە لای ژنێك و کاری سێکسییان لەگەڵ دەکرد ، ئەو جۆرە ژنانەش کە بەدخوو داوێن پیس بوون ، خۆیان بۆ هەموو کەسێك دەدا بەدەستەوە ، ئەمانە لەسەر دەرگایماڵەکانیان چارۆکەی سووریان هەڵواسی بوو بۆئەوەی بناسرێنەوەو هەر کەسێك بیویستایە بڕواتە لایان ، کە سکی پڕبوایە ئەو پیاوانەی کۆدەکردەوەو سەرناس (قائف)ی بانگ دەکرد ، (قافە) کەسانێك بوون شارەزایی یان هەبوو لەناسینەوەی ڕەگەزدا ، ئەویش لەهەر کامێکیان بچوایە دەیوت منداڵەکە هی تۆیە ، ئیتر بەناوی ئەوەوە بانگ دەکراو کابراش نکوڵی نەئەکرد ، کەخوای گەورە پێغەمبەری نارد ﷺ هەمووجۆرە هاوسەرێتیەکانی تری هەڵوەشاندەوەو تەنها ئەو هاوسەرێتییەی ئەمڕۆی ئیسلامی هێشتەوە[1].

هەندێجار لێواری شمشێرو نووکی ڕم ژن و پیاوی کۆدەکردەوە ، پیاوانی لە شەڕدا سەرکەوتوو ژنانی ژێرکەوتوانیان بۆ خۆیان حەڵاڵ دەکردو کۆیلەیان دەکردن ، ئەو منداڵانەی لەو جۆرە ژنانە دەبوو تاکۆتایی تەمەنیان لەکەو شوورەییان بەشوێنەوە بوو.

لەجاهیلیەتدا فرەژنی سنووریی نەبوو، دوو خوشکیان پێکەوە دەخواست ، باوەژنی خۆیان دەخواست کاتێك باوکیان تەڵاقی بدایە یان بمردایە (سورة النساء ٢٢-٢٣) تەڵاقیش بەدەست پیاوانەوە هیچ سنورێکی نەبوو[2].

زیناو بەدڕەوشتی ئەوپەڕی گرتبوو ، لەزۆربەی جێگەدا باوبوو، ناتوانین هیچ ناوەندو توێژێك جیابکەینەوە ، جگە لەهەندێك ژن و پیاوی ڕەوشت بەرز کە دەروونیان ئەوەی قەبووڵ نەدەکرد ، ژنە ئازادەکان کەمتر ئەو کارەیان دەکرد ،

---

[1] / أبو داود ، كتاب النكاح .
[2] / هەمان سەرچاوە، (باب) نسخ المراجعة بعد التطليقات الثلاث .

کارەساتەکە لە (کەنیزەك) دابوو، پێدەچێت زۆرینەی خەڵکی جاهیلی بەعەیبی نەزانی بێت ئەو فاحشەیە لەگەڵ جاریەدا بکات ، (ابو داود) لە (عمرو)ی کوڕی (شعیب)ە وە لە باوکیەوە ئەویش لەباپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: جارێکیان پیاوێك وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فلأنە منالْ کوڕی منە، چونکە لەجاهیلیدا لەگەڵ دایکیدا دروست بووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەو بارەیەوە هیچ سکالأیەك وەرناگیرێت لە ئیسلامدا ، کاروباری جاهیلیەت بەسەرچوو ، منالْ هی پەردەیە ، مرۆڤی بەدخوش دەستبەسەرە ، هەروەها ململانێی (سعد)ی کوڕی (أبی وقاص) و (عبد بن زمعە) لە بارەی کوڕی کەنیزەکەکەی (زمعە) وە کە ناوی (عبدالرحمن بن زمعە)یە دیارەو دەزانرێت [1].

پەیوەندی پیاو بەمناڵەکانیەوە چەند شێوەیەکی هەبوو، هەندێکیان دەیانوت:

إنما أولادنا بينن أكبادنا تمشي على الأرض

واتە: مناڵەکانمان لەناوماندا جگەرگۆشەمانن و بەسەر زەویدا دێن و دەچن.

هەندێکیان کچیان زیندە بەچاڵ دەکرد لەبەر ئابڕووچوون و هەژاریی ، کوڕیش لەبەر هەژاریی دەکوژران (قورئان (٦ـ ١٥١) (١٦ـ ٥٨) (١٧ـ ٣١) (٨١ . ٨) بەڵام ناکرێت بڵێن ئەوە نەریتێکی سەرانسەری بووە ، چونکە زۆر پێویستیان بە کوڕ هەبووە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن.

مامەڵەی پیاو لەگەڵ براو ئامۆزاو خێڵەکەیدا زۆر بەهێزو پتەو بوو ، ئەوان بۆ خاتری خێڵأیەتیو دەمارگیری هۆز دەژیان و دەمرن ، گیانی کۆبوونەوەو یەککرتن لەناو ڕۆڵەکانی خێڵێکدا زۆر بەهێزبوو، ئەوەش دەمارگیری زیاتر دەکردن بۆ ڕەگەزو خزمایەتی، لەسەر ئەو پەندە دەڕۆیشتن کەدەڵێت: (پشتیوانی لەبراکەت بکە ، زاڵم بێت یان مەزڵوم) بەو مانا ڕواڵەتی ئەو پەندەیان جێبەجێ دەکرد، کە دووربوو لەو چاکسازییەی ئیسلام کردی لەدەقەکەدا کە بریتیـیە لەرێگەنەدان بە زوڵم کردن لەکەسانی دیکە ، ململانێ لەسەر پلەوپایەو کورسی زۆرجار ڕۆڵەکانی یەك باوکیشی ئەدا بەشەڕ ، هەروەکو لە کێشەی نێوان (أوس و خزرج) و (عبس و ذیبان) و(بکر و تغلب) دا هەبوو .

---

[1] / ابو داود ، (باب) الولد للفراش .

پەیوەندی نێوان خێڵەکان بێ شیرازە لێکپچڕاو بوو، لەشەڕی یەکتریدا شەکەت بووبوون ، ترسان لە هەندێك داب و نەریتە هاوبەشەکانیان بەهۆی (ئایین) و (ئەفسانە) وە لەو شەڕەنگێزییەی کەم کردبوونەوە ، هەندێ جاریش (پشتیوانی لە یەك) و (پەیمان بەستن) خێڵە دژ بەیەکەکانی دەخستەوە یەك ، مانگە جەنگ تێدا حەرام کراوەکان گەورەترین ڕەحمەت و یارمەتی بوو بۆ ژیان و بژێویان.

بەکورتی، حاڵەتی کۆمەڵایەتی لەداکەوتنێکی ترسناکدا بوو، نەزانیی چوارلای تەنیبوون ، مرۆڤەکان وەك ئاژەڵ ملیان بۆ خورافات کەچ کردبوو ، ژن دەفرۆشراو دەکڕرا وەکو شمەك ، پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ پچڕابوو ، هەموو خەمێکی حوکومەتەکانیش ئەوەبوو گەنجینەکانیان پڕبکەن لەماڵ و سامانی ڕەعیەت ، یان جەنگ و هەرایان بۆ بنێنەوە.

## بـارودۆخـی ئـابـووری

بارودۆخی ئابووریش ، وابەستەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بوو ، ئەگەر سەیری بژێوی عەرەبەکان بکەین زیاتر ئەم حاڵەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ، بازرگانی گەورەترین هۆ بوو بۆ دەوڵەمەند بوون و دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیان ، یەك سەفەری بازرگانی بەبێ بەرقەراربوونی ئاشتی و.هێمنی هەرگیز نەدەکرا ، ئەوەش لە دوورگەی عەرەبیدا نەدەکرا مەگەر لە ڕۆژانی مانگە حەرامەکاندا ، لەم مانگانەدا بازاڕە بەناو بانگەکانی عەرەب دائەمەزرێنران وەکو (عکاظ) و(ذی المجان) و(مجنة) و هەندێکی تر.

لەبارەی پیشەسازیەوە عەرەب لەهەموو میللەتان دواکەوتووتر بوون ، هەرچی پیشەسازیەکیش لەناویاندا هەبوو وەك چنین و دروومان و پێستە خۆش کردن لەناو خەڵکی (یەمەن) و (حیرە) و دەوروبەری شامدا بوو، لەناو دوورگەی عەرەبیدا کشتوکاڵ و زەوی کێڵـیو ئاژەڵ بەخێوکردن هەبوو ، زۆربەی ژنانی عەرەب خەریکی ڕستن و چنین بوون ، بەڵام هەموو ئەو کەلوپەلانە لەبەردەم هەڕەشەی تالان و بڕۆی جەنگدا بوون ، ڕووتی و برسێتی و هەژاری دەردی زۆرینەی کۆمەڵ بوو.

## ڕەوشـــــت

نکوڵی ناکرێت لەوەی کە لەسەردەمی جاهیلیەتدا کۆمەڵێك ڕەوشتی نزم و خراپەی واهەبوو دژ بە هەموو عەقڵێکی دروست بوو، ویژدان قەبوڵی نەدەکرد ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك ڕەوشتی بەرزیان تێدابوو مرۆڤی جوان دەکردو مایەی سەرسامیو سەرسوڕمان بوو، لەو ڕەوشتانە :

١ـ **بەخشـــندەیی**: زۆر لەناوخۆیاندا شانازیان بەم خەسڵەتەوە دەکرد ، نیوەی شیعرەکانیان لەسەر ئەم خەسڵەتە ئەهۆنیەوە ، وەسفی خۆیان و خراپەی خەڵکی تریان تێدا دەوت ، جاری وادەبوو لەڕۆژێکی سەرماو سۆڵەو برسێتیدا پیاوێك میوانێکی دەهات ، هیچ لەماڵەکەیدا نەبوو بیداتیّ جگە لە وشترەکەی کە ژیانی خۆی وخێزانەکەی لەسەر وەستابوو، خەسڵەتی بەخشندەیی دەیگرت و وشترەکەی بۆ میوانەکەی سەر دەبڕی ، لەوەش گەورەتر زۆرجار بۆ خوێن خۆشکردنی چەندین باری قورس و ماڵ و سامانێکی زۆریان خەرج دەکرد ، بۆئەوەی دڵۆپێك خوێن نەڕژێت مرۆڤێك زایەنەبێت و بەمەشەوە فەخروشانازیان دەکرد بەسەرسەرکردەو سەرۆکەکانی تردا .

لەئاکامی بەخشندەیی خۆیاندا وەسفی (مەی) یان دەکرد ، نەك لەبەر زاتی (مەی) یەکە ، بەڵکو لەبەرئەوەی ڕێگەیەکەیە بۆ بەخشندە بوون لەسەر خودی خۆیان ، بۆیە بەداری مێویان دەوت (الکرم) ، بەو مەیەشیان دەوت کەلێی دروست ئەکرا (بنت الکرم) ، ئەگەر سەیری دیوانەکانی سەردەمی نەفامیی بکەیت چەند باسێکی گرنگ لەشانازی بەخۆوە کردن و وەسف و سەناکردن دەبینیت ، (عەنتەرەی) ی کوڕی (شداد)ی (عبسی) لە(معلقە) کەیدا دەڵێت:

وَلَقَدْ شربْتُ مِنَ الَمَدامَةِ بَعدَما رَكَدَ الهواجرُ بالَمَشُوف الُمعْلَمِ
بزُجاجَةٍ صَفَراءَ ذات أسِرَةٍ فُرِنَتْ بأزهَرَ بالشَمالِ مُفَدَمِ
فاذا شَرِبتُ فانني مُستَهلِكٌ مالي ، وَعِرضي وافرُ لم يُكْلَمِ
وإذا صَحَوتُ فما أقصِرُعن ندًى وكما علمْتِ شمائلي وتكرُمي

هەر لەئاکامی ئەو بەخشندەییەی کە هەیانبوو خۆیان بە قومارەوە سەرقاڵ دەکرد، چونکە وایاندەزانی ڕێگەیەکە بۆ بەخشندەبوون و هەرچیەکیان بیردایەتەوە

دەیانبەخشی بەهەژاران ، یان هەرپشکێکی سەرکەوتوان زیادبوایە دەبەخشرایەوە ، بۆیە دەبینی قورئان نکۆڵی لەهەندێك قازانجی قومارو مەی خواردنەوە ناکات و دەفەرموێت : ﴿وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ البقرة/٢١٩ واتە: بەڕاستی زیانیان لە سوودیان زیاترە .

٢ ـ **وەفاداری و ئەمەك شوناسی** ، وەفاداری وەکو ئایین دەستی پێوە دەگیرا ، بە لایانەوە ئاسان بوو بۆ وەفاداریی منالی خۆیان بکوژن و ماڵیان کاول بکەن ، لەو بارەیەوە ئەوەندە بەسە کە بەسەرهاتی (هانیء)ی کوڕی (مسعود الشیبانی) و (السموأل) ی کوڕی (عادیا) و (حاجب)ی کوڕی (زراره التمیمی) بزانین.

٣ـ **دەروون بەرزی و قەبووڵ نەکردنی زوڵم و ژێردەستەیی** ، لەئەنجامی ئەوەدا ئازایەتیەکی لەڕادە بەدەریان هەبوو ، غیرەت پەروەر بوون ، زوو هەڵدەچوون ، ووتەیەکیان بژنەوتایە بۆنی بێغیرەتیو ترسنۆکی و مل نەوی کردنی تێدابێت شمشێریان هەڵدەکێشاو شەڕیان دەکرد ، لەو پێناوەشدا چەندین جەنگ و هەرایان بەرپا کردووەو باکیان نەبووە لە هیچ قوربانیەك .

٤ـ **سەرڕاستی و بەدەمەوەچوونی کار**، ئەگەر نیازی هەرکارێکیان بکردایەو گەورەییان تێدا ببینیایە ، هیچ هۆیەك ساردی نەدەکردنەوە ، گیانیشیان لە مەترسیدا بوایە بەدەمیەوە دەچوون.

٥. **ئارامگرتن و لەسەرخۆیی و ئاغریی**، هەمیشە شانازیان پێوە دەکرد ، ئەم سیفەتەیان بەگەورەیی تێدا بوو زۆر ئازاو نەبەرد بوون لە جەنگدا.

٦ـ **وەك خەڵکێکی خێڵەکی و دەشتەکی سادەو بێ گرێ بوون**، بەجەنجاڵیەکانی شارستانێتی سەرقاڵ نەبووبوون و فڕوفێڵیان نەدەزانی ، دەرەنجامی ئەوەش ، ڕاستگۆیی و سپاردەناسی سیفەتیان بوو، حەزیان لەخیانەت و بێئەمەکی نەبوو.

دەبینین ئەم ڕەوشتە بەرزانە – لەگەڵ مەوقیعیەتی دوورگەی عەرەب لە جیهاندا – بوونە هۆی هەڵبژاردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەڵگرتن و لەئەستۆگرتنی پەیامی خوایی و سەرکردایەتی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگای بەشەریی، چونکە ئەو ڕەوشتانە هەرچەندە هەندێکیان لەکۆتاییدا ئەنجامی خراپیان هەبوو، بەلام لەکۆی

هەمویدا کۆمەڵێك ڕەوشتی بەنرخ بوون ، بەسوودێکی گشتی گەورەو دەگەڕانەوە بۆ کۆمەڵگا ئەگەر دەستکاریەکیان بکرایە ، ئەوەش ئیسلام لە ئەستۆی گرت .

لەوانەیە دوای وەفاداری بەسوودترین ڕەوشتی عەرەب نەفس بەرزی بیٚ لەگەڵ بەدەمەوە چوونی کارو ڕاپەڕاندنی ، چونکە ناکرێت شەڕەنگیزی و فەسادو خراپە ڕیشە کێش بکرێت و دادی لەجێگەدا بچێنرێت بەو سیفەتانە نەبێت.

بەدەر لەو سیفەتانە سیفەتی ڕەوشتی بەرزی تریان هەبوو لێرەدا جێگەی باس نی‌یە.

# ڕەچەڵەکی پێغەمبەر ﷺ و بنەماڵەکەی

## ڕەچەڵەکی پێغەمبەر ﷺ

**ڕەچەڵەکی پێغەمبەر سێ بەشی هەیە:**

بەشێکیان هەموو سیرەتناس و ڕەچەڵەك زانەکان یەکدەنگن لەسەری ، ئەوەش ئەو بەشەیانە کەدەگەڕێتەوە سەر (عدنان) ، بەشێکیشیان جێگەی ڕا جیایی یە ، هەندێکیان لەسەری وەستاون و هەندێکی تریشیان قسەیان لەسەرکردووە ، ئەمەشیان سەبارەت بەبەشی سەرەوەیە تا ئیبراهیم ، بەشێکیان گومانمان نی‌یە کە شتی هەڵەی تێدانیە ، ئەوەش هەواڵی پێش (ئیبراهیم) ، هەتا دەگاتە (ئادەم) ، پێشتر چەند ئاماژەیەکمان لەو بارەیەوە کرد ، ئەمەش درێژەکەیەتی:

**بەشی یەکەم :** موحەممەد ﷺ کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی (عبد المطلب)ە کە ناوی (شیبە)یە ، کوڕی هاشم کە ناوی (عمرو)ی کوڕی (عبدمناف)ە کە ناوی (المغیرە)یە ، کوڕی (قصی) کە ناوی (زید)ە ، کوڕی (کلاب)ی کوڕی (مرە)ی کوڕی (کعب)ی کوڕی (لؤی) کوڕی (غالب)ی کوڕی (فهر) ئەم پیاوە ناوی (قریش)ە ، خێڵی قوریش ناوەکەی لەوەوە هاتووە ، کوڕی (مالیك)ی کوڕی (النضر) کە ناوی (قیس)ە ، ی کوڕی (کنانە) کوڕی (خزیمە) کوڕی (مدرکە)، کە ناوی (عامر)ە کوڕی (إلیاس) کوڕی (مضر) کوڕی (نزار) کوڕی (معد) کوڕی (عدنان)ە[1].

**بەشی دووەم:** سەرەوەی عەدنان ، (عەدنان) کوڕی (اد) کوڕی (همیسع) کوڕی (سلامان) کوڕی (عوص) کوڕی (بوز) کوڕی (قموال) کوڕی (أبی) کوڕی (عوام) کوڕی (ناشد) کوڕی (حزا) کوڕی (بلداس) کوڕی (یدلاف) کوڕی (طابخ) کوڕی (جاحم) کوڕی (ناحش) کوڕی (ماخی) کوڕی (عیض) کوڕی (عبقر) کوڕی (عبید) کوڕی (الدعا) کوڕی (حمدان) کوڕی (سنبر) کوڕی (یثربی) کوڕی (یحزن) کوڕی (یلحن) کوڕی (ارعوی) کوڕی (عیض) کوڕی (یشان) کوڕی (عیصر) کوڕی (أفناد) کوڕی (إیهام) کوڕی (مقصر) کوڕی (ناحث) کوڕی (زارح) کوڕی (سمی) کوڕی (مزی) کوڕی (عوضة) کوڕی (عرام) کوڕی (قیدار) کوڕی (إسماعیل) کوڕی (ئیبراهیم) ؑ[2].

---

[1] / إبن هشام ١/١،٢ (تلقیح فهوم اهل الأثر) ٥،٦ . رحمة للعالمین ٢/١٣،١٢،١١ ج١ ، ٥٢.

[2] / شێخی عەلامە (احمدسلیمان المنصورفوری) ئەم بەشەی بەگێڕانەوەی کلبی نووسیوە، لەگەڵ (إبن سعد) بە لێکۆڵینەوەیەکی وورد ، رحمە للعالمین ٢/١٤، ١٧،١٦،١٥ لە سەرچاوەکانیشدا جیاوازیان زۆرە.

**بەشی سێیەم:** سەروی ئیبراهیم ﷺ ، کە کوڕی (تارح) کە ناوی (آزر)ە کوڕی (ناحور) کوڕی ساروع ـ یان ساروغ ـ کوڕی فالخ کوڕی (عابر) کوڕی (شالخ) کوڕی (أرفخشد) کوڕی (سام) کوڕی (نوح) ﷺ کوڕی (لامك) کوڕی (متوشلخ) کوڕی (أخنوخ) ـ کە دەڵێن ئیدریسە ﷺ کوڕی (یرد) کوڕی (مهلائیل) کوڕی (قینان) کوڕی (ئانوشە) کوڕی (شیت)ە کوڕی (ئادەم)ە ﷺ.

## بنەماڵەی پێغەمبەرێتی

بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ بەبنەماڵەی (هاشمی) ناسراوە ، بەهۆی (هاشم)ی باپیریەوە کەکوڕی (عبد مناف)ە ، کەواتە باباسێکی (هاشم)و ئەوانەی دوای ئەو بکەین:

١. هاشم ـ هەروەکو لەسەرەتادا ووتمان ـ چاودێرو زێوانی کابەی بەدەست بوو ، لەکاتێکدا کە (بنو عبدمناف) لەگەڵ (بنو عبدالدار) لەسەر دابەشکردنی پلەو پایەکان ڕێکەوتن ، (هاشم) پیاوێکی ناودارو دەوڵەمەند بوو، یەکەم کەس بوو شۆربای بۆ حاجیان دروست کرد ، ناوی (عمرو) بوو ، بۆیە ناوی نرا (هاشم) چونکە نان بدەیی بوو ، یەکەم کەسێك بوو کە کاروانی بازرگانی شام و یەمەنی ڕێکخست بۆ قوڕەیش لەم بارەیەوە شاعیرێك دەڵێت :

عمرو الذی هشم الثرید لقومه قوم بمکة مسنتین عجاف

سنت الیه الرحلتان کلاهما سفر الشتاء ورحلة الأصیاف

لەبارەی بەسەرهاتی ئەو پیاوەوە ، دەڵێن : جارێکیان بەبازرگانی چوو بۆ شام ، کە گەڕایەوە بۆ مەدینە (سلمی)ی کچی (عمرو)ی خواست کە یەکێك بوو لە (بنی عدی بن النجار) ، لەلای ژنەکەی مایەوە ، پاشان چوو بۆ شام ، ژنەکەی سکی بە(عبدالمطلب)ە وە پڕ بوو ، لەو سەفەرەدا (هاشم) لە (غزە)ی خاکی فەلەستین کۆچی دوایی کرد ، لە ساڵی (٤٩٧ زاییندا) (عبد المطلب) لە دایك بوو ، ناوی‌نا (شیبە) چونکە چەند تاڵێکی سپی لە سەریدا بوو[1] ، (سەلمی)ی دایکی لە یەثریب مایەوە لەماڵی باوکی‌دا بەخێوی کرد ، هیچ کەسێك لە کەس و کاری هاشم لە شاری (مەککە)دا بەمەیان نەدەزانی.

---

[1] / إبن هشام ٢،٣،٤/١ تلقیح فهوم اهل الأثر ل٦، پوختەی (السیر للطبری) ل٦، رحمة للعالمین ١٨/٢، سەرچاوەکان ڕاجیاییان هەیە لەناو بردنەکاندا بۆیە لە هەندێ سەرچاوەدا ناوەکان کەرتوون .

(هاشم) چوار کوری هەبوو کە بریتی بوون لە : (أسد) و (أبو صیفی) و (نضلة) و (عبدالمطلب).

لەگەڵ (٥) کچدا کە بریتی بوون لە : (شفاء) و (خالدە) و(ضعیفة) و (رقیه) و (جنه)[1].

٢ـ عبد المطلب ، پێشتر زانیمان کە چاودێری و زێوانی کابە لە دوای (هاشم) کەوتە دەست (عبدالمطلب)ی کوری (عبدمناف) ، ئەم پیاوە مرۆڤێکی بەرێزو پایەدار بوو قوریش ناویان نابوو (فیاض) چونکە زۆر نان بدە بوو، کاتێك (شیبە). عبدالمطلب ـ گەورەبوو، (المطلب) بیستیەوەو ناردی بەشوێنیدا ـ کەهات بینی چاوی پربوو لە ئاو ، باوەشی پێداکرد ، لەپشت خۆیەوە لەسەر ووڵاخەکەی داینا ، (عبدالمطلب) رازی نەبوو هەتا دایکی مۆڵەتی نەدا ، دایکیشی نەیویست بینیرێت . (المطلب) پێی ووت: ئەم کورە بۆلای ماڵ و موڵکی باوکی دەرواتەوە ، بۆلای (بیت الحرام) . ئەنجا مۆڵەتیدا، کە لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ مەککە لەپشت خۆیەوە سواری کردبوو خەڵکی ووتیان: ئەوە (عبد المطلب)ە ، ئەویش وتی: دایك رۆڵەرۆتان بۆ بکات ئەوە برازامە کوری (هاشم)ە ، (عبد المطلب) لای مایەوە ، هەتاکو پێگەیشت ، دوای ئەوە (المطلب) لە (بردمان)ە خاکی یەمەن مرد، (عبد المطلب) هاتە جێگەی، ئەوەی باوو باپیرانی دەیانکرد، ئەم لەوان زیاتری دەکرد ، پلەوپایەو ناودارییەکی پەیداکرد کەس پێش خۆی نەیبوو ، خەڵکی خۆشیان دەویست ، سامی لەدڵی خەڵکدا هەبوو[2].

کە (المطلب) کۆچیدوایی کرد، (نوفل) هەڵی کوتایە سەر (عبدالمطلب) و کەلو پەل و شمەکی ئەوی زەوتکردو بردی بۆ خۆی ، (عبدالمطلب)یش داوای کرد لە قورەیش پشتیوانی لێبکەن تا ئەو کەلوپەلە لەمامی بسەنێتەوە ، وتیان: ئێمە ناتوانین خۆمان فرێ دەینە نێوان تۆو مامت ، ئەنجا نامەی نووسی بۆ خاڵوانی لەخێڵی (بنی النجار)و بەچەند شیعرێك نامەیەکی بۆ هۆنینەوە ، خاڵەکەی (أبو سعد)ی کوری (عدی) و (٨٠) سوارەی لەگەڵ خۆیدا هێنا نەوەستان هەتا (أبطح)ی نزیك مەککە لەوێ دابەزین ، (عبدالمطلب) یان پێگەیشت ، پێی وت: خاڵە .. حەز

---

[1] / إبن هشام ١/١٣٧، رحمة للعالمين ١/٢٦، ٢/٢٤ .

[2] / إبن هشام ١/١٣٧، ١٣٨ .

دەکەم لە ماڵەکەم دابەزیت ، ئەویش وتی: نەخێر سوێندبێت هەتا بە(نوفل) نەگەم وازناهێنم ، کەوتەڕێ هەتا گەیشتە ئەنجومەنی قوڕەیش و ڕیش سپیانیان لەوێ بوون ، (نوفل) هەستایە سەرپێ ، (أبوسعد) شمشێری لێ هەڵکێشا ووتی : (نوفل)، سوێندبێت بەخاوەنی بەیت ئەگەر ئێستا ئەوکەلوپەلە نەدەیتەوە دەست ئەو خوشکەزایەم بەم شمشێرە ئەتکوژم ، (نوفل) وتی: هەمو کەلوپەلەکانم داوەتەوە بە(عبد المطلب) ، ڕیش سپیەکانی قوڕەیش شایەتیان بۆدا ، ئەنجا (أبوسعد) هاتە دەرەوەو لەماڵی (عبدالمطلب) دابەزی سێ ڕۆژ مایەوە ، عەمرەی کردو گەڕایەوە بۆ مەدینە ، کە ئەوە ڕوویدا ، (نوفل) پەیمانی بەست لەگەڵ (بنی عبد الشمس) کوڕی (عبدمناف) دژ بە (بنی هاشم) ، کەخێڵی (خزاعە)ش بینیان (بنی النجار) هاتن بە دەم (عبد المطلب)ە وە ، وتیان: چۆن کوڕی ئەوانە کوڕی ئێمەشە ، حەق وایە ئێمە زیاتر بچین بەهانایەوە -چونکە دایکی عبد مناف لەوانە - چوونە ناو (دار الندوە) پەیمانیان بەست لەگەڵ (بنی هاشم) دژ بە (بنی عبدالشمس) و (نوفل) ، هەر ئەم پەیمانە بوو لەئاکامدا بووە هۆی (فتح)ی مەککە ، هەروەکو لە دواییدا باسی دەکەین[1].

[1] / کورتەی کتێبی (سیرة الرسول) نووسینی (شێخ محمد عبد الوهاب) ل ٤١-٤٢.

## گـرنگـتریـن ڕووداوێك بەسەر ( عبد المطلب ) دا هاتبێت

## لەبارەی ( بیت )ە وە دوو شت بوو[1] :

**هەڵكەندنی بیری ( زەمزەم ) و ڕووداوی ( الفیل ) ،**

**خۆلاسەی یەكەم ئەوەیە :**

(عبـدالمطلب) لەخـەودا فـەرمانی پێكـرا لەشـوێنێكی دیـاریكراودا بیرێـك هەڵكەنێت ، دەستی كرد بەهەڵكەندن ، ئەوشتانەی تێدا دۆزیەوە كە لە كاتی خۆی (جـرهم) یـەكان تێیـدا حەشـاریان دابـوو وەكـو: (شمشـێرو قـەڵغان و دوو ئاسـكە ئاڵتونیەكـەو شمشـێرەكانی دا لـە دەرگـای كابـەو دوو ئاسكەكەشـی بەدەرگاكـەدا كـردو دەستی كرد بە دابەشكردنی ئاوی زەمزەم بۆ حاجیان ، كە ئاوی زەمـزەم دەركەوت قوڕەیش دەستیان كرد بە ململانێ لەگەڵ (عبـد المطلـب) داو پێیـان وت: بمانكە هاوبەشی خۆت ، وتی: قـەبوڵی ناكەم ، ئەمـە كـارێكی تایبەتـە بەخۆمـەوە ، وازیـان لێ نـەهێنا هـەتا بردیانـە لای فاڵگرەوەكـەی (بنـی سـعد) ، نەگەڕانـەوە هـەتا خوایگەورە ئەوەی نیشاندان كەئاوی زەمزەم تایبەتە بە (عبد المطلب)ە وە، لەوێدا (عبد المطلب) ئاهی كرد ئەگەر خوا (١٠) كوڕی پـێ ببەخشێت كە بتـوانن پشـتی بگرن ئەوا یەكێكیان لەپاڵ كابەدا بكاتە قوربانی.

**كورتەی ڕووداوی دووەم ئەوەیە :**

(ئەبرەهـەی سـەباحی حەبەشـی) جێگـەداری (نجاشـی) لەیەمەنـدا ، كاتێـك سەیری كرد خێڵەكانی عەرەب ڕوودەكەنە كابە ، كڵێسایەكی لە (صنعاء)دا دروست كرد ، بۆ ئەوەی ڕوویان لە كابە وەربگێڕێت ، كابرایەكی خێڵی (كنانـە) ئەمـەی بەر گوێ كەوتبوو ، چوو بووە ناو پەرستگاكەو پیسایی تێـدا كردبوو، كە ئەبرەهە بە مەی زانی ڕقی هەستا ، بە سوپایەكی زەبەللاحی شەست هەزار كەسیەوە بە نیازی ڕووخانـدنی كابـە كەوتـە ڕێ ، لـەناو سـوپاكەدا (٩) یـان (١٣) فیلـی تێـدا بـوو ، ئەبرەهـە سـواری فیلـە گەورەكـەیان بـوو كەوتـەڕێ تاگەیشتە ناوچـەی (مەغمـەس) لەوێدا سوپاكەی كۆ كردەوە ، فیلەكانی ئامادە كرد بۆ شاڵاوبردن و خۆشی سازدا بچێتە ناو مەككەوە ، لەكاتێكدا كە لە شیوی (محسر) دا بوون لـەنێوان (مزدلفە) و (منی)دا ، فیلەكە ڕۆیشت و ڕاست نەبۆوە بەرەو كابە ، كە ڕوویان پێدەكردە باكورو

---

[1] / إبن هشام ١/١٤٢.١٤٧.

باشور یان ڕۆژهەلات ڕای دەکرد کە ڕوویان وەردەچەرخاند بەرەو کابە چۆکی دادەدا ، لەو حاڵەتەدا هەموو فیلەکان مانیان گرتبوو ، خوای گەورە باڵندەیەکی زۆری نارده سەریان ، ووردە بەردی بەسەردا باراندن تەفروتووناى کردن وەکو کای خوراویان لێ هات ، باڵندەکانیش وەك پەڕەسێلکە وەهابوون ، هەرباڵندەیەك سێ بەردی هەڵگرتبوو ، بەردێك بە دەنووك ، دووبەردی وەك دەنکە نۆکیش بەقاچیانەوە ، بەر هەرکەسێکیان بکەوتایە پەلوپۆی دەشکاندو لەناوی دەبرد ، هەموویان بەرنەکەوتن ، زیندوەکان بەشپرزەیی تێکڕژان و ڕایانکرد شەپۆلیان ئەدا ، بەملاولادا دەکەوتن و هەڵنەدەستانەوە ، ئەبرەهەش (خوا) دەردێکی بۆ نارد سەرپەنجەکانی ڕزین ، کە گەیشتەوە (صنعاء) وەك جوجك بچوك بوو بووەوە ، دڵی وەستاو مرد.

قوڕەیش بەدەوروبەری شیوو دۆڵەکانی مەککە بلاوەیان کردبوو خۆیان دابووە پاڵ شاخەکان ، لە ترسی سوپاکە ، کە سوپاکە تەفرو تونا بوو ، ئەوانیش بە سەلامەتی گەڕانەوە بۆ ناو ماڵەکانیان[1].

ئەم ڕووداوە لەمانگی (محرم)دا بوو، پێش لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺ بە (٥٠) یان (٥٥) ڕۆژ - بەپێی ڕای زۆرینە- کەبەرامبەرە لەگەڵ سەرەتای مانگی مایسی ساڵی (٥٧١ز)دا، ئەمە نوقلانەیەکی خێربوو خوای گەورە بەخشی بەپێغەمبەر ﷺ و بنەماڵەکەی ، چونکە کاتێك سەیری (بیت المقدس) دەکەین دەبینین موشریکانی دوژمنی خودا هەلیان کوتایە سەر ئەم قیبلەیە ، لەکاتێکدا خەڵکەکەی موسڵمان بوون هەروەکو لەسەردەمی (بوختەنەسر)دا ڕوویدا ، ساڵی (٥٨٧ پ.ن) و ڕۆمەکانیش لەساڵی (٧٠ز) دا، بەڵام دەبینین (کابە) لەکاتێکدا کە جێنشینەکانی موشریك بوون کەچی نەسرانیەکان نەیانتوانی زاڵ بن بەسەریدا ، لە بارودۆخێکدا ئەم ڕووداوە ڕوویدا ، هەواڵەکە گەیشتە زۆرینەی شارنشینەکانی ئەوکاتە ، کە پەیوەندیەکی پتەویان لەگەڵ ڕۆمەکاندا هەبوو ، فارسەکانیش لەبۆسەدا بوون بۆیان وچاوەڕوانی چارەنووسی ڕۆمەکانیان دەکرد، دوای هەواڵەکە خێرا فارسەکان هاتن بۆ (یەمەن) ، ئەم دوو دەوڵەتە نوێنەرایەتی جیهانی شارستانیان دەکرد، ئەم ڕووداوە سەرنجی دونیای بەلای خۆیدا ڕاکێشاوەو بەڵگەی ئەو شەرەف و پیرۆزیە گەورەیە بوو کە خوا بەخشیویەتی بە (بیت الله) و

---

[1] / إبن هشام ٤٣/١ هەتا ٥٦ ، هەروەها (تفهيم القرآن) ٤٦٢/٦٦ هەتا ٤٦٩.

ئەوەش دەسەلمێنێت ئەوە تەنها ماڵێکی (مقدس)ە لەسەر زەویداو هەر کەسێکی خەڵکی ئەم (بیت)ە ، بانگەشە بۆ (نبوة) بکات جەخت لەسەر ئەو ڕووداوە دەکاتەوە ، ئەمە لێکدانەوەی فەلسەفەی شاراوەی خوایی‌یە بۆ پشتیوانی و پشتگیری کردنی خوای گەورە بۆ موشریکەکان و دژ بەکۆمەڵێك ئیمانداری مەسیحی بەشێوەیەك لەسەرو جیهانی دونیاوە بێت ، عبدالمطلب (١٠) دە کوڕی هەبوو ، بریتی بوون لە:

(حارث) و (زبیر) و (أبوطالب) و (عبدالله) و (حمزة) و(أبو لهب) و (غیداق) و(مقوم) و (صفار) و (عباس) ، گوتراویشە گوایە (١١) کوڕ بوون ، یانزە هەمیان ناوی (قثم) بووە ، هەندێکی تر دەڵێن (١٣) بوون ، (عبد الكعبه) و (حجل) یان بۆ زیاد کردوە ، وتراوە (عبدالكعبە) (مقوم)ە و ، (حجل)یش (غیداق)ە ، لەناو کوڕەکانیدا کەسێك نی‌یە بەناوی (قثم)ە وە ، (٦) کچیشی هەبووە: (أم الحكیم) - بیضاء . و (وبره) و (عاتکه) و (صفیه) و (أروی) و (أمیمه)[1].

٢- (عبدالله) باوکی پێغەمبەرە ﷺ ، دایکیشی (فاطمة)ی کچی (عمرو)ی کوڕی (عائذ)ی کوڕی (عمران)ی کوڕی (مخزوم)ی کوڕی (یقظة)ی کوڕی (مره)یە، (عبدالله) باشترین کوڕی (عبدالمطلب) بوو لە هەمووشیان خۆشەویستتر بوولای (عبدالمطلب) ، شۆرەتەکەی (ذبیح)ە ، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کاتێك کوڕی دەیەمی بوو ، زانی کە دەتوانن پشتی بگرن ، هەواڵی نەزرەکەی پێدان ، ناوی لە تیرو پشکەکاندا نووسین ، تیرەکەی لێدا ، بۆ عبدالله دەرچوو ، (عبدالمطلب) عەبدوڵڵای کوڕی بردو چەقۆیەکی هێناو بردیە بەردەم کابە بۆ سەربڕینی ، قوڕەیش و خاڵەکانی عەبدوڵڵا لەخێڵی (بەنی مەخزوم) و (أبو طالب)ی برای نەیانهێشت ، (عبدالمطلب) پێی وتن : چی بکەم لەنەزرەکەم ؟ وتیان: بڕۆ بۆلای ژنە فاڵگرەوەکەو پرسیاری لێ بکە ، ئەویش چووە لای ، فەرمانی‌دا کە تیروپشکەکە بۆ عەبدوڵڵا و (دە) وشتر بکرێت ، ئەگەر تیرو پشکەکە کەوتە سەر عەبدوڵڵا (دە) وشتری تری بۆ زیاد بکەن هەتاکو پەروەردگاری ڕازی دەبێت! ، ئەوجا ئەگەر کەوتە سەر وشترەکان با سەریان ببڕێت ، (عبدالمطلب) گەڕایەوە تیروپشکی کرد بۆ (عەبدوڵڵا) و (دە) وشتر ، کەوتە سەر (عەبدوڵڵا) ، ئەمەی دووبارە کردەوە هەمووجارێك لەسەر عەبدوڵڵا دەردەچوو ئەویش (دە) (دە) وشتری زیاد دەکرد ، کە وشترەکان ژمارەیان

---

[1] / بروانە (تلقیح فهوم أهل الأثر ) ل (٨،٩) هەروەها (رحمة للعالمین) ٥٦،٦٦/٢.

**گەیشتە (١٠٠) دانە ، تیروپشکەکە بۆ وشترەکان دەرچوو ، هەموویانی کردە قوربانی ، ئەنجا وازی لێ هێنان و نەیهێلا مرۆڤ و ئاژەڵی دڕندەیان لێ نزیك بێتەوە ، تا ئەوکاتە حەقی خوێنی مرۆڤ (دە) وشتر بوو لەناو قوڕەیشدا ، دوای ئەو ڕووداوە بوو بە (١٠٠) وشتر ، کە ئیسلامیش هات قەبوڵی کرد ، لە پێغەمبەریشەوە ﷺ دەگێڕنەوە ، فەرموویەتی : (انا إبن الذبيحين) واتە: من کوڕی هەردوو (ذبيح)ە کەم ، کە (إسماعيل) و (عەبدوڵلا)ی باوکیەتی[1] .**

**(عبدالمطلب) ، (ئامینە)ی کچی (وەهەب)ی هەڵبژارد بۆ هاوسەرێتی (عەبدوڵلا) ی کوڕی ، ئامینە لەو ڕۆژەدا بەڕێزترین ئافرەتی قوڕەیش بوو لەبنەماڵەو پلەی کۆمەلایەتیدا ، باوکی سەرۆکی (بني زهره) بوو خاوەنی بنەماڵەو ڕەچەڵەك و پلەوپایەوە بوو ، (عەبدوڵلا) لە مەککە ئامینەی گوێزایەوە ، پاش ماوەیەکی کەم (عبدالمطلب) ، عەبدوڵلای نارد بۆ مەدینە خورمایان بۆ بکڕێت ، لەوێ مردوە ، ڕیوایەتێکی تر دەڵێت ناردی بۆ بازرگانی بۆ وولاتی شام ، لەگەڵ کاروانێکی قوڕەیشدا بوو، کە لەمەدینە دابەزین نەخۆش کەوتوو ، هەرلەوێ وەفاتی کرد ، لە ماڵی (النابغة الجعدي) ئەسپەردە کرا بەپێی ڕایی مێژوونوسان ، لەوکاتەدا (عبدالله) تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو ، مردنەکەشی پێش لەدایك بوونی پێغەمبەر بووە ﷺ ، گێڕانەوەیەکیش دەڵێت: دوای لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺ بەدوومانگ وەفاتی کردووە[2] کەهەواڵی گەیشتەوە مەککە (آمنة) بەجوانترین شیعر بۆی لاوانەوە، ووتی:**

عفا جاب البطحاء من إبن هاشم ... وجاور لحداً خارجاً في الغماغم

دعته المنايا دعوة فأجابها ... وما تركتُ في الناسِ مثل إبن هاشم

عَشيّة راحوا يحملون سريره ... تعاوره أصحابه في التزاحُم

فإن تك غالته المنايا وريبها ... فقد كان معطاءً كثير التراحم[3]

**ئەوەی لە (عەبدوڵلا) بەجێما، (٥) وشترو، مێگەلێك و، کەنیزەکێکی حەبەشی بوو بەناوی (بەرەکە) شۆرەتەکەی (أم أيمن) ە ، ئەم ژنە دایەنی پێغەمبەر بوو ﷺ.[1]**

---

[1] / بڕوانە :(إبن هشام) ١٥١/١ تا ١٥٥، (رحمة للعالمين) ٢/٩٠،٨٩، (سيرة الرسول) نووسینی (شێخ عبدالله) ل ١٢ ، ٢٢ ، ٢٣ .

[2] / بڕوانە: إبن هشام ١٥٦/١ ـ ١٥٨، (فقه السيرة) نووسینی (الغزالي) ل٤٥، (رحمة للعالمين) ٩١/٢.

[3] / بڕوانە (طبقات ابن سعد) ٦٢/١.

# لەدایبك بوون و چل ساڵ پێش پێغەمبەرێتی

## (لەدایبك بــوون)

سـەروەری پێغەمبـەران ﷺ لەشیوی (بنـی هاشـم)ی مەككـە ، سـەرلەبەیانی دووشەممە (٩)ی ڕەبیعی یەكـەمی ساڵـی (فیل)ە كە لـەدایبك بوو ، چل ساڵ بوو سـەردەمی مـەلیكی كیسـرا (نەوشیروان) تێپـەڕی بـوو، ئـەو ڕۆژە بەرامبـەرە لەگـەڵ (٢٠) یان (٢٢)ی مانگی (چوار)ی ساڵی (٥٧١)ی زایین، بەپێی ئەو لێكۆڵینەوەیـەی زانـای گـەورە (محمـد سـلیمان المنصـورفوری) و لێكۆڵـەری بـواری گەردونناسـی (محمود پاشا) كردوویانە[٢].

(إبـن سـعد) دەگێڕێتـەوە كـە دایكـی پێغەمبـەر ﷺ وتویـەتی: كـە (محمـد) لـەدایك بـوو نورێك لـە داوێنم دەرچوو كۆشكەكانی شامی ڕوونكردەوە، ئیمـامی ئەحمەد لە (عرباض)ی كوڕی (ساریە) وە شتێكی نزیك لەوە دەگێڕێتەوە[٣].

دەگێڕنـەوە پـێش لـەدایبك بـوونی پێغەمبـەر ﷺ هەنـدێك پێشـبینی ڕووی داوە لەوانــە ، چـواردە باڵەكۆنــەی هەیوانەكــەی كیســرا كەوتۆتــە خـوارەوەو ئــەو ئاگرەی هەزار ساڵ بوو دەیانپەرست كوژایەوە ، كڵێساكانی دەوروبەری دەریاچەی (سـاوە) ڕووخـان ، پـاش ئـەوەی كـە درزیـان بردبـوو ، ئیمـامی (بەیهـەقی) ئەمـەی گێڕاوەتەوە[٤]، هەرچەندە (محمد الغزالی) دان بەمەدا نانێت[٥].

كە لەدایبك بوو، دایكی ناردی بەشوێن (عبدالمطلب)ی باپیریدا بۆ ئەوەی مـژدەی ئـەم كوڕەزایـەی بـدەنێ ، (عبـدالمطلب) لـەئامێزی گـرت و بـردی بـۆ كابەو سوپاسی خوای كردو پاڕایەوە ، نـاوی (محمـد)ی بـۆ هەڵبـژارد ـ شایانی وتنە ئەم ناوە لەناو عەرەبدا باونەبوو . لە حەوتودا خەتەنەی كرد كە ئەمە دابی عەرەب بوو[٦].

لەدوای دایكی، یەكەم ژنێك كە شیری‌دا بە (محمد) ﷺ (ثویبة)ی كەنیزەكی (أبو لهب) بوو ، شیری كوڕێكی خۆی دایە ناوی (مسروح) بوو، پێشتریش شیری بە (حمزە)ی كوڕی (عبد المطلب) مامی پێغەمبـەر ﷺ دابـوو، پاشتریش شیری دا بە (أبو سلمە) كوڕی (عبد الأسد المخزومی)[٧].

---

[١] / بڕوانە (مختصر سیرة الرسول) (عەبدوڵلای نەجدی) ل١٢، تلقیح فهوم اهل الأثر ل٤، (صحیح مسلم) ٩٦/٢.

[٢] / بڕوانە (محاضرات تاریخ الأمم الإسلامیة) نووسینی :الخضري ٦٢/١، رحمة للعالمین ٣٨،٣٩/١.

[٣] / بڕوانە (مختصر سیرة الرسول ﷺ) نووسینی شێخ (عبدالله النجدی) ل١٢ . (إبن سعد) ٦٣/١

[٤] / هەمان سەرچاوەی یەكەم .

[٥] / بڕوانە (فقه السیرة) نووسینی (محمد الغزالی) ل ٤٦.

[٦] / إبـن هشـام ١٥٩،١٦٠/١. (محاضـرات تـاریخ الأمـم الإسـلامیة (الخضـري) ٦٢/١، ووتەیـەك هەیـە دەڵـێ بـە خەتەنـە كـراوی لەدایبك بووە. بڕوانە (تلقیح فهوم اهل الأثر)ل٤. ( إبن القیم) دەڵێ: فەرموودەیەكی ڕاست لەو بارەیەوە نییە . بڕوانە (زاد المعاد) ١٨/١.

[٧] / بڕوانە (تلقیح فهوم اهل الأثر ل ٤)، (مختصر سیرة الرسول ﷺ) نووسینی شێخ (عبدالله النجدی) ل ١٣ .

## لـەناو (بنـی سعـد) دا

نەریتی عەرەب وەهابوو شارنشینەکانیان دەگەڕان بۆ دایەن بۆ منداڵەکان لەبەر ئەوەی لە نەخۆشی شار بە دور بن ، هەتاکو جەستەیان پتەوو بازویان بەهێز بێت و ، هەر لەمناڵییەوە زمانی عەرەبی بەپاراوی فێربن ، (عبد المطلب) بەدوای زۆر دایەندا گەڕا بۆ پێغەمبەر ﷺ، دایەنێکی لەخێڵی (بەنی سعد)بۆ دۆزیەوە ، ناوی (حلیمە) کچی (ابو ذؤیب) بوو ، هاوسەرەکەی ناوی (الحارث) کوڕی (عبد العزی) شۆرەتی (ابو کبشە) بوو لەهەمان خێڵ.

پێغەمبـەر ﷺ لـەوێ چـەند خوشـك و برایـەکی شـیریی هـەبوو ، لەوانـە (عبدالله) کوڕی (حارث) ، (انیسـە) کچـی (الحارث) و ، (حذافة) یان (جذامة) کچـی (الحارث) ـ نـاوی ڕاستەقینەی (شـیماء)ە ، ئـەم ژنـە هـەمووجارێك پێغەمبـەر ﷺ ، هەروەها (ابو سفیان) کوڕی (الحارث) کوڕی (عبد المطلب) ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ ، لە باوەش دەگرت.

(حمزە)ی مامی پێغەمبەر ﷺ لای دایەنێك بـوو لەهـەمان خێڵـی دایەنەکەی پێغەمبـەر ﷺ خێڵـی (بنـی سعد) کوڕی (بکـر)ە ، دایەنەکەی لەوکاتـەدا شیری‌دا بە پێغەمبـەر ﷺ کـە لـەئامێزی (حلیمـە)دا بـوو ، بـەم شـێوەیە (حمـزە) بـرای شـیریی پێغەمبەرە ﷺ لە دوو سەرەوە ، لەسەری (ثویبة) و سەری (سعدیە)وە [1].

(حلیمـە) لـەبارەی بەرەکـەت و پـیرۆزی پێغەمبـەرەوە ﷺ شـتی سـەیر دەگێڕێتـەوە ، باوازی لێ بهێـنین خـۆی بەدرێـژی بۆمـان بـاس بکـات ، (إبـن إسـحاق) دەڵێت:

(حلیمـە) دەیـوت: کـە لەگـەڵ هاوسـەرەکەی و کـوڕێکی شـیرەخۆرەیداو کۆمەڵێك ژنی تری خێڵی (بەنی سەعدی کوڕی بەکر)دا دەڕواتە دەرەوە بەمەبەستی وەرگرتنـی منداڵـە شـیرە خۆرەکـان ، حەلیمـە وتـی: ئـەو دەرچـونەمان لەسـاڵێکی وشکیدا بـوو هـیچ لەماڵـدا نـەبوو، دەڵێت: بەسـواری گوێدرێـژێکی سـپی دەرچـوین مەشکەیەکمان پێبوو سوێندبێت دڵۆپێکی تێدا نەبوو، نەماندەتوانی هـیچ شـەوێك بخەوین لەبەر گریانی ئەو منداڵەمان کە لەتاو برسێتی دەیکرد ، مەمکەکانم ئەوەندە شیریان تێدا نـەبوو تێـری بکـەن ، مەشـکەش هـیچ شـتێکی تێـدا نـەبوو بیـدەمێ ،

---

[1] / زاد المعاد ١/١٩.

چاوەڕوانی بارانبارین و بوژانەوە بوین ، بەسواریی ئەو گوێدرێژە چوومە دەرێ ، گوێدرێژەکەم ئەوەندە لاوازبوو هاوەڵەکانم بەزەییان پێمدا دەهاتەوە ، هەتا گەیشتینە مەککە بەشوێن منالە شیرەخۆرەکاندا دەگەڕاین ، ژنمان تێدا نەبوو پێغەمبەری نیشان بدرێت و قەبوڵی بکات ، چونکە دەیانوت بێ باوکە ، هۆکەشی ئەوەبوو ئێمە چاوەڕوانی یارمەتیەك بوین لە باوکی منالەکەوە ، دەمانوت ئەم منالە بێ باوکە ، دەبێت دایك و باپیرەی بتوانن چی بکەن ؟

بۆیە حەزمان لێ نەبوو ، ژنمان تێدا نەما ساوایەك هەڵنەگرێت من نەبێت ، کە خۆمان کۆکردەوە وتم بە هاوسەرەکەم: سوێند بێت بەخوا پێم ناخۆشە لەگەڵ هاوەڵەکانمدا بگەڕێمەوەو منالێکم وەرنەگرتبێت ، بەخوا دەڕۆم ئەو منالە بێباوکە هەڵدەگرم ، هاوسەرەکەی وتی: قەیدی نییە ، بەڵکو خوای گەورە بەهۆیەوە بەرەکەتێ بنێرێت بۆمان ، حەلیمە دەڵێت: چووم و هێنام ، هیچ پاڵی پێوە نەنام بۆ هەڵگرتنی تەنها ئەوە نەبێت کە منالی ترم دەست نەکەوت ، دەڵێت: وەرم گرت و گەڕامەوە نێو کاروانەکەم ، هەر کەخستمە باوەشم مەمکەکانم شیریان لێ دەچۆڕا ، ئەوەندەی خواردەوە تا تێر بوو ـ ئەنجا براکەشی مژی تا تێر بوو ـ پاشان نووست ، پێشتر هەرگیز لەگەڵی نەدەنووستین ، مێردەکەم هەستا چوو بۆ لای مەشکەکەوە سەیری کرد پڕە ، دەستی پێدا هێنا شیری لێ هاتە دەرەوە ، تێری لێ خواردەوە منیش تێر بووم ، خۆشترین شەومان کردەوە ، حەلیمە دەڵێت: کە ڕۆژ بوەوە مێردەکەم وتی: ئەرێ حەلیمە دەزانی! سوێند بێت بەخوا شنەیەکی پیرۆزمان بەرکەوتووە ، حەلیمە دەڵێت : وتم: منیش ئاوات دەخوازم وابێت ، حەلیمە دەڵێت: پاشان دەرچوین ، من سواری گوێدرێژەکەم بووم ، منالەکەشم لەگەڵ خۆمدا سوار کرد ، سوێند بێت بەخوا بەسواریی ئەوەندە ڕۆشتم گوێدرێژی کەسیان ئەو ماوەیان نەدەبڕی ، وای لێ هات هەندێك لە هاوەڵەکانم دەیانوت: ئەرێ کچەکەی (ابی ذؤیب) ، دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات!

کەمێك لەسەرمان بوەستە ، ئەمە ئەو گوێدرێژە نەبوو کە پێی هاتیت لەگەڵماندا؟

منیش پێم دەوتن: بەرێ وەڵڵا ! ئەوە خۆیەتی ، ئەوانیش دەیانوت: سوێند بێت شتێکی لێ هاتووە ، حەلیمە دەڵێت " پاشان گەیشتینەوە ماڵەکانی خۆمان لە ناوچەی (بەنی سەعد) ، پێم وانییە هیچ زەویەکی خودا هەبوو بێت لەوە

وشك و بێئاوتر ، دوای ئەوە مێگەلەکەم بەو شێوەیەی دەمان برد بەتێری و گوانی پڕ لە شیرەوە دەگەڕایەوە ، دەمان دۆشی و لێمان دەخواردەوە ، هیچ کەسێك لەوان یەك دڵۆپی لەگوانی مێگەلەکەیدا نەئەدۆشی و، گوانی مێگەلەکانیان هیچی تێدا نەبوو ، وای لێ هاتبوو ئامادەبوان دەیانوت بەشوانەکانیان: هاوار بۆ ئێوە لەو شوێنەدا مێگەلەکە بەڕەڵڵا بکەن کەشوانەکەی کچی (أبی ذؤیب) تیایدا مێگەلەکە ئەلەوەڕێنێت ، ئەمجارەش مێگەلەکانیان بەبرسێتی و گوانی خاڵیەوە دەگەڕانەوە ، مێگەلەکەی منیش بە تێریی و گوانی پڕ لە شیرەوە دەهاتنەوە ، بەردەوام نازو نیعمەتی خودامان بەسەرخۆمانەوە دەبینی هەتا دوو ساڵ و شیر بڕینەوەکەی پێغەمبەر ﷺ گوزەرا کە گەورە بوو لە مناڵەکانی تر نەدەچوو ، هێشتا نەگەیشبووە دوو ساڵ مناڵێکی قەڵەوو جوان بوو ، حەلیمە دەڵێت: هێنامانەوە بۆلای دایکی و سور بووین لەسەر ئەوەی لامان بمێنێتەوە ، بەهۆی ئەو بەرەکەتەوە کە بەسەرماندا ڕژابوو ، قسەمان لەگەڵ دایکیدا کردو ، من پێم وت: حەزدەکەم کوڕەکەمم لەلا بەجێ بهێڵیت هەتا گەورە دەبێ، چونکە لەپەتای ناو مەککە ئەترسم، حەلیمە دەڵێ: زۆر نەماینەوە هەتا جارێکی دی پێی داینەوەو لەگەڵ خۆمان هێنامانەوە[1].

بەو شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خێڵی (بنی سعد)دا مایەوە ، هەتا ساڵی چوارەم یان پێنجەمی[2] تەمەنی لەو ساڵەدا ڕووداوی سنگ لەت کردن ڕووی‌دا ، (مسلم) لە (أنس)ە وە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە جارێکیان جبرەئیل هاتە خزمەتی ، لەکاتێکدا کە لەگەڵ مناڵەکانی تردا یاریی دەکرد ، گرتی و دای بەزەویدا ، سنگی لەت کردو ، دڵی دەرهێنا خوێن پارەیەکی تێدا دەرهێنا ، فەرمووی : ئەمە پشکی شەیتانە لە تۆدا ، پاشان دڵەکەی لە تەشتێکی ئاڵتونی پڕ لە ئاوی زەمزەمدا شۆرد ، پاشان هێنایەوەیەك و ، خستیەوە شوێنی خۆی ، بە هەڵەداوان مناڵەکان ڕایانکرد بۆ لای دایکی ـ واتە دایەنەکەی ـ وتیان : محمد کوژرا ، کە هاتەوە لایان چون بە دەمیەوە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو[3].

---

[1] / إبن هشام ، ١/١٦٢،١٦٣،١٦٤.

[2] / ئەمە ڕای زۆرینەی سیرەت نووسەکانە، ڕەوتی گێڕانەوەکەی (إبن إسحاق) ئەوە دەگەیەنێ کە لە ساڵی سێیەمدا ڕووی دابێ ، بڕوانە (سیرەتی إبن هشام) ١/١٦٤،١٦٥.

[3] / صحیح مسلم ، باب الإسراء ١/٩٢.

## بەرەو دایکە بەسۆزەکەی

دوای ئەو ڕووداوە حەلیمە زۆر لە محمد ئەترسا هەتا گێڕایەوە بۆ دایکی، لای دایکی مایەوە هەتا تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ[1] ئامینە پێی باش بوو لەیادی کۆچی مێردەکەیدا سەردانی گۆڕەکەی بکات لە یەثریب ، لە مەککە دەرچوو ، ماوەیەکی پێنج سەد کیلۆمەتری دایەبەر ، محمدی بێ باوك ڕۆڵەکەیەتی ﷺ و کارەکەرەکەیان (أم أیمن) و (عبدالمطلب)ی سەرپەرشتیاری لەگەڵدا بوو ، لەوێ مانگێك مایەوە ، پاشان گەڕایەوە: لەڕێگەی گەڕانەوەدا نەخۆشیی لەکۆڵی نەبوەوە ، هەر لەسەرەتای ڕێگەوە لەگەڵیدا بوو ، لە (ئەبواء)ی نێوان مەککەو مەدینە کۆچی دوایی کرد[2].

## بەرەو لای باپیرە سۆزدارەکەی

(عبدالمطلب) هێنایەوە بۆ مەککەو، هەموو هەست و سۆزێکی دڵی دابوە کوڕەزا بێ باوکەکەی ، کە تووشی کارەساتێکی نوێ بوو برینە کۆنەکانی هێنایەوە سۆ ، ئەوەندە بەزەیی بەودا هاتەوە بەئەندازەی ئەوە بەزەیی بە ڕۆڵەکانی خۆیدا نەدەهاتەوە ، هەرگیز بەتەنها جێی نەدەهێشت و، ڕێزی ئەدا بەسەر منداڵەکانی خۆیدا ، (ابن هشام) دەڵێ : (عبدالمطلب) هەمووجارێك لەسێبەری کابەدا فەرشێکی بۆ ڕادەخرا ، کوڕەکانی لەدەوری ئەو فەرشە دادەنیشتن، کەچی پێغەمبەر ﷺ هێشتا منداڵێکی تازە پێگەیشتوو بوو دەچووە پاڵی باپیرەی ، مامەکانی دەیانویست دووری بخەنەوە (عبد المطلب) پێی دەوتن: واز لەو کوڕەم بهێنن سوێند بێت شان و شەوکەتێکی هەیە ، پاشان لەگەڵی دادەنیشت ، دەستی بەسەریدا دەهێناو دڵی پێخۆش دەکرد[3].

لە تەمەنی هەشت ساڵ و دوومانگ و دە ڕۆژدا (عبد المطلب)ی باپیرەی پێغەمبەر ﷺ لە مەککە کۆچی دوایی کرد ، پێشتر وای بەباشزانی کە بیخاتە ژێر ڕکێف و چاودێری (أبو طالب)ی مامیەوە[4].

---

[1] / تلقیح فهوم الأثر ل٧، إبن هشام ١٦٨/١.

[2] /إبن هشام ١٦٨/١، تلقیح فهوم اهل الأثر ل٧، کۆباسەکانی (تاریخ الأمم الإسلامیة) للخضري ٦٣/١، (فقه السیرة)ة غەزالی ل٥٠.

[3] / إبن هشام ١٦٨/١.

[4] / تلقیح فهوم الأثر ل ٧ ، إبن هشام ١٦٩/١.

## بۆ ئـامێزی مـامـه بـەبەزەییەكـەی

(أبو طالب)یش بەجوانترین شێوە مـافی برازایـەتی پێداو، خستیە نێو کوڕەکانی خۆی و، پێش ئەوانیشی خست ، ڕێزێکی تایبەتی دایە ، بۆ ماوەی چل ساڵ پشتی گرت و، پاراستی و، خۆشی و ناخۆشی لەبەر خاتری ئەوبوو . لە شوێنی خۆیدا کورتەیەك لەوەش دەدوێین.

## داوای باران بارینی پێ دەكەن

(ابـن عسـاكر) دەگێڕێتـەوە لـە (جلهمـە)ی کـوڕی (عرفطـة)وە فـەرموی: کاتێك چوومە مەککە خەڵکەکەی لە وشکی و بێ بارانیدا دەژیان ، خێڵی قوڕەیش وتیان:

ئەری ئەبو تاڵیب ! دەشت ودەرمان بێ ئاوە ، ماڵ و مناڵمان وشك بوونەوە ، ئادەی دۆعا بارانەیەك بکە ، (ابو طالب) هاتە دەرەوە مناڵێکی لەگەڵدا بوو ، وەکو خۆرێکی تێر وابوو کە تازە چەند پەڵە هەورێکی سورباوی لەسەر لاچوبێت و چەند مناڵێکی تری بەدەوردا بوو ، ئەبو تاڵیب دەستی گرت و، پشتیدا بەدیواری کابەوە ، پەنای بۆ پەنجەی مناڵەکە برد ، لەو کاتەدا پەڵەی هـەور بەئاسمانـەوە نـەبوو ، لـە چـەند گۆشـەیەکی ئاسمانـەوە پەڵـە هـەور پەیـدا بـوو، لێزمـەی کـردو ئـاو تـەقی ، شیوەکە پڕ بوو لە ئاوو دەشت و دەر سەوز بوەوە ، (ابـو طالـب) لەدێڕێکدا ئامـاژە بەمە دەکات و دەڵێت:

وأبيض يستسقي الغمام بوجهه ثمال اليتامى عصمةً للأرامل [1]

---

[1] / (مختصر سيرة الرسول ﷺ) نووسینی (عبدالله النجدي) ل ١٥،١٦.

## بـوحـــەیرای ڕاهـیـب

کاتێك پێغەمبەر ﷺ تەمەنی گەشتە دوانزەساڵ – وتراویشە دوومانگ و دە ڕۆژیش[1] (أبوطالب) لەگەڵ خۆیدا بۆ بازرگانی بردی بۆ شام ، هەتا گەیشتنە بوسرا – کە سەر بە شامەو بەشێکە لە(حوران) ، لەو کاتەدا بەشێك بوو لەو ناوچە عەرەبیەی کەوتبوە ژێر دەسەلاتی ڕۆمەکانەوە - لەو شوێنەدا ڕاهیبێك هەبوو بە (بوحەیرا) ناوی دەرکرد بوو ، ناوی (جرجیس) بوو ، کە کاروانەکە گەیشت (بوحەیرا) چوە دەرەوە بۆلایان ، ڕێزی لێنان، پێش ئەوکاتە (بوحەیرا) نەدەهاتە دەرەوە بۆلایان و پێغەمبەری خوای بە سیفەتەکانیدا ناسیەوە ، دەستی گرت و وتی بە (أبوطالب): ئەمە سەرداری جهانیانە ، خوای گەورە ئەم مرۆڤە بەڕەحمەت دەنێرێت بۆ جیهانیان ، (أبو طالب) وتی: تۆ چۆن دەزانیت؟ بوحەیرا وتی: کاتێك ئێوە لە عەقەبەوە هاتن دارو بەرد نەما کڕنووش نەبات ، ئەوانە جگە لە پێغەمبەر کڕنووش بۆ کەس نابەن ، من بەهۆی مۆری پێغەمبەرێتیەوە دەیناسمەوە کە وەکو وێنەی سێوێك لەسەر دەفەی شانیەتی و باسەکەی لە کتێبەکانماندا هەیە ، داوای کرد لە (أبوطالب) خێرا بیگێڕێتەوەو ، نەیبات بۆ شام ، لە ترسی جولەکە ، بۆیە مامی لەگەڵ چەند کوڕێکیدا ناردیەوە بۆ مەککە[2].

## جـەنگـی فوجـار (الفُجّـار)

لەتەمـــەنی (١٥) ســاڵیدا بـوو، جـــەنگی (فجـار) لـــەنێوان قـــوڕەیش و هاوپەیمانـەکانی خێڵـی کەنانـە لەلایـەك و لـەنێوان (قـیس)ی (عـیلان)دا ڕوویدا ، سەرکردەی قوڕەیش و هەموو کەنانە (حرب)ی کوڕی (أمیە) بوو بەهۆی تەمەن و ئەو پلەوپایـە کۆمەلایەتیـەوە کـە لەناویانـدا هـەیبوو ، لـە سـەرەتای ڕۆژەکەیـدا - سەرکەوتن بۆ (قەیس) بوو بەسەر کەنانـەدا ، تـانزیکی نیوەڕۆ کەنانـە سەرکەوت بەسەر (قیس)دا، ئەو جەنگە ناونرا جەنگی (فجار) چونکە حورمەت و سنوورەکانی تێدا شکاو لەمانگە حەرامەکاندا بوو . پێغەمبەر ﷺ لەو جەنگەدا بەشدار بوو، تیری بۆ ئامۆزاکانی ئامادە دەکرد.[3]

---

[1] / (إبن الجوزي) لە (تلقیح فهوم اهل الأثر ... ل ٧) دا وتوویەتی.

[2] / (مختصرسیرة الرسول) نووسینی (شێخ عبدالله النجدی) ل١٦، إبن هشام ١/١٨٣،١٨٢،١٨١،١٨٠، لە (کتاب الترمذي) دا هاتووە کە بیلالی لەگەڵدا ناردووە، (تحفة الأحوذي) ئەمەش هەڵەیەکی ڕوونە، چونکە پێدەچێت بیلال لەوکاتەدا لەدونیادا نەبووبێت، ئەگەر لەژیانیشدا بووبێت لەگەڵ مامی و ئەبوبەکردا نەبووە، (زاد المعاد)١ / ١٧.

[3] / إبن هشام ١/١٨٧،١٨٦،١٨٥،١٨٤، قلب جزیرة العرب ل٢٦٠ ، کۆباسەکانی (تاریخ الأمم الإسلامیة) نووسینی (الخضري) ٦٣/١.

# پەیمانی فضول

دوای ئەوجەنگە لە(ذی القعدة)ی حەرامدا پەیمانی (فضول) مۆرکرا، خێڵەکانی قورەیش لەسەری کۆبوونەوە لەوانە: بەنو هاشم ، بەنو عبد المطلب ، ئەسەدی کوڕی عبد العزی ، زوهرەی کوڕی کیلاب ، تەیمی کوڕی موڕڕە ، لەبەر پلەوپایەو ڕیش سپێتی (عبدالله بن جدعان) لە ماڵەکەی ئەودا کۆبوونەوە ، پەیمانیانداو کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی هەر ستەمدیدەیەکیان لەمەککەدا بینی لەسەری بکەنەوە ، دەبوونە داردەست دژ بە ستەمکارەکە هەتا مافەکەیان لێ وەردەگرتەوە . پێغەمبەر ﷺ ئەو پەیمانەشی بینی ، پاش ئەوەی خوای گەورە بە نیعمەتی پێغەمبەرێتی ڕێزی لێ گرت فەرموی: لە ماڵەکەی عەبدوڵلای کوڕی جەدعاندا پەیمانێکم دیوە بەلامەوە لە (حمر النعم) خۆشترە ، ئەگەر لە ئیسلامیشدا بۆی بانگ بکرێم ، بەدەمیەوە دەڕۆم .[1]

گیانی ئەو پەیمانە دژ بەو دەمارگیریە بوو کەسیستمی خێڵایەتی دەیوروژاند ، لەبارەی هۆی ئەو پەیمانەوە وتراوە ، پیاوێکی زوبێدی بەشمەکەوە دێتە مەککە ، (عاص)ی کوڕی (وائل)ی (سەهمی) لێی دەکڕێت و، پارەکەی ناداتێ ، ئەویش هانای برد بۆ هاوپەیمانەکانی (عبدالدار)و(مخزوم)و(جمح) و (سهم) و (عدی) و ئەوان گوێیان پێنەداو نەهاتن بەهانایەوە ، چووە سەر بەرزاییەکەی (أبی قبیس) ، بەدەنگی بەرز دەستی کرد بەخوێندنەوەی چەند شیعرێك و باسی لە ستەمدیدەیی خۆی دەکرد ، (زبیر)ی کوڕی (عبدالمطلب) چوو بەپیریەوەو وتی: بۆچی ئەم پیاوە پشت گوێ خراوە؟ تائەوانەی لەپەیمانی (فضول)دا ناویان هاتبوو کۆبوونەوە ، چوونە لای (عاصی)ی کوڕی (وائل) و مافەکەیان لێوەرگرتەوە پاش ئەوەی پەیمانەکەیان بەست[2] .

---

[1] / إبن هشام ١١٣/١، ١٣٥، (مختصر سيرة الرسول ) نووسینی (شيخ عبدالله النجدی) ل٣٠،٣١.
[2] / هەمان سەرچاوەی کۆتایی ل ٣٠،٣١ .

## ژیـانی کـوێـرەوەری

پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای تەمەنیدا کارێکی دیاری کراوی نەبوو ، بەڵام بە ڕیوایەتی جۆراوجۆر دەڵێن شوانی بۆخێڵی (بەنیسەعد) کردوە[1]، لەناو مەککەشدا بەپارەیـەکی کـەم[2] بـۆ مەککەییـەکان شـوانی کـردووە ، لەتەمـەنی بیسـت و پێنج ساڵیدا وەك بازرگانێك بەماڵی خەدیجەوە (ڕەزای خوای لێبێت) چوو بۆ شام ، (إبن إسـحاق) دەڵێـت : خەدیجەی کچی خوەیلیـد ئافرەتێکی بازرگـانی خـاوەن مـاڵ و پلەوپایە بوو، پیاوانی بە کرێ دەگرت بەپارەی خۆی و، قازانج بەشەراکەتی لەگەڵ دەکردن ، قورەیش خێڵێکی بازرگان بوون، جاکاتێك هەواڵی ڕاستگۆیی و سپاردە پـاکیی و ڕەوشـت بـەرزی پێغەمبـەر ﷺ بـەخاتوو خەدیجـە گەیشـتەوە نـاردی بەشـوێنیدا ، داوای لێ کـرد کـە بازرگـانی بکـات و هاموشـۆی شـام بکـات، لـە بەرامبەریشدا قازانجی باشتری دەداتێ لەوەی دەیدا بە بازرگانەکانی تر، پێغەمبەر ﷺ داواکەی خەدیجەی پەسەندکرد ، لەگەڵ غولامێکی ئەودا کە ناوی (مەیسـەرە) بوو ، بەو پارەیەوە بەرەو شام کەوتەڕێ و ، غولامەکەی خەدیجەش (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵی دەرچوو[3].

## خـوازبێنی خـەدیجـە (ڕەزای خـوای لێ بێت)

کاتێـك گەڕایـەوە بـۆ مەککـە ، خەدیجە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) ئەمانـەت و بەرەکـەتی زۆری لەپارەکـەدا بینـی ، کـە پێشـتر شـتی وای نـەدیبوو ، غولامەکەشی هەرچی دیبوو لە پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە لە خۆشخوانی و سیفاتی ڕێزدارانەو ، بیرێکی پەسەندو ڕاستگۆیی و ڕەویەیەکی دەستپاکانە ، ئەوەی بەشوێنیدا دەگەڕا دۆزیەوە . پێشتریش ئاغاو سەرەك خێڵـە قورەیشییەکان داوایـان کردبـوو – پێیـان ڕازی نـەدەبوو– ڕازی دڵـی خـۆی باسـکرد بـۆ (نەفیسـە) کچـی (مەنیـە)ی دەسـتە خوشـکی، نەفیسـە چـوو بـۆلای پێغەمبـەر ﷺ و قسـەی لەگەڵـدا کـرد کـە خەدیجـە بخوازێت، پێغەمبەر ﷺ ڕازیی بوو، قسەی لەگەڵ مامەکانیدا کرد ، مامەکانی چوون بۆلای مامی خەدیجەو خوازبێنیان کرد، دوای ئەوە ڕێ و ڕەسمی ژنهێنانەکە تەواو

---

[1] / إبن هشام ١/١٦٦.
[2] / (فقه السيرة) نووسینی محمد الغزالي .
[3] / إبن هشام ١/١٨٧، ١٨٨.

بوو، (بنو هاشم) و (مضر) ئامادەی عەقدەکە بوون ، ئەمە پاش گەڕانەوەی بوو لە شام بە دوو مانگ ، بیست وشتری بۆ کردە مارەیی ، تەمەنی خەدیجە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەوکاتەدا چل ساڵ بوو ، لەو ئان و ساتەدا لەڕووی عەقڵ و بنەچەو سەروەتەوە چاکترین ژنی خێڵەکەی بوو ، یەکەم ژن بوو پێغەمبەر ﷺ خواستی و ژنی بەسەردا نەهێنا هەتا وەفاتی کرد[1] .

جگە لە (ئیبراهیم) هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە خەدیجەن ، یەکەمجار (قاسم)ی لێ بوو . شۆرەتی (أبو القاسم) لەمەوەیە ، پاشان (زەینەب) و (ڕوقیە) و (أم کلثوم) و (فاطمة) و (عبدالله) کە شۆرەتی (طیب)ە و (طاهر)یشی هەبوو ، هەموو کوڕەکانی لە منداڵیدا مردوون ، بەڵام کچەکانی هەموویان بەئیسلامدا گەیشتن و موسڵمان بوون و کۆچیشیان کرد ، بەڵام هەر لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ وەفاتیان کرد ، جگە لە فاطمة (ڕەزای خوای لێ بێت) کە شەش مانگ دوای خۆی وەفاتی کرد[2] .

---

[1] / إبن هشام ١/١٩٠،١٨٩،(فقه السيرة)ی محمد الغزالي ل ٥٩، تلقيح فهوم أهل الأثر ل٧.

[2] / هەمان سەرچاوەی یەکەم ١/١٩٠ـ١٩١، دووەم ل٦٠و، (فتح الباري) ٧/٥٠٧، لەنێوان سەرچاوەکاندا جیاوازییەکی کەم هەیە ڕاستترینیانمان وەرگرتووە.

## بنیاتنانی کابه و کێشەی ناوبژیوانیەکە

لە تەمەنی سی و پێنج ساڵی تەمەنی پێغەمبەردا ﷺ قورەیش دەستی کرد بە بنیاتنانی کابە ، چونکە تا ئەو کاتە هێشتا کابە وشکە کەڵەکێك بوو کەمێك لەسەروو باڵای مرۆڤەوە بوو ، بەرزیەکەی لەسەردەمی (إسماعیل)ە وە نۆ باڵ بوو ، بنمیچی نەبوو ، چەند دزێك گەنجینەکەی ناویان دزی بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا – بە پێی ئەوەی ئاسەوارێکی کۆن بوو بەهۆی ڕێچکەی ئاوو بارانەوە – تووشی داڕمان و داخوران هاتبوو ، دیوارەکانی درزیان بردبوو ، پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرێتی ﷺ سێلاوێکی خوڕ مەککەی ڕامالّی بوو ، بەرەو مالّی خودا هاتبوو ، کابە خەریکبوو بە تەواوی بڕوخێت ، بۆیە قورەیش ناچاربوون لەترسی ڕووخان تازەی بکەنەوە ، بڕیاریان وابوو مالّی حەلاڵ نەبێت چیدی تیّ نەخەن و ، مارەیی زۆرە ملیّ و کڕین و فرۆتی سوو ، مافی خەڵکی تێکەلاّو نەکەن ، لە ڕووخاندنیشی دەترسان ، بۆیە وەلیدی کوڕی موغەیرەی مەخزومی دەستی کرد بەڕووخاندنی و کە خەڵکی تریش بینیان ئەو هیچی لیّ نەهات بەدوایدا دەستیان کرد بەڕووخاندنی کابەو ، لەسەری بەردەوام بوون تاگەیاندیانە بناغەکەی ئیبراهیم ﷺ پاشان ویستیان دەست بکەنەوە بەبنیاتنانەوەی ، دیوارەکانی کابەیان دابەشکرد هەربەشێکیان دانا بۆ خێڵێك ~~تابنیاتی~~ بنیێتەوە ، هەرخێڵەو لەلای خۆیەوە بەردی کۆدەکردەوەو دەستیان کرد بەبیناکردنەوەی کابە ، وەستای بیناکە کابرایەکی ڕۆمی بوو ناوی (باقوم) بوو، کاتێك دیوارەکە گەیشتە ئاستی دانانی بەردە ڕەشەکە ڕاجیاوازیی دروست کرد لەوەدا کەکیّ شەرەفی دانانی بەردەکەی پیّ ببڕێت ، مشت و مڕەکە چواریان پێنج شەو بەردەوام بوو ، تا دەهات گەرمتر دەبوو ، بەشێوەیەك خەریك بوو لەناو حەرەمدا جەنگێکی خوێناوی بەرپا ببێت ، بەلاّم (أبو أمیە)ی کوڕی موغیرەی مەخزومی پێشنیازی ئەوەی بۆ کردن کە کەسێك بکەن بەناو بژیوان کە یەکەم کەس بێت لە دەرگاکەی مزگەوتەوە بێتە ژورەوە ، ئەوانیش ڕازی بوون ، ویستی خودا وابوو ئەو کەسە پێغەمبەر بوو ﷺ ، کەبینیان هاواریان کرد: ئەوە پیاوە دەست پاکەکە هات ، پێی ڕازین ، ئەوە محمدە ، کە گەیشتە لایان ، مەسەلەکەیان تێگەیاند ئەویش داوای پارچە قوماشێکی کرد ، بەردەکەی خستە ناویەوە ، داوای

کرد لە سەرەك هۆزە پێکداهاتوەکان هەموویان چمکی قوماشەکە بگرن ، پێی ووتن بەرزی بکەنەوە ، تا ئاستی شوێنەکەی ، ئەنجا بەدەستی خۆی هەڵی گرت و لەجێگەی خۆیدا داینا ، ئەمە شێوازێکی ژیرانە بوو قورەیش پێی ڕازی بوو.

کەلەبەری (طیبة) لای قورەیشەوە کورتی دەهێنا ، بۆیە لەلای سەرەوە بەشی شەش باڵ هێنایانە پێشەوە ، ئەمە بە (حجر) و (حطیم) ناوزەدە ، دەرگاکەیان لە زەوی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی هەر کەسێك خۆیان نەیانەوێت نەڕواتە ژوورەوە ، کە دیوارەکانی پانزە باڵ بەرز بوەوە لەسەر شەش ستوون بنمیچەکەیان بۆ دانا.

دوای تەواوبوون کابە شێوەیەکی چوارگۆشەی وەرگرت بەرزیەکەی (١٥) مەتر بوو ، درێژی ئەو باڵەی کە بەردە ڕەشەکەی تێدا بوو ، لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا ١٠ بە ١٠ مەتر بوو، بەردەکە لە بەرزیی مەترونیوێکەوە لە تەوافگەکەوە دانرابوو ، ئەو لایەش دەرگاکەی تێدا بوو لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا ١٢ بە ١٢ بوو ، دەرگاکەی دوو مەتر بەرز بوو ، لە دەرەوەش بینایەك چواردەوری دابوو ژێرەکەی ، تێکڕای بەرزیەکەی (٠,٢٥ م)و تێکڕایی پانیەکەشی (٠,٣٠م) بوو، پێیان دەوت (شاذورات) ، لەڕاستیدا ئەوە بنەڕەتی (بیت) بوو کەچی قورەیش وازیان لێهێنا بوو.[1]

---

[1] / لەبارەی وردودرشتی بیناکردەوەی کابەوە بڕوانە (إبن هشام) ١٩٢/١٢ هەتا ١٩٧، هەروەها (فقه السيرة)ی غەزالی ٦٢. ٦٣ ، (صحيح البخاري) باب فچل مکەو بنیانها ٢١٥/١ و کۆباسەکانی (تأريخ الأمم الإسلامية) نووسینی (خضري) ٦٥/١، ٦٤.

## ژیننامەیەکی خێرای پێش بوون بە پێغەمبەر ﷺ

ژیانی پێغەمبەر ﷺ باشترین خەسڵەتی توێژەکانی ئوممەتی هەڵگرتبوو ، نموونەیەکی بەرز بوو لەبیری ڕاست و، دیدی ڕێك و ڕاست ، خوا زیرەکی و فیکر ڕەسەنی و ڕێکسازیەکی زۆری لە ئامرازو ئامانجدا پێ بەخشیبوو، ئەو بێدەنگیە درێژخایەنەی یارمەتی تێرامانی زۆرو ئالۆودایی بیرو دۆزینەوەی ڕاستی ئەدا ، بەو عەقڵە تێرو سروشتە پاك و بێگەردەی خۆی لاپەڕەکانی ژیان و کاروباری خەڵك و بارودۆخی کۆمەلانی خەڵکی خوێندبووەوە ، بەلای هیچ جۆرە خورافەیەکدا نەدەچوو ، لەسەر بنەمای بەرچاو ڕوونی لە کاروباردا هاوبەشی ژیانی خەڵکی دەکرد ، هەر چاکەیەکی بەدی بکردایە بەشداری تێدا دەکرد ، وەگەرنا دەگەڕایەوە باری گۆشەگیرییەکەی خۆی ، هەرگیز مەی نەدەخواردەوەو ، هەر قوربانیەکیش لەبەر دەستدا بدرایە بەزەویدا لێی نەدەخوارد ، ئامادەی بۆنەو ئاهەنگە بت پەرستیەکان نەدەبوو ، بەڵگە هەر لەسەرەتای نەشونمایەوە ڕقی دەبووەوە لەو پەرستراوە پووچەڵانە، شت نەبوو لەوانە بێزارتربێ لەدڵیدا ، تاقەتی بیستنی سوێندخواردنی نەبوو بە (لات) و (عوززا)[1].

گومانی تێدا نی‌یە کە قەدەری خوایی پاراستوویەتی ، کاتێك ڕەوتی نەفس و ئارەزووی دەجولاَ بۆ سەیرکردنی هەندێك لە لەزەتەکانی دونیاو، ڕازی دەبوو بە شوێنکەوتنی هەندێك لە باوە ناباشەکان ، ئیدی چاودێری خوایی دەهاتە گۆڕێ و نەیدەهێشت ئەوکارە بکات ، (ابن الأثیر) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (هەرگیز من ئەو کارانەی سەردەمی نەفامیم بەدڵدا نەهاتوە دووجار نەبێت ، هومو جارێکیش خوای گەورە دەیپاراستم ، دوای ئەوە ئیتر هیچ بەدڵمدا نەهات هەتا خوای گەورە پەیامی بۆناردم ، شەوێکیان بەو شوانەم وت کە لەگەڵمدا مێگەلەکەی دەلەوەڕاند لەسەرو مەککەوە چاوێکت لەمەڕەکانم بێت هەتا دەچمە مەککەو شەوانە دەکەم هەروەکو گەنجانی مەککە دەیکەن" وتی بڕۆ ، دەرچووم هەتا گەیشتمە یەکەم ماڵی مەککە گوێم لە لێدانی جوزەلە بوو ، وتم : ئەوە چیە؟ وتیان : ئەوە شایی فلانە بۆ فلانە کەس ، دانیشتم بۆ گوێگرتن ، خوای گەورە

---

[1] / قسە و باسەکەی لەگەڵ بوحەیرا دا بەڵگەیە لەسەری ، بڕوانە ( ابن هشام ) ١٢٨/١ .

گوێیەکانمی داخست تانووستم ، خەبەرم نەبۆوە هەتا گەرمی خۆرەتاو هەڵی ساندم ، گەڕامەوە بۆلای هاوەڵەکەم پرسیاری لێکردم ، منیش هەواڵەکەم دایە ، پاشان شەوی دی هەمان شتم وتەوە ، چوومە ناو مەککەوە وەکو شەوی یەکەمم لێ هاتەوە .. دوای ئەوە ئیتر هیچ خراپەیەك نەهات بەدڵمدا)[1]

هەروەها (بوخاری) دەگێڕێتەوە لە (جابر)ی کوڕی (عبدالله)وە ، دەڵێت: کاتێك کابە بنیاتنرا پێغەمبەرﷺ و (عباس) بەردیان دەگواستەوە ، (عباس) وتی بە پێغەمبەر ﷺ کراسەکەت بئاڵێنە لەملت لەزبریی بەردەکان دەتپارێزێت ، کراسەکەی هەڵدایەوە دەستبەجێ لەهۆش خۆی چوو ، چاوەکانی بۆ ئاسمانیان دەڕوانی ، پاشان هۆشی هاتەوەو فەرمووی: کوا کراسەکەم ، کراسەکەم ؟

ئەوجا ئیتر کراسەکەی لەبەر کرایەوە[2]، لە گێڕانەوەیەکیشدا ، دوای ئەوە هیچ کاتێك عەورەتی دەرنەکەوتووە[3].

پێغەمبەر ﷺ لەناو قەوم وخزمانیدا بەکۆمەڵێك ڕەوشتی بەرزو خۆشخوانیو ڕێزدارانە ناسرابوو ، پیاوترین مرۆڤی خێڵەکەی بوو ، لە هەموویان بەڕەوشتترو ، بە ئارامترو، ڕاستگۆترو، نەرم و نیانترو ، خێرەومەندترو ، کارچاکترو ، پەیمان پارێزترو، سپاردە پارێزتر بوو ، هەتا خەڵك ناویان نا بە (ئەمین) دەست پاك ، بەهۆی ئەو هەموو هەڵس و کەوتە چاك و خەسڵەتە باشانەیەوە بوو ، بەڕاستی هەر وەکو دایکی ئیمانداران خەدیجە (ڕ) دەفەرموێت : خەمەکانی لەکۆڵ دەناو ، برسیی تێردەکرد، میوانی خۆشنوود دەکردو یارمەتی تەواوی بێنەوایانی دەدا[4].

---

[1] / لەبارەی ڕاستێتی ئەو فەرموودەیەوە جیاوازی هەیە ، حاکم و زەهەبی بەڕاستی دەزانن ، (إبن كثير) یش لە (البدايەوالنهايە) بەلاوازی دادەنێ .٢٨٧/٢ .

[2] / صحيح ابخاري . باب بنيان الكعبة ٥٤٠/١.

3 / هەمان سەرچاوە لەگەڵ شەرحی قەستەلانیدا.

[4] / صحيح البخاري ٣/١.

## ( ئـەشكـەوتی حـەراء ) و
## سێبـەری پێغـەمبـەرێتی و پەیـامی ئاسمـان

کاتێـك تەمـەنی پـیرۆزی لـە چـل سـاڵ نزیـك بـووەوە ، تێڕامانـەکانی ڕابووردووی ، بیری کـەنارگیری و خـۆ دوورخستنەوەی لادروست کردبـوو ، ژیـانی گۆشـەگیری لا خۆشەویسـت کردبـوو ، هـەمووجارێك خورمـاو ئـاوی لەگـەڵ خۆیـدا دەبردو دەچوو بۆ ئەشکەوتی حەڕاء لەکێوی نوور ، ئەم کێوە دوومیل لە مەککەوە دوورە . ئەشکەوتێکی بچوکە درێژیەکەی چواربال و، پانیەکەشی یەك بال و سێ چارەکە بالی ئاسنە ، هاوسەرەکەشی لێیـەوە نزیـك بـوو ، مـانگی ڕەمـەزانی لـەوێ بەسـەر دەبـرد ، نـانی دەدا بـە هـەر هـەژارێك ڕووی تـێ بکردایـە ، کاتـەکانی بەخواپەرستی و بیرکردنەوە لە دەوروبەرو دیمەنەکانی گەردوون بەسەردەبرد ؛ لەو توانا داهێنـەرەی پشـتەوەی دروسـت کراوەکـان ورد دەبـۆوە ، لەهـەمان کاتـدا دڵ ئـارام نـەبوو لـەو بیروبـاوەڕی شـیرکە لـەق و لـۆق و ، ڕوبینـا بۆشـانەی گەلەکـەی لەسەری بوو، بەڵام هیچ ڕێبازێکی ڕوون و بەرنامەیەکی دیاریی کراوو ، ڕێگەیەکی ئامانجداری لەبەردەستدا نەبوو دڵی پێی ئارام ببێت و پێی ڕازی بێت[1] .

هەڵبژاردنی پێغەمبەریش ﷺ بۆ ئەو ژیانە گۆشەگیریە ، خواستێکی خوایی لـە پشـتەوە بـوو ، بـۆ ئـەوەی سـازی بکـات بـۆ کـارە گەورەکـە ، هـەرگیانێکیش چاوەڕوانی ئەوەی لێ بکرێت کەکاریگەری هەبێت لەسەر واقیعی ژیـانی مرۆڤایـەتی و بـەرەو ئاڕاسـتەیەکی تـر وەری چـەرخێنێت پێویسـتە ئـەو گیانـە هەنـدێك کـات خەڵوەت کێشی بکات و ، لەسەر قاڵیەکانی زەوی و هەراو هوریـاو خەمـەکانی ژیـان و خەمە بچوکوکانی خەڵك خۆی دابرێت.

بـەو شـێوەیە خـوای گەورە پلانی بـۆ محمـد داڕشت ﷺ لەکاتێکدا کـە بـۆ سپاردە گەورەکـەو ، گـۆڕینی ئاڕاسـتەی زەمـین و ، ڕێککردنـەوەی ڕێبـازی مێـژوو ئامـادەی دەکـرد ، ئـەم گۆشـەگیریەی بـۆ ڕێکخسـت پـێش پیێسـپاردنی ئـەرکی پەیامەکە بەسێ ساڵ ، یەك مانگ لەو گۆشەگیریە تێپەڕی کـرد ، لەگـەڵ گیـانی ئـەو بوونە ڕەهایەدا ، لەو غەیبە شاراوەیەی پشت سروشت ورد ئـەبوەوە ، هـەتا کـاتی ئەوە هات ، مامەڵە لەگەڵ ئەو غەیبەدا بکات .[2]

---

[1] / رحمة للعالمين ٤٧/١ ، ابن هشام ٢٣٥/١ ، ٢٣٦ ، فی ظلال القرآن ، جزء ٢٩ / ١٦٦.

[2] / هەمان سەرچاوەی دوایی ١٦٦/٢٩ ، ١٦٧.

## جبریل ﷺ بەنیگاوە دادەبەزێت

كە چل ساڵی لەتەمەن تەواوكرد ، ئەمەش چڵەپۆپەی كامڵبوونی مرۆڤە ، گوتراویشە لەو تەمەنەدا پێغەمبەران ڕەوانە دەكرێن . لەو تەمەنەیدا ئاسەوارەكانی پێغەمبەریێتی لەپشت ئاسۆی ژیانەوە خەریك بوو ڕەنگی ئەدایەوە و دەدرەوشایەوە ، ئەو ئاسەوارانەش بریتی بوون لە خەونەكان ، هیچ خەونێكی نەدەبینی مەگەر وەك سپێدەی بەیان دەهاتەدی ، شەش مانگ بەسەر ئەو حاڵەدا تێپەڕی كرد ، ماوەی پێغەمبەرێتیش (٢٣) ساڵە ، ئەم خەونانە بەشێكن لە (٤٦) بەشی پێغەمبەرێتی ، كە ڕەمەزانی ساڵی سێیەمی گۆشە گیریەكەی گوزەرا لە ئەشكەوتی (حەڕاء)دا خواستی خواوەند وەهابوو ، كە بەشێك لەڕەحمەتی خۆی بڕژێنێت بەسەر خەڵكی سەر زەویدا، ئەوەبوو بە پێغەمبەرێتی شكۆمەندی كرد، جبریل ﷺ چەند ئایەتێك لە قورئانی بۆ هێنایە خوارەوە[1].

پاش ڕامان و وردبوونەوە لەبەڵگەو نیشانەكان دەتوانین ئەو ڕۆژە دیاری بكەین بە شەوی دوو شەممەی بەرواری بیست و یەكی مانگی ڕەمەزان ، كە بەرامبەرە لەگەڵ (١٠) ئۆگستسی ساڵی (٦١٠)ی زایین ، لەوكاتەدا بەرێكی تەمەنی پیرۆزی چل ساڵی قەمەریی و شەش مانگ و ، دوانزەڕۆژ بووە ، ئەوەش دەكاتە (٣٩) ساڵی خۆریی و سێ مانگ و دوانزە ڕۆژ[2] .

---

[1] / (إبن حجر) دەڵێت: بەیهەقی گێڕاوێتیەوە: كەماوەی خەونەكانی (٦) مانگ بووە، بینا لەسەرئەوە دەست پێكردنی پێغەمبەرێتی بەخەون لەمانگی لەدایك بوونەكەیدا دەستی پێكردووە كە ڕەبیعی یەكەمە ، پاش تەواو كردنی چل ساڵ و. دەست پێكردنی نیگای بێداریش لەڕەمەزاندایە (فتح الباري) ٢٧/١.

[2] / مێژوونوسان لەو یەكەم مانگەدا كەخوای مەزن شكۆنامەی پێغەمبەرێتی داوە بەپێغەمبەرﷺ و. دابەزینی نیگادا جیاوازیان هەیە، كۆمەڵێكی زۆر بۆئەوە دەچن كە لەمانگی ڕەبیعی یەكەمدابێ، كۆمەڵێكی تریش پێیان وایە كە لە ڕەمەزاندایە، كەمینەیەكیش دەڵێن مانگی ڕەجەبە (بڕوانە. مختصر سیره الرسول . نوسینی شێخ عبدالله بن محمد بن عبدالوهاب النجدی ل٧٥) ئێمە ڕای دوەممان بەلاوە پەسەندە . واتە مانگی ڕەمەزانە . بەبەڵگەی ئایەتی ﴿ شهر رمضان الذی أنزل فیه القرآن ﴾ البقرة/١٨٥ هەروەها ئایەتی: ﴿ إنا أنزلناه في ليلة القدر ﴾ القدر /١ زانراویشە كە شەوی قەدر لەڕەمەزاندایە ، ئەم شەوە لەم ئایەتەشدا ئاماژەی پێ كراوە: ﴿ إنا أنزلناه في ليلة مباركة إنا كنا منذرين ﴾ الدخان/٣ ، هەرلەبەر ئەوەش پاڵدانی بەحەڕائەوە لە ڕەمەزاندا بوو، هەرلەوێداو لەو مانگەدا جبریل دابەزیە سەری وەك زانراوە.

پاشان گوتەبێژان لەدیاریكردنی ئەو ڕۆژەشدا ڕاجیاوازن، وتراوە: ڕۆژی حەوتەمە. وتراویشە ڕۆژی حەڤدەهەمە، وتراویشە ڕۆژی هەژدەهەمە (بڕوانە مختصر سیرەالرسول) (كەباسكرا) ل٧٥، هەروەها (رحمة للعالمین ٤٩/١) ، (الخضری)یش لەكۆباسەكانیدا سورە لەسەرئەوەی كە ڕۆژی (١٧) هەمە، (محاضرات تأریخ الأمم اللإسلامیة) نووسینی (الخضری) ٦٩/١.

بەلاّم ئێمە پێمان وایە كە ڕۆژی (٢١) هەمە، لەگەڵ ئەوەشدا كەسمان نەدیوە لە سیرەتناسەكان ئەمەی وتبێ ، لەگەڵ ئەوەدا كە هەموویان یان زۆرینەیان لەسەر ئەوەن كە پەیامداربوونی لە ڕۆژی (٢) شەممەدا بووە، ئەوەی پاڵپشتیانە ئەو فەرموودەیە كەپێشەوایانی فەرموودە لە(أبی قتادە) (ڕ) دەیگێڕنەوە پرسیاركرا لە پێغەمبەر

باگویٚ بگرین بۆ عائشه (ڕ) تا بەسەرهاتی ئەو ڕووداوەمان بۆ بگێڕێتەوە کە بریتی بوو لەکڵپەیەکی نووری لاهوت و، دەستی کرد بەکردنەوەی دەروازەی تاریکستانەکانی کوفرو سەرلێشێواوی ، هەتا ئاراستەی ژیانی گۆڕی و، ڕێڕەوی مێژووی وەرچەرخاند ، عائشه (ڕ) دەفەرموێت:

سەرەتا کە نیگا بۆ پێغەمبەر هات ﷺ بەخەونی ساڵحان دەستی پێکرد ، هەرخەوێکی دەبینی وەکو سپێدەی بەرەبەیان دەهاتەدی ، پاشان ژیانی گۆشەگیری لا خۆشەویست بوو ، بەتەنها لە ئەشکەوتی حەڕائدا دەمایەوە ، چەندین شەو لەوێدا دەمایەوە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی و، توێشوی بۆ هەڵبگرێت ، پاشان دەگەڕایەوە لای خەدیجەو بەهەمان شێوە توێشوی وەردەگرت ، هەتا هەق و ڕاستی بۆهات لە ئەشکەوتی حەڕائدا ، فریشتەکە هاتە لای فەرمووی: اقْرَأْ، دەفەرموێت : وتم: نازانم بخوێنم ، گرتمی و گوشیمی بەخۆیەوە تا هەناسەم توندبوو ، پاشان بەریدام و فەرمووی: اقْـــرَأْ، وتم: من خوێندەوارنیم ، گرتمی و گوشیمی بەخۆیەوە بۆجاری سێیەم، پاشان بەریدام و، فەرمووی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ {١} خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ {٢} اقْرَأْ وَرَبُّـــكَ الْـــأَكْرَمُ {٣}﴾[١]، واتـــە: بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە ، کە مرۆڤی لەخوێنپارە بەدی هێناوە ، بخوێنە هەر پەروەردگاری تۆ شکۆدارە ، پێغەمبەر ﷺ بەو چەند ئایەتەوە گەڕایەوە دڵی دەلەرزی ، هاتەوە بۆ ماڵەوە بۆلای خێزانی ، (خەدیجەی کچی خوەیلد) فەرمووی: داميپۆشن ، داميپۆشن ، دایانپۆشی هەتا ترسەکەی نیشتەوە، بە خەدیجەی فەرموو: ئاخۆ ئەمە چی بێت تووشم هاتووە ؟ ئەنجا بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: بەڕاستی ترسم هەبوو شتێکم لێ قەومابێت ، خەدیجە فەرمووی: نەخێر ،

---

ﷺ لە بارەی ڕۆژووی ڕۆژی دووشەممەوە، فەرموی: (لەو ڕۆژەدا لەدایك بووم و نیگام بۆ هات ، لەدەربڕینێکدا: ئەوە ڕۆژێکە تیایدا لەدایك بوم و بوم بەپێغەمبەر یان نیگام بۆهات) صحیح مسلم ٢٦٨/١، احمد/٢٩٧، ٢٩٩، البیهقی٥/ ٣٠٠،٢٦٨، الحاکم ٢/٢٦٠٢ ڕۆژی دووشەممەی ڕەمەزانی ئەو ساڵ . . تەنها لەگەڵ ڕۆژی (٧) دا ڕێك دەکەوێت، لەگەڵ چواردەو، بیست و یەك و، بیست و هەشتدا، ڕیوایەتە ڕاستەکانیش بەڵگەن لەسەرئەوەی شەوی قەدر لە شەوە تاکە کۆتاییەکانی ڕەمەزاندا نەبی ڕوونادەن ، لەو شەوانەشدا ئالووێر دەکات، ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان ئایەتی: ﴿إنا أنزلناه في ليلة القدر﴾ هەروەها گێڕانەوەی فەرموودەکەی (ابی قتادە) کە بە پێغەمبەر بوونی پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی دووشەمم دا بووەو لەنێوان ژمێریی ساڵنامەی زانستیدا کە تیایدا دووشەممە کە دەکەوێتە ناومانگی ڕەمەزانی هەمان ساڵەوە ئەوەمان بۆ دیاری دەکات کەپێغەمبەربوونی پێغەمبەر ﷺ لە شەوی بیست و یەکی ڕەمەزاندا بووە.

[١] / ئایەتەکان تا ﴿عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ هاتە خوارەوە .

سوێندبێت هەرگیز خوای گەورە سەرت شۆڕ ناکات، تۆ پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەهێنیت، یارمەتی نەدار دەدەیت ، هەژار تێردەکەیت و ڕێز لەمیوان دەگریت و ، یارمەتی لێقەوماوان دەدەیت.

خەدیجە (ڕ) لەگەڵ خۆیدا بردیە دەرەوە هەتا گەیشتە ماڵی (ورقە)ی کوڕی (نوفل)ی کوڕی (اسد)ی کوڕی (عبد العزى) کە ئامۆزای خەدیجە بوو (ڕ) ـ پیاوێك بوو لە سەردەمی جاهیلیدا ببوە فەلە ، بە(عیبری)یش دەینوسی ، چەندەی بیویستایە ئینجیلی بەعیبری دەنوسیەوە ، پیاوێکی بەتەمەن بوو چاوی لەدەست دابوو، خەدیجە پێی ووت: ئامۆزا ! گوێ لە برازاکەت بگرە ، وەرەقە پێی وت: ئەرێ برازا چی دەڵێیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ چی دی بوو بۆی گێڕایەوە ، وەرەقە پێی وت: ئەمە ئەو (ناموس)ەیە کەخوا بۆ موسای ناردە خوارەوە، خۆزگە لەو ڕۆژگارەدا گەنج بوومایە ، بریا ئەوکاتە زیندوو بوومایە کاتێك گەلەکەت وەدەرت دەنێن ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا بەڕاستی شار بەدەرم دەکەن؟ وەرەقە وتی: بەڵێ ، هیچ پیاوێك پەیامی لەو شێوەیەی تۆی نەهێناوە دوژمنایەتی لەگەڵدا نەکرا بێت ، ئەگەر فریای ئەو ڕۆژە کەوتم پشتیوانیەکی گەورەت لێ دەکەم ، پاشان وەرەقە زۆری نەخایاند کۆچی دوایی کردو نیگاش دابڕا [1].

(طبری) و (ابن هشام) دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی لەناکاو نیگای بۆ هات لە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوەو پاشان گەڕایەوەو گۆشەگیری درێژە پێدا ، لە پاش ئەوە گەڕایەوە بۆ مەککە ، گێڕانەوەکەی (طبری) تیشك دەخاتە سەر هۆی دەرچوونەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەمەش دەقەکەیەتی:

پاش باسی هاتنی نیگا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لە هەموو دروست کراوەکانی خوادا شت نەبووە لەلام لە شاعیر یان شێت زیاتر ڕقم لێیان بوو بێتەوە ، چاوم بەرایی نەدەهات سەیریان بکەم ، دەفەرموێت: وتم: مەحاڵە قورەیش من بە شاعیر یان شێت ناوزەد بکەن! دەڕۆمە سەر ئەوکێوە بەرزەوخۆمی لێوە فڕێ دەدەم ، خۆم دەکوژم و دەحەوێمەوە ! دەفەرموێت: بەو مەبەستەوە چوومە دەرەوە ، گەیشتمە دامێنی چیاکە گوێم لێ بوو دەنگێك لە ئاسمانەوە دەڵێت: ئەی

---

[1] / صحيح البخاري ٢،٣/١ بوخاری دەریهێناوە لەگەڵ بوونی جیاوازیەکی کەم لەدەربڕینەکەی هەردوو کتێبی (التفسير) و(تعبير الرؤيا).

محەممەد!! تۆ پێغەمبەری خودایت ، من جبرەئیلم ، فەرمووی: سەرم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان بینیم جبریلە پێیەکانی لە ئاسۆگەی ئاسمان توندکردووەو دەڵێت: ئەی موحەممەد! تۆ پێغەمبەری خوایت ، من جبریلم. دەفەرموێت وەستام سەیرم ئەکرد ، ئەوەی بۆی هاتبووم لەبیری بردمەوە ، لەشوێنی خۆم نەدەجولاّم ، چاوم دەگێڕا بەئاسۆکانی ئاسماندا سەیری هەر لایەکم دەکرد جبریلم دەبینی ، ڕەق وەستام نە بۆ پێشەوە ، نە بۆ دواوە جوڵەم نەدەکرد ، تا ئەوکاتەی پیاوەکانی خەدیجە هاتن بە شوێنمدا و گەشتمەوە شاری مەککە من هەر لە شوێنی خۆمدا وەستابووم ، پاشان جبریل ﷺ دیار نەماو منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە)[1] چوومە لای خەدیجە خۆم بە لایدا لارکردەوەو سەرم خستە کۆشی ، وتی: (أبا القاسم)! لەکوێ بویت؟ سوێند بێت ناردم بەشوێنتدا هەتا گەیشتنە مەککەو گەڕانەوە بۆ لای من ، پاشان منیش ئەوەی بینیبوم بۆم گێڕایەوە ، وتی: مژدەت لێ بێت ئامۆزا ، خۆت قایمکە ، سوێندم بەوکەسەی گیانی خەدیجەی بەدەستە ئومێدەخوازم تۆ ببیتە پێغەمبەری ئەم ئوممەتە[2]، پاشان هەستاو چوو بۆلای وەرەقەو هەواڵەکەی پیّدا ، وتبووی: (قدوس) (قدوس) ، سوێند بەوکەسەی گیانی وەرەقەی بەدەستە ، نامووسە گەورەکەیە هاتووە ، هەر ئەوەیە کە هاتوە بۆ موساش ﷺ ، ئەو پیاوە پێغەمبەری ئەم ئوممەتەیە ، ئەی خەدیجە پێی بڵێ: باخۆی قایم بکات ، خەدیجە (ڕ) گەڕایەوەو وتەکانی وەرەقەی بۆ گێڕایەوە ، کە پێغەمبەر ﷺ چلە کێشیەکەی تەواوکردو گەڕایەوە – بۆ مەککە – وەرەقەی پێگەیشت ، پاش ئەوەی هەواڵەکەی لە خۆی بیست وتی: سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ، تۆ پێغەمبەری ئەم ئوممەتەیت، ئەو نامووسە هەرە گەورەیەت بۆ هاتووە کە هات بۆ موساش ﷺ [3].

---

[1] / دەقەکەی طبری ٢/٢٠٧.
[2] / دەقەکەی (إبن هشام) ١/٢٣٧-٢٣٨.
[3] / کورتەی (إبن هشام) ١/٢٣٨.

## پـچــڕانی وەحـــی

ســەبارەت بــەماوەی پچـڕانی وەحــی ، (إبــن ســعد) لــە (إبــن عبــاس)ەوە دەگێڕێتـەوە کـە چـەند ڕۆژێـك بـووە[1] ، پـاش چـاوگێڕانی خێـرا بەهـەموو باسـەکەدا هـەر ئەمـە پەسـەندە ، بەڵام ئـەو گوتەیـەی کـەدەڵێت بۆماوەی سێساڵ یان دووساڵ ونیـو بەردەوام بووە بەهیچ جۆرێك ڕاست نییە ، ئێرەش جێگەی ڕەتکردنەوەی ئەوە نیە.
ئەومنـدە هەیـە لـەماوەی دابڕانەکـەدا پێغەمبـەر ﷺ بەخـەمباری و ماتیـەوە دانیشـتبوو، سەرسوڕمان و واق وڕمان دایگرتبوو ، (بوخاری) دەگێڕێتەوە لە (کتاب التعبیر)دا ئەمـە دەقەکەیـەتی: (وەحـی بـۆ ماوەیـەك وەسـتا هـەتا پێغەمبـەر ﷺ خـەمباربوو بە شێوەیەك چـەندجارێك دەچـووە سـەر لوتکـەی شـاخێکەوە تـاخۆی فـڕێ بداتـە خـوارەوە[2] هـەر کەدەگەیشتە لوتکەی چیاکە بۆ ئەوەی خۆی فڕێ بدات جبریل ؈ خۆی نیشـان دەدا، دەیفەرموو: ئەی موحوممەد بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خودایت ، ئیتر بێ تاقەتیەکـەی دەڕەویـەوەو ، دەروونـی هێمن دەبووەوەو دەگەڕایـەوە ، دابڕانـی وەحیەکە بیخایەندایـە هەمان کاری دووبارە دەکردەوەو کە دەگەیشتە لوتکەی چیاکە جبریـل ؈ جارێکـیتر خۆی نیشان دەدایەوەو هەمان شتی پێ دەوتەوە[3].

## جبریـــل ؈ جارێکی تر وەحی دەهێنێتە خوارەوە

(إبـن حجـر) دەڵێـت: وەسـتانی وەحـی بـۆ چـەند ڕۆژێـك لەبەرئـەوە بـوو کـە پێغەمبەر ﷺ ترس و لەرزەکەی بنیشێتەوەو، ئارەزووی دیداری نوێی تێدا دروست بێتــەوە[4]، کــە چــیدی تارماییــەکانی سەرســامی ڕەویــەوەو ، هێماکــانی ڕاســتی دەرکەوت ، پێغەمبەر ﷺ باوەڕی یەقینی پەیداکرد کە بۆتە پێغەمبەری خودا ، ئـەو کەسەش هاتۆتە لای باڵوێزی وەحیەو هەواڵی ئاسمانی بۆ دەهێنێت و ئالوودە بون و چاوەڕوانیشی بۆ هاتنی وەحی بووە هۆیەك بۆ دامەزراندن و ئەگـەری هاتنـەوەی بۆ جارێکی تر ، ئەوەبوو جارێکیتر جبریل هاتەوە بۆلای ، (بوخاری) دەگێڕێتـەوە لە (جابر)ی کوڕی (عبداللە)وە کـەگوێی لێ بوو پێغەمبـەر ﷺ جارێکیان باسـی کـاتی هاتنە خوارەوەی نیگای دەکرد ، فەرمووی:

---

[1] / فتح الباري ٢٧/١، ٣٦٠/١.
[2] / لە هەندێ نووسخەدا لە جیاتی (عدا)ی عەرەبیەکە وشەی (غدا) هاتووە.
[3] / صحیح البخاري ، التعبیر باب أول ما بدیء بە رسول الله من الوحي الرؤیا الصالحة ٣٤/٢.
[4] / فتح الباري ٢٧/١.

(جارێکیان بەرێگادا دەرۆیشتم گوێم لەدەنگێك بوو لەئاسمانەوە هات ، سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان ، بینیم هەمان ئەو فریشتەیە کە لە ئەشکەوتەکەی حەرائدا هات بۆلام لەسەر کورسیەك دانیشتوە لەنێوان ئاسمان و زەوییدا ، دەستەو ئەژنۆ نەویمەوە هەتا کەوتمە سەرزەوی ، هاتمەوە ماڵەوە وتم: داپۆشن، داپۆشن ، داپۆشن ، خوای گەورە ئایەتی نارده خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُـــدَّثِّرُ﴾ هەتا ئایەتی ﴿فَاهْجُرْ﴾ ، دوای ئەوە بەدوای یەکدا بەگەرم و گوڕی وەحی هاتە خوارەوە)[1].

## چەند باسێك لە ڕوونکـردنـەوەی بەشەکـانی وەحیدا

پێش ئەوەی باس لە وردو درشتی ژیانی پەیام و پێغەمبەرێتی بکەین ، پێمان باشە بەشەکانی وەحی بزانین بەوپێیەی سەرچاوەی پەیامەکەو وزە بەخشی بانگەوازەکەیە ، (إبن القيم) لەباسی پلەکانی وەحیدا دەڵێت:

**یەکەمیـان:** خەونی ڕاستەقینەیە، ئەم جۆرەش سەرەتای دەستپێکردنی وەحی بوو.

**دووەمیـان:** ئەو بەشانەی کە فریشتەکە دەیخستە مێشك و دڵیەوە بێ‌ئەوەی ببینێت ـ هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (روح القدس) فووی کردوە بەدەروونمدا کە هیچ نەفسێك نامرێت هەتا ڕۆزیەکەی تەواو نەکات ، لەخوا بترسن و، بەرێکوپێکی بەدوایدا بگەڕێن ، درەنگ هاتنی ڕۆزی واتان لێ نەکات کە بەتاوان کردن بەدوایدا بگەڕێن ، چونکە ئەوەی لای خودایە بەتاعەت نەبێت ناسەندرێت.

**سێهەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك جار جبریلی لەشێوەی پیاوێکدا دەبینی و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد بێداربوو کە قسەی لەگەڵدا کرد ، لەوحاڵەتەدا هەندێك جار هاوەڵانیش دەیانبینی.

**چـوارەم:** هەندێجار لەشێوەی دەنگی زەنگێکدا دەهات ، ئەمەشیان لە هەموویان قورستر بوو کە فریشتەکەی لەگەڵدا دەهات ، تاڕادەیەك نێو چاوانی ئارەقەی لێ دەچۆڕا لە ڕۆژی زۆر ساردیشداو ، ئەو وڵاخەی بەسەریەوە بوو لەو کاتەدا چۆکی دادەدایە سەر زەوی ، جارێکیان وەحی بۆهات ڕانی لەسەر ڕانی (زەید)ی کوڕی (ثابت) دانابوو ، ئەوەندە قورس بوو خەریك بوو ئازاری بدات.

---

[1] / صحيح البخاري . كتاب التفيير . باب ﴿ والرجز فاهجر ﴾ ٧٢٣/٢.

**پێنجـــەم:** فریشتەکەی لـە وێنـەی ڕاسـتەقینەی خۆیـدا دەبینـی ، ئەونـدە مەشیئەتی خـودای لەسـەر بـوو وەحـی بـۆ دەهێنـا ، هـەروەکو خـوای گـەورە لـە سورەتی (النجم)دا باسـی کـردوە ، تـەنها دووجـار بـەم شـێوەیە ڕووی داوە وەحـی بێتە خوارەوە.

**شـەشـەم:** ئەوەی خوای گەورە بۆی ناردووە، لە بەرزیی ئاسمانەکانەوە شەوی بڵندبوونەوە وەك فەرزکردنی نوێژو پەرستشی تریش.

**حەوتـەم:** کەلامی ڕاستەوخۆی خـوای گـەورە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هـەروەکو لەگـەڵ (موسـا)ی کـوڕی (عمـران)دا قسـەی فـەرمووە ، ئـەم پلەوپایەیـە بـەڕوونی و یـەکلایی بڕاوەتـەوە بـۆ موسـا ﷺ لـەدەقی قورئانـداو ، بـۆ پێغەمبـەری خۆشمـان ﷺ لـە ڕووداوی شەوڕەویدا ، هەندێك لەزانایان پلەی تریشیان بۆ زیادکردوە وەکو قسەی ڕاستەو خۆی بـێ (حجاب) لەگـەڵ بەنـدەدا ، ئەمـەش مەسـەلەی ڕاجیاوازیی نێـوان (سەلەف) و (خەلەف)ە ، لەگەڵ پوختەیەکی ئاسانی باسی پلەی یەکەم و هەشتەمدا کۆتایی هات[1].

---

[1] / بڕوانە : (زاد المعاد ) ١٨/١ .

## فـەرمانی بانگـەوازکـردن بۆ لای خواوەند ، باسـەکـانی

پێغەمبەری خوا ﷺ لەچەند ئایەتێکدا چەندفەرمانێکی پێگەیشت لەوانە :

﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ {١} قُمْ فَأَنذِرْ {٢} وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ {٣} وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ {٤} وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ {٥} وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ {٦} وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ {٧} ﴾ ئەمانە کۆمەڵێك فەرمانن بە ڕواڵەت ئاسان و سادەن ، بەڵام بە مەوداوو مەبەست قووڵن ، کاریگەریان لەسەر ناخ و حەقیقەت گەلێك گەورەیە .

١ـ مەبەستی ئاگادارکردنەوەکە ئەوەیە کەکەس لەیاخی بوان بەجیّ نەهێڵێت لەجیهانی بونەوەردا ئاگاداریان نەکاتەوە لەئاکامە خراپەکانی یاخی بوون هەتا ئەو کاتەی ڕاتەکاندن و هوشیار بوونەوەکە لەدڵیدا ڕوودەدا.

٢ـ مەبەست لەگەورە زانینی پەروەردگار ئەوەیە: کە هیچ کەسێك خۆی بەگەورە نەزانێت ، گەورەیێتی تەنها بۆ خودای تاك و تەنها بمێنێتەوە.

٣ـ مەبەستی جل و بەرگ پاککردنەوەو وازهێنان لەهەموو چەپەڵیەك ئەوەیە کە بگاتە پاککردنەوەی ناخ و دەرەوەو دەروون پاکژی لەهەموو پیسیو چەپەڵیەك و بەرزبوونەوە تابەرزترین پلەوپایە لەژێر ڕەحمەتی زۆری خواوەندو ڕێنومایی نوورەکەیدا ، تاببێتە بەرزترین نموونە لەکۆمەڵگای مرۆڤیداو، دڵان بەلای خۆیدا کەمەندکێش بکات و، سەرلێشێواوانیش سامیان لیّ بنیشێت و ، دونیا لە هەموو لایەکەوە ڕووی تیّ بکەن.

٤ ـ مەبەست لە بەزۆر نەزانینی نازو نیعمەتەکانیش بۆ ئەوەیە مرۆڤ کردەوە و کۆششەکانی خۆی بەگەورەو زۆر نەزانێت ، بەڵکو هێشتا دەبێت هەوڵ بدات کار لە دوای کار بکات و هەوڵ و قوربانی و کۆششی زۆر بکات ، پاشان ئەوەش لەبیر خۆی بباتەوەو لەپێناویی خوادا هەست کردن بەماندوو بوونی تێدا نەمێنێت.

٥ . لەکۆتا ئایەتەکەشدا ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەو ئازارەی توشیان دەبێت لەلایەن سەرسەختەکانەوە لە بیّ گوێیی و سووکایەتی پێکردن و گاڵتەجاڕی و ، هەتا هەوڵدان بۆ کوشتنی خۆی و هاوەڵەکانی و" فەوتاندنی هەموو ئیماندارانی

دەوروبـەری ، پاشـان خـوای گـەورە فـەرمان دەدات کـە بەهـەموو تواناپەکـەوە دان بـەخۆدا بگرێـت ، نـەك لەبـەر حـەزی دەروونیـی خـۆی بـەڵکو لەبـەر ڕەزامەنـدی پەروەردگارەکەی.

(الله أكبر)! ئەم فەرمانانە لەڕواڵەتدا چەندە سادەن و لەهەمان کاتدا چەند کاریگـەرو سەرنج ڕاکێشـن ، کاریگـەریان چـەند قووڵـە ، چـەندە گەورەشـن کاتێـك گەردەلوولێکی بەهێز دروست دەکەن و هەردوو دوونیا دەهێننەوەیەك و یەکانگیری یەکتریی دەکەن .

هەمان ئـەو ئایەتانـە چەندین ماددەی بانگـەوازو پێڕاگەیاندنیان تێدایـە ، خـودی بێدارکردنەوەکـە دەخوازێت کە هەندێك کـار هەبێت پاداشـتی خاوەنەکـەی سـزا بێـت ، لەبـەر ئـەوەی هـەموو کەسـێك دەزانێت کـە لەدونیادا پاداشـتی هـەموو کەسێك نادرێتەوە لەسەر ئەوەی دەیکات ، بەڵکو لەوانەشە نەکرێت مرۆڤ پاداشـتی هـەموو کارەکـانی وەربگرێـت ، بێـدار کردنـەوە دەخوازێـت کـە ڕۆژێـك هـەبێت بـۆ پاداشـت جگـە لـە دونیـا ، ئەمەشـە کـە بـە ڕۆژی قیامـەت یـان (جـزاء) یـان (دیـن) ناودەبرێـت ، ئەمـەش دەخوازێـت کـە ژیـانێکی تـر هـەبێت جگـە لـەم ژیانـەی ئێمـەی تێدا دەژین ، ئەویش قیامەتە.

ئایەتەکانی تریش داوادەکەن لەبەندەکان یەکتاپەرستی ساغ بن و هـەموو کارو بارەکان بۆ خواوەندی گەورە بگێڕنەوەو ، واز لـە نـەفس ڕازیـی کـردن و خـەڵك ڕازی کردن بهێنن بۆ ڕازی کردنی خودا.

**کەواتە ئەو بابەتانە لەم چەند خاڵدا خەست دەبنەوە:**

**أ ـ یەکتاپەرستی .**

**ب ـ باوەڕ بەڕۆژی دوایی .**

**ج ـ هەستان بەخۆ پاکژکردن ، ئەوەش بەوازهێنان لەکاری خراپ و بەدو هەستان بەکردنی چاکەو کارە خێرەکان.**

**و ـ باوەڕبوون بەوەی کە هەموو کاروبارێکی دونیا بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە .**

**هـ ـ ئەمانە دوای باوەڕ هێنان دێن بە پەیامەکەی موحەممەد ﷺ و چوونە ژێر باری ئاراستەو فەرمایشتە بە پێزەکانی.**

سەرەتای ئایەتەکان بانگەشەیەکی بالآیان لەئامێزگرتووە بەبڕیاری پەروەردگاری بالآدەست ، پێغەمبەر ﷺ دانرا کە بەئەو ئەرکە گەورەیە هەستێت و لەناو جێگەی گەرم و گوڕو خەوی درێژخایەندا ، خوایگەورە دەریکێشایە نێو جیهادو تێکۆشان و زەحمەت : ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ {١} قُمْ فَأَنذِرْ {٢}﴾ ، هەروەکو گوترا بێت: ئەو کەسەی بۆ خۆی بژی بەبێ کێشە دەژی ، بەلآم تۆ ئەی موحەممەد کە ئەم ئەرکە گەورەیەت هەڵگرتووە لەخەوت چی؟ لەحەوانەوەت چی؟ یان لەجێگەی گەرم و نەرم و ، ژیانی هێمنانەو، ڕابواردنێکی پڕ چێژت چی! هەستە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەوکارە گەورەیەی چاوەڕێتە ، بۆ ئەو بارەگرانەی بۆت دانراوە ، هەستە بۆ کۆشش و زەحمەت ، بۆ هەوڵ و ماندوو بوون ، هەستە کاتی خەوو حەوانەوە کۆتایی هات ، لە ئەمڕۆ بەدواوە جگە لە شەونخونی بەردەوام و، جیهادی درێژخایەن و پڕ لە زەحمەت هیچی تر نییە ، هەستە ڕاچەنەو خۆت ئامادە بکە بۆ ئەو کارە.

بەڕاستی وشەیەکی گەورەو ترسناکە ، لەنێو گەرم و گوڕی جێگەو لە ماڵێکی هێمن و ئامێزێکی گەرمەوە دەری دەکێشێت و، پاڵی پێوەدەنێت بۆ ململانێیەك ، لەنێوان کێشمە کێش و هێنان و بردندا ، لەنێوان ڕاکێشان و بەردانی مرۆڤەکان و واقیعی ژیانیشدا وەکو یەك.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەلآمدا هەستایە سەرپێ ، تاماوەی زیاتر لە بیست ساڵی تەواو بەپێوە بوو! ئارام نەبووەو نەحەوایەوە ، نە بۆخۆی و نە بۆ کەس و کاری نەژیا ، هەستاو دەستی کرد بەبانگەواز بۆلای خواوەند ، ئەو قورساییە گرانەی لە ئەستۆ گرت و قورسایی سپاردە گەورەکەی ئەم سەر زەمینەو، ئۆباڵی هەموو مرۆڤایەتی، باری گرانی بیروباوەڕ ، باری خەبات و تێکۆشان لە بوارە جیا جیاکاندا نوچی پێدانەدا ، لەناو شەڕە درێژخایەنەکەدا بۆماوەی زیاتر لەبیست ساڵ مایەوە ، لەوماوەیەدا هیچ کارێك لە کارێکی تری نەدەکرد ، لەو کاتەوە ئەو بانگەوازە ئاسمانیە شکۆدارەی بیست و ، ئەو ئەرکە پڕ مەترسیەی وەرگرت .. خوای گەورە لەجیاتی ئێمەو هەموو مرۆڤایەتی باشترین پاداشتی بداتەوە[١].

ئەو چەند لاپەڕەیەی دواییش جگە لەوێنەیەکی بچووکی ئاسانی ئەو جیهادە درێژخایەنە پڕ لە زەحمەتە نەبێت ، کە پێغەمبەر لەو ماوەیەدا پێی هەستاوە ، چیدی نییە.

---

[١] / في ظلال القرآن ، تەفسیری هەردوو سوورەتی (المزمل) و (المدثر) ج ١٦٨/٢٩ ، ١٦٩ ، ١٧٠، ١٧١، ١٨٢.

# ﴿ ڕۆڵ و قــۆناغــەکــانی بــانگـــەواز ﴾

دەکرێــت ســـەردەمی بانگــەوازە موحەممەدیەکــە بکــەین بــە دوو ڕۆڵــی سەرەکی کە هەریەکێکیان بەتەواوی لەوی تریان جیایە ، ئەوانیش:

**١ ـ ڕۆڵی مەککەیی ، کە نزیکەی سیانزە ساڵە.**

**٢ ـ ڕۆڵی مەدینەیی ، دە ساڵی تەواوە.**

پاشان هەریـەکێك لـەو دوو ڕۆڵـە چـەند قۆنـاغێکی تێدایـە هـەرقۆناغێك تایبەتمەنــدێتی خــۆی هەیــە جیایــە لــە قۆناغــەکانیتر ، ئەمــەش بــەڕوونی دەردەکەوێت لەو بارودۆخەی کە بانگەواز لەو دوو ڕۆڵدا پێیدا گوزەراوە:

**دەکــرێت ڕۆڵــی مەککی بکەین بە ســێ قۆنــاغی ســەرەکیــەوە :**

**قۆناغی بانگەوازی نهێنی ، سێ ساڵە.**

١. **قۆناغی ئیعلانکردن بانگەواز لەمەککــەدا ، لەســەرەتای ســاڵی چــوارەمی پێغەمبەرێتیەوە هەتا کۆتایی ساڵی دەیەم.**

٢. **قۆناغی بانگەواز بۆ دەرەوەی مەککــەو ، بلاوبوونــەوەی لەناویانــدا ، لــە کۆتاییەکانی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتیەوە بۆ کۆچکــردنی پێغەمبــەر ﷺ بەرەو مەدینە.**

٣. **سەبارەت بەقۆناغەکانی ڕۆڵی مەدینە لــەکاتی خۆیــدا دێینــەوە ســەری .**

## سێ ساڵ بانگـەوازی نهێنـــی

وەکو زانراوە کە مەککە مەڵبەندی ئاینی عەرەبەکان بوو ، زێوانـەکانی کابـەو پـارێزەرو چـاودێری بتـە پیرۆزەکـانی تـری تێـدا بـوو ، شـوێنێکیش وابـێ گەیشتن بەئامانجی ئیسلاح کردن تیایدا گرانتر دەبێت و، وەك لـەوەی لێوەی بەدوور بێت، کارەکە پێویستی بەهیمەتێکە بەلاّو کارەساتەکان نەیلەرزێنن ، لەبەردەم ئەو بارودۆخەدا پێویست وابوو کە بانگەوازکە لەسەرەتایدا بەنهێنی بڕوات ، بۆ ئەوەی خەڵکی مەککە نەوروژێن.

## نـــەوەی یەکـــەم

حاڵەتێکی سروشتی‌یە کەپێغەمبەر ﷺ ئیسلامەکەی بۆ نزیکترین کەس لە خۆی و خزم و خوێش و هاوڕێیانی ڕانوێنێت ، ئەوەبوو بانگی کردن بۆ ئیسلام ، هەرکەسێکی بناسیایەو بیزانیایە کەخێری تێدایە یان دەیناسین بانگی دەکردن ، بە خۆشەویستی خوداو ڕاستی و چاکە دەیناساندن ، ئەوانیش بەهۆی ڕاستگۆیی و چاکەخوازێتیەوە دەیانناسی، ئەوانەی ڕۆژێك لەڕۆژان گومانیان نەبووبێت لـە گەورەیـەتی پێغەمبەر ﷺ و مـەزنێتی عـەقڵی و ڕاستێتی هەواڵـەکانی باوەڕیان پـێ دەهێنا ، ئەمانە لەمێژووی ئیسلامەتیدا بەپێشینە یەکەمینەکان ناسراون (السابقون الأولـون) لـە پێشـەنگی هەموویانـەوە هاوسـەری پێغەمبـەر ﷺ خەدیجـەی دایکـی ئیمانـداران (ڕ)و ، غولاّمەکـەی (زەیـد)ی کـوڕی (حـارثـە)ی کـوڕی (شـەرحەبیل)ی (کەلبی) و[1] (عەلی کوڕی ئەبو تالیبی) ئامۆزای کەتا ئەوکاتە منالێك بوو لەئامێزو چـاودێری پێغەمبـەردا ﷺ دەژیـا، هـەروەها (ئەبوبـەکری سـدیق)ی دۆسـتی و خۆشەویستی ، ئەمانە لە یەکەم ڕۆژەکانی بانگەوازدا باوەڕیان هێناو موسوڵمان بوون[2].

پاشان ئەبوبەکر لەبانگکردندا بۆ ئیسلام کەوتە چالاکی نواندن ، پیاوێکی ئاسـانگیرو خۆشەویسـت و هـۆگری خـەڵك بـوو ، ڕەوشـت بـەرزو چاکەخواز بـوو ،

---

[1] / ئەم پیاوە پێشتر نەسیر کرابوو، کرابووە کۆیلە، خەدیجە کڕیبوویـەوەو، بەخشیبوی بەپێغەمبەرﷺ، جارێکیان باوکی زەیدو مامەکەی هاتبوونە لای پێغەمبەرﷺ تا بیبەنەوە بۆ ناو گەل و خێڵەکەیان، بەلاّم (زەید) پێغەمبەری هەڵبژارد ﷺ بەسەر باوك و مامیدا، بۆیە بەپێی نەریتی ئەوکاتەی عەرەب کردیە کوڕی خۆی، لەبەرئەوە دەیان وت : زەیدی کوڕی موحەممەد، تا ئیسلام هات و یاسای بەڕۆڵە کردنی پوچەڵکردنەوە.

[2] / رحمە للعالمین ١/٥٠.

پیاوانی خێڵەکەی دەهاتنە لای و هۆگری دەبوون ، بەهۆی زانست و بازرگانیەکەی و ، مەجلیسی گەرمیەوە ، دەستی کرد بەبانگکردنی ئەوانەیان کە متمانەی پێیان هەبوو لەژێر فەرمانی دەرنەئەچوون ، بەو بانگەشەیەی ئەبوبەکر ، (عوثمان)ی کوڕی (عففان)ی (ئومەوی) و(زبیر)ی کوڕی (عەوام)ی (اسد)ی و(عبد الرحمان)ی کوڕی (عوف) و (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص)ی (زهری)و (طلحة)ی کوڕی (عبدالله)ی (تمیمی) موسوڵمان بوون .

ئەو هەشت کەسە کە پێش خەڵك کەوتن لە موسوڵمان بووندا ، بوونە نەوەی یەکەم و پێشڕەوانی ئیسلام .

ئەوانەش لە موسوڵمانە سەرەتاییەکان بوون ، (بلال)ی کوڕی (رباح)ی (حەبەشی) ، بەدوای ئەواندا ئەمینداری ئوممەت[1] (ابو عبیدە)ی کوڕی (جەڕاح) لەخێڵی (حارث)ی کوڕی (فەهرو) ، (ابو سلمە)ی کوڕی (عبد الأسد)و ، (ارقم)ی کوڕی (ابو ارقم)ی (مەخزومی)ان و، (عوثمان)ی کوڕی (مەظعون) و هەردوو براکەی (قدامە) و (عبدالله)و ، (عبیدە)ی کوڕی (حارث)ی کوڕی (مطلب)ە کوڕی (عبدالمناف) و (سعید)ی کوڕی (زید)ی (عدوی) و ، هاوسەرەکەی (فاطمة)ی کچی (خطاب)ی (عدوی) خوشکی (عمر)ی کوڕی (خطاب) و، (خباب)ی کوڕی (ارت) و (عبدالله)ی کوڕی (مسعود)ی (هزلی) و خەڵکی تریش.

ئەمانە بریتی بوون لە (السَّابِقُون الأَوَّلُون) واتە پێشینە یەکەمینەکان ، ئەمانە لە لق و پۆپەکانی قوڕەیش بوون ، (إبن هشام) بەزیاتر لە چل کەس[2] ئەژماری کردوون ، لە باسی هەندێکیشیاندا قسەو تێبینی هەیە .

(إبن إسحاق) دەڵێت: پاش ئەوەی پۆل پۆل خەڵك موسوڵمان دەبوون لە ژن و پیاو هەتا ناوی ئیسلام لەناو مەککەدا بڵاوبوەوەو خەڵك قسەوباسیان لێدەکرد[3].

ئەوانە بەنهێنی موسوڵمان بووبوون، پێغەمبەریش ﷺ بەنهێنی کۆ بوونەوەی لەگەڵدا دەکردن و ڕێنوومایی دەکردن ، چونکە هێشتا بانگەواز نهێنی و تاکە کەسیی بوو ، (نیگا)ش بەدوای یەکدا بەگەرمی دوای سورەتی (الْمُدَثِّر) دەهاتە خوارەوە ، ئەو ئایەت و پارچە سورەتانەی لەو رۆژگارەنەدا دەهاتە خوارەوە کورت

---

[1] / لەبارەی ئەم شۆرەتەوەو بڕوانە (صحیح البخاري)، مناقب ابی عبیده بن الجراح ١/٥٣٠.
[2] / بڕوانە سیرەتی إبن هشام ١/٢٤٥ هەتا ٢٦٢ .
[3] / هەمان سەرچاوە ١/٢٦٢.

بوون و، چەند برگەو وەستانێکی جوانیان تێدابوو، بەئاوازێکی هێمن و سەرنج ڕاکێشی هاوچەشن لەگەڵ ئەو کەش و هەوایەدا چرپەیەکی ناسکی دەکرد، باسی دەروون پاککردنەوەو قەدەغەکردنی پیسی بەچەپەڵیەکانی دونیای تێدابوو ، وەسفی بەهەشت و دۆزەخی بەشێوەیەك دەکرد وەکو لەبەرچاو بن ، دەستی ئیماندارانی دەگرت بۆ کەش و هەوایەکی تری جیا لەو واقیعە مرۆڤیەی تێیدا دەژیان .

## نوێــــژ

نوێژ یەکێك بوو لەو شتانەی هەر لەسەرەتادا فەرمانی لەسەر دابەزی ، (مقاتل)ی کوڕی (سلیمان) دەڵێت: لە سەرەتای ئیسلامدا خوای گەورە دووڕکات نوێژی بەیانی و دووڕکات نوێژی خەوتنانی فەرز کرد ، بەبەڵگەی ئایەتی: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ {٥٥}﴾ غافر، (إبن حجر) دەڵێت: گومانی تێدانیيە کە پێغەمبەر ﷺ پێش شەوڕەوی نوێژی کردوە ، هەروەها هاوەڵانیش ، جیاوازی لەوەدایە ئایا (٥) نوێژەکە ئەوکاتە واجب بوو بوون یان نەء؟ گوتراوە کە نوێژێکی پێش خۆر هەڵهاتن و نوێژێکی پێش خۆرئاوا بوون فەرز بووە (تەواو).

هەروەها (حارث)ی کوڕی (أسامە) لە ڕێگەی (إبن لهیعە) وە بە (موصول)یی لە زەیدوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرەتای هاتنی وەحیدا جبریل (ع) هاتەلای ، دەست نوێژی فێرکرد ، کە لە دەست نوێژ بوەوە بەمشتێك ئاو داوێنیشی پاك کردەوە ، (ابن ماجە)ش بەم مانایە ڕیوایەتێکی کردوە ، بەهەمان شێوە لە (براء) ی کوڕی (عازب) و (إبن عباس)ەوە، لەفەرمودەیەکی (إبن عباس)دا هاتوە، ئەمەش لە سەرەتای فەرز بوونەکەدا بووە[1].

(إبن هشام) دەڵێت: کەکاتی نوێژ دەهات پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی دەچوونە شیوەکان ، بە دوور لەچاوی قوڕەیشیەکان نوێژەکانیان بەنهێنی دەکرد ، جارێکیان (أبو طالب) پێغەمبەر ﷺ و عەلی بینی بوو نوێژیان کردبوو، قسەی لەگەڵدا کردبوون ، کە بەڕوونی لەمەسەلەکە تێگەیشتبوو داوای لێکردبون کەدامەزراو بن[2].

---

[1] / مختصر سيرة الرسول ﷺ . نوسینی : شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل ٨٨ .

[2] / إبن هشام ٢٤٧/١.

## هەواڵەکە بە سەرجەمیی دەگاتە قورەیش

پاش سەیرکردنی چەندلایەنێکی ڕووداوەکان دەردەکەوێت کە بانگەواز – لەو قۆناغەدا – با نهێنی و تاکە کەسیش بووبێت ، بەڵام هەواڵەکانی گەیشتبووەوە قورەیش کەچی گوێیان پێ نەئەدا.

(محمدالغزالی) دەڵێت: ئەم هەواڵانە دەگەیشتەوە بەقورەیش بەڵام هیچ گرنگیان پێ نەدەدا ، لەوانەیە وایان زانیبێت (محمد ﷺ) یەکێکە لە (دیانەکان) ، کە ئەوانە بوون لەبارەی خوایەتی و مافەکانیەوە قسەوباسیان دەکرد، وەکو گوتەکانی (أمیە)ی کوڕی (صلت) و (قس)ی کوڕی (ساعدە) و (عمرو)ی کوڕی (نفیل)و هی تریش، بەڵام بەنهێنی سوسەی بڵاوبوونەوەی هەواڵ و پەرشبوونی ئاسەوارەکەیان دەکردو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چاوەڕوانی چارەنووس و بانگەوازەکەیان دەکرد[1].

***** ***** ***** *****

سێ ساڵ تێپەڕی بانگەواز هێشتا لە قۆناغی تاکە کەسی و نهێنیدا بوو، لەو ماوەیەدا کۆمەڵێك ئیمانداری باش لەسەر بنەمای برایەتی و هاوکاریی و گەیاندن و پشتیوانی کردنی پەیامەکە پەروەردە بوون ، پاش ئەوە (نیگا) هاتە خوارەوە داوای دەکرد لەپێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر خێڵەکەیدا خۆی ئاشکرا بکات و، ڕووبەڕوی بیرو باوەڕە پووچەکەیان بێتەوەو شاڵاو بکاتە سەر بتەکانیان.

---

[1] / فقه السیرة ل ٧٦

## یەکـەم فەرمانی .. ئاشکـرا کـردنی بـانگەواز

لەو بارەیەوە یەکەم ئایەت دابەزی ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ {٢١٤}﴾ بوو لە سوورەتی (الشعراء) ، ئەو سوورەتەی ئەم ئایەتەی تێدایە سورەتی (الشعراء) ە ، لە سەرەتاکەیدا باسی (موسا ﷺ) هاتووە هەر لەسەرەتایی بەپێغەمبەر بونیەوە هەتا کۆچ کردنی لەگەڵ بەنی ئیسرائیلداو، رزگاربونیان لە فیرعەون و تاقمەکەی و، نغرۆکردنی فیرعەون و دەستەکەی لەگەڵیداو، ئەم چیرۆکە باس لەهەموو ئەو قۆناغانە دەکات کە (موسا ﷺ) پێیدا گوزەراوە ، سەبارەت بە بانگەوازکردنی فیرعەون و گەلەکەی بۆ لای خوای گەورە.

پێم وایە ئەم وردو درشتیە لەکاتێکدا هێنراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدرا بانگەشەی گەلەکەی بکات بۆ لای خوا، بۆئەوەی نموونەیەك لەبەردەم خۆی و هاوەڵەکانیدا هەبێت لە بەدرۆخستنەوەو چەوساندنەوەی خەڵك بۆیان لەگەڵ ئاشکرا کردنی بانگەوازەکەیانداو، هەتا لەم سەرەتایەوە بەرچاو ڕونیەکیان هەبێت لەسەر داهاتووی بانگەوازەکەیان .

لەلایەکی ترەوە باسی چارەنووسی بەدرۆخەرەوانی پێغەمبەرانی تێدایە ، وەك گەلی نوح و، عاد و، ثمود و، گەلی ئیبراهیم و، گەلی لوط ، خاوەن ئەیکەکان – زیاد لەوەش باسی فیرعەون و گەلەکەی باسکراوە – بۆئەوەی یاخیبوانیش بزانن کاتێك ئەوانە لە پەیامی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران بەردەوام دەبن چ چارەنووسێك چاوەڕێیانەو، هەتا ئیمانداارانیش بزانن کە چارەنووسی باش چاوەڕوانی ئەوانە نەك یاخیبوان.

## بانگـەواز لەنـاو خزمـاندا

یەکەم کارێك پێغەمبەری خوا ﷺ کردی پاش هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ، ئەوە بوو خێڵی بەنوهاشمی بانگ کرد ، ئەوانیش ئامادەبوون ، چەند کەسێکی کوڕانی (عبد المطلب)ی (عبد مناف)یشیان لەگەڵدا بوو ، چل و پێنج پیاو دەبوون ، (أبو لهب) هاتە پێشەوە وتی: ئەمانە هەموو مام و ئامۆزاکانی تۆن ، قسە بکەو واز لە (صابیيء)یەکان بهێنە ، ئەوەش بزانە خێڵەکەی تۆ توانای بەسەر هەموو عەرەبدا ناشکێت ومنیش نزیکترین کەسم دەستی تۆ بگرم ، کەسەکانی باوکی

خۆتـت بەسـە ، خـۆ ئەگـەر لەسـەر ئـەم حاڵـەت بمێنیتـەوە ئـەوە بـەلای ئەوانـەوە ئاسانترە کەچەند بنەماڵیەکی قورەیش بە پاڵپشتی عەرەبەکان بدەن بەسەرتدا ، بەڕاستـی کەسـم نـەدیوە شتێکی لـەوەی تـۆ خـراپتری بـۆ خزمـانی بـاوکی خـۆی هێنابێت ، پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، لەو مەجلیسەدا هیچ قسەیەکی نەکرد.

پاشان جارێکیتر بانگیکردنەوەو فەرمووی: ((سوپاس بۆ خوایگەورە، حەمدو سەنای دەکەم، داوای کۆمەکیی لێدەکەم ، باوەڕم پێیەتی، پشتی پێ دەبەستم، شایەتی دەدەم جگە لەخوای تاك وتەنها هیچ خوایەکیتر ڕاست نیە، هاوبەشی نیە، پاشان فەرمووی : پێشڕەو هەرگیز درۆ لەگەڵ کەسەکانی خۆیدا ناکات ، سوێندم بەو کەسەی جگە لەو خوایەکیتر ڕاست نیە ، من پێغەمبەری خوام بۆلای ئێوە بەتایبەتی و، بۆلای خەڵك بەگشتی نێرراوم ، سوێند بەخوا دەمرن هەروەکو چۆن دەخەون، زیندووش دەکرێنەوە هەروەکو چۆن لەخەو هەڵدەستن و، لەسەر کردەوەکان لێتان دەپرسرێتەوە، چارەنووس یان بەهەشتی هەمیشەییە یان دۆزەخی هەمیشەیی)) .. ئەبو تالیب وتی: چەندە پێمان خۆشە یارمەتیت بدەین و، بەئامۆژگاریەکانت ڕازین ، ئای کەچەندە متمانەشمان بەقسەکانت هەیە ، ئەمانەش کەسەکانی باوکی تۆن لێرە کۆبوونەتەوە ، من یەکێکم لەوانە بەلام لەوان خێراتر دێم بەدەمتەوە ، بڕۆ بەردەوامبە لەسەرئەوەی فەرمانت پێدراوە، سوێندبێت بەخوا بە بەردەوامی دەبمە قەڵغانت و دەتپارێزم، بەلام نەفسم ڕێگەم نادا لەئایینی (عبد المطلب) جیاببمەوە.

(ئەبو لەهەب) وتی: وەڵلاهی ئەمە زۆرخراپە، خەڵکینە دەستی بگرن پێش ئەوەی بەرۆکی خەڵکیتر بگرێت، ئەبوتالیبیش وتی: سوێندبێت بەخوا هەتا لەدونیادا بین بەرگری لێ دەکەین.[1]

[1] / ابن الأثیر ، فقه السیرة ل ٧٧ ، ٧٨ .

## لەسەر کێوی سەفا

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیابوو لەپەیمانەکەی ئەبو تاڵیب بە پاراستنی، لەکاتێکدا کە فەرمانی خوا ڕادەگەیەنێت ، ڕۆژێکیان چووە سەر کێوی (سەفا) و هاواری کرد: (یا صباحاه) بنەماڵکانی قورەیشی لێ کۆبووەوە ، بانگی کردن بۆ یەکتاپەرستی و باوەڕ بەپەیامەکەی و ڕۆژی دوایی ، (بوخاری) لە (إبن عباس)وە بەشێکی ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ وأنذر عشيرتك الأقربين ﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر کێوی سەفا ، هاواری کرد: ئەرێ خێڵی بەنی فەهر! خێڵی بەنی عەدی لقەکانی قورەیش )) ، هەتا کۆبونەوە ، ئەو کەسەش خۆی نەهاتایە کەسێکی دەنارد بزانێت چیە ، قورەیش و ئەبو لەهەب هاتن ، فەرمووی: ( ئەگەر هەواڵتان بدەمێ چەند سوارێك لەودیو ئەو دۆڵەوە دەیەوێت بدات بەسەرتاندا، باوەڕم پێدەکەن ؟) وتیان: بەڵێ، جگە لەڕاستی هیچی ترمان لێ نەبینیوێت، فەرمووی: من ئاگاداری ئێوە دەکەمەوە لە سزایەکی توند)) ئەبولەهەب وتی: ئەمرۆش دەستت بە قوڕدا چێت ، بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە؟ ئەنجا فەرمووی ﴿ تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴾ هاتە خوارەوە.[1]

هەروەها (مسلم) لە (أبي هريرە) وە (ڕ) بەشێکی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە ، دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴾ هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ گوتارێکی ئاڕاستەی گشت و تایبەت کرد ، فەرمووی: (خێڵی قورەیش خۆتان لەدۆزەخ ڕزگار بکەن ، خێڵی بەنی کەعب! خۆتان لە دۆزەخ ڕزگار بکەن ، فاتمەی کچی موحەممەد! خۆت لە دۆزەخ ڕزگار بکە ، سوێندم بەخوا من لەبەردەم خوادا هیچ بەدەست نیم ، تەنها ئەوەیە ئێوە خزمن منیش ئەو پەیوەندی خزمایەتیە زیندوو دەکەمەوە))[2].

ئەم ئامۆژگاریە بەرزانە جوانترین شێوەی گەیاندن بوو ، پێغەمبەر ﷺ بۆ نزیکترین کەسی خۆی ڕوون کردەوە ، کە متمانەدان بەو پەیامە زیندوکردنەوەی پەیوەندی نێوان ئەوان و خۆیەتی ، بۆیە دەمارگیرێتی خزمایەتی کە بنەمای ژیانی عەرەبی لەسەر دامەزرا بوو لەناو گەرماو گەرمی ئەم ئاگادار کردنەوە خواییەدا توایەوە .

---

[1] / صحيح البخاري ٧٠٢/٢ . ٧٠٣ ، ریوایەتەکە لە (صحیح)ی موسلیمیشدا دەرهێنراوە ١١٤/١ .
[2] / صحيح مسلم ١١٤/١ . صحيح البخاري ٣٨٥/١ ، ٧٠٢/٢ ، مشكاة المصابيح ٤٦٠/٢ .

## بەدەنگی بەرز گوتنی حەق و دژەکاری موشریکان

هێشتا ئەم دەنگە سەداو دەنگدانەوەی لەمەککەو دەوروبەریدا مابوو ، ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ {٩٤}﴾ الحجر، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بەهەڵماڵینی ڕووی ڕەشی پڕوپوچێتی و بێسەرو بەرێتی شیرك و، بەهای ڕاستەقینەی بتەکانی باس دەکردو ، نموونەی لەسەر دەستەوسان بوونیان دەهێنایەوەو ، بەبەڵگەوە ڕوونی دەکردەوە کە هەرکەسێك بیانپەرستێت و بیانکاتە هۆی گەیشتن بە پەروەردگار ، ئەوە لە گومڕابوونێکی ڕووندایە.

جامی تووڕەیی مەککەییەکان پڕبوو، دەنگوباس و ناڕەزایی پەیدا بوو ، ئەوەتا گوێیان لێیە یەکێك بەئاشکرا باس لە سەرلێشێواوێتی بتپەرستان دەکات ، وەك هەورە بروسکە چەخماخەی دەداو ئەو کەشوهەوا لە دێر زەمانە هێمنەی شڵقاند بەسەریەکدا ، قوڕەیش ڕاچەنی و خۆی ئامادەکرد بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو شۆڕشە هەڵگیرساوە ، کە وا خەریکە نەریتە باوەکانیان ڕادەماڵێت.

قوڕەیش ڕاچەنی چونکە دەیزانی کە مانای بەیەکخوایەتی ( ﷲ )و ، باوەڕ بوون بەپەیام و ڕۆژیدوایی مانای ملکەچی تەواوو خۆ بەدەستەوەدانی ڕەها دەگەیەنێت ، بەشێوەیەك کەخۆیان هیچ خواست و ویستێکیان لەسەر خۆیان وماڵیان نامێنێت ، سەرباری غەیری خۆیان ئەمەش مانای سفربوونی دەسەلات و لووت بەرزیان بەسەر غەیری عەرەبدا دەگەیەنێت ، کەپێشتر مۆرکێکی ئایینی هەبوو ، دەبێت لەمەودواش ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بخەنە پێش ڕەزامەندی خۆیانەوەو ، واز لەو ستەمە بهێنن کە لەخەڵکی ڕەش و ڕووتیان دەکردو، ئەو خراپانەی کە بەیانی و ئێوارە ئەنجامیان دەدا ، ئەم مانایەیان باش دەزانی بۆیە دەروونیان قەبووڵی ئەوبارە سەرشۆڕیەی نەدەکرد، نەك لەبەر ڕێزداریی و خێرو چاکەیان ﴿ بَلْ يُرِيدُ الْإِنسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ {٥}﴾ القيامة، ئەوەیان بەباشی دەزانی ، بەڵام چی بکەن لەبەردەم پیاوێکی ڕاستگۆی دەستپاکدا ، کە نموونەی بەرزترین بەهای مرۆڤی و بنەماکانی ڕەوشتەو ، پێشتر هاو وێنەو هاوتایان لەمێژووی باوو باپیرانی گەلانی تردا نەبینیوە؟ چی بکەن؟ واق وڕما بوون ، ناهەقیشیان نەبوو لەوەدا.

پاش هێنان و بردنی زۆر چاریان نەما جگە لەچوونە لای (ابو طالب)ی مامی، بۆئەوەی داوای لێبکەن دەستی برازاکەی بگرێت لەو بارەداو، پێیان وابوو کە شێلگیرانە تر قسە بکەن و بڵێن: بانگەشە بۆ وازهێنان لە خواکانیان ، باس کردنیان بە بێکەڵك و بێتوانایی قسەوتن و سووکایەتی کردنە بەخواکان و، بەگەمژەزانینی ئەو باووباپیرانەیە کە لەسەر ئەو ڕێبازە بوون ، ئەم ڕێگەیان پێ باش بوو خێرا دەستیان کرد بەگرتنە بەری.

## شاندێکی قورەیش بۆ لای ئەبو تاڵیب

(إبن إسحاق) دەڵێت: چەند پیاوێك لەگەورەکانی قورەیش چوونە لای ئەبو تاڵیب ، وتیان: ئەبو تاڵیب برازاکەت قسە بەخواکانمان دەڵێت ، ئایینەکەمانی عەیبدار کردووە ، عەقڵمان بەسووك دەزانێت ، باپیرانمان بەسەرلێشێواو دەزانێت ، یان دەستی بگرە ، یان وازمان لێ بهێنە باخۆمان لەگەڵیدا یەکلای بکەینەوە ، تۆ بۆ خۆت وەك ئێمەیت ، کەواتە ئێمە لەکۆڵ تۆشی دەکەینەوە ، لە وەڵامدا ئەبوتاڵیب بەنەرمیی وەڵامی دانەوەو ، بەشێوەیەکی جوان دەستی پێوەنان و ئەوانیش بڵاوەیان کرد ، پێغەمبەریش ﷺ لەکارەکەی خۆی بەردەوام بوو ، ئایینی خوای ڕوون دەکردەوەو ، بانگەشەی بۆ دەکرد[1].

## ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی ڕێگەگرتن لە حاجیان بۆ گوێ نەگرتن لە بانگەواز

لەوچەند ڕۆژەدا مەسەلەیەکیتر قورەیشی سەرقاڵ کردبوو ، ئەویش ئاشکرا کردنی بانگەواز بوو ، کە پێش وەرزی حەج چەند مانگێکی بەسەر تێپەڕی بوو ، قورەیش دەیزانی شاندەکانی عەرەب لە هەموولایەکەوە دێن بۆ لایان ، پێیان وابوو کەدەبێت شتێك بەو شاندە عەرەبانە بڵێن لەبارەی موحەممەدەوە ﷺ هەتاکو بانگەوازەکەی هیچ کاریگەریەکی لەسەر دەروونیان نەبێت ، لەگەڵ وەلیدی کوڕی موغەیرە کەوتنە قسەوباس لەسەر ئەو مەسەلەیە ، وەلید پێی وتن: با یەك ڕاتان هەبێت لەسەری ، ڕا جیاواز مەبن و هەندێکتان یەکتری بەدرۆ بخەنەوەو ، قسەی یەکتری ڕەت بکەنەوە ، وتیان : تۆ ئەو قسەیە بڵێ ، وتی: نەخێر ئێوە بیڵێن! من دەبیستم ، وتیان: دەڵێن: فاڵگرەوەیە ،

---

[1] / إبن هشام ١/٢٦٥.

وتــی: نەخێر سوێند بێت بەخوا فاڵگرەوە نیـیە ، ئێمە فاڵگرەوەمـان دیـوە ، ئەو قسانە نەدەنگی فاڵچیـیەو نەسەروای ئەوە ،

وتیان: کەواتە شێتە ،

وتــی: شێتیش نیـیە ، ئێمـە شێتمان دیـوەو دەیناسـین ، ئـەو دڵـەڕاوکـێ و فێ لێهاتن و تێکچوونی شێتی نیـیە ،

وتیان: دەڵێین: شاعیرە ،

وتی: شاعیریش نیـیە ، ئێمە هەموومان کێش و سـەرواوو کورت و درێـژو شێوازەکانی شیعر دەزانین ، ئەوە شیعر نیـیە ،

وتیان : دەڵێن جادووگەرە ،

وتــی: وەڵلاهـی جادووگـەریش نیـیـە ، ئێمـە جادووگـەرو جادوەکانیانمان بینیوە ، ئەمە گرێ و فووپێدانی ئەوان نیـیە ،

وتیان: کەواتە چی بڵێن ؟

وتی: سوێندم بـەخوا قسـەکانی شیرینیەکیان تێدایـە ، بنەڕەتـەکـەی ڕەگـی داکوتاوەو، لق و پۆپەکەشی بەروبومدارە، ئێوە هەرچیەك لەوقسانە بکەن دەزانرێت کەڕاسـت نیـیـە ، نـزیکترین قسـەیەکیش لەگوتـەکانی ئـەوەوە جادوگەریـە ، بڵـێن: گوتەیەکی هێناوە جادووە ، جیاوازی دەخاتە نێوان کوڕو باوك و، مرۆڤ و براکـەی و، ژن و مێردو ، مرۆڤ و خێڵەکەیەوە ، بەم قسەیە بڵاوەیان لێ کرد[1].

هەندێك ڕیوایـەتیش دەڵێـت: کاتێك وەلید هـەموو قسـەکانی ئـەوانی ڕەت کردەوە ، وتیـان: ئـەو ڕایـەی خۆتمـان پـێ بڵـێ کـەگومانی تێدا نـەبێت ، پێـی وتن: لەسەرم بوەستن تابیرێکی لێ بکەمەوە ، وەلیـد بیری دەکـردەوە ، هـات و ئـەو ڕایـەی پێ وتن کە پێشتر باسکرا[2].

لەبارەی وەلیدەوە خوای گەورە شانزە ئایەتی لەسورەتی (الْمدَّثِّر) لە (١١-١٦) ، ناردە خوارەوە، لەسۆنگەی ئایەتەکاندا شێوازی بیرکردنـەوەی وەلیـد دیـارە، دەفەرموێت : ﴿ إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ {١٨} فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ{١٩} ثُمَّ قُتِلَ كَيْـــفَ قَـــدَّرَ{٢٠} ثُـــمَّ نَظَرَ{٢١} ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ {٢٢} ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ {٢٣} فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ {٢٤} إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ {٢٥}﴾.

---

[1] / هەمان سەرچاوە ٢٧١/١.

[2] / بڕوانە (فی ظلال القرآن) ٢٩،١٨٨.

واته: وەلید بیری کردەوەو ئەندازەگیری بۆ کرد ، خوا بیکوژێت چۆن بیری کردەوەو ئەندازەگیری کرد ، پاشان خوا بیکوژێت چۆن ئەندازەگیری کرد ، پاشان ڕووی گرژ کردو پەلەی کرد ، پاشان پشتی هەڵکردو بەلووت بەرزیەوە وتی: ئەمە جگە لە جادویەکی زاڵکراو چیدی نیە ، ئەمە جگە لەقسەی مرۆڤ چیدی نیە.

پاش ئەوەی کە ئەنجوومەن لەسەرئەو بڕیارە یەکدەنگیان کرد دەستیان کرد بەجێبەجێ کردنی ، لەسەر ڕێگەی هاتووچۆی خەڵك دادەنیشتن لەو وەرزەدا ، هەر کەسێك بەلایاندا دەگوزەرا وریایان دەکردەوە لەپێغەمبەر ﷺ و باسی خراپی ئەویان بۆ دەکرد[1].

ئەوەی کاری هەرەگەورەی لەئەستۆ گرتبوو (أبو لهب) بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو وەرزەدا بەدوای خەڵکیدا دەچووەماڵەکانیان و لە (عکاظ) و (مجنة) و (ذی المجاز) پێیان دەگەیشت و بانگی دەکردن بۆلای خوا، (أبولهب)یش بەدوایەوە بوو ، دەیوت : خەڵکینە بەگوێی مەکەن ئەو پیاوە هەڵگەڕاوەیەکی درۆزنە[2].

ئەمەش کارێکی کرد لەو وەرزەدا عەرەب باسی پێغەمبەر ﷺ ببەنە دەرەوە و ، باس و خواسی لەهەموو شوێنەکانی وڵاتی عەرەبدا بڵاوبوەوە.

---

[1] / إبن هشام ٢٧١/١.

[2] / ئەم کردەوەیە ترمذی ریوایەتی کردوە لە طارقی کوڕی عبداللە ی محاریبەوە/الإمام احمد ٤٩٢ ، ٣٤١/٤ لە مەسنەلەکەیدا هاتووە.

## چەند شێوازێك بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بانگەواز

کاتێك قورەیش سەیری کرد هیچ یەکێك لەو هۆیانە موحەممەد ﷺ لانادەن لە بانگەوازەکەی ، جارێکی تر کەوتنە بیرکردنەوە ، بۆ سەرکوتکردنی ئەو بانگەوازە چەند شێوازێکیان هەڵبژارد ، کە لەم خاڵانەدا خۆی دەبینیەوە :

١. گاڵتە پێکردن و سووکایەتی کردن و، بە درۆ خستنەوەو پێ پێکەنین و، بەمەش مەبەستیان سەرشۆڕ پێکردنی موسڵمانەکان و، لاوازکردنی هێزە مەعنەویەکەیان بوو ، پێغەمبەریان ﷺ بەتۆمەتی بێماناو ، جنێوی هەرزەیانە تاوانبار دەکرد ، بەشێت بانگیان دەکرد: ﴿ وَقَالُواْ يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴾ الحجر/٦، مۆرکی جادوویی و درۆیان دەدایە پاڵی ﴿ وَعَجِبُوا أَن جَاءهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ﴾ ص/٤، بەتێڕوانینی داخ لەدڵانەو هەڵچونێکی خێراو شێتانەوە مامەڵیان لەگەڵدا دەکردو ڕوویان دەدایە ﴿ وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ ﴾ القلم/٥١ ، ئەگەر دانیشتایەو هاوەڵە هەژارەکانی بەدەوریدا خڕبونایەتەوە گاڵتەیان پێدەکردن و دەیانوت: ئائەمانە هاونشینەکانی موحەممەدن کەخوا فەزڵی داون بەسەر ئێمەدا ﴿ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا ﴾ الانعام/٥٣، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴾ الأنعام/٥٣، واتە: ئایا خوای گەورە زاناتر نیە بەو کەسانەی سوپاسگوزارن؟ ئەوانە هەروەکو خوای گەورە بۆمان باس دەکات ﴿ إنَّ الذين أجْرَموا كانوا منَ الذين آمنوا يضحكون ، وإذا مَرُّوا بِهِمْ يَتغامَزون ، وَإذاآنقَلَبوا إلى أهلهِمُ أنقَلَبُوا فَكِهِين ، وإذا رأوهم قالوا إنَّ هؤلاء لضالون ، وما أُرسلوا عليهم حافظِين ﴾ المطففين ٢٩ــ٣٣.

٢. شێواندنی فەرمایشتەکانی و وروژاندنی گومان و ، بڵاوکردنەوەی پڕو پاگەندەی درۆو، هەواڵی ناڕاست لەبارەی ئەو فەرمایشتانەوەو ، دەربارەی زاتی کەسێتی خۆی و، زۆرکردنی ئەو هەولانە بۆئەوەی عەوامی خەڵك بواری نەمێنێت بیر لە بانگەوازەکەی بکاتەوە ، لەبارەی قورئانەوە دەیانوت: ﴿ وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ الفرقان/٥ واتە: ئەمە ئەفسانەی گەلانی پێشینەو نوسیویەتیەوەو بەیانی و ئێوارە بەسەریدا دەخوێنرێتەوە، یان﴿ إِنْ هَذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ ﴾ الفرقان/٤ واتە: ئەو قورئانە جگە لەهەڵبەستراوێك چیتر نیەو چەند کەسێکی تر یارمەتیان داوە ، هەروەها دەیان وت:﴿ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ ﴾ النحل/١٠٣ واتە: بێگومان ئەو قورئانە مرۆڤ، فێری کردوە ، هەروەها لەبارەی

پێغەمبەرەوە ﷺ دەیانوت: ﴿ مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِـي الْأَسْـوَاقِ ﴾ الفرقان/٧ واتە: ئەم پێغەمبەرە چیەتی ، وەکو خەڵکی ئاسایی دەخوات و بەبازاڕدا دێت و دەچێت ، لە قورئانیشدا نموونەی زۆر هەیە بۆ ڕەتدانەوەی هەواڵەکانیان پاش هێنانی یان نەهێنانی.

٣. دژایەتی کردنی قورئان و وێناکردنی بەئەفسانەی پێشینان و، سەرقاڵ کردنی خەڵك پێیانەوە، دەڵێن جارێکیان (نضر)ی کوڕی (حارث) بە قوڕەیشیەکانی وت: ئەریٚ خێڵی قوڕەیش! شتێکتان بەسەردا هاتووە وا هێشتا نەتانتوانیوە چارە دۆزی بۆ ئەو پیاوەبکەن ، موحەممەد لەناوتاندا غولامێکی منداڵ بوو ڕەزامەند ترینتان بوو، ڕاستگۆترینتان بوو ، لەهەمووتان سپاردەناستر بوو ، تا ئەوکاتەی تاڵی سپیتان لەڕیشیدا بینیو ئەوەی بۆی هێنان کەهێناویەتی ، وتتان: جادوگەرە ، سوێند بەخوا جادووگەرنیە ، ئێمە جادوگەران و فوکردن و گرێکانمان دیوە ، وتتان: فاڵگرەوەیە سوێندم بەخوا فاڵگرەوەش نیە ، ئێمە فاڵگرو ورتەورت و سەرواکانیانمان دیوە ، وتتان: شاعیرە ، نەخێر سوێندم بەخوا شاعیریش نیە ، ئێمە شیعرو جۆرەکانی و کێش و سەرواکانیمان دیوە ، وتتان شێتە ، سوێندم بە خوا شێتیش نیە ، ئەو پیاوە تەنگە نەفەس بوون و خوت خوتەو ، تێکەڵ و پێکەڵیی شێتی نیە ، ئەریٚ خێڵی قوڕەیش سەیرێکی کاروباری خۆتان بکەن ، سوێندم بەخوا کارێکی گەورەتان بە سەردا هاتوە.

پاشان (نضر) چوو بۆ (حیرە) ، لەویٚ فێری حیکایەتی مەلیکەکانی فارس و، بەسەرهاتەکانی ڕۆستەم و ئەسپەندیار بوو، هەرکاتێك پێغەمبەر ﷺ لەشوێنێکدا دانیشتایە بۆ یادخستنەوەی خواو ئاگاداركردنەوە لەهەڕەشەو تۆڵەی خوایی، (نضر) لەپشتیەوە دەوەستاو دەیوت: وەڵڵاهی موحەممەدو قسەکانی لە من باشتر نیە ، پاشان دەستی دەکرد بەباسی مەلیکەکانی فارس و ڕۆستەم و ئەسپەندیارو پاشان دەیوت: ئیدی موحەممەد بە چ شتێك قسەکانی لەقسەکانی من باشترن؟![1].

گێڕانەوەکەی (إبن عباس) دەڵێت : (نضر) چەند کەنیزەکێکی کڕی بوو ، لەهەرکەسێکی ببیستایە حەزی بەلای پێغەمبەردا هەیە ﷺ یەکێك لەو کەنیزەکانەی بۆ دەنارد خواردنی دەدایەو شەرب نۆشی پێدەکردو گۆرانی بۆ دەوت هەتا وای لێ

---

[1] / إبن هشام/١ ٣٥٨، ٢٩٩،٣٠٠، تفهیم القران ٨،٩/٤، هەروەها . مختصر سیرە الرسول ﷺ نوسینی (شێخ عەبدوڵڵای نەجدی) ل١١٨، ١١٧.

دەکرد حەزی لە ئیسلام نەدەما ، لەبارەی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّـهِ ﴾ لقمان/٦ [1] ، واتە: هەندێك كەس مەجلیسی گاڵتەو گەپ بەپارە ساز دەكات بۆ ئەوەی سەر لەخەڵكی تێك بدات.

٤ـ هەوڵیاندا سەوداگەریەك بكەن تیایدا ئیسلام و جاهیلیەت لەنیوەی ڕێگادا یەك بگرن ، بەوەی موشریكان واز لەهەندێك لەو حاڵەتانەی ئێستایان بهێنن و ، پێغەمبەریش ﷺ واز لەهەندێك داخوازیی خۆی بهێنێت ﴿وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ﴾ القلم/٩ واتە: حەزیان دەكرد تۆ كەمێك نەرم بیت تائەوانیش شل بوونایە ، گێڕانەوەیەكیش هەیە (إبن جرير) و (طبراني) گێڕاویانەتەوە دەڵێت: موشریكان داوایان خستە بەردەم پێغەمبەر ﷺ كە ئەو ساڵێك خواكانی ئەوان بپەرستێت و، موشریكانیش ساڵێك خواكەی ئەم بپەرستن گێڕانەوەیەكی (عبد بن حميد)یش هەیە دەڵێت: موشریكان وتیان ئەگەر تۆ بەخواكانی ئێمە ڕازیی بیت ئێمەش خواكەی تۆ دەپەرستین[2].

هەروەها (إبن إسحاق) بەسەنەدێكی خۆی دەڵێت: لەكاتێكدا كە پێغەمبەر ﷺ بە دەوری كابەدا تەوافی دەكرد ، ئەم موشریكانە ڕێگەیان گرت ـ (أسود)ی كوڕی (أسد)ی كوڕی (عبدالعزى) و (وليد)ی كوڕی (سفيره) و (أميه)ی كوڕی (خلف) و (عاص)ی كوڕی (وائل)ی سەهمی . ئەمانە شەوكەت دارەكانی خێڵی خۆیان بوون . وتیان: موحەممەد وەرە با ئەوە بپەرستین كە تۆ دەیپەرستی ، تۆش ئەوەی ئێمە بپەرستە ، بەو شێوەیە هەردوولامان لەو مەسەلەیەدا هاوبەش دەبین ، ئەگەر ئەوەی تۆ دەیپەرستیت خێری تێدا بێت پشكێكمان بەردەكەوێت ، ئەگەر ئەوەی ئێمەش خێری تێدابێت تۆ پشكێكت بەردەكەوێت ، خوای گەورە لەبارەیانەوە ئەم سورەتەی دابەزاند ﴿ قُلْ ياأيُها الكافرون، لاأعبدُ ماتَعْبُدون ﴾ الكافرون[3]، خوای گەورە بەم جیا بوونەوە یەكلاكەرەوەیە كۆتایی بەو دانوستانە پێكەنیناویەی موشریكان هێنا ، لەوانەشە جیاوازیەكە لەوەدابێت كە موشریكان دوای ئەو هەوڵە هەوڵی تریشیان دابێت.

---

[1] / تفهيم القرآن ٤/٩ .

[2] / تفهيم القرآن ٢٠٥،٥٠١/٦.

[3] / إبن هشام ٣٦٢/١.

# ئـەشكـە نجـەدان

موشریكان لە سەرەتای ساڵی چوارەمی پێغەمبەرێتیەوە وردە وردە زیاتر كاریان كرد لەسەر ئەو شێوازانەی پێشتر باسمان كرد بۆ وەستاندنی بانگەواز ، هەتا تێپەڕبوونی چەند هەفتەو مانگێك لەسەری بەردەوام بوون ، هێشتا سەریان نەكردبووە چەوساندنەوەو ئەشكەنجەدان ، بەڵام كاتێك بینیان ئەو شێوازانە ڕێگە لەبانگەوازی ئیسلامی ناگرێت ، جارێكیتر كۆبوونەوە، لیژنەیەكی (١٥) كەسیان دروستكرد لە گەورەكانی قورەیش، سەرۆكەكەیان (ابو لهب)ی مامی پێغەمبەر بوو ﷺ ، پاش ڕاوێژو بیركردنەوە ئەو لیژنەیە بڕیارێكی یەكلاكەرەوەی دژ بەپێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەكانی دا ، ئەو لیژنەیە بڕیاریدا كەم و كووڕی نەكات لەدژایەتی كردنی ئیسلام و ئازاردانی پێغەمبەرەكەی و ئەشكەنجەدانی شوێنكەوتوانیداو بە چەندین شێوەو جۆر ئازارو ئەشكەنجەیان بدات[1].

بڕیاریانداو سووربوون لەسەر جێبەجێ كردنی، سەبارەت بە موسڵمانەكان . بەتایبەتی لاوازەكانیان . ئەشكەنجەدانیان ئاسان بوو، سەبارەت بەپێغەمبەریش ﷺ كەسێتیەكی سەربەرزو سەنگین و كەم وێنەبوو، لەبەرچاوی دۆست و دوژمنانیشدا گەورە بوو، بەچاوی ڕێزەوە سەیر دەكرا ، مەگەر مرۆڤە سووك و دەروون نزمەكان وەگەرنا كەس زاتی نەدەكردو نەیدەتوانی كاری ناشیرین و سوكایەتی بەرامبەر بكات ، لەگەڵ ئەوانەشدا لەپەنای ئەبوتاڵیبدا بوو ، (أبو طالب) یش یەكێك بوو لە پیاوە ماقوڵەكانی مەككە ، وەجاخزادە بوو ، لەنێوان خەڵكیدا ڕیش سپی و قسە بیسراو بوو ، كەس نەیدەتوانی قسەی بشكێنێت یان دەست بۆ سایەی درێژ بكات ، ئەم ڕەوشە قورەیشی بەدگومان و هەراسان كردبوو، بەڵام ئەو ئارامگرتنە هەتاكەی لەبەردەم بانگەوازێكدا كە چاوی لە دووی سەرۆكایەتی ئایینی و ، سەرمەشقەیەتی دونیاشیانە.

دەستیان كرد بەدەستدرێژ كردنە سەر پێغەمبەر ﷺ و، لەسەرو هەموویانەوە ئەبو لەهەب ، ئەم پیاوە هەر لەڕۆژی یەكەمەوەو پێش ئەوەی قورەیش ئەو نیازە بكات ئەم هەڵوێستەی هەبوو ، پێشتریش باسمان كرد كە پێغەمبەر ﷺ لە دیوەخانی بەنی هاشم و، سەركێوی سەفادا چیكرد ، لەهەندێك گێڕانەوەدا هاتووە – كاتێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر سەفا بوو – (ئەبو لەهەب) بەردێكی هەڵگرت بۆ ئەوەی بیدا بە پێغەمبەردا ﷺ [2].

---

[1] / رحمة للعالمين ٦٠،٥٩/١.

[2] / تفهيم القرآن ٩/٤.

(أبـو لهـب) هـەردوو كچـەكەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، (رقيـە) و (أم كلثـوم)ی خواستبوو بۆ هەردوو كوڕەكەی خۆی ، (عتبە) و (عتيبـە) لـەپێش پێغەمبەرێتيـدا ، لـە دوای هـاتنی پێغەمبـەرێتی بەتوندوتيژيـەوە هـەردوكيانی بـە (عتبـە)و(عتيبـە) تەڵاقدا [1] .

كاتێك عەبدوڵلاّ – كوڕی دووەمی پێغەمبـەر ﷺ وەفـاتی كـرد – ئەبولەهەب قريوەی لێدەهات و ڕايدەكرد بۆلای هاوەڵانی و دەيوت ئەوە موحەممـەدە ، تەمەنی دوابڕاو بوەو نەوەی نيە[2] .

پێشتريش وتمان كە (أبو لهب) لە وەرزی حەج و نێو بازاڕەكاندا هەميشـە بە دوای پێغەمبەرەوە بوو ﷺ ، بۆ بە درۆخستنەوەی ، (طـارق)ی كوڕی (عبـدالله)ی (محاربی) دەگێڕێتەوە: كارەكانی (أبو لهب) لە بەدرۆخستنەوەدا نەوەستابوو بەڵكو بەرد بارانيشی دەكردو قاچی پيرۆزی برينـدار دەكرد[3] .

(أم جميل)ی ژنی (أبو لهب) كە ناوی (أروى)ی كچی (حرب)ی كوڕی (أميە) يەو خوشكی (أبو سفيان) ە . لە دژايەتی كردنی پێغەمبەردا ﷺ هيچی لە مێردەكەی كـەمتر نـەبوو ، دڕك و داڵـی دەهێنـاو شـەوانە لەسـەرە ڕێگـاو بـەردەرگی ماڵەكـەی پێغەمبـەردا ﷺ دای دەنـا، ژنێكـی زمان سەڵيتەو دەم پـيس بـوو ، بوختـان و درۆی زۆری بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ دەكردو ئـاگری شـەڕی هەڵدەگيرساندو، جەنگی كوێرانەی دژ بە پێغەمبـەر ﷺ دەوروژاند ، بۆيـە قورئـانی پـيرۆز بـە (حمالـة الحطب) ناوی بردووە.

كاتێك (أم جميـل) بيسـتی كـە لەبارەيـەوە قورئـان هاتۆتـە خـوارەوە هـات بۆلای پێغەمبـەر ﷺ لەناو مزگەوتەكەی كابەدا دانيشـتبوو ، ئەبوبـەكری صديقيشـی لەگەڵـدا بـوو ، پـڕ بەدەسـتی بـەردی پـێ بـوو ، هاتـە سەرسـەريان و وەسـتا چـاوی دەگێڕا بۆ پێغەمبەرﷺ ، جگە لە ئەبوبەكر كەسـی تـری نـەدەبينی، وتـی: ئەبوبـەكر: كوا هاوەڵەكەت ؟

بيستومە گوايە قسەی پێ وتووم، سوێندبێت ئەگەر بيدۆزمەوە ئەم بەردانە دەكێشم بەدەم و چاويدا، سوێندبێت شاعيريشم، ئەنجا ئەم شيعرەی وت:

مُذَمَّمـاً عصينـــا و أمــرَهُ أبَينـــا وَ دِينَـــهُ قَلَـــيْنـــا

---

[1] / تفهيم القرآن ٦/٥٠١، ٢٠٥.

[2] / إبن هشام١/٣٦٢.

[3] / رحمة للعالمين ١/٥٩، ٦٠.

پاشان ڕۆشت ، ئەبوبەکر فەرمووی : پێغەمبەری خوا ئایا دەزانیت کە نەیبینیت ؟ فەرمووی: نەیبینیم ، خوای گەورە لەئاستی مندا کوێری کرد[1].

هەروەها (ئەبوبەکری بەززار) ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە ، تیایدا هاتووە کاتێک بەسەر ئەبوبەکرەوە وەستا وتی: ئەرێ ئەبوبەکر هاوەڵەکەت هەجووی کردوین ، ئەبوبەکر فەرمووی: نا سوێندبێت بەپەروەردگاری ئەم خانووە ، نە شیعر دەبێژێت و نە لەدەمی دێتە دەرەوە ، (أم جميل) وتی: تۆ کابرایەکی باوەڕ پێکراویت.

(أبو لهب) هەموو ئەوکارە خراپانەی دەکرد لەکاتێکدا مام و دراوسێی پێغەمبەر بوو ﷺ ، ماڵەکەی لکابوو بەماڵەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ ، وەکو هەموو دراوسێکانی تری ئازاریان دەدا کاتێك لە ماڵەوە بوایە.

(إبن إسحاق) دەڵێت : ئەوانەی لەماڵەکەیدا ئازاری پێغەمبەری خوایان دەدا ﷺ بریتی بوون لە (أبولهب) و(الحكم)ی کوڕی (أبي العاص)ی کوڕی (أميه) و ، (عقبه)ی کوڕی (أبي معيط) و، (عدى) کوڕی (حمراء الثقفى) و (إبن الأصداء الهذلى) ـ ئەمانە دراوسێی بوون . کەسیان لێ موسوڵمان نەبوو جگە لە (الحكم)ی کوڕی (أبي العاص)[2]، یەکێکیان پیسی ئاژەڵی لەکاتی نوێژکردندا دەکرد بە سەریدا ، یەکێکی تریان هەمووی دەخستە ماڵەکەیەوە، هەتا وای لێهات ژوورێکی تەرخان کردبوو بۆ نوێژکردن بۆئەوەی لێیانەوە دیارنەبێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کاتێك ئەو پیسییەیان لەبەر ماڵەکەیدا فڕێدایە، بەسەرەدارێك دووری دەخستەوە و لەبەر دەرگاکەیدا دەوەستاو، پاشان دەیفەرموو: ئەرێ خێڵی (عبد مناف) ! ئەمە چۆن دراوسێیەتیەکە ؟ پاشان پیسیەکەی لەسەر ڕێگەکە لادەبرد[3].

(عقبه)ی کوڕی (أبي معيط) شتێکی زیاد کردبوو لەسەر سەختی و ناپوختیدا ، (بوخاری) دەگێڕێتەوە لە (إبن مسعود)ەوە ﷺ دەڵێت : کە پێغەمبەر ﷺ لەناو (بيت)دا نوێژی دەکرد (أبوجهل) و هاوڕێکانی دانیشتبوون ، هەندێکیان بەوانی تریان دەوت: کێ دەتوانێت پاشەڕۆی ئاژەڵ بهێنێت و لەکاتی سوژدەدا بیخاتە سەرپشتی موحەممەد ، سەرسەخترین کەسی خێڵەکە (عقبه)ی کوڕی (أبي معيط)[4] هەستاو سەیرێکی کرد ، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی برد پاشماوە

---

1 / سەیری (سيره إبن هشام ) ٢٣٦.٢٣٥/١.

2 / ئەو پیاوە باوکی خەلیفەی ئومەوی (مەروان)ی کوڕی (حەکەم)ە.

3 / إبن هشام ٤١٦/١.

4 / لە (صحيح البخاري)دا ئەمە بەڕاشکاوی هاتووە ٥٤٣/١.

سەروپێیەکەی لەنێوان هەردووشان و پشتی پیرۆزیدا دانا ، منیش سەیرم ئەکرد ، بریا دەسەلاتم هەبوایە ، دەڵێت: (أبوجهل) و تاقمەکەی دەستیان دەکردە پێکەنین و بەدەم گەمەو گاڵتەوە بەلای یەکتریدا لارئەبونەوە ، هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوژدەدا بوو، سەری بەرز نەکردبوەوە هەتا (فاطمة) هات و پیسیەکەی لەسەر پشتی لابرد ، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوە ، پاشان فەرمووی: (اللهم عليك بقريش) واتە: خوایە خۆت چارەی قورەیش بفەرموو ، ئەمەی سێجار وتەوە ، ئەوان ئەم نزایەیان بەلاوە سەخت بوو ، (إبن مسعود) دەفەرمووێت : قورەیش بڕوای وابوو کە دۆعا لەمەککەدا گیرادەبێت ، پاشان پێغەمبەر ﷺ لەنزاکەدا ناوی بردن فەرمووی خوایە خۆت چارەی ئەمانە بکە (أبو جهل) و (عتبه) کوڕی (ربيعه) و (شيبه) کوڕی (ربيعه) و (وليد) کوڕی (عتبه) و (أميه) کوڕی (خلف) و (عقبه) کوڕی (أبي معيط) ناوی حەوتەمیشی بردبوو بەلام ڕاوی لەبەری نەکردووەو دەڵێت : سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەموو ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی بردبوون بەکوژراوی لە (قليب)ی بەدردا هەموویانم بینی[1].

(ئومەییە)ی کوڕی (خەلەف) هەرکاتێك پێغەمبەری خوای ببینیایە ﷺ لاقرتێی پێدەکردو خراپەی دەوت ، لەبارەیەوە ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿ وَيلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴾ (إبن هشام) دەڵێت: (الهمزه) ئەو کەسەیە کە بەئاشکرا جنێو بدات و ، چاوشۆڕی پێ بکات و لاقرتێی پێ بکات. (اللمزه)ش ئەوکەسەیە بەنهێنی کەسانی تر عەیبدار دەکات و ئازاریان دەدات[2].

خۆ (أبي) کوڕی (خلف)ی براشی لەگەڵ (عقبه)ی کوڕی (أبي معيط) دا یەك ڕیز بوون ، جارێکیان (عقبه) لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و گوێی بۆ گرت ، کە ئەو هەواڵە گەشتەوە بە (أبي) سەرزەنشتی کردو ڕەخنەی لێگرت و داوای لێکرد کە تف بکات لە پێغەمبەر ﷺ . ئەویش تفی تێکرد . هەر خودی (أبي) جارێکیان پارچە ئێسقانێکی وردوخاش کردو پاشان بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ بەهەوادا فووی لێکرد[3].

(أخنس)ی کوڕی (شريق)ی (ثقفي) لەو کەسانە بوو ئازاری پێغەمبەریان دەدا ﷺ ، قورئانی پیرۆز بە نۆ خاڵ ئەم پیاوەی وەسف کرد ، کە بەڵگەن لەسەر ئەو

---

[1] / صحيح البخاري ، كتاب الوضوء ، باب إذا ألقى على المصلي قذر أو جيفة ٣٧/١.
[2] / ابن هشام ٣٥٦/١، ٣٥٧.
[3] / هەمان سەرچاوە ٣٦١/١، ٣٦٢.

حاڵەتەی هەی بووە ، لەم ئایەتەدایە : ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ {١٠} هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ {١١} مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ {١٢} عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ {١٣} ﴾ القلم .

هەندێ جار ئەبوجەهلیش دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوێی لەقورئان دەگرت ، پاشان هەڵدەستا باوەڕی نەدەهێناو ملکەچیش نەدەبوو ، پیاوێکی بێ ئەدەب و بێ باك بوو، بەقسە ئازاری پێغەمبەری دەدا ﷺ ڕێگەی دەگرت لە ڕێبازی خوایی ، پاشان دەچوو فیزیدەکرد بەوکارەیەوە ، شانازیی دەکرد بەوکردە شەڕەنگێزەیەوە ، هەر وەکو شتێکی باشی کردبێت ، ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوەوە هاتە خوارەوە: ﴿ فلا صدق ولا صلى ﴾ هتد[1].

هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کە پێغەمبەری بینی ﷺ لەحەرەمدا نوێژی دەکرد ڕێگەی لێ دەگرت ، جارێکیان بەلای پێغەمبەردا تێپەڕی نوێژی دەکرد لەو شوێنەدا (أبو جهل) وتی: ئەی موحەممەد (من نەموت ئەمکارە نەکەیت ، هەڕەشەی لێکرد پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵی توندبوو پیایدا هەڵشاخا، وتی: ئەی موحەممەد بەچی هەڕەشەم لێ دەکەیت ؟ سوێندبێت من لەمابەینی ئەم دووشیوەدا زۆرترین پیاوم بەدواوەیە ، ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَه ﴾[2] ، لەگێڕانەوەیەکی تریشدا پێغەمبەر ﷺ بەرۆکی (ئەبو جەهل) ی گرت و ڕایوەشاندو فەرمووی: ﴿أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى {٣٤} ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى {٣٥}﴾ دوژمنی خوا وتی: هەڕەشەم لێ دەکەیت موحەممەد؟ سوێندبێت نە تۆ نە خواکەت ناتوانن هیچ شتێك بکەن ، منیش پایەدارترین کەسی نێوان ئەم دوو کێوەم[3].

(أبو جهل) بەم پیاهەڵشاخانە وەنەبێت هۆشی بەبەردا هاتبێتەوە، بەڵکو لە دوایدا زیاتر سەرسەخت بوو، (مسلم) لەئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی : ئەبوجەهل وتی: موحەممەد لەنێوان ئێوەدا نێوچەوانی دەخاتە سەر زەوی ؟ وترا: بەڵێ، وتی: سوێندم بەلات و عوززات ، ئەگەر بینیم پێی دەخەمە سەر گەردنی ، لە پڕێکدا (أبو جهل) هاتەوە ، دەستی بەدەموچاویەوە گرتبوو ، تاقمەکەی وتیان: ئەوە چیتە (أبو الحكم)؟ وتی: لەنێوان من و ئەودا چاڵێکی پڕ لە ئاگر پەیدابوو پریشکی ئەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لێم نزیك ببوایەتەوە فریشتە پرزۆڵ پرزۆڵیان دەکرد[4].

---

[1] / في ظلال القرآن ٢١٢/٢٩.
[2] / هەمان سەرچاوە ٢٠٨/٣٠.
[3] / هەمان سەرچاوە ٣١٢/٢٩.
[4] / (مسلم) لە (صحيح) ەکەیدا گێڕاویەتەوە.

ئەم دەستدرێژیانە تایبەت بوون بەپێغەمبەرەوە ﷺ لەگەڵ کەم وێنەیەتی کەسێتی‌یە پڕ لە ڕێزو سامیەکەی لەناخی خەڵکانی گشتی و تایبەتیدا لەگەڵ ئەو بەرگریەی (ابو طالب) لێی دەکرد کە گەورەترین پیاوی ڕێزداری مەککە بوو، بەڵام ڕەوشەکە بۆ موسوڵمانان . بەتایبەتی لاوازەکانیان لێپێچانەوە بەرامبەریان سەخت ترو تاڵتر بوو، لەهەمان کاتدا هەرخێڵێك تاکە موسوڵمانبوەکانی خۆی بە چەندین جۆر ئەشکەنجە دەدا ، ئەو کەسەش خێڵی نەبوایە ئەوباش و ئاغاکان بەچەندین شێوە ئەشکەنجەیان دەدان، ئەوەندە ترسناك بوو دڵی ئارامگریش حەوسەڵەی بیستنی نیە.

ئەبو جەهل هەرکاتێك بیبیستایە یەکێك موسوڵمان بووە ئەگەر خاوەن پلەو پایەو بەرگری بوایە سەرزەنشتی دەکردو ڕەخنەی لێدەگرت و هەڕەشەی خەسارۆ مەندی ماڵ و سامان و پلەوپایەی لێ دەکردو، ئەگەر لاوازیش بوایە لێی دەداو هەڵی دەخەڵەتاند[1].

مامی (عثمان)ی کوڕی (عفان) ﵁ دەیپێچا لەحەسیرێکی دروستکراو لەگەڵای دار خورما پاشان لە ژێریەوە قانگی دەدا [2].

کاتێکی (أم مصعب)ی کوڕی (عمیر) بیستی کوڕەکەی موسوڵمان بووە ، بێ نان و ئاوی کردو لەماڵەوە دەری کرد ، لەکاتێکدا کە خۆشترین گوزەرانی هەبوو ، پێستی لەشی وەك کارژی مار هەڵی دابوو.[3]

(بیلال)یش کە کۆیلەی بەردەست (أمیە)ی کوڕی (خلف الجمحی) بوو ، ئومەییە پەتێکی دەخستە ملی‌و ، دەیدایە دەست منداڵان و، بەدەوری شاخەکانی مەککەدا دەیانگێڕا، بەشێوەیەك ئاسەواری پەتەکە لەسەر ملی دیاربوو ، ئومەییە هەموو جارێك دەیبەستەوە بەدار لێی ئەداو، ناچاری دەکرد لەبەر گەرمای خۆردا دانیشێت، هەندێك جاریش بەزۆر برسیی دەکرد لەوانەش سەختتر لەگەرمای نیوەڕۆدا کەخۆر گەرم دەبوو بیلالی دەهێنایە دەرەوە لەسارای مەککەدا پاڵی دەخست ، پاشان فەرمانی ئەدا بەردێکی گەورەیان دەخستە سەرسنگی، پاشان پێی دەوت: سوێندم بێت، ئەوە حاڵت دەبێت تادەمریت یان کافر دەبیت بە ئایینی موحەممەد ، لات و عوززا دەپەرستیت ، ئەویش دەیوت: (أحد ، أحد) ، هەتا

---

[1] / ابن هشام ١/٣٢٠.
[2] / رحمة للعالمين ١/٥٧.
[3] / هەمان سەرچاوە ١/٥٨. هەروەها (تلقیح فهوم اهل الاثر) ل٦٠.

جارێکیان ئەبوبەکر ﷺ بەلایدا تێپەڕی و بینیی ئەوانە چی‌دەکەن لە بەرامبەر ئەو غولامە ڕەش پێستە کڕیەوە، گوتراویشە کڕیویەتیەوە بە حەوت یان پێنج ئۆقیە زیوو، پاشان ئازادی کردووە[1].

عەمماری کوڕی یاسریش ﷺ کۆیلەی (بنی مخزوم) بوو، خۆی و باوکی و دایکی موسڵمان بوون، موشریکان – لەسەروو هەموویانەوە أبوجهل– بەرەو (أبطح) دەیانبردنە دەرەوە کاتێك کە لمەکە سوور دەبوەوە ، بەو گەرمایە ئازاریان دەدان ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایاندا تێپەڕی پێی فەرموون: ئال و بەیتی یاسر ئارام بگرن! ژوانی ئێوە بەهەشتە ، یاسر لەژێر ئەشکەنجەدا وەفاتی کرد ، ئەبو جەهلیش یەك نێزەی‌دا لەدامێنی سومەییە –دایکی عەممار– و شەهیدی کردو ، بووە یەکەم شەهیدی ئیسلام، سزاکەی لەسەر عەممار توندکرد ، جارێك بە گەرماو جارێکیش بەدانانی بەردێکی سورەوەبوو لەسەر سنگی و جارێکی تریش بە تەنگەنەفەس کردن سزایان دەدا ، دەیانوت: وازت لێناهێنین هەتا جنێونەدەی بە موحەممەد ، یان لەبارەی لات و عوززاوە قسەی باش بکەیت ، بەناچاری ڕازی بوو، پاشان بەدەم گریەو عوزر خواییەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە ﴿ مَن كَفَرَ بِاللَّه من بَعْدِ إيمَانه إلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ ﴾ النحل/ ١٠٦ [2].

هەروەها (ابو فکیهه) کە ناوی (أفلح) بوو ، کۆیلەی (بنی عبدالدار) بوو ، بە گوریس قاچیان دەبەستەوەو پاشان لەسەر دەم بەزەویدا ڕایان دەکێشا [3].

(خباب)ی کوڕی (أرت)یش کۆیلەی (أم أنمار)ی کچی (سباع)ی خوزاعی بوو، موشریکان چەندین جۆری ئەشکەنجەیان دەدا ، قژی سەریان دەگرت و ڕایاندەکێشا ، ملیان بادەدا بەتوندی و چەندجارێك لەسەر سکڵی گەشکراو دایان دەنا، پاشان بەردێکیان لەسەر سنگی دانا ، بۆ ئەوەی نەتوانێت هەستێتەوە [4].

(زنیره) و (نهدیه) و کچەکەیان و (أم عبیس) کۆیلە بوون و موسڵمان بوو بوون ، موشریکان بەهەمان ئەو شێوەیەی باسمان کرد سزای ئەمانیشیان دەدا ،

---

[1] / رحمة للعالمين ١/٥٧، تلقيح الفهوم ل٦١ ، إبن هشام ١/٣١٧،٣١٨.
[2] / إبن هشام ١ ٣١٩،٣١٢٠، فقه السيرة نوسينى محمد الغزالي ل٨٢ . (العوفي) هەندێ لەوانەی گێڕاوەتەوە لە (إبن عباس)ەوە . بڕوانە (مختصر السيره للشيخ عبدالله) ل٩٢.
[3] / رحمة للعالمين ١/٥٧ ، من إعجاز التنزيل ل ٥٣.
[4] / هەمان سەرچاوە ١/٥٧ ، تلقيح فهوم اهل الأثر ل٦٠.

کەنیزەکێکی (بنی مؤمل) . کەخێڵێکن لە (بەنی عەدی) موسڵمان بووبوو ، (عومەر)ی کوڕی (خەتاب) – کە لەوکاتەدا هێشتا موشریك بوو– دەکەوتە لێدانی ، هەتا بێتاقەت ئەبوو، ئەنجا دەیوت : وازم لێ نەهێنا لەبەرئەوە نەبێت کە بێتاقەت بووم[1].

(ابوبکر) ئەو کەنیزەکانەشی کڕی و ڕزگاری کردن، هەروەکو چۆن (بلال) و (عامر)ی کوڕی (فهیرە)ی کڕیەوە[2].

هەندێك لەموشریکان چەند هاوەڵێکیان دەخستە ناو پێستی وشترو مانگاوەو، دوای ئەوە فڕێیان دەدانە بەر گەرماکەوە ، زرێبەندی ئاسنینیان دەکردە بەری هەندێکی ترو لەسەر گابەردی زۆر گەرم دایان دەنان[3].

لیستی ئەوانەی لە پێناوی خوادا ئەشکەنجەدەدران زۆرن ، بە هەرکەسێکیان بزانیایە کە موسڵمان بووە ڕێگەیان پێدەگرت و ئازاریان دەدا.

---

[1] / رحمة للعالمين ٥٧/١ ، ابن هشام ٣١٩/١.

[2] / إبن هشام ٣٠٩,٣١٨/١.

[3] / رحمة للعالمين ٥٨/١.

## ماڵەکەی ئەرقەم

لەبەردەم ئەو هەموو چەوساندنەوەیەدا پێغەمبەر ﷺ بەدانایانە نەیدەهێشت بەگوتارو کردار شوێنکەوتوانی ئیعلانی خۆیان بکەن و ، بەنهێنی نەبوایە لەگەڵیان کۆ نەدەبوەوە، چونکە ئەگەر بەئاشکرا لەگەڵیان کۆببوایەتەوە موشریکان نەیاندەهێشت پرۆسەی خۆپاککرنەوەو فێرکردنی کیتاب و داناییان لەگەڵدا ئەنجام بدات ، کە لەوانەبوو ئەوە ببێتە هۆی پێکدادانی هەردوولا، ئەو ئاشکرا کردنە لەساڵی چوارەمی پێغەمبەرێتیدا بەکردەیی ڕووی‌دا ، لەکاتێکدا کە هاوەڵان لە (شیعاب) کۆببوونەوەو، بەنهێنی نوێژیان دەکرد ، هەندێك لە بێ باوەڕانی قوڕەیش بەدیانکردن، جنێویان پێدان و شەڕیان لەگەڵدا کردن، (سعد) ی کوڕی (أبی وقاص) دای لە یەکێکیان و خوێنی لەسەری هێنا ، ئەوە یەکەم خوێنێك بوو کە لەپێناوی ئیسلامدا ڕژێنرا [1].

گومانی تێدانیە کە ئەگەر پێکدادانەکە زۆر ببوایەو درێژەی پێدرایە دەبووە هۆی تێکشکاندنی موسڵمانەکان و تەفروتونا کردنیان ، بۆیە خۆلادان کارێکی ژیرانە بوو، زۆرینەی هاوەڵان ئیسلامەتی و خواپەرستی و بانگەوازو کۆ بونەوەکانی خۆیان بەنهێنی دەکرد، بەلاَم پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو موشریکاندا بەئاشکرا بانگەشەی و خواپەرستی خۆی دەکرد ، هیچ شتێك بەری پێنەدەگرت ، بەلاَم بە نهێنی کۆبوونەوەی لەگەڵ موسوڵمانەکاندا دەکرد ، ئەوەش بۆ بەرژەوەندی ئەوان و ئیسلامیش بوو، خانوەکەی (أرقم)ی کوڕی (أبی الأرقم)ی مەخزومی لەسەر گردی (سەفا) بوو ، لەبەرچاوی زاڵمان و دیوەخانەکانیان دوور بوو ، پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرێتیەوە کردبوویە مەڵبەندێك بۆ بانگەوازەکەی و ، کۆبوونەوەی لەگەڵ موسوڵمانەکاندا [2].

---

[1] / إبن هشام ٢٦٣/١، مختصر سيرة الرسول . لمحمد بن عبد الوهاب . ل٦٠.

[2] / هەمان سەرچاوەی دوایین ل٦١.

## کـۆچی یــەکـەم بــەرەو حـەبــەشـە

سەرەتای چەوساندنەوەکان لە ناوەندو کۆتایی ساڵی چوارەمی پێغەمبەرێتیدا بەکزی دەستی پێکرد ، پاشان ڕۆژ لەدوای ڕۆژو مانگ لەدوای مانگ زیاتر بوو هەتا لەناوەڕاستی ساڵی پێنجەمدا توندو تیژتر بوو ، هەتا جێگەیان لە مەککەدا پیێ لەق بوو ، ناچاری کردن بیر لەکارێك بکەنەوە کە لەو سزا سەختە ڕزگاریان بکات ، ئا لەوساتە پڕ لە نەهامەتیە تاریکەدا سورەتی (الكهف) هاتە خوارەوە، وەکو وەڵامێك بۆ هەموو ئەو پرسیارانەی موشریکان لە پێغەمبەریان کردبوو ﷺ ، سورەتەکە سێ چیرۆکی تێدابوو ، چەند ئاماژەیەکی کاریگەری تێدابوو لەلایەنی خواوەندی گەورەوە بۆ بەندە ئیماندارەکانی ، بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە ڕێنومایی دەکات بۆ کۆچکردن و وازهێنان لە شوێنی کوفرو دەست درێژی لەئایین و مەترسی لەسەر ئایینەوە بەپشت بەستن بە خوای گەورە ﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا﴾ الكهف /١٦.

چیرۆکی (خضر) و(موسا)ش عليه السلام ، ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو جارێك بارودۆخ بەپێی ڕووکاری دەرەوە بەرێوە ناچێت و بەهەمان شێوە نایەتە دی ، لەوانەیە ئەنجامەکە بەتەواوی پێچەوانەی ڕووکارەکە بێت ، ئەمەش ئاماژەیەکی نهێنی تێدایە بۆ ئەو جەنگەی کە دژ بەموسڵمانەکان دەکرێت کە لەداهاتودا ئاکامەکەی هەڵدەگەڕێتەوەو ، ئەو زاڵمە موشریکانەش . ئەگەر باوەڕ نەهێنن . لەبەردەم ئەو مرۆڤە لاوازە تێکشکاوانەدا شکست دەهێنن .

هەروەها چیرۆکی (ذی القرنين) ئەوە دەگەیەنێت خوای گەورە سەرزەمین دەکاتە میراتگری ئەو بەندانەی خۆی دەیەوێت ، ڕزگاربوونی ڕاستەقینەش لە پێناوی ئیماندایە نەك کوفر، خوای گەورەیش هەمیشە – سات ناساتێك– یەکێك لەو بەندانەی خۆی دەنێرێت بۆ ڕزگارکردنی ژێردەستەکان لە (یأجوج)و (مأجوج) ی ئەو ڕۆژگارە، ئەوانەش کە شایستەی میراتگریی سەرزەمینن بریتین لە بەندە ساڵحەکانی خوا، پاشان سورەتی (الزمر) هاتەخوارەوە ئاماژەیەکی تێدایە بۆ کۆچ کردن و، ئەوەش ڕادەگەیەنێت کە سەرزەمین بەر تەسك نیە : ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ

الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ الزمر/١٠

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی (أصحمه)ی (نەجاشی) مەلیکی حەبەشە مەلیکێکی دادپەروەرە، لەسایەیدا زوڵم لەکەس ناکرێت ، بۆیە فەرمانی‌دا بە موسوڵمانەکان بەخۆیان و ئایینەکەیانەوە هەڵێن بەرەو حەبەشە.**

**لە رەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیدا یەکەم پۆلی هاوەڵانی نارد بەرەو حەبەشە ، کە پێکهاتبوو لە (١٢) پیاوو چوار ژن ، سەرۆکەکەیان (عثمان)ی کوڕی (عفان) بوو ، خاتوو (رقیە)ی کچی پێغەمبەر ﷺ و هاوسەری لەگەڵدا بوو ، پێغەمبەر ﷺ لەبارەیانەوە فەرمووی : (ئەوە یەکەم ماڵە لەدوای ماڵەکەی ئیبراهیم و لوط ، (سەلامی خوایان لەسەر) کۆچی کردبێت )[1].**

**ئەو پۆلە بەشێوەی دزەکردنێکی شەوانە بەڕێ کەوتن هەتا قوڕەیش پێیان نەزانێت . بەرەو دەریا ڕۆشتن ، ڕوویان کردە کەناری (شعیبە) ، قەدەر دوو کەشتی بازرگانی بۆ ژێر بارخستن بەرەو حەبەشە هەڵی گرتن و قوڕەیش پێی نەزانین ، بەدوایاندا بەڕێ کەوتن ، بەڵام کاتێك قوڕەیش گەیشتە کەناری دەریا ، موسوڵمانەکان گەیشتبونە شوێنی ئارامیی‌و ، لەناو حەبەشەدا بەجوانترین شێوە میوانداریان کرابوو[2].**

**لە ڕەمەزانی هەمان ساڵدا پێغەمبەر ﷺ بەرەو حەرەم دەرچوو ، لەوێدا ژمارەیەکی زۆری قوڕەیش وەستا بوون ، ئاغاو قسەبیسراوەکانیان تێدابوو، لە ناویاندا مایەوە ، دەستی کرد بەخوێندی سورەتی (النجم) ، ئەو بێباوەڕانەش پێشتر هیچیان لەبارەی کەلامی خوداوەندەوە نەبیستبوو ، چونکە شێوازی بەردەوامیان بریتی بوو لەو قسەیەی کە بەگوێی یەکدا چرپاندبوویان ، دەیانوت :** ﴿ لا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾ فصلت/ ٢٦ ، **کاتێك کە لەناکاودا ئەم سورەتەی بەسەردا خوێندنەوەو ، بۆ یەکەمجار وتەیەکی خودایی قەشەنگ و سەرنج ڕاکێش بەر گوێیان کەوت – کە زمان و دەربڕین دەستەوسان بوو لە پەی بردن بەجوانی و گەورەییەکەی – سەراسیمەی بوون و هەریەکەیان کەوتنە گوێ بۆ هەڵخستنی‌و،**

---

[1] / مختصر سيرة الرسول . نوسینی شیخ عبدالله ی نەجدی ل ٩٢،٩٣، هـتروەها (زادالمعاد)١/٢٤، رحمة للعالمين١/٦١.

[2] / رحمة للعالمين١/٦١، زاد المعاد ١/٢٤.

جگه لەواق ورمان هیچی دییان بەبیردا نەدەهات، هەتا لەکۆتایی سورەتەکەدا کۆمەڵێك زەنگی خەتەرناکی دڵهەژێنی دا بەگوێیانداو پاشان فەرمووی : ﴿ فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا ﴾ النجم/ ٦٢، پاشان کڕنووشی برد ، کەس خۆی پێنەگیراو هەموو سوژدەیان برد ، لەڕاستیدا ئەوە کاریگەریی جوانبێژی هەق بوو کە سەرسەختی و لوت بەرزی ملهوڕان و گاڵتەجاڕانی هێنا بەچۆکدا ، ئەوە بوو خۆیان پێنەگیراو سوژدەیان بۆ خواوەندی گەورە برد[1] .

کاتێك هەستیان کرد بەقورسیی کەلامی خودا زمانیان لوولی خواردو لەدەستیان دەرچوو ، ئەوکارەیان کرد کەهەموو تواناییان خەرج کردبوو بۆ سڕینەوە و لەناوبردنی ، لەهەمووﻻیەکەوە لۆمەو سەرزەنشت ڕووی تێکردن، لەو کەسە موشریکانەوە کە دیمەنەکەیان نەدیبوو ، ئیدی موشریکان کەوتنە هەڵبەستنی درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ کە گوایە بەوشەی ڕێزلێنان باسی بتەکانی ئەوانی کردووەو ، لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ( تلك الغرانقةُ العلى ، وإنَّ شَفاعَتهُنَ لَتُرتَجى ) ، ئەم هەڵبەستراوە ڕوونەیان هێنا ، بۆ ئەوەی عوزر خواهی بهێننەوە لە بەرامبەر ئەو سوژدەیەدا کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بردبویان ، ئەمەش لەبارەی خێڵێکی درۆزنەوە هیچ سەیر نیە کە فێری تێچاندن و درۆ هەڵبەستن بووبن[2] .

ئەم هەواڵە گەیشەوە بەکۆچکردوەکانی حەبەشە ، بەڵام بەشێوەیەکی جیا لە شێوە ڕاستەقینەکەی وایان پێگەیشتبوو کە قوڕەیش موسوڵمان بووە ، بۆیە لە شەوالی هەمان ساڵدا گەڕانەوە بۆمەککە ، ماوەی یەك سەعات پێش گەیشتنە مەککە ، ڕاستیی مەسەلەکەیان زانی ، هەندێکیان جارێکی‌دی گەڕانەوە بۆ حەبەشە ، ئەوانی دیکەش یان بەنهێنی ، یان لەپەنای پیاوێکی قوڕەیشدا چوونەوە مەککە[3] .

پاشان بەڵاو چەوساندنەوەی قوڕەیشیەکان لەسەریان توندبوو ، خێڵەکانیان هەڵیان کوتایە سەریان ، قورەیش میوانداریی کردنی نەجاشیان بەلاوە گران بوو ، پێغەمبەر ﷺ چارێکی تری نەبوو جگە لەوەی ئاماژە بکات بەکۆچێکی تر بۆ حەبەشە ، ئەم کۆچەی دووەم زۆر لەکۆچی یەکەم سەختتر بوو، چونکە

---

[1] / (بخاری) بەسەرهاتی سوژدە بردنەکە بەکورتی لە (إبن مسعود) و (إبن عباس) وەرگێڕاوەتەوە ، بڕوانە باب سجدة النجم، باب سجود المسلمين والمشركين١/١٤٦، باب ما لقي النبى ﷺ وأصحابه في المشركين بمكة ١/ ٥٤٣.

[2] / تفهيم القرآن ٥/١٨٨، لێکۆڵەران لە مەسەلەی بەسەرهاتی (غرانقه) دا ئەم بۆچوونەیان هەیە.

[3] / هەمان سەرچاوە ٥/١٨٨، زاد المعاد ١/٢٤، ٢/٤٤، ابن هشام١/٣٦٤.

قورەیش بەئاگا هاتبوەوەو بڕیاری ڕێگەگرتنی دابوو، بەڵام موسوڵمانەکان خێراتر دەرچوون ، ئەم جارەش خوای گەورە سەفەرەکەی بۆ ئاسان کردن، پێش ئەوەی دەستی قورەیشیان پێ بگات ، خۆیان گەیاندە نەجاشی.

لەم جارەشدا لەپیاوان هەشتاو سێ کەس کە (عمار) یان تێدابوو (هەر چەندە گومانیشی تێدایە) لەگەڵ دوانزە یان نۆزدە ژندا کۆچیان کرد[1] ، عەللامە (محمد سلیمان المنصور فوری) جەخت لەسەر ڕای یەکەم دەکاتەوە[2].

## داوێکی قورەیش بۆ کۆچکەرانی حەبەشە

موشریکان لەسەر دڵیان زۆرگران بوو کە کۆچکەران پەناگەیەکیان دەست کەوێت بۆ خۆیان و ئایینەکەیان ، بۆیە دوو پیاوی زیری ژیریان هەڵبژارد کە بریتی بوون لە: عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعە – پێش ئەوەی موسوڵمان بن – چەندین دیاری جوانیان پێدا ناردن بۆ نەجاشی و بەتریکەکانی دەوروبەری ، پاش ئەوەی ئەم دوو پیاوە دیاریەکانیان دایە دەست بەتریکەکان ، ڕێککەوتن لەسەرئەوەی داوابکەن لەنەجاشی کە ئەو موسوڵمانانە دوور بخاتەوە ، هەردوکیان هاتنە لای نەجاشی ، دیاریان پێشکەش بەویش کردو پاشان قسەیان لەگەڵدا کردو وتیان:

(ئەی مەلیك ، چەند گەنجێکی سەرلێشێواو هاتونەتە وڵاتەکەت ، ئەوانە لە ئایینی گەلەکەیان جیابونەتەوە ، نەهاتوونەتە نێو ئایینەکەی تۆ ، ئایینێکی داهێنراوی خۆیان هێناوە ، نە ئێمە نە تۆ نایزانین ، ئێمە پیاوماقوڵانی خێڵەکانی خۆیانمان بەدوادا ناردوون لەباوان و مام و خێڵەکانی خۆیان، بۆئەوە بیاندەیتەوە دەستیان ، ئەوان باشتر دەیانناسن و چاکتر دەزانن لەسەر چی ڕەخنەیان لێدەگرن و سەرزەنشتیان دەکەن :

بەتریکەکان وتیان : ئەی مەلیك ئەم دوانە ڕاست ئەکەن!

بیاندەرەوە دەستیان ، با بیانگێڕنەوە بۆ لای خێڵ و وڵاتی خۆیان ،

بەڵام نەجاشی پێی وابوو کەدەبێت کێشەکە تاووتوێ بکرێت و گوێ لە هەموولایەك بگیرێت، ناردی بەشوێن موسوڵمانەکاندا، بانگێشتی کردن ، هەموویان

---

[1] / بڕوانە (زاد المعاد) ١/٢٤، رحمە للعالمین ١/٦١.
[2] / بڕوانە دوا سەرچاوە .

هاتن ، هەموویان لەسەر ڕاستی گوتن ڕێککەوتبوون ئاکامەکەی هەرچیەك بێت ، **نەجاشی** پێی وتن: ئەم ئایینە چیە کەئێوە خۆتان لە گەلەکەتان پێ جیا کردۆتەوەو بەو پێیە نەهاتوونەتە نێو ئایینەکەی من و ئایینی هیچ میللەتێك ؟

**جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب کە ـ قسەکەری موسوڵمانەکان بوو ـ وتی:**

ئەی مەلیك ، ئێمە خەڵکێکی نەفام بووین ، مردوومان دەخواردو بتمان دەپەرست ، کردەوەی خراپمان دەکرد ، پەیوەندی خزمایەتیمان دەپچڕاندو ، لەگەڵ دراوسێدا خراپ بووین ، بەهێزەکانمان لاوازەکانمانی دەخوارد، لەسەر ئەوحاڵەتە بوین ، هەتا خوای گەورە لەخۆمان پێغەمبەرێکی بۆ ناردین ، باوان و ڕاستگۆیی سپاردە ناسێتیی و داوێن پاکیەکەی دەناسین ، بانگی کردین بۆ پەرستنی خوداو یەکتاپەرستیو ، وازهێنان لەو داروبەردانەی خۆمان و باوو باپیرانمان دەمانپەرست و فەرمانی پێداین ڕاستگۆبین ، سپاردە پارێزبین و، پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنین و ، چاك بین لەگەڵ دراوسێداو ، دەست هەڵگرین لە حورمەت شکێنی و خوێن ڕشتن و، وازبهێنین لەفاحیشەو، قسەی ناڕاست و، خواردنی ماڵی بێباوك و، تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی داوێن پاك و ، فەرمانی پێداین تەنها خودا بپەرستین و، هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەین و نوێژ بکەین و زەکات بدەین و ڕۆژو بگرین . لەسەر ئەو ئایینە خواییە کە بۆی هێناین شوێنی کەوتین و، هاوبەشمان بۆ خوا دانەناو هەرچیەکمان لەسەر حەرامکرا حەرامامان کردو ، هەرچیەکیشمان بۆ حەلاڵکرا حەلاڵمان کرد ، کەچی خێڵەکەمان بە گژماندا هاتن ، خێڵەکەمان تووشی بەلایان کردین ، بۆئەوەی بمانگێڕنەوە بۆ سەر بتپەرستی و حەلاڵ کردنەوەی ئەو شتە پیسانەی حەرامامان کرد بوو ، کاتێك زۆریان بۆ هێناین تەنگەتاویان کردین و زوڵمیان بەرامبەر کردین و نەیانهێشت ئایینداریی خۆمان بکەین ، ئیدی دەرچوین بەرەو ولاتەکەت ، تۆمان بەسەر خەڵکی تردا پەسەند کردو ، حەزمان لەنزیکی تۆ کردو ، ئاواتمان خواست کە لای تۆ ستەممان لێ نەکرێت.

**نەجاشی** پێی وت: ئایا شتێکت لەبەرە لەوەی خودا بۆ پێغەمبەرەکەتانی ناردووە ؟ **جەعفەر** فەرمووی : بەڵێ !

**نەجاشی** پێی وت : بۆم بخوێنە .

سەرەتای (سوورەتی مەریەم)ی بۆ خوێندەوە ، سوێندبێت نەجاشی ئەوەندە گریا هەتا ڕیشی تەڕبوو، کەشیشەکانیش ئەوەندە گریان هەتا سەحیفەکانی بەردەمیان تەڕبوو ، پاشان **نەجاشی** پێی وتن : سوێند بێت ئەمەو ئەوەی عیسا

هێناویەتی لەیەك چاوگەوە هاتوە ، بەنوێنەرەکانی قورەیشی وت: بڕۆنەوە ، سوێند بێت هەرگیز ئەمانەتان پێ نادەمەوە ڕووی کردە (عەمر)ی کوڕی (عاص) و هاوەڵەکەی . هەتا چوونە دەرەوە ، (عەمر) بە (عبدالله)ی وت : سوێند بەخوا سبەینێ وابۆیان دێمەوە لە ڕەگەوە دەریانکێشم ، (عبدالله) پێی وت: شتی وانەکەیت ، ئەوانە خزمن با لەگەڵ ئێمەشدا جیاواز بن ، بەلاّم (عەمر) لەسەر ڕاکەی سوور بوو ، بۆ سبەینێ وتی بە نەجاشی : ئەی مەلیك . ئەمانە لەبارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە شتی خراپ دەڵێن ، نەجاشی ناردیەوە بەشوێنیانداو لەبارەی مەسیحەوە پرسیاری لێ کردن ، موسوڵمانەکان ترسان ، بەلاّم بە یەکدەنگی بڕیاریاندا ڕاستگۆبن و هەرچیەکیش ڕوبدات گوێ نەدەنێ ، کە چوونە لای و پرسیاری لێکردن ،

جەعفەر وتی : ئەوە دەڵێین کە پێغەمبەرەکەمان ﷺ بۆی هێناوین ، عیسا بەندەو پەیامبەرەو ڕوح و وتەی خوداوەندە ، داویەتی بەمەریەمی داوێن پاك .

نەجاشی دارێکی لەسەر زەوی هەڵگرت ، پاشان وتی: سوێند بەخودا ئەوەی عیسای کوڕی مەریەم گوتویەتی لەم دارە تێنەپەڕیوە ، بەتریکەکانی کەوتنە مقۆ مقۆ ، وتی : سوێند بەخوا هەرچیەك بکەن ئەوە هەڵوێستی منە.

پاشان وتی بەموسوڵمانەکان : ئێوە لەخاکی مندا لە ئەماندان ، هەر کەسێك قسەتان پێ بڵێت باجی لێ دەسەنرێت ، ئەمەی سێ جار وتەوە ، پێم خۆش نیە بەئەندازەی شاخێك ئاڵتوونم هەبێت و ئازاری ئێوە بدەم.

پاشان وتی بەدەست و پێوەندەکانی : دیاریەکان بدەنەوە بەو دوانە ، پێویستم پێیان نیە ، وەڵلاّهی کە خوا موڵکەکەی پێدامەوە بەرتیلی لێ وەرنەگرتم ، تامنیش بەرتیلی تێدا وەربگرم ، لەبارەی بەگوێی کەسی نەکرد ، تامنیش لە فەرمانی ئەودا بەگوێی خەڵکی بکەم ، (ام سلمه) کە ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە دەڵێت : ئەو دوانە بە سەرشۆڕیەوە دیاریەکانیان درایەوە بەسەریاندا، ئێمەش لە باشترین جێگەو لەنزیك چاکترین دراوسێوە بوین[1] .

ئەمە گێڕانەوەکەی (ابن إسحاق)ە، کەسیتر دەڵێن: ناردنی شاندەکەی (عەمر) بۆلای نەجاشی دوای بەدر بووە ، هەندێکی تر دەڵێن دووجار بووە بە وەفد[2] بەلاّم ئەو پرسیارو وەلاّمانەی لەگفتوگۆی نێوان نەجاشیو جەعفەردا ڕوویدا لە وەفدەکەی

---

[1] / إبن هشام . بەکورت کراوەیی ١/٣٣٤، ٣٣٥، ٣٣٧،٣٣٨.

[2] / کورتکراوەی (سیره) نوسینی شێخ عبدالله نەجدی ل٩٦. ٩٨ ، لەو لاپەڕانەدا وردو درشتی پرسیارەکانی تێدایە.

دووەمدا هەمان ئەو پرسیارو وەڵامانەیە کە (إبن إسحاق) باسی کردون ، پاشانیش ناوەڕۆکی ئەو پرسیارانە دەڵێت :- کە لەیەکەم چاوپێکەوتندا بووە لەگەڵ نەجاشیدا – فێڵی موشریکان شکستی هێنا ، داوەکەیان دۆڕاو ، بۆیان دەرکەوت کەناتوانن داخی دڵی خۆیان هەڵڕێژن ، مەگەر لەژێر دەسەلاتی خۆیاندا، بۆیە بیرۆکەیەکی ترسناکیان بۆ هات، پێیان وابوو ڕزگاربوون لەو مرۆڤە بلیمەتە بەدەست کۆتاکردنی دەبێت ، یان کوشتنی بەلام چی بکەن (أبو طالب) دەوری داوە ناهێڵێت دەستیان بیگاتێت ؟ بڕیاریاندا لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ (أبو طالب) دا بکەن .

## قــوڕەیش هــەڕەشــە لە ( أبو طالب ) دەکــات

ئاغاکانی قوڕەیش هاتنە لای ئەبوتاڵیب و پێیان وت : (أبو طالب) تۆ پیاوێکی بەتەمەنیت و خاوەن پلەوپایەیت لەناو ئێمەدا ، داوامان لێ کردیت دەستی برازاکەت بگریت نەتگرت ، سوێندبێت ئێمە ئارامیمان لێبڕا ، لەقسەوتن بە باوانمان و، گاڵتەکردن بەعەقڵمان و، لەکەدارکردنی خواکانمان، وازناهێنین تادەستی نەگریت ، یان دائەبەزینە مەیدانی تۆو ئەویش ، تایەکێکمان لەناو دەچین.

(أبو طالب) ئەو هەڕەشە نواندنەی قوڕەیشیی بەلاوە گەورە بوو، ناردی بەشوێن پێغەمبەردا ﷺ و پێی وت: ئەرێ برازاکەم خزمەکانت هاتنە لام ، ئەوەو ئەوەیان پێ وتم ، منیش و خۆیشت بهێڵە کارێکم پێ مەکە نەتوانم هەڵی بگرم ، پێغەمبەری خوا ﷺ وایزانی مامی پشتی تێ کردوەو، لەلاوازیدا پشتیوانی ئەوی پێ ناکرێت ، فەرمووی: مامەکەم! سوێند بێت بەخوا ئەگەر لەسەر دەستی ڕاستم خۆرو لەسەر دەستی چەپم مانگ دابنێن لەپای ئەوەدا واز لەم کارە بهێنم ، ئەوە هەرگیز دەست بەرداری نابم . هەتا خوای گەورە سەری دەخات یان لەپێناویدا دەڕۆم . پاشان دڵی گەرم بوو گریاو، هەستا، کە ڕۆشت (أبو طالب) بانگی کرد، کە گەڕایەوە پێی وت : برازاکەم بڕۆ حەز بەچی دەکەیت بیڵێ ، سوێندم بەخوا ناتدەم بە دەست کەسەوە[1] ، ئەنجا ئەم بەیتەی وت:

والله لن يصلــوا إليك بجمعهم ... حتى أوسد في التراب دفينـــا

فأصدع بأمرك ماعليك غضاضة ... وأبشر وقر بذاك منك عيوناً [2]

---

[1] / إبن هشام ١/٢٦٥،٢٦٦.

[2] / مختصر سيرة الرسول نوسینی (شێخ محمد عبدالوهاب) ی نەجدی ل٦٨.

## جارێکی تر قورەیش لەبەردەم (أبو طالب) دا

کاتێك قورەیش بینیان پێغەمبەر ﷺ بەردەوامە لەسەر کارەکەی و ، زانیان کە (أبو طالب)یش ئامادەنیە پشتی بەر بدات و، بڕیاریداوە کە لێیان جیابێتەوەو دژایەتیان بکات لەسەرئەوە ، (عمارە)ی کوڕی (وەلید)ی کوڕی (مغیرە)یان بردە لای و پێیان وت: ئەم کوڕە پێکەوتووترین گەنجی قورەیش و جوانترینیانە ، بیبە بۆخۆت لای خۆت ڕاگیری بکەو پشتیوانی بکە ، بیکە بە کوڕی خۆت ، برازاکەی خۆتمان بدەرە دەست چونکە دژی ئایینی تۆو ئایینەکەی باوو باپیرانی تۆیەو ، یەکدەنگی خێڵەکەتی شێواندوەو بە بێعەقڵیان دەزانێت ، ئێمەش دەیکوژین ، ئەوجا دەبێتە پیاوێك بەپیاوێك (أبوطالب) وتی: ئای کە سەودایەکی خراپم لەگەڵدا دەکەن ، کوڕەکەتانم دەدەنێ بۆ ئەوەی بەخێوی بکەم بۆتان ، منیش کوڕەکەمتان بدەمێ بۆ ئەوەی بیکوژن ، سوێندم بەخوا هەرگیز شتی وانابێت . (مطعم) ی کوڕی (عدی) کوڕی (نوفل)ی کوڕی (عبدمناف) وتی: سوێندبێ (أبو طالب) خێڵەکەت لەگەڵتدا بەویژدان بوون و، هەوڵیشیاندا بۆ ڕزگاربونت لەو شتەی حەزت لێ نیە، وادەبینم کە تۆ ناتەوێ هیچیان قەبوڵ بکەیت ، (أبوطالب) وتی: وەڵڵاهی ئێوە هەرگیز لەم کارەدا لەگەڵ من بەویژدان نەبوون . بەڵام تۆ بڕیارت داوە من سەرشۆڕ بکەیت وخێڵەکەم بهێنیتە سەرم ، بڕۆ چیت لەدەست دێ بیکە[1] .

سەرچاوە مێژووییەکان کاتی ئەو دووشاندەیان دیاریی نەکردووە ، بەڵام پاش ڕامان لە بەڵگە بەردەستەکان دەردەکەوێت کە هەردووکیان لە ناوەڕاستی ساڵی شەشەمی پێغەمبەرێتیدا بوون و ، ماوەی نێوان هەردوو شاندەکەش زۆر کەم بوە.

## پیرۆکەی ستەمکاران بۆ لەناو بردنی پێغەمبەر ﷺ

پاش شکستهێنانی دووشاندەکەی قورەیش کەوتنەوە سەر توندوتیژیی دڕندەیەتی خۆیان بەشێوەیەکی توندتر لەپێشوو، لەماوەی ئەوچەند ڕۆژەشدا بیرۆکەی لەناو بردنی پێغەمبەر ﷺ بەشێوازێکی تر پەیدا بوو ، ئەم بیرۆکەیەو ئەو دڕندەیەتیەبوو کەبووە هۆی بەهێزبوونی ئیسلام بەدوو پاڵەوانی شکۆداری خەڵکی مەککە، ئەوانیش:(حمزە)ی کوڕی (عبدالمطلب) و(عمر)ی کوڕی (خطاب) بوو ﵄.

لە نموونەی ئەو دڕندەیەتیە جارێکیان (عتیبە)ی کوڕی (أبی لهب) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: من باوەڕم نیە بە ﴿ وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى ﴾ و ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى﴾ ، ئەنجا کەوتە ئازاردانی و ، کراسەکەی دڕاندو، تفی لێکرد، بەڵام تفەکەی بەر

---

[1] / إبن هشام ٢٦٧،٢٦٦/١.

نەکەوت ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دۆعای لێکردو فەرمووی: خوایە سەگێك لە سەگەکانی خۆتی تێبەردە ، ئەوەبوو دۆعاکەی پێغەمبەر ﷺ گیرابوو، جارێکیان (عتیبە) لەگەڵ چەند کەسێکی قورەیشدا چووبوونە دەرەوە تاگەیشتبوونە شوێنێك لە شامدا پێی دەڵێن (زرقاء) ، لە شەودا شێرێك بەسەریاندا دەگەڕێت ، ئنجا (عتیبە) دەڵێت: ماڵوێران خۆم ، وەڵڵاهی ئێستا ئەو شێرە دەمخوات ، هەروەکو موحەممەد دۆعاکەی لێکردم ، کوشتمی لەکاتێکدا کە ئەو لە مەککەیەو، منیش لە شام ، شێرەکە هەڵمەتی بردە سەری لەناو ئەوانی تردا سەری لێکردەوەو کوشتی[1].

نموونەی تریش دەگێڕنەوە کە (عقبە)ی کوڕی (أبی معیط) لەکاتی سوژدە بردندا پێی نایە سەر ملی پیرۆزی هەتا چاوەکانی ئاویان لێ تکایە خوارەوە[2].

بەڵگەش لەسەر ئەوەی سەرانی ستەمکار نیازی کوشتنیان هەبوو ، ئەو گێڕانەوەی (إبن إسحاق)ە ، کە لەفەرمودەیەکی درێژدا دەیگێڕێتەوە ، دەڵێت: ئەبو جەهل وتی: ئەریٚ خێڵی قورەیش، ئەو موحەممەدە جگە لە لەکەدارکردنی ئایینەکەمان و، قسەوتن بە باپیرانمان و، گاڵتەکردن بەعەقڵمان و، سووکایەتی کردن بەخواکانمان هیچی تر ناکات ، من پەیمان دەدەم بەخوا بەبەردێکەوە بۆی دادەنیشم پێم هەڵنەگیرێت، لەگەڵ سوژدە بردنیدا دەیدەم بەسەریدا ، ئەوجا یان لەگەڵمدا بێن یان دەستم بگرن ، با ئیتر دوای ئەوە (بنو عبدمناف) چی دەکات بیکات ، وتیان: وەڵڵاهی هیچت لێ ناکەین ، بڕۆ چیت دەوێت بیکە.

کە ڕۆژ بوەوە (أبوجهل) هەروەکو باسی کردبوو بەردێکی هەڵگرت ، دانیشت و چاوەڕوانی پێغەمبەری دەکرد ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ وەك هەموو ڕۆژێك بەرەبەیان هات ، دەستی کرد بەنوێژ ، قورەیشیش لەیانەکانیاندا دانیشتبون ، چاوەڕوانی کارەکەی (أبوجهل) یان دەکرد ، کە پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد ، (أبو جهل) بەردەکەی هەڵگرت ، پاشان بەرەو ڕووی پێغەمبەر چوو ﷺ ، هەر کەلێی نزیك بوەوە سەری شۆڕ کردو بە زەردهەڵگەڕاوی گەڕایەوە ، لەترساندا دەستی بە بەردەکەوە ڕەق بوو بوو ، تا بەردەکەی فڕێدا ، چەند پیاوێکی قورەیش چوونە لای پێیان وت : (أبا الحکم) ئەوە چیتە ؟ وتی: هەستام ئەوەی پێ بکەم کە دوێنێ بە ئێوەم وت ، کە لێی نزیك بوومەوە نێرە وشترێکی گەورە بەری ڕێگەکەی لێگرتم ، شتی وەك ئەوە گەردن بەرزم نەدیبوو ، وێنەی ئەو قەدو کەڵبەو دەم و ددانەم بەرچاو نەکەوتبوو ، خەریك بوو بمخوات .

---

[1] / تفهیم القرآن ٥٢٢/٦ . من الإستیعاب . والإصابة ، دلائل النبوة ، الروض الأنف ، مختصر سیرة الرسول نوسینی (شێخ عەبدوڵلای نەجدی) ل١٣٥.

[2] / هەمان سەرچاوەی دوایی ل١١٢.

(إبن إسحاق) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردم و فەرمووی ئەوە جبریل بوو ؈ ئەگەر نزیك تر ببوایەتەوە دەیبرد[1].

دوای ئەوە ، ئەوەی ئەبوجەهل کردی بەپێغەمبەر ﷺ ، بوە هۆی موسوڵمان بوونی (حەمزە) ؓ کە باسەکەی دێت.

سەرانی قورەیشیش هێشتا خەریك بوو بیرۆکەی لەناوبردنەکە لەدڵیاندا دەگەیشت ، (إبن إسحاق) لە (عبدالله)ی کوڕی (عەمر)ە وە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت: چوومە لایان لە (حجر) کۆببوونەوە ، باسی پێغەمبەری خوایان کرد ﷺ وتیان : هەرگیز نەماندیوە ئەوەندەی ئەو پیاوە لەگەڵ کەسی تردا دان بەخۆدا بگرین ، لەسەر کارێکی زۆر گەورەش ئاراممان گرتوە ، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوت ، هات هەتا رووکنی وەرگرت ، پاشان بەلایاندا گوزەراو تەوافی کرد ، بەهەندێك قسەی بێ تام لاقرتێیان پێکرد ، ئەوەم لەنێوچەوانی پێغەمبەردا ﷺ بەدی کرد ، کەجارێکی‌تر بە بەردەمیاندا هاتەوە ، هەمان شتیان کردەوە ، دیسان و لەدەموچاویدا هەستم پێکردەوە ، پاشان بۆ جاری سێیەم تێپەڕیەوە بەهەمان شێوەیان کردەوە ، هەستاو پاشان فەرمووی : ( ئەرێ تاقمی قورەیشیان ئایا گوێ دەگرن ، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، قوربانیم هێناوە بۆ سەر بڕین ) قورەیش قسەکەیان بەجددی وەرگرت، هەتا وایان لێ هات هەروەکو باڵندە لەسەر سەریان نیشتبێتەوە نەدەجولاَن ، بەشێوەیەك توندوتیژترینیان لە باشترین جێگەدا دایناو وتی: (أبو القاسم) تکایە بلاَوەی لێ بکەن سوێند بێت بە خوا تۆ پیاوێکی نەزان نیت.

بۆ سبەینێ کۆبوونەوە باسیان دەکرد ، لەپڕ لێیانەوە دەرکەوتەوە ، بە هەموویانەوە هەڵیانکوتایە سەری ، چواردەوریان گرت ، یەکێکیان یەخەی کراسەکەی گرت ، ئەبوبەکر نەیهێشت ، دەگریاو دەیوت: ئایا پیاوێك دەکوژن کە تەنها دەڵێت خوا پەروەردگارمە؟ ئەنجا بلاَوەیان لێ کرد.(إبن عمرو) دەڵێت: ئەمە سەختترین هەڵوێست بوو من لە قورەیشم بینی ، کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردبێتیان[2]. (بەکورتی کۆتایی هات).

لەگێڕانەوەکەی بوخاریدا لە عروەی کوڕی زوبێرەوە هاتوە ، دەڵێت: ووتم بە (عمرو)ی کوڕی (عاص) هەواڵم بدەرێ لەبارەی توندترین کاری موشریکانەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردبێتیان وتی: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە ژووری کابەدا نوێژی دەکرد (عقبە)ی کوڕی (ابی معیط) هات ، کراسەکەی ئالاَند لە ملی ، توند گرێی‌دا ،

---

[1] / إبن هشام ١/٢٩٨،٢٩٩.
[2] / إبن هشام ١/٢٨٩،٢٢٩٠.

ئەبوبەکر پەیدابوو هەردوو شانی (عقبە)ی گرت و، لە پێغەمبەری دوورخستەوە ﷺ و فەرمووی: ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە تەنها دەڵێت خوا پەروەردگارمە؟ [1].

لە فەرموودەکەی (اسماء)یشدا: دەنگێك کەوتە بەرگوێی ئەبوبەکر ، وتی: ئەبوبەکر بگە بە هاوڕێکەت ، ئەنجا لای ئێمە خێرا دەرچوو ، چوار پرچی شۆڕی بەسەرەوە بوو ، لەگەڵ دەرچوونەکەیدا هاواری ئەکرد : ئایا پیاوێك ئەکوژن : تەنها لەبەر ئەوەی ئەڵێت خوا پەروەردگارمە ؟ ئەنجا قورەیشیەکان سەرقاڵی بوون و هاتن بەرەو رووی ئەبوبەکر ، کەهاتەوە لامان هیچی بەسەرەوە نەمابوو ، پێمان نەزانی تاهاتەوە لامان [2] .

## موسوڵمـــان بوونی ( حـــەمزە ﷺ )

لەناو ئەو کەشوهەوا پڕ لە هەوری ستەم و دەستدرێژیەدا بروسکە چەخماخەی داو ڕێگەی ژێر دەستەکانی ڕۆشن کردەوە، ئەو ڕووداوەش بریتی بوو لەموسڵمانبوونی حەمزە ﷺ، لەکۆتاییەکانی ساڵی شەشەمی پێغەمبەرێتیدا موسوڵمان بوو، زیاتر پێدەچێت لەمانگی (ذی الحجة) دا موسوڵمان بووبێت.

هۆی موسوڵمان بونیشی ئەوەیە جارێکیان (أبوجهل) بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی لە (سەفا) بوو ، دەستی بۆ بردو ئازاریدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو هیچی نەوت ، پاشان (أبوجهل) بەردێکی کێشا بەسەری پیرۆزیدا بریندااری کرد، هەتا خوێنی لێهات، ئەنجا وازی لێ هێناو چووەوە یانەی قورەیشیان لەناو کابەداو ، لەگەڵیان دانیشت ، کەنیزەکێکی (عبداللە)ی کوڕی (جدعان) ماڵەکەیان لەسەر (سەفا) بوو چاوی لێبوو، حەمزە لە ڕاو دەگەڕایەوە تیروکەوانەکەی لەملدا بوو، کەنیزەکە چوو بەدەمیەوەو چی لە (أبو جهل) دی بوو بۆی گێڕایەوە ، حەمزە تووڕە بوو – نەبەردترین و ئازاترین گەنجی قورەیشیی بوو – بەپەلە ڕۆشت ، لەگەڵ کەس نەوەستا ، خۆی ئامادە کردبوو بۆ (أبو جهل) کە پێی گەیشت لێی بدا ، کەچووە مزگەوتەوە لەسەر سەری وەستاو ، پێی وت: وەستای فیتنە ، ئایا جنێو بە برازاکەم دەدەیت لەکاتێکدا من لەسەر ئایینی ئەوم ؟ پاشان بە کەوانەکەی کێشای بەسەریدا بە خراپی برینداری کرد ، چەند پیاوێك لەخێڵی (بنی مخزوم) – خێڵەکەی أبو جهل– وروژان و، (بنو هاشم) – خێڵی حەمزە –

---

[1] / صحيح البخاري ، باب ماذكر مالقي النبي ﷺ وأصحابه من المشركين بمكة ٥٤٤/١.

[2] / مختصر سيرة الرسول ، نوسينی شێخ عبداللە ی نەجدی ل ١١٣ .

ورووژان ، (أبو جهل) هاواری کرد: واز له (أبو عماره) – واته حەمزە – بهێنن ، چونکه جنێوی خراپم به برازاکەی داوە[1].

له سەرەتا موسوڵمان بوونی حەمزە بریتی بوو له تووڕە بوونی پیاوێك لەبەر سوکایەتی کردن بەکەسەکەی ، پاشان خوای گەورە دڵی گوشاد کردو دەستی گرت بەم پەیامە پیرۆزەوە[2] ، موسوڵمانەکانیش زۆر شانازیان پێوە دەکرد.

## موسوڵمان بوونی ( عومەر ) ی کوڕی ( خەطاب ) ﷺ

هەر لەو کەش و هەوا پڕ له جەورو ستەمەدا بروسکەیەکی‌تر چەخماخەی‌داو ، ڕووناکیەکی زۆرتری هەبوو له چەخماخەی یەکەم ، ئەویش موسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب بوو ﷺ ، لەمانگی (ذی‌الحجة)ی ساڵی شەشەمی پێغەمبەرێتیدا موسوڵمان بوو[3]، ئەمەش پاش سێ ڕۆژ بوو له موسوڵمان بوونی حەمزە ﷺ[4] ، پێشتر پێغەمبەر ﷺ نزای کرد بوو بۆ موسوڵمان بوونی: (ترمذی) له (إبن عمر)ەوە دەری هێناوەو بەڕاستی‌ دەزانێت ، هەروەها (طبرانی) له (إبن مسعود) و (أنس)ە وە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوایە به خۆشەویستترینی یەکێك لەم دوو پیاوە ئیسلام سەربخەیت : به عومەری کوڕی خەتاب یان به (أبی جهل)ی کوڕی هشام) دەرکەوت خۆشەویسترینیان عومەری کوڕی خەتابە ﷺ[5].

پاش چاوگێڕانیش بەهەموو ڕیوایەتەکاندا که لەبارەی موسوڵمان بونیەوە گێڕاونەتەوە دەردەکەوێت که بەشێوەیەکی لەسەرخۆ ئیسلامەتی چووەتە دڵیەوە ، پێش ئەوەی باسی کورتەی بەسەرهاتەکە بکەین پێمان باشە ئاماژە به سیفاتە سۆزداریی و پڕ له هەستەکانی بکەین ﷺ.

عومەر ﷺ بەتەبیعەت تیژیی و ئازایەتی ناسراو بوو، چەندین جار موسوڵمانەکان ئازاریان بەدەستی چەشتبوو، دیارە که لەناخیدا هەستێکی دژبەیەك له کێشەدا بوو ، ڕێزگرتنی لەو نەریتانەی باووباپیران دایان نابوو ، ئالوودەبوونی لەگەڵ ئارەزوەکانی سەرخۆش و ڕابواردنیشدا ، پاشان سەرسوڕمانی بەڕەقی موسوڵمانەکان و بەرگە گرتنیان لەبەردەم بەڵاکاندا لەپێناو بیروباوەڕدا ، پاشان ئەو هەموو گومانەی ڕووی کردبووە دڵی – وەك هەموو بیرمەندێك – لەوەدا که لەوانەیە ئەوەی ئیسلام

---

[1] / مختصر سیرة الرسول ﷺ نوسینی (شێخ محمد بن عبد الوهاب) ل٦٦، رحمه للعالمين ١/٦٨، إبن هشام ٢٩١/١.

[2] / ڕیوایەتێك بەڵگەیە لەسەری شێخ عەبدوڵڵای نەجدی باسی کردوە له (مختصر السيره)دا ل١٠١.

[3] / تاريخ عمر بن خطاب نوسینی (إبن الجوزي) ل١١.

[4] / باسی ئەوەش دێت .

[5] / الترمذی ، أبواب المناقب ، مناقب أبی حفص ، عمر بن الخطاب ٢٠٩/٢.

خەڵکی بۆ بانگ دەکات گەورەترو پاکتربێت لەهی تر ، بۆیە کەهەڵدەچوو بەزوویش خاو دەبووەوە . (وتەی محمد غەزالیە)[1].

کورتەی گێڕانەوەکان پاش کۆکردنەوەی هەموویان - لەبارەی موسوڵمان بونیەوە ئەوەیە شەوێکیان بەناچاری لە ماڵ دەچێتە دەرەوە- دەچێتە ناو حەرەم و ، دەڕواتە ناو سیتری کابەوە ، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ نوێژدەکات و تازە دەستی کرد بوو بە خوێندنی سورەتی (الحاقە) . عومەر گوێی لێ دەگرێت ، دەکەوێتە ژێر کاریگەری وشەکانیەوە ، دەڵێت: لەدڵی خۆمدا وتم : وەڵلاهی هەروەکو قورەیش دەڵێن ، ئەمە شاعیرە ، ئەنجا ئەمەی خوێندەوە : ﴿ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ {٤٠} وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ {٤١} ﴾ الحاقە ، دەڵێت: وتم فاڵگرە ، فەرموی : ﴿ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ {٤٢} تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ {٤٣} ﴾ هەتا کۆتایی سورەتەکە دەڵێت : ئیدی ئیسلام چووە دڵمەوە[2].

ئەوە کەوتنی یەکەم تۆوی ئیسلام بوو لەدڵی عومەردا ﷺ ، بەڵام توێکڵی ڕەوتە جاهیلیەکەو، دەمارگیریە باوەکەو، شانازی کردن بەئایینی باپیرانەوە بەسەریدا زاڵ بوو بوو، هەمیشە دەی چرپاند بەگوێی دڵیدا ، شێلگیرانە دژ بە ئیسلام کاری دەکردو ، گوێی نەئەدایە ئەو هەستەی لەپشت ئەو توێکڵەوە خۆی حەشار دابوو.

هەر لەبەر ئەو تەبیعەت توندی و دژایەتی کردنەی بۆ پێغەمبەر ﷺ ، جارێکیان شمشێری هەڵگرت و بەنیازی لەناو بردنی پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە ، لە ڕێگەدا (نعیم)ی کوڕی (عبدالله النحام العدوی) بینی[3]، یان پیاوێك لەخێڵی (بنی زهره)[4] . یان پیاوێك لەخێڵی (بنی مخزوم)[5]، پێی وت: نیازی کوێت هەیە (عومەر)؟ وتی : ئەمەوێت موحەممەد بکوژم ، کابرا وتی: ئیدی چۆن لەدەست (بنی هاشم) و (بنی زهره) قوتارت دەبێت ئەگەر موحەممەد بکوژیت؟ عومەر پێی وت: هەرچی سەیرت دەکەم تۆش وازت

---

1 / فقه السیرة ل ٩٣،٩٢.

2 / تاریخ عمربن الخطاب نوسینی (ابن الجوزی) ل٦، ریوایەتێکی (إبن إسحاق) کە لە (مجاهد) و (عطاء)ەوە دەیگێڕێتەوە لەمەوە نزیکە ، بەڵام لەکۆتاییەکەیدا لەو جیایە ، سەیرکە (سیره إبن هشام) ١/٣٤٦-٣٤٨، هەروەها ئەوەی (إبن الجوزی) لە(جابر)ەوە هێناویەتی لەمەوە نزیکە، ئەویش لەکۆتاییدا جیادەبێتەوە، بڕوانە (تاریخ عمربن الخطاب) ل٩ . ١٠.

3 / ئەمە لەسەر ریوایەتەکەی (إبن إسحاق)ە ، سەیرکە (إبن هشام)١/٣٤٤.

4 / ئەمەی لە(انس)ی کوڕی (مالیك)ەوە گێڕاوەتەوە، بڕوانە (تاریخ عمربن الخگاب) ل١٠ و، مختصر سیره الرسول نوسینی شێخ عبدالله ی نەجدی ل١٠٣.

5 / ئەوەی لە (إبن عباس)ەوە گێڕاوەتەوە ، بڕوانە دوا سەرچاوە ل١٠٢.

لەو ئایینە هێناوە کە لەسەری بویت ، کابرا پێی وت: ئەرێ عومەر هەواڵێکی سەیرترت پێ بڵێم ! خوشکەکەت و زاواکەت وازیان هێناوەو چوونە سەر ئایینی موحەممەد ، عومەر بەڕەقی و تووڕەییەوە هەستا چوو بۆماڵی خوشکەکەی ، خەبابی کوڕی ئەرەتیان لەلابوو هەردووکیانی فێری قورئان دەکرد ، لاپەڕەیەکیش لە سورەتی (طـه) پێ بوو بۆی دەخوێندنەوە ، لەپشتیانەوە بۆی دەخوێندنەوە ، کە خەباب هەستی کرد بەهاتنی عومەر لەماڵەکەدا خۆی حەشاردا ، (فاطمة)ش . خوشکەکەی عومەر . لاپەڕەکەی شاردەوە ، کاتێکیش عومەر لە دەرگای ماڵەکە نزیك بووبووەوە گوێی لەدەنگی خەباب بوو بۆی دەخوێندەوە ، کە هاتە ژوورەوە وتی: ئەو دەنگە چی بوو کە لەئێوەم دەبیست؟ وتیان: تەنها قسەوباسێکی نێوان خۆمان بوو ، وتی: لەوە دەچێت لەئایینی خۆتان هەڵگەڕابنەوە ، زاواکەی پێی وت: ڕات چی‌یە ئەگەر ڕاستی لەئایینەکەی تۆدا نەبێت؟ عومەر هەر ئەمەی بیست هەڵی کوتایە سەری و بەتوندی لێی‌دا ، (فاطمة)ی خوشکی ویستی لەژێر دەستیدا مێردەکەی دەربهێنێت ، زللەیەکی توندی کێشا بەدەم و چاوی ئەویشدا خوێنی لێهات . لە گێڕانەوەکەی (إبن إسحاق)دا دەڵێت: لێیداو بریینداری کرد . ئەنجا (فاطمة) بە تووڕەییەوە پێی وت: ئەرێ عومەر چیت دەوێت ئەوەتا هەق لە ئایینەکەی تۆدا نییە ، شایەتی‌دا جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی تر مافی پەرستنیان نیەو ، شایەتی بدە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە.

کە عومەر نائومێد بوو ، بینی خوێن لە دەم و چاوی خوشکەکەی دێتە خوارەوە پەشیمان بوەوەو شەرم دایگرت ، وتی: ئەو نوسراوەم بدەنێ کە لاتانە با بیخوێنمەوە ، خوشکەکەی وتی: تۆ پیسی ، تەنها پاکان دەستی لێدەدەن ، هەستە خۆت بشۆ ، هەستاو خۆی شۆرد ، ئەنجا نوسراوەکەی بەدەستەوە گرت ، خوێندیەوە :﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ وتی: ئەمانە کۆمەڵێك ناوی پاك و پیرۆزن ، پاشان (طـــه)ی خوێند ، هەتا گەیشتە ﴿ إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي ﴾ طــه : ١٤، وتی: ئای ئەم گوتانە کە جوان و شکۆدارن ، ئادەی موحەممەدم نیشان بدەن.

کە (خباب) قسەکەی عومەری گوێ لێ بوو هاتە دەرەوە ، وتی: مژدە بێت عومەر ، لە خوا داواکارم کەنزاکەی پێغەمبەر ﷺ بێ بۆت کە شەوی پێنج شەممە فەرموی: (خوایە ئیسلام سەربخە بەعومەری کوڕی خەتاب یان بەئەبوجەهلی کوڕی هشام) پێغەمبەری ﷺ خواش لەناو ئەو خانوەدایە کە لەناو قەدی (سەفا) دایە.

عومەر شمشێرەکەی بەدەستەوە گرت ، چووە ماڵەکە ، دای لە دەرگا ، پیاوێك لە کونی دەرگاکەوە سەیری کرد ، بینی عومەرە شمشێرەکەی بەدەستەوەیە ، خێرا

هەواڵی‌دا بە پێغەمبەر ﷺ ، هەموویان کۆبوونەوە ، حەمزە پێی وتن: چیتانە ؟ وتیان: عومەرە ، وتی: جابا عومەر بێت ، ئادەی دەرگاکەی بۆ بکەنەوە ، ئەگەر خێری بوێت بۆی دەکەین ، ئەگەر بۆ شەڕیش هاتبێت بە شمشێرەکەی خۆی دەیکوژین ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی بۆ دەهات ئەنجا هاتە دەرەوە لە ژوورەکەدا عومەری بینی ، بەرۆك و تاقمەکەی عومەری گرت و بەتوندی ڕای وەشاند ، پێی فەرموو: هێشتا واز ناهێنیت (عومەر) هەتا سەرشۆڕیەکەی (وەلید)ی کوڕی (موغەیرە)ت بەسەردا نەیەت ؟ خوایە ! ئەوە عومەری کوڕی خەتابە ، خوایە بە عومەری کوڕی خەتاب ئیسلامەکەت سەر بڵند بکە ، عومەر دەستبەجێ فەرموی: (أشهد أن لا إله إلا الله ، وأنّك رسول الله) موسوڵمان بوو موسوڵمانەکانی ناوماڵەکە دەستیان کرد بەگوتنی (الله أكبر) بەشێوەیەك خەڵکی مزگەوت گوێیان لێیان بوو[1].

بەڕاستی عومەر خاوەنی ئازایەتیەکی کەم وێنە بوو ، موسوڵمان بوونی هەرایەکی لەناو موشریکاندا دروست کرد سەرشۆڕو زەلیلی کردن و ، پۆشاکی سەر بڵندی و پایە بەرزی و ئاسوودەیی بەموسوڵمانانیش بەخشی.

(إبن إسحاق) بە سەنەدێکی خۆی لە (عمر)ە وە دەگێڕێتەوە ، عومەر فەرموی: کە موسوڵمان بووم توندو تیژیی و دوژمنایەتی خەڵکی مەککەم کەوتەوە بیر بۆ پێغەمبەر ﷺ ، دەڵێت : وتم : ئای ئەبوجەهل ، خێرا چووم تەقەمدا لە دەرگاکەیان هاتە دەرەوە ، وتی: بەخێر بێیت ، چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە ؟ وتی: هاتووم پێت بڵێم کە باوەڕم هێناوە بە خواو موحەممەدی پێغەمبەری و، متمانەشم داوە بەو پەیامەی هێناویەتی ، دەڵێت : دەرگاکەی بەسەردا داخستم و، وتی : خوا لەناوت بەرێت ، بەڕاستی شتێکی خراپت هێنا[2].

(إبن جوزی) دەڵێت: عومەر فەرمووی : هەرپیاوێك موسڵمان ببوایە پیاوانی لێ کۆ دەبوەوە لێیان دەداو ئەویش لێی دەدان ، کاتێك موسڵمان بووم چووم بۆ لای خاڵم . کە (عاصی) کوڕی (هاشم)ە . هەواڵم دایە چووە ژورەوە ، دەفەرموێت چووم بۆ لای گەورە پیاوێکی قوڕەیش . کە لەوانەیە ئەبوجەهل بێت . هەواڵم دایە ، ئەویش لە داخاندا چووە ژوورەوە[3].

هەروەها (إبن هشام) و (إبن الجوزی)یش بەکورتی دەگێڕنەوە، کە عومەر ﷺ موسوڵمان بوو هات بۆ لای (جمیل)ی کوڕی (معمر الجمحی) – دەم نەوێستاوترین

---

[1] / تاريخ عمر بن الخطاب ل٧،١٠،١١، مختصر سيره الرسول نوسينى شێخ عبدالله ى نەجدى ل١٠٢،١٠٣، إبن هشام ٣٤٤/١-٣٤٦.

[2] / دوا سەرچاوە ٣٤٩/١، ٣٥٠.

[3] / تاريخ عمر بن الخطاب . نوسينى (إبن الجوزى) ل٨.

پیاوی قوڕەیش بوو – عومەر هەواڵی دایە کە موسوڵمان بوە ، (جمیل) بەدەنگی بەرز هاواری کرد (إبن الخطاب)یش لە ئایین هەڵگەڕایەوە ، عومەر بەدوایەوە بوو دەیوت: درۆ ئەکا من موسوڵمان بووم ، لێی ووروژان ، کەوتە شەڕ لەگەڵیاندا هەتا خۆر لەسەریان گەرم بوو ، ئیدی عومەر ماندوو بوو دانیشت ، هاتنە سەری ، پێی وتن : چیتان لە دەست دێت بیکەن ، سوێند بەخوا دەخۆم ئەگەر سێ سەد پیاو بووینایە یان بۆمان بەجێ دەهێشتن یان دەبوایە بەجێتان بهێڵایە[1].

دوای ئەوە موشریکان چون بۆماڵەکەی ویستیان بیکوژن ، (بوخاری) لە (عبدالله)ی کوڕی (عمر)ە وە دەگێڕێتەوە فەرمووی: لەکاتێکدا عومەر بەترسەوە لە ماڵەکەیدا بوو، (عاص)ی کوڕی (وائل السهمی) . (أبو عمرو) هات بۆ لای ملوانکەیەکی جوان و کراسێکی ڕووپۆش بە ئاوریشمی لەبەردا بوو ، لەخێڵی (بنی سهم) بوو ، ئەمانە لە جاهیلیەتدا پشتیوانی ئێمە بوون ، پێی وت: چیتە؟ فەرموی: خێڵەکەت ئەڵێن : ئەگەر موسوڵمان بوبم دەمکوژن ، وتی ڕێگەیان پێ نادرێت بگەنە لات . پاش ئەوەی ئەم قسەیەی کرد ئیتر دڵنیا بووم . (عاص) چووە دەرەوە ، بینی خەڵکی ناو دۆڵەکەیان پڕکردوە ، پێی وتن : بۆ کوێ ئەچن ؟ وتیان: ئەوە عومەری کوڕی خەتابە لە ئایین هەڵگەڕاوەتەوە ، وتی: ڕێگە نیە ، ئیدی خەڵکەکە بیرێکیان کردەوە[2]، لەگێڕانەوەیەکی (إبن إسحاق) دا: وەڵلاهی وەکو پۆشاکێك وابوون لەسەری لاچووبن[3].

ئەمە سەبارەت بە موشریکان ، سەبارەت بە موسوڵمانەکانیش ، موجاهید لە (إبن عباس)ەوە ئەگێڕێتەوە : دەڵێت: پرسیارم کرد لە عومەری کوڕی خەتاب ، بەهۆی چیەوە ناونرایت (الفاروق) فەرمووی: حەمزە پێش من بە سێ ڕۆژ موسوڵمان بوو . پاشان بەسەرهاتی موسوڵمانبوونەکەی بۆ گێڕایەوەو لەکۆتاییدا فەرموی : وتم : واتە دوای ئەوەی موسوڵمان بووم . پێغەمبەری خودا ئایا ئێمە بژین و بمرین لەسەر هەق نین ؟ فەرموی : بەڵێ ! سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، ئێوە بژین و بمرن لەسەر هەقن ، فەرمووی ، منیش وتم : ئیتر بۆچی خۆمان بشارینەوە ؟ وتم : سوێندم بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە دەڕۆینە دەرەوە ، بردمانە دەرەوە لە دوو ڕیزدا ، حەمزە لەیەکێکیاندا بوو ، منیش لەوی تریاندا بووم دەنگی پێمان لە خرمەی هاڕینی باراش دەچوو، هەتا چووینە مزگەوتەوە ، دەفەرموێت: قوڕەیش سەیری من و

---

[1] / هەمان سەرچاوە ل٨ ، إبن هشام ١/٣٤٨,٣٤٩.
[2] / إبن هشام ١/٣٤٩.
[3] / صحیح البخاری . باب إسلام عمر بن الخطاب . ١/٥٤٥.

حەمزەیان دەکرد ، تووشی خەمۆکیەك بوون پێشتر شتی وایان بەسەردا نەهاتبوو ، لەو ڕۆژەوە پێغەمبەر ﷺ ناوی نام (الفاروق)[1].

(إبن مسعود) یش ﷺ دەیفەرموو: نەماندەتوانی لەپاڵ کابەدا نوێژ بکەین هەتا عومەر موسوڵمان بوو[2].

لە (صهیب)ی کوڕی (سنان الرومی)یەوە ﷺ فەرموی: کە عومەر موسوڵمان بوو ئیسلامەتی دەرکەوت و، بەئاشکرا بانگی بۆ دەکراو، لە دەوری کابە بەئەڵقە دادەنیشتین ، تەوافی بەیتمان دەکرد ، هاوتاییمان دەکرد لەگەڵ ئەوانەدا کە لەگەڵماندا توند بوون و ، ڕەدی هەندێك لەوانەشمان دەدایەوە کە قسەیان دەکرد[3].

هەروەها لە (إبن مسعود)ەوە فەرمووی: لەو کاتەوە عومەر موسوڵمان بوو سەرمان بڵند بوو[4].

## نوێنەری قوڕەیش لەبەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ

پاش موسوڵمان بوونی ئەو دووپاڵەوانە ڕێزدارە - حەمزەی کوڕی عەبدول موتەلیب و عومەری کوڕی خەطاب ﷺ - هەوری خەمەکان دەڕەوینەوە موشریکانیش بۆ سزادان و ئەشکەنجەدانی موسوڵمانەکان بەئاگا هاتنەوەو ، هەوڵیاندا سەودایەك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن بەڕشتنی هەر نازو نیعمەتێك پێویست بکات بەسەریدا ، هەتا وازی پێ بهێنن لە بانگەوازەکەی ، ئەو هەژارانە بەوەیان نەدەزانی هەرچیەك خۆری لەسەر هەڵدێت لەبەردەم بانگەوازەکەیدا بەهای باڵی مێشولەیەکی نیە ، هەرچیەکیان ویست نائومێد بوون و شکستیان هێنا.

(إبن إسحاق) دەڵێت: (یزید)ی کوڕی (زیاد) لە (محمد)ی کوڕی (کعب القرظی) یەوە بۆی گێڕایەوە وتی: (عتیبە)ی کوڕی (ربیعە) ، پیاوماقوڵێك بوو، جارێکیان لەیانەکەی قوڕەیشدا وتی: ئەری خێڵی قوڕەیش بۆ نەچم بۆلای موحەممەدو قسەی لەگەڵدا بکەم ؟. لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ بەتەنها لە مزگەوتەکەدا بوو. (عتیبە) وتی: دەچم هەندێك پێشنیار دەخەمە بەردەستی لەوانەیە بەهەندێکیان ڕازی بێت ، چی ویست دەیدەینێ و ، وازمان لێ بێنێت ؟ ئەمە کاتێك بوو حەمزە موسوڵمان بوو بوو، هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ زیاترو

---

[1] / تاریخ عمر بن الخطاب نوسینی إبن الجوزی ٦-٧.
[2] / مختصر سیرة الرسول . نوسینی شێخ عبدالله ی نەجدی ل١٠٣.
[3] / تاریخ عمر بن الخطاب ، نوسینی (إبن الجوزی) ل١٣.
[4] / صحیح البخاری . باب إسلام عمر بن الخطاب ١/٥٤٥.

زۆرتر دەبوون ، وتیان : ئەی بۆ نا ، (أبو الولید) هەستە برۆ بۆلای ، قسەی لەگەڵدا بکە ، (عتبە) چوو بۆلای ، هەتا لەنزیکیەوە دانیشت ، وتی: ئەریٚ برازا ، تۆ خۆت دەزانی چ پلەو پایەیەکت لەناو خێڵ و چ رێزێکت لەناو خزماندا هەیە ، ئەوەی تۆ هێناوتە بۆ کەسەکانت کارێکی گەورەیەو بەهۆیەوە دوبەرەکیت تیٚخستوون ، گاڵتە بەعەقڵیان دەکەیت ، ئایینی باووباپیرانت عەیبدار کردووە ، هەرچیەکیش باپیرانیان کردویانە تۆ بە کوفری دەزانیت ، گوێم لیٚ بگرە هەندێك کاروبار دەخەمە بەردەستت بیرێکی لیٚبکەیتەوە ، لەوانەیە هەندێکیان قەبوڵ بکەیت ، دەڵێ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (أبو الولید) هەر چیەکت هەیە بیڵیٚ گوێم لێتە ، وتی : برازا ، ئەو شتەی تۆ هێناوتە ئەگەر ماڵت پێی دەوێت ، هەموومان ماڵ و سامانی خۆمانت بۆ کۆدەکەینەوە هەتا دەبیتە دەوڵەمەندترینمان ، ئەگەر گەورەییت دەوێت دەتکەینە سەرۆکی خۆمان ، هیچ کارێك بە بیٚ تۆ ناکەین ، ئەگەر مەلیکایەتیت دەوێت دەتکەینە مەلیکی خۆمان ، ئەگەر ئەوەش بۆت دێت رێیەکە و ناتوانیت دووری بخەیتەوە لە خۆت ئەوا حەکیمت بۆ بانگ دەکەین ، ماڵ و سامان خەرج دەکەین هەتا چاك دەبیتەوە ، چونکە لەوانەیە تووشی شتێك هاتبیت یان هەروەکو ئەوەی پیٚ وت : هەتا (عتبە) لە قسەکانی بوەوە ، پێغەمبەر ﷺ بە تەواوی گوێی لیٚ گرتبوو ، فەرمووی : (أبو الولید) لیٚ بویتەوە ؟ وتی : بەڵێ ، فەرموی : تۆش گویٚ لە من بگرە ، وتی: باشە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، حم (١) تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٢) كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٣) بَشِيراً وَنَذِيراً فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لا يَسْمَعُونَ (٤) وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ﴾ فصلت ، پاشان پێغەمبەر ﷺ لەسەر خوێندنەوەکەی بەردەوام بوو ، (عتبە) گوێی لیٚ گرتبوو ، دەستی خستبوە پشتی و پاڵی پێوە دابوەوە ، گوێی لیٚ دەگرت ، پاشان پێغەمبەر ﷺ گەیشتە سوژدە کە سوژدەی برد ، پاشان فەرموی ( أبو الولید) ئەوەیە کە بیستت ، ئەوە تۆو ئەو ، (عتبە) هەستاو چوو بۆلای هاوەڵەکانی ، هەندێکیان بەیەکتریان وت : سوێند دەخۆین بەخوا ئەو رەنگ و رووەی (أبو الولید) هەیەتی ئەوەنە بوو کە پێی رۆیشت ، کە هاتەوە لایان دانیشت ، وتیان : ئەوە چیتە (أبو الولید) ؟ وتی: من گوێم لەقسەیەك بوو ، سوێند بەخوا هەرگیز لەو جۆرەم گویٚ لیٚ نەبوە ، وەڵڵاهی ئەوە نە شیعرە ، نە جادووە ، نە فاڵە ، ئەی خێڵی قورەیش بەگوێم بکەن و ئەمە بخەنە گەردنی من ، واز لەو کابرایە بهێنن و خۆتانی لیٚ کەنار بگرن ، وەڵڵاهی ئەو قسەیەی من لێم بیست لە داهاتوودا شەوکەتێکی گەورەی دەبێت ، ئەگەر عەرەب

لەناوی بەرن ئەوا بە غەیری خۆتان لەکۆڵتان دەبێتەوە ، ئەگەر بەسەر عەرەبیشدا زاڵ بێت ئەوا موڵکی ئەو موڵکی ئێوەشە ، سەربەرزی ئەو هی ئێوەیە و ، دڵخۆشترین کەس دەبن بە ئەو ، وتیان : وەڵلاهی (أبو الولید) ئەڵێی بە زمانی سیحری لە تۆش کردوە ؟ (عتبە) وتی: ئەوە ڕای منە لەبارەی ئەو پیاوەوە ، چیتان پێ باشە ئەوە بکەن [1].

لە ڕیوایەتێکی تردا (عتبە) گوێی گرتبوو هەتا پێغەمبەر گەیشتە ئایەتی: ﴿ فَإِن أَعْرَضُوا فَقُلْ أنذَرْتُــكم صاعِقة مِثْلَ صاعقَة عادٍ وَ ثَمــود ﴾ ئیدی (عتبە) بەترس و لەرزەوە هەستاو، دەستی خستە سەردەمی و دەیوت: بیکە بەخاتری خوداو خزمایەتی! لەترسی هەڕەشەکە هەستابوو ، ئەوەی وتبوو بەقوڕەیش کە وتبووی. [2]

## ( ئەبو طالب )

## ( بەنی هــاشم ) و ( بەنی عبد المطلب ) کۆ دەکاتەوە

ئاڕاستەی بارودۆخ و ڕەوشەکە گۆڕانی بەسەردا هات ، بەڵام هێشتا (أبو طالب) ترسی لە برازاکەی هەبوو کە موشریکان شتێکی لێ بکەن ، کە سەیری ڕووداوەکانی پێشتری دەکرد . کاتێك موشریکان هەڕەشەی شەڕیان لەگەڵدا کردبوو، پاشان هەوڵی سەودایاندا لەگەڵیدا بە (عمارە)ی کوڕی (ولید) هەتا پێغەمبەریان بداتێ بیکوژن ، هەروەها ڕۆشتنی (أبوجهل) بۆلای بەبەردێك بیکوژێت و، هەوڵی (عقبە) بۆ خنکاندنی برازاکەی بەجلەکانی خۆی و خەریك بوو بیخنکێنێت و هەروەها دەرچوونی (إبن الخطاب) بەشمشێرەکەیەوە بۆ کوشتنی برازاکەی . ئەبوطالب بیری لەو ڕووداوانە دەکردەوەو ، بۆنی شەڕێکی دەکرد دڵی هێنایە لەرزە ، بۆی ساغ بوبوەوە کە موشریکان بڕیاری شاردنەوەی ئۆباڵی ئەم دەدەن و، برازاکەی دەکوژن ، ئەوجا (حەمزە) یان (عومەر) یان هەر کەسێکی تر هیچ دادێکی نادەن ئەگەر کەسێك هەڵی کوتایە سەر برازاکەی و لە ناکاودا کوشتی.

(أبوطالب) لەمە دڵنیابوو، لەسەر هەقیش بوو، ئەوان بەئاشکرا کۆبوونەوە بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ ، قورئان ئاماژەی کردووە بەو بڕیارەی قوڕەیش و فەرمویەتی : ﴿أم أبــرَموا أمْراً فإنـــا مُبْرَمونْ ﴾ الزخرف/٧٩ کەواتە دەبێت (أبو طالب) چی بکات !

---

[1] / إبن هشام ٢٩٤،٢٩٣/١.

[2] / تفسیر ابن کثیر ١٥٩/٦ . ١٦١.

که بینی قورەیش گردبونەتەوە دژ بەبرازاکەی ، هەستا لەناو بنەماڵەکەیدا لە (بنی هاشم) و بنی (عبد المطلب) کە هەردوو ڕۆڵەی (عبد مناف) بوون ، بانگی کردن بۆ بەرگری کردن لە برازاکەی و پشتیوانی کردنی ، ئەوانیش بە موسوڵمان و کافرەوە وەك دەمارگیریی هاوسێیەتی عەرەبی هاتن بەدەمیەوە ، تەنها (أبو لهب)ی برای نەبێت ، کە لەوان جیابوەوەو لەگەڵ قورەیشدا بوو[1].

## پەیوەندی دابڕینی گشتی

سەبارەت بەموشریکان . چوار ڕووداوی گەورە لەماوەی چوار هەفتەدا ، یان لە کەمترین ماوەدا ڕوویاندا ، لەوانە ، موسوڵمان بوونی حەمزە ، پاشان عومەرو ، پاشان ڕەتکردنەوەی سازشی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیانداو، پاشان یەکگرتنی (بنو مطلب) بە موسوڵمان و کافرەوە بۆ پاراستنی ژیانی پێغەمبەرو بەرگریی لێ کردنی ، موشریکان سەرسام بووبوون ، ناهەقیشیان نەبوو ، ئەوان دەزانن ئەگەر موحەممەد بکوژن خوێنی هەموویان لەشیوی مەککەدا دەڕژێت ، لەوانەشە ببێتە هۆی لە ڕەگەوە دەرکێشانیان ، ئەوەیان دەزانی بۆیە بیریان لەزوڵمێکی تر دەکردەوە جگە لە کوشتن ، بەلاّم کاریگەرتر لەوەی دوایی کردیان.

## پەیمانامەی ستەم و دەست درێژی

هەموو قورەیش لە (ضیف)ی (بنی کنانه) لە شیوی (المحصب) کۆبونەوەو پەیمانیاندا دژ بە (بنی هاشم) و (بنی عبد المطلب) کە ئیتر لەمەودوا نە ژن و ژنخوازی و، نە کڕین و فرۆشتن و ، هاودەمیی کردن و، تێکەلاّوی و، هاتوچۆو ، قسەیان لەگەڵدا نەکەن ، هەتا پێغەمبەریان تەسلیم نەکەن بۆ کوشتنی ، لەو بارەیەوە پەیمانامەیەکیان نووسی چەند بەڵێن و پەیمانێکی تێدابوو کە (هەرگیز هیچ جۆرە سوڵحێکیان لەگەڵدا نەکرێت و ، بەزەییان پیایاندا نەیەتەوە ، هەتا پێغەمبەریان تەسلیم دەکەن بۆ کوشتنی)

(إبن القیم) دەڵێت گوتراوە: کە (منصور)ی کوڕی (عکرمە)ی کوڕی (هاشم) نوسیویەتی ، گوتراویشە کە (نضر)ی کوڕی (حارث) نوسیویەتی ، بەلاّم قسەی ڕاست ئەوەیە کە (بغیض)ی کوڕی (عامر)ی کوڕی (هاشم) نوسیویەتی ، پێغەمبەر ﷺ نزای لێ کردوە هەردوو دەستی ئیفلیج بوون[2].

---

[1] / إبن هشام ٢٦٩/١، مختصر سیرة الرسول ، نوسینی عبدالله ی نەجدی ل ١٠٦.

[2] / زاد المعاد ٤٦/٢.

ئەو پەیمانە تەواوبوو بەسترا ، نووسخەکە بەدیواری ناوەوەی کابەدا هەڵواسرا ، هەموو (بنو هاشم) و(بنو عبدالمطلب) بە کافرو موسوڵمانەوە لایەنگر بوون جگە لە (أبو لهب) بۆیە هەموویان لە شیوی (أبوطالب) دا سەرەتای شەوی مانگی (المحرم)ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرێتی بەندی کران.

## سێ ساڵ لە شیوی ( أبو طالب ) دا

ئابڵوقەکە توندبوو ، هەموو ئاوو خۆراکێکیان نەما ، موشریکان نەیان دەهێشت هیچ خۆراك و کڕین و فرۆشتن و بازرگانیەك بێتە مەککەو نەیکڕن ، هەتا وای لێهات زۆریان بۆهات کەوتنە خواردنی گەڵای دارو چەرم ، بەشێوەیەك لەپشت شیوەکەوە دەنگی ئاهوحەسرەتی ژن و مناڵەکانیان دەبیسرا کە لەبرساندا هاواریان دەکرد ، مەگەر بە - نهێنی- وەگەرنا هیچ شتێکیان پێ نەدەگەیشت ، لە ڕۆژانی مانگە حەرامکراوەکاندا نەبێت نەیاندەتوانی هیچ ڕۆژێك بۆ شت کڕینیش بێنە دەرەوە ، ئەو کاتانە شمەکیان لەو کاروانانە دەکڕی کە لە دەرەوە دەهاتنە ناو مەککە ، خەڵکی مەککەش نرخی شتەکانیان بەکڕین بەرز دەکردەوە بۆ ئەوەی پێیان نەکڕدرێت.

حەکیمی کوڕی حوزام پێدەچوو گەنمی پێ بێت بۆ خەدیجەی پوری ، ڕ. جارێکیان (أبوجهل) هاتە سەر ڕێ و لێی نەدەبوەوە نەیدەهێشت تا (أبو البختری) کەوتە نێوانیان و ، یارمەتیدا گەنمەکە بۆ پوری بەرێت.

(أبو طالب) زۆر لەگیانی پێغەمبەر ﷺ دەترسا ، بۆیە کاتێك خەڵك بەرەو خەوتن دەڕۆشتن فەرمانی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ لە جێگەکەیدا بنوێت ، هەتا ئەو کەسەی نیازی کوشتنی هەیە ئەوە ببینێت ، کە خەڵك دەخەوتن فەرمانی دەدا بەیەکێك لە کوڕەکانی یان براکانی یان ئامۆزاکانی تا لەسەر جێگاکەی پێغەمبەر ﷺ بخەون ، ئەنجا دەی وت بە پێغەمبەر ﷺ کە لەسەر جێگای یەکێکیان بخەوێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانەکان لە ڕۆژانی وەرزی حەجدا دەچوونە دەرەوە ، بەخەڵك دەگەیشتن بانگیان دەکردن بۆ ئیسلامەتی ، پێشتریش وتمان کە (أبولهب) چی دەکرد.

## هەڵوەشاندنەوەی پەڕەی پەیمانەکە

سێ ساڵی ڕەبەق تێپەڕی کرد ڕەوشەکە وەکو خۆی بوو ، لەمانگی موحەڕڕەمی[1] ساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتیدا ڕووداوی هەڵوەشاندنەوەی پەڕەکەو دڕاندنی پەیمان نامەکە ڕوویدا ، ئەمەش لەبەرئەوە بوو کەهەندێك لەقورەیش پێی ڕازی بوون و هەندێکێشیان پێی ڕازی نەبوون ، بۆیە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەیان دەدا.

ئەوەی بەوکارە هەستا (هشام)ی کوڕی (عمرو) لە (بنی عامر بن لؤی) بوو. شەوانە بەنهێنی خواردنی دەبرد بۆ شیوەکە. ئەم پیاوە چوو بۆلای (زهیر)ی کوڕی (أبی أمیە المخزومی). دایکی (عاتکە)ی کچی (عبد المطلب) بوو، پێی وت: ئەی زوهەیر ، من بەتەنها چی بکەم ؟ وەڵڵاهی یەك پیاوی ترم لەگەڵدا بوایە ئەو پەیماننامەیەم ئەدڕاند ، وتی: من پیاوێکم دۆزیەوە ، وتی کێیە ؟ وتی: منم ، زوهەیر وتی: کەواتە پیاوی سێیەمم بۆ بدۆزەرەوە.

چوو بۆ لای (أبو البختری)ی کوڕی (هشام) ، چی وتبوو بە (مطعم) بەویشیی وت ، وتی: جا کەس هەیە هاوکاری ئەم کارە بکات ؟

وتی: بەڵێ ، وتی: کێیە ؟

وتی: (زهیر)ی کوڕی (أمیە)و، (مطعم)ی کوڕی (عدی) و، منیش لەگەڵتدام،

وتی: پێنجەممان بۆ پەیدا بکە.

چوو بۆ لای (زمعە)ی کوڕی (أسود)ی کوڕی (المطلب)ی کوڕی (أسد) ، قسەی لەگەڵدا کردو ، باسی خزمایەتی و مافەکانی بۆ کرد ، پێی وت: ئایا بۆ ئەو کارەی منی بۆ بانگ دەکەی کەسی تر هەیە ؟

وتی: بەڵێ و ناوی ئەوانی تریشی وت، ئەنجا لە (الحجون) کۆبوونەوەو، پەیمانیان بەست لەسەر هەڵوەشاندنەوەی پەڕەی پەیماننامەکەو ، زوهەیر وتی: من دەست پێ دەکەم و یەکەم کەستان دەبم بۆ ئەو کارە.

بۆ ڕۆژی سبەینێ کەچوونە یانەکانی خۆیان ، زوهەیر هاتەدەرەوە ملوانکەیەکی لەملدا بوو ، حەوت جار تەوافی کرد بەدەوری کابەدا ، پاشان ڕووی کردە خەڵك و، وتی: ئەی خەڵکی مەککە ڕەوایە ئێمە نان بخۆین و، جل لەبەر بکەین و، کەچی (بەنی هاشم)یش بەرەو فەوتان بڕۆن و ، نەکەس شتیان پێ بفرۆشێت و نەکەس شتیان لێ بکڕێت ؟

---

[1] / بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە(ابوطالب) پاش هەڵوەشاندنەوەی لاپەڕەکە بەشەش مانگ مردووە، ڕاستترینیش ئەوەیە لەبارەی مردنی (ابو طالب)ەوە کە لەمانگی (ڕەجەب) دا بوە، ئەوەش دەڵێ : لە ڕەمەزاندا مردوە، مانای وایە پاش هەڵوەشاندنەوەی لاپەڕەکە بە هەشت مانگ و چەند ڕۆژێ مردوە.

وەڵڵاهی دانانیشم هەتاکو ئەو پەڕە ستەمکارە دوابڕاوە نەدڕێنرێت.

(ابو جهل) – کە لە گۆشەی مزگەوتەکەدا دانیشتبوو – وتی: درۆ ئەکەیت ، وەڵڵاهی نابێت بدڕێت ، (زومعە) هەڵیدایەو وتی: وەڵڵاهی (أبو جهل) تۆ درۆ ئەکەیت ، ئێمە ڕازی نەبووین بەنووسینی ئەو پەیماننامەیە کاتێك نوسراوە ، ئەنجا (ابو البختری) وتی: (زمعە) ڕاست ئەکا . ئێمە ڕازی نابین بەوەی تێیدا نوسراوەو دانی پیدا نانێین.

(مطعم)ی کوڕی (عدی) وتی: ئێوە ڕاست ئەکەن هەرکەسێکیش وەك ئێوە نەڵێت خۆی و ئەوەی نوسیویەتی دەدەینە دەست خوا.

ئەنجا (هشام)ی کوڕی (عمرو)یش بەو شێوەیەی وت.

ئەبوجەهل وتی: ئەمە کارێکە بەشەو تەگبیری بۆ کراوە ، لەشوێنێکی تردا پرس و ڕای لەسەر کراوە ، (ابوطالب)یش لەلایەکی مزگەوتەکەدا دانیشتبوو ، هات بۆ لایان چونکە خوای گەورە هەواڵی دابوو بەپێغەمبەر ﷺ کە پەڕەی پەیماننامەکە چی لێهاتووەو ، چۆن خۆرەی بۆ ناردووەو ، هەرچی باسێکی تێدایە لە ستەم و دابڕینی پەیوەندی خزمایەتی و زۆرداریی خواردوویەتی جگە لە باسی خودای گەورە ، ئەم هەواڵەی‌دا بەمامی، (ابو طالب) هەستاو چوو بۆلای قورەیش و هەواڵی پێدان کە برازاکەی ئەوەو ئەوەی فەرمووە ، ئەگەر درۆی کرد ئێمە لادەچین خۆتان چاری بکەن ، ئەگەر ڕاستیشی کرد دەبێت لەو ستەم و دابڕینە پاشگەز ببنەوە ، وتیان: بەڕاستی بە ویژدانیت.

پاش ئەوەی گفتوگۆ لەنێوان ئەو کۆمەڵەو (أبوجهل)دا بەردەوام بوو، (مطعم) هەستا پەڕەکە بدڕێنێت ، سەیری کرد خۆرە هەمووی خواردووە جگە لە وشەی پیرۆزی (باسمك اللهم) و، هەرچیەك ناوی خودای تێدا بووبێت نەیخوارد بوو.

پاشان پەڕەی پەیماننامەکە هەڵوەشێنرایەوەو ، پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی لە شیوەکەدا لەگەڵی بوون هاتنە دەرەوە ، موشریکان نیشانەیەکی گەورەی پێغەمبەرێتی موحەممەدیان بینی ﷺ ، بەڵام هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ﴾ القمر/٢ ، بەو نیشانە گەورەیەش ملیان نەداو کوفرەکەیان خەستتر بوەوە[1].

---

[1] / وردو درشتی ئەم دابڕینە لە (صحیح البخاری)دا کۆکردەوە، باب نزول النبی بمکە ٢١٦/١، باب تقاسم المشرکین علی النبی ٥٤٨/١، هەروەها (زاد المعاد) ٤٦/٢، وە ابن هشام ٣٥١,٣٧٤/١ – ٣٧٧، هەروەها (رحمە للعالمین) ٧٠,٦٩/١، هەروەها (مختصر سیرە الرسول) (نوسینی عەبدوڵڵای نەجدی) ل ١٠٦ـ١١٠، هەروەها (مختصرالسیرە) نوسینی (شێخ محمد بن عبدالوهاب النجدی) ل٦٨–٧٣، لەنێوان ئەو سەرچاوانەشدا جیاوازیەکی زۆرکەم دەبینریٚ، ئێمەش ئەو ڕایەمان پەسەند کردووە، کە پاش تێڕامان بە لامانەوە باشتربوە.

## دواین شاندی قوڕەیش بۆ لای (أبو طالب)

پێغەمبەری خوا ﷺ لە شێوەکە هاتە دەرەوەو ، دەستی کردەوە بەکارەکەی خۆی ، قوڕەیشیش هەرچەندە وازیان لەدابڕینەکە هێنابوو، بەڵام هێشتا کاریان دەکرد بۆ فشار خستنەسەر موسڵمانەکان و ڕێگەگرتن لەڕێبازی خودا، (أبو طالب)یش بەردەوام چوار دەوری برازاکەی دابوو ، بەڵام تەمەنی لە هەشتا تێپەڕی بوو ، ئازارو ئەشکەنجەو ڕووداوە گەورە یەك لەدوای یەکەکانی ئەو چەند ساڵە – بەتایبەتی ئابلۆقەی شیوەکە – جومگەکانی لاوازو بێ هێز کردبوو ، پشتی چەماندبووەوە ، هێشتا چەند مانگێك بەسەر هاتنە دەرەوەیدا نەڕۆشتبوو لە شیوەکە ، نەخۆشی بەرۆکی گرتبوو لێی نە ئەبووەوە . ئیدی موشریکان لە شۆرەتی خۆیان دەترسان لەناو عەرەبدا کەئەگەر دوای مردنی (أبو طالب) شتێکی لێ بکەن حورمەتیان دەشکێت ، بۆیە جارێکی تر هەوڵیاندا بە ئامادەبوونی (أبو طالب) شاندێکی تر بنێرن بۆ قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و ئەوەی بدەنێ کە پێشتر ڕازی نەبوون بیدەنێ ، شاندێکیان نارد کە دادەنرێت بەدوایین شاند بۆلای (أبو طالب).

(إبن إسحاق) و هەندێکی تر دەڵێن: کە (أبوطالب) کەوتە جێگەو ، هەواڵی کەفتەکاربوونی گەیشتەوە بەقوڕەیش هەندێکیان بەیەکتریان دەوت: (حمزە) و (عمر) موسوڵمان بوون ، هەواڵی موحەممەدیش بەناو هەموو تیرەکانی قوڕەیشدا بڵاوبۆتەوە ، با بڕۆین بۆ لای (أبو طالب) ، بەڵکو دەستی ئەو بگرێت و ، خاتری ئێمەش بگرێت ، وەڵڵاهی هیچ متمانەیەکمان نیە کە لە دواڕۆژدا هەموو شتێکمان زەوت نەکەن ، لە دەربڕینێکی تردا : بەڕاستی ئەترسین ئەم پیرە پیاوە بمرێت و ، ئەو پیاوە (موحەممەد ﷺ) شتێکی لێ بێت و عەرەبیش ئێمەی پێ عەیبدار بکات و پێمان بڵێن : وازیان لێ هێنا تا مامی مرد ئەنجا دەستیان بۆ برد.

چوون بۆلای (أبوطالب) و قسەیان لەگەڵدا کرد ، شاندەکە پیاوماقوڵانی قوڕەیش بوون بریتی بوون لە: (عتبە بن ربیعە) و (شیبە بن ربیعە) و (أبو جهل بن هشام) و (امیە بن خلف) و (أبوسفیان بن حرب) لەگەڵ چەند پیاوماقوڵێکی تریاندا – نزیکەی بیست و پێنج کەس دەبوون – وتیان : (أبو طالب) خۆت دەزانیت کە لەناو ئێمەدا چ پلەوپایەیەکەت هەیە ، خۆشت دەبینیت کە چیت لێ هاتووە ، دەترسین شتێکت لێ بێت و دەزانی کێ لەنێوان ئێمەو برازاکەتدایە ، بانگی بکە ، چی لەلای ئێمەیە بیدەرێ ، چ مافێکی ئێمەش لای ئەوە بۆمان وەرگرە ، باوازمان لێ بهێنێت و ئێمەش وازی لێ دەهێنین ، واز لە ئایینەکەمان بهێنێت ، ئێمەش واز لە

ئایینەکەی ئەو دەهێنین ، (أبوطالب) ناردی بەشوێنیدا ، هات بۆلای ، پێی وت: برازاکەم ، ئەمانە پیاوماقوڵانی خێڵەکەتن ، لەبەر تۆ کۆبوونەتەوە ، تا هەق و حساب لەگەڵ یەکتریدا بکەن ، پاشان هەواڵی ئەوەی پێدا کە ئەوانە بۆچی هاتوون ، لەگەڵ دەست نەهێنانە ڕێگە لەلایەن هیچ لایەکەوە بۆ لاکەی تر.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: پێتان چۆنە ئەگەر گفتێکتان بدەمێ باسی بکەن ، بەو گوتەیە دەبنە خاوەنی هەموو عەرەب و، عەجەمیش ملتان بۆ دەدەن ، لە دەربڕینێکی تردا ، پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە (أبو طالب)و فەرمووی: ئەمەوێت ئەوان لەسەر وشەیەك ڕێك بکەون ، کە عەرەب ملیان بۆ کەچ بکات و، بەو پێیەی عەجەمیش جزیەیان بداتێ ، لەدەربڕینێکی تریشدا فەرمووی: مامە ، بۆچی بانگیان ناکەیت بۆ شتێك باشترە بۆیان؟ وتی: تۆ بۆ چیان بانگ دەکەیت؟ فەرمووی: بانگەشەیان دەکەم بۆ ووشەیەك بیڵێن تا بەووشەیە عەرەب ملیان بۆ بدات و، ببنە خاوەنی عەجەمیش ، دەربڕینێکیش هەیە، لە ڕیوایەتەکەی (إبن إسحاق) دا دەڵێت ، فەرمووی: یەك وشە هەیە بیڵێن ، دەبنە خاوەن هەموو عەرەب و، عەجەمیش ملتان بۆ کەچ دەکەن ، کە ئەم وتەیەی فەرموو ، هەموویان وەستان و سەرسام بوون ، نەیاندەزانی چۆن ئەو تەنها قسە بەسوودە ڕەت بکەنەوە تائەو ئاست و سنوورە ؟ پاشان (أبو جهل) وتی: ئەو وشەیە چیە؟ بەسەری باوکت دە وشەیشت دەدەینێ ، فەرمووی: بڵێن (لاإله إلا الله) و، واز لەوەبهێنن کە دەیپەرستن ، دەستیان کرد بەچەپڵەلێدان و، وتیان: ئەرێ موحەممەد تۆ ئەتەوێت هەموو خواکان بکەینە یەك خواوەند؟ بەڕاستی تۆ شتێکی سەیر ئەڵێیت.

پاشان هەندێکیان بەیەکتریان دەوت: سوێند بەخوا ئەو پیاوە هیچ شتێکتان ناداتێ لەوەی ئێوە دەتانەوێت ، بڕۆن بەدەم ئایینی باوو باپیرانتانەوە ، هەتا خوا ئەم کێشەیەتان بۆ یەکلا دەکاتەوە ، پاشان بڵاوەیان لێ کرد.

لەبارەی ئەوانەوە ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ {١} بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ {٢} كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوْا وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ {٣} وَعَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ {٤} أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ {٥} وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ {٦} مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ {٧} ﴾ ص[1].

---

[1] / إبن هشام ٤١٧/١ ـ ٤١٩، تفهيم القرآن ٣١٦/٤ – ٣١٨، (مختصر سيرة الرسول) نوسینی (شێخ عبدالله ی نەجدی) ل٩١.

# ساڵی ماتەمینی

## کۆچی دوایی ئەبو طالب

نەخۆشی بەرۆکی (ابو طالب)ی بەرنەدا ، زۆری پێ نەچوو وەفاتی کرد لە مانگی ڕەجەبی[1] ساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتیدا ، پاش شەش مانگ لەهاتنە دەرەوەیان لەشیوی ئەبو طالب[2]، وتراویشە: لەمانگی ڕەمەزانداو پێش وەفاتی خەدیجە . ڕ . بە سێ ڕۆژ وەفاتی کردوە.

لە (صحیح)یشدا هاتووە لە (المسیب)ەوە: کاتێك (أبو طالب) کەوتە گیانەڵا ، پێغەمبەر چووە لای ، (أبوجهل)یش لەلای دانیشتبوو ، فەرمووی: مامە ، بڵێ (لاإله إلاالله) ، بەم وشەیە داوای لێخۆش بونت بۆ بکەم لەلای خودا ، (أبوجهل) و (عبدالله)ی کوڕی (أمیه)ش دەیانوت: (أبو طالب) ، ئایا لە ئایینی (عبد المطلب) پەشیمان دەبیتەوە؟ وازیان لێ نەهێنا هەر قسەیان لەگەڵدا دەکرد تا دواوشەی پێ وتن: لەسەر ئایینی (عبد المطلب)م ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: داوای لێخۆش بونت لێ دەکەم هەتا لێم قەدەغە نەکرێت ، ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿ مَاكَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِمَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴾ التوبة/ ١١٣، هەروەها ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿ إِنَّكَ لَاتَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾[3].

پێویستیش ناکات باس لەدەست ڕۆیشتوویی (أبو طالب) بکەین ، بە ڕاستی ئەو قەڵایەبوو کە بانگەوازی ئیسلامی خۆیی پێ دەپاراست لەشاڵاوی گەورەو بێعەقڵەکانی قوڕەیش ، بەڵام لەسەر ئایینی پیرەکانی پێش خۆی مایەوە ، بەتەواوەتی ڕزگاری نەبوو ، لە (صحیح) داهاتووە لە (عباس)ی کوڕی (عبد المطلب) ەوە بەپێغەمبەری ووت ﷺ: نەتتوانی هیچ بۆ مامت بکەیت ، لەکاتێکدا ئەو پەرژینی تۆ بوو ، بۆ تۆو لەبەر تۆش توورە دەبوو؟ فەرمووی: (أبو طالب) لە تەنکاوی ئاگردا دایانناوە ، ئەگەر من نەبومایە ئەوا لەپلەی خوارەوەی دۆزەخدا دەبوو[4].

---

[1] / تاریخ الإسلام، نوسینی (شا ئەکبەرخان نەجیب ئابادی ١/ ١٢٠، لەسەرچاوەکانیشدا جیاوازیەکی زۆرهەیە سەبارەت بەومانگەی (ابوطالب)ی تێدا مردووە، ئەم ڕایەمان بەلاوە پەسەندترە چونکە زۆرینەی سەرچاوەکان لەسەرئەوە کۆکن کە شەش مانگ پاش ڕزگاربوون لەشیوەکی (ابو طالب) وەفاتی کردووە، ئابڵوقەکەش سێ ساڵ بوە، ئەگەر ئابڵوقەکە شەوی بەدری موحەڕەمی ساڵی حەوت دەستی پێکردبێ ، ئەوا لەڕەجەبی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتیدا کۆچی دوایی کردوە.

[2] / مختصر سیره الرسول ، نوسینی شێخ عبدالله ی نەجدی ل١١١.

[3] / صحیح البخاری ، باب قصة ابی طالب ١/٥٤٨.

[4] / صحیح البخاری ، باب قصة ابي طالب ١/٥٤٨.

هەروەها لە (أبی سعید الخدری)یەوە ، دەڵێت کە گوێی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ - باسی مامی لەلادا کرا - فەرمووی: بەڵکو تکا کردنم بۆی لە ڕۆژی قیامەتدا سوودی پێ ببەخشێت ، لە تەنکاوی ئاگردا دادەنرێت تا دەگاتە هەردوو قولە پێی[1].

## دواماڵئاوایی خەدیجە - ڕ-

پاش کۆچی دوایی (أبوطالب) بەدوومانگ یان سێ مانگ - لەگەڵ بونی جیاوازی لەڕاکاندا - دایکی ئیمانداران خاتوو خەدیجەی گەورەژن (ڕەزای خوای لێ بێت) وەفاتی کرد ، کۆچی دواییەکەی لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرێتیدا بوو ، لەو کاتەدا تەمەنی (٦٥) ساڵ بوو ، پێغەمبەریش ﷺ تەمەنی پەنجا ساڵ بوو[2].

خاتوو خەدیجە (ڕەزای خوای لێ بێت) یەکێك بوو لە نیعمەتە چاکەکانی خودا بەسەر پێغەمبەرەوە ﷺ ، بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك لەگەڵیدا مایەوەو هەمیشە لە ساتەکانی دڵەڕاوکێدا سۆزی بۆ دەنواندو لەکاتە سەختەکانیدا پشتیوانی دەکردو، لە گەیاندنی پەیامەکەیدا هاوکاریی دەکردو، لەقۆناغەکانی جیهادی سەختدا هاوبەشی دەکردو بەخۆیی و ماڵ و سامانی دڵنەوایی دەکرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە فەرمویەتی: ( لە کاتێکدا کە خەڵك باوەڕیان پێ نەدەکردم ئەو باوەڕی پێهێنام ، کاتێك خەڵك بەدرۆیان دەخستمەوە ئەو متمانەی پێدەبەخشیم ، کاتێك خەڵك لە یارمەتی خۆیان بێ بەشیان کردم ، ئەو کردمیە هاوبەشی سامانەکەی خۆی، خوای مەزن منداڵەکانی ئەوی بۆ هێشتمەوەو ، لە غەیری ئەو نەیهێشتەوە )[3].

لە (صحیح)یشدا هاتووە لە (أبی هریرە)وە ﷺ فەرمووی: جبریل ؑ هاتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە خەدیجەیە ، بەڕێوەیە ، دەفرێکی پێیە یان پێخۆری تێدایە یان خواردن یان شەراب ، ئەگەر هاتەلات سڵاوی پەروەردگاری پێبگەیەنەو ، مژدەی بدەرێ بە بەهەشتێك کە نە دەنگە دەنگی تێدایە نە ماندوو بوون[4].

---

[1] / هەمان سەرچاوە .

[2] / (إبن الجوزی) لە (التلقیح)دا جەخت دەکاتەوە لەسەر مردنی (خەدیجە - ڕ- لە ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا ل٧، هەروەها عەلامە (المنصور فوری) لە (رحمە للعالمین) ٢/١٦٤، چەندینی تر هەمان ڕایان هەیە.

[3] / لە (مسند)ەکەیدا گێڕاویێتیەوە ٦/١١٨.

[4] / صحیح البخاری ، باب ترویج النبی ﷺ خدیجة وفضلها ١/٥٣٩.

## داباریِنی خەمەکان

لەچەند ڕۆژێکدا ئەو دووڕووداوە خەمناکە ڕوویاندا ، هەستی خەم و ئازارەکان دڵی پێغەمبەریان ﷺ هێنایە لەرزە ، پاشان قورەیش کەوتنە داباراندنی کارەساتەکان ، زاتی زیاتریان دەکرد بەسەریدا ، پاش مردنی (أبو طالب) بە ئاشکرا ئازارو ناڕەحەتیان بۆ دروست دەکرد، خەمەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەڵەکە دەبوون ، هەتا بێئومێد بوو لێیان و کەوتەڕێ بەرەو (طائف) بەئومێدی بەدەمەوە هاتنی بانگەوازەکەی یان پەنادانی و پشتیوانی کردنی دژ بەخێڵەکەی، کەسی نەبینی جێگەی بکاتەوەو کەسیش پشتیوانی نەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئازاریاندا ، کارێکیان پێکرد خێڵی قورەیش پێیان نەکردبوو.

چەند قورسایی ئازارەکانی خەڵکی مەککە بۆ سەر پێغەمبەر بوایە ، ئەوەندە لەسەر هاوەڵانی توند ئەبوو، هەتا جارێکیان ئەبوبەکری صدیق ﷺ پەنای برد بۆ کۆچکردن لە مەککە ، لەشار دەرچوو هەتا گەیشتە (برد الغماد)و دەیویست بەرەو حەبەشە بڕوات ، (إبن الدغنە) گەڕاندیەوەو پەنای‌دا[1].

(إبن إسحاق) دەڵێت: کاتێك (أبوطالب) وەفاتی کرد ، قورەیش ئەوەندە ئازاری پێغەمبەریان ﷺ دەدا لەژیانی (أبو طالب)یشدا هەرگیز ئەو زاتەیان نەدەکرد ، هەتا بێ عەقڵێك لە بێ عەقڵەکانی قورەیش ڕێگەی پێگرت و، خۆڵی کرد بەسەری پیرۆزیدا ، کە گەڕایەوە ماڵەوە ، خۆڵەکە هەر بە سەریەوە بوو ، یەکێك لەکچەکانی هەستا چوو بۆ لای و بەدەم گریانەوە سەرو دەم وچاوی سڕی ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی وت: کچم مەگری ، خوای گەورە باوکت دەپارێزێت ، لەبەر خۆیەوە دەیفەرموو: قورەیش کارێکیان نەکرد زۆر ئازارم بدات ، هەتا (أبو طالب) وەفاتی کرد[2].

بەهۆی بەدوای یەکدا هاتنی ئێش و ئازارەکان لەو ساڵەدا ، پێغەمبەر ﷺ ئەو ساڵەی ناونا ساڵی خەمەکان ، هەر بەو شۆرەتەشەوە لە مێژوودا ناسرا.

---

[1] / شا ئەکبەرخان نەجیب ئابادی ڕاشکاوانە وتویەتی ئەم ڕوداوە لەوساڵەدا بوە، بڕوانە (تاریخ الإسلام) ١/١٢٠، بەسەرهاتەکە بە درێژی لە (إبن هشام) دا هاتوە ١/٣٧٢-٣٧٤، (صحیح البخاري) دهاتوە ١/٥٥٢,٥٥٣.

[2] / إبن هشام /١/٤١٦.

## خوازبێنی سەودە ـ ڕ ـ

لە (شەوال)ی ئەو ساڵەدا – واتە ساڵی (١٠)ی پێغەمبەرێتی– پێغەمبەری خوا (سودە)ی کچی (زمعە)ی خواست ، لەو ئافرەتانە بوو کە دەمێك بوو موسوڵمان بوو بوو ، کۆچی دووەمیشی کردبوو بۆ حەبەشە ، هاوسەرەکەی (سکران)ی کوڕی (عمرو) موسوڵمان بوو بوو لەگەڵیدا کۆچی کردبوو ، لەخاکی حەبەشە وەفاتی کردبوو، یان پاش گەڕانەوە بۆ مەککە ، کەگەیشتنەوە جێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنی کرد ، ئەوە یەکەم ژنهێنانی پێغەمبەر بوو ﷺ دوای وەفاتی خەدیجە ، پاش چەند ساڵێك سەرەکەی خۆی بەخشی بە عائشە[1].

## هۆیەکانی دان بەخۆدا گرتن و دڵ قایم بوون

لێرەدا عاقڵ حەیران دەبێت و، مرۆڤە ژیرەکان لەنێوان خۆیاندا دەپرسن:

ئەو هۆکارانە چی بوون وایان لە موسوڵمانەکان کردبوو بگەنە ئەو ئاستە بەرزو سنوورە سەر سوڕهێنەرە لەدڵ قایمیدا؟

چۆن ئارامیان گرت لەژێر ئەو چەوساندنەوەیەدا کە موچوڕك بە جەستەی مرۆڤدا دەهێنێت و، وڵات دەهێنێتە لەرزە؟

بەدەر لە ئەو هەستەی بەناخی دڵەکاندا دێت و دەچێت ، باشتر وایە کە ئاماژە بکەین بەهەندێك لەو هۆکارانە ، با بەشێوەیەکی خێراش بێت :

١. هۆی سەرەکی لەو مەسەلەیەدا بەپلەی یەکەم ، باوەڕبوونە بەخوای تاك و تەنهاو بەڕاستی ناسینی ، چونکە باوەڕی تەواو ئەگەر لەدڵەکاندا بچەسپێت لەشاخەکان قورستر دەبێت ، خاوەنی ئەو ئیمانە پتەوو ئەو یەکلابوونەوە تەواوە – زەحمەتەکانی دونیا هەرچەندە زۆرو گەورەو زەبەللاح بن – لەپاڵ باوەڕەکەیدا . وەك قەوزەیەکی سەر سێلاوێکی توند دەیانبینێت کە هاتبێت بەنداوە پتەوو قەلا سەختەکان بڕمێنێت ، ئیدی گوێ نادا بەهەموو ئەو زەحمەتانە ، لەبەردەم شیرینی ئیمان و لەزەتی مل کەچی و خۆشی باوەڕەکەیدا خۆی دەگرێت ﴿ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ ﴾ الرعد/١٧.

لەم هۆکارە چەند هۆیەکی تریش دەکەونەوە کە ئەم دڵ قایمی و ئارامگریە بەهێز تر دەکەن ئەویش :

---

[1] / رحمة للعالمين ٢/١٦٥. تلقيح فهوم أهل الأثر ل١٠.

٢. سەرکردایەتیەك دلآن کەمەندکێشی خۆی دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردەی بالآی هەموو ئوممەتی ئیسلامیی بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی بوو. مەزنترین سیفەتی لەجوانیی ڕەوشت و بەرزیی نەفس و ڕەوشت بەرزیی و پیاوەتی و سیفاتی ڕێزدارانەی تێدابوو، بەشێوەیەك دڵەکانی بۆلای خۆی کەمەندکێش دەکردو، نەفسەکان خۆیان دەکردە قوربانی ، لە گەورەییدا مرۆڤی ئاشوفتە دەبوو، بەجۆرێك هیچ کەسێك ئەو شانو شەوکەتەی نەبوو ، لە چڵە پۆپەی ڕێزو چاکەخوازی و خێرو شکۆداریدا بوو، ئەوەندە داوێنپاك و سپاردەناس و ڕاستگۆ بوو ، لەهەموو ڕووەکانی خێروچاکەوە بە شێوەیەك بوو تەنها ساتێك دوژمنەکانی گومانیان لێی نەبوو، چ جای دۆست و هاوەڵەکانی، وشەیەکی لەدەم دەرنەئەچوو لێی بێگومان نەبوونایە.

سێ کەسی قوڕەیش کۆبوونەوە، پێشتریش هەریەکێکیان بەنهێنییەوە گوێی گرتبوو بۆ قورئان خوێندنی پێغەمبەرو ﷺ پاشان نهێنیەکەیان ئاشکرا بوو ، یەکێکیان پرسیاری کرد لە (أبو جهل) – کە یەکێك بوو لەو سێ کەسە – ڕات چۆنە سەبارەت بەوەی لە موحەممەدت بیست ؟ وتی: چیم بیست ؟ ئێمەو خێڵی (بنو عبدمناف) لەسەر پلەو پایە کێشەمان هەبوو ، نان بدەییان کرد ئێمەش کردمان ، کاروانیان بارکرد ئێمەش کردمان ، بەخشندەییان کرد ئێمەش کردمان ، هەتا لەکۆتایی کێبڕکێکەدا یەکسان بوین ، ئێمە وەکو ئەسپی پێشبڕکێ وابوین ، ئەنجا ئەوان وتیان: ئێمە پێغەمبەرمان هەیە لەئاسمانەوە وەحی بۆدێت ، ئیدی چۆن بەوەدا بگەین ؟ وەڵڵاهی هەرگیز باوەڕی پێ ناهێنین و متمانەی پێ نادەین[1].

(أبو جهل) هەمووجارێك دەیوت: ئەی موحەممەد ئێمە تۆ بەدرۆ ناخەینەوە بەڵکو ئەو پەیامە بەدرۆ دەخەینەوە کە هێناوتە خوای مەزن ئایەتی ناردە خوارەوە:
﴿ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ الأنعام/ ٣٣ [2].

ڕۆژێکیان بێ باوەڕەکان سێ جار لاقرتێیان پێکرد ، لە سێیەمدا فەرمووی : خێڵی قوڕەیش ، پەیامی لەناو بردنتانم پێیە ، ئیدی ئەو قسەیە هەموویانی گرت ، وای لێ هێنان سەرسەختترینیان بەجوانترین شێوە ڕووبەڕوی دەهات.

[1] / إبن هشام ١/٣١٦.
[2] / (ترمذي) ریوایەتی کردوە لە ڕاڤەی سورەتی (الأنعام) دا ٢/١٣٢.

کاتێك کە پاشماوەی سەروپێی ئاژەڵیان کرد بەسەریدا لەکاتی سوژدەدا نزای لێ کردن ، دوای ئەوە پێکەنینیان نەما ، تووشی دڵەڕاوکێ و خەفەت هاتن و ، دڵنیا بوون لەوەی کە تیادەچن.

پێغەمبەر ﷺ نزای کردبوو لە (عتبە)ی کوڕی (أبی لهب) باوەڕی تەواوی هەبوو ئەو دۆعایە گیرا دەبێت ، لەکاتێکدا کە شێرەکەی بینی وتی: سوێند بێت هەر ئەوکاتە . موحەممەد . کە لە مەککە بوو کوشتمی.

(ابی) کوڕی (خلف)یش هەڕەشەی کوشتنی لێکرد ، فەرمووی: بەڵکو (إنشاء الله) من ئەتکوژم ، کە لە ڕۆژی (ئوحود)دا (ابی) ملی بریندار بوو – برینەکەشی سەخت نەبوو – (ابی) ئەیوت: موحەممەد هەر لە مەککە پێی وتم: من تۆ ئەکوژم ، وەڵڵاهی ئەگەر تفیشم تێ بکات ئەمکوژێت[1]. ئەوا دێت.

(سعد)ی کوڕی (معاذ) – کاتێك لەمەککە بوو – بە (أمیە)ی کوڕی (خلف)ی وت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: موسوڵمانەکان دەتکوژن ، بەتەواوی زەندەقی چوو بوو، بڕیاری دابوو لەمەککە نەچێتە دەرەوە ، کاتێك (أبوجهل) لە ڕۆژی بەدردا ناچاری کرد بڕواتە دەرەوە چوو باشترین وشتری لەمەککەدا کڕی تا بتوانێت پێی هەڵبێت ، ژنەکەی پێی وت: ئەبو سەفوان ، ئەرێ لەبیرت چوو کەبرا یەثریبییەکە چی پێ وتی؟ وتی: نەوەڵڵا لەبیرم نەچووە نامەوێت لەگەڵیدا دەرچم مەگەر لە نزیکەوە[2].

ئەوە حاڵی دوژمنەکانی بوو ، خۆ هاوەڵەکانی ، ئەوە وەکو گیان و ڕۆح چوو بووە جەستەیانەوە ، بوو بووە دڵ و چاو بۆیان ، خۆشەویستی ڕاستەقینە وەکو ئاوی خوڕ بەرەو لای دەڕژا ، وەکو موگناتیس چۆن وورده ئاسن بۆ خۆی ڕادەکێشێت بەو شێوەیە دڵ و دەروونی ئەوانی بەلای خۆیدا کەمەندکێش کردبوو.

فَصُورَتُــه هَيولى كُلّ جِسْمٍ          وَمغنــاطيسُ أفئدة الرِّجالِ

لەئاکامی ئەو خۆشەویستیە بێوێنەیەدا وایان لێ هاتبوو ، پێیان خۆش بوو لەگەردنیان بدرێت نەك نینۆکێکی پێغەمبەر ﷺ بریندار ببێت یان دڕکێك بە پێیدا بچێت.

---

[1] / إبن هشام ٢/٨٤.

[2] / بروانة (صحيح البخاري) ٢/٥٦٣.

ڕۆژێکیان لە مەککە ئەبوبەکری کوڕی (أبی قحافە) بە توندی لێی درا ، جا (عتبە)ی کوڕی (ربیعە) لێی نزیك بوەوەو ، بە دوو نەعلی زبر کەوتە لێدانی و، دەیهێنان بەدەم و چاویداو ، چووە سەر سکی و، وای لێهات دەم و چاوی نەدەناسرایەوە ، خێڵی (بنو تمیم) ئەبوبەکریان لەناو پارچە قوماشێکدا هەڵگرت ، تا بردیانەوە ماڵەکەی ، هیچ گومانێکیان نەمابوو کە دەمرێت ، سەر لەئێوارە کە هۆشی هاتەوە وتی: ئەریٚ پێغەمبەری خوا ﷺ چی لیٚ بەسەر هاتووە ، جا بە زمانی بەدو هەرزەیانە کەوتنە گیانی و تانەیان لێدا ، پاشان هەستان و وتیان بە (أم الخیر)ی دایکی: بزانە بەڵکو شتێکی بدەیتیٚ بیخوات یان قومێك ئاوی بدەریٚ ، کە دایکی چووە لای زۆری لیٚ پاڕایەوە شتێك بخوات ، کەچی ئەو دەیوت: ئەریٚ پێغەمبەری خوا چی لێهات ؟ دایکی وتی: وەڵڵاهی نازانم هاوەڵەکەت چی لیٚ هاتووە ، پێی وت: برۆ بۆ لای (أم جمیل)ی کچی خەتاب و پرسیار لەو بکە ، دایکی چووە دەرەوە تاگەیشتە لای (أم جمیل) پێی وت: ئەبوبەکر هەواڵی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ئەپرسێت ، (أم جمیل) وتی: من نە ئەبوبەکر ئەناسم و نە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ، ئەگەر پێت خۆشە لەگەڵت دێم بۆلای کوڕەکەت ، وتی: بەڵیٚ ، ئیدی پێکەوە ڕۆشتن تاگەیشتنە لای ئەبوبەکر سەیریان کرد نیوە گیانە ، (أم جمیل) نزیك بوەوەو ، هاواری لیٚ هەستاو ، وتی: وەڵڵاهی ئەو کەسانەی وایان لە تۆ کردووە تاقمێکی بیٚ باوەڕو لە سنوور دەرچوون و ، لە خوا دەپاڕێمەوە کە تۆڵەت بسێنێت ، (ئەبوبەکر) وتی: ئەریٚ پێغەمبەری خوا چی کرد؟ وتی: ئەوە دایکت وەستاوە گوێی لێیە، ئەبوبەکر وتی: گویٚ مەدەریٚ لێی مەترسە.

(أم جمیل) وتی: لەش ساغەو هیچی نیە ، ئەبوبەکر وتی: لەکوێیە ؟ وتی: لە ماڵی (إبن الأرقم) ە ، ئەبوبەکر وتی: ئاهم کردووە کە نەخواردن بخۆم و نە ئاو بخۆمەوە هەتا نەڕۆمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، چاوەڕوانیان کرد ، هەتا ئەبوبەکر ئێشەکەی هێور بوەوەو ، خەڵك بیٚدەنگ بوون ، بردیانە دەرەوە ، چوونە ژێرباڵیەوە هەتا بردیانە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ [1].

لەچەند جێگەیەکی ئەم باسەدا قسە لەسەر دیمەنێکی خۆشەویستی و قوربانیدان دەکەین ، بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی کە لە ڕۆژی ئوحوددا ڕوویانداو ، کارەساتی خوبەیب و چەندین نموونەی تر.

---

[1] / البداية والنهاية ٣/٣٠.

٣. هەست کردن بەبەرپرسیارێتی . هاوەڵانی ڕێزدار بەتەواوی هەستیان دەکرد بەوبارە گەورەیەی کە لەسەرشانی مرۆڤایەتی دانراوە، ئەم بەرپرسیارێتیە هەرگیز بێلایەن وەستان و خۆڵ کەناردانی نیە ، ئەو کارەساتەی لەئەنجامی ڕاکردن و خۆ قوتارکردنەوە پەیدا دەبێت گەلێك زیاترن لەوانەی کە لەئەنجامی ئەو چەوساندنەوەیە تووشی دەبن و ئەو خەسارۆمەندیەی بەدوایاندا دێت – و بەدوای مرۆڤایەتیشدا دێت – ئەمەش هەرگیز ناپێورێت بەو زەحمەت و ماندوو بوونەی کە تووشیان دەبوو لە چوونە ژێرباری ئەو ئازارانەدا.

٤. باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی – ئەمەش ئەو هەستەی تێدا بەهێز دەکردن – واتە هەست کردن بە بەرپرسیارێتی ، ئەوان لەسەر بڕوایەکی تەواوبوون بەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان هەڵدەستنەوە بۆ بەردەم بارەگای پەروەردگاری هەموو جیهان ، لەسەر هەموو کارە وردو گەورەکانیان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت یان ئەوەیە بەرەو دۆزەخ دەڕۆن ، یان بەرەو بەهەشتێکی نەبڕاوە ، ئیدی ژیانیان لەنێوان ترس و ئومێددا بەسەر دەبرد ، ئومێدیان بەڕەحمەتی خودایان زۆربوو ، لەسزاکەشی دەترسان و، بەم شێوەیە بوون: ﴿ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴾ المؤمنون/٦٠، دەشیانزانی کە دونیا بەخۆشی و ناخۆشیەکانیەوە لای خودا باڵی مێشوولەیەك ناهێنێت لە بەرامبەر ئاخیرەتدا ، ئەم مەعریفە قووڵ و بەهێزە هەموو زەحمەتەکانی دونیاو تاڵی و سوێریەکانی لەسەر ئاسان کردبوون ، بەشێوەیەك زۆرگوێیان نەئەدایە.

٥. قورئانی پیرۆز لەوماوە ناخۆشە ترسناکەدا ئایەت و سورەتەکانی دەهاتنە خوارەوەو بەڵگەسازیان دەکرد بۆ ڕاستیەکانی ئیسلام – ئەو ڕاستیانەی کە لەسەری دەڕۆشتن – بەچەند شێوازێکی سەرسوڕهێنەرو سەرنج ڕاکێش و ، ڕێنومایی موسوڵمانەکانی دەکرد بۆ کۆمەڵێك بنەما کە قەدەری خوا وابووە گەورەترین و جوانترین کۆمەڵگای مرۆڤیی لەسەر دروست ببێت لەهەموو دونیادا – ئەویش کۆمەڵگای ئیسلامیە – و هەست و نەست و ڕەوتی موسوڵمانەکان لەسەر ئارامیی و خۆ ڕاگریی ڕادەهێنێت ، نموونەت بۆ دەهێنێتەوەو، باس حوکمەکەت بۆ ڕوون دەکاتەوە: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَ الضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ ﴾ البقرة/٢١٤ ،

هەروەها ئایەتی :﴿ الم {١} أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَايُفْتَنُونَ {٢} وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ {٣}﴾ العنكبوت.

ئەو ئایەتانە دادەبەزینە خوارەوە وەلامی بێدەنگکەری بێباوەڕو سەر سەختەکانی دەدایەوەو، هیچ بوارێکی فڕوفێڵی بۆ نەدەهێشتنەوە ، پاشان جارێکی تر لەئاکامی خراپ ئاگاداری ئەکردنەوە کە ئەگەر بێت و لەسەر لادان و سەرسەختی خۆیان بەردەوام بن ، هەندێك جار بەشێوەیەکی ڕوون وئاشکراو ، بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕۆژگارە یەك لەدوای یەکەکانی خوداوەند ، ڕووداوە مێژووییەکان کەبەڵگەن لەسەر یاسانوێنی خوداوەند سەبارەت بەپاڵگرو دوژمنەکانی خودا قسەی لەگەڵدا دەکردن ، هەندێك جاریش بەمیهرەبانی لەگەڵیان دەدواو ، مافی تێگەیاندن و ڕێنوێنی و ئاڕاستەکردنی پیێدەبەخشین ، تا وازبهێنن لەو سەر لێشێواویە ئاشکرایەی تێیدا دەژین.

قورئانی پیرۆز دەستی موسوڵمانانی بەرەو جیهانێکی تر گرتبوو ، لە چەشمەندازەکانی گەردوون و، جوانیی پەروەردگارێتی و ، تەواوێتی خوداوەندو ، ئاسەواری بەزەیی و میهرەبانیی ، درەوشانەوەی ڕەزامەندی ئەوەندەی پیشان دەدان ئاواتی پیێ بخوازن و هیچ لەبەردەمیاندا نەوەستێت.

لەدوو توێی ئەو ئایەتانەدا چەندین گوتاری تێدایە بۆ موسوڵمانەکان ، تیایدا مژدەیان دەداتیێ بەڕەحمەت و، ڕەزامەندیی و بەهەشتی پڕ لە نازونیعمەتی نەبڕاوەو ، وێنەی دوژمنە بێباوەڕو ستەمکارەکانی پیێ نیشان دەدان ، کە دادگایی دەکرێن و، سەرو ماڵیان تیایدا دەچێت و، لەسەر ڕوو بەرەو دۆزەخ پەلکێش دەکرێن گڕەی دۆزەخیان بەردەکەوێت.

٦. مژدەدان بەسەرکەوتن – لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکان هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کە توشی توندوتیژیی و چەوساندنەوە بوون – بەڵکو پێشتریش . دەیانزانی کە هاتنە ناو ئیسلام مانای هێنانی بەڵاو مردن نیە ، بەڵکو بانگەوازی ئیسلامی – هەر لەیەکەم ڕۆژیەوە – ئامانجی سەرکوتکردنی جاهیلییەتی نەفامان و سیستمە زاڵمەکەیان بوو ، یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانیشیی بریتی بوو لە باڵادەست کردنەی هەژموونی خۆی بەسەر زەمین و هەڵوێستی سیاسیی لەجیهاندا ، بۆ ئەوەی پێشڕەوێتی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بکات بەرەو ڕەزامەندی خوداو ، لە بەندەیی کردنی بەندەکانەوە دەریان بهێنێت بەرەو بەندەیی کردنی پەروەردگار ڕزگاریان بکات.

قورئانی پیرۆز بەم مژدانەوە دادەبەزی - جارێك بەڕاستەوخۆو جارێك بە لاوەکی - لەوکاتە سەختو کەمەرشکێنانەی دەستی نابوە بینی موسوڵمانەکانەوە ، خەریکبوو دەیخنکاندن و، لەناوی دەبردن ، ئایەتەکانی قورئان دادەبەزین باسی ڕووداوی پێغەمبەرە پێشینەکان و گەلەکانی پێشووی بۆ دەکردن کە هەڵدەستان بەدژایەتی کردن و بەدرۆخستنەوەیان ، ئەو ئایەتانە باسی لە ئەو حاڵەتانەی دەکرد کە هاوشێوەی تەواوی بارودۆخی موسوڵمانەکانی مەککە بوو لەگەڵ کافراندا ، پاشان باسی لەو ژانە دەکرد کە لەئەنجامی ئەو بارودۆخەدا تەفروتونا بوونی بێباوەڕان و ستەمکارانی لێ هاتە کایەوەو ، لەئاکامیدا بەندەکانی خوا بوونە میراتگری ماڵ و حاڵیان ، ئەو بەسەرهات و چیرۆکانە ئاماژەیەکی ئاشکرای تێدابوو بۆ شکستهێنانی خەڵکی مەککە لە داهاتووداو ، سەرکەوتنی موسوڵمانەکان و بانگەوازی ئیسلامیی.

لەو ماوەیەدا چەند ئایەتێك هاتە خوارەوە مژدەی سەرکەوتنی ئیماندارانی تێدا بوو:

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ {١٧١} إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ {١٧٢} وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ {١٧٣} فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ {١٧٤} وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ {١٧٥} أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ {١٧٦} ﴾ الصافات ، هەروەها فەرمووی: ﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ{٤٥} ﴾ ، وە فەرمووی: ﴿ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ الْأَحْزَابِ {١١} ﴾ ص ،

لەبارەی ئەوانەشەوە کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە

﴿ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي اللّهِ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَلَأَجْرُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُواْيَعْلَمُونَ {٤١} ﴾ النحل ،

هەروەها لەبارەی چیرۆکی یوسفەوە پرسیاریان لێکرد، ئایەت هاتە خوارەوە :

﴿ لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِّلسَّائِلِينَ {٧} ﴾ یوسف ،

واتە: پرسیارکەران کە خەڵکی مەککەن هەموو شکستی براکانی یوسف دەبینن و، وەکو ئەوان ملکەچ دەبن ، لەباسی پێغەمبەرانی تردا فەرمووی:

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّـــكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ {١٣} وَ لَنُسْكِنَنَّـــكُمُ الأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ {١٤} ﴾ إبراهيم .

لەکاتێکدا شەڕی نێوان فارسەکان و ڕۆمەکان هەڵگیرسابوو، موشریکان حەزیان بەسەرکەوتنی فارسەکان دەکرد چونکە موشریکبوون، موسوڵمانەکانیش حەزیان

بەسەرکەوتنی ڕۆمەکان بوو، بەو پێیەی باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەران و وەحی و کتێبە ئاسمانیەکان و ڕۆژیی دوایی هەبوو ، ئاکامەکە بەسەرکەوتنی فارسەکان کۆتایی هات ، خوای مەزن مژدەی سەرکەوتنی ڕۆمەکانی ناردە خوارەوە لەچەند ساڵی داهاتوودا ، هەرچەندە تەنها ئەو مژدەیەی تێدا نەبوو، بەڵکو مژدەی سەرکەوتنی ئیماندارانیشیی تێدابوو کاتێك فەرمووی : ﴿ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ {٤} بِنَصْرِ اللَّهِ ﴾ الروم.

خودی پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ناوبەناو لەو جۆرە مژدانەی دەدا، کە کاتێك وەرزی حەجیش دەهات و، لە بازاڕی (عکاظ) و (ذي المجاز)دا لەناو خەڵکیدا هەڵدەستایەوە بۆ گەیاندنی پەیامەکەی تەنها مژدەی بەهەشتی پێ نەئەدان و بەس، بەڵکو ڕاشکاوانە پێی دەوتن: خەڵکینە بڵێن : (﴿ لا إله إلاّ الله ﴾ ڕزگار دەبن ، دەبنە خاوەنی هەموو عەرەب ، عەجەمیش ملتان بۆ دەدەن ، کە مردیشن دەبنە میرو مەلیکی بەهەشت) [1].

پێشتریش زانیمان کەپێغەمبەر ﷺ چۆن وەڵامی (عتبە)ی کوڕی (ربیعە)ی دایەوە کاتێك ویستی سەودای دونیایی لەگەڵدا بکات و ، ئەو تکاو ڕجایەی (عتبە) کردی پاش دەرکەوتنی ڕاستێتی پێغەمبەر ﷺ .

هەروەها دوا وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بۆ دواشاندی قوڕەیش کەهاتنە لای (ابو طالب) ، ئەوەبوو پێی وتن کە تەنها یەك وشەیان لێ داوا دەکات بیڵێن بۆ ئەوەی عەرەب ملیان بۆ کەچ بکات و ببنە خاوەنی عەجەمیش.

خەبابی کوڕی ئەرەت دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بوردەکەی لە خۆی ئاڵاند بوو، لەژێر سێبەری کابەدا بوو، بەدەست موشریکانەوە ئازاری زۆرمان چەشتبوو، وتم: لەخوا ناپاڕێیتەوە بۆمان؟ دەموچاوی پیرۆزی سوور بووەوەو دانیشت، فەرمووی: گەلانی پێش ئێوە بەشانەی ئاسن گۆشت و ماسوولکەیان لە گۆشتیان جیادەکردەوە کەچی ئەوە لەدینەکەیان پەشیمانی نەدەکردنەوە ، خوای گەورەش ئەم دینەی خۆی سەردەخات ، هەتا وای لێدێت سوار لە (صنعاء)ەوە بەرەو (حضرموت) دەڕوات لەهیچ ناترسێك جگە لەخوا - ڕوونکردنەوەی ڕاوی ئەوەشی زیادکردوە - هەروەها گورگیش بۆسەر مەڕەکانی [2]، لەگێڕانەوەیەکیشدا هاتووە ، (بەڵام ئێوە پەلە دەکەن) [3].

---

[1] / (ترمذي) ریوایەتی کردوە . پێشتریش چەند جارێك باس کرا.
[2] / صحیح البخاري ١/٥٤٣.
[3] / هەمان سەرچاوە ١/٥١٠.

ئەم مژدانە نهێنی و شاراوە نەبوون ، بەڵکو ئاشکراوو بڵاوبوون ، بێ باوەڕان پێیان دەزانی ، هەروەکو موسوڵمانەکانیش دەیانزانی ، هەتا (أسود)ی کوڕی (مطلب) و هاونشینانی کە هاوەڵانی پێغەمبەریان دەبینی ﷺ لەسەر ئەوە لاقرتێیان پێدەکردن و دەیانوت: ئەوا مەلیکەکانی سەرزەمین بۆتان هات ، ئەوانە زاڵ دەبن بەسەر مەلیکەکانی کیسراو قەیسەردا ، پاشان فیکەیان دەکێشاو چەپڵەیان لێ دەدا[1].

لەبەردەم ئەم هەموو مژدانەدا بەداهاتوویەکی ڕووناك و پرشنگدار لە دونیادا ، لەگەڵ بوونی ئەو ئومێدە چاکە گەورەیە کە هەبووە لەو مژدانەداو تاپلەی گەیشتنە بەهەشت ڕۆشتووە ، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێیان وابوو کە ئەو چەوساندنەوانەی بەسەریاندا دادەبارێت و ئەو کارەسات و بەڵایانەی لە هەموو لایەکەوە چواردەوری گرتوون ، هیچ نین جگە لە (هەورێکی تەنکی هاوینەو پاش ماوەیەکی تر دەڕەونەوە).

بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە گیانی ئیماندارانی بەخۆشیەکانی ئیمان ئاو دەداو ، دڵ و دەروونیانی بەفێرکردنی دانایی و قورئانی پیرۆزو بە پەروەردەیەکی قووڵ ڕای دەهێنان ، دەروونەکانی بۆ پلەکانی بڵندیی ڕۆح و بێگەردیی دڵ و خاوێنی ڕەوشت و خۆ ئازادکردن لەدەسەڵاتی ماددیگەرایی و بەرەنگاریی ئارەزووخوازی و گەڕانەوە بۆلای خاوەنی ئاسمانەکان و زەمین بەرز دەکردەوە کڵپەی دڵەکانی گەش دەکردەوەو لە تاریکستانەکانەوە دەری دەهێنان بۆ نێو نووری خودا فێری ئارامیی لەسەر ئازارو لێبوردنی جوان و ڕامکردنی دەروونی دەکردن ، بۆیە زیاتر دڵی هاوەڵان بەئایینەکەدا دەچەسپاو لە ئارەزوو بازی دوردەکەوتنەوە لەپێناوی خودا دەسوتان و حەزوشەوقیان بۆ بەهەشت زیاترو سووربوونیان لەسەر زانست و تێگەیشتن لە ئایین و خۆ سەرزەنشت کردن و نەفس پەروەردەکردن و زاڵبوون بەسەر سۆزداریداو جڵەوکردنی هەڵچوون و داچوون و خۆبەستنەوە بەئارامیی و هێمنی و لەسەرخۆیی ، تیایاندا زیاتر دەبوو.

---

[1] / فقه السيرة ل ٨٤.

# پێغەمبەر ﷺ لە (طائف) دا

لە (شەوال)ی[1] ساڵی (١٠)ی پێغەمبەرێتی (واتە لەکۆتایی مانگی (مەی) یان سەرەتایی یۆنیوی ساڵی ٦١٩ی زایین)دا ، پێغەمبەر ﷺ بەرەو (طائف) دەرچوو، ئەم شارۆچکەیە (٦٠) میل لەمەککەوە دوورە، بەپێ لەهەردوو سەرەوە ماوەکەی بڕی ، (زید)ی کوڕی (حارثة)ی غولامی لەگەڵدابوو ، لەڕێگەدا بەلای هەرخێڵێکیدا بگوزەرایە بانگی دەکردن بۆ ئیسلام ، کەسیان بەدەمیەوە نەهاتن ، کە گەیشتە (طائف) چووە لای سێ برا لەخێڵی (ثقیف) ، ئەوانە بریتی بوون لە (عبد یالیل) و (مسعود) و (حبیب) کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عمر)ی (ثقفي) بوون لەگەڵیان دانیشت و بانگی کردن بۆلای خوداو سەرخستنی ئیسلام ، یەکێکیان وتی: ئەگەر خوا تۆی ناردبێت شەرت بێت پۆشاکی کابە بدڕێنم ، ئەوی تریان وتی: جگە لە تۆ خوا کەسی نەدۆزیوەتەوە؟

سێیەمیشیان وتی: وەڵلاهی هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەم ، ئەگەر تۆ پێغەمبەریت لەوە ترسناکتریت کە من ڕەتی قسەی تۆ بدەمەوە ، ئەگەر لەگەڵ خواشدا درۆ بکەیت پێویست ناکا قسەت لەگەڵدا بکەم ، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی : ئەگەر ئەوەی دەتانەوێت بیکەن ئەوا تکاتان لێ دەکەم ئاشکرام مەکەن.

پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵکی (طائف) دا (دە ڕۆژ) مایەوە ، پیاوماقوڵ نەما نەڕواتە لای و قسەی لەگەڵدا نەکات ، پێیان وت : لێرە بڕۆ دەرەوە ، ئەنجا گەنج و بێعەقڵەکانیان لێهاندا ، کەویستی بڕواتە دەرەوە ، کاڵ فام و کۆیلەکان کەوتنە دوای بەجنێودان و هاوار لێ کردن ، هەتا خەڵکی لەدەور کۆبوەوە ، بەدوو ریز بە دەوریدا وەستان و کەوتنە بەردباران کردنی و قسەی ناشیرینیان پێدەوت ، قاچیان دایە بەربەرد ، هەتا نەعلەکانی پڕبوون لەخوێن ، (زید)ی کوڕی (حارثة) ش خۆی دەدایە بەری ، هەتا بەردێك بەر سەری کەوت و شکاندی ، بەشوێنیەوە بوون هەتا ناچاربوو خۆی بکات بەباخێکی (عتبە) و (شیبە)ی کوڕانی (ربیعە)دا ، کە سێ میل لە (طائف)ەوە دوورە ، کە چووە ناو باخەکەوە ئەوان گەڕانەوە ، پێغەمبەر ﷺ چووە ژێر دارمێوێك ، لەژێر سێبەرێکدا پاڵیدا بە دیوارێکەوە ، کە هێورو ئارام بوەوە ، نزا بەناوبانگەکەی کرد کە پڕیەتی لە خەمی دڵ و بێتاقەتی دەرهەق ئەو مامەڵە خراپەی تووشی هات و، بێزاربوونی لەدەست باوەڕ نەهێنانی هیچ کەسێك پێی ، ئەنجا فەرمووی:

---

[1] / (النجیب آبادي) لە (تاریخ الإسلام) دا ١٢٢/١، ڕاشکاوانە ئەم ڕایەی وتووە ، ئەمەش لای من پەسەندە.

**( خوایه ، لاوازی هێزو کەم توانایی و بێ دەسەلاتیم بەدەست خەڵکەوە بۆ لای تۆ دەهێنم ، ئەی بەبەزەیترینی هەموو بە بەزەییەکان ـ تۆ پەروەردگاری ژێردەستەکانی ، تۆ خاوەنی منی ، بەکێم دەسپێریت ؟ بەدوورە کەسێك ئازارم بدات ؟ یان بە دوژمنێك کارت داوەتە دەست ؟ ئەگەر تۆ تووڕە نەبوبیت من باکم نیە ، بەلام بێ وەیی کردنی تۆ بۆ من دڵگوشاد ترە ، پەنا دەگرم بەنووری ڕووی پیرۆزی تۆ کە هەموو تاریکستانەکانی رووناك کردۆتەوەو ، کاروباری دونیاو ئاخیرەتی لەسەر دامەزراوە لەوەی تووڕەیی خۆتم بەسەردا داباریێنیت ، یان خەشمت بم گرێت ، ڕازو نیاز هەر بۆ لای تۆیە هەتا ڕازی دەبیت ، (وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ إِلاّ بِكَ ) .**

که هەردوو کوڕەکەی ڕەبیعە بەو شێوەیە بینیان بەزەییان پێیدا هاتەوە ، غولامێکی نەسرانیان هەبوو ، ناوی (عداس) بوو ، بانگیان کرد ، پێیان وت: بڕۆ بۆشکێك لەو ترێیە ببە بۆ ئەو پیاوە ، کە بردی و داینا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ دەستی بۆ درێژ کردو فەرمووی: ( بِسْمِ اللهِ ) پاشان دەستی کرد بە خواردنی.

عەدداس وتی: خەڵکی ئەم شوێنە ئەو وتەیە بەکار ناهێنن ،

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ خەڵکی چ شوێنێکیت ؟

چ ئایینێکت هەیە؟

وتی: من نەسرانیم ، خەڵکی (نینوی)م ،

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵکی شاری پیاوە چاکەکەیت (یونس)ی کوڕی ( مەتی ) !

پێی وت : تۆ چوزانیت (یونس)ی کوڕی (مەتی) کێیە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو برای منە ، پێغەمبەر بوو، منیش پێغەمبەرم ،

ئەنجا (عداس) کەوت بەسەر دەست و قاچیداو کەوتە ماچ کردنی.

کوڕەکانی (ربیعە)ش یەکێکیان بەوی تریانی وت: ئەوە غولامەکەشی لێ هەڵگێڕایتەوە، کە (عداس) هاتەوە پێیان وت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەوە چیە؟

وتی : گەورەم ، لەسەر زەمیندا لەم پیاوە باشتر نیە ، بەڕاستی هەواڵێکی پێداوم جگە لە پێغەمبەر کەس نایزانێت ،

پێیان وت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات (عداس) ، نەکەیت لە ئایینەکەت وەرت بگێڕێت ، ئایینەکەی خۆت باشترە لە ئایینەکەی ئەو.

پێغەمبەری خوا ﷺ پاش دەرچوونی لەباخەکە بەدڵشکاوی و خەمباریەوە بەرەو مەککە گەڕایەوە ، کە گەیشتە (قرن المنازل) خودای گەورە (جبریل)ی نارد بۆ لای ، فریشتەی شاخەکانی لەگەڵدا بوو ، داوای لێ کرد کە ڕێگەی بدات ئەو دوو کێوە بەسەر خەڵکی مەککەدا بهێنێتەوە یەك.

(بوخاری) ووردو درشتی چیرۆکەکە – بەسەنەدی خۆی – دەگێڕێتەوە:

لە (عروە)ی کوڕی (زبیر)ەوە ، جارێکیان عائشە (خوا لێی رازی بێت) بۆی گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی بە پێغەمبەر ﷺ : ئایا ڕۆژی خراپتر لە (أحد) ت بەسەردا هاتوە؟

فەرمووی: ئەوەی بینیم لەخێڵەکەت کە بینیم ، خراپترین شتێك لێم بینین ڕۆژی (عقبە) بوو ، کە خۆم پیشانی (عبد یا لیل)ی کوڕی (عبد کلال) داو ، بە هیچ شێوەیەك بەدەممەوە نەهات ، ئیتر بە کۆڵێك خەم و خەفەتەوە دەرچووم ، لە (قرن الثعالب) نەبێت هۆشم نەهاتەوە – کە ناسراویشە بە (قرن المنازل) – سەرم بەرزکردەوە بینیم هەورێك سێبەری بۆ کردووم لێی وورد بوومەوە ، سەیر دەکەم (جبریل)ی تێدایە ، بانگی لێکردم ، فەرمووی : خوای گەورە گوێی لە گوتەکانی گەلەکەت بوو کەپێیان وتی: ئەوە خودای گەورە فریشتەی بۆ ناردویت بۆ ئەوەی بەخواستی خۆت فەرمانی بەسەردا بدەیت ، ئەنجا فریشتەی شاخەکان بانگی کردم و سلاوی لێکردم ، پاشان فەرمووی : ئەی موحەممەد ئەوە منم ، چیت دەوێت ، ئەگەر دەتەوێت ئێستا ئەو دووشاخەیان بەسەردا دەهێنمەوە ، دوو شاخەکەش (أبو قبیس) و (قیقعان) بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( بەڵکو ئومێد دەکەم خوای گەورە لەپشتی ئەمانە نەوەیەك بخاتەوە بەتەنها خودای گەورە بپەرستێت و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدات )[1].

لەو وەلاْمەدا کە پێغەمبەر ﷺ دەیداتەوە کەسێتی بێ وێنەی دەردەکەوێت ، کە ئەوەندە لەسەر ڕەوشتێکی بەرز بوە دەرك بە سنوورەکەی ناکرێت.

پێغەمبەر ﷺ لە ئاقار ئەو سەرکەوتنە غەیبیەدا هۆشی بەبەردا هاتەوەو دڵی ئارام بوەوە، کەخوای گەورە لەسەروی حەوت ئاسمانەوە بۆی ناردبوو، پاشان بە ڕێ کەوت بەرەو مەککە، هەتا گەیشتە شیوی (النخلە)و چەند ڕۆژێك لەوێدا مایەوە

[1] / صحيح البخاري . كتاب بدء الخلق ٤٥٨/١ ، مسلم . باب ما لقي النبي ﷺ من أذي المشركين والمنافقين ١٠٩/٢.

، لەشیوی (النخلە) دووجێگە هەیە بۆ هەوارگە خستن باشە کە بریتین لە (السیل الکبیر) و (الزیمە) ، بەهۆی ئەو ئاوو لەوەڕە زۆرەوە کە تیایاندایە ، بەڵام سەرچاوەیەکمان نەبینی شوێنی هەوارگە خستنەکەی پێغەمبەرمان پێ بڵێت ﷺ.

لەو ماوەیەدا کە لەوێدا بوو ، خوای گەورە چەند کەسێکی لە پەرییان بۆ نارد ، خوای گەورە لە دوو شوێنی قورئاندا باسی کردوون ، لە سورەتی (الأحقاف) دا ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّاحَضَرُوهُ قَالُواأَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ {٢٩} قَالُوا يَاقَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ {٣٠} يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ {٣١} ﴾ .

هەروەها لە سورەتی (الجن) دا: ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا {١} يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا {٢}﴾ هەتا تەواوی ئایەتی ژمارە (١٥).

لە ڕەوتی ئەو ئایەتانەو . هەروەها ڕەوتی ئەو گێڕانەوانەدا کە لەڕاڤەی ئەم ڕووداوەدا هاتووە . ڕوون دەبێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئاگای لە ئامادەبوونی ئەو پەریانە نەبوەو، کاتێك پێی زانیوە کەخوای گەورە بەو ئایەتانە ئاگاداری کردۆتەوە ، ئەو ئامادەبوونەشیان یەکەم جار بووە ، ڕەوتی گێڕانەوەکانیش ئەوە دەخوازێت کە چەند جارێکی تریش هاتبنەوە.

بەڕاستی ئەو ڕووداوەش سەرکەوتنێکی‌تر بوو کەخوای گەورە لەگەنجینە شاراوەکانی خۆی ئەو سەربازانەی بەخشی بەپێغەمبەرﷺ کەکەس نازانێت ژمارەیان چەندە، پاشان ئەو ئایەتانەی لەوبارەیەوە هاتنەخوارەوە لە دووتوێیاندا چەندین مژدەی سەرکەوتنی بانگەوازەکەی پێغەمبەری تێدابووﷺ، کەهیچ هێزێکی گەردونیش ناتوانێت ڕێ لە سەرکەوتنی بگرێت: ﴿ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَولِيَاءُ أُوْلَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ {٣٢} ﴾ الأحقاف ، هەروەها ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعجِزَاللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا {١٢}﴾ الجن.

لەبەردەم ئەم سەرکەوتن و مژدانەدا ، هەوری خەم و نائومێدیەکان ڕەوینەوە ، کە ماوەیەك بوو هەر لە ڕۆژی دەرچونیەوە لە (طائف) لاسەریان گرتبوو ، هەتا بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ مەککەو ، دەست بکات بە تێهەڵچونەوەی پیشاندانی ئیسلام و گەیاندنی پەیامی نەمری خودای بەچالاکی و دڵ گەرمیەکی زۆرەوە.

لەوێدا (زید)ی کوڕی (حارثة) پێی وت: چۆن دەڕۆیتەوە بۆ ناویان لەکاتێکدا کە ئەوان دەریان کردویت ؟ مەبەستی قوڕەیش بوو، فەرمووی : ئەی زەید ، ئەوەی تۆ دەیبینی خوای گەورە دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو ، پێغەمبەرو ئایینەکەشی سەر دەخات.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مەککە کەوتەڕێ هەتا لەمەککە نزیك بوەوە ، لە (حراء) مایەوە ، پیاوێکی خێڵی (خزاعە)ی نارد بۆلای (أخنس)ی کوڕی (شریق) تا پەنای بدات ، وتبوی : من پەیمانم داوە ، پەیماندەریش ناتوانێت پەنای کەسی تر بدات ، ئەنجا ناردی بۆ لای (سهیل)ی کوڕی (عمرو) ، (سهیل) وتبوی: (بنی عارم) هەرگیز بەسەر (بنی کعب)دا پەنای کەس نادەن ، ناردی بۆلای (مطعم)ی کوڕی (عدی) ، (مطعم) وتبوی : بەڵێ من پەنای دەدەم ، پاشان چەکی بەست و کوڕان و خێڵەکەی بانگ کردو پێی وتن: چەك ببەستن ، لەسەر ڕوکنەکانی (بیت) دا بوەستن ، ئەوە من موحەممەدم پەنا داوە ، پاشان ناردی بەشوێن پێغەمبەردا ﷺ کە بێتە ناو مەککەوە ، تەشریفی هاتە ژورەوە زەیدیشیی لەگەڵدا بوو نەوەستا تاچوە (بیت الحرام) ، (مطعم)ی کوڕی (عدی) چوە سەرپشتی وشترەکەی و هاواری کرد: ئەی خێڵی قوڕەیش ، من موحەممەدم پەناداوە ، هیچ کەسێك لە ئێوە هەڵنەکوتێتە سەری ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ڕوکنی کابەو وەری گرت و پاشان دوو ڕکات نوێژی کردو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ، (مطعم)ی کوڕی (عدی) و کوڕەکانی بەچەکەوە چوار دەوریان گرتبوو ، هەتا چووە ماڵەکەیەوە.

وتراویشە: کە (أبوجهل) یش دەڵێت: ئێمەش پەنای کەسێك دەدەین کە تۆ پەنای بدەیت[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پیاوەتیەی (مطعم)ی لەبەرچاو بوو، لەبارەی دیلەکانی بەدرەوە فەرموی: ئەگەر (مطعم)ی کوڕی (عدی) لەژیاندا بوایەو لەبارەی ئەم دیلانەوە قسەی بکردایە هەموویانم بۆ بەردەدا[2].

---

[1] / طولضنی وردو درشتی روداوقکةی (طائف) مان لةم سةرضاوانة نةكردوة ، إبن هشام ١/٤١٩- ٤٢٢ ، زاد المعاد ٢/٤٧،٤٦، هةروةها (مختصر سيرة الرسول ﷺ) نوسينى شيخ عةبدوللا نةجدى ل ١٤١، ١٤٣، هةروةها (رحمة للعالمين) ١/٧١-٧٤، هةروةها (تاريخ الإسلام) نوسينى (نجيب ئابادى) ١/١٢٤،١٢٣.

[2] / صحيح البخارى ٢/٥٧٣.

## بانگ کردنی خێڵ و تاکەکان بۆ ئیسلام

لە مانگی (ذی القعدة)ی ساڵی (١٠) ی پێغەمبەرێتیدا . لەکۆتاییەکانی یۆنیۆ یان سەرەتاکانی یۆلیۆی ساڵی ٦١٩ی زایینیدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە مەککە ، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ خێڵ و تاکەکانی قورەیش بۆ ئیسلامەتی بانگ بکات و، بەهۆی نزیکبوونەوەی وەرزی حەجەوە خەڵك بەپێ و سواری وشتری لەڕەوە لە هەمووڵایەکەوە دەهاتن بۆ بەجێهێنانی ئەرکی حەج و، بۆئەوەی سوودیان دەستکەوێت و ، لەچەند ڕۆژێکی دیاری کراودا یادی خوا بکەن ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دەرفەتەی قۆستەوە ، خێڵ بەخێڵ دەچووە لایان و باسی ئیسلامی بۆ دەکردن ، هەروەکو چۆن لە ساڵی چوارەمی پێغەمبەرێتیدا بانگی دەکردن.

### ئەو خێڵانەی باسی ئیسلامی بۆ کردن

(زهری) دەڵێت: ئەو خێڵانەی کە ناوەکانیان هەیەو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردون بۆ ئیسلام و خۆی تەشریفی چوەتە لایان بریتین لە (بنو عامربن صعصعة) و (محارب بن خصفة) و (فزارة) و (غسان) و (مرّة) و (حنيفة) و (سليم) و (عبس) و (بنى نصر) و (بنو البكاء) و (كندة) و (كلب) و (الحارث بن كعب) و (عذرة) و (حضارمة) ، کەسیان نەهاتن بە دەمیەوە[1].

ئەو خێڵانەی (زهری) باسیان دەکات ، باس کردنی ئیسلام بۆیان لە یەك ساڵدا نەبوەو، لەیەك وەرزیشدا نەبووە ، بەڵکو لەنێوان ساڵی چوارەمی پێغەمبەرێتی تا دوا وەرزی پێش کۆچ کردن بووە ، ساڵێکی دیاری کراو نییە بۆ باسکردنی ئیسلام لەگەڵ خێڵێکی دیاریکراودا ، بەڵێ هەندێك خێڵ هەبووە (عەلامە المنصورفوری) دەڵێت: لە ساڵی (١٠)[2]ی پێغەمبەرێتیدا باسی ئیسلامی بۆکراوە، ئەمەش کورت کراوەکەیەتی:

١. خێڵی (بنو کلب) ، پێغەمبەر ﷺ چوەلای تیرەیەکیان ، پێی دەڵێن (بنو عبدالله) بۆلای خوا بانگی کردن و خۆی پێناساندن ، هەتا پێی دەگوتن: ئەی خێڵی (بنی عبدالله) خوای گەورە ناوێکی جوانی ناوە لەباوکتان ، کەچی هیچیان لێ وەرنەگرت.

٢. (بنو حنيفه) ، چووە ناو ماڵەکانیان بانگی کردن بۆلای خواو ، خۆی پێ ناساندن ، هیچ کەسێکی عەرەب لەمان خراپتر وەڵامیان نەدایەوە.

---

[1] / (ترمذی) ئەمەی گێڕاوەتەوە، بڕوانە (مختصر سيره الرسول) نوسینی (شێخ عبدالله ی نەجدی) ل١٤٩.
[2] / رحمة للعالمين ١/٧٤، نەجیب ئابادیش پێی لەسەر دادەگرێ ، بڕوانە (تاريخ الإسلام) ١/١٢٥.

٣. چوو بۆلای (بنی عامر بن صعصعه) . بانگی کردن بۆ لای خوا . خۆی پێ ناساندن . (بحيره)ی کوڕی (فراس) که یەکێك بوو لەپیاوەکانیان وتی: وەڵڵاهی ئەگەر دەستی ئەم کوڕەی قوڕەیش بگرم ، هەموو عەرەبی پێ قووت دەدەم ، پاشان وتی: ڕات چی‌یە ئەگەر ئێمە بەڵێنت بدەینێ و، پاشان ئەگەر خوا سەری خستی بەسەر نەیارەکانتدا ، ئایا کارو باری دوای تۆ بۆ ئێمە دەبێت ؟ فەرمووی : کاروبار بۆ خودایە ، ویستی لەسەر کێ بوو لەسەر ئەوی دادەنێت ، ئەنجا (بحيره) وتی بە پێغەمبەر ﷺ ، پێویستمان بەم کارەی تۆ نیە ، گوێیان پێنەدا.

که (بنو عامر) گەڕابوونەوە بۆ شوێنی خۆیان ، قسەیان کردبوو بۆ ڕیش سپیەکی خۆیان کە لەبەر پیریی نەیتوانی بوو بڕوات بۆ حەج ، پێیان وت: کوڕێکی قوڕەیشی لە (بنی عبدالمطلب) هاتە لامان ، دەیوت من پێغەمبەرم ، بانگی کردین بۆ ئەوەی پشتی بگرین و لەگەڵیدا بین و، بیهێنین بۆ شوێنی خۆمان ، کابرای پیرەساڵ کێشای بەسەری خۆیداو، پاشان وتی: ئەی خێڵی (بنی عامر) ئەرێ ناکرێت فریای کەون؟ ئەو پیاوە پەل و پۆکەی لە (مطلب)ە؟ سوێندم بەو کەسەی گیانی فلأنە کەسی بەدەستە ، هیچ نەوەیەکی (إسماعیل) ئەوە هەڵنابەستێت ، ئەوەش وتوویەتی هەقە ، ئەرێ لەوکاتەدا عەقڵتان لەکوێ بوو؟

## ئیماندارانی دەرەوەی مەککە

هەروەکو پێغەمبەر ﷺ باسی ئیسلامی بۆ خێڵ و شاندەکان دەکرد ، خۆی بەتاکە تاکەی خەڵکیش دەناساند لەلای هەندێکیان وەڵامی باشی دەستکەوت ، چەندپیاوێکیش پاش ماوەیەکی‌کەم لەو وەرزە باوەڕیان پێهێنا، ئەمەش دیمەنێکی ئەوانە:

١. (سويد بن صامت) شاعیرێکی ژیری خەڵکی (يثرب) بوو ، بەهۆی ئازایەتی و شاعیرێتی و پلەوپایەو بنەماڵەکەیەوە ناویان نابوو (الكامل) ، بۆ (حەج) یان (عومرە) هاتبوە مەککە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام ، پێی وت: لەوانەیە ئەوەی لای تۆیە لەوەبێت کە لەلای منە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی تۆ چیت پێیە؟ وتی: دانایی لوقمان، فەرمووی: بۆم باس بکە، باسی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە گوتەی جوانە، بەڵام ئەوەی لای منە جوانترە لەوە، ئەوەش قورئانێکە خوای گەورە بۆمی ناردۆتە خوارەوە ، نوورو ڕێنوێنیە ، ئەنجا هەندێك قورئانی بەسەردا خوێندەوەو ، بانگی کرد بۆ ئیسلام بوون ، موسوڵمان بوو ، وتی:

بەڕاستی ئەمە گوتەیەکی جوانە، کەڕۆیشتەوە بۆ مەدینە زۆری پێ‌نەچوو لەرۆژی (بعاث)دا کوژرا[1]، موسوڵمان بوونەکەی سەرەتای ساڵی (١١)ی پێغەمبەرێتی بوو[2].

٢. (إياس)ی کوڕی (معاذ)، کوڕێکی گەنجی (یثرب)ی بوو، لەگەڵ شاندێکی خێڵی (أوس) دا هاتبوون بۆ ئەوەی پەیمان ببەستن لەگەڵ قورەیشدا دژ بە خزمانیان لە (خزرج)، ئەمەش پێش جەنگی (بعاث) بوو کە لەسەرەتای ساڵی (١١)ی پێغەمبەرێتیدا ڕوویدا ، چونکە ئاگری شەڕ لەنێوان هەردوو خێڵەکەی (یثرب)دا هەڵگیرسابوو. ئەوسیەکان لە خەزرەجیەکان کەمتر بوون . کە پێغەمبەری خوا زانی هاتوون بۆ مەککە چووە لایان و لەگەڵیاندا دانیشت و، پێی وتن: ئایا لەم هاتنەتاندا حەزتان لە چاکە هەیە ؟ وتیان: ئەوە چاکەیە چی‌یە؟ فەرمووی: من پێغەمبەری خوام ، خوای گەورە منی ناردووە بۆ لای عەبدەکانی ، بانگیان دەکەم بۆ خوداپەرستی و وازهێنان لە (شيرك)و ، (قورئان)ی بۆ ناردووم ، پاشان باسی ئیسلامی بۆ کردن و ، قورئانی بۆ خوێندنەوە ، (إياس) ی کوڕی (معاذ) وتی: خزمینە وەڵڵاهی ئەمە باشترە لەوەی بۆی هاتوون ، (أبو الحيسر) . (أنس بن رافع) . کە پیاوێك بوو لە شاندەکەدا . مشتێك خۆڵی (بطحاء)ی هەڵگرت و کردی بەدەم و چاوی (إياس)دا و ، وتی: وازمان لێ بێنە ، ئێمە بۆ کارێکی‌تر هاتووین ، (إياس) بێ‌دەنگ بوو پێغەمبەری خوداش ﷺ هەستاو ، ئەوانیش بەبێ ئەوەی هیچ پەیمانێك لەگەڵ قورەیشدا ببەستن گەڕانەوە بۆ مەدینە.

پاش گەڕانەوەیان بۆ مەدینە زۆری پێ نەچوو (إياس) مرد ، لەکاتی سەرە مەرگدا زیکری (لاإله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) و (سبحان الله)ی دەکرد ، کەس گومانی نەبوو لەوەی کە بە موسوڵمانی مردووە)[3].

٣. (أبوذر الغفاري) . خەڵکی دەوروبەری (یثرب) بوو ، کاتێك هەواڵی وەحی بۆ هاتنی پێغەمبەر بەرگوێی کەوت (سويد)ی کوڕی (صامت) و (إياس)ی کوڕی (معاذ) بەهەمان شێوە کەوتە بەرگوێی (أبوذر)یش ئەمەش بووە هۆی موسوڵمان بوونی[4].

(بخاری) لە (إبن عباس)ە وە دەگێڕێتەوە:

---

[1] / هەمان سەرچاوە ٤٢٥/١-٤٢٧، هەروەها (رحمە للعالمين) ٧٤/١.

[2] / تاريخ الإسلام ، نوسینی (نجيب ئابادی) ١٢٥/١.

[3] / (إبن هشام) ٤٢٧/١-٤٢٨، هەروەها (تاريخ الإسلام) نوسینی (نجيب ئابادی) ١٢٦/١.

[4] / هەمان سەرچاوەی کۆتایی ١٢٨/١.

ئەبوزەڕ وتی: من پیاوێکی (غەفاری) بووم ، هەواڵمان پێگەیشت کە پیاوێك لە مەککە دەرکەوتوە ، دەڵێت من پێغەمبەرم ، وتم بە براکەم: بڕۆ بۆلای ئەو پیاوەو قسەی لەگەڵدا بکەو، هەواڵەکەیم پێ بدەرەوە ، پێی گەیشتبوو ، پاشان گەڕایەوە ، وتم چیت پێیە؟

وتی : وەڵلاهی پیاوێکم دی فەرمان بەکاری چاك دەکات و نادەکات لە هەموو خراپەیەك ،

پێم وت : دڵم ئاو ناخواتەوە ، هەستام توێشەبەرەو دارێکم گرت بە دەستمەوە، بەرەو مەککە کەوتمەڕێ ، خۆم والێکرد کە نایناسم و ، حەزم لەچارەی نیە ، لەئاوی زەمزەمم خواردەوەو چوومە مزگەوت ، عەلی بەلامدا تێپەڕی کرد ،

وتی: پێدەچێت تۆ پیاوێکی نامۆ بیت؟

دەڵێت : وتم: بەڵێ ،

وتی: کەوتە ڕێ بۆ ماڵەوە ، منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم ، نە ئەو پرسیاری لە من کرد نە منیش هیچ پرسیارێکم لەو کرد ، کە ڕۆژ بوەوە چووم بۆ مزگەوتەکەو ، هەواڵم نەپرسی ، کەسیش نیە هەواڵی ئەوم بداتێ ،

دەڵێت: عەلی بەلامدا تێپەڕی وتی: ئایا هێشتا ماڵی کابرات نەدۆزیوەتەوە؟

دەڵێت وتم : نەء ،

وتی: کەواتە وەرە لەگەڵم ،

دەڵێت: پێی وتم: کابرا چیت ئەوێت ؟

چی تۆی هێناوە بۆ ئەم شارە؟

دەڵێت : پێم وت : ئەگەر لای کەس قسە نەکەی پێت ئەڵێم ،

وتی: باشە وادەکەم ،

دەڵێت : وتم : هەواڵمان پێگەیشتوە کەپیاوێك لێرە هەڵکەوتووە دەڵێت من پێغەمبەری خودام ، براکەم نارد بۆ لای قسەی لەگەڵدا بکات ، گەڕایەوەو ئاوی دڵی نەدام ، حەزم کرد خۆم بیبینم.

عەلی پێی وت ﷺ : ڕێگەت دۆزیوەتەوە ، ڕووی منیش لەوێیە ، چۆن من چوومە ژورەوە تۆش بڕۆ ژورەوە ، ئەگەر کەسێکم دی جێگەی مەترسی بێت بۆ تۆ

دەچمە پاڵ دیوارەکەو خۆم بەچاککردنی نەعلەکانمەوە خەریك دەکەم و ، تۆ بەڕێی خۆتەوە بڕۆ ، ئەو ڕۆشت ، لەگەڵیدا ڕۆشتم هەتا چووە ژوورەوە ، لەگەڵیدا چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ، عەرزم کرد: باسی ئیسلامم بۆ بکە ، بۆی باس کردم ، دەستبەجێ موسوڵمان بووم ، پێی فەرمووم: ئەبوذەڕ، ئەم کارە بپۆشەو بانهێنی بێت ، بگەڕێرەوە بۆ شارەکەت ، کە هەواڵی سەرکەوتنی ئێمەت پێگەیشت ئەوجا وەرەوە ، منیش وتم: سوێند بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردوە لەناویاندا بەدەنگی بەرز هاوار ئەکەم ، ئەنجا چوومە مزگەوت قوڕەیشی لێ بوو ، وتم: ئەی خێڵی قوڕەیش ، من شایەتی دەدەم ( أشهد أن لا إله إلاّ الله ) و ( أنّ محمداً عبده ورسوله ) وتیان : ئادەی بڕۆنە گیانی ئەو هەڵگەڕاوەیە ، بۆم هەستان ، لێدانێك لێ درام کە بمرم ، عەباس فریام کەوت ، خۆیدا بەسەرمدا ، پاشان ڕووی تێکردن و فەرمووی :

دایك ڕۆڵە ڕۆتان بۆ بکات ئایا پیاوێکی غەفاری دەکوژن؟ لەکاتێکدا کە ڕێگەی بازرگانی و هاتوچۆتان بەسەر خێڵی غەفارەوەیە؟ ئیدی وازیان لێ هێنام ، کە ڕۆژ بوەوە ، گەڕامەوە ، ئەنجا هەمان وشەکەی دوێنێم وتەوە ، وتیان: ئادەی هەستن بۆ ئەو هەڵگەڕاوەیە ، وەکو دوێنێیان لێ کردمەوە ، عەبباس فریامکەوت ، خۆیدایەوە بەسەرمداو وەکو قسەکانی دوێنێی فەرمووەوە[1].

٤. (طفیل)ی کوڕی (عمرو)ی (دوس)ی . پیاوماقوڵێکی شاعیرو ژیرو سەرۆکی تیرەی (دوس) بوو ، تیرەکەی لە هەندێ ناوچەی (یەمەن)دا میرنشینیەکی هەبوو ، لە ساڵی (١١)ی پێغەمبەرێتیدا هات بۆ مەککە ، خەڵکەکەی پێش ئەوە بگات بەخێرهاتنیان کرد ، جوانترین سڵاویان لێکردو بەشکۆدارترین شێوە ڕێزیان گرت و ، پێیان وت: ئەی (طفیل) ، تۆ هاتویتە وڵاتی ئێمە ، ئەم پیاوەی لەناوماندا دەرکەوتوە گێچەڵمان پێدەگێڕێت و، جیاوازی تێخستوین، کاروبارمانی پەرتەوازە کردووە، گوتەکانی لەجادوو ئەچن ، کوڕ لەباوك و ، لەبراکەی و، هاوسەر لە یەکتری جیادەکاتەوە ، ئێمە بەهۆی ئەو پیاوەوە ترسمان هەیە لەسەر خۆت و خێڵەکەت ، لەبەرئەوە قسەی لەگەڵدا مەکەو گوێیشی لێ مەگرە.

(طفیل) دەڵێت: وەڵڵاهی وازیان لێ نەهێنام هەتا بڕیارمدا کە نەقسەی لەگەڵدا بکەم و نەبیدوێنم ، هەتا وام لێ هات کە چووم بۆ مزگەوت گوێم بەشتێك

[1] / صحیح البخاری . باب قصة زمزم ١/٤٩٩–٥٠٠ ، باب إسلام ابی ذر ١/٥٤٤،٥٤٥.

ئاخنی ، نه بادا شتێك له قسەكانیم بەرگوێ بكەوێت ، دەڵێت: چوومە مزگەوت ، دەبینم لەپاڵ كابەدا نوێژ دەكات ، لە نزیكیەوە ڕاوەستام ، خوا ویستی گوێم لە هەندێك قسەی بێت ، بەڕاستی گوێم لە وتەیەكی شیرین بوو . لەدڵی خۆمدا وتم: دایك ڕۆڵە ڕۆم بۆ بكات ، من پیاوێكی خاوەن عەقڵم و شاعیرم ، چاك و خراپ لە من ون نابن، چی ڕێگەم لێ دەگرێ كە گوێ لە قسەی ئەم پیاوە بگرم ؟ ئەگەر پێم باش بوو وەری دەگرم ، خۆ ئەگەر خراپیش بوو ڕەتی دەكەمەوە ، وەستام هەتا گەڕایەوە بۆ ماڵەكەی ، شوێنی كەوتم تاچوە ژورەوەو چووم بۆلای و باسی هاتنی خۆمم بۆ كردو ، باسی ترساندنی خەڵك لەوو، ئاخنینی گوێم بەپارچە پەرۆیەك پاشان گوێ گرتنم بۆ هەندێ لەگوتەكانی بۆ گێڕایەوەو ، پێم وت: باسی ئەم كارەی خۆتم بۆ بكە ، باسی ئیسلامی بۆ كردم ، قورئانی بەسەردا خوێندمەوە ، وەڵلاهی هەرگیز گوێم لەقسەی لەوە جوانتر نەبوو بوو ، كارنەبوو لەوە دادپەروەرانەتر . دەست بەجێ باوەڕم هێناو شایەتی هەقم داو ، پێم وت: من لەناو تیرەكەمدا قسەبیسراوم و، دەگەڕێمەوە بۆ لایان و، بانگیان دەكەم بۆ ئیسلامەتی ، دۆعام بۆ بكە بەڵگەیەكم هەبێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ دۆعای كرد بەڵگەكەش ئەوەبوو خوای گەورە نورێكی وەك گلۆپی لەنێوچەوانیدا خولقاند ، وتی: خوایە بائەم بەڵگەیە لە دەم وچاومدا نەبێت ، چونكی دەترسم بڵێن: ئەوە خوا پێی نواندوە ، ئیتر نوورەكە چووە ناو قامچیەكەی ، باوك و هاوسەرەكەی بانگ كرد بۆ ئیسلام هەردووكیان موسوڵمان بوون ، خێڵەكەی لەموسوڵمان بووندا درەنگ هاتن بەدەمیەوە ، بەڵام هەر وازی لێ نەهێنان هەتا لە دوای (خەندەق)ەوە[1] كۆچی كرد بۆ مەدینەو حەفتا یان هەشتا بنەماڵەی خێڵەكەی لەگەڵدا بوو ، لە ئیسلامدا هەوڵ و خەباتێكی باشی كرد ، لە جەنگی ڕۆژی (یەمامە)دا شەهید بوو[2] .

٥. (ضماد الأزدي) : لەخێڵی (أزد شنوءة) ی یەمەن بوو، خەریكی نوشتە كردن بوو ، گەیشتە مەككە گوێ لەبێ عەقڵەكانیان بوو دەیانوت: موحەممەد شێتە ، وتی: ئەگەر من بڕۆمەوە لای ئەو كابرایە بەڵكو خودا لەسەر دەستی مندا شیفای بدات ، پێی گەیشت ، پێی وت: ئەی موحەممەد ، من نوشتە دەكەم ، ئایا پێت

---

[1] / بەلكو دوای (حدیبیة) ش هاتە مەدینەو خزمەت پێغەمبەریش ﷺ، سەیركە (إبن هشام) ١/٣٨٥.

[2] / إبن هشام ١/٣٨٢-٣٨٥، رحمةللعالمین ١/٨١،٨٢، مختصر سیرة الرسول ، نوسینی شیخ عبدالله ی نەجدی ل١٤٤ ، تاریخ الإسلام نوسینی (نجیب ئابادی) ١/١٢٧.

باشه بۆت بکەم ؟ پێغەمبەر ی خوا ﷺ فەرمووی: (( إن الحمد لله نحمده ونستعينه ، من يهد الله فلا مضل له ، ومن يضلله فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله ، أما بعد )).

وتی: ئەو وشانەم جارێکی تر بۆ بڵێرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سیٚجار بۆی وتەوە ، کابرا وتی: من گوێم لەقسەی فاڵگرو جادوگەرو گوتەی شاعیران بووە ، هەرگیز گوێم لە هاوێنەی ئەم قسانەی تۆ نەبووە، بەڕاستی گەشتونەتە فەرهەنگی دەریاکان ، دەستت بێنە با لەسەر ئیسلام بەیعەتت بدەمیٚ ، بەیعەتی دا بەپێغەمبەر ﷺ[1].

## شەش شنەبای فێنك لە خاکی (یثرب)ە وە

لە وەرزی حەجی ساڵی (١١) ی پێغەمبەرێتیدا . یۆلیۆی شاڵی ٦٢٠ی زایینی . بانگەوازی ئیسلامیی چەند تۆوێکی چاکی بەدی کرد ، خێرا بوونە چەند درەختێکی بالآبەرز ، موسوڵمانان خۆیان خستە ژێرسێبەری فێنکی لەدەست گڕەی ستەم و ستەمی سالآنی پێشوو.

یەکێك لە داناییەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو، کاتێك تووشی بەدرۆ خستنەوەو ڕێگە ڵیگرتن دەبووەوە ، لەلایەن خەڵکی مەککەوە ، لەتاریکایی شەودا بەسەر خێڵەکاندا دەگەڕا ، هەتا هیچ کەسێك لەموشریکەکانی مەککە نەتوانن ڕێگەی لیٚ بگرن[2].

بەو شێوەیە شەوێکیان دەرچوو ، ئەبوبەکرو عەلی لەگەڵدا بوو ، بەسەر ماڵەکانی (ذهل) و (شیبان) و (بن ثعلبة)دا گوزەراو لەبارەی ئیسلامەوە قسەی لەگەڵدا کردن . لەنێوان ئەبوبەکرو پیاوێکیٚ خێڵی (ذهل)دا پرسیارو وەلآمێکی خۆش ڕوویدا ، (بنو شیبان) یش وەلآمێکی ئومێد بەخشانەیان دایەوە ، بەلآم لە قەبوڵ کردنی ئیسلامدا وەستان[3].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە(عقبە)ی (منى) دا تێپەڕی ، گوێی لەدەنگی چەند پیاوێك بوو قسەیان دەکرد[4]، چووە لایان ، شەش گەنجی (یثرب) یی بوون ، هەموویان لە (خزرج) بوون ، بریتی بوون لە:

---

1 / (موسلیم) ریوایەتی کردوە ، مشکاة المصابیح ، باب علامات النبوة ٢/٥٢٥.
2 / تاریخ الإسلام نوسینی (نجیب ئابادی) ١/١٢٩.
3 / بروانة ، مختصر سیرة الرسول ، نوسینی (شێخ عەبدوڵلآی نەجدی) ل١٥٠ -١٥٢.
4 / رحمة للعالمین ١/٨٤.

(اسعد بن زراره) له خێڵی (بنی النجار)

(عوف بن الحارث بن رفاعة ، إبن عفراء) لەخێڵی (بنیالنجار)

(رافع بن مالك بن العجلان) له خێڵی (بنی زریق)

(قطبة بن عامر بن جديدة) له خێڵی (بنی سلمه)

(عقبه بن عامر بن نابی) لەخێڵی (بنی حرام بن كعب)

(جابر بن عبدالله بن رئاب) لەخێڵی (بنی عبید بن غنم)

یەکێك لەخۆشیەکانی خەڵکی (یثرب) ئەوەبوو، کە لە جوولەکە هاوپەیمانەکانیان دەبیست لە مەدینەدا کە یەکێك لە پێغەمبەران لەو ڕۆژگارانەدا دەردەکەوێت ، ئەوجا شوێنی دەکەوین ، ئەوجا ئێمە (جولەکە) لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا دەبین ئێوە دەکوژین وەکو (عاد) و (إرم)[1].

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان گەیشت ، پێی فەرموون : ئێوە کێن ؟ وتیان: ئێمە چەند کەسێکی خەزرەجین ، فەرمووی: هاوپەیمانەکانی جولەکە؟ وتیان: بەڵێ ، فەرمووی: دادەنیشن قسەتان لەگەڵدا بکەم؟ وتیان: بەڵێ، لەگەڵیدا دانیشتن ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ کرۆکی ئیسلام و بانگەوازەکەی بۆ باس کردن و، بانگی کردن بۆلای خوای گەورە ، هەروەها قورئانی بۆخوێندنەوە . هەندێکیان بەئەوانی تریان وت: ئەرێ دەزانن وەڵڵاهی خەڵکینە ، ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکە هەڕەشەیان پێی لە ئێوە دەکرد ، نەکەن بهێڵن پێشتان بکەون ، دەستبەجێ وەڵامی بدەنەوەو موسوڵمان بن.

ئەوانە پیاوە ژیرەکانی (یثرب) بوون ، دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆ ماندووی کردبوون ، کە زۆر نەبوو گوزەرا بوو ، هەتا ئەو کاتەش کڵپەکەی بەهەڵگیرساوەیی مابوەوە ، ئومێدیان وابوو کە بانگەوازە ببێتە هۆیەك بۆ وەستاندنی شەڕ ، وتیان: ئێمە لەحاڵێکدا خێڵەکەمان بەجێهێشتوە هیچ خێڵێك لەوناوەدا بەئەندازەی ئەوان دوژمنایەتیان لەناودا نیە ، لەخودا داواکارین کە بەهۆی تۆوە کۆیان بکاتەوە ، دەچینەوە لایان ، بانگیان دەکەین بۆ لای تۆ ، ئەگەر لەسەر دەستی تۆدا یەك بگرن ، هەرگیز ڕێیان لەکەسێك ناکەوێت پایە بڵندتر بێت لە تۆ .

ئەو کۆمەڵە خەڵکە گەڕانەوە بۆ مەدینە پەیامی ئیسلامیان بۆ بردن ، وای لێهات ماڵێك لە ماڵەکانی (انصار)دا نەما باسی پێغەمبەری تێدا نەبێت ﷺ[2].

---

[1] / زاد المعاد ٢/٥٠، إبن هشام ١/٥٢١,٤٢٩.

[2] / هەمان سەرچاوە ١/٤٢٨-٤٣٠.

## خواستنی عائشه له لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ

لەشەوالی ئەو ساڵەدا ـ ساڵی (١١)ی پێغەمبەرێتی ـ پێغەمبەری خوا ﷺ عائشەی (صدّیقە)ی خوازبێنی کردو (ر) ، لە شەوالی ساڵی یەکەمی کۆچیدا گواستیەوە[1].

## شەورەوی و بڵند بوونەوە

لەو قۆناغەدا بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان سەرکەوتن و چەوساندنەوەدا بێ وچان رێگەی دەبڕی ، چەند ئەستێرەیکی کز لە ئاسۆیەکی دورەوە وەدیار دەکەوتن ، ئەوە بوو ڕووداوی شەورەوی و بڵند بوونەوە ڕووی‌دا.

بەچەند وتەیەکی جیاواز کاتی دیاری کردنەکەی قسەی لەسەرە:

١. وتراوە: شەورەوی لەیەکەم ساڵی پێغەمبەرێتیدا ڕوویداوە، ڕای (طبری)یە.

٢. وتراوە: پێنج ساڵ دوای پێغەمبەرێتی بووە ، (نەوەوی) و (قرطبی) ئەمەیان بە لاوە پەسەندترە.

٣. وتراویشە: لە شەوی (٢٧)ی مانگی رەجەبی ساڵی (١٠)ی پێغەمبەرێتیدا بوە ، (عەللامە المنصور فوری) ئەم ڕایەی پەسەند کردوە.

٤. وتراوە: پێش کۆچ بە (١٦) مانگ بووە ، واتە لە ڕەمەزانی ساڵی (١٢)ی پێغەمبەرێتیدا.

٥. وتراوە: پێش کۆچ کردن بەساڵێك و دوومانگ بووە ، واتە لە (محرم)ی ساڵی (١٣)ی پێغەمبەرێتیدا.

٦. وتراوە: ساڵێك پێش کۆچ کردن بووە ، واتە لە (ربیع الأول) ی ساڵی (١٣)ی پێغەمبەرێتیدا.

سێ گوتەی یەکەم بەوە ڕەت کراوەتەوە کە (خەدیجە) (ر) لە ڕەمەزانی ساڵی (١٠) پێغەمبەرێتیدا وەفاتی کردوە ، وەفات کردنەکەشی پێش فەرز کردنی (٥) نوێژەکە بووە ، ڕای جیاواز نیە لەوەدا کە فەرز کردنی پێنج نوێژەکە لە شەوی (إسراء)دا بووە[2].

بەڵام هەر سێ وتەکەی دواوە بەڵگەیەکم نەدی پەسەندی بکەم ، هەرچەندە ڕەوتی سورەتی (الإسراء) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەورەوی دواتر ڕوویداوە.

---

[1] / تلقیح فهوم اهل الاثر ل١٠، صحیح البخاری ٥٥١/١.

[2] / بۆ ئەم ڕایانە بڕوانە، زادالمعاد ٤٩/٢، مختصر سیرەالرسول ، شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل ١٤٨-١٤٩، رحمه للعالمین ٧٦/١، (تاریخ إلإسلام) نوسینی (نجیب ئابادی) ١٢٤/١.

هەروەها پێشەوایانی (فەرمووده) وردو درشتی ئەم ڕووداوە دەگێڕنەوە ، ئێمەش زۆر بەكورتی دەیخەینە ڕوو:

(إبن القيّم) دەڵێت: ڕاست وەهایە كەپێغەمبەری خوا ﷺ بەجەستەی شەوڕەوی پێكراوە ، لەمزگەوتی حەرامەوە بۆ (بيت المقدس) ، بەسواری بوراق و بەهاوڕێیەتی (جبريل) ﵇ لە (بيت المقدس) دابەزیوە ، نوێژی بەئیمامەت بۆ پێغەمبەران كردوەو، جڵەوی بوراقیشی بەئەڵقەی دەرگاكەی مزگەوتەوە بەستۆتەوە.

پاشان هەر لەو شەوەدا لە (بيت المقدس)ەوە بۆ ئاسمانی دونیا بڵند كرایەوە ، (جبريل) ﵇ داوای كردنەوەی ئاسمانی یەكەمی كرد ، بۆی كرایەوە ، لەوێدا باوكی مرۆڤایەتی (ئادەم)ی بینی سڵاوی لێ كرد ، بەخێرهاتنی كردو ، وەڵامی دایەوە ، دانیـنا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا ، لەلای ڕاستیەوە خوای گەورە گیانی هەموو پێغەمبەرانی نیشانداو ، لەلای چەپیشیەوە گیانی تاوانبارانی نیشاندا.

پاشان بەرزكرایەوە بۆ ئاسمانی دووەم ، بۆی كرایەوە ، تیایدا یەحیای كوڕی زەكەریاو عیسای كوڕی مەریەمی بینی ﵉ ، پێیان گەیشت و سڵاوی لێ كردن ، وەڵامیان دایەوەو، بەخێرهاتنیان لێ كردو ، دانیان نا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا.

پاشان بڵند كرایەوە بۆ ئاسمانی سێیەم ، یوسفی تێدا بینی ﵇ ، سڵاوی لێ كرد ، وەڵامی دایەوەو بەخێرهاتنی لێ كردو ، دانی نا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا.

پاشان بەرز كرایەوە بۆ ئاسمانی چوارەم ، ئیدریسی تێدا بینی ﵇ ، سڵاوی لێ كردو ، بەخێرهاتنی لێ كردو، دانی نا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا.

پاشان بەرز كرایەوزە بۆ ئاسمانی پێنجەم ، هاروونی كوڕی عمرانی تێدا بینی ﵇ ، سڵاوی لێكردو ، بەخێرهاتنی كردو ، دانی نا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا.

پاشان بڵند كرایەوە بۆ ئاسمانی شەشەم ، بە موسای كوڕی عمران گەیشت ﵇ ، سڵاوی لێكردو ، بەخێرهاتنی كردو ، دانی نا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا.

كە موسای بەجێهێشت ﵇ گریا ، پێی وترا: بۆچی دەگریت ؟ فەرمووی : دەگریم چونكە كوڕێك نێرراوە لەدوای منەوە ، ئەوانەی لەئوممەتی ئەو دەڕۆنە بەهەشتەوە لە ژمارەی ئەوانەی ئومەتی من زیاترن.

پاشان بەرزكرایەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم ، گەیشت بە ئیبراهیم ﵇ ، سڵاوی لێكردو ، بەخێرهاتنی كردو ، دانی نا بە پێغەمبەرێتیەكەیدا.

پاشان بەرز كرایەوە بۆ (سدرة المنتهى) و، ئەنجا بڵند كرایەوە بۆ (البيت المعمور).

پاشان بەرز کرایەوە بۆ لای (الجبّارﷻ) ، ئەوەندە لێی نزیك بووەوە هەتا بەئەندازەی دووکەوان یان کەمتری مابووەوە ، ئەنجا ئەوەی ویستی (وەحی) کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ، (٥٠) نوێژی لەسەر کردە ئەرك ، گەڕایەوە هەتا بەلای موسادا تێپەڕی ﷺ ، پێی فەرموو : بەچی فەرمانی پێکردی ؟ فەرمووی بەپەنجا نوێژ ، فەرمووی : ئوممەتەکەت بەرگەی ئەوە ناگرێت ، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت داوای لێ بکە سووکی بکات لەسەر ئوممەتەکەت ، لای کردەوە بەلای جبریلدا ، وەکو بیەوێت ڕای ئەو وەربگرێت ، ئاماژەی فەرموو: بەڵێ، ئەگەر حەزت لێ بێت ، جبریل بەرزی کردەوە هەتا چوە خزمەت خوای گەورە ، لەجێگەی خۆیدابوو . ئەمە قسەی بوخاریە لەچەند ڕێگەیەکەوە . ئەنجا دە نوێژی لەسەر کەمکردەوە، پاشان دابەزیەوە هەتا بەلای موسادا ﷺ تیْپەڕی، هەواڵی پێدا، فەرموی: بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت و داوای سووك کردنی لێ بکە ، بەردەوام لەهاتوچۆدا بوو لەنێوان موسا ﷺ و خوای گەورەدا، هەتا بۆی کرد بەپێنج نوێژ، موسا ﷺ فەرمانیپێدا کەداوای سووککردن بکاتەوە ، فەرمووی: شەرم دەکەم لەپەروەردگارم بەڵام ڕازی دەبم و ملکەچم ، کە دورکەوتەوە بانگ وێژێك هاواری کرد: من بڕیاری فەریزەکەم داو سەرشانی بەندەکانم سووك کرد . تەواو[1].

پاشان (إبن القيم) باس لە ڕاجیاوازیەك دەکات سەبارەت بەچاوپێکەوتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ پەروەردگاری گەورە ، پاشان باسی قسەیەکی (إبن القيم)ی کردوە لەو بارەیەوە ، پوختەی قسەکە ئەوەیە کە بینین بەچاو لەبنەڕەتدا نەسەلماوەو ئەمە قسەیەکە هیچ یەکێك لەهاوەڵان نەیان فەرمووە ، ئەوەش باس دەکرێت لە (إبن عباس)ەوە کە بە ڕەهایی و بە دڵی بینیویەتی ، ئەوا یەکەم دژ بە دووەم نیە.

پاشان دەڵێت: ئایەتی ﴿ ثم دنا فتدلى ﴾ النجم/٨ ، ئەم نزیکبوونەوەیە ئەو نزیکبوونەوە نیە لە سورەتی (الإسراء)دا هاتووە ، ئەوەی لەسوورەتی (النجم)دا هاتوە نزیکبوونەوەی (جبريل)ە ﷺ نزیکبوونەوەکەش ، هەروەکو عائشەو (إبن مسعود) دەڵێن : ڕەوتی ئایەتە بەڵگەیە لەسەری ، نزیك بوونەوەکە لەسورەتی (الإسراء)دا ڕوونە کەمەبەست پێی نزیکبوونەوەی پەروەردگاری گەورەو، لە سورەتی (النجم)دا باس لەوە ناکات ، بەڵکو ئەوەی تێدایە کە جارێکی تر لە (سدره

---

[1] / زاد المعاد ٢/٤٧،٤٨.

المنتهى) بينيويەتيەوە ، ئەوەش (جبريل)ە عليه السلام ، پێغەمبەر ﷺ دووجار لەسەر شێوەی پیرۆزی جبریلی بینیوە: جارێك لەسەر زەمین ، جارێکیش لە (سدرە المنتهى) ، (والله اعلم) . تەواو.[1]

ڕووداوی سنگ لەت کردنەکەش جارێکی تر لێی ڕووی دایەوە ، لەو سەفەرەدا کۆمەڵێك شتی جۆراو جۆری بینی:

شیرومەی خرایە بەردەستی ، شیرەکەی هەڵبژارد ، پێی وترا: ڕێگەی فیترەتت هەڵبژارد یان فیترەتت پێکا ، خۆ ئەگەر مەیەکەی هەڵبژاردایە ئوممەتەکەت سەری لێ تێکدەچوو.

هەروەها چوار ڕووباری بینی لە بەهەشتدا : دوو ڕووباری دیارو ، دوو ڕووباری نادیار ، دوو دیارەکە بریتی بوون لە نیل و فورات ، ماناکەشی ئەوەیە کە پەیامەکەی نیشتەجێی ئەو دوو شیوە بەپیتە دەبێت لە نیل و فوراتداو ، خەڵکەکەی دەبنە هەڵگرانی ئیسلام نەوە لەدوای نەوە ، ماناکەی ئەوە نیە کە ئاوی ئەو دوو ڕووبارە لە بەهەشتەوە هەڵدەقوڵێت.

هەروەها مالیکی دەرگاوانی دۆزەخی بینی ، پێنەدەکەنی ، لە ڕووکاریدا گەشی و خۆشی دیار نەبوو ، هەروەها بەهەشت و دۆزەخی بینی.

هەروەها بخۆرانی ماڵی هەتیوانی بینی قاپۆڵەیان هەبوو وەك وشتر ، پارچە ئاگری وەك مشتە بەرد دەکرا بە دەمیانداو ، لە دەرچەیانەوە دەچووە دەرەوە.

سووخۆرەکانیشیی دەبینی سکیان گەورە بووبوو ، نەیاندەتوانی لە جێگەی خۆیان بجوڵێن، بۆ پیشاندانی دۆزەخ ئال و بەیتی فیرعەون بەلایاندا تێدەپەڕین و پێیان پێدادەنان.

زیناکارەکانیشیی بینی گۆشتێکی پاکو قەڵەوو گۆشتێکی هەڵاوساوی بۆگەنیان لەبەردەستدا بوو ، لەگۆشتە پیسە بۆگەنەکەیان دەخواردو ، وازیان لە گۆشتە پاکە قەڵەوەکە هێنا بوو.

هەروەها ئەو ژنانەشی بینی کە منالی زۆڵ دەخەنەوە ، بە مەمکەکانیان هەڵواسرا بوون.

---

[1] /زادالمعاد ٢/٤٧,٤٨ .هەروەهاسەیرکە(صحيح البخاری)١/٥٠..٤٥٥، ٤٥٦، ٤٧٠، ٤٧١، ٤٨١، ٥٤٨، ٥٤٩، ٥٥٠ ...٢/٦٨٤، (صحيح مسلم) ١/٩١، ٩٢، ٩٣، ٩٤، ٩٥ ، ٩٦.

هەروەها کاروانێکی خەڵکی مەککەی بینی لەچوون و گەڕانەوەدا بوو، وشترێکیان لەپێشەوە بوو دیاریی کرد، لەسەریان وەستا ئاوی لەدەفرێکی سەر داپۆشراویان خواردەوە ئەوان نووستبوون ، پاشان دەفرەکەی بە سەرداپۆشراوی هێشتەوەو ڕۆشت ، ئەوەش بوو بەبەڵگەی بانگەوازەکەی لە بەرەبەیانی شەوی شەو ڕەیدا[1].

(إبن القيم) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی کردەوە لەناو قورەیشدا هەواڵی پێدان ، کە خودا چی لە ئایەتە گەورەکانی خۆی نیشانداوە ، ئیدی بەدرۆخستنەوەو ئازاردان و زیان پێگەیاندنیان زیاتری کرد ، داوایان لێ کرد وەسفێکی (بيت المقدس) یان بۆ بکات ، خوای گەورە هێنایە پێش چاوی ، تا بەباشی دیاری کرد ، ئەنجا هەواڵی نیشانەکانی پێدان ، ئەوانیش نەیاندەتوانی بەرپەرچی یەك وشەی بدەنەوە ، ئەنجا هەواڵی ڕێگەی هاتن و چونی کاروانەکەشی پێدان و ، پێشیی وتن کە چ کاتێك دەگاتە جێ ، هەواڵیشی پێدان سەبارەت بە یەکەم وشتری پێش کاروانەکە ، هەواڵەکەش بەڕاستی وادەرچوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ، کەچی ئەو هەواڵە زیاتر توورەی کردن و ، زیاتر لە کوفرو بێباوەڕیدا نغرۆی کردن[2].

گوتراوە: بۆیە (أبوبكر) ﷺ ناونراوە (صدّيق) چونکە دەستبەجێ ئەم ڕووداوەی بەڕاست زانی ، لەکاتێکدا بەدرۆیان خستەوە[3].

کورترین و گەورەترین وشە لەبارەی هۆو حیکمەتی ئەو گەشتەوە وترابێت ئەم ئایەتە پیرۆزەیە ﴿ لنريه من آياتنا ﴾ الأسراء (١) واتە: بۆ ئەوەی ئایەتی خۆمانی نیشان بدەین ، ئەمەش سوننەتی پێغەمبەرانە (س) فەرمویەتی : ﴿ وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ {٧٥} ﴾ الأنعام ، واتە : بەو شێوەیە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەمینمان نیشانی ئیبراهیم داو ، بۆ ئەوەی یەقین پەیدا بکات ، هەروەها بە (موسا)ی فەرموو: ﴿ لِنُرِيَكَ مِنْ آيَاتِنَا الْكُبْرَى {٢٣}﴾ واتە : بۆ ئەوەی ئایەتە گەورەکانی خۆمانت نیشان بدەین ، مەبەستی ئەو (إرادە) یەشی ڕوون کردەوەو فەرمووی: ﴿ وليكون من الموقنين ﴾ ، پاش ئەوەی کە پێغەمبەران (س) پشت بەبینینی

---

[1] / سەرچاوەکانی پێشوو ، ابن هشام ٣٩٧،٤٠٢،٤٠٣،٤٠٤،٤٠٦/١.

[2] / زاد المعاد/٤٨، هەروەها سەیرکە (صحيح البخاری) ، ٦٨٤/٢، و(صحيح المسلم) ٩٦/١، (إبن هشام) ٤٠٢،٤٠٣/١.

[3] / هەمان دوا سەرچاوە ٣٩٩/١.

ئایەتە خواییەکان دەبەستن ئەوەندەیان زانیاری یەقین دەست دەکەوێت ئەندازەی نیە ، هەواڵیش وەك دیاری کردن نیە ، ئەوانە ئەوەندە ئازار دەنۆشن کەس بەرگەی ناگرێت ، هەموو هێزەکانی دونیا لەبەردەمیاندا باڵی مێشوولەیەو باکیان لێی نیە با بەسزاو ئازاریش تاو بدرێن.

ئەو حیکمەت و نهێنیانەی لەپشت وردەکاری ئەم گەشتەوەن ، بواری باس لێکردنیان بریتیە لەپەرتووکی نهێنیەکانی شەریعەت ، بەلاَم هەندێك ڕاستی سادە هەن کە لەکانیاوی ئەم گەشتەوە هەڵدەقوڵێن و بەقوڵپ دێنە دەرەوە بەرەو باخچەکانی سیرەتی پێغەمبەر ﷺ .

پێم باش کە بەکورتی هەندێکیان تۆمار بکەم :

خوێنەر لە سورەتی (الأسراء)دا دەبینێت کە خوای گەورە باسی بەسەرهاتی شەوڕەوی لەیەك ئایەتدا کردوە ، پاشان دەستی کردوە بەباسی ئابڕوچوون و تاوانەکانی جولەکەو ، پاشان ئاگاداری کردنەوە کە ئەم قورئانە بۆ ئەو میللەتەیە کە شیاوترە لەوانەشە خوێنەر واهەست بکات کە هیچ پەیوەندیەك لەنێوان دوو ئایەتەکەدا نەبێت ، لەڕاستیدا مەسەلەکە وانیە ، خوای گەورە بەم شێوازە ئاماژە دەکات بەوەی کە شەوڕەوی بەرەو (بیت المقدس) بوە ، چونکە جولەکە لە سەرکردایەتی کۆمەڵگای مرۆڤیی وەلا دەخرێن ، بەهۆی ئەو تاوانانەوە کە هیچ بوارێکی بۆ مانەوەیان لەسەر ئەو پلەوپایە نەهێشتۆتەوە ، لە داهاتویەکی نزیکیشدا خوای گەورە ئەو پلەیە بە کردەیی دەبەخشێت بەپێغەمبەرەکەی ﷺ و، هەردوو پلەوپایەی بانگەوازی ئیبراهیمی بۆ کۆدەکاتەوە ، ئیدی کاتی گواستنەوەی سەرکردایەتی ڕۆحی هاتوە لە ئوممەتێکەوە بۆ ئوممەتێکی تر ، لە ئوممەتێکەوە کە مێژووی خۆی پڕکردووە لەناپاکی و فێڵ و تاوان و دەست درێژی ، بۆ ئوممەتێك کەچاکەو خێروبێری لێ دەڕژێت و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕۆژانە وەحی بۆ دادەبەزێت.

بەلاَم ئەم سەرکردایەتیە چۆن دەگوازرێتەوە ، لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ بە لانەوازی لەناو شاخەکانی مەککەدا خۆی حەشارداوە ، ئەم پرسیارە پەردە لە ڕووی ڕاستیەکی تریشدا هەڵدەماڵێت ، کە ئەوەیە ڕۆڵی ئەم بانگەوازە ئیسلامیە خەریکە بەرەو کۆتایی و تەواو بوون دەڕوات ، ئیدی ڕۆڵێکی تر دەست پێ دەکات کە لە ڕەوگەیدا جیایە لە ڕۆڵی یەکەم ، لەبەرئەوەیە کە دەبینین هەندێك لە ئایەتەکان

ئاگادارکردنەوەیەکی ڕوون و هەڕەشەیەکی سەختی تێدایە سەبارەت بە موشریکان ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا {١٦}﴾ الأسراء ، واتە : ئەگەر ویستمان بڕیار بدەین بەفەوتاندنی هەر شارێك وا لە خۆشگوزەرانەکانیان دەکەین لە سنوور دەرچن ئەوسا بڕیاری خوایان بەسەردا دەچەسپێت و ماڵ وحاڵیان وێران دەکەین . ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ وَكَفَى بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا {١٧}﴾ الأسراء ، واتە: پاش نوح چەندین گەلی ترمان لەناو برد ، خوای تۆ بەسە بۆ ناسین و بینینی گوناهی بەندەکانی ، بەپاڵ ئەم ئایەتانە کۆمەڵێك ئایەتی تریش هەیە کە بنەماو بەندو پرەنسیپەکانی ژیار بۆ موسوڵمانان ڕوون دەکاتەوە کە کۆمەڵگای ئیسلامیانی لەسەر بنیات دەنرێت ، هەروەکو هاتبنە سەر زەویەك تیایدا کاروبار لە هەموو ڕوویەکەوە بەدەستی خۆیان بێت و، یەکەیەکی یەکگرتویان دروست کردبێت کە کاروباری کۆمەڵی لەسەر بەرێوە بچێت ، هەروەها ئامارەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر لەداهاتویەکی نزیکدا شوێن و پەناگەیەك دەدۆزێتەوە کە تیایدا نیشتەجێ ببێت و، ببێتە مەڵبەندێك بۆ بلاوکردنەوەی بانگەوازەکەی لە هەموو جیهاندا ، ئەمەش یەکێکە لەنهێنیەکانی ئەم قۆناغە پیرۆزە ، پەیوەستە بە باسەکەمانەوە ، بۆیە بەباشمان زانی باسی بکەین.

هەر لەبەرئەم حیکمەتەو هاووێنەکانیەتی پێمان وایە کەدیاردەی شەو ڕەوی پێش بەڵێنی عەقەبەی یەکەم یان لەنێوان هەردوو بەڵێنی عەقەبەدا ڕووی داوە، (والله أعلم).

## بەیعەتی عەقەبەی یەکەم

پێشتر وتمان کە شەش کەس لە خەڵکی (یثرب) لە وەرزی حەجی ساڵی (١١)ی پێغەمبەرێتیدا موسوڵمان بوون ، بەڵێنیاندا بەپێغەمبەر ﷺ کە پەیامەکەی بە کەسوکاریان بگەیەنن.

لەئاکامی ئەوەدا کە وەرزی داهاتوو هاتە پێشەوە . لە وەرزی حەجی ساڵی (١٢)ی پێغەمبەرێتیدا ، بەرامبەر بە ساڵی (٦١٢)ی زایین بوونە (١٢) پیاو ، پێنج کەسیان لەو شەش کەسە بوون کە پێشتر پەیوەندیان کردبوو بە پێغەمبەرەوە لە ساڵی رابوردوودا . شەشەمیان کە ئامادە نەبوو (جابر)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (رئاب) بوو . لەگەڵ حەوت کەسی تر کە بریتی بوون لە :

١. (معاذ)ی کوڕی (الحارث) ، (إبن العفراء) لە ( بنی النجار) خەزرەجی
٢. (ذکوان)ی کوڕی (عبد القیس) لە (بنی زریق) خەزرەجی
٣. (عبادە)ی کوڕی (صامت) لە (بنی غنم) خەزرەجی
٤. (یزید)ی کوڕی (ثعلبة) هاوپەیمانی (بنی غنم) خەزرەجی
٥. (العباس)ی کوڕی (عبادە)ی کوڕی (حنظلة) لە (بنی سالم) خەزرەجی
٦. (أبوالهیثم)ی کوڕی (التیهانی) لە(بنی عبد الأشهل) ئەوسی
٧. (عویم)ی کوڕی (ساعدە) لە (عمرو بن عوف) ئەوسی

دوانەکەی کۆتایی لە (ئەوس) و ئەوانی تریش لە خێڵی (خەزرەج) بوون[١].

ئەمانە لە (عەقەبە)ی (مینا)دا وەك بەیعەتی ژنان کە لەفەتحی مەککەدا دابەزی ، بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر ﷺ.

بوخاری لە(عبادە)ی کوڕی (صامت)ەوە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: وەرن ، بەیعەتم بدەنێ کە هاوەڵ بۆ خودا پەیدا نەکەن و دزی نەکەن و زینا نەکەن و ڕۆڵەکانتان نەکوژن و بوختانی دەست و داوێن هەڵنەبەستن و لەهیچ چاکەیەکدا سەرپێچیم نەکەن ، هەرکەسێك لەئێوە وادەی خۆی بردەسەر ئەوە پاداشتی لەسەرخوایە ، هەرکەسێکیش سنووری یەکێك لەوانە ببەزێنێت و لە دونیادا سزابدرێت دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکەی ، هەرکەسێکیش سنووری بەزاندو خودا بۆی

---

[١] / رحمة للعالمین ١/٨٥ . إبن هشام ١/٤٣١،٤٣٢،٤٣٣.

پۆشی ئەوا کاروبارو سەرەنجامی بۆلای خوا دەبێت ، ئەگەر ویستی سزای دەدات ، ئەگەر ویستیشیی لەسەر بوو لێی خۆش دەبێت ، فەرمووی : بەیعەتیان پێدا . لە ڕوو نوسێکی تردا دەڵێت : . لەسەر ئەوە بەیعەتمان پێدا[1].

## نوێنەری ئیسلام لە مەدینەدا

پاش ئەوەی بەیعەت تەواوبوو وەرزی حەجیش کۆتایی هات ، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو بەیعەتدەرانەدا یەکەم نوێنەری خۆی نارد بۆ (یثرب) ، بۆ ئەوەی شەریعەتی ئیسلام فێری موسوڵمانەکانی (یثرب) بکات و لەئاییندا شارەزایان بکات و هەستێت بە بلاْو کردنەوەی ئیسلام لەنێوان ئەو کەسانەدا کەهێشتا لەسەر شیرك مابوونەوە ، بۆ ئەو مەبەستەش گەنجێك لە گەنجە موسوڵمانە سەرەتاییەکانی نارد ، ئەویش (مصعب) ی کوڕی (عمیر)ی (عبدری) بوو ﷺ.

## سەرکەوتنێکی کەم وێنە

(مصعب)ی کوڕی (عمیر) لەماڵی (أسعد)ی کوڕی (زرارە) دابەزی ، بە لێبڕانێکی زۆرەوە دەستی کرد بەبلاْوکردنەوەی ئیسلامەتی لەناو خەڵکی (یثرب) دا ، تا بە پیاوە قورئان خوێنەکە ناسرا.

یەکێك لەجوانترین ئەوحاڵەتە سەرکەوتوانەی لەبانگەوازەکەیدا دەیگێڕنەوە ئەوەیە ، جارێکیان (أسعد)ی کوڕی (زرارە) بردیە دەرەوە بەرەو ماڵی (بنی عبدالأشهل) و (بنی ظفر)، چوونە ناوباخێکی (بنی ظفر)ەوە ، لەسەردەمی بیرێك دانیشتن ناوی بیری (مرّە) بوو، چەند پیاوێکی موسوڵمانیان لەدەور خڕ بوەوە . (سعد)ی کوڕی (معاذ) و (أسعد)ی کوڕی (حضیر) کە لەوکاتەدا لەسەر باوەڕی شیرك بوون . کە ئەم دووانە بەمەیان زانی (سعد) بە (أسید)ی وت: ئادەی بڕۆ بۆلای ئەو دوو پیاوە کە هاتوون لاوازو کەم دەستەکانمان گێل بکەن و پیایاندا هەڵبشاخێ و ، ڕێگەیان مەدە جارێکی بێنەوە ماڵەکەمان ، (أسعد)ی کوڕی (زرارە) کوڕی پورمە لەبەر ئەو ناتوانم ، ئەگەر وانەبوایە خۆم دەڕۆشتم.

(أسید) ڕمەکەی هەڵگرت بەرەو ڕوویان چوو ، کاتێك (أسعد) بەدی کرد وتی بە (مصعب): ئەوە گەورەی هۆزەکەیەتی دێتەلات ڕاستگۆیانە هەمووشتێکی پێ بڵێ .

---

[1] / صحيح البخاري ، باب بعد حلاوة الإيمان ٧/١، باب وفود الأنصار ١/٥٥٠،٥٥١، واللقط من هذا الباب ، وباب قوله تعالى: إذا جاءك المؤمنات ٢/٧٢٧، باب الحدود كفارة٢/١٠٠٣.

(مصعب) وتی: ئەگەر دانیشت قسەی لەگەڵدا دەکەم ، (أسید) هات و بەسەریانەوە وەستاو دەستی کرد بەقسە پیۆتنیان و وتی : چی ئێوەی هێناوەتە ئێرە؟ دەتانەوێت لاوازەکانمان فریو بدەن ؟ ئەگەر خۆتان خۆشدەوێت دور کەونەوە ، (مصعب) پێی وت : دانیشەو گوێمان لێ بگرە ، ئەگەر بەدڵت بوو وەری بگرە ، ئەگەر بەدڵیشت نەبوو چی دەکەیت بیکە، (أسید) وتی: باشت وت ، پاشان ڕمەکەی چەقاند بەزەیداو دانیشت، (مصعب) لەبارەی ئیسلامەوە قسەی بۆ کردو ، قورئانی بۆ خوێندەوە ، دەڵێت : سوێند بەخودا . پێش ئەوەی قسە بکات ئیسلامەمان لە ڕواڵەت و گەشی و بەدەمەوە هاتنیدا دەبینی . پاشان وتی: ئەم وتانە چەند جوان و شیرینن ؟ ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بڕواتە ناو ئەم ئایینەوە چی دەکات ؟

پێیان وت : خۆت بشۆ ، جلەکانت پاکژکەرەوە ، پاشان شایەتومانی هەق بهێنە ، پاشان دووڕکات نوێژ بکە ، هەستا خۆی شۆردو ، جلەکانی پاك کردەوەو ، شایەتومانی هێناو ، دووڕکات نوێژی کردو ، پاشان وتی: پیاوێکی ترم لەگەڵدایە ئەگەر شوێناتن بکەوێت ، یەك کەسی خێڵەکەی نامێنێت شوێنتان نەکەوێت ، ئێستا ڕێگەتان نیشان دەدەم بۆ لای ئەو پیاوە . (سعد بن معاذ) ە . ڕمەکەی هەڵگرت و چوو بۆلای (سعد) لەناو خێڵەکەیدا بوو ، لەناو کۆڕیاندا دانیشتبوون، (سعد) وتی: سوێندبێت ئەم ڕەنگ و ڕووەی (أسید) ئەوە نەبوو کەپێیەوە ڕۆشت لای ئێوە.

کاتێك (أسید) گەیشتەوە کۆڕەکە (سعد) پێی وت: ئەرێ چیت کرد؟ وتی: قسەم کرد لەگەڵ هەردووکیاندا ، هیچ شتێکی وەهام لێ نەبینین ، ڕێگەم لێ گرتن وتیان : چی دەڵێیت وادەکەین .

بۆیان گێڕامەوە کە (بنی حارثة) چوون بۆ (أسعد)ی کوڕی (زرارە) تا بیکوژن . لەبەر ئەوەی دەیانزانی کە ئەو پورزای تۆیە . تا تۆڵەت لێ بکەنەوە ، ئیدی (سعد) هەستاو تووڕە بوو ، ڕمەکەی هەڵگرت و ، چوو بۆیان ، کاتێك کە هەردووکیان بینی بەئارامیی دانیشتبوون ، زانیی کە (أسید) ویستویەتی گوێیان لێ بگرێت ، بەسەر سەریانەوە وەستاو دەستیکرد بەقسە پیۆتنیان ، پاشان وتی: بە (أسعد)ی کوڕی (زرارە):. (أبو امامة) ، سوێند بێت بەخوا ئەگەر خزمایەتی نێوانمان نەبوایە ئەوەم لێ قەبوڵ نەدەکردی ، ئایا تۆ کەسێك دەهێنیتە ماڵمان کە ئێمە پێمان خۆش نیە ؟

پێشتریش (اسعد) بە (مصعب)ی وتبوو: سوێند بە خوا ، پیاوێك بەڕێوەیە خێڵێك شوێنی کەوتون ، ئەگەر ئەمە شوێنت بکەوێت هیچ کەسێکی خێڵەکەی دوا ناکەوێت ، (مصعب) وتی بە (سعد)ی کوڕی (معاذ): دادەنیشی قسەت بۆ بکەین ؟

ئەگەر پێت خۆش بوو قایل بە ، ئەگەر پێشت خۆش نەبوو ڕەتی کەرەوە ، (سعد) وتی: قسەیەکی باشت کرد ، پاشان دەستی خستە سەر ڕمەکەی و دانیشت و ، (مصعب) باسی ئیسلامی بۆ کردو ، قورئانی بەسەردا خوێندەوە ، دەڵێت: سوێند بە خوا پێش ئەوەی بێتە گۆ ئیسلامەتیمان لە ڕواڵەت و بەدەممەوە هاتنیدا بینی ، پاشان وتی: ئەریٚ ئێوە چی‌دەکەن ئەگەر موسوڵمان ببن وتیان: خۆت دەشۆریت و ، جلەکانت پاکژ دەکەیتەوە پاشان شایەتومانی هەق دەهێنیت ، پاشان دوو ڕکات نوێژ دەکەیت ، ئەویش وەهای کرد.

پاشان ڕمەکەی هەڵگرت و چووەوە بەرەو کۆڕەکەی ، کە بینیان وتیان : سوێند دەخۆین بەخوا ئەم ڕەنگ و ڕووەی ئەوە نەبوو کە پێیەوە ڕۆشت.

کە وەستا بەسەریانەوە وتی : ئەی خێڵی (عبد الأشهل) ، ئایا ئێوە ڕاتان بەرامبەر بە من چۆنە لەناو خۆماندا ؟ وتیان : تۆ گەورەی ئێمەیت و ڕاوبۆچونت لە هەمووومان باشترەو لە هەمووومان قسە ڕۆشتووتریت ، وتی: گوتەی ژن و پیاوتان لەسەر من حەرامە هەتاکو باوەڕ دەهێنن بە خوداو پێغەمبەرەکەی ، ئیدی پیاوو ژنیان تێدا نەما موسوڵمان نەبن ، تەنها یەك پیاو نەبێت . ئەویش (أصيرم) بوو ، کە لە ڕۆژی ئوحوددا موسوڵمان بوو ، شەڕێکی باشی کردو شەهید بوو ، یەك سوژدەی بۆ خوا نەبرد بوو ، پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرمووی: ﴿ (أصيرم) ئەو پیاوە بوو کاری کەمی کردو پاداشتی زۆری پیٚ بڕا ﴾.

(مصعب) لە ماڵەکەی (أسعد)ی کوڕی (زرارە)دا مایەوەو خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئایینی ئیسلام ، تا وای لیٚهات ماڵی (انصار)ەکان نەما پیاوو ژنی موسوڵمانی تێدا نەبێت ، جگە لەماڵی (بنی أميه)ی کوڕی (زيد) و (خطمة) و (وائل) ، کە (قيس)ی کوڕی (أسلت)ی شاعیریان تێدا بوو . هەمویان بەگوێیان دەکرد . نەیهێڵا موسوڵمان ببن هەتا ساڵی شەڕی خەندەق کە ساڵی پێنجەمی کۆچییە.

پێش هاتنی وەرزی حەجی داهاتوو . واتە حەجی ساڵی سیانزەهەم . (مصعب) ی کوڕی (عمیر) گەڕایەوە بۆ مەککە ، مژدەی سەرکەوتنی دا بە پێغەمبەر ﷺ و بەسەرهاتی خێڵەکانی (يثرب)ی بۆ گێڕایەوەو باسی بەهرەی چاك و هێزو لێهاتنی خەڵکی شارەکەی بۆ کرد[1].

[1] / إبن هشام ٤٣٥/١ ، ٤٣٦ ، ٤٣٧ .. ٢ / ٩٠، هەروەها (زاد المعاد) ٥١/٢.

## بەیعەتی عەقەبەی دووەم

لەوەرزی حەجی ساڵی سیانزەهەمی پێغەمبەرێتیدا - یۆنیۆی ساڵی ٦٢٢ زایین - حەفتاو ئەوەندە کەس لەموسوڵمانەکانی (یثرب) هاتن بۆ حەج، لەگەڵ حاجیە موشریکەکانی خێڵەکانیاندا هاتبوون ، ئەو موسوڵمانانە لەنێوان خۆیاندا پرسیاریان دەکرد . کاتێك کە لە (یثرب) بوو یان هێشتا لە ڕێگەدا بوون . داخۆ تاکەی بێدەنگ بین لەوەی پێغەمبەر ﷺ بەناو شاخەکانی مەککەدا بگەڕێت و دەربکرێت و بترسێت ؟

کە گەیشتنە مەککە لەنێوان ئەوان و پێغەمبەردا ﷺ چەند پەیوەندیەکی نهێنی ئەنجامدرا، بووەهۆی ڕێککەوتنی هەردوولا لەسەرئەوەی لەڕۆژانی (تشریق) دا لەو شیوەدا کۆببنەوە کە دەکەوێتە (عەقەبە) لای (حجرە)ی یەکەمی (مینا)وە ، بەمەرجێك ئەو دانیشتنە لەتاریکی شەوداو بەنهێنیەکی تەواو ئەنجام بدرێت.

بالێگەڕێین سەرکردەیەکی ئەنساریی وەسفی ئەو کۆبوونەوە مێژووییەمان بۆ بکات ، کە ڕەوگەی خۆی لە ڕۆژانی ململانێی نێوان بتپەرستی و ئیسلامدا گۆڕی ، (کعب)ی کوڕی (مالك)ی ئەنساری ﷺ دەڵێت:

{چووین بۆ حەج کردن ، ژوانمان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە عەقەبەدا لە ناوەندی ڕۆژانی (تشریق)دا ئەوشەوە هاتە پێشەوە کە بەڵێنمان دابوو تیایدا بە پێغەمبەر ﷺ بگەین ، (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (حرام)مان لەگەڵدابوو ، کە یەکێك بوو لە گەورەو پیاوماقوڵەکانمان ، لەگەڵ خۆماندا بردمان . ئێمە ئەم مەسەلەیەمان لە هەموو موشریکانی خێڵەکەمان شاردبۆوە . قسەمان لەگەڵیدا کردو پێمان وت: (أبو جابر): تۆ یەکێکیت لە گەورەکانی ئێمەو، پیاوماقوڵێکی ناومانی ، پێمان خۆش نیە بەو حاڵەتەییت و ببیتە سووتەمەنی دۆزەخ ، پاشان بانگمان کرد بۆ ئایینی ئیسلام و هەواڵی پێگەیشتنمان دایە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە عەقەبە ، دەستبەجێ موسوڵمان بوو، لەگەڵمان هات بۆ عەقەبەو، یەکێك بوو لە نەقیبەکان }.

(کعب) دەڵێت: ئەو شەوە لەگەڵ خێڵەکەماندا لەناو کاروانەکەدا نوستین ، تاسێیەکی شەو تێپەڕی لەکاروان دەرهاتین بەرەو ژوانەکەی پێغەمبەر ﷺ بەڕێ کەوتین، بەدزیەوە وەك پشیلە دەربازبوین ، تاهەمووومان لەشیوەکەی (عەقەبە)دا کۆ بوینەوە ، ئێمە حەفتاو سێ پیاوو دوو ژنیشمان لەگەڵدابوو ، کەبریتی بوون لە (نسیبە)ی کچی (کعب) - دایکی عەمارە - لەخێڵی (مازن)ی کوڕی (نجار)و (أسماء)ی کچی (عمرو) - دایکی منیع - لەخێڵی (سلمه).

له شیوەکەدا کۆبووینەوە و چاوەڕوانی پێغەمبەرمان دەکرد ، هەتا تەشریفی هێناو، (عباس)ی کوڕی (عبد المطلب)ی مامی لەگەڵدابوو ، کە هەتا ئەوکاتە لەسەر ئایینی شیرك بوو . بەڵام حەزی دەکرد کە ئامادە ببێت بۆ کاری برازاکەی و ، لێی دڵنیابێت و ، یەکەم کەسیش بوو قسەی کرد[1].

## سەرەتای گفتوگۆ و لێکدانەوەکەی (العباس) بۆ مەترسی بەرپرسیارێتیەکە

پاش ئەوەی ژمارەی ئامادەبوان تەواوبوو قسەوباسەکان بۆ بەستنی هاوپەیمانی ئایینی و سەربازیی دەستی پێکرد، یەکەم کەسێك قسەی کرد (العباس)ی کوڕی (عبد المطلب) بوو ، کە مامی پێغەمبەرە ﷺ ، دەستی کرد بە قسەکردن بۆ ئەوەی ڕاشکاوانە . باسی مەترسیێتی ئەو بەر پرسیارێتیە بکات ، کە دەخرێتە سەرشانیان لە ئاکامی ئەم هاوپەیمانێتیەدا ، وتی :

{ ئەی گرۆی خەزرەج – لەو کاتەدا بە (أنصار)مان دەوت (خزرج) – بە (خەزرەج) و (أوس)یشەوە ، ئێوە دەزانن کە موحەممەد کەسی ئێمەیە ، نەمانهێلاوە کەسێك لەوانەی لەسەر ئەم بیروباوەڕەی ئێمەیە دەستدرێژی بکاتە سەری ، ئەم لەناو خێڵەکەیدا سەربەرز پارێزراوە ، ئەم بۆ خۆی حەزی بەهاتنە لای ئێوەیە ، ئەگەر ئێوە ئەزانن کە دەتوانن ئەو بەڵێنەی پێتانداوە بیبەنە سەرو، ڕێ لە نەیارەکانی بگرن و، ئەوە فەرموو بەرپرسیارێتی لەسەر شانی خۆتانە ، ئەگەر دەشزانن کە تەسلیمی دەکەن و پاش دەرچوونتان لێرە سەری شۆڕدەکەن ئەوا هەر لەئێستاوە وازی لێبهێنن ، چونکە لەناو خزم وحاڵی خۆیدا سەربڵندو پارێزراوە }.

(کعب) وتی: پێمان وت : هەرچیەکت وت گوێمان لێ بوو، پێغەمبەری خوا ئێستا جەنابت بفەرموو ، بۆ خۆت و خودای خۆت چیت پێ خۆشە ئەوە بکە[2].

ئەم وەڵامە بەڵگەیە لەسەرئەو بڕیارو لێبڕان و ئازایەتی و باوەڕو دڵسۆزیەی ئەنسار لە بەرگەگرتنی ئەو بەرپرسیارێتیە گەورەیەو، چونە ژێرباری ئاکامە ترسناکەکەیدا هەیانبوە

پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ ڕونکردنەوەی خۆی بۆدان و، بەیعەت ئەنجامدرا.

---

[1] / إبن هشام ١/٤٤٠،٤٤١.

[2] / هەمان سەرچاوە ١/٤٤١،٤٤٢.

## بەندەکانی بەیعەتەکە

پێشەوا ئەحمەد لە (جابر)ەوە بەدووروودرێژی دەگێڕێتەوە ،
جابر دەڵێت: وتمان: پێغەمبەری خودا ، لەسەر چی بەیعەتت پێ بدەین ؟
فەرمووی :

١. لەسەر بەگوێ کردن لە خۆشی و ناخۆشیدا .
٢. لەسەر خەرجی کێشان لە بوون و نەبونیدا.
٣. لەسەر فەرمان کردن بەچاکە و نا کردن لە خراپە.
٤. لەسەر ئەوەی کار بۆ خودا بکەن و ، گوێ لە قسەی لۆمەکاران نەگرن.
٥. لەسەر ئەوەی ئەگەر هاتمە لاتان پشتیوانیم لێ بکەن ، بەرگریم لێبکەن لەوەدا کە بەرگری دەکەن لەخۆتان و هاوسەرانتان و ڕۆڵەکانتان ، لەپای ئەوەدا بەهەشت هی ئێوەیە}[1].

لەگێڕانەوەکەی (کعب)دا – کە (إبن إسحاق) دەیگێڕێتەوە – لە بەندی کۆتاییدا (کعب) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کرد ، قورئانی خوێندەوەو ، بانگەشەی کرد بۆ لای خودا ، خەڵکی هاندا بۆ ئیسلامەتی ، پاشان فەرمووی: لەسەر ئەوە بەیعەتتان لەگەڵ دەبەستم کە بەرگریم بکەن لەوەدا بەرگریی لە ماڵ و منالی خۆتان دەکەن ، دەستبەجێ (البراء)ی کوڕی (معرور) دەستی هێناو وتی: بەڵێ، بەو کەسەی تۆی بەڕاستی کردووە بەپێغەمبەر بەرگریت لێ دەکەین وەك چۆن بەرگری لەخۆمان دەکەین ، ئەی پێغەمبەر بەیعەتمان لەگەڵ ببەستە ، سوێند بەخوا ئێمە پشتاوپشت کوڕانی جەنگ و شەڕ بوین.

(أبو الهیثم)ی کوڕی (التیهان) قسەکەی بە (البراء) بڕی و وتی: پێغەمبەری خودا ، لەنێوان ئێمەو جولەکەدا بەڵێننامەیەك هەیە ، ئەگەر ئەوان پچڕاندیان و ئێمەش لەگەڵ تۆدابین ، ئایا وازمان لێ ناهێنیت و بگەڕێیتەوە بۆ ناو خزمەکانت؟

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد ، پاشان فەرمووی: خوێن بە خوێنە ، وێرانکاری بەوێرانکاریە ، من لەئێوەم و ئێوەش لە منن ، جەنگ دەکەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ئێوە جەنگی لەگەڵدا دەکەن ، ئاشتی دەکەم لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ئێوە ئاشتی لەگەڵدا دەکەن[2].

---

[1] / ئیمامی ئەحمەد بە (إسناد)ێکی (حسن) ڕیوایەتی کردوە، (الحاکم) و (إبن حبان) بەڕاستیان زانیوە. بڕوانە (مختصر سیرە الرسول)، شێخ عەبدوڵلای نەجدی ل١٥٥، هەروەها (إبن إسحاق) ڕیوایەتێکی لەو شێوەیە لە (عبادە بن صامت)ەوە دەگێڕێتەوە. دێڕێکی زیادەی تێدایە، (وهو أن لا ننازع الأمر أهله) بڕوانە (إبن هشام) ١/٤٥٤.
[2] / إبن هشام ١/٤٤٢.

## جەختکردنەوە لەسەر مەترسیداریێتی بەیعەتەکە

پاش ئەوەی قسەوباس کرا لەسەر مەرجەکانی بەیعەتەکەو بڕیاریاندا لەسەر مۆرکردنی ، دوو پیاو هەستان لەوانەی کە نەوەی یەکەمی موسوڵمانەتی بوون و لە ساڵی (١١) و (١٢)ی پێغەمبەرێتیدا موسوڵمان بووبوون ، یەك لەدوای یەك هەستان ، بۆئەوەی هەریەکەیان ترسناکێتی مەسەلەکە بۆ ئەو خەڵکە ڕوون بکەنەوە ، تا بەبەرچاو ڕوونیەکی تەواو نەبێت بەیعەتی پیٚنەدەن و هەتا بشزانن کە ڕادەی قوربانی دانی ئەو خەڵکە چەندێکەو لەوەش دڵنیا بن.

(إبن إسحاق) دەڵێت : کاتێك کۆبوونەوە بۆ بەیعەتدان (العباس)ی کوڕی (نضلة) وتی: ئەریٚ ئێوە دەزانن لەسەر چی بەیعەت دەدەن بەو پیاوە ؟

وتیان : بەڵێ ، وتی: ئێوە بەیعەتی دەدەنێ لەسەر شەڕکردن لەگەڵ ڕەش و بۆری خەڵك ، ئێوە ئەگەر وادەزانن تاڵانکردنی ماڵتان کارەساتەو بەکوژرانی پیاوماقوڵانتان دەستبەجێ دەیدەنەوە دەست کافران ، ئەوە سوێند بەخوا ئەگەر وابکەن سەر شۆڕیی دونیاو قیامەت دەبینن ، خۆ ئەگەر وادەزانن بەڵێن دەبەنەسەر سەرباری لەناوچونی ماڵ و سامان و کوژرانی پیاوماقوڵان . ئەوا دەست بدەنە دەستی ، چونکە بەڕاستی سوێندم بەخودا خێری دونیاو ئاخیرەتی تێدایە.

وتیان: ئێمە سەرباری کارەساتی ماڵ و سامان و کوژرانی پیاوماقوڵان بەیعەت دەدەین ، ئەی پێغەمبەر ، ئەگەر ئێمە وەفاداریمان هەبێت چیمان بە چارەنووس دەبێت ؟

فەرمووی: (بەهەشت) ، وتیان دەستت بهێنە ، دەستی درێژ کرد ، هەموویان بەیعەتیان پێدا[1].

لەگێڕانەوەکەی (جابر)دا هاتوە ، فەرمووی : هەستاین بەیعەتی بدەینێ ، (أسعد)ی کوڕی (زرارە) کە لەو حەفتا کەسە کەم تەمەنتر بوو دەستی پێغەمبەری گرت ﷺ و وتی: خەڵکی (یثرب) بە کاوەخۆ ، ئێمە پشتی وشترەکانمان نەشکاندوە کەچوین بۆلای مەگەر زانیومانە کە ئەو پێغەمبەری خوایە ، دەرکردنی ئەو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا خۆ جیا کردنەوەیە لە هەموو عەرەب و ، کوژرانی باشەکانتان و ، شمشێرەکان دەتانبڕن و ، ئەگەر دان بەخۆدا دەگرن لەسەر ئەوانە فەرمون بەیعەتی بدەنێ و ، پاداشتان لای خودایە ، یان ئەوەیە لەخۆتان دەترسن ئەوە وازی لێ بهێنن ، ئەمە دەبێتە دەرفەت بۆتان لە لای خوا[2].

---

[1] / هەمان سەرچاوە ١/٤٤٦.

[2] / ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوە لە فەرمودەیەکی (جابر)ەوە.

## بەستنی بەیعەتەکە

پاش دانپێدانانی بەندەکانی بەیعەتەکەو ، پاش ئەو جەختکردنەوەو دڵنیا بوونە ، ئیدی بەستنی بەیعەتەکە بە تەوقە دەستی پێکرد – (جابر) – پاش ئەوەی قسەکەی (سعد)ی کوڕی (زرارە)ی گێڕایەوە، وتیان : ئەی (أسعد) دەستتمان لەسەر لابدە . سوێند بەخوا واز لەم بەیعەتە ناهێنین و ، بەجێی ناهێڵین[1].

ئیدی (أسعد) زانی کەڕادەی ئامادەیی خەڵکەکە چەندە بۆ قوربانیدان لەو ڕێگەیەیەداو لەوە دڵنیابوو ، . ئەم بۆخۆی بانگخوازێکی گەورەبوو ، لەگەڵ (مصعب)ی کوڕی (عمیر)دا بوو ، بێگومان سەرۆکی ئایینی ئەو بەیعەتدەرانە بوو . یەکەم کەس بوو بەیعەتی‌دا . (إبن إسحاق) دەڵێت : (بنو النجار) دەڵێن (ابو امامه) واتە (أسعد)ی کوڕی (زرارە) یەکەم کەس بوو دەستی هێنا بۆ بەیعەت[2].

پاش ئەوەش بەیعەتە گشتیەکە دەستی پی‌کرد ، (جابر) دەڵێت : پیاو لەدوای پیاو هەڵدەستاین و بەیعەتمان لێ وەردەگیرا پێغەمبەریش ﷺ لەپای ئەوەدا بەڵێنی بەهەشتی پێدەداین[3].

بەڵام بەیعەتی هەردوو ژنەکە کە ئەو ڕووداوەیان بینی تەنها بەگفت بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز تەوقەی لەگەڵ هیچ ژنێکی بێگانەدا نەکردوە[4].

## دوانزە نەقیبەکە

پاش ئەوەی بەیعەت تەواوبوو پێغەمبەر ﷺ داوای هەڵبژاردنی (١٢) سەرۆکی کرد بۆ ئەوەی ببنە نەقیب بەسەر کەسەکانیانەوەو، بۆ ئەوەی لەجیاتی ئەوان بەندەکانی ئەم بەیعەتە جێبەجێ بکەن ، وتی بەخەڵکەکە: ئادەی دوانزە کەسم لە خۆتان بۆ بهێننە دەرەوە تا ببنە نەقیب بەسەرتانەوە.

دەستبەجێ هەڵبژێرران ، بریتی بوون لە (٩) کەسی خەزرەجی و (٣) کەسی ئەوسی ، ئەمەش ناوەکانیانە:

## نەقیبەکانی خەزرەج

١. (أسعد)ی کوڕی (زرارە)ی کوڕی (عدس).
٢. (سعد)ی کوڕی (ربیع)ی کوڕی (عمر).

---

[1] / هەمان سەرچاوە.
[2] / (إبن إسحاق) دەڵێ: (بنو عبدالأشهل) دەڵێن: بەڵکو (أبوالهیثم بن التیهان) بوە، هەروەها (کعب)ی کوڕی (مالك) دەڵێ: بەڵکو(البراء)ی کوڕی (معرور) (إبن هشام١/٤٤٧) دەڵێم: لەوانەیە ئەوان ئەو گفتوگۆی بەیعەتەیان حلێب کردبێ ، وەگەرنا باشترین کەسێ بۆ پێش خستن لەو شوێنەدا (أسعد)ی کوڕی (زرارە)یە، (والله أعلم).
[3] / (مسند) ی ئیمامی ئەحمەد.
[4] / سەیرکە (صحیح مسلم) باب (کیفیة بیعة النساء) ٢/١٣١.

٣. (عبدالله)ی کوڕی (رواحه)ی کوڕی (ثعلبة).
٤. (رافع)ی کوڕی (مالك)ی کوڕی (عجلان).
٥. (البراو)ی کوڕی (معرور)ی کوڕی (صخر).
٦. (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (حرام).
٧. (عبادە)ی کوڕی (الصامت)ی کوڕی (قیس).
٨. (سعد)ی کوڕی (عبادە)ی کوڕی (دلیم).
٩. (المنذر)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (خنیس)

## نەقیبەکـانی ئەوس

١. (أسید)ی کوڕی (حضیر)ی کوڕی (سماك).
٢. (سعد)ی کوڕی (خیثمة)ی کوڕی (حارث).
٣. (رفاعه)ی کوڕی (عبد المنذر)ی کوڕی (زبیـر)[1].

کاتێك ئەم نەقیبانە هەڵبژێرران پێغەمبەر ﷺ بەڵێننامەیەکی تری لێ وەرگرتن ، بەو سیفەتەی کە سەرۆك و بەرپرسن.

هەروەها پێی فەرموون : ئێوە وەك کەفالەتیی حەوارییەکانی (عیسا)ی کوڕی (مەریەم) دەبنە کەفیلی سەر گەلەکەتان ، منیش کەفیلی ئوممەتەکەی خۆمم . واتە موسوڵمانەکان . وتیان : بەڵێ وایە[2].

## فێڵبازێك پەیماننامەکە ئاشکرا دەکات

کاتێك کە پەیماننامەکە بەسترا ، خەڵکەکە خەریك بوو بڵاوەیان لێ دەکرد ، فێڵبازێك قاوی لێدان ، ئەو ئاشکرا کردنە لە کاتی دواساتی دانیشتنەکەدا بوو ، نەدەکرا هەموو سەرکردەکانی قورەیشیی بەنهێنی پێ ئاگاداربکرێت تا لەناکاودا لەناو شێوەکەدا بدەن بەسەر موسوڵمانەکاندا ، ئەو فێڵبازە چووە سەرگردۆلکەیەك و بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: ئەرێ خەڵکی شار ، بۆ نایەن بۆ سەیری موحەممەدو شوێنکەوتوانی ؟ ئەوەتا بۆ جەنگی ئێوە کۆبوونەتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : { ئەوە دڕندەکەی عەقەبەیە ، سوێندم بەخودا کە دەستم بەتاڵ بوو ئەوجا دەزانم چیت بەسەردەهێنم } پاشان فەرمانیدا بە پەیماندەرەکان بڵاوەی لێ بکەن بەرەو کاروانەکانیان[1].

---

[1] / وتراوە لە جیاتی (رفاعه) ، ( ابو الهیثم)ی کوڕی (التیهان) بوە.
[2] / إبن هشام ١/٤٤٣، ٤٤٤، ٤٤٦ .

## ئامادەگی ئەنسارەکان بۆ لێدانی قورەیش

کاتێك دەنگی ئەم فێڵبازە کەوتە بەرگوێ، (عباس)ی کوڕی (عبادە)ی کوڕی (نضلة) وتی: سوێندم بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە ، ئەگەر ئارەزوو بکەیت سبەینێ بە شمشێرەکانمان ئەدەین بەسەر خەڵکی (منی)دا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {ئێمە هێشتا فەرمانی ئەوەمان پێ نەدراوە ، بەڵام ئێوە بگەڕێنەوە بۆ مەنزڵگاکانتان} ئیدی ئەوانیش گەڕانەوەو نووستن هەتا بەیانی[2].

## قورەیش نارەزایی دەردەبڕێت بۆ سەرۆکەکانی (یثرب)

کاتێك ئەم هەواڵە کەوتە بەرگوێی قورەیشەکان ، تووڕەی کردن و تووشی خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێی کردن ، چونکە ئەوان دەیانزانی کە ئاکامی ئەوجۆرە بەیعەتانە چی دەبێت ، دەشیانزانی ئەنجامەکانی بۆ ماڵ و گیانیان چەندە خراپ دەبێت ، بۆیە هەر کەڕۆژ بووەوە شاندێکی گەورەی سەرکردەو لەخوا یاخیەکانی مەککە بەرەو خێوەتگاکانی (یثرب) بەرێ کەوتن ، بۆ ئەوەی نارەزایی توندی خۆی لەسەر ئەو پەیماننامەیە بخاتە روو بۆیان ، شاندەکە وتی :

خێڵی خەزرەج ، هەواڵمان پێگەیشتوە کە ئێوە هاتوون بۆلای ئەو پیاوەی خزمی ئێمە ، بۆ ئەوەی لەژێر دەستی ئێمە دەری بکەن و بەیعەتی بدەنێ بۆ جەنگ کردن لەگەڵماندا ، ئێمەش سوێندتان بۆ دەخۆین کام خێڵی عەرەب هەیە حەز ناکەین بەئەندازەی ئێوە ناخۆشیی بکەوێتە نێوانمانەوە[3]، لەکاتێکدا موشریکە خەزرەجیەکان هیچیان لەبارەی ئەم بەیعەتەوە نەدەزانی ، چونکە لەکەشێکی نهێنی تەواوداو لەنێوە شەودا ئەنجام درابوو ، ئەو موشریکانە کەوتنە سوێند خواردن: کە هەرگیز شتی وانەبوە و، ئێمە پێمان نەزانیوە ، هەتا هاتنە لای (عبدالله)ی کوڕی (ابی)ی کوڕی (سلول) ، ئەو وتی: ئەمە قسەیەکی پووچە ، شتی وانەبوە ، خێڵەکەی من ناکرێت شتی وەها بکەن ، ئەگەر من لە (یثرب) بومایە خێڵەکەم بەبێ پرسی من شتی وەهایان نەدەکرد.

موسوڵمانەکانیش سەیری یەکتریان دەکردو ، خۆیان بێدەنگ کرد ، هیچ یەکێکیان بە بەڵێ یان نەو وەڵامیان نەدانەوە.

ئیدی سەرکردەکانی قورەیش باوەڕیان کرد بەموشریکان و بە نائومێدی گەڕانەوە.

---

1 / زاد المعاد ٢/٥١.

2 / إبن هشام ١/٤٤٨.

3 /هەمان سەرچاوە ١/٤٤٨.

## دڵنیابوونی هەواڵەکە لای قورەیش و ڕاوەدونانی بەیعەتدەران

سەرکردەکانی قورەیش خەریکبوو تەواو باوەڕیان دەکرد کە هەواڵەکە درۆیە ، گەڕانەوە بۆ مەککە ، بەڵام هەر سوسەیان دەکردو بەشوێنیدا دەچوون و لێی ورد دەبونەوە . تابۆیان ساغ بوەوە کەهەواڵەکە ڕاستەو بەیعەتەکەش بەکرداری ڕووی داوە ، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە حاجیان بەرەو شوێنی خۆیان گەڕابوونەوە ، ئیدی سوارەکانیان کەوتنە شوێن (یپرب)ی‌یەکان ، بەڵام پاش ئەوەی لەدەست دەرچوو بوون ، بەڵام توانیان (سعد)ی کوڕی (عبادە) و (المنذر)ی کوڕی (عمرو) بەدی بکەن ، شوێنیان کەوتن ، (المنذر) هەلات ، بەڵام (سعد) یان گرت ، بەقەیتانی نەعلەکانی دەستیان بەگەردنیەوە بەستەوە ، دەستیانکرد بەلێدانی و بەقژی سەری ڕایانکێشا تا کردیان بەناو مەککەدا ، لەو کاتەدا (مطعم)ی کوڕی (عدی) و (الحارث)ی کوڕی (حرب)ی کوڕی (امیە) هاتن و ڕزگاریان کرد لەدەستیان . چونکە (سعد) کاروانەکانی ڕێگەی مەدینەی بۆ پەنادەگرتن کاتێك ئەنساریەکان سەیریان دەکرد وا (سعد) دیار نیە پرس و ڕایان کرد کە بەدوایدا بگەڕێنەوە ، لەم کاتەدا لێیانەوە دەرکەوت ، ئیتر بە یەکەوە گەیشتنەوە مەدینە[1].

ئەمە بەیعەتی عەقەبەی دووەم بوو . کە بەبەیعەتی عەقەبەی گەورە ناسراوە، لە کەش و هەوایەکدا سازدرا کە پڕی بوو لە سۆزی خۆشەویستی و بۆ یەکتربوون و سەرجەم گردکردنی پارچەکانی تری موسوڵمانان و ، متمانەو ئازایەتی و نەبەردی لەو ڕێگەیەدا ، ئیماندارێکی خەڵکی مەدینە سۆزی دەجولاً بۆ برا ئیمانداره لاوازە مەککەییەکەی و لەسەری دەکردەوەو لە ستەمکارەکەی تووڕە دەبوو ، لەبەر خوا خۆشەویستی بۆی دەجولاً.

ئەم هەست و سۆزە بەرەنجامی ڕەوتێکی بەرگوزاری نەبوو کە پاش چەند ڕۆژێك دامرکێتەوە ، بەڵکو سەرچاوەکەی بریتی بوو لەباوەڕ بەخوداو پێغەمبەران و کتێبەکانی ، باوەڕێك لەبەردەم هەرهێزێکی زاڵم و ستەمکاردا نەجوڵێت ، بیرو باوەڕێك کە ڕەشەباکەی هەڵی کرد شتی سەیر بهێنێتە کایەوە ، بەو باوەڕە ئیمانداران توانیان لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو چەندین پرۆسە ئەنجام بدەن، چەندین شوێنەواری وەهای تێدا جێ بهێڵن ، کە لە کۆن و نوێدا هاوێنمەی نەبوو بێت و، لە داهاتووشدا مەحاڵ بێت شتی وەها ڕوو بدات.

---

[1] / زاد المعاد ٥١/٢، (إبن هشام) ٤٤٨/١، ٤٤٩، ٤٥٠.

## سەرەتاکانی کۆچ

پاش ئەوەی کە بەیعەتی عەقبەی دووەم تەواوبوو ، ئیسلامیش سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەدامەزراندنی نیشتمانێکدا بۆ خۆی لەناوەندی بیابانێکدا کە شەپۆلی دەخوارد لە کوفرو نەفامیدا . ئەویش پڕ مەترسیترین دەستکەوت بوو کە لەسەرەتای بانگەوازدا دەست ئیسلام کەوت . ئیدی پێغەمبەری خوا مۆڵەتیدا بە موسوڵمانەکان کۆچ بکەن بۆ ئەو نیشتمانە.

مانای کۆچ جگە لە بەفیڕۆدانی بەرژەوەندی و قوربانیدان بەماڵ و رزگاربوونی گیان چیدی نەبوو ، لەگەڵ هەست بەوەی کە هەموو ئەو ماڵ و سامانە تالأن دەکرێت ، سەرباری ئەگەری تیاچوون لەسەرەتا یان کۆتایی ڕێگەداو ، دەیانزانی کە بەرەو چارەنووسێکی نادیار دەڕۆن و ، لێیان ڕوون نیە کە چ دڵەڕاوکێ و ناخۆشیەك دێتە ڕێگەیان.

موسوڵمانەکان کەدەستیان کرد بەکۆچ کردن و ، ئەمانەشیان دەزانی ، موشریکانیش هەر کاتێك هەستیان بەمەترسی بکردایە هەوڵیان دەدا نەهێڵن بڕۆنە دەرەوە ، ئەمەش چەند نموونەیەکە لەوە :

١. (أبو سلمە)و هاوسەرو کوڕەکەی یەکەم کۆچکەر بوون . ساڵێك پێش عەقبەی هەرە گەورە بەپێی ڕاوو بۆچونی (إبن إسحاق) کۆچی کرد . کەویستی لە مەدینە دەربچێت ژن براکانی پێیان وت : هەقمان نیە بەخۆتەوە ، بەلأم چۆن ڕێگە دەدەین خوشکەکەمان بەریت بەرەو ولأتێکی تر؟ بۆیە ژنەکەیان لێ سەندەوە ، کەسوکاری (أبوسلمە) تووڕە بوون ، وتیان: ئێمەش ڕێگە نادەین کوڕەزاکەمان لەگەڵ ژنەکەدا بێت کە ئێوە نەهێڵن لەگەڵ کوڕەکەماندا بڕوات ، هەریەکە پەلی کوڕەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێش دەکرد ، ئەوە بوو لە ژنەکەیان سەندو بردیان ، (أبو سلمە)ش بە تەنها بەرەو مەدینە بەڕێ کەوت ، (أم سلمە)ش دوای کۆچکردنی هاوسەرەکەی و وون بونی کوڕەکەی هەموو بەیانیانێك دەچوە سارای (أبطح) تێر دەگریا تا ئێوارێ ، حاڵ و گوزەرانی بەم شێوەیە تا یەك ساڵ گوزەراند ، تا دڵی یەکێك لە خزمانی نەرم بوو ، وتی: ئەرێ ناکرێت ئەم ژنە هەژارە دەرکەن بەرەو لای مێردەکەی ؟ ئێوە جیاتان کردەوە لە مێردو منداڵەکەشی ، ئەوانیش وتیان پێی : ئەگەر پێت خۆشە بڕۆ بۆلای مێردەکەت ، (أم سلمە) هەستا کوڕەکەی لە خزمانی مێردەکەی سەندەوەو ، کەوتەڕێ بەرەو مەدینە . کۆچێك ماوەکەی پێنج سەد کیلۆمەترە . یەك بەندەی خوای لەگەڵدا

نەبوو ، تا گەیشتە ناوچەی (التنعیم) لەوێدا (عثمان)ی کوڕی (طلحة)ی کوڕی (أبی طلحة)ی بینی ، کە لەحاڵی تێگەیشت بەڕێی کرد تا گەیاندیە مەدینە ، کاتێك سەیرێکی (قباء)ی کرد پێی وت: پیاوەکەت لەو گوندەدایە، پشت بەخوا بڕۆ ناویەوە ، ئنجا خۆی بەرەو مەککە گەڕایەوە[1].

٢. کاتێك (صهیب) ویستی کۆچ بکات ، کافرانی قورەیش پێیان وت: کەهاتیتە ناومان خزمەتکارێکی کەم دەست بویت ، لەناو ئێمەدا ماڵ و سامانەکەت زۆر بوو ، گەیشتیتە ئەم حاڵەت ، پاشان دەتەوێت بەخێزان و ماڵەوە دەرچیت؟ سوێند بێت هەرگیز شتی وانابێت . (صهیب) پێی وتن: ئەگەر ماڵەکەتان بدەمێ وازم لێ دەهێنن ؟ وتیان: بەڵێ ، وتی: ئەوە منیش ماڵ و سامانەکەم بەخشی بەئێوە . ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ فەرموو بووی: بەڕاستی (صهیب) قازانجی کرد ، بەڕاستی (صهیب) قازانجی کرد[2].

٣. (عمر) ی کوڕی (خطاب) و (عیاش)ی کوڕی (أبی ربیعه) و ، (هشام) ی کوڕی (عاصی) کوڕی (وائل) ئەوانیان دانا لە شوێنێك بەیەکتری بگەن لەبەرەبەیاندا ، پاشان لەوێوە کۆچ بکەن بەرەو مەدینە ، (عمر) و (عیاش) لەکات و شوێنی دیاری کراودا بەیەکگەیشتن کەچی (هشام) دیار نەبوو.

کە گەیشتنە مەدینەو لە (قباء) دابەزین ، (أبو جهل) و (حارث)ی برای چوون بۆ لای (عیاش) کە دایکی هەرسێکیان یەکێکە . پێیان وت: دایکت ئاهی کردوە کە شانە بەر سەری نەکەوێت و نەچێتە بەر سێبەر هەتا تۆ دەبینێت ، (عیاش) دڵی نەرم بوو ، (عمر) ﷺ فەرمووی: (عیاش) سوێندم بەخوا ئەوانە دەیانەوێت لەسەر ئاینەکەت هەڵت بگێڕنەوە وریایان بە ، سوێندم بەخوا ئەگەر ئەسپێك بداتە سەری دایکت شانە هەڵدەگرێت ، سوێند بێت ئەگەر گەرمای مەککە لێی بدا ڕادەکاتە بەر سێبەر ، (عیاش) بەگوێی (عمر)ی نەکردو لەبەر سوێندەکەی دایکی لەگەڵیاندا گەڕایەوە ، (عمر) پێی وت: مادامەکی دەڕۆیتەوە ئەو وشترە هێمنە چاکەی من بەرە ، پشتی بەرنەدەیت ، ئەگەر گومانت بەشتێك برد خۆت پێ دەرباز بکە . بەسواری وشترەکە گەڕایەوە ، تاگەیشتنە نیوەی ڕێگە ، (أبو جهل) پێی وت: ئەرێ (عیاش) بەڕاستی لەسەر پشتی ئەم وشترە بێ تاقەت بووم ، سوارم ناکەیت لە پشت خۆتەوە؟

---

[1] / إبن هشام ٤٦٨/١، ٤٦٩، ٤٧٠.

[2] / هەمان سەرچاوە ٤٧٧/١.

(عیاش) وتی: بەڵێ باشە ، وشترەکەی دانیشاند ویستی لەسەری دابەزێت ، کە نزیکی زەوی بوەوە پەلاماریاندایەو دەست و قاچیان بەست ، دوای ئەوە بەرۆژی ڕووناك کردیان بەناو شاری مەککەدا دەیانوت بە خەڵك : خەڵکی مەککە ، سەرلێشێواوەکانتان ئاوا لێ بکەن ، هەروەکو ئێمە کردمان[1].

ئەمە سێ حاڵەت بوون بۆ هەرکەسێك موشریکان پێیان بزانیایە کە دەیەوێت کۆچ بکات بۆ مەدینە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك پۆل پۆل بەدوای یەکدا کۆچیان دەکرد ، پاش دوومانگ و چەند ڕۆژێك لەدوای بەیعەتی عەقەبەی گەورەوە لەناو مەککەدا جگە لە (پێغەمبەر ﷺ) و (أبوبکر) و (علی) کەس نەمابۆوە ، کە بەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە کارەکان هەڵدەستان ، مەگەر کەسێك موشریکان بیانگرتایە ، پێغەمبەریش ﷺ یاتاخ و کەل و پەلی پێچابوەوە چاوەڕوانی دەکرد تا فەرمانی پێ بکرێت بەدەرچوون ، (أبوبکر) یش کەل و پەلی ئامادە کرد[2].

(بخاری) لە (عائشە)وە دەگێڕێتەوە ، فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە موسوڵمانەکان من ماڵی کۆچەکەتانم دیوە باخی خورمای زۆری تێدایە ، هەندێك کۆچیان کرد بەرەو مەدینە ، زۆرینەی ئەوانەش کۆچیان کردبوو بەرەو حەبەشە گەڕانەوە بۆ مەدینە ، (ابوبکر)یش خۆی ئامادە کرد بەرەو مەدینە بەڕێ بکەوێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو ، جارێ پەلە مەکە ، تکادەکەم مۆڵەتم بدرێت، (أبوبکر) پێی فەرموو: دایك و بابم بە قوربانت بێت ، ئایا ئومێد دەکەیت کە مۆڵەت بدرێیت ؟ فەرمووی: بەڵێ ، ئیتر (ابوبکر) خۆی هێشتەوە بەدیار پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی بکات ، پێشتریش بۆ ماوەی چوار مانگ دوو وشتری چاکی دابەستبوو بەگەڵای (سمر)[3].

---

[1] / (هشام) و (عیاض) لەکۆت و زنجیری کافراندا مابوونەوە، تا پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد، جارێکیان فەرمووی:- کێ دەتوانێ (عیاض) و (هشام) م بۆ بهێنێ؟ وەلیدی کوڕی وەلید وتی: من دەیانهێنم بۆت پێغەمبەری خوا ، وەلید بە پەنامەکی هاتەوە ناو مەککە، ژنێکی بینی خۆراکی بۆ دەبردن شوێنی کەوت تا جێگەکەیانی دۆزیەوە، لەخانویەکی بێ بنمیچدا گیرابوون، کە ئێوارە داهات بەسەر دیوارەکەیدا سەرکەوت کۆت و زنجیرەکانی پچڕاندو سواری وشترەکەی خۆی کردن تامەدینە ، سەیرکە (إبن هشام)١/٤٧٤، ٤٧٥، ٤٧٦، هاتنی (عمر) یش بۆ مەدینە لەگەڵ (٢٠) هاوەڵی تردا بوو.(صحیح البخاری) ١/٥٥٨.

[2] / زاد المعاد ٢/٥٢٥.

[3] / صحیح البخاری ، باب هجرە النبی ﷺ و (صحابە ١/٥٥٣.

## له ( دار الندوه ) دا ﴿ پەرلەمانی قورەیش ﴾

کاتێك موشریکان هاوەڵانی پێغەمبەریان دەبینی ﷺ خۆیان ئامادە کردوەو دەرئەچن و، ماڵ و مناڵ سامانەکەیان بەرەو ئەوس و خەزرەج دەبەن، خەم و دڵەڕاوکێیەکی دایگرتن، تووشی خەمۆکیەك بوون شتی وەهایان بەخۆیانەوە نەدیبوو ، مەترسیەکی گەورە هاتبوە پێشیان، کەهەڕەشەی لەقەوارە ئابووری و بتپەرستیەکەیان دەکرد، دەرکیان کردبوو بەگەورەیەتی کەسێتی پێغەمبەر ﷺ و کاریگەرێتی لەسەر خەڵك و تێروتەواوێتی سەرکردەیی ڕێنومایی مرۆڤەکانداو، ئەو لێهاتن و هیممەت و ڕاسالیو گیان فیداییەی هاوەڵانی هەیانبوو لەڕێگاکەیداو ، ئەو تواناو هێزو دەسەلاتەی (أوس) و (خزرج) هەیانەو، ئەو حەزی ئاشتی و چاکسازیەی ژیرەکانی هەردوو خێڵەکە هەیانە بۆ نەهێشتنی جیاوازی نێوانیان ، پاش ئەوەی چەندین ساڵی پێشتر شەڕی ناوخۆیان دی بوو.

هەروەها دەیانزانی کە مەدینە چ جێگەوتەیەکی ستراتیژی گرنگی هەیە سەبارەت بەو ڕێگە بازرگانیەی کە بەکەناری دەریای سووردا لە یەمەنەوە بەرەو شام دەڕوات ، خەڵکی مەککەش ساڵانە بڕی چارەکە ملیۆنێك دیناری ئاڵتون بازرگانییان بەرەو شام دەبرد، ئەمە جگە لەو بڕەی دەستی خەڵکی (طائف) و شوێنەکانی تر دەکەوت ، دیاریشە کەبنەڕەتی بازرگانی لەوشوێنەدا پشتی بە ئاسایشی ئەوڕێگەیە بەستبوو.

شاراوەش نەبوو لای قوڕەیشیەکان کەبانگەوازی ئیسلامی لە(یثرب)دا چڕ دەبێتەوە ، ئەوجا چ مەترسیەکی دەبێت و خەڵکەکەیان چ ڕووبەڕوو بوونەوەیەکیان لەگەڵدا دەکەن.

ئیدی موشریکان بەتەواوی هەستیان کرد بەو مەترسیەی هەڕەشە دەکات لەقەوارەیان، دەگەڕان بەشوێن باشترین ئامرازدا کەئەو مەترسیە لەخۆیان دور بخەنەوە، کە هۆ سەرەکیەکەی هەڵگری ئالاکەیەتی ئەویش پێغەمبەری ئیسلامە ﷺ.

لە ڕۆژی (٥) شەممەی (٢٦)ی مانگی (صفر) ساڵی (١٤) هەمی پێغەمبەرێتیدا ، هاوڕێك لەگەڵ (١٢)ی مانگی دیسەمبەری ساڵی (٥٧٠)ی زایینی[1] واتە پاش نزیکەی

[1] / ئەم مێژوەمان پاش لێکۆڵینەوەیەك وەرگرت کە (عەلامە) (محمد سلیمان المنصور فوری) لە (رحمه للعالمین) دا تۆماری کردوە ، ١/٩٥، ٩٧، ١٠٢، ٤٧١/٢.

دوومانگ و نیو لەبەیعەتی عەقەبەی گەورە . پەرلەمانی مەککە (دارالندوە) لەسەرەتای ڕۆژەکەیدا[1] ترسناکترین کۆبوونەوەیان ئەنجامدا لەمێژووی خۆیاندا ، لەو کۆبوونەوەیەدا نوێنەری هەمووتیرە قوڕەیشیەکان ئامادەبوون ، بۆ ئەوەی بکۆڵنەوە لەنەخشەیەکی یەکلا کەرەوە کە هەڵگری ئاڵای بانگەوازە ئیسلامیەکە لەناو بەرێت و ، بۆ هەتا هەتایی نووری تیشکەکەی بکوژێننەوە.

سەرە زۆر دیارەکانی ئەو کۆبوونەوە ترسناکە لە نوێنەرانی قوڕەیش بوون کە بریتی بوون لە :

(١) (أبو جهل)ی کوڕی (هشام) لەجیاتی تیرەی (بنی مخزوم).

(٢) (جبیر)ی کوڕی (مطعم) و(طعمیة)ی کوڕی (عدی) و (الحارث)ی کوڕی (عامر) ، لەجیاتی (بنی نوفل) کوڕی (عبد مناف).

(٣) (شیبه) و (عتبه) کوڕانی (ربیعه) بوون، (أبو سفیان)ی کوڕی (حرب)، لە جیاتی (بنی عبد الشمس)ی کوڕی (عبد مناف).

(٤) (النضر)ی کوڕی (حارث) ئەو کەسە بوو کە سەروپێی ئاژەڵی کرد بەسەری پێغەمبەردا ﷺ ، لەجیاتی (بنی عبد الدار).

(٥) (أبو البختری) کوڕی (هشام) ، (زمعه)ی کوڕی (أسود) و ، (حکیم)ی کوڕی (حزام) لەجیاتی (بنی أسد)ی کوڕی (عبد العزی).

(٦) (نبیه) و (منبه) هەردوو کوڕەکەی (الحجاج) . لەجیاتی (بنی سهم).

(٧) (أمیه)ی کوڕی (خلف) ، لەجیاتی (بنی جمح).

کاتێك هاتن بۆ (دار الندوه) شەیتان لەشێوەی پیاوێکی شکۆداردا هاتە ڕێگەیان ، تاجە گوڵینەیەکی بەسەرەوە بوو، لەبەردەکەیدا وەستابوو ، وتیان: ئەم پیاوە پیرە کێیە ؟ وتی: پیرە پیاوێکی نەجدیم بیستم کە خۆتان بۆچی ئامادە دەکەن، ئامادەبووم تاگوێم لەگوتەکانتان بێت، بەڵکو لەئامۆژگاری و بۆچوونەکانی خۆی بێبەشتان نەکات، وتیان: قەیدی نیە وەرە ژورەوە، لەگەڵیاندا چوە ژورەوە.

---

[1] / ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کۆبوونەوەکە لە سەرەتای ڕۆژدا ئەنجام دراوە ، ئەو ریوایەتەیە کە (إبن إسحاق) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: جبریل هەواڵی ئەو پیلانەیدا بەپێغەمبەرﷺ و مۆڵەتی پێدا کەکۆچ بکات، پاشان ئەو ڕیوایەتەش کە (بوخاری) دەیگێڕێتەوە لە فەرموودەیەکی (عائشە)وە کەپێغەمبەرﷺ لە قرچەی نیوەڕۆدا هات بۆ لای (ابوبکر) و پێی فەرموو.

## قسەوباسی پەرلەمانیی و
## کۆدەنگی لەسەر بڕیارێکی زاڵمانە بۆ شەهیدکردنی پێغەمبەر ﷺ

هەرئەوەندەی ئەندامانی کۆبوونەوەکە تەواوبوون دەستکرا بەپێشنیارو چارەسەرەکان ، گفتوگۆ درێژەی کێشا ، (ابو الأسود) وتی: لەم شارەدا دەری دەکەین و لێرە نایهێڵین ، گوێ نادەینێ بۆکوێ دەڕوات ، یان لەکوێدا دەگیرسێتەوە ، ئەو کاتە بارودۆخمان چاك دەبێت و وەك جارانمان لێ دێت.

پیرە پیاوە نەجدیەکە وتی: نەخێر ئەوە ڕایەکی باش نیە ، ئەدی نابینن قسەی چەند شیرین و کاریگەرە ، چەندە بەتوانایە لە کەمەندکێش کردنی دڵی مرۆڤەکاندا ؟ سوێند بێت ئەگەر وابکەن بڕواتە ناو هەرخێڵێکی تری عەرەب ئەوجا حاڵتان خراپتر دەبێت ، پاشان پێش خۆیان دەدات بۆ سەر ئێوە ، هەتاکو پێتان پێدا دەنێت لە وولاتی خۆتاندا ، ئەوجا چی بوێت پێتان دەکات ، ڕایەکی تر بڵێن.

(ابو البختری) وتی: لە زنجیرە بەندی ئاسنیدا بیبەستنەوەو ، لەژوورێکدا دایبنێن ، پاشان چاوەڕێی بکەن تاوەکو چارەنووسی شاعیران. زهیرو نابغە . ی لێ دێت ، هەر کەسێك بەو توونی مەرگەدا بڕوات تووشی دەردەسەری ئەوان ئەبێت.

پیرە نەجدیەکە وتی : نا نا سوێندتان بۆ دەخۆم کە ئەوە ڕایەکی پەسەند نیە ، سوێندبێت ئەگەر. وەکو خۆتان دەڵێن. بیبەستنەوە. ئەوا لە پشت دەرگاوە خۆی قوتار دەکات بۆلای هاوەڵەکانی و، لەوانەیە بدەن بەسەرتانداو لە دەستانی بسێنن ، پاشان بەهۆیەوە زۆر بن و بەسەرتاندا زاڵ بن، بەڕاستی ئەمەیان ڕا نیە ، ڕایەکی تر بڵێن.

پاش ئەوەی پەرلەمانی قوڕەیش ئەم دوو پێشنیارەی ڕەتکردەوە ، پێشنیارێکی گوناهکارانەی خرایە بەردەست هەموو ئەندامەکانی ڕەزامەندیان نواند لەسەری ، ئەو پێشنیارە سەرکردەی تاوانبارەکانی مەککە (أبو جهل)ی کوڕی (هشام) خستیە ڕوو، (أبو جهل) وتی: سوێندم بەخودا من ڕایەکم هەیە باوەڕ ناکەم هێشتا ئێوە ڕێتان لێی کەوتبێت ، وتیان چیە (أبا الحكم)؟ وتی: پێم وایە لە هەر تیرەیەك گەنجێکی ئازای جوامێری بەجەرگ بهێنین و ، هەریەکەیان شمشێرێکی بڕندەی بدەینە دەست ، ئەوانە بڕۆنە سەری و ، بەیەکەوە بیدەنە بەر شمشێرو بیکوژن ، ئەوجا ڕزگارمان دەبێت ، ئەگەر وایانکرد خوێنەکەی بەناوخێڵ و تیرەکاندا بڵاوەدەکات، ئەوجا (بنو عبدمناف) ناتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو تیرەکاندا بکەن و، داوای (فدیه)مان لێدەکەن ئێمەش دەیاندەینێ.

پیرە نەجدیەکە وتی: ئەمە قسەی تەواوە ، منیش تەنها ئەم ڕایەم پێ پەسەندە ، ئیدی پەرلەمانی مەککە یەك دەنگیاندا بەو بڕیارە تاوانکاریەو، نوێنەرەکان گەڕانەوە بۆماڵەکانیان ، دەستبەجێ دەستیان کرد بەجێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە[1].

## کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ

کاتێك کە بڕیارە تاوانکاریەکە دەرچوو بەکوشتنی پێغەمبەر ﷺ ، جبریل عليه السلام بە (وەحی) خوای گەورەوە دابەزیە خوارەوە بۆلای و هەواڵی پیلانەکەی قوڕەیشیی پێ ڕاگەیاندو ، هەواڵیشیی دایە کەخوای گەورە مۆڵەتی پێداوە کۆچ بکات و کاتی کۆچەکەشی بۆ دیاری کردوەو پێی فەرموو: ئەمشەو لەناو ئەو جێگەیەتدا مەمێنە کە شەوانی تر تیایدا دەمایتەوە [2].

بۆ نیوەڕۆ پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای (أبوبکر) رضي الله عنه . بۆ ئەوە ڕێك بکەوێت لەگەڵیدا لەسەر قۆناغەکانی کۆچەکەیان ، (عائشە) (ڕ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەماڵەکەی (أبوبکر)دا دانیشتبوین ، لە قرچەی نیوەڕۆدا بوو کەسێك هات و وتی بە (أبوبکر) : ئەوە پێغەمبەری خوایە ، سەروچاوی پۆشیوە ، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە هەرگیز لەو کاتەدا نەدەهات بۆلامان ، خێرا (أبوبکر) هەستاو فەرمووی: دایکم و بابم بەقوربانی بێت ، سوێند بێت دیارە شتێکی گرنگ هێناویێتی لەم کاتەدا.

(عائشە) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات ، داوای مۆڵەتی هاتنە ژورەوەی کرد ، (أبوبکر) فەرمووی: ئەوانە هەموو کەسی خۆتن ، دایك و بابم بەقوربانت بێت ، پێغەمبەری خوا فەرمووی : مۆڵەتی دەرچوونم پێدراوە ، (أبوبکر) فەرمووی : کەواتە هاوڕێیەتی سەفەرت دەکەم ، دایك و باوکم قوربانت بێت ؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی : بەڵێ[3].

پاش ڕێککەوتن لەسەر پلانی کۆچکردنەکە ، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی ، چاوەڕوانی هاتنی شەوی دەکرد.

---

[1] / ستيركة (إبن هشام) ١/٤٨٠، ٤٨١، ٤٨٢.

[2] / إبن هشام ٤٨٢/١ ، زاد المعاد ٥٢/٢.

[3] / صحيح البخاري ، باب هجرة النبي ﷺ واصحابه ٥٥٢/١.

# گەمارۆدانیماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ

گەورە تاوانبارانی قورەیش ڕۆژەکەیان بەخۆسازدان بۆ نەخشە داڕێژاوەکەوە بەسەربرد کە پەرلەمانی مەککە (دارالندوە) سەرلەبەیانیەکەی پەیمانی لەسەردابوو، بۆ ئەو مەبەستەش یانزە سەرۆك لەو گەورە تاوانبارانە دانرابوون کە بریتی بوون لە:

١. (أبو جهل) کوڕی (هشام).
٢. (الحکم) کوڕی (أبی العاص).
٣. (عقبه) کوڕی (أبی معیط).
٤. (النضر) کوڕی (حارث).
٥. (أمیه) کوڕی (خلف).
٦. (زمعه) کوڕی (أسود).
٧. (طعیمة) کوڕی (عدی).
٨. (أبو لهب).
٩. (أبی) کوڕی (خلف).
١٠. (نبیه) کوڕی (الحجاج).
١١. براکەی (منبه) کوڕی (الحجاج)[1].

(إبن إسحاق) دەڵێت: کاتێك کە تاریکایی شەوداهات چاودێری دەرگای ماڵەکەیان کرد تا بخەوێت ، ئەوجا بدەن بەسەر ماڵەکەیدا [2].

متمانەو بڕوای تەواویان هەبوو بەسەرکەوتنی ئەم پیلانە خراپەیان ، تاوای لێ هات (ابوجهل) بەشێوەیەکی لەخۆبایی بوون و گاڵتەجاڕیەوە بەهاوەڵەکانی بڵێت: موحەممەد دەڵێت ئەگەر لەسەر ئەوکارە شوێنی بکەون دەبنە مەلیکی عەرەب و عەجەم ، پاشان زیندوو دەکرێنەوە دوای مردن ، ئەوجا باخچەی هاووێنەی باخچەکانی ئوردنتان پێ دەدرێت ، ئەگەر وانەکەن لەناودەچن ، پاش مردنیش زیندوو دەکرێنەوە ، پاشان ئاگرتان بۆ داخ دەکرێت و تیایدا دەسوتێنرێن[3].

کاتی جێبەجێ کردنی ئەو پیلانە دوای نیوەشەو بوو، بەبێداریی مانەوە چاوەڕوانی سەعاتی سفریان دەکرد ، بەڵام خودا باڵادەستە بەسەر هەمووشتێکدا ، موڵکی ئاسمانەکان و زەمینی بەدەستە ، هەرچییەکی خواست دەیکات ، ئەو پەنای مرۆڤان دەدات بەبێ ئەو کەس ناتوانێت پەنا بدات ، ئەوجا ئەو کارەی کرد کە پێشتر پێغەمبەرەکەی پێ دواند بوو ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴾ الأنفال/ ٣٠.

---

[1] / زاد المعاد ٢/٥٢.
[2] / إبن هشام ١/٤٨٢.
[3] / هەمان سەرضاوة ١/٤٨٣.

# پێغەمبەرماڵەکەی بەجێ دەهێڵێت

لەگەڵ ئەوەدا کە قورەیش بەتەواوی خۆیان بۆ پیلانەکە سازکردبوو کەچی بەتەوای شکستیان هێنا، لەوکاتە تەنگەتاوەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە (علی) کوڕی (أبی طالب): { لەجێگاکەی مندا بنوو، خۆت بەم بوردەیەی من داپۆشە کە (حضرمی) یەکی سەوزە ، لە ژێریدا بنوو ، دڵنیابە شتێکت تووش نابێت کە پێت ناخۆش بێت } پێغەمبەر ﷺ نەریتی وابوو کە بخەوتایە لەژێر ئەو بوردەیەدا دەنووست [1].

پاشان پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە ، بەنێوان ڕیزەکانیاندا تێپەڕی ، مشتێك خۆڵی هەڵگرت پژاندی بەسەریاندا ، ئیدی خوای گەورە لەئاستیدا هەموویانی کوێر کردو نەیانبینی ، ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ ﴾ يس/٩، پیاویان تێدا نەبوو کەخۆڵ بەسەریەوە نەبێت ، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ماڵی (أبوبکر) . لەکوخێکی ماڵی (أبوبکر)ەوە . بەشەو دەرچوون هەتا گەیشتە ئەشکەوتی ( ثـور ) بەرەو ڕووی (یەمەن)[2].

جەنگاوەرە ئابڵوقەدەرەکانیش چاوەڕێی سەعاتی سفر دەکەن ، پێش هاتنی کاتی دیاریکراو نیشانەی بێ ئومێدی و شکستیان تێدا دەرکەوت . پیاوێك کەلەوێدا لەگەڵیان نەبوو هاتەلایان و کەبینی لەبەردەم دەرگاکەی ماڵی پێغەمبەردا ﷺ وەستاون ، پێی وتن: چاوەڕێی چی دەکەن ؟ وتیان: موحەممەد ، کابرا وتی: دەك داوەشێن و خوا لەناوتان بەرێت ، وەڵڵاهی ئێستە بەبەردەمتاندا دەرچوو ، خۆڵی کردوە بەسەر هەموتانداو ، چوو بەدەم کاری خۆیەوە ، وتیان: وەڵڵاهی نەمانبینیوە ، ئنجا هەستان و تەپوتۆزەکەی سەریان تەکاند.

بەڵام لەکونی دەرگاکەوە سەیرێکیان کرد (علی) یان بینی ، وتیان : سوێندبێت ئەوە موحەممەدە نووستووەو بوردەکەی داوە بەخۆیدا ، بەو شێوەیە نەجوڵان تارۆژ بوەوە ، ئنجا (علی) لەجێگەکە هەستاو هاتەدەرەوە، کەوتە بەردەستیان، لەبارەی پێغەمبەرەوە ﷺ پرسیاریان لێکرد ، وتی: هیچ لەو بارەیەوە نازانم[3].

---

[1] / هەمان سەرچاوە ٤٨٢/١ ، ٤٨٣.
[2] / هەمان سەرچاوە ٤٨٣/١ ، زاد المعاد ٥٢/٢ .
[3] / هەمان دوو سەرچاوەی پێشوو .

## لە ماڵەکەوە بۆ ئەشکەوت

پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی (٢٧)ی مانگی(صفر)ی ساڵی (١٤)ی پێغەمبەرێتی بەرامبەر بە ١٢-١٣ی سێبتێمبەری ساڵی ٦٢٢ی [1] زایینی ماڵەکەی بەجێ هێشت و چوو بۆ ماڵی هاوەڵەکەی (أبوبكر) کە خەڵك لە هاوڕێیەتی و ماڵ و سامانی ئەمین بوون. پاشان لەدەرگایەکی پشتەوە ماڵەکەیان بەجێهێشت ، تا بەپەلە لەمەککە دەربچن پێش ئەوەی بەرەبەیان هەڵبێت.

لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ دەیزانی قورەیش سەرومڕانە بەشوێنیدا دەگەڕێن و ، یەکەم ڕێگاش کە زەینی ئەوانی بەلادا بچێت لەسەرەتادا ڕێگەی سەرەکیە کە بەرەو باکوورو مەدینە دەچێت ، کەچی ئەم ڕێگەیەکی تەواو پێچەوانەی هەڵبژارد ، کە ڕێگەی باشووری مەککەیەو ، بەرەو یەمەن دەچێت ، بەدرێژی (٥) میل ڕێگەی گرتەبەر ، تاگەیشتە شاخێك ناسرابوو بەشاخی (ثور) ، شاخێکی بەرزە ، ڕێگاکەی زۆرسەخت و ناخۆشە ، تاشە بەردی زۆرەو سەرکەوتن پیایدا زەحمەتە ، لەبەرئەوە پێیەکانی پێغەمبەر ﷺ بریندار بوون - گوتراویشە : لەسەر لاپێ دەڕۆیشت تا شوێنەوارەکەی بسڕێتەوە بۆیە قاچی پیرۆزی داماڵرابوو ، هەرکامیان بێت ، (أبوبكر) لەکۆڵی گرت کەگەیشتە شاخەکەو ، خۆی لێ توند کردەوە تاگەیاندیە ئەشکەوتێك لە لوتکەی شاخەکەدا ، ئەو ئەشکەوتە لە مێژوودا بە ئەشکەوتی (ثور) ناسراوە [2].

## لەناو ئەشکەوتەکەدا

کە گەیشتە نزیك ئەشکەوتەکە ، (أبوبكر) وتی: سوێند بەخوا ناڕۆیتە ژوورەوە دەبێت لەپێشدا من بڕۆم ، نەبادا شتێکی تێدابێت با بەرمن بکەوێت ، چووە ناوی دەستێکی پێداهێنا ، دیوارەکەی کونێکی تێدابوو کراسەکەی دڕاندو کونبڕی کرد ، دووکونی تری تێدا مابوو هەردووقاچی خستە سەریان ، پاشان وتی بەپێغەمبەر بفەرموو بۆ ژوورەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژوورەوە ، سەری خستە سەرکۆشی ئەبوبەکرو نوست ، قاچێکی ئەبوبەکر کە لەکونەکەدا بوو شتێك پێوەیدا ، لە جێگەی خۆی نەجولا نەبادا خەبەری بێتەوە ، لەتاو ئازار دڵۆپێك فرمێسکی چاوی کەوتە سەردەموچاوی پێغەمبەر ﷺ ، فەرمووی: چیە (أبوبكر) وتی: گەزراوم ، دایك و باوم بەقوربانت بێت ، پێغەمبەر ﷺ تفی کردە سەری چاك بووەوەو ئازاری نەما [3].

---

[1] / رحمه للعالمين ١/٩٥، سەرەتا ئەو مانگی (صفر)ە لەساڵی چواردەمی پێغەمبەرێتیەوە دەست پێ دەکات ئەگەر سەرەتایی ساڵی بەمانگی (محرم) دابنێین ، خۆ ئەگەر سەرەتایی ساڵ لەوێوە دابنێین کە خوای گەورە (وەحی) نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ بەبێگومان ئەو مانگی (صفر)ە لەساڵی سیانزەهەمەوە دەست پێ دەکات ، زۆربەی ئەوانەی لە سیرەدا دەنوسن کە لەوانیە ئەم ڕایە پەسەند بکەن ، زۆرجار هەڵەدەکەن لە ڕێکخستنی ڕووداوەکاندا ، ئێمە لێرەدا سەرەتای ساڵمان بەمانگی (محرم) داناوە .

[2] / رحمه للعالمين ١/٩٥ ، مختصر سيره الرسول نوسینی شێخ عەبدوڵلای نەجدی ل ١٦٧.

[3] / (رزين) لەعومەری کوڕی خەتابەوە ﷺ ڕیوایەتی کردوە، دوای ئەوە ژاری مارەکە گەڕایەوەو ئاوسکی لەکاتی وەفاتیدا و ئەوەش هۆی مردنی بوو ، بڕوانە (مشكاةالمصابيح) ، باب مناقب (ابى بكر) ٥٥٦/٢.

سێ شەو لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە ، شەوی هەینی و شەوی شەممەو شەوی یەك شەممە[1] ، (عبدالله)ی کوڕی (أبوبکر) لەلایان دەمایەوە ، عائشە دەڵێت: (عبدالله) کوڕێکی گەنجی وریای ژیر بوو ، لە سەحەردا لای ئێمە دەردەچوون لە مەککە ڕۆژی دەکردەوە ، هەرچی هەواڵێکی ببیستایە کە شەو داهات دەیهێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، (عامر)ی کوڕی (فهیرە)ش غولامی (أبوبکر) بوو مێگەلێکی لەو دەوروبەرەدا دەلەوەڕاند ، کاتی خەوتنان مێگەلەکەی لێ نزیك دەکردنەوە تا شیریان دەخوارد ، ئەنجا پێش تاریك و ڕوونی بەیانی دەگەڕایەوە بەرەو مەککە ، (عامر) هەموو شەوێکی ئەو سێ شەوە بەم شێوەیەی دەکرد ، هەمووجارێکیش (عامر)ی کوڕی (فهیرە) بە مێگەلەکەیەوە شوێنی (عبدالله)ی کوڕی (أبوبکر) دەکەوت کە لەمەککە دەرئەچوو بۆئەوەی جێگە پێیەکانی بسڕێتەوە[2].

کاتێك قورەیش دڵنیابوو لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەدەست دەرچوو لە شەوی جێبەجێ کردنی پیلانەکەدا شێت بوون ، یەکەم شتێك کردیان لێدانی (علی) بوو، ڕاپێچیان کرد بەرەو مەککە ، ماوەیەك بەندیان کرد ، بەئومێدی ئەوەی هەواڵێکی لێوە وەربگرن لەبارەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەیەوە[3].

کاتێك کە هیچیان لە (علی) دەستنەکەوت ڕۆشتن بۆ ماڵی (أبوبکر) ، لە دەرگایاندا ، (أسماء)ی کچی (أبوبکر) هاتە دەرەوە ، پێیان وت: کوا باوکت ؟ وتی: سوێند بەخوا نازانم باوکم لە کوێیە ؟ (أبوجهل) . کە پیاوێکی دەم پیسی هەرزەگۆ بوو . دەستی بەرز کردەوە شەپازلەیەکی لێدا گوارەکەی گوێی کەوتە خوارەوە[4].

لەدانیشتنێکی خێرای نائاساییدا قورەیش بڕیاری بەکارهێنانی هەموو ئامرازێکیدا بۆ گرتنی ئەو دوو پیاوە ، بۆیە هەموو ئەو ڕێگانەی لەهەر چوارلاوە دێنە سەر مەککە ، خستیانە ژێر چاودێریەکی توندی چەکدارەوە ، هەروەها بڕیاری خەلاتێکی گەورەیدا کە بریتی بوو لە دیاریی (١٠٠) وشتر بۆ هەریەکێك کە بتوانێت یەکێك لەو دوانە بەزیندوویی یان بەمردوویی تەسلیم بە قورەیش بکاتەوە[5].

ئیدی هەرچی سوارچاك و پیادەو پێهەڵگریان هەیە کەوتنە گەڕان ، بەشاخ و دۆڵ و دەشت و گردۆلکەدا ، بەڵام بێ هوودە بوو.

---

[1] / سەیری (فتح الباري) بکە ٧/٢٣٦.
[2] / (إبن هشام) ١/٤٨٦.
[3] / رحمه للعالمین ١/٩٦.
[4] / (إبن هشام) ١/٤٨٦.
[5] / بڕوانە (صحیح البخاري) ١/٥٥٤.

موشریکان هەتا دەمی ئەشکەوتەکەش هاتن ، بەڵام خودا باڵادەستە ، (بوخاری) دەگێڕێتەوە لە (انس)ەوە لە (أبوبکر)ەوە ﷺ دەڵێت: لە ئەشکەوتەکەدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووم ﷺ - سەرم بەرز کردەوە قاچ و قولی موشریکەکانم بینی، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ ئەگەر یەکێکیان سەیری خوارەوە بکات دەمانبینێت ، فەرمووی : بێدەنگ بە (أبوبکر) ، ئێمە دوانین خودا سێهەممانە ، لە دەربڕینێکی تردا : (ابوبکر) چی دەڵێیت لەبارەی دووکەسەوە کە سێیەمیان خودا بێت !![1]

بەڕاستی موعجیزەیەك بوو کەخودا پێغەمبەرەکەی پێ شکۆدارکرد ﷺ ، لە کاتێکدا کەچەند هەنگاوێکیان مابوو بگەنە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی کەچی گەڕانەوە.

## کەوتنە ڕێ بەرەو مەدینە

کاتێك کەکەف و کوڵی گەڕانی موشریکان دامرکایەوە، کاری مەفرەزەکانی گەڕان کۆتایی هات ، وروژانی قوڕەیش پاش ئەو ڕاونانە سێ ڕۆژە سەرسەختانەیە هێور بووەوە بەبێ هیچ ئەنجامێك ، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکەی خۆیان ئامادە کرد بۆ دەرچوون بەرەو مەدینە.

(عبدالله)ی کوڕی (اریقط اللیثي)ی بەکرێ گرتبوو ، کە ڕێبەرو شارەزای ڕێگە بوو . تا ئەوکاتە موشریك بوو، ئەمان متمانەیان پێی هەبوو ، هەردوو وشترەکەی خۆیان دابوو بەدەستی و بەڵێنیان بەیەکتری دابوو کە دوای سێ شەوو بە هەردوو وشترەکەوە بێتە بەردەم ئەشکەوتەکە ، کاتێك کە شەوی دووشەممە هات ، سەرەتای ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١)ی کۆچی / بەرامبەر بە (١٦)ی سێبتێمبەری ساڵی (٦٢٢)ی زایینی ، (عبدالله)ی کوڕی (أریقط) بەخۆی و وشترەکەوە هات بۆلایان ، لەوێدا (ابوبکر) وتی بەپێغەمبەر ﷺ: دایك و بابم بەقوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، یەکێك لەو دوو وشترە هەڵبژێرە ، ئەنجا باشترینیانی لێ نزیك کردەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە نرخی خۆی.

(أسماء)ی کچی (ابوبکر)یش (ڕ) خۆراکەکەی بۆ هێنان و ، بیری چووبوو بیخاتە توێشە بەرەیەکەوە، کەبەڕێ کەوتن، چوو ویستی خۆراکەکە بخاتە کەشکۆڵێکەوە ، سەیری کرد توێشە بەرەی نییە ، ئیدی پشتێنەکەی کرد بەدوو پارچەوە خۆراکەکەی

---

[1] / (صحیح البخاری) ١/٥١٦، ٥٥٨، ترسەکەی (ابوبکر) لەبەرخۆی نەبوو، بەڵکو ئەو گێڕانەوەیە کە دەڵێ : کاتێ ئەبوبەکر پێهەڵگرانی بینی خەمی پێغەمبەری لێنیشت ﷺ و پێی فەرموو: ئەگەر من بکوژرێم یەك پیاوم ، بەڵام ئەگەر تۆ بکوژرێیت یەك ئوممەت دەفەوتێت ، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ لاتحزن إن اللـــهَ معَنـــا ﴾ ، بڕوانە مختصر سیرە الرسول نووسینی شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل١٦٨.

کرده یەکێکیان و وەك کەشکۆڵ هەڵی واسی ، پارچەکەی تریشی کردەوە بە پشتوێن ، لەوێدا ناونرا بە (ذات النطاقین)[1].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ و (أبوبکر) ﷺ بەڕێ کەوتن ، (عامر)ی کوڕی (فهیرە)یش لەگەڵیاندا کەوتەڕێ ، ڕێبەرەکە ، (عبدالله)ی کوڕی (اریقط) ، ڕێگەی کەنار دەریای پێگرتن.

یەکەمجار کە لەئەشکەوتەکەوە دەرکەوتن ڕووی کردە باشوور بەرەو یەمەن و ، پاشان ڕووی کردە ڕۆژئاوا بەرەو کەنار دەریا ، تاگەیشتە ڕێگەیەك کەسی پێدا نەچوو بوو ، لەنزیکی کەناری دەریای سورەوە ڕووی کردەوە باکورو ، بەڕێیەکدا ڕۆشت ـ مەگەر بەکەمیی ـ وەگەرنا کەس ڕێی لێ نەکەوتبوو.

(إبن إسحاق) باسی ئەو شوێنانەی کردوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕێگەیەدا پیایدا گوزەراوەو دەڵێت : کاتێك ڕێبەرەکە دەریکردن بەرەو خوارووی مەککە کەوتنەڕێ ، پاشان بەڕێی کردن بەرەو کەنار دەریا تا لەڕێگە لایاندا لە خوارووی (عسفان)ە وە ، پاشان خستنیە ڕێ بەرەو خواروی (أمج) ، پاشان بەڕێی خستن تا لە ڕێگە لای دایەوە پاش ئەوەی کە لە (قدید) گوزەرا ، ئەنجا لەوێش دەری کردن کەوتنە ڕێ بەرەو (خرار) ، ئەنجا بەرەو (ثنیة المرة) ، پاشان بەرەو (لقف) ، ئەنجا لە دەروازەی (لقف) دەرچوون و ، چوونە ناو دەروازەی (مجاج) ، پاشان بەرەو (مرجح مجاج) پاشان چوونە (مرجح ذی العضوین) ، پاشان بۆ (بطن ذی الکشر) ، پاشان بەرەو (جداجد) ئەنجا بەرەو (الأجرد) ، پاشان بۆ (ذا سلّم) ، لە (بطن أعداء مدلجة تعهن)ە وە بەرەو (عبابید) ، پاشان لە (الفاجه) تێپەڕین ، پاشان دابەزینە ناو (العرج) ، پاشان بەڕێ کەوتن بەرەو (ثنیة العائر) . لەلای ڕاستی ڕەکوبەوە . هەتاکو دابەزینە ناو (بطن رئم) و پاشان گەیاندنیە (قباء)[2]،

ئەمەش نموونەیەکە لەو ڕووداوانەی لەڕێگەدا بەسەریاندا هات :

١ـ (بوخاری) دەگێڕێتەوە لە (أبوبکر)ی (صدّیق)ەوە ﷺ دەڵێت: ئەو شەوە بەڕێ کەوتین تاسبەینێ گەرمای نیوەڕۆ بەڕێوە بوین ، ڕێگە چۆڵ و هۆڵ ، کەسی بە سەرەوە نەبوو ، بەردێکی درێژمان بینی سێبەرێکی هەبوو هێشتا خۆر نەچوو بووە سەری ، دابەزین ، لەژێریدا شوێنێکم چاککرد بۆ پێغەمبەر ﷺ تا لەسەری بخەوێت ، فەروەیەکم لەسەری داخست و ، وتم : لێرە بخەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ،

[1] / صحیح البخاری ١/٥٥٣ ، ٥٥٥ ، هەروەها إبن هشام ١/٤٨٦.
[2] / إبن هشام ١/٤٩١ ، ٤٩٢.

من باوەشێنت دەکەم ، نوست ، هەستام باوەشێنی بکەم ، بینیم وا شوانێك مێگەلەکەی داوەتە بەرو بەرەو بەردەکە دێت ، دەیویست وەك ئێمە بحەوێتەوە ، پێم وت : تۆ شوانی کێیت ؟ وتی : شوانی پیاوێکی مەککەیی یان مەدینەییم ، وتم : ئایا مێگەلەکەت شیریان تێدایە ؟ وتی: بەڵێ ، وتم : ئایا دەیاندۆشیت ؟ وتی : بەڵێ ، مێیەکی گرت ، وتم: گوانی مێیەکە لە خۆڵ و موو پیسیی بتەکێنە ، کەمێك شیری دۆشیە ناو دەفرێکی پێستەوە ، خۆشم دەفرێکی ئاوم پێبوو ، بردم بۆ پێغەمبەر ﷺ تالێی تێراوبێت دەستنوێژی لێ هەڵبگرێت ، هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ پێم ناخۆش بوو هەڵی بسێنم ، وەستام تاخۆی هەستا ، ئاوەکەم کرد بەسەر شیرەکە تا بەشی خوارەوەی سارد بوەوە ، وتم: بخۆرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوەندەی خواردەوە تا تێر بوو ، پاشان فەرمووی : ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کە برۆین ؟ وتم : بەڵێ ، دەڵێت: ئیدی بەرێ کەوتین[1].

٢. نەریتی (أبوبكر) ﷺ وابوو لە پشت پێغەمبەرەوە دەرۆشت ﷺ ، پیر دەهاتە بەر چاوو دەناسرا ، بەلاَم پێغەمبەری خوا ﷺ گەنج دیاربوو نەدەناسرا ، کەسێك کە بە (أبوبكر) دەگەیشت پێی دەوت: ئەو پیاوە کێیە لەگەڵتدایە؟ دەیوت: ئەم پیاوە ڕێنومایی ڕێگەم بۆ دەکات ، پرسیارکەر وایدەزانی مەبەستی ڕێگەیە، مەبەستیشی ڕێگەی ڕێنومایی چاکە بوو[2].

٣. (سراقە)ی کوڕی (مالك) شوێنیان کەوتبوو ، سوراقە دەڵێت : لەکاتێکدا کە لەناو خێڵەکەمدا (بنی مدلج) دانیشتبووم ، پیاوێك هاتەلام وتی: (سراقە) ئێستە من لەکەنار دەریاوە تارمایی چەند پیاوێکم بینی ، وابزانم موحەممەدو هاوەڵەکانی بن ، (سراقە) دەڵێت: ئیتر زانیم کە ئەوانن ، پێم وت : نا ئەوان نین ، بەلاَم تۆ فلاَن و فلاَنت بینی لەبەرچاوی خۆمانەوە دەرچوون ، پاش کەمێك مامەوە ، دوای هەستام ، فەرمانمدا بە کەنیزەکەکەم کە ئەسپەکەم بۆ دەرکات لە پشت گردێکەوە بۆم ڕاگرێت ، ئنجا ڕمەکەم هەڵگرت و لەپشتیماڵەکەمەوە دەرچووم ، ڕمەکەم سەروخوار کردەوە ، تاگەیشتمە ئەسپەکەم سواری بووم ، بەرێ کەوتم زانیم کە نزیکی کردومەتەوە تاچەند هەنگاوێکم مابوو بگەمە لایان ، ئەسپەکەم سەرسمێکیداو لەسەری کەوتمە خوارەوە، جارێکیتر سوار بوومەوە، وامدەزانی نزیکم دەکاتەوە تاچەند هەنگاوێکم مابوو لێیانەوە، ئەسپەکەم سەرسمێکی تریداو

---

[1] / صحيح البخاري ١/٥١٠.
[2] / بوخاری ئەمەی لە (انس)ەوە گێڕاوەتەوە ١/٥٥٦.

کەوتمە خوارەوە، هەستام، دەستم برد بۆ هەگبەی تیرەکانم ، تیرەکانم دەرهێنا تیرو پشکم کرد، ئایا ئەوانە زیانم پیّ دەگەیەنن یان نەء ؟ ئەوەم بۆ دەرچوو کەپێم ناخۆشە ، جارێکی تر سواربومەوەو گوێم نەدا بەتیروپشکەکە ، ئەسپەکە نزیکی کردمەوە تائەوەندەی گوێم لە خوێندنەوەکەی پێغەمبەر بوو ﷺ و لای نەدەکردەوە ، بەلاّم (ابوبکر) زۆرلای دەکردەوە . ئنجا هەردوو دەستی ئەسپەکەم بەناو لمەکەدا ڕۆچوون تا سەر ئەژنۆیان ، کەوتمە خوارەوە ، ئاوزەنگیم لێدا هەستایەوە ، خەریکبوو دەستەکانی لە لمەکە دەردەهێنا ، کە بەپێوە وەستا شوێن دەستەکەی لەسەر زەویەکە تەپو تۆزێکی پرشنگدار وەك دووکەڵی لێوە دەردەچوو ، دیسانەوە تیروپشکم کردەوە ، ئەوەم بۆ دەرچوو کە پێم ناخۆشە ، هاوارم لیّ کردن کە پەنام بدەن ، وەستان ، سواری ئەسپەکەم بووم تاگەیشتمە لایان ، پاش ئەوەی کە بەسەرمدا هات گەشتمە ئەو بڕوایەی ، کە پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی سەردەکەون ، عەرزم کرد: پێغەمبەری خوا خێڵەکە خەلاّتیان داناوە بۆ هەر کەسێك تۆ بدۆزێتەوە ، هەواڵی ئەوەم پێدان کە خەڵکی دەیانەوێت چییان لیّ بکەن ، نان و خۆراکم خستە بەردەستیان گوێیان نەدایەو ، هیچ پرسیارێکیشیان لیّ نەکردم ئەوەندە نەبێت : پێیان وتم : خەڵکمان لیّ چەواشە بکە ، داوام لیّ کرد کە نوسراوێکی دڵنیابوونم بۆ بنوسێت ، فەرمانیدا بە (عامر)ی کوڕی (فهیره) ، ئەویش لەسەر پارچە قوڕێك بۆی نووسیم ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت [1] .

لە ڕیوایەتێکی تری (ابوبکر)ە وە دەڵێت: کەوتینە ڕێ ، خەڵکەکەش بەدواماندا دەگەڕان کەس لەوان نەیتوانی پێمان بگات جگە لە (سوراقە)ی کوڕی (مالك) کوڕی (جعشم) کە سواری ولاّخەکەی بوو بوو ، وتم : پێغەمبەری خوا ئەریّ ئەو ئەسپ سوارە خەریکە پێمان دەگات ، فەرمووی : ﴿ لاتَحْزَنْ إنَّ اللّهَ مَعَنا ﴾ [2].

(سوراقە) گەڕایەوە بینی خەڵك بەشوێن پێغەمبەردا دەگەڕێن ﷺ ، ئەویش پێی دەوتن کە تازە فریایان ناکەون و لە دەستیان دەرچوون ، ئەو پیاوە بەیانیەکەی بەدوایاندا دەگەڕا کەچی سەر لەئێوارە پاسەوانی دەکردن [3] .

---

[1] / هەمان سەرچاوە ١/٥٥٤، شوێنی خێڵی (بنی مدلج) لەنزیك (رابغ)ە وە بوو ، سوراقە لەو شوێنەوە شوێنیان کەوتبوو کە لە (قدید)ە وە سەردەکەوتن ، زاد المعاد ٢/٥٣ ، وا دەرئەکەوێت ڕۆژی سێیەم بوبیّ.

[2] / صحیح البخاری ١/٥١٦.

[3] / زاد المعاد ٢/٥٣.

٤. لەو سەفەرەیدا پێغەمبەر ﷺ بەلای خێوەتەکەی (أم معبد)ی خوزاعیدا تێپەڕی کرد ، ژنێکی کەڵەگەتی بەتاقەت بوو لەناو خێوەتەکەیدا بوو، نان وئاوی دەدا بە هەرکەسێك بەوێدا بڕۆشتایە ، پرسیاریان لێ کرد ، ئایا هیچی لەلایە؟ وتی: سوێند بەخوا هەرچیەکم ببوایە پێم دەدان ، ئەوەتا مەڕەکانم لاوازن ، ئەم ساڵە ساڵی وشکیی بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری مەڕێکی کرد لە خوار خێوەتەکەوە ، پێی فەرموو: ئەرێ (أم معبد) ئەی ئەو مەڕە چیە ؟ وتی: ئەوە لەبەر لەڕیی لەمێگەلەکە جێماوە ، فەرمووی : ئەی شیری تێدایە ؟ (أم معبد) وتی: بەخوا لەوە لاوازترە شیری تێدابێت ، فەرمووی : مۆڵەتم دەدەیت بیدۆشم .؟ وتی: بەڵێ بەقوربانت بم ، ئەگەر شیری تێدا دەبینی بیدۆشە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پیرۆزی هێنا بەگوانەکەیدا ، ناوی خوای هێناو دۆعای کرد ، گوانەکەی پڕ بوو ، لێی دەچۆڕا ، داوای دەفرێکی کرد کە کۆمەڵێك تێر بکات ، ئەوەندەی تێ دۆشی سەر ڕێژ بوو، دای بە (أم معبد) لێی خواردەوە تا تێر بوو ، ئەنجا دای بەهاوەڵەکانی تا ئەوانیش تێر بوون ، پاشان خۆی خواردیەوە ، ئەنجا جارێکی تر گوانەکەی تێدا دۆشیەوە ، تا دەفرەکە پڕبوو ، ئەنجا (أم معبد) یان بەجێ هێشت و ڕۆشتن.

زۆری پێنەچوو (أبو معبد)ی مێردی گەڕایەوە چەن بزنێکی وشك هەلاتوی لاوازی دابوە بەرخۆی ، کە شیرەکەی بینی سەری سوڕما ، وتی: ئەمەت لەکوێ بوو؟ لەکاتێك دا کە مەڕەکە لاوازە ، هیچ شیریش لەماڵەکەدا نەبوو؟ (أم معبد) وتی: نەوەڵڵا ئەوەندە نەبێت پیاوێکی پیرۆز بەئێرەدا تێپەڕی کرد قسەی ئاواو ئاوای دەکرد ، ئەوە حاڵ و وەزعی بوو ، (أبو معبد) وتی: سوێند بەخوا ئەمە ئەو پیاوەیە کە قوڕەیش بەدوایدا دەگەڕێت ، ئەرێ (أم معبد) بۆم وەسف بکە پیاوێکی چۆن بوو؟ بەپیاهەڵدانێکی جوان وەسفی کرد بەزمانێکی شیرین باسی کرد گوێگر وای دەزانی مرۆڤەکەی لەبەردەمدایە . ئەو وەسفانە لەکۆتایی باسەکە باس دەکەین ، (أبو معبد) وتی: وەڵلاهی ئەمە پیاوەکەی ناو قوڕەیشە کە ئەوەیان وتوەو دەیڵێن لەبارەیەوە ، ئەڵێی بڕۆم لەگەڵیدا بم ، هەرکاتێك بوارم هەبوو مەرج بێت شوێنی بکەوم ، پاش ماوەیەك لەدەوروبەری مەککەدا ڕۆژانە گوێیان لەدەنگێك بوو بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد قسەکەرەکەیان نەدەبینی دەیوت :

جزى اللّه رَبُّ العَرشِ خَيْرَ جزاءه رفيقــين حلاّ خَيْمَتي أُمَّ مَعْبَدِ
هُما نَزَلا بــالبِرّ وارتَحَــلا بــه وأفلح مــن أمسىٰ رفيق محمَّدِ
فيا لقصَيٍّ مــا زوى اللهُ عنكــم به من فعــالٍ لايُحاذى وسؤدد
ليهن بنى كعب مكــانُ فتــاهِم ومقعدُها للمؤمنين بــمرصَــدِ
سلوا أختكم عن شاتِها وإنــائها فإنكُم إنْ تسألوا الشــاةَ تَشْهَدِ

(اسماء) دەڵێت: نەماندەزانی کە پێغەمبەر بەرەو کوێوە دەرچووە ، جنۆکەیەك لە خوارووی مەککەوە پەیدابوو ئەم دێرە شیعرانەی دەوتەوە ، خەڵکیش بەشوێنیدا دەڕۆشتن تەنها گوێیان لە دەنگەکە بوو کابرایان نەدەبینی ، تا لە سەرەوە بۆی دەردەچوو ، (اسماء) دەڵێت: کە گوێمان لەو شیعرە بوو ئیتر بۆمان دەرکەوت کە بەرەو مەدینە تەشریفی ڕۆشتوە[1].

٥- لەڕێگەدا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە (أبا بريدة) ، کە سەرەك خێڵێك بوو ، بۆ گەڕان بەدوای پێغەمبەردا ﷺ دەرچوو بوو ، لەگەڵ (أبوبکر)دا ، بەو ئومێدەی ئەو خەڵاتە گەورەیەی دەستکەوێت کە قورەیش ڕایگەیاندبوو ، کە ڕووبەڕووی پێغەمبەر ﷺ بوەوە ، دەستبەجێ لەشوێنی خۆیدا لەگەڵ حەفتا پیاوی خۆیدا موسوڵمان بوون ، پاشان مێزەرەکەی داگرت و، بەستی لەرمەکەی و کردی بەپەرچەم کەڕاگەیاندنێك بێت بۆ ئەوەی مەلیکی ئاسایش و ئاشتی هاتوە تا دونیا پڕبکات لە دادودادپەروەری[2].

٦- هەر لە ڕێگادا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە(الزبير) ، کە لەقافڵەیەکی موسوڵماناندا بوو ، بازرگان بوون تازە لە شام دەگەڕانەوە ، (الزبير) پێغەمبەری خواو ﷺ (ابوبکر)ی بە بەرگی سپی پۆشی [3].

---
[1] / زاد المعاد ٢/٥٣ ، ٥٤.
[2] / رحمە للعالمین ١/١٠١.
[3] / بوخاری ئەوەی لە (عروە)ی کوڕی (الزبیر)ەوە گێڕاوەتەوە.

## دابەزین لە (قباء)

لە ڕۆژی دوو شەممەی (٨)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١٤)ی پێغەمبەرێتی - کە ساڵی یەکەمی کۆچییەو بەرامبەرە لەگەڵ (٢٣)ی سێپتێمبەری ساڵی (٦٢٢)ی زایین - پێغەمبەری خوا ﷺ لە (قباء) دابەزی[1].

(عروە)ی کوڕی (الزبیر) دەڵێت : موسوڵمانەکان هەواڵیان بیستبوو کە پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەرچوە ، هەموو بەیانیانێ دەهاتنە دەرەوە ، چاوەڕوانیان دەکرد تا گەرمای نیوەڕۆ ، ڕۆژێکیان پاش چاوەڕوانیەکی زۆر گەڕانەوە بۆ ماڵەوە ، کاتێك کەچوونەوە ماڵەکانیان ، پیاوێکی جولەکە بەسەر یەکێك لە دار خورماکانیانەوە بوو ، سەیری دەکرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی بینی لەناو تراویلکەدا سپییان دەکردەوە ، کابرای جولەکە خۆی پێ نەگیراو بەدەنگی بەرز هاواری کرد ، ئەی خێڵەکانی عەرەب ، ئەوە باپیرەتانە کە چاوەڕوانیتان دەکرد ، موسوڵمانان هەموو بەرەو چەکەکانیان ورووژان[2].

(إبن القیم) دەڵێت: لەناو خێڵی (عمرو)ی کوڕی (عوف) سرووودی (وجبت) و (الله أکبر) دەبیسرا ، موسوڵمانان بەهاتنی پێغەمبەر لەخۆشیدا تەکبیرەیان دەکردو ، چونە دەرەوە بۆ بەخێرهاتنی، چوونە خزمەتی و سڵاوی پێغەمبەرانەیان لێ کرد ، ئەڵقەیان بە دەوریدا بەست و لەدەوری خڕبوونەوە ، ئارامیی لێ نیشتبوو ، (وەحی) بۆ دابەزی : ﴿ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَمَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ التحریم/٤[3].

(عروە)ی کوڕی (زبیر) دەڵێت : چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، بەلای ڕاستدا لای دا ، تا لەناو خێڵی (بنی عمرو)ی کوڕی (عوف)دا دابەزی ، ئەمە لە ڕۆژی دوو شەممەی مانگی ڕەبیعی یەکەمدا بوو ، ئەنجا ئەبوبەکر هەستا بۆ خەڵکەکەو ، پێغەمبەری خواش ﷺ بەبێدەنگی دانیشتبوو ، هەندێك لەو ئەنسارییانەی کە هێشتا

---

[1] / رحمە للعالمین ١٠٢/١ لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ تەمەنی پیرۆزی (٥٣) ساڵی تەواو بوو بێ زیادوکەم ، (١٣) ساڵی تەواویش گوزەرابوو بەسەر بەپێغەمبەر بونیدا بەپێی ڕای ئەوانەی دەڵێن: لە (٩)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٤١)ی فیلدا ، شکۆدار بووە بەپێغەمبەرێتی، ئەوەش کە دەڵێت لە ڕەمەزانی ساڵی (٤١) ی فیلدا شکۆدار بووە بەپێغەمبەرێتی . بەپێی ئەم ڕایە . لەم ڕۆژەدا . دوانزە ساڵ و پێنج مانگ و (١٨) ڕۆژ یان (٢٢) ڕۆژی تەواو تێپەڕ بووە بەسەر پێغەمبەرێتیەکەیدا ﷺ.

[2] / صحیح البخاری ٥٥٥/١.

[3] / زاد المعاد ٥٤/٢.

پێغەمبەری خودایان نەدیبوو ، دەهاتنە خزمەتی بۆ سلاَو لێکردنی - لە ڕوونوسێکدا - دەهاتنە لای (أبوبکر) ، تا خۆر بەر پێغەمبەر کەوت ﷺ ، ئەنجا بە کراسەکەی سێبەری کرد بۆ سەری ، ئیدی لەوێدا خەڵك زانیان کامەیان پێغەمبەری خوایە[1].

هەموو خەڵکی مەدینە هاتبوونە دەرەوەی شار بۆ پێشوازی ، ڕۆژێکی کەم وێنە بوو کە هەرگیز مەدینە لە مێژوودا شتی وای بەخۆوە نەدیبوو ، جولەکەش ڕاستگۆیی مژدەکەی (حبقوق) پێغەمبەریان بینی کە دەڵێت: (خودا لە تەیمانەوە هات و ، قدوسیش لە شاخی فارانەوە)[2].

پێغەمبەری خوا ﷺ لە (قباء) لە ماڵی (کلثوم)ی کوڕی (الهدم) دابەزی ، وتراویشە لە ماڵی: (سعد)ی کوڕی (خیثمة) دابەزیوە ، یەکەم ڕاستترە ، (علی) کوڕی (أبی طالب) یش لەمەککەدا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مایەوە ، هەتاکو سپاردەکانی پێغەمبەر ﷺ ی دایەوە کە خەڵك لەلای دایان نابوو ، پاشان بە پێ کۆچی کرد بۆ مەدینە ، لە (قباء) پێیان گەیشت ئەویش لە ماڵی (کلثوم)ی کوڕی (الهدم) دابەزی[3].

پێغەمبەری خوا ﷺ لە (قباء) چوار ڕۆژ مایەوە: دووشەممەو سێشەممەو چوار شەممەو پێنج شەممە[4]، مزگەوتی (قباء)ی دروست کردو نوێژی تێدا کرد ، ئەوە یەکەم مزگەوت بوو لە دوای پێغەمبەرێتیدا بنیاتنرا بێت لەسەر تەقوا ، کە ڕۆژی پێنجەم هات ڕۆژی هەینی بوو ، بەفەرمانی خوا سوار بوو ، (أبوبکر) یش لە پشتیەوە بوو ، ناردی بەشوێن ماڵی (بنی نجار)ی خاڵوانی - دا هەموویان بە چەکەوە هاتن ، بەرەو مەدینە کەوتەڕێ ، لەخێڵی (بنی سالم) کاتی جومعە هات ، هەموویانی کۆکردەوە لەناو مزگەوتی شیوەکەدا - نزیکەی سەد پیاو دەبوون[5].

---

[1] / صحیح البخاری ١/٥٥٥.

[2] / صحیفە (حبقوق) (٣:٣)

[3] / زاد المعاد ٢/٥٤ ، إبن هشام ١/٤٩٣ ، رحمه للعالمین ١/١٠٢.

[4] / ئەمە ریوایەتەکەی (إبن إسحاق)ە ، سەیرکە (إبن هشام) ١/٤٩٤ ، عەللامە (المنصور الفوری) ئەم ڕایەی پەسەند کردووە ، بڕوانە (رحمە للعالمین) ١/١٠٢ ، لە (صحیح البخاری) یشدا هاتوە کە (٢٤) شەو لە (قباء) دا ماوەتەوە ، ١/٦١ هەروەها دەڵێن لە دە شەو زیاتر ١/٥٥٥ ، چواردە شەو ١/٥٦٠ ، (إبن القیم) ئەم ڕایەی کۆتایی پەسەند کردوە ، لەکاتێك دا کەخۆی دەڵێت: ڕۆژی دابەزینی لە (قباء) ڕۆژی دووشەممە بوو ، ڕۆژی دەرچوونیشی ڕۆژی هەینی بوو ، بەیەکیشەوە لە (١٢) ڕۆژ تێناپەڕێت ئەگەر باسەکە دوو هەفتە بێت.

[5] / (صحیح البخاری) ١/٥٥٥ ، ٥٦٠، زاد المعاد ٢/٥٥ ، إبن هشام ١/٤٩٤ ، رحمه للعالمین ١/١٠٢.

# چوونە ناو مەدینە

پاش ئەنجامدانی نوێژی هەینی پێغەمبەر ﷺ چووە ناو مەدینە ، لەو ڕۆژەوە (یثرب) ناونرا بە (مدینة الرسول) شارەکەی پێغەمبەر ﷺ، بەکورتی ناونرا (مدینة) بەڕاستی ڕۆژێکی پیرۆزبوو، هەموو ماڵ و ڕێگاوبانەکان دەزرنگایەوە بەدەنگی سوپاسگوزاری و تەسبیحات کردن ، کچانی ئەنساریش بەم دێرە شیعریە لەخۆشیدا گۆرانیان دەوت :[1]

أشرق البــدر علـينــا      من ثنيــات الــــوداع

وجب الشكــر علـينـا      مــا دعــا للّـــــه داع

أيهــا المبعــوث فينــا      جئت بــالأمر المطـــاع

ئەنسارییەکان خاوەن سەروەت و سامانی زۆر نەبوون ، کەچی هەموو یەکێکیان حەزی دەکرد پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەی دابەزێت ، بەلای هەر ماڵێکی ئەنسارییدا دەگوزەرا جڵەوی وشترەکەیان دەگرت و پێیان دەوت: وەرە بۆلای ئەم هەموو حەشامات و تواناو چەك و هێزو دەسەلاتە ، ئەویش خۆش خۆش دەیفەرموو: وازی لێ بهێنن ئەوە فەرمانی پێدراوە ، وشترەکە ڕۆشت تاگەیشتە ئەم شوێنەی ئێستای مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و چۆکی دادا ، لەسەری دانەبەزی هەتا جارێکی هەستایەوەو کەمێکی تر ڕۆیشت ، ئەنجا گەڕایەوەو هاتەوە شوێنی یەکەم و چۆکی داو دانیشت .

ئەنجا پێغەمبەر ﷺ لەسەری دابەزی ـ ئەم شوێنەش لەناو خێڵی (بنی النجار)ی خاڵوانیدا بوو.

ئەوەش ڕێنوماییەکی خوایی بوو ، چونکە خۆی حەزی دەکرد لەلای خاڵۆوانی دابەزێت بۆ ڕێز لێ گرتنیان ، خەڵك کەوتنە قسەوباس لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئەوەی لای ئەوان دابەزێت ، (أبوأیوب الأنصاري) خێرا دەست پێشخەری کرد بۆ جڵەوی وشترەکەو بردیە ماڵەکەی خۆیەوە ، پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی ، مرۆۃ دەبێت لەگەڵ ولاخ و کەل و پەلەکەی خۆیدا بێت ، (اسعد)ی کوڕی (زرارە)ش هات جڵەوی وشترەکەی گرت و بەلایەوە بوو[2].

---

[1] / (إبن القیم) دەڵێت: وتنی ئەو شیعرانە لە ڕۆژی گەڕانەوەی (تبوك) دابوە و بەهەڵەدا چووە ئەو کەسەی وا بزانێت لەڕۆژی تەشریف هێنانیدا بوە بۆ مەدینە (زادالمعاد٣/١٠)، بەلام (إبن القیم)یش بەڵگەیەکی دڵنارامکەری لەوبارەیەوە نەهێناوە، عەللامە (المنصور فوري) دەڵێت ئەوە شیعری پێشوازی مەدینەیە، چەند بەڵگەیەکیشی هێناوە کە ناکرێت بدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا . بڕوانە (رحمه للعالمین) ١٠٦/١.

[2] / رحمة للعالمین ١٠٦/١ ، زاد المعاد ٥٥/٣.

له ریوایەتەکەی (انس)دا کە لای (بوخاری)یە هاتووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چ ماڵێك نزیکە ؟ (أبوأیوب) وتی: ماڵەکەی من پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەمەش دەرگاکەیەتی ، فەرمووی: کەواتە هەستە جێگەیەکمان بۆ ئامادە بکە ، وتی: کەواتە پشت بە خوا هەستن[1].

پاش چەند ڕۆژێکی تر (سودە)ی هاوسەری و هەردوو کچەکەی (فاطمة) و (أم کلثوم) و (أسامە)ی کوڕی (زید) و (أم أیمن) گەیشتن ، (عبدالله)ی کوڕی (ابوبکر) هەموویانی هێنابوو بەمناڵەکانی (أبوبکر)یشەوە ، هەروەها عائشەیان تێدا بوو ، بەڵام (زەینەب)ی کچی پێغەمبەر ﷺ کە ژنی (أبی العاص) بوو مێردەکەی نەیهێشتبوو تا لەدوای شەڕی (بدر)ەوە ئەویش کۆچی کرد[2].

(عائشە) دەڵێت : کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەدینە ، (أبوبکر) و (بلال) نەخۆش کەوتن ، چوومە لایان وتم : بابە ، چیتە ؟ ئەریٚ : (بیلال) چیتە ؟ عائیشە دەڵێت : هەر کاتێك (ابوبکر) (تا) بیگرتایە ئەم شیعرەی دەخوێندەوە :

کُــــل إمرئٍ مصبّحٍ في أهله　　　　والموت أدنى من شراك نعله

(بیلال)یش کەنەخۆشیەکەی لەکۆڵ بوایەتەوە، سەری دەردەهێناو دەیوت:

ألا ليت شعري هل أبيتن ليلة　　　　بواد وحولى أذخر و جليلُ

وهَــــل أرَدن يوماً ميـــاه مجنَّة　　　　وهل يَبْدونْ لى شامةٌ وطفيلُ

عائشە دەڵێت : هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵم پێدا ، ئەویش ئەم نزایەی کرد بۆ مەدینە : ( اللهم حبب إلينا المدينة كحبنا مكة أو أشد حباً ، و صححها ، و بارك فى صاعها ومدّها ، وأنقل حمّاها ، فأجعلها بالجحفة )[3] واتــە: "خوایە ، مەدینەشمان لەلا خۆشەویست بکە بەئەندازەی خۆشەویستی مەککەو زیاتریش و ، ڕاساڵیکە ، گەزو پێوانە و مامەڵەی پیرۆز بکە ، بیپارێزیت بیخەیتە (جحفە) وە .

تائێرە بەشێك لەژیانی پێغەمبەر ﷺ کۆتایی هات و ، خولێکی بانگەوازی ئیسلامی کۆتایی هات ، کە خولی بانگەوازی مەککەیە.

---

[1] / صحیح البخاری ٥٥٦/١.
[2] / زاد المعاد ٥٥/٢.
[3] / صحیح البخاری ٥٨٨/١ ، ٥٨٩.

## ﴿ ژیـــان لەنـــاو مــەدینــەدا ﴾

دەکرێت سەردەمی قۆناغی مەدینەیی بکەین بە سێ بەشەوە :

١. قۆناغێك کە چەند کێشەو ئاشوبێکی تێدا وروژێنراو لە ناوخۆوە چەندین کۆسپ و تەگەرە دانران و دوژمنان هەڵیانکوتایە سەر مەدینە بۆ لەڕیشە دەرهێنانی سەوزاییەکانی شار ، ئەم قۆناغە کۆتایی دێت بە سوڵحی ( حودەیبیە ) لە مانگی ( ذی القعدة )ی ساڵی ( ٦ ) کۆچیدا .

٢. قۆناغی شەڕوەستان لەگەڵ سەرکردایەتی بتپەرستیداو ، لە ڕەمەزانی ساڵی ( ٨ ) کۆچیدا، کۆتایی دێت بەفـەتحی مەککـە ، ئەمەش قۆنـاغی بانگـەوازی مەلیکەکانە بۆ ئیـسلام.

٣. قۆناغی پۆل پۆل موسوڵمان بوونی خەڵك ، ئەمەش قۆناغی هاتنی شاندی خێڵ و تیرەکانە بۆ مەدینە ، ئەم قۆناغە تا کۆتایی ژیانی پێغەمبەر ﷺ درێژ دەبێتەوە لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ( ١١ ) ی کۆچیدا .

کۆچ کردن تەنها مانای ئەوە نەبوو ، کە ڕزگاربوون بێت لە گۆبەنگ و گاڵتە جاڕی بتپەرستان و بەس ، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا کۆچکردن بریتی بوو لەبنیاتنانی کۆمەڵگای نوێ لەولاتێکی هێمندا، لەبەرئەوە بوو بەئەرك لەسەر هەموو موسوڵمانێکی خاوەن توانا کە بەشداری بکات لە دروستکردنی ئەو نیشتمانە نوێیەداو هەوڵی پتەو کردن و بەرزکردنەوەی پلەوپایەی بدات .

گومانی تێدانیە کەپێغەمبەری خوا ﷺ تەنها پێشەواو سەرکردەو ڕێنوما بوو لە بنیاتنانی ئەو کۆمەڵگایەدا، هەموو مەسەلەکان بەبێ سێ‌ودوو بۆلای خۆی دەگەڕایەوە.

ئەو خەڵکانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەدا ڕووبەڕوویان دەبوەوە سێ جۆر بوون ، هەریەکێك لەو جۆرانە جیاوازیەکی ئاشکرای هەبوو لەگەڵ ئەوانی تردا ، هەر جۆرێك پرسیارو کێشەیەکی تایبەتی ڕووی تێ دەکرد کە جیا بوو لەوانی دی ، ئەو سێ جۆرەش بریتی بوون لە :

١ . مرۆڤە پوختە بەڕێزەکانی هاوەڵی (ڕ) .

٢ . ئەو موشریکانەی کە هێشتا باوەڕیان نەهێنا بوو ، ئەمانە تیرەو هۆزەکانی مەدینە بوون .

٣ . جولەکە ،

أ / ئەو مەسەلانەی ڕووبەڕووی هاوەڵەکانی دەبوەوە بریتی بوو لە بارو دۆخی شاری مەدینە ، کە سەبارەت بەئەوان جیابوو لەو بارودۆخەی کە لەمەککەدا بینیبوویان ، ئەوان لە مەککەدا با لەدەوری یەك وشەش کۆبوێتنەوەو ، بەدیهێنانی یەك ئامانجیش مەبەستیان بووبێت ، بەلام بەچەند ماڵێکی جیاوازو دورلەیەك دابەش بووبوون ، ژێردەست و چەوساوە بوون ، هیچ کاروبارێکیان بەدەستەوە نەبوو ، بەڵکو کاروبار بەدەست دوژمنەکانیانەوە بوو ، لەبەرئەوە ئەو موسوڵمانانە نەیاندەتوانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی نوێ دروست بکەن بەو کەرەستانەی ، کە هەر کۆمەڵگایەکی مرۆڤی لە دونیادا ناتوانێت دەستبەرداری ببێت ، لەبەرئەوە دەبینین سورەتە مەککەییەکان باس لە وردو درشتی پرەنسیپە ئیسلامیەکان دەکەن ، لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە لەسەر ئاستی تاك کاری پێ دەکرێت و ، هاندانی تاك بۆ چاکەو خێرو بنەماکانی ڕەوشت و ، دورکەوتنەوە لە خراپەو تاوانەکان .

بەلام لە مەدینەدا هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کاروبارەکان بەدەست خۆیانەوە بوو ، هیچ کەس بالادەست نەبوو بەسەریانەوە ، پێویست بوو لەسەر شانیان کە ئیدی بە مەسەلەکانی ژیاریی و ئاوەدانی و ، گوزەران و ئابووری و سیاسەت و حکومەتداری و مەسەلەی شەڕو ئاشتیی‌یەوە سەرقاڵ بێن ، لەگەڵ پالاوتنێکی تەواوی مەسەلەکانی حەلاڵ و حەرام و خواپەرستی و ڕەوشت و هەرچی مەسەلەیەکی‌تر کە پەیوەندیدار بێت بە مەسەلەکانی ژیانەوە .

کاتی ئەوە هاتبوو کەکۆمەڵگایەکی نوێ دروست بکەن، کۆمەڵگایەکی ئیسلامی ، لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا جیابێت لە کۆمەڵگای نەفامی‌و، ناوازە بێت لەناو هەر کۆمەڵگایەکی تری جیهانیداو ببێتە نوێنەری ئەو بانگەوازە ئیسلامیەی لەپێناویدا موسوڵمانەکان چەندین جۆری چەوساندنەوەو ئەشکەنجەیان چەشت لەماوەی (١٠) ساڵدا .

شاراوەش نیە کە پێکهێنانی هەر کۆمەڵگایەك لەسەر ئەو شێوازە ناکرێت بە ڕۆژێك ، یان مانگێك ، یان ساڵێکیش ئەنجام بدرێت ، بەڵکو پێویستی بەکاتێکی دوورو درێژ هەیە ، کە تیایدا یاسادانان و نوسینەوەو هۆشیارکردن و مەشق پێکردنی لەسەرخۆ ئەنجام بدرێت ، سەبارەت بەیاسا کە خودای گەورە خۆی ڕێکی خست ، پێغەمبەری خواش ﷺ جی‌بەجێی دەکردو ، ڕێنومایی بۆدەکردو ، عەقڵ و پەروەردەی موسوڵمانی لەسەر پێدەگەیاند ﴿ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾ الجمعة/ ٢، واتە: خوای گەورە لەناوەندی نەخوێندەوارەکاندا پێغەمبەرێکی لەخۆیان نارد ، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوەو پاکیان دەکاتەوەو فێری کیتابی خوداو داناییان دەکات ، هاوەلانیش بە دڵ و گیان ڕوویان کردبوە خوای گەورە ، خۆیان بەئەحکامەکانی دەڕازاندەوەو مژدەیان پێدەدات : ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً ﴾ الأنفال / ٢، واتە: کاتێك ئایەتەکانیان بەسەردا دەخوێنرایەوە باوەڕیان زیادی دەکرد ، ئەم باسانەش جێگەی قسەوباسی ئێمە نین ، بۆیە بەپێی پێویست ئاماژەی بۆ دەکەین .

گەورەترین شت سەبارەت بەموسوڵمانەکان کە پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕووی دەبوەوەو، هەرئەوەش لەسەر ئاستە بالاکە جێگەی مەبەست بوو لە سەرووی بانگەوازی ئیسلامی و، پەیامی موحەممەدەوە ﷺ ، ئەمەش کێشەیەکی ناکاوی سەرپێی نەبوو ، جگە لەوانە چەندین کێشە هەبوو پێویستی بەچارەسەری پەلە هەبوو .

کۆمەڵی موسوڵمانان دووبەش بوون :

بەشێکیان لە خاك و ئاوو ماڵ و حاڵی خۆیاندا بوون ، ئەوەندەیان بەلاوە گرنگ بوو کە پیاو لەماڵی خۆیدا بیوەی بێت ، ئەوانە **ئەنسارییەکان** بوون ، لەناو خۆیاندا دوژمنایەتیەکی هەمیشەیی و لێك دوریەکی تەواویان هەر لەدێر زەمانەوە هەبوو ، لەپاڵ ئەمانیشەوە بەشێکی تر هەبوون ، ئەمانیش **کۆچکەران** بوون . هەموو شتێکیان لەدەست چووبوو . تەنها خۆیان دەرچوو بوون بۆ مەدینە ، شوێن و پەناگەیەکیان نەبوو ، کارێکیشیان نەبوو گوزەرانی خۆیانی پێ بە ڕێ بکەن ، ماڵ و سامانێکی ئەوتۆشیان نەبوو حاڵی خۆیانی پێ ڕاست بکەنەوە ، ژمارەی ئەو پەنابەرانە کەم نەبوو رۆژ بە رۆژ زیادیان دەکرد ، پێشتریش مۆڵەتی کۆچ درابوو بەهەموو ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوە ، زانراویشە کەشاری مەدینە سەروەت و سامانێکی زۆری نەبوو ، بەو کۆچ کردنە هاوسەنگی ئابووری شارەکە لاسەنگ بوو ، لەوکاتە تەنگانەیەشدا هێزە نەیارەکانی ئیسلام نیمچە ئابڵۆقەیەکی ئابووریان لەسەر دانابوو ، بۆیە بارودۆخ خراپتر بوو، دەرامەتیش کەم بووەوە.

ب / کۆمەڵەیەکی تر . کە بریتی بوون لە موشریکانی ناو خێڵەکانی مەدینە ، هیچ دەسەڵاتێکیان بەسەر موسوڵمانەکاندا نەبوو ، تیایاندا هەبوو لەسەر گومان دەژیاو دوودڵ بوو لەوەی واز لەئاینی باوباپیرانی بهێنێت ، بەلاّم هیچ جۆرە دژایەتی و ڕقەبەرایەتیەکی بەرامبەر بەئیسلام و موسوڵمانەکان نەبوو ، زۆریان پێ نەچوو موسوڵمان بوون مرۆڤی ئایین پەروەریان لێ دەرچوو .

تیایشیاندا هەبوو کەدوژمنایەتی و ڕقێکی زۆری لەدڵدا بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان ، بەلاّم کەسێکیان نەیدەتوانی دژ بەموسوڵمانەکان بوەستێت ، بەڵکو ناچاربوو خۆشەویستی و دڵسافی خۆی بەپێی بارودۆخەکە نیشان بدات، لەسەرووی ئەوانەوە (عبدالله)ی کوڕی (أبی) وەستابوو ، کەپاش جەنگی (بعاث) هەردوو خێڵی (أوس) و (خزرج) لەسەر سەرۆکایەتی ئەو ڕێك کەوتبوون و ، پێشتریش بەو شێوەیە لەسەر سەرۆکایەتی هیچ کەسێ کۆ نەبووبونەوەو ، جێگەو پلەوپایەیان بۆ ڕازاندبۆوە ، بۆ ئەوەی بیخەنە سەر کورسی و تاجی مەلیکایەتی لەسەر دابنێن ، خەریکبوو دەبوە مەلیکی مەدینە بەهۆی هاتنی ناکاوی پێغەمبەر ﷺ و لێتەکینەوەی خێڵەکەی لێی ، (عبدالله) پێی وابوو کە پێغەمبەر ﷺ مەلیکایەتی لێ زەوت کردوە، بۆیە لەناخەوە دژایەتی پێغەمبەری دەکرد ﷺ . کە بینی بارودۆخەکە ڕێگەی موشریك بونی نادات و بەرژەوەندیە دونیاییەکانی خۆی

له دهست ئهدات ، دوای جهنگی بهدر ئیسلامهتی خۆی ئهرخست، بهڵام لهدڵدا بهكافری مایهوه، دهرفهتی بۆ نهدهڕهخسا كه فرتوفێڵێك بهكاربهێنێت دژ بهپێغهمبهر ﷺ و موسوڵمانهكان نهیكات ، . هاوڕێكانیشی لهو سهرانهی كه بێبهش بووبوون لهگهڵ خۆیدا بهشداریان دهكردو پشتیوانی جێبهجێ كردنی پلانهكانی ئهویان دهكرد ، ههندێ جاریش ههرزهو دهروون نهخۆشه موسوڵمانهكانیان بهكاردههێنا وهك كرێگرتهی خۆیان ، بۆ جێبهجێ كردنی نهخشهكانیان.

ج / كۆمهڵی سێیهم بریتی بوون له – جولهكه – ههروهكو پێشتریش باسمان كرد ، ئهمانه لهرۆژگارهكانی چهوساندنهوهی ئاشووری و رۆمانیدا لایان دابوو بهلای (حجاز) داو، لهڕاستیدا عیبری بوون ، بهڵام پاش پاشه كشهكهیان بۆ حیجاز شهقڵی عهرهبیان وهرگرت له جلوبهرگ و زمان و ژیاریاندا، تاوای لێ هات ناوی خێڵ و كهسهكانیشان بوو بهعهرهبی، لهگهڵ عهرهبهكاندا پهیوهندی ژن ژنخوازی و خزمایهتیان دروستكرد ، بهڵام ههر به ڕهگهزه دهمارگیریهكهی خۆیان مانهوهو لهگهڵ توخمی عهرهبدا ههرگیز تێكهڵنهبوون، بهڵكو ههمیشه شانازیان به ڕهگهزه ئیسرائیلیه جولهكایهتیهكهی خۆیانهوه دهكردو بهچاوێكی سووكایهتی زۆرهوه سهیری عهرهبهكانیان دهكرد تا ڕادهیهك پێیان دهوتن (أميّ) نهخوێندهوار ، بهمانای گهمژهیی و وهحشیگهری و دواكهوتوو ، پێیان وابوو ههموومالّی عهرهب بۆ ئهوان ڕهوایهو ، چۆن پێیان خۆشه دهتوانن بیخۆن : ﴿ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ ﴾ آل عمران/٧٥، واته: (جولهكه دهیانوت ئێمه سهبارهت بهئوممیهكان دهربهستی هیچ نین، هیچ تاقهتێكی ئهوهیان نهمابوو ئایینهكهیان بلاوبكهنهوه بهڵكو ئایینیان كردبوه ، فالگرتنهوه جادوگهری و فوپیاكردن و نوشتهو شتی لهو جۆرهو ، بهو شێوهیه خۆیان بهخاوهن زانست و ڕێزو پێشڕهویی رۆحانیی دهزانی ./

لهشێوازی كاسپی و گوزهراندا شارهزابوون ، بازرگانی دانهوێڵهو خورماو شهراب و كالآیان بهدهستهوه بوو، دانهوێڵهو كالاو شهرابیان دههێناو خورماكهیان دهنارد ، جگه لهمانه كاری تریشیان ههبوو ، قازانجی دوو ئهوهندهیان له بهشێكی زۆری عهرهب وهردهگرت و ، بهوهشهوه نهدهوهستان ، بهڵكو سووخۆریشیان دهكرد ، قهرزیان دهدا به پیرو پیاوماقولانی عهرهب ، بۆ ئهوهی شاعیران پیایاندا ههڵدهن و ، لهناو خهڵكیدا بهپاره خهرجكردنی بێهودهو بێكهڵك شۆرهت و ناوبانگ پهیدا بكهن ، پاشان دهچوون زهوی وزارو مهزراو باخچهكانی ئهو سهره عهرهبانهیان به ڕههن دهگرت ، پاش ماوهی چهند ساڵێك تێدهپهڕی دهبووه موڵكی خۆیان .

جولەکە پیلانگێرو ئاژاوەچی و سەرسەخت و خراپەکار بوون ، لەنێوان خێڵە عەرەبە دراوسێکاندا دوژمنایەتی و کێشەیان دروست دەکرد، هانی هەندێکیان دەدا دژ بەوانی تریان بەفێڵی پەنامەکی وەها ئەو خێڵانە هەستیان پێ نەدەکردو ، دەکەوتنە جەنگی خوێناوی بەردەوام لەگەڵ یەکتریدا ، بەردەوام جێگە دەستی جولەکە بۆ ئاگری شەڕ ، ئاژاوەکەیان گەشتر دەکردەوە هەرکاتێك بینییان خەریکە دەکوژێتەوە ، پاش ئەم هەموو فێڵو تەڵەکەیە کە لەهەموولایەکەوە دەست دابویە، لەئاستی ئەو ڕووداوانەدا کە بەسەر عەرەبدا دەهات بێدەنگ دەبوون، بەڵێ هەمیشە قەرزی سوداری زۆریان پێدەدان تاکو خەرجی شەڕیان بۆ ئاسان بکەن ، بەمکارە دوو سوودیان دەستدەکەوت ، کە لەلایەکەوە قەوارە جولەکەیتیەکەی خۆیان دەپاراست و لەلایەکی تریشەوە، بازاڕی سوودیان دەجولاندو، سوودەکەیان بە چەندین چەندانە دەخواردو ، سامانێکی زۆریان دەست دەکەوت .

لەناو (یثرب) دا سێ هۆزی جولەکەی بەناوبانگی تێدا بوو:

١. (**بنو قینقاع**) ، کە هاوپەیمانی (خەزرەج) یەکان بوون و دانیشتووی ناو شاری مەدینە بوون.

٢. (**بنو النضیر**).

٣. (**بنو قریظة**) ، ئەم دوو هۆزەی دوایین هاوپەیمانی (أوس) بوون ، ماڵەکەیان لە قەراغ شاردا بوو ، ئەم هۆزانە بوون ، کە هەر لەدێر زەمانەوە جەنگی نێوان (أوس) و (خەزرەج) یان دەوروژاند ، بەخودی خۆشیان لە جەنگی (بعاث) دا بەشداریان کردبوو ، هەرلایەکیان لەگەڵ هاوپەیمانی خۆیاندا .

بێگومان چاوەڕوان دەکرا کە جولەکە بەچاوی ڕق و کینەوە نەبێت سەیری ئیسلام نەکەن ، پێغەمبەریش ﷺ لە ڕەگەزی ئەوان نەبوو تا سوکنایی دڵیان بێت و واز لەو دەمارگیریە بهێنن کە زاڵ بووبوو بەسەر دەروون و عەقڵیەتیاندا ، پاشان ئیسلامیش بانگەوازێك بوو بۆ ڕێکخستن و ئاشناکردنی دڵەکان بەیەکترو ، بۆ کوژاندنەوەی ئاگری دوژمنایەتی دووبەرەکیی و ، بانگەشەی دەکرد بۆ سپاردە ناسیی لەکاروبارو ، بۆ پابەندبوون بەخواردنی ماڵی حەڵاڵ ، ئەمانەش مانای ئەوەبوو، کە چیدی لەمەودوا هۆزە عەرەبەکان بەیەکتر ئاشنا دەبنەوە، ڕزگاریان دەبێت لە میکرۆبەکانی جولەکەو چالاکیە بازرگانیەکانیان دەوەستێتو لەو ماڵی سوودە بێبەش دەبن کەسەروەت و سامانەکەیانی لەسەر وەستاوە ، بەڵکو لەوانەیە ئەو هۆزانە بێداربینەوە، مەسەلەی ئەوماڵە سوانەی جولەکە وەریانگرتوەو ، هەستن بەگێڕانەوەی ئەو زەوی و باخ و بێستانەی لەدەستیان داوەو لەباتی سوودا داویانە بەجولەکە.

جولەکە ئەم هەموو لێکدانەوانەیان بۆخۆیان کردبوو، هەر لەوکاتەوە کە دەیانزانی ئیسلام دەیەوێت ئارامی لەناو (یثرب)دا بەرقەرار بکات ، لەبەرئەوە دوژمنایەتی و کینەیەکی زۆریان لە دڵدا هەڵگرتبوو بۆ ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەوە کە چوونە ناو (یثرب) ەوە ، هەرچەندە تاماوەیەك زاتی دەرخستنی ئەو ڕق و کینەیان نەکرد تا ماوەیەك .

ئەوەش لە ریوایەتێکی (إبن إسحاق) دا دەردەکەوێت کە دەڵێت:

لەدایکی ئیمانداران (صفیة) وە (ڕەزای خوای لێبێ)، (إبن إسحاق) دەڵێت:

(صفیة) کچی (حیي) کوڕی (أخطب) بۆی گێڕامەوەو وتی:

خۆشەویسترین منالی باوکم و، (أبو یاسر)ی مامم بووم ، هەرگیز نەمبینیون منالێکی تری خۆیان پێ بێت و من لەگەڵ خۆیاندا نەبەن ، دەڵێت : کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە ، لە (قباء) لەماڵی (بنی عمرو)ی کوڕی (عوف) دابەزی ، لە بەرەبەیانێکی تاریکدا باوکم (حیي) کوڕی (أخطب) و مامم (أبو یاسر)ی کوڕی (أخطب) چوون بۆلای ، (صفیە) دەڵێت : نەگەڕانەوە تا خۆرئاوابوون، دەڵێ : وەك دوو پەك کەوتەی تەمبەڵی بەسەریەکدا کەوتوو لەسەرخۆ دەهاتن ، (صفیە) دەڵێت : ئامبازیان بووم وەك جاران، سوێند بەخوا کەسیان لایان لێ نەکردمەوە ، لەگەڵ ئەو هەمووخەمەدا کەهەیانبوو، ئەنجا گوێم لێ بوو مامم بەباوکمی وت : ئەرێ ئەوە خۆی بوو ؟

وتی : ئەرێ وەڵلا خۆی بوو ، مامم وتی : تۆ دەیناسیت و دڵنیاییت ؟

باوکم وتی : بەڵێ ، مامم وتی : چی لەدڵتایە بۆی ؟

باوکم وتی : سوێند بێت تا لە ژیاندا بم دژایەتی دەکەم[1] .

ریوایەتەکەی (بوخاری) یش بە هەمان شێوە بەڵگەیە کە لەبارەی ئیسلام بوونی (عبداللە)ی کوڕی (سلام) وە ﷺ دەیگێڕێتەوە ، ئەم پیاوە یەکێك بوو لە زانا بلیمەتەکانی جولەکە ، کاتێك کەلە (بنی النجار) بیستبووی بەتەشریف هێنانی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە بەخێرایی هاتبوو، چەند پرسیارێکی لێکردبوو کە جگە لەپێغەمبەر کەس ناتوانێت وەڵامی بداتەوە ، کاتێك وەڵامی پرسیارەکانی بیست دەستبەجێ باوەڕی پێ هێنابوو ، پاشان وتبووی بەپێغەمبەر ﷺ: جولەکە گەلێکی بوختانکەرن ، ئەگەر بزانن موسوڵمان بووم پێش ئەوەی تۆ پرسیاریان لێ بکەیت

---

[1] / (إبن هشام) ١ / ٥١٨ ، ٥١٩ .

ئەوا لای جەنابت درۆم بەدەمەوە هەڵدەبەستن ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێن جولەکەدا هاتن ، ئەنجا (عبدالله)ی کوڕی (سلام) هاتە ژوورەوە ، پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە جوەکان و فەرمووی : (عبدالله)ی کوڕی (سلام) لەناوتاندا پیاوێکی چۆنە ؟

وتیان زاناترین کەسی ئێمەیەو کوڕی زاناترین کەسمانە ، باشترینمانەو کوڕی باشترینمانە . (لەگێڕانەوەیەکی تردا) گەورەمانەو کوڕی گەورەمانە (لە گێڕانەوەیەکی تردا) باشترینمانەو کوڕی باشترینمانە ، ڕێزدارترینمانەو کوڕی ڕێزدارترینمانە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەگەر زانیتان کە موسوڵمان بوە ؟

وتیان : پەنا دەگرین بە خوا لە شتی وەها (دووجار تا سێجار ئەمەیان وتەوە) . ئەنجا (عبدالله)ی کوڕی (سلام) هاتە دەرەوە ، وتی: ( أشهد أن لا إله ألاّ الله وأشهد أنّ محمداً رسول الله) ، هەموویان وتیان : خراپترینمانە کوڕی خراپترینمانەو ، دەستیان کرد بەجنێو پێدانی. لە (دەربڕینێکیشدا) وتی: خێڵی جولەکە لەخوا بترسن، سوێندم بەو خودایەی کەجگە لەئەو کەسیتر خودانیە ئێوە دەزانن کە ئەو پیاوە پێغەمبەری خوایەو، بەڕاستی هاتووە، کەچی پێیان وت: تۆ درۆ دەکەیت[1] .

ئەمە یەکەم ئەزموون بوو ، کە لە یەکەم ڕۆژی چوونە مەدینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جولەکەی وەرگرت .

ئەمە سەبارەت بەناوخۆ ، لە ڕووی دەرەکیشەوە ، دیارە کە سەرسەختترین هێزی دژ بەئیسلام بریتی بوو لە قوڕەیش ، کە لەماوەی دە ساڵدا ، لەو کاتەوە کە موسوڵمانەکان لەبن دەستیاندا بوون . هەموو جۆرەکانی تۆقاندن و هەڕەشەو تەنگەتاو کردن و سیاسەتی برسیی کردن و ئابلۆقەدانی دژ بەئەوان تاقیکردەوە ، چەندین جۆری ئەشکەنجەو ئازاروبەلاّیان بەسەرداهێنان و، جەنگێکیکی دەروونی سەرومڕو پڕو پاگەندەیەکی بەرفراوانی بەرنامە بۆ داڕێژراویان لەگەڵدا ئەنجامدان و ، پاشانیش کە موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بەرەو مەدینە (قوڕەیش) هەستا بە دەست بەسەراگرتنی ماڵ و سامانیان و نەیهێشت ژن و منالەکانیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن و هەستا بەسزادان و گرتنی ئەو کەسانەی توانایان بەسەریاندا هەبوو ، بەوەشەوە نەوەستان ، بەڵکو پیلانیان دانا بۆ کوشتنی پێشڕەوی بانگەوازەکە ﷺ و لەناوبردنی بانگەوازەکەو ، هیچ کەم تەرخەمیەکی نەکرد لە جێبەجێ کردنی ئەم پیلانەدا . پاش

---

[1] / سەیرکە (صحيح البخاري) ٤٥٩/١ ، ٥٥٦ ، ٥٦١ .

ئەمانە . کە موسوڵمانەکان خۆیان ڕزگارکرد بەرەو شوێنێك کە پێنج سەد کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە . بەحوکمی ئەو پلەوپایە سەرکردایەتیە دونیایی و سەرمەشقییە ئاییینەی هەیانبوو لەناو عەرەبدا هەستان بەڕۆڵی سیاسیانەی خۆیان، بەو سیفەتەی کەنیشتەجێ حەرەم و دراوسێی ماڵی خواو سادینەکانیشن ، بۆیە موشریکەکانی تری ناودورگەی عەرەبیان فریودا دژ بەخەڵکی مەدینە ، تا شاری مەدینە وای لێهات ، بوو بەنیمچە دابڕاوێکی مەحکەم ، داهاتی کەم بوەوە ، لەکاتێکدا کە ژمارەی پەنابەران ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر دەبوو ، گومان نیە کە (حاڵەتی جەنگ) دەبێت ڕوودات لەنێوان زاڵمانی خەڵکی مەککەو موسوڵمانەکانی نێو نیشتمانە نوێیەکەیاندا ، بۆیە گێلیە کە ئۆباڵی خەتای ئەو جەنگە بخرێتە ئەستۆی موسوڵمانەکانەوە [1] .

موسوڵمانەکان مافی خۆیان بوو کەدەست بەسەر ماڵ و سامانی موشریکەکاندا بگرن ، هەروەکو ئەوان ماڵ و سامانی ئەمانیان تالاَن کردو ، بەرپەرچی ئازارو ئەشکەنجەکانیان بدەنەوەو ، کۆسپ لەڕێی ژیانیاندا دروست بکەن هەروەکو موشریکان وایانکرد لە موسوڵمانەکان و هەوڵیاندەدا ڕێگەیەك بدۆزنەوە بۆ تەفروتونا کردنی موسوڵمانەکان و لەبن هێنانی بەرو بومیان .

ئەمانە ئەو کێشەو دۆزانە بوون کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاتنیدا بۆ مەدینە ڕووبەڕوویان دەبوەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بەڕۆڵی پەیامدارێتی و سەرکردایەتی لە مەدینەدا ، بەئەندازەی شایستەیی هەر کۆمەڵێك بەزەیی و ڕەحمەت یان توندی و هەق لێ کردنەوەی پێدان . گومان نیە کە ڕەحمەت زۆرتربوو لەتوندو تیژیەکانی . هەتا لەماوەی چەند ساڵێکدا جڵەوی کاروبار گەڕایەوە دەست ئیسلام و هەڵگرانی ، خوێنەرانی بەڕێزیش ئەم ڕاستیانە لەم لاپەڕانەدا دەبینن :

## بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ

وەکو وتمان هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە ، لەناو (خێڵی بنی النجار)دا لە ڕۆژی هەینی (١٢)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١)ی کۆچیدا بوو بەرامبەر بە (٢٧) سێپتێمبەری ساڵی (٦٢٢)ی زایین ، لە زەویەکی بەردەم ماڵی (ابو ایوب)دا دابەزی و فەرمووی: خوایاربێت ئێرە مەنزڵگایە، پاشان چووە ماڵی (أبی ایوب).

---

[1] / دوا وتە لێرەدا هی (محمد الغزالی) یە لە (فقه السیرة) ١– ل١٦٢ .

## بنیاتنانی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ

دوای ئەوە ، یەکەم هەنگاوی پێغەمبەر ﷺ ، بریتی بوو لە دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە ئەو جێگەیەدا کە وشترەکەی چۆکی دادا ، فەرمانی دا بە بنیاتنانی مزگەوت ، زەویەکەی لە دوو کوڕی بێ باوك کڕی ، خۆشیی بەشداری کرد لە بنیاتنانەکەداو ، خشت و بەردی دەهێنا و دەیفەرموو :

اللهم لاعيش إلا عيش الآخرة　　　فـــأغفر للأنصـــار والمهاجرة

هەروەها دەیفەرموو :

هـــذا الحمـــال لاحمـــال خيبر　　　هـــذا أبـــرُّ ربنـــا و أطهـــر

ئەمەش بوبوە هۆی زیاتر چالاك کردنی هاوەڵان لە بینا کردنەکەداو، هەیانبوو دەیوت:

لَئـــن قَعَدنـــا والنـــبيُّ يعمَل　　　لـــذاك منـــّا العملُ المضلّلُ

لەو شوێنەدا گۆڕی موشریکان و کەلاوەی کۆن و خورماو درەختی غەرقەی تێدابوو ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا، گۆڕەکان دەرهێنرانەوەو، کەلاوەکان تەختکران و، دارودرەختەکانیش بڕران ڕیزکران لەبەردەم قیبلەی مزگەوتەکەدا، ئەوکاتە (بيت المقدس) قیبلە بوو ، هەردوو پایەکەی لەبەرد بوو ، دیوارەکانیشی لەخشت و قوڕو ، سەرەکەیشی بەگەڵای دارخورما گیرابوو، ستونەکانیشی ساقی دارخورما بوو، زەمینەی مزگەوتەکەش لم و چەو بوو، سێ دەرگای بۆکرا، درێژیەکەی لە قیبلەگاکەوە بۆ کۆتاییەکەی سەد باڵ دەبوو ، هەردوولاکەشی بەو ئەندازەیە یان کەمتر ، بناغەکەی نزیکەی سێ باڵ دەبوو .

بەپەنایەوە چەند ماڵێك دروست کران ، ماڵەکانی (الحجر) ، کە لەخشت بوون و سەریشیان بە لق و پۆپ و گەڵاو ساقی دارخورما گیرابوو ، ئەمانە (حجر) ژووری هاوسەرەکانی بوو ﷺ ، پاش تەواوبوونی ژوورەکان ، ئیدی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی (أبو أيوب) ەوە گواستیەوە بۆ ئەوێ [1] .

مزگەوتیش تەنها بۆ بەجێهێنانی نوێژەکان نەبوو بەس ، بەڵکو زانکۆیەك بوو ، موسوڵمانەکان تیایدا فەرمایشت ئامۆژگاریەکانی ئیسلامیان تێدا وەردەگرت و ببوە سەکۆیەك بۆ بەیەك گەیشتن و هۆگریی و یەکترناسینی هەموو توخمە جیاوازە خێڵەکیەکان ، کەدەمێك بوو جەنگ و ڕەوتی دەمارگیری نەفامیانەی ناوخۆیان دووبەرەکیی خستبوە ناویانەوە ، هەروەها مزگەوت بوو بووە بنکەیەك

---

[1] / صحيح البخاري ٧١/١ ، ٥٥٥ ، ٥٦٠ ، زاد المعاد ٥٦/٢.

بۆ بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارەکان و دەرچوونی بڕیارەکان و پەرلەمانێك بۆ بەستنی ئەنجومەنی ڕاوێژو جێبەجێ کاری .

لەگەڵ ئەوەشداماڵێك بوو بۆ نیشتەجێ بوونی ژمارەیەکی زۆر لەو کۆچکەرە پەنابەرە هەژارانەی لەناو شاری مەدینەدا نە ماڵیان هەبوو نە کەس و کارو نە کوڕوکاڵ.

هەر لەسەرەتای کۆچەوە بانگ دانرا ، ئەو ئاوازە بڵندە جوانەی ڕۆژانە پێنج جار ئاسۆکانی دەوروبەری دەهەژاندو ، هەموو جیهانی بوونەوەری پێ‌دەزرنگایەوە ، بەسەرهاتی خەونەکەی (عبدالله)ی کوڕی (زید)ی کوڕی (عبد ربە)ش لەو بارەیەوە زانراوە، (ترمذی) و (أبو داود) و(أحمد) (إبن خزیمە) ڕیوایەتیان کردوە[1] .

## بە برا کردنی موسوڵمانەکان

هەروەکو پێغەمبەر ﷺ هەستا بەبنیاتنانی مزگەوت وەکو مەڵبەندێکی کۆ بونەوەو پێك ئاشنابوون ، هەستا بەکارێکی تریش کە لەجوانترین ئاسەوارەکانی مێژووە ، ئەویش بریتیە لە برایی کردنی نێوان کۆچەرو ئەنسارییەکان ، (إبن القیم) دەڵێت : پاشان لە ماڵی (أنس)ی کوڕی (مالك)دا ، کۆچکەران و ئەنسارییەکانی کرد بە برا ، نەوەد کەس دەبوون ، نیوەیان کۆچکەرو نیوەکەی تریشیان ئەنسار بوون ، لەسەر بەدەمەوەچونی یەکتری کردنی بەبراو ، بەدەر لەخزمانیش دوای مردن میراتگری یەکتربن ، تا جەنگی بەدر هات و ، ئایەت هاتە خوارەوە فەرمووی : ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾ الانفال / ٧٥ ، کە میرات بردنی ڕەتکردەوە بەبێ پەیوەندی برایەتی ، گوتراویشە کە برایەتی دروست کرد لەنێوان کۆچکەران و ئەنسارەکاندا بۆ جاری دووەم ، بەڵام دیارە ڕای یەکەم پەسەندە ، کۆچکەرانیش برایەتی ئیسلام و برایەتی هاوماڵی و خزمایەتی و کەسایەتی‌یان پێ باشتر بوو لە دروست کردنی هەر برایەتیەکی جیا لە کۆچکەران لەگەڵ ئەنسارییەکاندا[2] .

مانای ئەو برایەتیەش بریتی بوو لەوەی - هەروەکو موحەممەد غەزالی وتویەتی - کە پێویستە دەمارگیریی جاهیلیەت بتوێتەوە ، دەمارگرژی نەمێنێت مەگەر بۆ ئیسلام و جیاوازی و هەڵاواردنی باوان و ڕەنگ و نیشتمان وەلانرێت و کەس پێشی کەسێکی تر نەکەوێت مەگەر بە پیاوەتی و لە خوا ترسان .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم برایەتیەی کرد بە عەقدێکی کارا ، نەك قسەیەکی بێ بناغە ، کردی بەکارێك وابەستەی خوێن و ماڵ و ببێت نەك تەنها سڵاوێك بێت و زمان ئاڵ و وێری پێ بکات و هیچ شوێنەوارێکی نەبێت .

---

[1] / بڕوانە (بلوغ المرام) نوسینی (إبن حجر العسقلانی) ل١٥ .
[2] / زاد المعاد ٢/٥٦.

بەڕاستی سۆزی خۆبەخت کردن و بەدەم یەکەوە چون و هۆگری کردن تێکەڵاو بوو بوو لەگەڵ ئەو برایەتیەداو کۆمەڵگای نوێی پڕ کردبوو لەجوانترین نموونەی هەڵس وکەوت [1].

(بوخاری) دەگێڕێتەوە ، کاتێك ئەو کۆچکەرانە هاتنە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی دروست کرد لەنێوان (عبد الرحمن) و (سعد)ی کوڕی (الربیع)دا . وتی بە (عبد الرحمن) من لە هەموو ئەنسارەکان زیاتر ماڵ و سامانم هەیە ، ماڵەکەم دابەش دەکەم نیوەی بۆ من و نیوەکەی تریشی بۆ تۆ ، دوو ژنیشم هەیە سەیریان بکە کامەیانت پێ باشە بۆت تەڵاق دەدەم ، کە عیددەی بەسەرچوو بیخوازە ، (عبد الرحمن) پێی وت: خوا کەس و خێزان و ماڵ و منداڵت لێ پیرۆز بکات ، ئەرێ بازاڕەکەتان لە کوێیە ؟ بازاڕەکەی (بنو قینقاع) یان پێ نیشاندا ، کە گەڕایەوە لە بازاڕ گوارەو ئاڵتونێکی باشی پێ بوو ، پاشان بەردەوام بوو ، پاشان جارێکیان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ زەرد هەڵگەڕا بوو ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : ئەرێ چیتە ؟ وتی: ژنم هێناوە، پێی فەرموو: چیت بۆ کردووە بەمارەیی؟ وتی: گوڵێکی ئاڵتون [2].

هەروەها (أبو هريرە) دەڵێت: ئەنسارەکان وتیان بە پێغەمبەر ﷺ ، دار خورماکانمان بۆ دابەش بکە لەنێوان ئێمەو براکانماندا ، فەرمووی: نەخێر ، وتیان : کەواتە یارمەتیمان بدەن ، ئێمەش لەبەروبوومدا هاوبەشتان دەکەین ، وتیان: گوێڕایەڵین [3].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەو خۆشحاڵیو ڕێزلێنانەی ئەنسارەکان کردوویانە بۆ برا کۆچکەرەکانیان ، لە قوربانیدان و خۆبەختکردن و خۆشەویستی و دڵپاکی ، ئەوەش دەردەخات کە کۆچکەران چەندە پێزان بوون بۆ ئەو ڕێزلێنانەو ، چۆن خراپ بەکاریان نەهێناوەو، هەر ئەوەندەیان بردوە بەشیان بکات و ڕاگیریان بکات.

بەڕاستی ئەو برایەتی کردنە داناییەکی کەم وێنەو ، چارەسەرێکی جوان بوو بۆ زۆرێك لەو کێشانەی کە موسوڵمانان ڕووبەڕووی دەبوونەوە ، کە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردن .

---

[1] / فقه السيرة ل ١٤٠ – ١٤١ .

[2] / صحيح البخاري / باب إخاء النبي ﷺ المهاجرين والأنصار ٥٥٣/١.

[3] / صحيح البخاري ٣١٢/١.

## بەڵگەنامەی هاوپەیمانێتی ئیسلامی

هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بەبەستنی برایەتی نێوان ئیمانداران ، هەستا بەبەستنی پەیماننامەیەکیش کە هەموو جۆرەکانی هەستی نەفامی و ڕەوتی خێڵگەری تێدا وەلانان و، بواری نەهێشتەوە بۆنەریتی نەفامی ، ئەمەش چەند بەندێکە بە کورتی:

ئەمە نوسراوێکە لە موحەممەدی پێغەمبەرەوە ﷺ لەنێوان ئیمانداران و موسڵمانانی قورەیش و (یثرب)و شوێنکەوتوەکانیانو ئەوانەی جیهادیان لەگەڵدا دەکەن:

١. هەموویان یەك ئوممەتن .
٢. کۆچکەرانی قورەیش لەسەرماڵی خۆیان دەبن ، خوێنی یەك دەدەن ، فیدیەی ئەسیرەکانی خۆیان دەدەن بەچاکەو ، دادپەروەریش لەنێوان ئیمانداراندا ، هەر تیرەیەکی ئەنساریەکانیش لەسەرحاڵی خۆیان دەبن خوێنی کوشتنە یەکەمینەکان دەدەن بەیەك ، هەرتایەفەیەکی ئەوانیش دەبێت فیدیەی ئەسیرەکانیان بدەن بەچاکە ودادپەروەریش بکەن لە نێوان ئیمانداراندا .
٣. دەبێت ئیمانداران هەرکەسێکی قەرزارو خاوەن مناڵیان لەناوخۆیاندا بینی فیدیەی بۆ بدەن یان یارمەتی بدەن بە چاکە.
٤. دەبێت ئیمانداران دژ بەوکەسانە ببنەوە کە دەست درێژی دەکەنە سەریان ، یان کەسێك داوای بەرگری و لابردنی زوڵمێك یان تاوانێك بکات یان دەست درێژیەك یان خراپەیەك لەگەڵ ئیمانداراندا بکات و هاوکاریی بکرێت.
٥. دەست لەناو دەستە بۆ هەرکەسێك دژ بەکۆمەڵ بێت ، بامناڵی یەکێکیشیان بێت.
٦. نابێت ئیماندارێك ئیماندارێکی تر بکوژێت لەبەر کافرێك .
٧. نابێت ئیماندار پشتیوانی کافرێك بکات دژ بە موسوڵمانێك .
٨. زیممەتی خودایی مافێکە پەنای بچوکترین کەسیان دەدات .
٩. هەرکەسێك سەر بەئێمە بێت لە جولەکە ، ئەوا پشتیوانی و پێشڕەوێتی دەکەین، زوڵمیان لێ ناکرێت و کەسیش گەلەکۆمەکیان دژ ناکات.
١٠. ئاشتیی موسوڵمانەکان یەکێکەو، نابێت ئیماندارێك ئاشتی بکات و ئەوی دی نەیکات ، لەکاتی شەڕکردنیش لەپێناوی خوادا هەمان شتە ، مەگەر بە یەکەوەو بەدادپەروەرانە لەنێوان هەموولایەکدا ئەنجامی بدەن.

١١. ئيمانداران وەكو يەكن لەوەدا كە خوێنيان ڕشتوە لە پێناوی خوادا .

١٢. نابێت هيچ موشريكێك ماڵ و سامانێك يان كەسێكی قوڕەيشی پەنا بدات ، نابێت ڕێ بگرێت لە ئيماندارێك .

١٣. هەركەسێك بەناهەق وبێگوناه بەقەستی ئيماندارێك بكوژێت دەكوژرێتەوە ، مەگەر كەس و كاری كوژراوەكە ڕازی بن بە سوڵح كردن لێی خۆش بن.

١٤. هەموو ئيمانداران لەسەر ئەم دەستورەن بۆيان نيە دژی بوەستنەوە.

١٥. هيچ ئيماندارێك بۆی نيە پشتيوانی پەيمانشكێنێك بكات و ڕێگەی بكاتەوە ، هەر كەسێك پشتيوانی بكات يان ڕێگەی بكاتەوە ئەوا نەفرەت و تووڕەيی خودای بەسەردا ببارێت لە ڕۆژی قيامەتدا ، هيچ گوتەو شايەتێكی لێ وەرناگيرێت .

١٦. ئێوە ئەگەر لە هەر شتێكدا جياواز بوون ، ئەوا دەبێت بيگێڕنەوە بۆ خودای گەورەو پێغەمبەرەكەی (محمد ﷺ) .[1]

---

[1] / (إبن هشام) ١/٥٠٢ ، ٥٠٣.

## كاریگەری هۆ دەروونیەكان لە كۆمەڵگادا

بەم دانایی و زیرەكیە بێ وێنەیە ، پێغەمبەر ﷺ بنەماكانی كۆمەڵگایەكی نوێی دامەزراند ، ئەم دیاردەیەش شوێنەوارێكی تری ئەو مانا جوانانە بوو كە ئەو مرۆڤە بەرزانە بەهۆی رێزو شكۆداری پێغەمبەرەوە ﷺ هەیانبوو .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر زانست و پەروەردەو دەروون پاكی و رەوشتە جوانەكان ڕای هێنابوون ، بەئەدەبی خۆشەویستی و برایەتی و بەرزی و شكۆداری و خواپەرستی و ملكەچی بۆ خوا پەروەردەی دەكردن .

جارێكیان پیاوێك پرسیاری لێ كرد : كام جۆری ئیسلامەتی چاكە ؟ فەرمووی: نان بدەیت ، سلاو بكەیت لەو كەسەی دەیناسیت و لەوەش نایناسیت[1] .

(عبداللە)ی كوڕی (سلام) دەڵێت : كاتێك پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە چوم بۆ خزمەتی ، كە دەم و چاویم بینی ، دەستبەجێ زانیم كە ئەوە دەم وچاوی مرۆڤی درۆزن نیە ، یەكەم شت كە فەرمووی : خەڵكینە سلاوبكەن ، نان بدەن ، پەیوەندی خزمایەتی پتەوبكەن ، بەشەواندا كاتی خەوتنی خەڵك نوێژبكەن ، ئەوجا بەباشی دەڕۆنە بەهەشتەوە[2] .

هەروەها دەیفەرموو: (هەر كەسێك دراوسێیەكەی لە خراپەكانی بێوەی نەبێت ناڕواتە بەهەشتەوە)[3] .

هەروەها دەیفەرموو: (موسوڵمان ئەو كەسەیە كە موسوڵمانان بێوەی بن لە دەست و زوبانی)[4] .

هەروەها فەرموویەتی: (هیچ یەكێك لە ئێوە باوەڕەكەی تەواونیە هەتا ئەوەی بۆخۆی پێی خۆشە بۆ براكەشی پێی خۆشبێت)[5] .

فەرمووشیەتی: (ئیمانداران وەكو یەك پیاو وەهان ، ئەگەر چاوێكی گل بكات هەمووگیانی ئێش دەكات ، خۆ ئەگەر سەریشی ئێشی كرد ئەوا هەمووگیانی دەداتە ئازار )[6] .

---

[1] / (صحيح البخاري) ٦/١ ، ٩ .
[2] / (ترمذی) ریوایەتی كردوە لەگەڵ (إبن ماجة) و (الدارمی) . مشكاة المصابيح ١٦٨/١.
[3] / (مسلم) ریوایەتی كردوە ، مشكاه المصابيح ٤٢٢/٢.
[4] / (صحيح البخاری) ٦/١.
[5] / (صحيح البخاری) ٦/١.
[6] / (مسلم) ریوایەتی كردوە ، مشكاه المصابيح ٤٢٢/٢.

هەروەها دەیفەرموو: (ئیماندار بۆ ئیماندار وەك خشتی دیوار وەهایە کە یەکتریان گرتبێت)[1] .

فەرمووشیەتی: (کینەو ڕقەبەرایەتی یەکتری مەکەن ، چاوچنۆکی بەیەك مەبەن ، چاڵ بۆیەك هەڵمەکەنن ، ببنە بەندەی خوداو برای یەکتری و بۆ هیچ موسوڵمانێك ڕەوا نیە زیاتر لە سێ ڕۆژ قسە لە براکەی دابڕێت)[2] .

هەروەها دەیفەرموو: (موسوڵمان برای موسوڵمانە ، نە زوڵمی لێ دەکات و نە سەری شۆڕدەکات ، هەرکەسێك بەدەم پێداویستی برا موسوڵمانەکەیەوە بڕوات خودای گەورەش بەدەم پێداویستی ئەوەوە دەڕوات ، هەرکەسێکیش ناخۆشیەك لەسەر موسوڵمانێك نەهێڵێت خوای گەورە ناخۆشیەکی قیامەتی لەسەر لادەبات ، هەر کەسێکیش لەکەی موسوڵمانێك بپۆشێت خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەکەکانی ئەو دەپۆشێت)[3] .

هەروەها دەیفەرموو: ( بەزەییتان بەخەڵکی زەویدا بێتەوە تا ئەو کەسەی لە ئاسماندایە ڕەحمتان پێ بکات)[4] .

هەروەها دەیفەرموو: ( ئیمانداران ئەو کەسە نیە کە خۆی تێر دەبێت و ئاگای لێیە کە دراوسێیەکەشی برسیە)[5] .

دیسان دەیفەرموو: (جنێودان بەئیماندار فاسق بوونەو، شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرە)[6] .

پێغەمبەری خوا ﷺ ، لادانی کۆسپەکانی ڕێگەی بە سەدەقە دادەناو ، وەکو بەشێك لە بەشەکانی ئیمان سەیری دەکرد[7] .

هەروەها هانی دەدان لەسەر خەرجی کێشان و، ئەوەندە باسی لایەنە باشەکانی دەکرد لەخۆشیدا دڵی گەشکەی دەکردو دەیفەرموو . سەدەقە گوناهەکان دەسڕێتەوە، هەروەکو ئاو ئاگر خامۆش دەکات[8] .

هەروەها فەرموویەتی : (هەر موسوڵمانێك موسوڵمانێکی تر لەسەر ڕووتی بپۆشێت ، خوای گەورە بەسەوزیی بەهەشت دەیپۆشێت ، هەر موسوڵمانێکیش

---

[1] / (متفق علیە) مشكاة المصابيح ٤٢٢/٢ ، صحيح البخاري ٨٩٠/٢.

[2] / صحيح البخاري ٨٩٦/٢.

[3] / (متفق علیە) ، (مشكاة المصابيح) ٤٢٢/٢.

[4] / (سنن أبي داود) ٣٣٥/٢ ، (جامع الترمذي) ١٤/٢.

[5] / (البيهقي) لە (شعب الإيمان) دا ڕیوایەتی کردوە ، (مشكاة المصابيح) ١٢/١ ، ١٦٧.

[6] / صحيح البخاري ٨٩٣/٢

[7] / فەرمودەکە لەو بارەوە لە (صحيحين) دا ڕیوایەت کراوە ، بڕوانە (مشكاة المصابيح) ١٢/١، ١٦٧.

[8] / (أحمد)و(ترمذي) و (إبن ماجة) ڕیوایەتیان کردوە ، مشكاة المصابيح ١٤/١.

**لەسەر برسێتی موسوڵمانێك تێر بكات ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە (رحیق المختوم) تێراوی دەكات)[1] .**

**هەروەها فەرموویەتی: (خۆتان لەئاگر بپارێزن ، با بەلەتە خورمایەكیش بێت ، ئەگەر نەبوو بەوشەیەكی جوان)[2] .**

**بەپاڵ ئەوەشەوە بەگەرمی هانی دەروون بەرزیی دەداو ، باسی شكۆداری ئارامگری و قایل بوونی دەكردو ، سواڵ كردنی بەڕووزەردی و ئابڕووچوون و شێوانی دەم و چاوی سواڵكەر دادەنا[3] . مەگەر كەسێك زۆر ناچاربێت ، هەروەكو چۆن لەبارەی چاكەو پاداشتی حاڵەتەكانی عیباداتەوە قسەی بۆ دەكردن ، هەروەها بەشێوەیەكی تۆكمە پابەندی نیگای ئاسمانی دەكردن قورئانی دەخوێندەوە بەسەریانداو ، ئەوانیش دەیانخوێندەوە ، تائەم پێوتنەوەیە ببێتە مایەی بێداركردنەوەیان سەبارەت بەو مافانەی كە لەسەریانە ، وەكو ئەركی بانگەوازو ، گەیاندنی پەیام.**

**بەو شێوەیە ورەو وزەكانیانی بەرز كردەوەو ، بە بەرزترین بەهاو پلەو نمونەی جوان دەوڵەمەندی كردن ، تاوای لێهات بوونە وێنەیەك لە چڵەپۆپەیەكدا وەستان كە هێشتا مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەیدیوە .**

**(عبدالله)ی كوڕی (مسعود) (ڕ) فەرمویەتی: هەركەسێك دەیەوێت ڕەویە وەربگرێت بارەویەی كەسێك وەربگرێت كەمردووە، چونكە زیندوو متمانەی سەر لێنەشێوانی پێ ناكرێت ، ئەوە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ ، باشترین مرۆڤی ئوممەت بوون ، ساغترین دڵ و ، قوڵترین زانست و ، كەمترین ئەركیان هەبوو ، خوای گەورە هەڵی بژاردن بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەكەی و سەرخستنی ئایینەكەی ، كەواتە ئێوەش ڕێزیان بگرن و شوێنیان بكەون ، چەندە دەتوانن دەست بگرن بە ڕەوشت و سیرەتیانەوە ، چونكە ئەوانە لەسەر ڕێنومایی ڕاست و ڕەوا بوون[4].**

**پاشان ئەو پێغەمبەرە سەركردە گەورەیە ﷺ ئەوەندە خەسڵەتی مەعنەوی و دیارو ، تێرو تەواوی و بەهرەو گەورەیی و فەزیلەت ڕەوشت بەرزی و كردەوەی چاكی تێدابوو ، دلآنی بەلای خۆیدا كەمەندكێش دەكردو ، گیانی مرۆڤەكانی ئاشوفتەی خۆی كردبوو ، وتەیەكی لەدەم دەرنەچوو خێرا هاوەڵەكانی ﷺ**

---

[1] / (سنن ابي داود)و(جامع الترمذي)،( مشكاة المصابيح) ١/١٦٩.

[2] / (صحیح البخاری) ١/١٩٠، ٢/٨٩٠.

[3] / لەو ڕووەوە سەیركە (ابو داود) و(ترمذی) و(نەسائی) و(إبن ماجة) و(دارمی) ، بڕوانە مشكاة المصابیح ١/١٦٣.

[4] / (رزین) ریوایەتی كردوە ، (مشكاه المصابیح) ١/٣٢.

دەستبەجێ فەرمان بەردارییان دەکردو ، هەر ڕێنومایی و ئامۆژگاریەکی بکردنایە خۆیان پێ دەڕازاندەوە .

بەو جۆرە کارانە پێغەمبەر ﷺ توانی لەمەدینەدا کۆمەڵگەیەکی نوێ بنیات بنێت ، کە جوانترین و شکۆدارترین کۆمەڵگا بێت لەمێژوودا، چارەسەرێك دابنێت بۆ کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایە ، تا لەسایەیدا مرۆڤایەتی ئاهێك هەڵبکێشێت، پاش ئەوەی کە لەناو تاریکستان و ئاڵو وێرەکانی ڕۆژگاردا شکستەو ماندووبوو.

بەم جۆرە وورەبەرزیەوە توخمە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا گەشتنە پلەی تەواوێتی و ڕووبەڕووی هەموو تەوژمەکانی ڕۆژگار بوونەوەو ئاڕاستە پێ گۆڕین و ڕەوگەی مێژووشی لەگەڵ خۆیدا وەرچەرخاند.

## پەیماننامەیەك لەگەڵ جولەکەدا

پاش ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو ، دڵنیابوو لە چەسپاندنی بناغەکانی کۆمەڵگای نوێ ، کەبریتی بوو لەدامەزراندنی یەکێتیەکی عەقیدەیی سیاسیی و نیزامی لەنێوان موسوڵمانەکاندا ، پێی وابوو کە دەبێت هەستێت بەڕێکخستنی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ناموسوڵمانەکانیشدا ، لەو بوارەشدا خەمێکی هەبوو کە بریتی بوو لەدابینکردنی ئاسایش و ئاشتی و ئاسوودەیی و خێروچاکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی ، لەگەڵ یەکخستنی ناوچەکە لەیەك پەیماننامەدا ، بۆیە لەو بوارەدا یاسای لێبوردن و لێخۆشبونی هێنایە کایەوە کە پێشتر لەو جهانی پڕ لەدەمارگیری و خۆسەپاندنەدا باونەبوو .

نزیکترین کەسانێکی لەو جۆرەش کەدراوسێی مەدینە بوون لە ناموسوڵمانەکان ، بریتی بوون لە جوولەکە ـ هەروەکو پێشتر باسمان کرد ـ ئەمانە هەرچەندە لە دڵەوە دژایەتی موسوڵمانەکانیان دەکرد ، بەڵام هێشتا هیچ جۆرە بەرەنگاری و دژایەتیەکیان دەرنەخستبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیماننامەیەکی لەگەڵدا مۆرکردن و تەواوی ئازادی پێدان لەماڵ پەیداکردن و ئاییندداری خۆیانداو ، هیچ پەنای نەبردە بەر سیاسەتی دورخستنەوە یان دەست بەسەرا گرتن یان ڕکابەرێتی.

ئەم پەیماننامەیە وەکو بەشێك لەو پەیماننامەیە هاتە گۆڕێ کە لەنێوان موسوڵماناندا بەسترا بوو، هەروەکو پێشتر باسی لێوەکرا ، ئەمەش گرنگترین بەندەکانی ئەو پەیماننامەیە : ـ

# بەندەكانی پەیماننامەكە

١. جولەكەكانی (بنی عوف) ئوممەتێكن لەگەڵ ئیمانداراندا ، جولەكە ئاینی خۆیان هەیەو موسوڵمانەكانیش ئاینی خۆیان هەیە ، موسوڵمانەكان و هاوپەیمانەكانیشیان ئایینی خۆیان هەیە ، غەیری خێڵی (بنی عوف) یش هەمان حاڵەتیان هەیە .

٢. جولەكە خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانە ، موسوڵمانەكانیش خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانە.

٣. هەموویان پشتگیری یەكتری دەكەن دژ بە هەركەسێك دژایەتی ئەو پەیماننامەیە بكات .

٤. لەنێواندا مۆچیاری و ئامۆژگاری و چاكەكردن هەیە بەبێ هیچ جۆرە خراپەكارییەك.

٥. هەموو كەسێكی ستەملێكراو پشتیوانی لێ دەكرێت .

٦. جولەكە لەگەڵ ئیمانداراندا یەكدەنگ دەبن چەندە جەنگیان لەگەڵدا بكرێت.

٧. زەوی ناو شاری (یثرب) حەرامە لەپێناو بەرقەراركردنی ئەم پەیماننامەیەدا.

٨. هەرچییەك ڕوویدات لەنێوان مۆركەرانی ئەم پەیماننامەیەدا لە شەڕو دەمەقاڵێ كەترسی لێكەوتنەوەی خراپەی لێ بكرێت ، ئەوا ڕووبەڕووی پەڕاوی خودای گەورەو، پێغەمبەری خودا ﷺ دەكرێتەوە بۆ چارەسەر كردنی .

٩. هیچ قورەیشیەك و هاوپەیمانێكیان نابێ لە مەدینەدا پەنا بدرێن.

١٠. هەموویان دەبێت پشتیوانی یەكتری بكەن دژ بەوانەی هەڵدەكوتنە سەر (یثرب) ، هەركەسە بەپێی بوون و توانای خۆی.

١١. ئەم پەینماننامەیە چاوپۆشی ناكات لە زاڵم و تاوانبار [1] .

بەبەستنی ئەم پەیماننامەیە مەدینە و دەوروبەری بووە دەوڵەتێكی یەككگرتوو كە پایتەختەكەی شاری مەدینەیەو سەرۆكەكەیشی - ئەگەر دروست بێت بڵێین - پێغەمبەر بوو ﷺ، بڕیاری یەكلایی و دەسەڵاتی بالأدەست تیایدا كەوتە دەست موسوڵمانەكان و ، بەو شێوەیە مەدینە بووە پایتەختێكی ڕاستەقینەی ئیسلام.

بۆ فراوانكردنی ناوچەی ئاشتی و ئاسایش ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنیدا لە داهاتوودا هاوشێوەی ئەم پەیماننامەیە بەپێی بارودۆخەكە لەگەڵ هۆزەكانی تردا ببەستێت ، باسی ئەوەش لەدواییدا دێت .

---

[1] / بڕوانە إبن هشام ١/٥٠٣ ، ٥٠٤.

## خەباتی خوێناوی

## (شەڕ فرۆشتنی قوڕەیش بە موسوڵمانەکان لەدوای کۆچەوەو پەیوەندی کردنیان بە (عبدالله)ی کوڕی (أبی) یەوە)

وەکو وتمان ئەوەی کافرەکانی مەککە کردیان بەموسوڵمانەکان لە بەڵاو ئازارو ئەشکەنجەدان دژ بەموسوڵمانەکان و ئەوەش کە لەکاتی کۆچکەردنیدا پێیان کردن و ، شایستەی ئەوەی کردن کە دەستیان لێ بکرێتەوە و شەڕیان لەگەڵدا بکرێت ، سەرباری ئەوە هێشتا هۆشیان نەهاتبوەوەو وازیان لە دەستدرێژی نەدەهێنا ، بەڵکو هەرکە زانیان موسوڵمانەکان دەربازبوون و ڕێ و شوێنێکی نیشتەجێ بوونیان لە مەدینەدا دۆزیوەتەوە ، ئەوەندەی تر ڕقیان هەستاو ، نامەیان نووسی بۆ (عبدالله)ی کوڕی (أبی) کوڕی (سلول) ، لەوکاتەدا موشریك بوو بەسیفەتی ئەوەی سەرۆکی ئەنسار بوو پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە - دیارە کە هەموویان پێش ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ لە دەوری خڕبوونەوەو خەریك بوو دەیانکردە سەرۆکی خۆیان ، بە تەشریف بردنی پێغەمبەر ﷺ ئەو هەلەی لەدەست چوو - لەنامەکەدا ڕاشکاوانە بەخۆی و هاوڕێکانیان وتبوو: -

ئێوە ڕێگەی ئەو پیاوەی لای ئێمەتان کردۆتەوە ، ئێمەش سوێند دەخۆین یان دەبێت شەڕی لەگەڵدا بکەین یان دەبێت دەری بکەن ، یان بە هەموومانەوە دێینە سەرتان ، هەتا دەتانکوژین و، ژن وماڵتان حەڵاڵ دەکەین[1] .

لەگەڵ گەیشتنی ئەو نامەکەدا (عبدالله)ی کوڕی (أبی) دەستی کرد بەجێبەجێ کردنی فەرمانی برا موشریکە مەکەییەکانی ، داخی زۆریشی لە دڵدا بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ ، کە دەیبینی بەهاتنی موڵك و دەسەڵاتی نەما - (عبد الرحمن)ی کوڕی (کعب) دەڵێت : کاتێك ئەو نامەیە گەیشتە دەست (عبدالله)ی کوڕی (أبی) ، ئەو بتپەرستانەی لەگەڵیدا بوون خێرا کۆبوونەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ، کە ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ بینینی و فەرمووی پێیان : (هەڕەشەکانی قوڕەیش ئەوەندە کاری تێ کردوون ، ئەوەندەی بەخۆتانی دەکەن ئەوان ئەوەندەیان پێ ناکرێت ، دەتانەوێت شەڕ لەگەڵ ڕۆڵەو براکانی خۆتاندا بکەن ، کە ئەوەیان لە دەمی پێغەمبەر ﷺ بیست بلاوەیان لێکرد)[2] .

---

[1] / (أبو داود) باب خبر النضير.

[2] /(أبو داود) باب خبر النضير.

(عبدالله)ی کوڕی (أبی) کوڕی (سلول) کە بینی هاوڕێیەکانی خاوو خلیچك بەدەمیەوە هاتن شەڕی نەکرد ، بەڵام دیارە کەدەستی تێکەڵاو کردبوو لەگەڵ قوڕەیشدا، هەر دەرفەتێکی ببینیایە دەیقۆستەوە بۆ ئاژاوەنانەوە لەنێوان موسوڵمانان و موشریکانداو ، جولەکەکانیشی لەخۆ گرتبوو ، بۆئەوەی لەسەر ئەو خراپەکاریە یارمەتی بدەن ، بەڵام دانایی پێغەمبەر ﷺ لەئاستێکدا بوو نەخشەکانی پووچەڵ دەکردنەوە [1].

## ڕاگەیاندنی ڕێگە گرتن لە زیارەتی کابە

پاش ماوەیەك (سعد)ی کوڕی (معاذ) بۆ عومرە کردن بەرەو مەککە کەوتە ڕێ ، لە ماڵی (امیە)ی کوڕی (خلف) لە مەککە لای‌دا ، وتی بە ئومەییە : بەڵکو دەرفەتێکم بۆ وەربگری تەوافێکی کابە بکەم ، بە ڕۆژی ڕووناك بردیە دەرەوە ، (أبو جهل) یان پێگەیشت وتی : ئەرێ (أبو صفوان) ئەوە کێیە لەگەڵتدا ؟ وتی: ئەوە (سعد)ە ، (أبو جهل) وتی: کە دەتبینم ئەو پیاوە لادەرانەتان پەنا داوەو ئێستاش تەواف دەکەیت خەریکە کوێراییم دابێت و ، وتوشتانە پشتیوانیان دەکەن و یارمەتیان دەدەن ، سوێند بەخوا ئەگەر لەگەڵ (أبو صفوان)دا نەبوویتایە بەسەلامەتی نەدەگەیشتیتەوە بۆ مەدینە ، (سعد)یش بەدەنگی بەرز پێی وت و نەڕاندی بەسەریا: سوێندم بەخودا ئەگەر ڕێگەم لێ بگریت ، منیش ڕێگەی هاتوچۆی مەدینەت لێ دەگرم کە زۆر لەوە سەختترە بۆت [2].

## قوڕەیش هەڕەشە لە کۆچکەران دەکات

پاشان قوڕەیش هەواڵیان نارد بۆ موسوڵمانەکان و پێیان وتن : وانەزانن کە چوونەتە (یثرب) لە دەستمان قوتارتان بوە ، دێینە سەرتان ڕیشە کێشتان دەکەین لەناو ماڵەکانتاندا وشك و تەڕتان قات و قڕ دەکەین [3].

ئەوە تەنها هەڕەشەیەکی ڕووت نەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیابوو کە قوڕەیش شتێك دەکەن بۆیە خۆی شەونخونی دەکرد ، یان هاوەڵان پاسەوانیان دەکرد ، (مسلم) لە (صحیح)ە کەیدا دەگێڕێتەوە لە (عائشە)ە وە (ڕ)کە فەرموویەتی:

---

[1] / لەو بارەیەوە بڕوانە (صحیح البخاري) ٢/٦٥٥. ٦٥٦ ، ٩١٦ ، ٦٢٤.
[2] / (صحیح البخاري) ، کتاب المغازی ، ٢/٥٦٣.
[3] / رحمة للعالمین ١/١١٦.

پێغەمبەر ﷺ خۆی لەدەروازەی چوونە ژوورەوەی مەدینەدا ئێشکگری دەکرد، ئەنجا فەرمووی : خۆزگە پیاوچاکێك ئەمشەو پاسەوانیی دەکردم ، (عائشە) دەڵێت: لەم قسانەدا بوین ، گوێمان لەدەنگی ڕاکێشانی چەك بوو ، فەرمووی: ئەوە کێیە ؟ وتی: (سعد)ی کوڕی (أبی وقاص) ە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەم شەوە چی تۆی هێناوەتە ئێرە ؟ وتی: دڵم ترسی لێ نیشت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، هاتم پاسەوانیی بکەم ، پێغەمبەری خوا ﷺ نزای خێری بۆ کرد ، ئەنجا نووست [1] .

ئەم پاسەوانێتیە تەنها چەند شەوێك نەبوو ، بەڵکو شەوانە بەردەوام بوو ، لە (عائشە) ەوە (ڕ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ شەو پاسەوانیی دەکرد ، هەتا ئایەت هاتە خوارەوە : ﴿ والله يعصمك من الناس ﴾ ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لە کلاوڕۆژنەکە هێنایە دەرەوەو فەرمووی بەخەڵك: (خەڵکینە بلاوەی لێ بکەن و بڕۆنەوە خوای گەورە من دەپارێزێت) [2] .

مەترسیەکە تەنها لەسەر پێغەمبەر نەبوو ﷺ ، بەڵکو موسوڵمانەکانیشی گرتبووەوە ، (أبی) کوڕی (کعب) (ڕ) دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانی هاتنە مەدینەو ئەنساریەکان پەنایاندان ، ئیدی عەرەب چوار دەوریان گرتن ، موسوڵمانەکان بەچەك و تفاقی شەڕەوە نەبوایە نەدەنوستن.

## مۆڵەتدان بە شەڕکردن

لە ئەم بارودۆخە پڕ مەترسیەدا کە هەڕەشەی لە قەوارەی موسوڵمانەکان دەکرد لەناو مەدینەدا ، ئەوەشی دەگەیاند کە قوڕەیشیەکان نایەنەوە بەهۆشی خۆیانداو ، واز لەو سەرسەختیەی خۆیان ناهێنن ، خوای گەورە مۆڵەتی شەڕکردنیدا بەموسوڵمانەکان و ، نەیکردە ئەرك بەسەریانەوەو فەرموی : ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴾ الحج/٣٩ ، واتە : مۆڵەت درا بە ئەوانەی ماوەیەکە شەڕیان لەگەڵ دەکرێت و ستەملێکراون ، خوای گەورە بالادەستە بۆ سەرخستنیان .

خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەناو کۆمەڵە ئایەتێکی تردا نارده خوارەوە کە ئەم مۆڵەت پێدانە بۆ لابردنی ناهەقیی و بەرقەرار کردنی دروشمە گەورەکانی

---

[1] / (مسلم) باب فضل (سعد) کوڕی (أبي وقاص) ٢/٢٨٠ دەقەکە هی ئەوە ، هەروەها (صحيح البخاري) ـ باب الحراسة في الغزو في سبيل الله ١/٤٠٤.

[2] / جامع الترمذي ـ أبواب التفسير ٢/١٣٠.

خودا بوو ، خوای گەورە فەرمووی : ﴿ الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ الحج/٤١ ، واتە : ئەو ئیماندارانە کەسانێکن ئەگەر لەسەر زەمیندا سەریان بخەین نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و فەرمان بەچاکە دەکەن و نا لە خراپەکاری دەکەن .

ڕاستیەکەو گومانی تێدانیە کە ئەو مۆڵەتدانە لەمەدینەداو دوای کۆچ هاتۆتە خوارەوە، نەك مەککە ، بەڵام بەتەواوی ناتوانین کاتی هاتنە خوارەوەکەی دیاریی بکەین.

مۆڵەتی شەڕکردن هاتە خوارەوە . بەڵام لەو بارودۆخەدا کە قورەیش بەدەسەڵات و هێزی خۆیدا زۆری دەنازی ، پێویست بوو کە دەست بگرن بەسەر ڕێگەی بازرگانی مەککەو شامداو ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو دەست بەسەرا گرتنە دوو نەخشەی دانا :

**یەکەم** / بەستنی پەیماننامەی هاوپەیمانێتی یان دەست درێژی نەکردن لەگەڵ هۆزەکانی نزیك ئەو ڕێگەیەدا ، یان ئەوانەدا کە لە نێوان ئەو ڕێگەیەو مەدینەدا نیشتەجێ بووبوون ، پێشتر باسی پەیماننامەکەیمان کرد لەگەڵ جولەکەدا ، هەروەها پەیماننامەی هاوپەیمانەی یان دەستدرێژی نەکردنی بەست لەگەڵ خێڵی (جهینە) ، پێش دەست پێکردنی چالاکی سەربازیی ، ئەو ماڵانە جێگەو ماڵەکانیان بەسێ قۆناغ لە مەدینەوە دووربوون ، لەکاتی ناردنی مەفرەزە سەربازیەکاندا پەیماننامەی لەگەڵ ئەوانەدا بەست .

**دووەم** / ناردنی چاودێری یەك لە دوای یەك بۆ سەر ئەو ڕێگەیە .

# غەزاو سریەکانی پێش بەدر[1]

بۆ جێبەجێ کردنی ئەو دوو نەخشەیە لەناو موسوڵمانەکاندا چالاکی سەربازیی کرداریی دوای هاتنە خوارەوەی ئایەتی مۆڵەتەکە دەستی پێکرد ، دەستیان کرد بەچەند جوڵانەوەیەکی سەربازیی وەك دەوریەی چاودێری کردن ، ئەو دەوریانە کاریان بریتی بوو لە دۆزینەوەو زانینی ڕێگاکانی دەوروبەری مەدینەو ، ئەو تولە ڕێگانەی کە دەچوونەوە سەر مەککەو ، بەستنی پەیماننامە لەگەڵ ئەو هۆزانەی لەسەر ئەو ڕێگەیە بوون و ، خۆدەرخستن بەڕووی موشریکانی (یثرب) و جولەکەکانی و عەرەبە دەشتەکیەکانی دەوروبەریدا ، کە موسوڵمانەکان بەهێزن و ، وەکو جاران کەمدەست و لاوازنین و ، پەیامێکی ئاگادار کردنەوەش بێت بۆ قورەیش لەسەر ئەو ملهوڕیەی هەیەتی ، تا بە ئاگا بێتەوە لەو بێباکی و لەخۆبایی بونەی خۆی و هەست بکات بەگەورە بوونی ئەو مەترسیەی ڕووی کردۆتە ئابووریەکەی و شێوازی گوزەرانی و مل بدات بۆ ئاشتی و وازبهێنێت لە شەڕ فرۆشتن بەموسوڵمانەکان لەناو خانەو لانەی خۆیانداو، وازبهێنێت لەدژایەتی کردنی ئایینی خوداو ، ئەشکەنجەدانی ئیماندارانی ناو مەککە ، بۆ ئەوەش موسڵمانەکان ئازادبن لەگەیاندنی پەیامی خوداوەند بە هەموولایەکی دورگەی عەرەبیدا .

ئەمەش چالاکی ئەو سریانەیە بە کورتی:

1. سریەی (سیف البحر) ، لە ڕەمەزانی ساڵی (١)ی کۆچیدا بوو ـ بەرامبەر بە مارتی ساڵی (٦٢٣)ز ـ پێغەمبەر ﷺ حەمزەی مامی کردە سەرۆکی ئەم سریەیە ، سی کەسی لە کۆچکەران نارد لەگەڵیدا ؛ بۆ ڕێگەگرتن لە کاروانێکی قورەیش کە لە شامەوە دەهاتەوە ، کاروانەکە (أبو جهل)ی کوڕی (هشام) ی لەگەڵدا بوو بە سێ سەد چەکدارەوە ، گەیشتنە (سیف البحر) لە ناوچەی (العیص) دا[2] ، هەردوولا بە یەکگەیشتن ڕیز بوون بۆ شەڕ ، (مجدی) کوڕی (عمرو الجهنی) کە هاوپەیمانی هەردوولا بوو کەوتە بەینەوە ، لەنێوانیاندا وەستا ، بەو هۆیەوە شەڕ ڕووی نەدا . ئاڵاکەی (حەمزە) یەکەم ئاڵابوو کە پێغەمبەر ﷺ بەستبووی ، ئاڵایەکی سپی بوو ، بەدەست (أبو مرثد کناز) کوڕی (حصین الغنوی) یەوە بوو.

---

[1] / مێژووناسان بەو دەرچونانە دەڵێن (غزو) (غزا) کەپێغەمبەر ﷺ خۆیی تێدا چووبێتە دەرەوە ، جا جەنگی تێدا کرابێ یان نەء، هەردەرچونێکیش یەکێك لە سەرکردەکانی دەرچوبێ پێیان وتوە (سریە).

[2] / العیص . بەکەسرە . شوێنێکە دەکەوێتە نێوان (ینبع)و(مروه) بە ڕووی دەریای سوردا.

٢. سریەکەی (رابغ) ، لە شەوالی ساڵی (١) ی کۆچیدا ـ ئەپریلی ساڵی (٦٢٣ن) ـ پێغەمبەری خوا ﷺ، (عبیدە)ی کوڕی (حارث)ی کوڕی (المطلب) نارد بەشەست سواری کۆچکەرانەوە ، گەیشت بە (أبو سفیان) . بە دووسەد کەسەوە ـ لەناو (رابغ) دا . هەردوولا بەرامبەریەك وەستان دەستیان کرد بە شەڕەتیر . بەڵام جەنگی ڕووبەڕوو بوونـەوە ڕووی نەدا .

لەو (سریە) دا دووکەس لەسوپای مەککە هاتنە ناو موسوڵمانەکان ، ئەوانیش بریتی بوون لە (مقداد)ی کوڕی (عمرو البهرانی) و (عتبە)ی کوڕی (غزوان المازنی) ، پێشتریش موسوڵمان بوو بوون ، لەگەڵ کافراندا چووبوونە دەرەوە تا دەستیان لە شوێنێك گیر بێت بۆ گەیشتن بە موسوڵمانەکان ، ئالآکەی (عبیدە) سپی بوو ، (مسطح)ی کوڕی (أثاثة)ی کوڕی (المطلب)ی کوڕی (عبد مناف) هەڵی گرتبوو .

٣. سریەی (الخرّار) ، لە (ذی القعدة)ی ساڵی (١)ی کۆچیدا ـ بەرامبەرە لەگەڵ مایۆی ساڵی (٦٢٣ن) ـ پێغەمبەر ﷺ ، (سعد)ی کوڕی (أبی وقاص)ی لەگەڵ بیست سواردا نارد بۆ ڕێگەگرتن لە کاروانێکی قورەیش ، بەڵێنی لێ وەرگرتن کە لە (الخرّار) نەگوزەرێن ، کەوتنەڕێ بە شەو دەڕۆشتن و بە ڕۆژ کەمینیان دادەنا ، تا لە ڕۆژی پێنجەمدا گەیشتنە (الخرّار) ، هەواڵیان پرسی کاروانەکە ڕۆژێك پێش ئەمان دەرچوو بوو .

ئالآکەی (سعد) (ر) سپی بوو ، (مقداد) ی کوڕی (عمرو) هەڵی گرتبوو.

٤. غەزای (أبواء) یان (ودّان)[1] ، لە (صفر)ی ساڵی (٢)ی کۆچیدا ـ بەرامبەر بە ئۆگستۆسی ساڵی (٦٢٣ن) ـ پێغەمبەر ﷺ خودی خۆی چووە دەرەوە ، پاش ئەوەی (سعد)ی کوڕی (عبادە)ی لەدوای خۆی لە مەدینە بەجێهێشت ، لەگەڵ (حەفتا) پیاوی تایبەتی کۆچکەراندا چوە دەرەوە ، بۆ ڕێگە گرتن لە کاروانێکی قورەیش کە گەیشتبوە (ودّان) ، بەڵام پێیان نەگەیشت لەو غەزایەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پەیماننامەیەکی هاوپەیمانی لەگەڵ (عمرو)ی کوڕی (مخشی الضمری) دا بەست کە لەو ڕۆژگارەدا سەرۆکی خێڵی (بنی ضمرة) بوو ، ئەمەش دەقی پەیماننامەکەیە :

---

[1] / (ودّان) . شەدە لەسەر داڵەکە بێت . شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا ، لەنێوان (ودّان) و (رابغ) دایە بەدیوی مەدینەدا (٢٧) میلە دوورە ، (ابواء) یش شوێنێکە لە نزیك (ودّان) ەوە .

( ئەمە نووسراوی موحەممەد پێغەمبەری خودایە بۆ (بنی ضمرة) . ئەوان بێوەی دەبن لە ماڵ و حاڵی خۆیاندا تا دەریای صوفە ئاوی تێدابێت . پشتیوانی دەکرێن دژ بە هەر کەسێك لەگەڵیاندا بجەنگێت جگە لە دژایەتی ئایینی خودا ، ئەگەر پێغەمبەریش ﷺ ئەوانی بانگکرد بۆ پشتیوانی لێ کردنی دەبێت هاوکاریی بکەن )[1] .

ئەمە یەکەم غەزایە کە پێغەمبەر ﷺ خۆی پێی هەستابێت ، ماوەی (١٥) شەوی پێچوو ، ئالاکەی سپی بوو ، (حمزە)ی کوڕی (عبد المطلب) هەڵی گرتبوو.

٥. غەزای (بواط) ، لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٢)ی کۆچیدا - بەرامبەر بەمانگی سێبتێمبەری ساڵی (٦٢٣ ز) - پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دووسەد هاوەڵیدا چووە دەرەوە بەمەبەستی ڕێگە گرتن لە کاروانێکی قوڕەیشی کە (أمیە)ی کوڕی (خلف)ی تێدا بوو ، لەگەڵ سەد پیاوی قوڕەیشی و ، دوو هەزارو پێنج سەد وشتر ، پێغەمبەر ﷺ لەلایەکی ترەوە گەیشتە (بواط) لەڕێگەی (رضوی)[2] وەو لەئەنجامدا بەکاروانەکە نەگەیشتن .

لەو غەزایەدا پێغەمبەر ﷺ، (سعد)ی کوڕی (معاذ)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت، ئالاکەی سپی بوو، بەدەست (سعد)ی کوڕی (أبی وقاص)ەوە بوو رضي الله عنه.

٦. غەزای (صفوان) . لەمانگی ڕبیعی یەکەمی ساڵی (٢) ی کۆچیدا - بەرامبەر بە ساڵی (٦٢٣) ز - (کرز)ی کوڕی (جابر الفهری) بەهێزێکی سووکەڵەی موشریکانەوە هێرشێکی هێنایە سەر لەوەڕگەکانی مەدینەو ، هەندێك مەڕو ماڵاتی بەتاڵانی برد . پێغەمبەری خوا ﷺ حەفتا پیاوی لەگەڵ خۆیدا بردو کەوتە ڕاوەدونانی ، تاگەیشتە شیوێك پێی دەڵێن: (صفوان) بەڕووی بەدردا ، بەڵام بە (کرز)و تاقمەکەی نەگەیشت ، ئەوەبوو بەبێ شەڕ گەڕایەوە ، ئەم غەزایە بە ناوی غەزای بەدری یەکەمیش ناوی دەبرێت .

لەم جەنگەدا (زید)ی کوڕی (حارثة)ی بەسەر مەدینەوە دانا ، ئالاکە سپی بوو ، (علی) کوڕی (ابو طالب) هەڵی گرتبوو (ڕ) .

---

[1] / بڕوانە (المواهب اللدنیە) ١/٧٥ . و شەرحەکەی نوسینی / زەرقانی .

[2] / (بُواط) . (ضمة) لەسەر بائەکە بێت . لەگەڵ (رضوی) دوو گردە شاخن بەشێکن لە شاخی (جهینة) ، بەرەو ڕێگەی شام ، لە نێوان (بواط) و (مدینة) دا چوار شەو و ڕۆژ ڕێگەیە .

٧. غەزای (ذی العشیرة) . لە جەمادی یەکەم و ، جەمادی ئاخیرەتی ساڵی (٢) ی کۆچیدا - بەرامبەر بە نۆڤەمبەرو دیسەمبەری ساڵی (٦٢٣)ز - پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (١٥٠) کەس ، هەندێك دەڵێن (٢٠٠) کەسی کۆچکەراندا چوە دەرەوەو ، بە زۆر کەسی نەبرد ، بە نۆرە سواری نۆ وشتر دەبوون ، دەیانویست ڕێگە لە کاروانێکی تری قورەیش بگرن ، کە بەرەو شام دەچوو ، هەواڵی دەرچوونی لە مەککەوە هات کە بڕێکی زۆر پارەی قورەیشی تێدایە ، کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە (ذی العشیرة [1]) ، بینی بەچەند رۆژێك پێشتر تێپەڕ بوون ، هەر ئەم کاروانە بوو ، کە بۆی چووە دەرەوەو کاتێکیش گەڕایەوە بووە هۆی ڕوودانی غەزای بەدری گەورە .

دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەکۆتاییەکانی مانگی جەمادی یەکەمدا بوو ، گەڕانەوەشی لە سەرەتای مانگی جەمادی ئاخیرەدا بوو . هەروەکو (إبن إسحاق) دەڵێت . لەوانەیە هەرئەمەش بووبێتە هۆی جیاوازی ڕاوبۆچوونی سیرەت نووسەکان لەبارەی دیاریکردنی ئەو مانگەوە.

لەم غەزایەدا پێغەمبەر (أبو سلمە)ی کوڕی (عبد الأسد المخزومی) دانا بەسەر مەدینەوە ، ئاڵاکە لەم جەنگەشدا سپی بوو ، (حمزە)ی کوڕی (عبد المطلب) هەڵی گرتبوو (ڕ) .

٨. سریەی (نخلە)، لەمانگی ڕەجەبی ساڵی (٢)ی کۆچیدا - بەرامبەر بە یەنایەری ساڵی (٦٢٣ز) - پێغەمبەر (عبد اللە)ی کوڕی (جحش الأسدي) نارد بۆ (نخلە) لەگەڵ (١٢) پیاوی کۆچکەردا، هەر دووکەسەو بەنۆرە سواری وشترێك دەبوون .

پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ نووسیی و ، فەرمانی پێدا ، تا ماوەی دوو ڕۆژە ڕێ نەیکاتەوە ، پاشان سەیرێکی بکات ، (عبداللە) ڕۆشت ، پاش دوو ڕۆژەڕێ نامەکەی کردەوە ، ئەمەی تێدا نوسرا بوو :

( هەرکاتێك سەیری ئەم نووسراوەی منت کرد ، بڕۆ هەتا دەگەیتە (نخلە) لەنێوان مەککەو تائیفدا ، چاودێریەکی کاروانەکەی قورەیش بکەو ، هەواڵمان بۆ بهێنەرەوە، (عبداللە) پاش خوێندنەوەی نامەکە وتی: بەسەرچاوان ) ، ئینجا هەواڵەکەیدا بەهاوڕێکانی ، زۆری لەکەسیان نەکرد ، وتی : هەرکەسێك حەزی لە شەهید بوونە باهەستێت ، هەرکەسێکیش لە مردن دەترسێت بانەیەت ، بەلام خۆم هەڵدەستم ، ئیدی هەموویان هەستان ، لەکاتی ڕێگە ڕۆشتندا (سعد)ی کوڕی (أبي وقاص) و (عتبە)ی

---

[1] / (العشیرە) ناوچەیەکە لە نزیك (ینبع)ەوە.

کوڕی (غزوان) وشترەکەیان لێ ون بوو بە دوایدا دەگەڕان ، بەو هۆیەوە دواکەوتن ، (عبدالله)ی کوڕی (جحش) کەوتەڕێ تا گەیشتە (نخلە) لەوێ دابەزی ، کاروانێکی قوڕەیش بەوێدا تێپەڕی ، شەراب و بەردی بەنرخ و شمەکی بازرگانی پێبوو ، (عمرو)ی کوڕی (الحضرمی) و (عثمان) و (نوفل)ی هەردوو کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (مغیرە) و (الحکم)ی کوڕی (کیان) غولامی (بنی المغیرە) یان لەگەڵدا بوو ، موسوڵمانەکان کەوتنە مشتومڕ لەنێوان خۆیانداو وتیان : ئێستا ئێمە لەدوایین ڕۆژی ڕەجەبداین کە مانگێکی حەرامە ، ئەگەر شەڕی تێدا بکەین ئەوا سنووری مانگەکەمان بەزاندووە ، ئەگەر ئەمشەویش وازیان لێ بهێنین ئەوا دەگەنەوە حەرەم ، بۆیە بڕیاریاندا کە لێیان بدەن ، یەکێکیان تیرێکی دا لە (عمرو)ی کوڕی (الحضرمی) و کوشتی ، ئەنجا (عثمان) و (الحکم) یشیان بەدیلی گرت و ، (نوفل) ڕای کرد ، پاشان بەکاروانەکەی (عمرو) و دوو دیلەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە ، پێنجیەکیان لێ جیاکردەوە ئەوە یەکەم پێنجیەك بوو لەئیسلامدا . هەروەها یەکەم کوژراو بوو لە ئیسلامداو ، یەکەم دیلیش بوو لە ئیسلامدا .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی پێ ناخۆش بوو ، فەرمووی : من فەرمانم پێ نەدابوون بە شەڕکردن لەمانگی حەرامدا ، سەبارەت بەکاروان و هەردوو دیلەکەوە وەستاو هیچی نەکرد.

موشریکانیش لەو ڕووداوەدا دەرفەتێکی باشیان دەستکەوت بۆ تاوانبار کردنی موسوڵمانەکان بەوەی گوایە شتێکیان حەڵاڵ کرد کەخوا حەرامی کردوە ، قسەو قسەلۆکی زۆری تێداکرد ، تا وەحی هاتەخوارەوەو ئەو قسەو قسەلۆکانەی یەکلاکردەوەو جەختی لەسەرئەوە کرد ، کەئەوەی موشریکان دەیکەن زۆر گەورەترە لەوەی موسوڵمانەکان کردوویانە ....

﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ ﴾ البقرة / ٢١٧ ، واتە : پرسیارت لێدەکەن لەبارەی مانگی حەرامەوە کە ئایا شەڕ تێیدا حەرامە یان نەء ، بڵێ : کوشتار تێیدا تاوانێکی گەورەیە ، هەروەها دژایەتی کردنی ڕێبازی خوداو و کافر بوون پێی و دەرکردنی خەڵکەکەی لە مزگەوتی حەرام گەورەترە لەو تاوانەی موسوڵمانەکان کردویانە ، ئاشووب و ئاژاوەگێڕیی لە کوشتن خراپترە .

وەحی لێرەدا بەئاشکرا دەڵێت ئەو گۆبەنگەی موشریکان ناویانەتەوە بۆ وروژاندنی گومان و دڵەڕاوکێ لەسیرەتی ژیانی چەکدارە موسوڵمانەکاندا هیچ بەهانەیەکی نیە ، چونکە حورمەتە پیرۆزەکان لە دژایەتی کردنی ئیسلامدا هەموو

شکێنراون و ، خەڵکەکەی چەوسێنراونەتەوە ، ئایا کە موسوڵمانەکان بڕیار درا لەسەر بەسەراگرتن و زەوت کردنی ماڵ و موڵکیان وکوشتنی پێغەمبەرەکەیان لەناو مزگەوتی حەرامدا تاوان نەبوون ؟ کەواتە ئەو هۆیە چیە ئێستاکێ پیرۆزی گێڕاوەتەوە بۆ ئەو حورمەتانە و شکاندنیان لە ئەمڕۆ دا بوەتە تاوان ؟

گومانی تێدانیە کە ئەو پڕوپاگەندەیە موشریکان بڵاویان کردەوە جۆرێك بوو لە بێ مێشکی و ڕووهەڵماڵراوی ، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ هەردوو دیلەکەی بەڕەڵلا کردو ، خوێنی کوژراوەکەشی دا بە کەس و کارەکەی [1] .

ئەمانە گرنگترین سریەو غەزاکانی پێش جەنگی بەدر بوون ، لەهیچ یەکێکیاندا ماڵ تالاّنکردن و پیاوکوشتن ڕووی نەدابوو ، مەگەر دوای ئەو تاوانانەی کە موشریکان لە ژێر سەرۆکایەتی (کرز)ی کوڕی (جابر الفهری)دا ئەنجامیاندا ، کەواتە دەست پێشخەریەکە لەموشریکانەوە بوو لەگەڵ ئەو هەموو کاروکردەوە ناشیرینانەی کە پێشتریش ئەنجامیان دابوو .

پاش ئەو دەست وەشاندنەی سریەکەی (عبداللە)ی کوڕی (جحش) ترسی موشریکان زیادی کردو ، لە بەردەمیاندا مەترسیەکی گەورەو ڕاستەقینە بەرجەستە بوو ، ئەوەی لێی ترسابوون  هاتەدی ، بۆیان دەرکەوت کە شاری مەدینە لە وریایی و بۆسەیەکی مەحکەمدان و ، چاودێری هەموو جموجوڵێکی بازرگانیان دەکەن و ، دەتوانن تا ماوەی (٣٠٠) میل داکشێن بەرەو مەککەو ، لێیان بکوژن و دیلیان لێ ببەن و ، ماڵیان تالاّن بکەن و ، بەبێ‌وەیی بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان ، موشریکان هەستیان کرد کە بازرگانیەکەی بەرەو شامیان لەبەردەم مەترسیەکی هەمیشەییدایە ، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی بەئاگاییەوەو ڕێگەیەکی نەرم نیانی بگرن ، وەکو چۆن خێڵی (جهینە) و (بنو ضمرة) ئەو ڕێگەیان گرت ـ کەچی زیاتر ڕق ئەستوور بوون و ، گەورە و سەرکردەکانیان بڕیاری جێبەجێ کردنی هەڕەشەکانی خۆیاندا بە قڕ کردنی موسوڵمانەکان لەخانەی خۆیاندا ، هەر ئەم کەللە شەقیە بوو ڕاپێچی کردن بۆ بەدر، خوای گەورە دوای سریەکەی (عبداللە)ی کوڕی (جحش) مۆڵەتی شەڕ کردنی پێدا بوون لە شەعبانی ساڵی (٢) ی کۆچیدا پێدا بوون ، لەو بارەیەوە چەند ئایەتێکی ناردە خوارەوە ﴿ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ

---

[1] / درێژەی باسی ئەم سریە و غەزایانەمان لە (زاد المعاد) ٢/٨٣ ، ٨٤ ، ٨٥ ، هەروەها ( إبن هشام) ١/٥٦١ ، تا ٦٠٥ ، هەروەها (رحمە للعالمین)ەوە وەرگرت /١١٥، ١١٦، ٢/٢١٥، ٢١٦، ٤٦٨، ٤٦٩، ٤٧٠، لە سەرچاوەکانیشدا جیاوازیەك هەیە لە ریزکردنی ئەو غەزاو سریانەدا ، دیاریکردنی ئەوانەش کە لەدەرەوەیدان ، لەوەشدا پشتمان بەلێکۆلینەوەکەی (عەللامە إبن القیم) و (عەللامە المنصور فوری) بەست.

تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ {١٩١} فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ {١٩٢} وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ {١٩٣} وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ {١٩٠} ﴾ واتە: لەپێناوی خودا شەڕ بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شەڕتان لەگەڵدا دەکەن ، دەست درێژی مەکەن ، خوای گەورە دەست درێژکارانی خۆش ناوێت ، لەکوێدا بەدیتان کردن بیانکوژن ، وەدەریان بنێن هەروەکو ئێوەیان دەرکرد ، ئاشوب لە کوشتن خراپترە ، لەپاڵ مزگەوتی حەرامدا شەڕیان لەگەڵ مەکەن ئەگەر ئەوان شەڕیان کرد بیانکوژن ، ئەوە سزای کافرانە ، ئەگەر وازیان هێنا ئەوە خودای گەورە لێبوردەو بەبەزەییە ، شەڕیان لەگەڵدا بکەن تا ئاشووب دروست نەبێت و ملکەچ بوون تەنها بۆ خودا بێت ، ئەگەر ئەوان وازیان هێنا ئەوا دەست درێژی ڕەوا نیە ، مەگەر بۆ سەر زاڵمان .

پاشان زۆری پێ نەچوو خوای گەورە چەند ئایەتێکی لە جۆری تر بۆ ناردنە خوارەوە ، کە فێری شێوازی شەڕیان دەکات و ، هانیان دەدات ، هەندێك لە ئەحکامەکانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە ﴿ فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ {٤} سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ {٥} وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ {٦} يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ {٧} ﴾ محمد[1] ، واتە : ئەگەر کافرانتان بینی بدەن لەملیان تا زاڵ دەبن بەسەریاندا بیانبەستنەوە ، جا یان بەریان بدەن یان خوێن باییان لێ وەربگرن لە فیدیەدا بیاندەن تا ئەو کاتەی جەنگ کۆتایی دێت ، بەو شێوەیە گەر خودا بیەوێت سەرتان دەخات بەسەریاندا ، بۆ ئەوەی بە هەندێکیان ئەوانی دی تاقی بکاتەوە ، ئەوانەش کە لەپێناوی خوادا شەهید بوون خودا پاداشتیان زایە ناکات ، ڕێنومایییان دەکات و کاروباریان چاك دەکات و ، دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کە بۆی باس کردوون ، ئەی ئیمانداران ئەگەر ئایینی خودا سەربخەن ، خودای گەورەیش ئێوە سەر دەخات و پێەکانتان دەچەسپێنێت .

پاشان کەوتە سەرکۆنەکردنی ئەو کەسانەی بەبیستنی فەرمانی شەڕ دڵیان کەوتە لەرزەو هەڵلەرزین : ﴿ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي

[1] / مامۆستا سەیید (ابو الأعلى المودودى) لێکۆڵینەوەیەکی بەبەڵگەوە ئەنجامداوە ، تیایدا دەڵێت : کە سورەتی (محمد) پێش جەنگی بەدر هاتۆتە خوارەوە ، بڕوانە (تفهيم القرآن) ٥/ ١١ ، ١٢ .

قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ ﴾ محمد ، واتە: ئەگەر سورەتێکی موحکەم بهاتایە خوارەوەو باسی شەڕی تێدابوایە ، دەتبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە بەشێوەیەك سەیرت دەکەن ، دەڵێتی زەندەقیان چووە .

واجب بوونی جەنگ و خۆ بۆ ئامادەکردنی بەپێی بارودۆخی ئەوکاتە زۆر جێگەی خۆی بوو ، ئەگەر سەرکردەیەك هەبوایە کوڕی ڕۆژگار بێت فەرمانی دەدا بە سەربازەکانی کەئامادەباشی وەربگرن بۆ هەموو بارێکی نائاسایی ، بارو دۆخەکە دەیخواست کەشەڕێکی خوێناویی لەنێوان هەق و ناهەقدا ڕووبدات، قورسایی ڕووداوەکە سریەی (عبدالله)ی کوڕی (جحش) لێدانێکی سەختبوو حورمەت و لووت بەرزی موشریکانی شکاندو ، ئازاری پێگەیاندن و ، وای لێکردن دەتوت لەسەر سکڵ دەژین.

ئایەتەکانی فەرمان بەشەڕیش لەناوەڕۆکدا شەیپوری نزیك بوونەوەی شەڕیان لێدەداو، نیشانیان دەدا کە سەرکەوتن و زاڵبوونی کۆتایی بۆ موسوڵمانەکانە ، سەیرکە چۆن خوای گەورە فەرماندەدا بەدەرکردنی موشریکان هەروەکو چۆن ئەوان ئەمانیان دەرکردو ، فێریشان دەکات کە ئەحکامەکانی سوپای سەرکەوتوو لەگەڵ دیلەکاندا چۆنە ، چۆن دوژمن کەفتەکار دەکەن و زاڵ دەبن بەسەریاندا ، تا ئەوکاتەی جەنگ کۆتایی دێت، ئەمانە هەموو ئاماژەی سەرکەوتنی کۆتایی موسوڵمانەکانی تێدایە، بەڵام ئەمانە هەموو بەشاراوەیی مانەوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بەئەندازەی دڵگەرمی خۆی لەپێناو خوادا بجەنگێت .

لەو ڕۆژانەدا – لە شەعبانی ساڵی (٢)ی کۆچیدا – بەرامبەر بە فەبرایەری ساڵی (٦٢٤ز) – خوای گەورە فەرمانیدا بەوەرچەرخاندنی ڕووگە (قیبلە) لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (بیت الحرام) ، ئەمەش سوودەکەی ئەوەبوو ئەو دڵ نەخۆش و دووڕووە جولەکانەی هاتبوونە ناو ڕیزەکانی موسوڵمانانەوە بۆ نانەوەی پشێوی هەموویان دەرکەوتن و ئاشکرابوون وگەڕانەوە سەردۆخی جارانی خۆیان و، بەو شێوەیە ڕیزەکانی موسوڵمانان لە بەشێکی زۆری تاقمی خیانەتکارو خراپەکار ڕزگاری بوو پاك بووەوە .

لە وەرچەرخانی قیبلەشدا ئاماژەیەکی نهێنی تێدایە بۆ دەست پێکردنی قۆناغێکی نوێ ، کە بەگرتنە دەستی ئەو قیبلەیە کۆتایی دێت ، سەیر نیە کە قیبلەی کۆمەڵێك بەدەست کۆمەڵێکی ترەوە بێت ! خۆ ئەگەر بە دەستیشیانەوە بێت دەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لەدەستیان دەربهێنرێت و ڕزگار بکرێت .

پاش ئەم فەرمان و ئاماژانە چالاکی موسوڵمانەکان پەرەی سەند، ئارەزوویان بۆ جیهاد کردن لەپێناوی خواو گەیشتن بەدوژمندا لەشەڕێکی یەکلاکەرەوەدا ، زیادی کرد.

## غەزای گەورەی بەدر

## یەکەم جەنگی یەکلاکەرەوەی ئیسلام

### هۆیەکانی غەزاکە

هەروەکو لەباسی غەزای (العُشیره)دا باسمان کرد کاروانێکی قورەیش لە مەککەوە بۆ شام لەدەست پێغەمبەر ﷺ قوتار بوو ، کە کاتی گەڕانەوەی لە شامەوە بۆ مەککە نزیك بوەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ (ظلمة)ی کوڕی (عبدالله) و (سعید)ی کوڕی (زید)ی نارد بەرەو باکور ، بۆئەوەی سوسەیەکی ئەو ناوچەیە بکەن ، گەیشتنە ناوچەی (حوراء) لەوێ مانەوە هەتا (ابو سفیان) بەکاروانەکەوە بەوێدا تێپەڕی کرد ، خێرا گەڕانەوە بۆ مەدینەو ، هەواڵەکەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ ، کاروانەکە پێکهاتبوو لە سامانێکی زۆر گەورەی خەڵکی مەککە ، هەزار وشتری بارکراو بە ماڵ ، بەهایان لە پەنجا هەزار دینار ئاڵتوون کەمتر نەدەبوو ، تەنها چل پاسەوانیشیان لەگەڵدا بوو.

دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ سەربازگەی مەدینەو دەست وەشاندنیش لەو کاروانە لە ڕووی سەربازی و سیاسیی و ئابووریەوە گورزێکی کەمەرشکێن دەبوو ، ئەگەر موشریکان ئەو سامانەیان لەکیس بچوایە ، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ لەناو موسوڵماناندا بانگی کردو فەرمووی: ئەوە کاروانەکەی قورەیشە ماڵ و سامانی ئەوانی تێدایە ، بڕۆنە دەرێ بۆیان سابەڵکو خودا بیکات بەدەستکەوتتان .

هیچ کەسێکی بەدەرچوون ناچار نەکرد ، بەڵکو وازی لێهێنان بۆ حەزی خۆیان ، چونکە چاوەڕوانی نەدەکرد بەو شێوەیە هەڵتەقێت بەڕووی سوپای مەککەدا . لەجیاتی دەست بەسەراگرتنی کاروانەکە . ئەو پێکدادانە توندوتیژە لە شەڕی بەدردا بقەومێت ، هەروەها زۆرێك لە مەدینە مانەوە چونکە پێیان وابوو ئەم دەرچوونە وەکو دەرچوونی سریەکانی تری پێغەمبەرە ﷺ ، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ سەرزەنشتی هیچ کەسێکی نەکرد کە نەهاتبێت بۆ ئەو غەزایە.

### هێزی سوپای ئیسلام و دابەشکردنی سەرکردایەتیەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادەکرد بۆ دەرچوون ، سیسەدو چواردە تا (۱۷) کەسی لەگەڵ خۆیدا برد (۳۱۳ ، ۳۱٤ پیاو) ۸۲ یان ۸۳ یان ۸٦ کەس لە کۆچکەران و ، (٦۱) کەس لە (ئەوسیەکان) و (۱۷۰) کەسیش لە خەزرەجیەکان ،

ئەو دەرچوونەیان ، ئەوەندە بەهەند وەرنەگرت و ، ئامادەگی باشیان بۆ نەکرد ، تەنها دوو ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو ، (زبیر)ی کوڕی (عوام) و (مقداد)ی کوڕی (أسود الكندی) و حەفتا وشتریان پێ بوو هەردوو تا سێ پیاو بەنۆرە سواریان دەبوون ، پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ (علی) و (مرثد)ی کوڕی (أبي مرثد)ی (غنوی)دا بە نۆرە سواری یەك وشتر دەبوون .

(ابن أم مکتوم)ی بۆ نوێژو ئیمامەت بەسەر مەدینەوە بەجێ هێشت ، کە گەیشتنە (الروحاء) ئەوجا (أبو لبابە)ی کوڕی (عبد المنذر)ی ناردەوەو ، کردیە سەرداری مەدینە .

ئاڵا گشتیەکەشی کە ڕەنگی سپی بوو دایە دەست (مصعب)ی کوڕی (عمیر)ی (القرشی العبدری).

سوپاکەشی کرد بەدوو کەتیبەی سەرەکیەوە :

١. کەتیبەی کۆچکەران، ئاڵاکەیانی دایەدەست (علی) کوڕی (أبي طالب) (ڕ).

٢. کەتبەی ئەنسار ، ئاڵاکەیانی دایە دەست (سعد)ی کوڕی (معاذ).

(زبیر)ی کوڕی (عوام)ی کردە سەرۆکی بەشی ڕاست ، (مقداد)ی کوڕی (عمرو) یشی کردە سەرۆکی بەشی لای چەپ ئەم دوانە هەروەکو وتمان تەنها دوو ئەسپ سواری ناو سوپاکەی پێغەمبەر بوون ﷺ . لەناوەڕاستیشدا (قیس)ی کوڕی (أبی صعصعە)ی دانا ، سەرکردایەتی گشتیش وەك سەرۆکی باڵادەست خۆیەوە بوو ﷺ .

## سوپای ئیسلام بەرەو بەدر دەجوڵێت

پێغەمبەری خوا ﷺ بەو سوپا نائامادەوە کەوتەڕێ ، لە(نقب)ی مەدینە دەرچوو ، بەسەر ئەو ڕێگە سەرەکیەدا ڕۆشت کە بەرەو مەککە دەچێت ، تاگەیشتە بیری (الروحاء) کەمێك لەوێ مایەوەو ، ڕێگەی مەککەی خستەلای دەستی چەپیەوە لایدا بەلای ڕاستدا لەسەر (نازیە - مەبەستی گەیشتن بوو بە بەدر - لایەکی گرت ، هەتا گەیشتە شیوێك پێی دەڵێن : (رهقان) لەنێوان (نازیە) و تەنگەبەری (صفراء) دا ، پاشان بەناو تەنگەبەرەکەدا تێپەڕی تا نزیك بوەوە لە ( الصفراء) ، لەوێدا (بسیس)ی کوڕی (عمر الجهینی) و (عدی) کوڕی (أبي الزغباء الجهني)ی نارد بۆ بەدر تا هەواڵگۆیەکی لەبارەی کاروانەکەی قورەیشەوە بۆ بکەن .

## جاڕدەرێك لە مەككەدا

سەبارەت بەهەواڵی کاروانەکە ـ کە (ابو سفیان) بەرپرسی بوو ـ زۆر خۆی دەپاراست ، (ابو سفیان) دەیزانی کە ڕێگەی مەککە پڕیەتی لە مەترسی و زوو زوو گوێی هەڵدەخست بۆ هەواڵ و، پرسیاری دەکرد لەهەر ئەسپ سوارێك کەپێی بگەشتایە، زۆری پێ‌نەچوو هەواڵگرەکانی هەواڵیان پێدا کەموحەممەد ﷺ هاوەڵەکانی کۆکردۆتەوە تادەستێ لەکاروانەکە بوەشێنن، دەستبەجێ کابرایەکی بەکرێ گرت ناوی (ضمضم)ی کوڕی (عمرو الغفاری) بوو ناردی بۆ مەککە، تا لەوێ دەست بکات بەهاوار هاوار کەفریای کاروانەکەیان بکەون و، نەهێڵن دەست موحەممەد ﷺ و ، هاوەڵەکانی بکەوێت ، (ضمضم) بەسواری وشترەکەیەوە هەر لە دۆڵەکەی سەرەتای مەککەوە بەپێوە وەستاو، لوتی وشترەکەی قلیشاندبوو ، جلەوی وولاخەکەی بەرەڵلا کرد بوو، یەخەی دادڕیبوو ، هاواری دەکرد ، خێڵی قوڕەیش ، قوڕ بپێون ، قوڕ بپێون ، ماڵ و سامانەکەتان کە لەگەڵ (ابو سفیان) دایە ، موحەممەدو هاوەڵەکانی ڕێگەیان پێگرتوە ، بڕوا ناکەم پێیان بگەن ـ فریاکەون ، فریاکەون .

## خەڵكی مەككە خۆیان ساز دەكەن بۆ شەڕ

دەستبەجێ خەڵك بەپەلە هاتنەدەرەوەو وتیان: لەموحەممەدو هاوەڵەکانی وایە ئەمەش کاروانی (حضرمی) یەکەیە ؟ شتی وانابێت ، دەبێت بزانێت کەوانیە ، یەك یەك و دوودوو هاتنە دەرەوە ، ئەو کەسەش خۆی نەهاتایە کەسێکی دەنارد ، خۆیان ئامادەکرد بۆ دەرچوون ، جگە لە (ابی لهب) هیچ کەس لە سەرانی قوڕەیش دوانەکەوت ، لەجیاتی خۆی پیاوێکی نارد کە قەرزاری بوو . هەرچی هۆزو تیرەی دەوری خۆیان هەیە کۆیان کردەوە ، هەموو تیرەکانی قوڕەیش کەوتنە ڕێ جگە لە (بنی عدی) کە هیچ کەسێکیان ئامادە نەبوو.

## ژمارەی سوپای مەككە

ئەم سوپایە لە سەرەتای بەڕێکەوتنیدا هەزارو سێ‌سەد کەس بوو ، سەد ئەسپ سوارو شەش سەد زنجیربەندیان لەگەڵدابوو، ژمارەی وشترەکانیان ئەوەندە زۆر بوو بەتەواوی نەدەزانران ، سەرکردەی گشتیان (ابو جهل)ی کوڕی (هشام) بوو ، ئەوانەی پێداویستیان بۆ سوپاکە ئامادەکردبوو نۆکەس بوون لەسەرانی قوڕەیش ، ڕۆژێك نۆ وشترو ڕۆژێکیش دە وشتریان بۆ سوپاکە سەردەبڕی.

## گیروگرفتی هۆزەکانی (بنی بکر)

کاتێك ئەم سوپایە کەوتەڕێ ، قورەیش وەبیری کەوتەوە کە لەگەڵ (بنی بکر)دا دوژمنایەتی و شەڕیان هەیە ، لەوە دەترسان کە لەپشتەوە لێیان بدەن و ، بکەونە نێوان دوو ئاگرەوە ، خەریکبوو ئەوە پەشیمانیان بکاتەوە ، بەڵام لەوکاتەدا ئیبلیس لە شێوەی (سراقە)ی کوڕی (مالك)ی کوڕی (جعشم المدلجی)دا - کە سەرۆکی خێڵی (کنانە)یە - هاتە لایان و پێی وتن: من دڵنیاتان دەکەم لەوەی کە (کنانە) لە پشتەوە بێت بۆتان و شتێکتان لێ بکات کە پێتان ناخۆش بێت .

## سوپای مەککە دەکەوێتە جووڵە

ئیدی لە ماڵ دەرچوون ، هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿ بَطَراً ورئاءَ الناسِ وَيَصُدُّون عَن سَبيلِ الله ﴾ ، کەوتنە ڕێ هەروەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( بەچەك و تفاقیانەوە بۆ جەنگان لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەیدا کەوتنە ڕێ ) ، ﴿وَغَدَوا على حرد قَادرين ﴾ ، دەستیان کردە جووڵە بەرەو لایی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی ، چونکە زاتی ئەوەیان کردوە پەلاماری کاروانەکەیان بدەن ، بەشێوەیەکی زۆر خێرا سوپاکە بەرەو باکوورو ئاڕاستەی بەدر کەوتەڕێ ، ڕێچکەی شیوی (عسفان) یان گرتەبەر ، پاشان (قدید) و (جحفە) و لەوێدا لەلایەن (أبو سفیان)ەوە نامەیەکیان پێگەیشت کە تیایدا پێیان دەڵێت: ئێوە بۆ ئەمە دەرچوون کە کاروانەکەو پیاوەکانتان و ماڵ و سامانەکەتان ڕزگار بکەن ، ئەوە خودا ڕزگاری کرد کەواتە بگەڕێنەوە.

## کاروانەکە دەرباز دەبێـت

(أبو سفیان) کاروانەکەی بەڕێگەی سەرەکیدا دەبرد ، بەڵام بەوریایی و خۆ پارێزیەوە ، چالاکیەکی زۆری دیدەوانیانەی ئەنجام دەدا ، کە لەبەدر نزیکبووەوە کەوتەپێش کاروانەکەوە، تالەوێدا (مجدی) کوڕی (عمرو)ی بینی ، لەبارەی سوپاکەی مەدینەوە پرسیاری لێکرد ، وتی : کەسێکم نەدیتوە نەیناسم ، لەپشت ئەو گردەو دوو وشترسوارم بینی وشترەکانیان لەپشت ئەو گردەوە یخ دابوو ، پاشان کەمێك ئاویان بردو ڕۆشتن ، دەستبەجێ (أبو سفیان) چووە شوێنی یخ دانەکەیان و ، کەمێك لە پشقلی وشترەکانی هەڵگرت و تێکیدا ، بینی ناوکی تێدایە ، وتی : وەڵڵاهی ئەمە ئالفی شاری (یثرب)ە ، خێرا گەڕایەوە بۆ لای کاروانەکەو ، ئاڕاستەی کاروانەکەی کردە ڕووەو ڕۆژئاواو ڕێگەی کەنار دەریا ، ئیدی لە ڕێگە سەرەکیەکە لای داو خستیە لای چەپیەوە ، بەو شێوەیە کاروانەکەی لە دەست سوپای موسوڵمانەکان قوتارکرد ، دوای ئەوە ئەو نامەیەی نووسی بۆ مەککەییەکان کە لە ناوچەی (الجحفە)دا بارگەیان خستبوو.

## بڕیاردانی سوپای مەککە بە گەڕانەوە و
## دروست بوونی دووبەرەکی تیایدا

کە سوپای مەککە نامەکەی پێگەیشت خەریکبوو بگەڕێتەوە ، لەوێدا (ابو جهل) بە لووت بەرزی و لەخۆبایی بونێکەوە هەستایە سەرپێ‌و وتی : سوێند بەخوا ناگەڕێنەوە تا نەچینە سەر ئاوی بەدر ، سێ ڕۆژ تیایدا دەمێنینەوەو ئاژەڵ سەر دەبڕین و ، مەی دەخۆینەوە ، کەنیزەکەکان گۆرانیمان بۆ دەڵێن و سەمادەکەن و هەموو عەرەب هەواڵی ئەم هاتن و کۆبوونەوەیەمان ببیستن و بەبەردەوامی لێمان بترسن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (أخنس)ی کوڕی (شریق) داوای کرد بگەڕێنەوە کەچی کەسیان بەگوێیان نەکرد ، خۆی و کوڕەکانی و (بنی زهرە) گەڕانەوە چونکە هاوپەیمان و سەرۆکیان بوو لەم خۆ ئامادەکردنەدا ـ بۆیە یەك کەسی خێڵی (زهرە) شەڕی بەدری نەدی و نزیکەی سێ سەد پیاو دەبوون ، (بنو زهرە) ڕاوبۆچوونەکانی (اخنس)ی کوڕی (شریق) یان پێ خۆش بوو ، بۆیە بەبەردەوامی قسە بیسراو شکۆدار بوو لەناویاندا .

(بنوهاشم) یش ویستیان بگەڕێنەوە ، (ابو جهل) پیایاندا هەڵشاخاو وتی : ئەم تاقمەمان لێ جیا نابێتەوە تا دەگەڕێنەوە بۆ مەککە .

سوپای مەککە دوای گەڕانەوەی (بنو زهرە) ژمارەیان هەزار چەکدار دەبوو ـ بەرەو بەدر کەوتە ڕێ ـ بەردەوام بوو تا گەیشتە نزیکی بەدرو لەوێ دابەزین ، لە پشت گردێکەوە کە دەکەوێتە (العدوە القصوی) لەسەر سنووری شیوی بەدر دابەزین.

## تەنگـاویی هەڵـوێستی سوپـای ئیسلامـی

هەواڵگریی سوپای مەدینە هەواڵێکیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ـ کە هێشتا لە شیوی (ذفران) دابوو ـ سەبارەت بە دەربازبوونی کاروانەکەو هاتنی سوپاکەی مەککە ، پاش وورد بوونەوە لەو هەوالانە تەواو دڵنیابوو کە هیچ بوارێك نەماوە بۆ خۆ لادان لەجەنگێکی خوێناوی و پێویستە لەو شەڕە بەگیانێکی لەخۆ بوردوانەو ئازایانەو بەغیرەتانەوە بڕۆنە پێشەوە ، چونکە گومانی تێدانیە کە ئەگەر واز لە سوپای مەککە بهێنرێت بەو ناوچەیەدا بگەڕێت ئەو مەسەلەیە پلەوپایەی سەربازیی قورەیش بەهێز دەکات و دەسەڵاتی سیاسیانەی بەرفراوانتر دەکات و ، هەڵوێست و بڕیاری موسوڵمانەکانیش لاوازو سووك دەکات ، بەڵکو لەوانەش لەوەودوا بزاڤی ئیسلامیی ببێتە جەستەیەکی بێ گیان و، هەرکەسێك ڕقی لە ئیسلام بێت لە ناوچەکەدا زاتی ئەوە بکات شەڕی پێ بفرۆشێت .

پاش هەموو ئەوانەش ، چ کەسێك دەتوانێت دەستی سوپاکەی مەککە بگرێت لە هەڵکوتانە سەر شاری مەدینەو شەڕەکە نەگوێزرێتەوە بۆ پاڵ قەڵاو قوللەکانی مەدینەو ، هەڵنەکوتێتە سەر خەڵکی مەدینە لە شارەکەی خۆیاندا ؟ نەخێر ، ئەگەر سوپای مەدینە هیچ جۆرە پەشیمانیەکی نیشان بدایە ، گەورەترین کاریکەری خراپی دەبوو لەسەر سام و هەیبەت و ناوبانگی موسوڵمانەکان.

## ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی

بەهۆی ئەو گۆڕانکاریە ترسناکە ناکاوەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجوومەنێکی ڕاوێژکاریی سەربازیی باڵای دامەزراند ، تیایدا ئاماژەی کرد بۆ ڕەوشە دروست بوەکە ، ڕا گۆڕینەوەی لەگەڵ سەرکردەکانیدا ئەنجامدا ، لەوێدا دڵەلەرزە کەوتە دڵی هەندێك خەڵکەوەو ، لەو شەڕە خوێناویە ترسان ، ئەمانە ئەو کەسانە بوون کەخودا لە بارەیانەوە فەرمووی : ﴿ كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِن بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ {٥} يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ بَعْدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ {٦}﴾ الأنفال ، سەبارەت بەسەرکردەکانی سوپاکەش ، ئەبوبەکر (ڕ) لەناویاندا هەستاو کۆمەڵێك قسەی باشی کرد ، پاشان (عمر)ی کوڕی (خطاب) هەستاو قسەی باشی کرد ، پاشان (مقداد)ی کوڕی (عمرو) وتی : پێغەمبەری خوا بڕۆ بەدەم ئەو کارەوە کە خودا نیشانی داویت ، ئێمە لەگەڵتدا دەبین ، وەڵڵاهی ئەوەت پێ ناڵێین کە (بنو إسرائيل) بە موسایان وت : بڕۆ تۆو خوداکەت شەڕبکەن ئێمەش لەگەڵتان شەڕدەکەین، سوێندم بەوکەسەی تۆی بەهەق ناردوە ئەگەر بمانبەیت بۆ (برك الرماد)یش ئەوا سەرسەختانە لەگەڵت دێین هەتا دەیگەیتێ ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ گوتەیەکی جوانی پێ فەرموو دۆعای خێری بۆ کرد، ئەو سێ سەرکردەیە لە کۆچکەران بوون ، کۆچکەرانیش کەمینەی سوپاکە بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد ڕای سەرکردە ئەنساریەکان بزانێت ، چونکە ئەوان زۆرینەی سوپاکەی بوون و ، قوورسایی شەڕەکەش دەکەوتە سەرشانی ئەوان ، لەگەڵ ئەوەشدا دەقەکانی پەیماننامەی عەقەبە نەیکردبووە ئەرك لە سەریان کە شەڕ لەدەرەوەی شارەکەیاندا بکەن ، پاش گوتەی ئەو سێ سەرکردەیە فەرمووی: (خەڵکینە ڕای خۆتانم پێ بڵێن) مەبەستی ئەنساریەکان بوو ، ئیدی (سعد)ی کوڕی (معاذ) سەرکردەو هەڵگری ئاڵای ئەنساریەکان دەرکی پێکرد کە مەبەستی ئەوانە ، وتی: وەڵڵاهی دەڵێی مەبەستت ئێمەیە پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : بەڵێ.

(سعد) وتی: ئێمە باوەڕمان پێت هێناوە ، متمانەمان پێداویت ، شایەتیمان داوە ئەوەی تۆ هێناوتە ڕاستیە ، لەسەر ئەو بنەمایە پەیمان و بەڵێنمانداوە کە گوێڕایەڵت بین پێغەمبەری خوا ، بڕۆ بۆ ئەو مەبەستە خۆت دەتەوێت ، سوێندم بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردوە ، بماندەیت بە گژ ئەو دەریایەدا لەگەڵت دێین و ، یەك پیاومان دواناکەوێت و، ناترسین لەوەی سبەینێ بچین بەگژ دوژمندا ، ئێمە لەم جەنگەدا دان بەخۆدا دەگرین ، ڕاستگۆین لە ڕووبەڕوو بونەوەدا ، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئێمەوە شتێکت نیشان بدات کە دڵ و چاوتی پێ خۆشنوود بێت ، بمانخەرە ڕێ لەسەر بەرەکەتی یەزدان .

لە ریوایەتێکشدا (سعد)ی کوڕی (معاذ) وتی بەپێغەمبەری خوا ﷺ : لەوانەیە ترست لەوە هەبێت کە ئەنسارییەکان تەنها ئەوە بە ئەرك دەزانن کە لە ماڵ و حاڵی خۆیاندا پشتت بگرن ، ئەوە من لەجیاتی ئەوان قسە دەکەم و وەڵام دەدەمەوە ، بڕۆ بۆ ئەو کارەی خۆت پێت باشە ، ئەوەی کە تۆ بیبەیت بەلامانەوە خۆشترە تا ئەوەی بەجێی دەهێڵیت ، فەرمایشت بفەرموو بەهەر شتێك کاری ئێمەش بەدوای فەرمانی تۆوەیە ، سوێندم بەخوا ئەگەر بڕۆیت هەتا دەگەیتە (برك الرماد)ی (غمدان) یش لەگەڵت دێین ، وەڵڵاهی ئەگەر بچیتە ئەو دەریایەوە لەگەڵت دێین .

ئیدی پێغەمبەرﷺ بەو قسانەی (سعد) زۆر دڵخۆش بوو ، پاشان فەرمووی: (بکەونە ڕێ مژدەتان لێ بێت ، خوای گەورە مژدەی تێکشکاندنی یەکێك لەو دوو تاقمەی پێداوم ـ وەڵڵاهی دەڵێی دیمەنی کوشتارگەی ئەو تاقمەم لە پێش چاوە) .

## سوپای ئیسلام درێژە بە ڕۆشتنی دەدات

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ذفران) ڕۆشت ، بە لاپاڵێکدا ڕۆشت پێی دەڵێن (الأصافر) ، پاشان بەرەو خوار بووەوە بۆ شوێنێك پێی دەڵێن (الدیه) ، ئەنجا (الحنان)ی خستە لای دەستی ڕاستیەوە ـ کە بریتییە لە گردێکی لماوی گەورەی بەقەد شاخێك ـ پاشان لە نزیك چاوگەکانی (بدر)ە وە دابەزین .

## پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستێت بە پرۆسەیەکی دیدەوانی

لەوێدا پێغەمبەر ﷺ خۆی و هاوەڵەکەی ئەشکەوتی (أبوبکر الصدیق)(ڕ) ، هەستان بەئەنجامدانی کارێکی دیدەوانی و چاودێری کردن ، لەکاتێکدا کە دەسوڕانەوە بەدەوری سەربازگەکەدا پیاوێکی پیری دەشتەکیان بینی ، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرد لەبارەی قوڕەیش و موحەممەدو هاوەڵەکانیەوە پرسیاری لەبارەی هەردوو سوپاکەوە لێ کرد لەبەر نهێنی پاراستن . بەڵام کابرای پیر وتی : هەواڵتان پێ نادەم هەتا پێم نەڵێن ئێوە کێن ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر هەواڵمان بدەیتێ پێت دەڵێن ، کابرا وتی : مانای وایە ئەمەیان بەوەیان ؟ فەرمووی : بەڵێ .

پیاوە پیرەکە وتی : هەواڵم زانیوە کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی فلانە ڕۆژو فلانە ڕۆژ دەرچوون ، ئەگەر ئەم هەواڵە ڕاست بێت کە پێم گەیشتوە ئێستا ئەو لە فلانە شوێن و فلانە شوێندایە . ئەو شوێنەی وت کە سوپاکەی مەدینەی تێدا بوو . هەروەها هەواڵم پێگەیشتوە قوڕەیش ڕۆژی ئەوەندەو ئەوەندە لە مەککە دەرچوون ، ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێ کە بە من گەیشتوە ئەوا ئێستا لە فلانە شوێن و فلانە شوێندان . دەقاو دەق ئەو شوێنەی وت کە سوپاکەی مەککەی تێدا بوو .

کە کابرا لە قسەکانی بوەوە ئەنجا وتی : ئەی ئێوە کێن ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئێمە لە ئاوەوە هاتوین) ، پاشان کابرایان بەجێ هێشت ، کابرای پیرەیش لەبەر خۆیەوە دەیوت : ئاو ؟ تۆ بڵێی ئاوی عێراق بێت ؟

## به دەست خستنی گرنگترین زانیاریی

## لە بارەی سوپاکەی مەککەوە

لەئێوارەی ئەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ سەرلەنوێ هەواڵگرەکانی ناردەوە بۆ زانینی هەواڵەکانی دوژمن ، سیّکەسی کۆچکەران هەستان بەئەنجامدانی ئەوکارە ، (علی) کوڕی (أبی‌طالب) و، (الزبیر)ی کوڕی (عوام) و، (سعد)ی کوڕی (أبی وقاص) لەگەڵ چەند هاوەڵێکی تردا ، چوونە سەر ئاوەکەی بەدر ، دوو غولامیان بینی ئاویان دەبرد بۆ سوپاکەی مەککە ، هەردوکیان گرتن و ، هێنایانن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەو کاتە نوێژی دەکرد ، لێکۆڵینەوەیان لەگەڵداکردن بۆ قسە لێدەرهێنان ، دوو غولامەکە وتیان: ئێمە ئاوگێڕی قوڕەیشین ناردویانین بۆ ئاو هێنان ، ئەوانەی لێیان دەپرسینەوە ، باوەڕیان بەم قسانە نەکرد حەزیان دەکرد خزمەتکاری (أبو سفیان) بن ، بۆئەوەی دەست بەسەر کاروانەدا بگرن - بۆیە زۆر بەتوندی لێیاندا ، تا ناچاریان کردن کە بڵێن: ئێمە خزمەتکاری (أبو سفیان) ین، ئیتر بەرەڵلایان کردن.

کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بوەوە سەرزەنشتی کردن و فەرمووی: کە ڕاستیان وت لێتاندان کە درۆیان لەگەڵدا کردن بەرەڵلاتان کردن ، سوێند بەخودا ڕاستیان وت ، ئەوانە خزمەتکاری قوڕەیش بوون .

پاشان هەردوو غولامەکەی بانگ کردوو فەرمووی پێیان : هەواڵی قوڕەیشم پێ بڵێن ، وتیان : ئەوان لە پشتی ئەو گردەوەن کە لە (العدوه القصوی) وەدیارە ، فەرمووی : ژمارەیان چەندە ؟ وتیان : زۆرن ، فەرمووی : ژمارەیان چەندە ؟ وتیان نازانین، فەرمووی: ڕۆژی چەند وشتر سەردەبڕن؟ وتیان: ڕۆژێك (٩) دانەو ڕۆژێکیش (١٠) دانە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سوپای قوڕەیش لەنێوان نۆ سەد تا هەزار کەسن ، پاشان پێی فەرموون ، لە پیاو ماقوڵانی قوڕەیش کێیان لەگەڵدایە ؟ وتیان : (عتبه) و (شیبه) هەردوو کوڕەکەی (ربیعه) و، (أبو البختری) کوڕی (هشام) و(حکیم)ی کوڕی (حزام) و (نوفل) ی کوڕی (خویلد) و، (الحارث)ی کوڕی (عامر) و ، (طعیمة)ی کوڕی (عدی) و ، (النضر)ی کوڕی (الحارث)و (زمعه)ی کوڕی (الأسود) و، (أبو جهل)ی کوڕی (هشام) و، (أمیه)ی کوڕی (خلف) و، چەندین پیاوی تر کە ناویان بردن .

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە سوپاکەی خۆی و فەرمووی پێیان : (ئەوە مەککەیە جگەرگۆشەکانی خۆی فڕێداوەتە بەر دەستتان) .

## بــاران بــارين

لەو شەوەدا خودای گەورە بارانێکی باراند ، بوو بە ڕەهێڵەو تۆف بۆ موشریکان و نەیهێلا بێنە پێشەوە، بۆ موسوڵمانەکانیش بووە نەرمە بارانێك و پاکی کردنەوەو پیسی و چەپەڵی شەیتانی لێ دورخستنەوەو زەوی بۆ پتەو کردن لمەکەی بۆ سفت و ساف کردن و پێیانی پێ جێگیرکردن و ڕێگەی بۆ خۆشکردن و دڵەکانی پێ ڕاگیرکردن.

## سوپای ئیسلام پێشڕەوی دەکات بۆ گرنگترین خاڵە سەربازیەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی جولاند ، بۆ ئەوەی پێش موشریکان بگەنە ئاوی بەدرو نەهێڵن ئەوان دەستی بەسەردا بگرن ، لەگەڵ کاتی خەوتناندا چووە بەشی خوارەوەی ئاوەکانی بەدر ، لێرەدا (الحباب)ی کوڕی (المنذر) وەکو شارەزایەکی سەربازیی هەستاو وتی : پێغەمبەری خوا ، ئایا ئەم شوێنە کەهەڵت بژاردووە ، بە وەحی بۆت هاتۆتە خوارەوەو ، ئێمە بۆمان نیە کەقسەی تێدا بکەین ؟ یان ڕاو بۆچوون وفێڵیکی سەربازیەو بەس ؟ فەرمووی: ئەمە ڕاوبۆچوون و تەکنیکی سەربازیەو پلانی شەڕە ، ئەنجا وتی: کەواتە پێغەمبەری خوا ئەم شوێنە گونجاو نیە ، بفەرموو خەڵکەکە هەسێنە تا دەڕۆینە نزیکترین ئاو لە قوڕەیشەوە لەوێ دادەبەزین و هەموو چاوگەکانی تر پڕ دەکەینەوەو دەیڕوخێنین و ، لەسەر ئەوەی خۆشمان ئەستێڵێك دروست دەکەین و پڕی دەکەین لە ئاو ، ئەنجا شەڕ دەکەین لەگەڵیان ، ئێمە ئاو دەخۆینەوەو ئەوان ناتوانن بیخۆنەوەو شەکەت ئەبن ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاماژەت بۆ ڕایەکی باش کرد .

ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی هەستاند ، تاهاتنە نزیکترین چاڵاو لە دوژمنەوە ، لەنیوە شەودا لەوێ دابەزین ، پاشان ئەستێڵەکەیان دروست کردو ، هەموو چاوگەکانی تریان پڕ کردەوە .

## بنکەی سەرکردایەتی

پاش ئەوەی موسوڵمانەکان لەسەر ئاوەکە دابەزین ، (سعد)ی کوڕی (معاذ) پێشنیاری ئەوەیکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ، کە موسوڵمانەکان بنکەیەکی سەرکردایەتی بۆ دروست بکەن ، بۆ حاڵەتی ناکاوی و ئەگەریی ڕوودانی هەر تێکشکانێك بەر لە سەرکەوتن ، وتی بەپێغەمبەر ﷺ: (پێغەمبەری خوا، پێت چۆنە کوخێکت بۆ دروست بکەین و کەلوپەل و تفاقەکەت بۆ ئامادەبکەین، پاشان ڕووبەڕووی دوژمنەکەمان

دەبینەوە، ئەگەر خوا کردی و سەرکەوتین بەسەر دوژمنەکەماندا ، ئەوە بەدڵی خۆمانە ، خۆ ئەگەر سەریش نەکەوتین ئەوا کەلوپەلەکەت بپێچەرەوەو سواری وڵاخەکەت ببەو بگەڕێرەوە بۆلای ئەوانی ترمان کە بەجێمان هێشتن ، سوێندبێت بەخوا چەند کەسێکمان لەدوا بەجێماوە لەئێمە زیاتر تۆیان خۆش دەوێت و ئەگەر بیانزانیبایە تۆ تووشی شەڕدەبیت هەرگیز دوا نەدەکەوتن ، خوای گەورە بەهۆی ئەوانەوە دەتپارێزێت ، ئەوان گوێڕایەڵیت دەکەن و ، لەگەڵتدا خەبات دەکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری پێ خۆش بوو ، دۆعای خێری بۆکردن ئیدی موسوڵمانەکان کوخێکیان لەسەر گردێکی بەرز بۆ دروست کردو ، کەوتە باکووری ڕۆژهەلاتی مەیدانی شەڕەکەوەو بەسەر گۆڕەپانی شەڕەکەدا دەیڕوانی ، هەروەها چەند گەنجێکیان هەڵبژارد لە ئەنسارییەکان بەسەرپەرشتی (سعد)ی کوڕی (معاذ) بۆ چوار دەوری کوخەکەو پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ .

## سازدانی سوپاکەو بەسەر بردنی شەو

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی سازکردو[1] چووە شوێنی شەڕەکەو بە دەستی ئاماژەی دەکرد بۆ چەند جێیەك دەیفەرموو : خوا یار بێت سبەینێ ئەوە شوێنی کوژرانی فلأنە کەسە ، خوا یاربێت سبەینێ ئەوەش شوێنی کوژرانی فلأنە کەسە[2] ، پاشان لە بن ساقی درەختێکدا دەستی کرد بە نوێژ کردن ، موسوڵمانەکانیش ئەو شەوەیان بەشێوەیەکی هێمن و بێخەم بەسەر برد ، تەواو ئارام بوونەوە ، پشووی تەواویاندا ، ئاواتەخواز بوون سبەینێ مژدەکانی پەروەردگار بەچاوی خۆیان ببینن :

﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ {١١} ﴾ الأنفال ، واتە: کاتێك کە خەوەنوچکە دەیبردنەوەو شلی کردن و بەتەواوی پشوتانداو باران دەباری بەسەرتاندا ، بۆ ئەوەی پاکتان بکاتەوەو پیسی شەیتانتان لێ دور بخاتەوەو دڵەکانتان دامەزراو بکات و پێیەکانتان دامەزرێنێت .

ئەو شەوە شەوی هەینی بوو، بەرواری حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە (٨) یان (١٢) ی ئەو مانگەدا لەشاری مەدینە دەرچوو بوو.

---

[1] / بروانە (جامع الترمذی) لە (باب الجهاد) ، (باب ما جاء في الصف والتعبئة) ٢٠١/١.

[2] / (مسلم) ریوایەتی کردوە لە (انس) ، بروانە (مشكاة المصابيح ٥٤٣/٢ .

## سوپاکەی مەککە لە مەیدانی شەڕدا و
## کەوتنەوەی دووبەرەکی لەناویاندا

قورەیشیش ، شەویان لە (العدوه القصوی) کردەوە ، کە ڕۆژ بووەوە پۆلەکانیان کەوتنە ڕێ و لەڕێی (الكثيب)وە دابەزینە شیوەکەی (بدر) ، چەند کەسێکیان هاتن لە ئەستێڵکەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاو بخۆنەوە ، فەرمووی: وازیان لێ بهێنن ، هەرچییەکیان هاتە سەرئاوەکە کوژراو نەگەڕایەوە ، جگە لە (حکیم)ی کوڕی (حزام) کە نەکوژراو دوای ئەوە موسوڵمان بوو ، موسڵمانێکی باشی لێ دەرچوو ، ئەم پیاوە کە زۆری بۆ بهاتایەو سوێندی بخواردایە ، دەیوت : سوێندم بەو کەسەی کە ڕۆژی بەدر ڕزگاری کردم ، کە قورەیش هێور بووەوە (عمیر)ی کوڕی (وهب)ی (جمحی) بۆ ئەوەی ژمارەی سوپاکەی مەدینە بزانن ، لە دوورەوە (عمیر) بەدەوری سوپاکەدا هات و چوو ، پاشان گەڕایەوە بۆلایان و پێی وتن: موسوڵمانەکان سێ سەد کەسن ، کەمتر یان زۆرترن لەو ژمارەیە ، بەڵام کەمێك لەسەرم بوەستن تا بزانم لەشوێنێ دیکەوە بۆسەیان نیە یان کۆمەکیان بۆ نەهاتوە ؟ بەناو شیوەکەدا ڕۆشت هەتا دورکەوتەوە ، هیچی بەدی نەکرد ، گەڕایەوە بۆ لایان وتی: هیچم نەدی ، بەڵام خێڵی قورەیش بەڵاو کارەساتێکم دی مەرگیان هەڵگرتبوو ، (یثرب) مەرگی ناکاویان هەڵگرتوە، کۆمەڵێکم دی جگە لە شمشێرەکان هیچ پشت و پەناگەیەکیان نیە ، وە دەزانم هەتا هەریەکێکیان کەسێك لە ئێوە نەکوژێت ناکوژرێت ، خۆ ئەگەر ژمارەیەکتان لێ بکوژن ئیدی ژیان هیچ مانایەکی نیە ، ئێوەش پرس و ڕایەکی خۆتان بکەن .

لەوێدا چەند نەیارێکی تریش دژ بە (أبو جهل) ڕاستبوونەوە ـ کە بەرگرییەکی سەرسەختی لەسەرکردنی شەڕەکە دەکرد ـ ئەو نەیارانە داوایان دەکرد سوپاکە بگەڕێتەوە بۆ مەککە بەبێ شەڕکردن ، (حکیم)ی کوڕی (حزام) بەناو خەڵکیدا دەگەڕاو ، هاتە لای (عتبه)ی کوڕی (ربیعه) و پێی وت : (أبو الوليد) تۆ ڕیش سپی قورەیشیت ، گوێ لە قسەت دەگرن ، ئەگەر ڕێگایەکی خێرت نیشاندەم بەگوێم دەکەیت ؟ وتی : ئەو ڕایە چی‌یە (حکیم) ؟

(حکیم) وتی: ئەو خەڵکە بگەڕێنیتەوە بۆ مەککە ، خوێنی هاوپەیمانەکەشت (عمرو)ی کوڕی (الحضرمی) لەئەستۆ بگریت ـ کە لە سریەکەی (النخله) دا کوژرا ـ (عتبه) وتی: وامنیش ئەوەم کردو تۆ زامنی من بویت، کێشەکەم لە هاوپەیمانەکەمدایە کە دەبێت من خوێنەکەی بدەم و هەرچی زیانێکی ماددیشی لێکەوتووە بۆی ببژێرم.

پاشان (عتبه) بە(حكیم)ی وت: برۆلای (أبا الحنظلية) - ( أبا جهل) - (الحنظلية) مەبەستی دایکی بوو، بەڕاستی جگە لەئەو ترسی کەسم نیە مەسەلەکە تێك بدات.

پاشان (عتبە)ی کوڕی (ربیعه) هەستاو وتارێکیداو وتی : ئەرێ خێڵی قورەیش ، ئەگەر ئێوە بگەن بە موحەممەدو هاوەڵەکانیشی هیچی ئەوتۆتان دەست ناکەوێت ، سوێند بێت ئەگەر لێیان بکوژن ، بەدڵێك سەیرتان دەکات وەکو ئامۆزای یان خاڵۆزایەکی یان کەسێکی عەشرەتەکەیتان کوشتبێت ، داواتان لێدەکەم بگەڕێنەوە وازبهێنن لە موحەممەدو بزانن لەگەڵ عەرەبدا چی دەکات ، ئەگەر ئەوان لەناویان برد ئەو خواستی ئێوەیە ، ئەگەر واش نەبوو ئەوا پێتان دەگاتەوەو شتێکتان پێ ناکرێت لەگەڵیدا .

(حكیم)ی کوڕی (حزام) ڕایکرد بەرەو لای (أبو جهل) - و قەڵغانەکەی هەڵگرتبوو - وتی (أبو جهل) : (أبو الحكم) (عتبە) منی نارد بۆلای تۆ ئەمەو ئەوەت پێ بڵێم ، (أبو جهل) فووی تێکراو وتی: وەڵڵاهی ئەم پیاوە هەر لەگەڵ موحەممەدو هاوەڵەکانی بینی چاوبەستی لێکرا ، نەخێر شتی وانیە ، وەڵڵاهی ناگەڕێینەوە تا خوا بەلایەکماندا دەیخات ، (عتبە) هیچی نیە ، ئەوەندە نەبێت کە موحەممەدو ڕەش و ڕووتەکانی دەوروبەری بینیوەو . کوڕەکەی ئەویشیان لەگەڵدایە کە ناوی (حذیفة) یە ، کاتێك موسوڵمان بوەو کۆچی کردوە لەگەڵ موحەممەددا - لە لەناوچونی کوڕەکەی دەترسێت و بەوە دەتانترسێنێت .

کاتێك کە قسەکەی (أبو جهل)ی پێگەیشت کە وتبوی : جادوەکەی هەڵاوساوە ، (عتبە) وتی : دەبێت (أبو جهل) بزانێت کێ جادوەکەی هەڵاوساوە ، من یان ئەو ؟ (أبو جهل) دەست و بردی کرد نەبادا ئەم ناڕەزاییە گەورەتر ببێت ، لە دوای ئەم قسەوباسە ناردی بەشوێن (عامر)ی کوڕی (الحضرمی) دا . کە برای (عمرو)ی کوڕی (الحضرمی) بوو ، ئەو پیاوەی کە لە سریەکەی (عبدالله)ی کوڕی (جحش) دا کوژرابوو - پێی وت : - عوتبە - ئەوە هاوپەیمانەکەتە دەیەوێت خەڵکی بگێڕێتەوە ، خۆشت بەچاوی خۆت تۆڵەی خۆتت بینی ، هەستە مردوەکەت بلاوێنەوە ، بۆ مەرگی براکەت بگری ، (عامر) هەستا ، سەری پەتی کردو ، هاواری کرد : ئەی هاوار بۆ عەمر ، ئەی هاوار بۆ عەمر ، خەڵکەکەی گەرم کردو ، دڵنیابوون لەو شەڕەی ڕووی تێ کردوون ، هەموو بیرکردنەوەیەکی ئاسایی لێ تێکدان کە پێشتر (عتبە) بانگەشەی بۆ دەکردن و ، دەنگی ناڕەزایی کپ بوەوەو سوودی نەبوو .

## هەردوو سوپاكە لە یەكتر دەركەوتن

كاتێك كە موشریكەكان دەركەوتن و ، هەردوو كۆمەكەكە یەكتریان بینی ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (خوایە ، ئەوە قورەیشە بەفیزو شانازیەوە بەرەو ئێرە دێت ، بەرەنگاری تۆ دەبێتەوەو پێغەمبەرەكەت بەدرۆ دەخاتەوە ، خوایە چاوەڕوانی ئەو سەركەوتنەم كە بەڵێنت پێداوم ، خوایە ئەم سەرلەبەیانیە سەریان شۆڕكە) ، پێغەمبەر ﷺ لەدورەوە - (عتبە)ی كوڕی (ربیعە)ی بینی لەناو سوپاكە بەسەر وشترێكی سورباوەوە بوو ، فەرمووی : (ئەگەر لەناو ئەو خەڵكەدا خێر هەبێت لەو پیاوەدایە ، كە بەسەر ئەو وشترە سورباوەوەیە ، خۆ ئەگەر بەگوێی بكەن ڕزگاریان دەبێت).

پێغەمبەری خوا ﷺ ریزەكانی موسوڵمانەكانی ڕێككردو ، لەو كاتی ڕێككردنەدا شتێكی سەیر ڕوویدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ تیرێكی بەدەستەوە بوو بەكلكی تیرەكە ریزەكانی ڕێك دەكرد ، (سواد)ی كوڕی (غزیە) لە ریزەكە كەمێك هاتبوە پێشەوە ، پێغەمبەر ﷺ بەكلكی تیرەكە دای لە سكی و پێی فەرموو: (سواد) ڕێك بوەستە ، (سواد) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئازارت دام ، تۆڵەم دەوێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ كراسەكەی هەڵدایەوەو سكی پیرۆزی بۆ دەرخست و فەرمووی: فەرموو هەقی خۆت بكەرەوە . (سواد) باوەشی پێداكردو ، سكی پیرۆزی پێغەمبەری ماچ كرد ﷺ، فەرمووی: (سواد) چی وای لێ كردی ئەم كارە بكەیت ؟ وتی : پێغەمبەری خوا ، ئەوە دەبینیت كە هەردوو سوپاكە بەرامبەر یەك وەستاون ، ویستم دوا هەڵوێستم ئەوە بێت كە پێستم بەر پێستت بكەوێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ دۆعای خێری بۆ كرد .

كە ریزەكان ڕێك بوون فەرمانیدا بەسوپاكەی كە شەڕ دەست پێنەكەن ، تا دوا فەرمانی لێ وەرنەگرن ، پاشان فەرمانێكی تایبەتی سەبارەت بەشەڕ بۆ دەركردن، فەرمووی: ئەگەر زۆریان بۆ هێنان تیربارانیان بكەن، تیرەكانتان بهێڵنەوە[1] ، شیر هەڵمەكێشن تادێنە سەرتان[2] ، ئەنجا گەڕایەوە بۆ ناو كوخەكە، خۆی و ئەبوبەكر بوون، (سعد)ی كوڕی (معاذ) بەمەفرەزەكەیەوە لەسەر دەرگای كوخەكەدا وەستان بۆ پاراستن.

---

[1] / صحیح البخاري ٥٦٨/٢.

[2] / سنن أبي داود لە (سل السیوف عند اللقاء) ١٢/٢.

لەناو موشریکەکانیشدا (أبو جهل) لەو ڕۆژەدا نوقلانەی لێدەداو دەیوت: خوایە کامەیان سیلەی خزمایەتی دەپچڕێنی و ، شتێکی بۆ هێناوین کە نایزانین ، ئەم بەرەبەیانە لە ناوی بەریت ، خوایە کێمان لای تۆ خۆشەویسترەو زیاتر تۆ لێی ڕازیت ئەمڕۆ سەری بخە ، لەبارەی ئەم نوقلانە لێدانەی (أبو جهل)ە وە بوو ، ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَاءكُمُ الْفَتْحُ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْئًا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ {١٩}﴾ الأنفال، واتە موشریکان ـ ئەگەر ئێوە نوقلانەی سەرکەوتنی خۆتان لێبدەن ئەوا سەرکەوتن و ڕزگاربوون بەڕێوەیە ، ئەگەر وازبهێنن ئەوە باشترە بۆتان ، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە ئێمەش دێینەوە بۆتان ، ئەوسا ئەو کۆمەڵەشتان ناتوانێت هیچتان بۆ بکات با زۆریش بێت ، خوای گەورەش لەگەڵ ئیمانداراندایە.

## کاتی سفر و یەکەمین سووتەمەنی جەنگ :

یەکەم قوربانی جەنگەکە (اسود)ی کوڕی (عبدالاسد المخزومی) بوو. کابرایەکی دڕندەی بێ ڕەوشت بوو . لەناو سوپاکەدا هاتە دەرەوەو وتی: ئاهم کردووە یان دەبێت لەو ئەستێڵکە ئاو بخۆمەوە ، یان دەبێت تێکی بدەم ، یان دەبێت لەو پێناوەدا بمرم .(حەمزە) بۆی چووە دەرەوە کە بەیەکگەیشتن (حەمزە) شمشێرێکی لێدا لاقی لەڕانی کردەوە بەو حاڵەوە خەریکبوو دەگەیشتە ئەستێڵکەکە ، لەسەر گازی پشت کەوت و خوێنی لاقی ڕووەو هاوەڵەکانی فیچقەی کرد ، ئەنجا لەسەر دەست بەرەو ئەستێڵکە ڕۆشت دەیویست سوێندەکەی بەجێ بهێنێت بەڵام (حەمزە) کەوتە سەری شمشێرێکی لێداو خستیە ناو ئەو ستێڵکەکەوەو کوشتی.

## شەڕە شمشێر

ئەمە یەکەم کوشتن بوو کە ئاگری شەڕەکەی هەڵگیرساند ، دوای ئەو سێ کەس لەچاکترین سوارچاکانی قوڕەیش هاتنە دەرەوە ، هەرسێکیان لەیەك بنەماڵە بوون ، بریتی بوون لە (عتبە) و (شیبە)ی برای هەردووکیان کوڕی (ربیعە) بوون ، لەگەڵ (ولید)ی کوڕی (عتبە)دا ، کە لەریزەکە هاتنە دەرەوە داوای شەڕە شمشێریان کرد ، سێ گەنجی ئەنساری بۆیان چوونە دەرەوە، (عوف) و(معوذ) و هەردوو کورەکەی (الحارث) و (عفراء) ناوی دایکیان بوو ـ لەگەڵ (عبدالله)ی کوڕی

(رواحه) دا ، پێیان وتن : ئێوه کێن ؟ وتیان : چەند کەسێکی ئەنسارین وتیان : ئێوه هاوشانی ڕێزداری ئێمەن ، کارمان بەئێوه نیە ، ئامۆزاکانی خۆمانمان دەوێت ، پاشان یەکێکیان هاواری کرد : موحەممەد ، لەناو خزمانی خۆماندا هاوشانمان بۆ بنێرە دەرەوە ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (عبیدە)ی کوڕی (حارث) هەستە ، (حمزة) هەستە ، (علی) هەستە ، کاتێك هەستان و لێیان نزیك بوونەوە پێیان وتن : ئێوه کێن ؟ هەواڵیان پێدان . وتیان : بەڕاستی ئێوه هاوشانی ڕێزدارن ، ئەنجا (عبیدە) کە بەتەمەنترینی هەرسێکیان بوو کەوتە شەڕ لەگەڵ (عتبە)ی کوڕی (ربیعە) و (حمزە) ش لەگەڵ (شیبە) و (علی)یش لەگەڵ (ولید)دا [1] ، (حمزە) و(علی) زۆریان پێ‌نەچوو بەرامبەرەکانی خۆیان کوشت ، بەڵام (عبیدە) و بەرامبەرەکەی دوو شمشێریان دا لەیەکتر هەریەکەیان بەرامبەرەکەی خوێناوی کرد ، پاشان (علی) و (حمزە) هەڵیان کوتایە سەر (عتبە) و کوشتیان و (عبیدە) یان هەڵگرت ، قاچی برابوەوە ، زمانی شکاو بێ‌دەنگ بوو ، چوار تا پێنج ڕۆژ لە ڕووداوی بەدر لە (الصفراء) وەفاتی کرد ، لەکاتێکدا کە موسڵمانەکان لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بوون بەرەو (مدینە) .

(علی) سوێندی بەخودا دەخوارد کە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوانەوە هاتۆتە خوارەوە: ﴿ هذان خصمان اختصموا في ربهم ﴾ ئایەتەکە . واتە : ئەمانە دوو ڕکابەر بوون لەسەر خودای خۆیان ململانێی یەکتریان کرد .

## شاڵاوی گشتی

کۆتایی ئەم شەڕە شمشێرە سەرەتایەکی خراپ بوو بۆ موشریکان ، هەر لێرەوە باشترین شۆڕە سوارو سەرکردەی خۆیان لەدەستدا ، تەواو شێت و هار بوون ، بەیەك جارەکی شاڵاویان هێنایە سەر موسڵمانەکان ، موسوڵمانەکانیش پاش داوای یارمەتی لە پەروەردگاریان ، هانایان بۆ برد ، دڵیان بۆ یەکلایی کردەوەو ، لە هەڵوێستی بەرگریدا بوون ، بەدەم وتنی (احد) (احد)ە وە زیانی باشیان گەیاند بەبێ باوەڕان .

---

[1] ئەمە گوتەی (ابن اسحاق)ەو، لەگێڕانەوەیەکی (احمد) و (ابی داود)دا ،( عبیدە) لەگەڵ (ولید) دا شەڕی کردووە ، (علی)یش لەگەڵ (شیبە) و ( حمزە)ش لەگەڵ (عتبە)دا ، بڕوانە (مشکاة المصابیح) ٢/ ٢٤٣.

## پێغەمبەر ﷺ لەخوا دەپاڕێتەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەکاتی گەڕانەوەیەوە دوای ڕێککردنی ڕیزەکانی سوپاکەی لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە کە ئەو بەڵێنەی بۆ بهێنێتە دی وادەی پێداوەو دەیفەرموو : (خوایە ئەو داخوازیەم بۆ بهێنەجیّ، خوایە داوای وادەو بەڵێنەکەت لێدەکەم) . دۆعای کرد تاشەڕ گەرم بوو، بگرەو بەردەو سەداو شەیپوری شەڕ بەرز بووەوە ، بەیەکدا هاتن ، دەنگی شەڕ گەیشتە گومبەدی ئاسمان ، ئەنجا فەرمووی : ( خوایە ئەگەر ئەمڕۆ ئەم کۆمەڵە ئیماندارە لەناو بچن ئیدی تۆ ناپەرسترێیت ، خوایە ئەگەر ویستت لەسەر بێت لەمەودوا هەرگیز ناپەرسترێت ) . زۆر لەخوا پاڕایەوە تا بووردەکەی لەسەر شانی پیرۆزی کەوتە خوارەوە ، (ابوبکر) جارێکی دی خستیەوە سەرشانی و فەرمووی : ئیتر بەسە پێغەمبەری خوا ، بەڕاستی زۆر لە خودای خۆت پاڕایتەوە .

خوای گەورە نیگای نارد بۆ فریشتەکانی و فەرمووی : ﴿أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ الأنفال/١٢، واتە : من (خوداوەند) لەگەڵتانم ئێوەش ئیمانداران قایمکەن ، ترس و بیم دەخەمە دڵی بێ باوەڕانەوە ، هەروەها بە پێغەمبەری فەرموو : ﴿ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾ الأنفال/٩ ، من (پەروەردگار) بەهەزار فریشە پشتیوانیتان لێ دەکەم ، واتە فریشتەکان پۆل بەدوای پۆلدا دێن بۆ پشتیوانیتان .

## دابەزینی فریشتەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ وەنەوزێك بردیەوەو، پاشان سەری بەرزکردەوە ، فەرمووی: (ابوبکر) مژدە بێت ، ئەوە سەرکەوتنی خوایی بەرێوەیە ، ئەوە جبریلە جڵەوی ئەسپەکەی گرتووە ، سەرشانی تۆزی بەسەرەوەیە .

پاشان پێغمبەری خوا ﷺ لە کوخەکە هاتە دەرەوە بەچەك و قەڵغانەوە ، بە پەلە هەنگاوی ناو فەرمووی : ﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴾ القمر:٤٥، واتە: خوا یار بێت ئەو تاقمە دەبەزن و ڕادەکەن، پاشان مشتێ خۆڵی هەڵگرت و ڕووەو سوپاکەی قوڕەیش فڕێدا، موشریك نەما هەندێك لەو تەپوتۆزە نەچێت بەدەم و لوت وچاویدا ، لەو بارەوە ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾ الانفال /١٧، واتە : تۆ فڕێت نەدا ، ئەوە خودا بوو فڕێیدا.

## هێرشی دژەوانە

ئیدی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەسوپاکەی کە پەرچە هێرش دژەوانە بکەن ، فەرمووی : دەستیان لەسەر توندبکەن و ، هانیدان بۆ جەنگ و فەرمووی : سوێندم بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە هەر یەکێك لە ئێوە ، ئەمڕۆ شەڕ بکات و ڕوو بە ڕوویان بوەستێت ، ڕانەکات و بکوژرێت خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە ، لەکاتێکدا کەهانی دەدان بۆ شەڕکردن لەگەڵ کافران، فەرمووی : هەستن بڕۆن بەدەم بەهەشتێکەوە کە پانتاییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەمینە ، (لەوێدا) (عمر)ی کوڕی (حمام) وتی : بەخ بەخ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : چی وای لێکردی کە بڵێیت بەخ بەخ ؟ وتی : سوێند بێت بەخوا تەنها ئەوەپاڵی پێوەنام کەئومێدم وایە لەو کەسانەبم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : تۆ لەو کەسانەیت ، (عمیر) چەند دەنکە خورمایەکی لەمشتدا بوو، دەستی کردبوو بە خواردنیان ئەنجا دەیوت ئەگەر من بمێنم تا ئەم هەموو دەنکە خورمایە دەخۆم ئەوە ژیانێکی درێژخایانە هەمووی فڕێداو ، چووە ناو شەڕەکە شەڕی کرد هەتا کوژرا [1] .

بەهەمان شێوە (عوف)ی کوڕی ( الحارس) ـ ابن عفراء ـ پرسیاری لێکرد وتی : پێغەمبەری خوا ، چ شتێکی بەندە خوای گەورە دەخەنێنێت !

فەرمووی : خۆ فڕێدانە ناو دوژمن بەسەری ڕووتەوە ، ئەنجا زرێبەندەکەی داکەندو فڕێیدا ، شمشێری دەرهێنا دەستی کرد بەشەڕ هەتا کوژرا .

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەپەرچە هێرش ، شاڵەوەکانی دوژمن گەرم و گوڕیان نەمابوو ، خاوبووبوونەوە ، ئەم نەخشە ژیرانە ڕۆڵی زۆری هەبوو لە بەرز کردنەوەی هەڵوێستی موسڵمانەکاندا ، کاتێك کەفەرمانی توندکردنەوەو دەست لێداگرتنیان بۆ دەرچوو چالاکی و گوڕی شەڕکردینان هێشتا لە سەرەتادا بوو ، بۆیە هەستان بەشالاوێکی ڕامالەری ترسناك ، شمشێریان بەهەمولایەکدا ڕادەوەشاندو هەر سەر بوو دەپەڕی ، جموجوڵیان زیاترو توندتربوو کەبینیان پێغەمبەری خوا بە زرێبەندەکەیەوە قەڵەمبازی داو فەرمووی : ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ موسڵمانەکان شەڕێکی بەهێزیان کرد ، فریشتەکانیش پشتیوانیان کردن ، لەگێڕانەوەکەی (ابن سعد) داهاتووە لە(عکرمە)ەوە دەڵێت : لەو شەڕەدا

---

[1] مسلم ریوایەتی کردووە ٢/ ١٩٣ ، مشكاة المصابيح ٢/ ٣٣١ .

سەری خەڵك دەپەڕی کەس نەیدەزانی کێ لێی داوە ، دەستی مرۆڤ دەقرتاو نەدەزانرا کێ لێی‌داوە، (ابن عباس) یش فەرمویەتی: لەکاتێکدا کە موسڵمانێك بەشوێن موشریکێکدا ڕای دەکرد گوێی لە وەشاندنی دەنگی قامچی بوو بەسەر سەریەوە هاواری دەکرد : حەیزوم هات ، سەیرێکی کابرای موشوریکی کرد لە بەردەمیدا کەوتووە ، ئەنجا پیاوە ئەنساریەکە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ڕاست دەکەیت ، ئەوە کۆمەکی ئاسمانی سێیەم بوو هات [٢] . (ابوداود المازنی) دەڵێت : لەناو شەڕەکەدا شوێن کابرایەکی موشریك کەوتم تاشمشێرێکی لێبدەم ، کەچی پێش ئەوەی من شمشێرەی لێبدەم سەری کابرا پەڕی ، ئیدی زانیم کە شمشێرەکەی من نەیکوشت ، پیاوێکی ئەنساریش (عباس)ی بەدیلی دابویە بەری خۆی و هێنایە بەردەم پێغەمبەر ﷺ ، (عباس) وتی : وەڵڵاهی ئەم کابرایە منی ئەسیر نەکردووە ، بەڵکو پیاوێکی قژ کورتی جوان خاس بەسەر ئەسپێکی مارۆوە بوو ئەسیری کردم ، ئێستا ئەو کابرانیە لەناو سوپاکەدا نابینم ، کابرای ئەنساری وتی: پێغەمبەری خوا من خۆم دیلم کردووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : بێدەنگبە خوای گەورە بەفریشتیەکی ڕێزدار پشتیوانی کردویت .

## ئیبلیس لە گۆڕەپانی شەڕ پاشەکشە دەکات

کاتێك ئیبلیس بینی فریشتەکان چی بەموشریکەکان دەکەن بەرودوا تێی تەقاند تا ئەوکاتەش لەشێوەی (سراقە)ی کوڕی (مالك الجعشم المدلجی)دا لەگەڵ موشریکاندا مابوەوە ، (الحرس)ی کوڕی (هشام) وایدەزانی کە خودی (سراقە)یە بۆیە دەستەودامێنی بوو، نەیدەهێشت بڕوات ، ئەویش بۆکسێکی‌دا لەسەر سنگی (الحارس) خستی‌و ڕایکرد، موشریکەکانی پێیان وت : سوراقە بۆ کوێ ڕائەکەیت ، ئەی تۆ نەبووی کە دەتوت من پەنادەری ئێوەم و بەجێتان ناهێڵم ؟ وتی ئەوەی من ئەبینم ئێوە نابیینن ، من لەخودا دەترسم ، بەڕاستی خوا خاوەن سزای توندە ، پاشان ڕای کردو هەتا خۆی فڕێدایە ناو دەریاوە .

---

[٢] مسلم هاوشێوەی ئەمەی گێراوەتەوە ٢/ ٩٣ لەگەڵ هی تریش .

## شكستی کەمەرشکێن

ئیدی شپرزەیی و نیشانەکانی ژێرکەوتن لەناو موشریکاندا دەرکەوت و ، ریزەکانیان لەبەردەم ئەم شالأوە توندو تۆڵەکانی موسڵمانانەدا هەرەسی هێناو شەڕ لەکۆتایی نزیکبووەوەو موشریکان کەوتنە خۆ قوتارکردن و هەلأتنی بێ بەرنامەو موسڵمانەکانیش کەوتنە سەریان هەندێکیان لێکوشتن و هەندێکیشیان بەدیلی گرت تا بەتەواوی تێکیان شکاندن .

## مانەوەی ( ابو جهل )

ستەمکاری هەرە گەورە (ابوجهل) ، کە لە سەرەتادا نیشانەی شپرزەیی و بێ سەروبەری لەریزەکانیدا بینی هەوڵیدا لەسەرەتاوە ڕای بگرێت ، دەستی کرد بە هاندانی سوپاکەی ، بەدڕندەیەتی و لەخۆبایی بوونێکەوە پێی وتن : گوێ مەدەنە ڕاکردنی سوراقە ، ئەو لەگەڵ موحەممەددا وادەی هەبوو ، تەنانەت کوژرانی (عتبە) و (شیبە) و (ولید)یش نەتانترسێنێت ئەوانە پەلەیان کرد، سوێندبێت بە(لات) و (عزی) ناگەڕێینەوە تا هەموویان دەسبەست نەکەین ، نامەوێت بیانکوژن ، بەڵکو دەبێت بیانگرن ، تا پیشانیان بدەین چ کارێکی خراپیان کردووە .

بەلأم زۆری پێنەچوو ڕاستی ئەو لەخۆبایی بوونەی ئاشکرابوو، ئەوەندەی نەبرد ریزەکانیان لەبەردەم شالأوی بەجەرگانەی موسڵمانەکاندا تێکشکاو خۆی نەگرت ، بەڵێ چەند کەسێکی موشریکی بەدەورا مایەوە ، بە شمشێرو ڕمەکانیان پەرژینێکیان بۆ دروست کرد ، بەلأم گەردەلوولی شالأوەکە ئەوەشی تێکشکاند بەسەریەکداو لەبنەوە دەریانکێشان ، ئەنجا (ابوجهل) خۆی تەنها مایەوە ، موسڵمانەکان بینیان بەسەر ئەسپەکەیەوە دەهات ودەچوو، دوو غولامی ئەنساری چاوەڕوانی ڕژاندنی خوێنی بوون.

## کوژرانی ( ابو جهل )

(عبدالرحمن) ی کوڕی ( عوف) دەڵێت : لەناو ریزەکاندا شەڕم دەکرد ، بەلای ڕاست و چەپی خۆمدا لام کردەوە ، دوو کوڕی منداڵکارم بینی و ترسام لەوێدا شتێکیان لێبێت ، یەکێکیان بەدزی هاوەڵەکەیەوە پێی وتم : ئەرێ مامە ، ئەبو جەهل کامەیە ؟ وتم : کوڕم چی لێ ئەکەیت ؟ منداڵەکە وتی : بیستومە جنێوی داوە بە پێغەمبەر ﷺ ، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە تارماییەکەی

ببينم يان دەيكوژم يان دەبێت بمكوژێت ، بەڕاستی سەرم سوڕما لەو ئازايەتيە ، دەڵێت : ئەنجا ئەوی تريشيان ئيشارەتێكی لێكردم ، هەمان شتی هاوەڵەكەی پێ وتم : منيش (ابوجهل) م بينی بەناو خەڵكەكەدا دەهات و دەچوو ، پێم وتن : ئەوەتا دەبينن ؟ ئەوە (ابوجهل) ە ، دەڵێت : هەڵيان كوتايە سەری و دايانە بەر شمشێرو كوشتيان ، ئەنجا ڕۆشتنەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، پێی فەرموون: كامتان كوشتان ؟ هەريەكەيان وتی : من كوشتومە فەرمووی: شمشێرەكانتان سڕيوە؟ وتيان: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ سەيری هەردوو شمشێرەكەی كرد، فەرمووی : هەردووكتان كوشتوتانە. پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەداڕشتنی كەل و پەلەكەی (ابوجهل) بۆ (معاذ)ی كوڕی (عمرو)ی كوڕی (جموح) ، دوو كەسەكەش (معاذ)ی كوڕی (عمرو)ی كوڕی (الجموح) و (معوذ) كوڕی (عفراء) بوون [١].

(ابن اسحاق) دەڵێت : (معاذ)ی كوڕی (عمرو) كوڕی (جموح) وتی : گوێم لێ بوو دەيانوت : (ابوجهل) لە بن درەختێكی دڕكاويدايە ، شمشێر بەدەستەكانيان چواندبوو بەدڕكی دەوری درەختەكەو وەدەيانوت : (ابوالحكم) كەس نايگاتێ ، كە ئەوەم بيست ، بوو بە خەمم بۆيە بۆی چووم ، كە لێی نزيك بوومەوە شمشێرێكم دا لە قاچی پەڕاندم ، قاچی بەو شێوەيە لەبەرچاوم وەكو دەنكۆڵەيەك وابوو لەژێر لێدانێكدا دەرپەڕێت . دەڵێت : (عكرمە)ی كوڕی شمشێرێكیدا لە لاشانم قۆڵم پەڕی بەپێستی لاتەنيشتمەوە مايەوە ئەو برينە ماندووی كردم ، ئەو ڕۆژە بەو شێوەيە لەگەڵ شەڕكردندا بەدوای خۆمدا ڕام دەكێشا ، كە زۆر ئازاری دام خستمە ژێر پێم و ڕامكێشا تا لێبوەوە و فڕێمدا [٢] ، بەو حاڵەوە (معوذ)ی كوڕی (عفراء) بەلای (ابوجهل)دا تێپەڕی ، شمشێرێكی لێدا خستی ، بەنيوە گيانی بەجێی هێشت ، (معوذ) بەردەوام بوو لەشەڕ تا شەهيد كرا .

كە شەڕ تەواوبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی : كێ دەتوانێت هەواڵێكی (ابوجهل) بزانێت كە چی لێ بەسەر هاتووە ؟ خەڵك بلاوەيان لێكرد بەدوای (ابو جهل) دا ، ( عبدالله)ی كوڕی (مسعود) ڕەزای خوای لێ بێت ، چووە سەری لە دوا هەناسەيدا بوو ، پێی نا بەسەر گەردنيدا ڕيشی گرت ، بۆ ئەوەی سەری لە لاشەی

---

[١] صحيح البخاري ١/٤٤٤/ ، ٥٦٨/٢٢ مشكاة المصابيح ٢/٢٣٥ دياره كەپێغەمبەر داڕنينی كەلوپەلەكانی (ابو جهل)ی بەيەكێكيان سپاردوە ، چونكە ئەوی تر لە جەنگەكەدا شەهيد كراوە .

[٤] ئەو (معاذ) ناوە (ڕەزای خوای لێ بێت) تا سەردەمی خەليفە (عوسمان) ی كوڕی (عەففان) (ڕەزای خوای لێبێت) ژيا .

جیا بکاتەوە ، وتی: خوا سەری شۆڕ کردیت ئەی دوژمنی خوا ، وتی : بە چی سەری شۆڕکردم؟ من جگە لەپیاوێك کە قەومەکەی کوشتویانە چیدی هیچ لەکەیەکم لەسەر نی‌یە ، یان سەرباری ئەوەی پیاوێکتان کوشتوە ؟ هەروەها وتی : خۆزگە کردەیەك بیکوشتمایە پاشان وتی: پێم بڵێ کێ سەرکەوتووە ؟ وتی : خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ ، لەوکاتەدا کە (ابن مسعود) قاچی خستبووە سەر گەردنی وتی: بە(ابن مسعود) هەی شوانی مێگەل لە شوێنێکی بەرزدا راوەستاویت - (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) لە مەککەدا شوانی مێگەل بوو - پاش ئەم قسانە (ابن مسعود) سەری لەلاشەی جیاکردەوەو ، بردی بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : پێغەمبەری خوا ، ئەوە سەری دوژمنەکەی خوایە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سێجار فەرمووی: (هو الله الذي لا اله الا هو) ؟ پاشان فەرمووی : ( الله اكبر ، الحمد لله الذي صدق وعده ، ونصر عبده ، وهزم الاحزاب وحده ) ئادەی نیشانم بدەن ، دەڵێت : ڕۆشتین لاشەکەیمان پیشاندا فەرمووی : ئەمە فیرعەونی ئەم ئوممەتە بوو .

## چەند دیمەنێکی ئیمانیی لەم جەنگەدا

پێشتر باسی دوونمونەی جوانمان کرد لەلایەن (عمیر)ی کوڕی (الحمام) و (عوف)ی کوڕی (الحارث) - ابن الفراء - ، لەو جەنگەدا چەند دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش وەدەرکەوت ، کە تیایدا هێزی بیروباوەڕ خۆی دەنوێنێت ، لەو جەنگەدا باوکان بە ڕۆڵەکانیان گەیشتن ، برا بە برا دەگەیشت بیروباوەڕیان یەك نەبوو ، شمشێر یەکلایی کردنەوە ، ژێردەستەکان ڕووبەڕووی سەردەستەکانیان بوونەوەو ، داخی دڵی خۆیان پێ ڕشتن.

1. (ابن اسحاق) لە (ابن عباس)ە وە دەگێڕێتەوە ، کە پێغەمبەر ﷺ بەیارانی فەرموو : من دەزانم هەندێك لە پیاوەکانی (بنی هاشم) و هی تریش بەزۆرە ملێ لەگەڵ ئەوانەدا هێنراون ، هیچ کارێکیان نیە بە شەڕکردن لەگەڵ ئێمەدا ، هەر کەسێك لەخێڵی (بنی هاشم)ی بینی نەیکوژێت ، هەرکەسێك (ابو البختری) کوڕی (هشام)ی بینی نەیکوژێت ، هەرکەسێك (عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب)ی بینی با نەیکوژێت ، ئەو پیاوە بە زۆر هێنراوەتە دەرەوە . (ابو حذیفة)ی کوڕی(عتبة) وتی : ئایا ئێمە باوان و ڕۆڵەو براو خێڵەکەی خۆمان بکوژین و ، واز لە (عباس) بهێنین ؟ وەڵلاهی ئەگەر پێی بگەم

بەشمشێر لەتی دەکەم ، ئەم قسەیە گەیشتووە بەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە (عمر)ی کوڕی (خطاب) : (ابو حفص) ئەریٚ دەکرێت مامی پێغەمبەر بەشمشێر لە دەم و چاوی بدرێت؟ (عمر) فەرمووی : پێغەمبەری خوا ، رێگەم بدە بدەم لە گەردنی ، وەڵلاهی دووڕوو بوەتەوە .

(ابو حذيفة) هەمووجارێك دەیووت: زۆر لەو قسەیە دەترسام کە لەکاتی خۆیدا کردم ، پێم وایە مەگەر شەهیدی وەگەرنا هیچ شتێك نایسڕێتەوە ، ئەوەبوو لەشەڕی (يمامه)دا بەشەهیدی سەری نایەوە .

٢. قەدەغە کردنی کوشتنی (ابو البختری)یش لەبەر ئەوەبوو کە لەمەککەدا لە هەموو قوڕەیشیەکان زیاتر ئازاردانی پێغەمبەری پیٚ ناخۆش بوو، هیچ ئازاری نەدەداو، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی خراپی پیٚنەگەیشتوە لەلایەن (ابو البختری)یەوە ، ئەو پیاوە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە هەستان بۆ دڕاندنی پەیماننامەی پەیوەندی بڕین لەگەڵ (بنی هاشم) و (بنی عبد المطلب) دا.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە شەڕەکەدا (ابوالبختری) کوژرا ، هۆکەشی ئەوەبوو کە (مجذر)ی کوڕی (زياد)ی (بلوی) لەناو شەرەکەدا پێی گەیشتبوو ، هاورێیەکی لەگەڵدا بوو ، پێکەوە شەڕیان دەکرد ، (مجذر) پێی دەڵێت : ئەی (ابو البختری) پێغەمبەری خوا لێی قەدەغە کردوین تۆ بکوژین ، (ابوالبختری) وتی : ئەی هاڕێکەم ؟ (مجذر) وتی : نەخێر واز لەهاورێکەت ناهێنین ، ئیدی (ابوالبختری) وتی : وەڵلاهی دەبێت هەردووکمان پێکەوە بمرین ، پاشان دەستیان دایە شەڕ لەگەڵ یەکتردا ، (مجذر) ناچاربوو بیکوژێت .

٣. (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف) و (اميه)ی کوڕی (خلف) لەسەردەمی جاهیلیدا لە مەککە هاورێی یەك بوون ، لە ڕۆژی شەڕی بەدرا (عبدالرحمن) بەلایدا تێپەڕی لەگەڵ (علی) کوڕیدا وەستابوو، دەستی گرتبوو، (عبدالرحمن) یش چەند قەڵغانێکی دەستکەوتی پێبوو ، وتی بە(عبدالرحمن) : هیچت پێیە بۆ من ؟ خۆ من لەهەموو ئەو قەڵغانانەی دەستت باشترم ، بەڕاستی هەرگیز ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە ، ئایا پێویستتان بە شیر نیە ؟ مەبەستی ئەوەبوو کە هەر کەسێك دیلی کردووە بە وشترێکی شیردەری چاك فیدیەی دەداتیٚ - (عبدالرحمن) قەڵغانەکانی فرێداو پاشان وتی : ئومەییە پێی وتم : لەوکاتەدا من لەنێوان ئومەییەو کوڕەکەیدا وەستابووم : ئەو پیاوەتان کیٚ بوو کە

پەڕی سیمرغی دابوو لە بەرۆکی ؟ وتم : ئەوە (حزە)ی کوڕی (عبدالمطلب) بوو ، وتی : هەرچیمان بەسەردا هات ئەو پیاوە پێی کردین.

(عبدالرحمن) دەڵێت: هەردووکیانم دایەبەرخۆم لەدوورەوە بیلال هەردووکیانی بینی کە لەگەڵمدا بوون، ئومەییە لەمەککەدا بەبەردەوامی ئەشکەنجەی بیلالی دەدا ، بیلال هاواری کرد : هەی سەری کوفرو بێباوەڕی (ئومەییە)ی کوڕی (خلف) خوا بمکوژێت ئەگەر نەیکوژم ، وتم : کورە بیلال نەکەی ، ئەوە دیلی منە ، وتی : خوا بمکوژێت ئەگەر نەیکوژم ، وتم : ئەرێ کوڕی ژنە ڕەشەکە گوێت لێمە ؟ ئەو هەر وتی : خوا بمکوژێت ئەگەر نەیکوژم ، پاشان بەدەنگی بەرز هاواری کرد ، ئەی ئەنسارەکانی خودا ، ئەمە سەری کوفر (امیە)ی کوڕی(خلف) ە ، بمرم ئەگەر نیکوژم ، دەڵێت : چوار دەوریان گرتین و خستیانە نێوکەوانەوە . من بەرگریم لێدەکرد ، دەڵێت : پیاوێکیان لەناکاو شمشێرێکی‌دا لە قاچی کوڕەکەی خستی ، (امیە) هاوارێکی وای کرد شتی وام هەرگیز گوێ لێ نەبووبوو ، منیش وتم : خۆت قوتارکە ئێمە ناتوانین رزگارت بکەین ، ئەنجا ئەوان هەڵیان کوتایە سەریان دانیانە بەر شمشێر هەتا ساردیان کردنەوە ، هەموو جارێ (عبدالرحمن) دەیوت : خوا ڕەحم بە بیلال بکات ، بێ قەزابێت ، من قەڵغانەکانیشم لەکیس چوو ، لە دیلەکانیشمدا دڵی ئێشاندم .

لە(زاد المعاد) یشدا هاتووە ، کە(عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف) بە(امیە)ی وت : دانیشە ئەویش دانیشت (عبد الرحمن) خۆیدا بەسەریدا ، لەژێر (عبد الرحمن) یشەوە دایانە بەر شمشێر هەتا کوشتیان لەهەندێك شوێنەوە قاچ و قۆڵی (عبد الرحمن) یشیان بریندار کرد [1] .

٤. (عمر) کوڕی (خطاب) ﷺ لەو ڕۆژەدا خاڵی خۆی کوشت ، کە ناوی (العاص) کوڕی (هشام)ی کوڕی (المغیرە) بوو.

٥. (ابوبکر)ی (الصدیق) (ر) لەناو شەڕەکەدا هاواری کرد لە کوڕەکەی (عبد الرحمن) کە لەو کاتەدا لەگەڵ موشریکاندا بوو . وتی : پیسی خراپ چیت کرد لە ماڵ و سامانەکەم ؟ (عبدالرحمن) یش وتی :

لـــم یبق غـــیر شکـــة و یعبوب      وصـــارم یقتـــل ضلال الشیب

٦. کە موشریکان دەستیان هەڵگرت و تەسلیم بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوخەکەی‌دا بوو، (سعد)ی کوڕی (معاذ)یش بەشمشێرەکەی دەستی

---

[1] زاد المعاد ٢/ ٨٩ .

پاسەوانیی بەردەرگاکەی دەکرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕەنگ و ڕووی (سعد) دا ئەوەی دەخوێندەوە کە پێی ناخۆشە ئەوانەیان دیل کردووە، پێی فەرموو: ئەریّ (سعد) دەڵێی ئەو بارو دۆخەت پیّناخۆشە ؟ وتنی : بەڵێ پێغەمبەری خوا. ئەمە یەکەم کارەساتە کە بەسەر موشریکاندا هاتبێت ، کوشتنیانم بەلاوە چاکتر لە هێشتنەوەیان .

٧. شمشێرەکەی (عکاشە)ی کوڕی (محصن الاسدی) لەو ڕۆژەدا قرتا ، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش کۆتەرە دارێکی دایەو فەرمووی : (عکاشە) بەمە شەڕ بکە ، کە لەپێغەمبەری خوای وەرگرت ﷺ ڕای وەشاند ، بەدەستیەوە بوو بەشمشێرێکی درێژی، ڕەقی بڕندە ، شەڕی پیّکرد تا خودای گەورە فەتحی نارد بۆ موسڵمانەکان ، ئەو شمشێرە ناونرا بوو (العون) ، پاشانیش لەلای مایەوە شەڕی پێدەکرد ، تا لە جەنگەکانی هەڵگەڕاوەکاندا شەهید کرا.

٨. پاش تەواوبوونی شەڕەکە (مصعب)ی کوڕی (عمیر العبدری) بەلای براکەیدا تێپەری کە ناوی (ابو عزیز) بوو ، بەدەست یەکێك لە ئەنسارییەکانەوە دیل کرابوو، (مصعب) بە ئەنسارییەکەی وت: توند دەستی بگرە ، دایکی دەوڵەمەندە، بەڵکو لەباتی ئەودا خوێنباییت بداتیّ ، (ابو عزیز) وتی بە (مصعب) ئەمەیە وەسیّتی تۆ بۆ من ؟

(مصعب) وتی : ئەو کابرا ئەنسارییە برای منە نەك تۆ .

٩. کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە ئەسپەردەکردنی لاشەی موشریکان لە (قلیب)داو لاشەی (عتبە)ی کوڕی (ربیعە) یان ڕاکێشا بەرەو (قلیب) ، پێغەمبەر ﷺ سەیرێکی دەم و چاوی (ابو حذیفة)ی کوڕی کرد ، بینی زەرد هەڵگەڕابوو فەرمووی: (ابو حذیفة) ئەڵێی لەبارەی باوکتەوە شتێکت لەدڵدایە ؟ وتی: نەخێر پێغەمبەری خوا ، سوێند بەخوا هەرگیز بەدگومانیم بۆ دروست نەبووە لەکوژرانی باوکمدا ، بەلاّم سەیرم دەکرد ، کە باوکم خاوەن عەقڵ ئاغریی و ئازایی و ڕێزێکی تایبەتیە ، ئاواتم و خواست کە ئەوە ڕێنومایی بکردایە بۆ ئیسلام ، کاتێك کەبینیم کوژرا ، ئەوەم بیرکەوتەوە کە ئەو لەسەر کوفرو مردوە ئەوە زۆر نارەحەتی کردم ، پێغەمبەری خوا ﷺ گوتەیەکی جوانی پیّ فەرموو ، دۆعای فێری بۆ کرد .

# تەرمەکانی هەردوولا

شەڕەکە بەشکاندنێکی خراپی موشریکان و سەرکەوتنێکی گەورەی موسڵمانان کۆتایی هات لەموسڵمانەکان (١٤) چواردەکەس شەهیدبوون ، شەش کۆچەری و هەشت ئەنساریی.

موشریکانیش تووشی زیانێکی گەورە هاتن ، حەفتایان لێکوژراو حەفتاشیان لێ بەدیل گیرا ، زۆرینەشیان سەرکردەو فەرماندەو پاڵەوانەکانی قورەیش بوون .

کەجەنگەکە کۆتایی هات پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر کوژراوەکانەوە وەستاو پێی فەرموون: بەراستی ئێوە خراپترین کەسی پێغەمبەرەکەتان بوون ، بەدرۆتان خستمەوە لەکاتێکدا خەڵك هات بەدەممەوە، سەرتان شۆڕکردم لە کاتێکدا کە خەڵك پشتیوانیان لێکردم ، دەرتان کردم کەچی خەڵك جێگەی کردمەوە ، پاشان فەرمانیدا ـ رایان کێشان و خستنیانە یەکێك لە چاڵەکانی بەدرەوە .

لە (ابي طلحة)ە وە ، پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی بەدردا فەرمانیدا ، بیست و چوار فەرماندەی قورەیشیان فرێدایە ناو پەنا شیوێکی بەدرەوە ، نەریتی وابووە بەسەر هەر کۆمەڵێکدا سەربکەوتایە لە ساراکەدا سێشەو دەمایەوە ، لە ڕۆژی سێیەمدا کەلە بەدر بوون فەرمانیدا کاروانەکەی رێکخەن، پاشان رۆشت هاوەڵەکانی بەدواییدا رۆشتن، چووە سەرچاڵی گۆڕەکان و، دەستی کرد بە بانگ کردنیان هەریەکەیان بەناوی خۆیان و باوکیانەوە ، فلانی کوڕی فلان ، فلانی کوڕی فلان ، ئایا باشتر نەبوو ئەگەر بەگوێی خوداو پێغەمبەرەکەیتان بکردایە ؟ ئەوە ئێمە بەمە گەیشتین کە خودا بەڵێنی پێدابووین ، ئایا بەڕاستی ئێوەش بەوە گەیشتن کەخودا وادەی پێدابوون؟ (عمر) ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا چ جەستەیەکی بێ گیان قسەی کردووە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئێوە باشتر لەوان ئەو قسانەی من نابیستن ، لەگێڕانەوەیەکی تردا ، بەڕاستی ئێوە زیاتر لەوان نابیستن ، بەڵام ئەوەیە کەناتوانن وەڵام بدەنەوە[1] .

---

[1] متفق عليه ، مشكاة المصابيح ٢/٣٤٥.

## ( مەککە ) هەواڵی ژێرکەوتنەکەی پێدەگات

موشریکان لەمەیدانی بەدردا بەشێوەیەکی ناڕێك هەڵاتن و بەشیوو دۆڵەکاندا پەرش و بلاّوبوونەوەو بەترسەوە بەرەو مەککە ڕایاندەکردو لە شەرماندا نەیاندەزانی چۆن بڕۆنە مەککەوە .

(ابن اسحاق) دەڵێت : یەکەم کەسێك هەواڵی کارەساتەکەی گەیاندە مەککە (الحسیمان)ی کوڕی (عبدالله الخزامی) بوو ، وتیان: چ هەواڵێکت پێیە ؟ وتی: (عتبە)ی کوڕی (ربیعە) و (شیبە)ی کوڕی (ربیعە) و (ابوالحکم) کوڕی (هشام) و (امیە)ی کوڕی (خلف) کوژراون لەگەڵ چەند پیاوێکی تردا کە - ناوی بردن - کەدەستی کرد بەژماردنی سەرکردە کوژراوەکانی قورەیش ، (صفوان)ی کوڕی (امیە) کە لە (الحجر)دا دانیشتبوو ، وتی : وەڵلاهی عەقڵ نایگرێت ئادەی هەواڵی منی لێ بپرسن ، وتیان : ئەی (صفوان)ی کوڕی (امیە) چی لێهات ؟ وتی : ئەوەتا لە (حجر)دا دانیشتووە ، وەڵلاهی چاوم لێ بوو باوك و براکەی بەیەکەوە کوژران .

(ابو رافع) غولاّمەکەی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت : خزمەتکاری (عباس) بووم ، هاتبوە ناومانەوە بۆ ئەهل و بەیت ، (عباس) موسڵمان بوو ، (ام الفضل)و منیش موسڵمان بووین ، (عباس) ئیسلام بوونەکەی شاردبۆوە (ابولهب) نەچوو بوو بۆ شەڕی بەدر ، کە هەواڵەکەی بەدر هات دەمکوت بوو سەری شۆڕ کرد ، هەستمان بەخۆشی و سەربەرزی دەکرد ، من پیاوێکی لاوازبووم دەفرم دروست دەکرد ، لە ژوورەکەی زەمزەمدا هەڵم دەکۆڵی ، سوێندبێت لەوێدا دانیشتبووم خەریکی هەڵکۆڵینی دەفرەکانم بوو (ام الفضل) یش لەپاڵمدا دانیشتبوو ، ئەو هەواڵەی پێمان گەیشت زۆر دڵی خۆش کردبوین ، (ابو لهب) بەبێزاری و بێتاقەتیەکی زۆرو داخ لەدڵیەوە بەرەو لای ئێمە دەهات ، هات و لەپاڵ (حجر)دا دانیشت ، پشتی کردە من ، لەوحاڵەدا دانیشتبووم ، خەڵك وتیان: ئەوە (ابوسفیان)ی کوڕی (حارث) ی کوڕی (عبدالمطلب) هات ، (ابولهب) پێی وت : ئادەی وەرە بۆلام ، سوێند دەخۆم هەموو هەواڵەکەت لەلایە ، دەڵێت : لەلای دانیشت ، خەڵك لەدەوری کۆ بوونەوەوە ، وتی : برازا هەواڵم بدەرێ بزانم بارودۆخەکە چۆن بوو؟ (أبو سفیان) وتی : وەڵلاهی هەر ئەوەندەمان خۆش بوو چووینە شەڕەکەوە خێرا شانمان بۆ شل کردن ، بەئارەزووی خۆیان لێیان کوشتین و بەدیل گرتین ، وەڵلاهی سەرباری ئەوەش من لۆمەی کەس ناکەم ، هەندێك پیاومان پێگەیشت سەرتاپا سپی بەسواری ئەسپی ماڕۆوە لەنێوان ئاسمان و زەمیندا وەستابوون ، وەڵلاهی ئەوانە هیچیان نەهێشت ، هیچ کەسیش نەیدەتوانی بەرامبەریان بوەستێت .

(ابو رافع) دەڵێت : چمکێکی (حجر)م بەرز کردەوەو وتم : وەڵلاهی ئەوانە فریشتە بوون ، دەڵێت: (ابولهب) دەستی بەرزکردەوەو یەك زللەی توندی لێدام ، منیش ڕەتم دایەوە ، هاتە گیانم دامی بەزەویدا ئەنجا کەوتە لێدانم ، من پیاوێکی لاواز بووم ، (ام الفضل) هەستا کوڵەکەیەکی هەڵگرت و کێشای بەسەریدا ، خوێنی لێهێناو پێی وت: کە زانیت ئاغای لێرەنیە بێکەس کوژت کرد ، (ابو لهب) سەری شۆڕکردو لێیدا ڕۆیشت ، سوێند بەخوا تەنها حەوت شەوی تر ژیاو ، خوای گەورە گەڕو گولی کردو کوشتی ، (ئەوەش دەردێکە عەرەب نوقلانەی شەڕی پێ لێدەدەن ، بۆیە کوڕەکانیشی وازیان لێهێنا ، تاماوەی سێ ڕۆژ کەس نزیکی تەرمەکەی نەدەکەوتەوەو کەسیش هەوڵی نەدەدا بینێژێت کەکوڕەکانی لەقسەو باسی خەڵك ترسان ، ئیتر هەستان چاڵێکیان بۆ هەڵکەند بەدار پاڵیان پێوەنا بۆناو چاڵەکەو لەدورەوە خۆڵیان بۆ فڕێدا تابەتەواوی دایانپۆشی).

بەم شێوەیە ، خەڵکی ، هەواڵی شکستەکەی مەیدانی بەدریان پێگەیشت ، ئەم هەواڵە کاریگەریەکی زۆرخراپی کردە سەریان ، گەشتە رادەیەك شین و واوەیلایان قەدەغە کرد بۆ مردوەکانیان ، نەبادا موسڵمانەکان ئۆخەی بکەن .

یەکێك لەو نوکتە خۆشانە کە ڕوویدا ئەوەبوو ، (اسود)ی کوڕی (عبدالمطلب) سێ کوڕی لە شەڕی بەدرا بەرکەوتبوون و کوژرا بوون ، زۆر حەزی دەکرد بۆیان بگری ، چاوی کوێر بوو ، شەوێك گوێی لەلاوانەوەیەك بوو ، غولامەکەی نارد؟ وتی بەڵکو ئەمە خوایە ڕێگەی لاواندنەوەیان دابێت ، ئەرێ تۆ بڵێی ئەمە قوڕەیش بن و بۆ کوژراوەکانیان بگرین؟ بەڵکو ساخوا ڕێگەم بدەن بگریم بۆ (أبي حكمية)ی کوڕم . خەریکە جەرگم دەسوتێت ، غولامەکەکە گەڕایەوەو وتی : ئەو لاوانەوەیە شینی ژنێکە بۆ وشترە ونبوەکەی دەگری، ئیتر (اسود) خۆی پێنەگیراو ئەم شیعرەی وت:

| | |
|---|---|
| اتبكـي أن تضـل لهـا بعير | ويمنعهـا من النوم السهود |
| فـلا تبكي على بكر ولكن | على بدر تقـاصرت الجدود |
| علـى بدر سراة بني هصيص | ومخـزوم ورهط أبي الوليد |
| وبكي ان بكيت علـى عقيل | وبكي حارثـاً أسد الاسود |
| وبكـيهم ، ولا تسمي جميعاً | ومـالأبي حيكمة من نديد |
| ألا قد سـاد بعدهم رجـال | ولولا يوم بدر لـم يسودوا |

## (مەدینە) هەواڵی سەرکەوتنەکەی پێدەگات

که خودای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بەموسڵمانان ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مژدەدەری نارد بۆ خەڵکی مەدینە، بۆئەوەی بەخێرایی مژدەکە یان پێ بگەیەنێت ، (عبدالله)ی کوڕی (رواحە)ی نارد بۆ خەڵکی سەرەوەو (زید)ی کوڕی (حارثة) یشی نارد بۆ خەڵکی خوارەوە .

جولەکەو دووڕووەکان کەوتبوونە جموجووڵ لەناومەدینەدا بە بڵاو کردنەوەی پروپاگەندەی درۆ ، زیاد لەوەش هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەریان بڵاوکردەوە ﷺ کاتێك کە یەکێك لە دووڕوان (زید)ی کوڕی (حارثة)ی بینی بە سواری ((القصوراء) وشترەکەی پێغەمبەرەوە بوو ، وتی : ئەریْ وەڵلاّ موحەممەد کوژراوە ، ئەوەش (قصوراء)ەو دەیناسینەوە ، ئەوەش (زید) ە لە ترساندا نازانێت چی بڵێت و سەری شۆڕ کردەوەو شکاوە .

کە هەردوو پیاوە کە گەیشتنە مەدینە موسڵمانان دەورەیان دان ، گوێیان گرت بۆ بیستنی هەواڵەکە ، تا بەتەواوی دڵنیابوون لە سەرکەوتنی موسوڵمانان ، ئیتر خۆشی هەموولایەکی گرتەوە ، هەمووولایەکی مەدینە پڕ بوو لە دەنگی (لاالەالاالله و اللەاکبر) سەرانی ئیماندران - ئەوانەی لەمەدینەدا بوون - هاتنە دەرەوە بۆ سەر ڕێگاکانی شار بە مەبەستی پێشوازی کردن و پیرۆزبایی کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەوە .

(اسامە)ی کوڕی (زید) دەڵێت: لەکاتێکدا کە تازە (رقیە)ی کچی پێغەمبەری خوامان ﷺ ئەسپەردە دەکرد کە خێزانی (عفان)ی کوڕی (عفان) بوو ، هەواڵی سەرکەوتنەکەمان پێگەیشت ، ئەوکاتە پێغەمبەری خوا ﷺ من و (عثمان)ی هاوسەری بەدیاریەوە دانابوو .

## سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەدینە بەرێ دەکەویت

پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە لە بەدر مایەوە ، پێش بەرێکەوتنی لەشوێنی مەیدانی شەڕەکە ڕاجیاوازی لەنێوان سوپاکەدا لەسەر مەسەلەی دەستکەوتی شەڕ دروست بوو ، کە جیاوازیەکە توندتر بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا هەرچی کۆکراوەتەوە بیگێڕنەوە ، هەموو دەستکەوتەکانیان هێنایەوە . پاشان وەحی هاتە خوارەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە :

لە (عبادە)ی کوڕی (صامت)ە وە دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووم ، شەڕی بەدرم لەگەڵدا بینی ، خوای گەورە کافرانی ژێرخست ، هەندێك لە موسڵمانەکان ڕاودویان کەوتن هەندێکیان لێ کوشتن و هەندێکیان بەدیلی لێگرتن ، کۆمەڵێکی تریش چوون بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت و تالآنی ، هەندێکی تریش چواردەوری پێغەمبەریان دابوو ﷺ نەبادا دوژمن پەلاماری بدەن لەناکاودا ، هەتا شەو داهات ، ئەوانەی کە تالآنی شەڕەکەیان کۆ کردبووەوە ، لەبەینی خۆیاندا دەیانوت : خۆمان کۆمان کردۆتەوەو ، بەش کەسی پێوە نیە ، ئەوانەش کە بەدوای دوژمندا ڕایان کردبوو هەڵیاندایەو وتیان : ئێوە لەئێمە شیاوترنین ، ئێمە بووین دوژمنمان دوورخستەوەو ڕاومانان ، ئەوانەش کە چواردەوری پێغەمبەریان گرتبوو ﷺ وتیان : ئێمەش لەوە دەترساین کە لەناکاودا بێنە سەر پێغەمبەر ﷺ بۆیە بەوەوە سەرقاڵ بووین، خوای گەورە ئایەتی ناردەخوارەوە: ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ الانفال:١، واتە: پرسیارت لێدەکەن ئەی موحەممەد لەبارەی ئەنفالەوە ، تۆش بڵێ : ئەنفال بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیەتی لەخودای گەورە بترسن و نێوەندی خۆتان چاك بکەن و، بەگوێی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ، ئەگەر بەڕاستی ئیماندارن ، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوان موسڵماناندا دابەشی کرد [1].

پاش سێ ڕۆژەکەی بەدر پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی جوڵآند بەرەو مەدینەو ، دیلە موشریکەکانیشی پێ بوو ، هەروەها ئەو برە ئەنفالەشی پێ بوو کە لەکافرانی شەڕی بەدردا دەستی کەوتبوو ، (عبداللە)ی کوڕی (کعب)ی کردبووە بەرپرس بەسەریەوە ، کە لەتەنگاوی (الصفراء) دەرچوون ، لەسەر گردۆڵکەیەکی نێوان تەنگاوەکەو (نازیە) پاش ئەوەی کە پێنجیەکی لێدەرکرد ئەنجا دەستکەوتەکەی

---

[1] (احمد) دەریهێناوە ٥/ ٣٢٣ ، ٣٢٤ ، هەروەها (حاکم) ٢/٣٢٦ .

بەیەکسانی دابەش کرد ، کە گەیشتنە ناوچەی (الصفراء) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بەکوشتنی (نظر)ی کوڕی (حارث) ، ئەم کابرایە هەڵگری ئاڵای موشریکان بوو لە شەڕی بەدرا ، یەکێك بوو لە تاوانبارە هەرە گەورەکانی قوڕەیش و خراپترین هەڵوێستی هەبوو بەرامبەر بەئیسلام و زۆر ئازاری پێغەمبەری خوای دەدا ﷺ ، (علی) کوڕی (ابو طالب) دای لەگەردنی .

کە گەیشتنە ناوچەی (عرق الظبية)ش فەرمانیدا بەکوشتنی (عقبە)ی کوڕی (ابي معیط) ، پێشتریش باسمان کرد کە چۆن ئازاری پێغەمبەری دەدا ﷺ ، هەر ئەم بوو لەکاتی نوێژدا سەروپێی ئاژەڵی کرد بەسەر سەری پیرۆزی پێغەمبەردا ﷺ ، ئەوەبوو عەباکەی لە ملی پێغەمبەری ئاڵاندو ویستی بیتاسێنێت و ، خەریك بوو بیکوژێت ئەگەر ئەبوبەکر نەبوایە ﷺ ، کە فەرمانیدا بەکوشتنی وتی : کوڕەکانم کێیان هەیە ئەی موحەممەد ؟ فەرمووی : دۆزەخ [1] ، (عاصم)ی کوڕی (ثابت الانصاري) کوشتی ، گوتراویشە (علی) کوڕی (ابو طالب) .

کوشتنی ئەو دوو ستەمکارە لە ڕووی سەربازییەوە پێویست بوو ، ئەوانە تەنها دیلی جەنگ نەبوون ، بەڵکو بە زاراوەی نوێ تاوانباری جەنگ بوون .

## شاندەکانی پیرۆزبایی

کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە (روحاء) سەرانی موسڵمانەکانی پێگەیشت ، ئەوانەی کە پێشتر لەگەڵ بیستنی مژدەی سەرکەوتنەکەدا بەهۆی دوونێرراوەکە هاتبوونە دەرەوەی شار - هاتنە خزمەتی بۆ پیرۆزبایی کردن ، لەوێدا (سلمە)ی کوڕی (سلامە) پێی وتن: لەسەرچی پیرۆزبایمان لێدەکەن ؟ وەڵڵاهی ئەوانەی شەڕمان لەگەڵداکردن چەند پیرە پیاوێکی سەرساف بوون وەك وشتر ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بەپێکەنین ، پاشان فەرمووی: برازا ، خۆ ئەوانە ئەنجوومەنی قوڕەیش بوون.

(اسید)ی کوڕی (حضیر) یش وتی: پێغەمبەری خوا ، سوپاس بۆ ئەو خودایەی سەری خستیت ، دڵی ئارام کردیت ، وەڵڵاهی پێغەمبەری خوا ، هەرگیز دواکەوتنم لە بەدردا لەبەرئەوە نەبوو کە پێم وابووبێت شەڕ دەکەیت لەگەڵ دوژمندا ، بڕوام وابوو کە مەسەلە کاروانەکەیە بۆیە نەهاتم ، ئەگەر بمزانیبایە بەدوژمن دەگەیت هەرگیز دوا نەدەکەوتم ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ڕاست دەکەیت .

---

[1] خاوەنی سەرچاوە (صحیح)ەکان ئەمەیان ریوایەت کردووە ، بڕوانە (سنن ابی داود) لەگەڵ پەراوێزەکەی

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرکەوتوویی و سەری بەرزەوە چووە ناو مەدینەوە، هەرچی دوژمنی ناوەوەو دەرەوە هەبوو زەندەقیان لێی چوو بوو ، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی مەدینە موسڵمان بوون ، لەوکاتەوە (عبدالله)ی کوڕی (ابی) و تاقمەکەی بە ڕواڵەت و ئاشکرایی هاتنە ناو ئیسلامەوە .

دیلەکان دوای خۆی بەڕۆژێك گەیشتنەوە مەدینە، دابەشی کردن بەسەر هاوەڵانیداو وەسیەتی خێری بۆ کردن ، هاوەڵان خۆیان خورمایان دەخواردو ، لەبەر وەسیەتەکەی پێغەمبەر نانیان دەدا بەدیلەکان .

## مەسەلەی دیلەکان

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە مەدینە ، لەبارەی دیلەکانەوە ڕاوێژی بە (ابوبکر)ی هاوەڵی کرد ﷺ، فەرمووی : پێغەمبەری خوا ، ئەوانە ئامۆزاو براو خزمانی عەشرەتن ، من پێم باشە فیدیەیان لێ وەربگریت ، بەو پارەیەی وەری دەگرین هێزمان دەبێت بەسەر کافراندا ، سا بەڵکو خوا هیدایەتیان بداو ببنە پشتیوانێك بۆ ئێمە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە (عمر)ی کوڕی(خطاب) تۆچی دەڵێیت ؟ (عمر) وتی : وەڵڵاهی من لەگەڵ ڕایەکەی (ابوبکر) دانیم ، پێم وایە کە تۆ بوار بدەیت من فلانە کەسی خزمم بکوژم ، (علی)ش (عقیل)ی کوڕی (ابوطالب) بکوژێت و (حمزة)ش فلانە کەسی برای بکوژێت ، تاپیشانی بدەین لای خوای خۆمان کە هیچ دڵ نەرمیەکمان تێدا نییە بەرامبەر بەموشریکان ، ئەمانەش سەران و پێشڕەو سەرکردەکانی کوفرن.

(عمر) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ مەیلی بەلای ڕایەکەی (ابوبکر)دا بوو ، قسەکەی منی بەدڵ نەبوو ، خوێنبایی لێ وەرگرتن ، بۆ ڕۆژی سەرلەبەیانی چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بینیم لەگەڵ ئەبوبەکردا دەگریان ـ وتم : پێغەمبەری خوا تۆو هاوەڵەکەت بۆچی دەگرین ؟ ئەگەر گریانم بۆ هات منیش دەگریم ، وەگەرنا خۆم دەگریەنم بۆ گریانی ئێوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سەبارەت بە مەسەلەی دیلەکان کە هاوەڵەکانت ڕای خۆیان وت : بە وەرگرتنی خوێنبایی ، کەچی سزاکەیانم پێ نیشاندرا لە ئەو درەختە لێمانەوە نزیکتربوو . ئاماژەی بۆ درەختێکی نزیك کرد[1].

---

[1] تاریخ عمر بن الخطاب ، نوسینی (ابن الجوزی) ل ٣٦

خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە : ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ، لَوْلَا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ الانفال : ٦٧ ــ ٦٨ واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە کە دیل گل بداتەوە تاکاتێك پایەدارو جێگر دەبێت لە زەویدا ، مەگەر کەل و پەل و شمەکی دونیاتان دەوێت ؟ خۆ خوای گەورە ئەو جیهانی دەوێت بۆتان و سەرفرازی قیامەتی ئێوەی مەبەستە ، خوا بالأدەست و دانایە ، خۆ ئەگەر بڕیارادەی خودا نەبوایە لەسەر ئەو شتانەی کە وەرتانگرت لەبەرامبەر ئازادکردنی دیلەکانەوە ئەوە تووشی سزایەکی سەخت دەبوون.

ئەو (کتاب)ە ش کە لە ئایەتەدا دەڵێت : پێشتر هاتووە مەبەست پێی ئایەتی : ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾ محمد : ٤ ، واتە : یان منەتیان بەسەردا بکەن بەریان بدەن ، یان فیدیەیان لێ بسێنن ، ئایەتەکە باسی مۆڵەتی وەرگرتنی فیدیەی تێدایە وەگەرنا سزا دەدران ، سەرزەنشتەکە بۆ ئەوە دابەزی ، چونکە ئەوان پێش جێگیر بوون و پایەداربوون دیلیان گلدایەوەو ، پاشان فیدیەیان وەرگرت لەو تاوانبارانەی کە دیلی شەڕ نەبوون ، بەڵکو تاوانباری جەنگ بوون ، ئەوانە یاسای نوێش وازیان لێناهێنێت و دادگاییان دەکات ، زۆرجاریش حوکمی دادگا لەبارەیانەوە کوشتن یان بەندیی کردن دەبێت هەتا مردن .

ئەوەبوو بڕیارەکە بەپێی بۆچوونەکەی (ابوبکر) (ڕ) جێگیربوو ، قسەیان لە دیلەکان وەرگرت ، هەر فیدیەیەکیش چوارهەزار درهەم بوو تا سێ هەزاردرهەم و تا هەزاردرهەم، خەڵکی مەککە خوێندەواریان هەبوو خەڵکی مەدینە خوێندەواریان نەبوو ، هەرکەسێکیان نەیتوانیایە فیدیە بدات، دە منالیان دەدایە دەست فێری خوێندەواریان بکەن ، کە فێری بکردنایە بەڕەڵای دەکردن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ بەرامبەر هەندێکی تر لەدیلەکانی ئازادکرد ، لەوانە (المطلب)ی کوڕی (حنطب) و(صیفی) کوڕی (ابی رفاعە) و (ابوعزە الجمحی) ئەمەی بە ئەسیری گرتەوە لە ئوحودداو کوشتی و باسەکەی لەدواییدا دێت .

(ختنە ابی العاص) یشی بەڕەڵا کرد بەمەرجێك دەستبەرداری (زینب) ببێت، پێشتریش (زینب) پارەومالی ناردبوو بۆ بەردانی (ابی العاص) ملوانکەیەکی تێدانابوو کەلای خەدیجە بوو ، بەو ملوانکەیەوە شووی کردبوو (ابی العاص) کاتێك پێغەمبەر ﷺ ملوانکەکەی بینی دلی نەرم بوو ، داوای کرد لەهاوەلانی کە (ابی العاص) بەربدەن بەمەرجێك ڕێگە بدات کە (زینب) کۆچ بکات بۆ مەدینەو

دەستبەرداری ببێت ، (ابو العاص) ڕازی بوو ، پێغەمبەریش بەریدا و (زید)ی کوڕی (حارثة) و پیاوێکی تری ئەنساری نارد بەشوێن زەینەبی کچیداو پێی فەرموون : لە (بطن یأجج) بمێننەوە تا زەینەب بەوێدا دەگوزەرێت لەگەڵ خۆتاندا بیهێننەوە. هەردووکیان دەرچوون و لەسەرەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنایانەوە ، بەسەرهاتی کۆچەکەی زەینەب زۆرو دورو درێژو خەمناکە .

(سهیل)ی کوڕی (عمرو) لەناوو دیلەکاندا بوو ، وتاربێژێکی کارامەبوو ، (عمر) فەرمووی : پێغەمبەری خوا هەردوو دانی پێشەوەی (سهیل)ی کوڕی (عمرو) دەربهێنە بازمانی تێی بگیرێت و ، بۆ ئەوەی لەمەودوا لەهیچ شوێنێکدا نەبێتە هۆی شێواندنی دەم و چاوی مرۆڤ و ، خەشم و قینی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا.

(سعد)ی کوڕی (النعمان) چوو بۆ (عومرە) لەوێ (ابو سفیان) گرتی و بەندی کرد ، (عمرو) کوڕی (ابوسفیان) لەناو دیلەکاندا بوو، ناردیانەوە بۆ (ابو سفیان) ئەویش لە بەرامبەریدا (سعد)ی بەرەڵڵا کرد .

## قورئان لەبارەی شەڕەکەوە دەدوێت

لەبارەی ئەو جەنگەوە سورەتی (الانفال) هاتە خوارەوە ، ئەم سورەتە قسە لێکردنێکی خودایی‌یە - ئەگەر ڕاست بێت بڵێین - لەبارەی ئەو جەنگەوە ، ئەم شێوە لێدوانە زۆر جیایە لەو گوتانەی کە مەلیك و سەرکردەکان دوای سەرکەوتن لێی دەدوێن .

خوای گەورە باری سەرنجی موسڵمانەکان - یەکجار - ڕادەکێشێت بۆ ئەو کەم و کورتی و لاوازیە ڕەوشتیانەی کەهێشتا تیاندا مابوەوەو ، هەندێکیان لێوەشایەوە ، بۆئەوەی هەوڵبدەن خۆیان کامڵتر بکەن و دەروونیان پاکژ بکەنەوەو لەو کەم و کورتیانە.

پاشان باسی پشتیوانی خوداوەندو سەرخستنی خۆیی بۆ موسڵمانەکان کردو تا لەخۆیان بایی نەبن و بەئازایەتی و قارەمانێتی خۆیان بوغرا نەبن و تووشی فیزو دەمار زلی نەبن و ، پشت بەخودای گەورە ببەستن و ، ملکەچ بن بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەر ﷺ .

پاشان ئەو ئامانج و مەبەستە گەورەانەی ڕوون کردەوە کە لەپێناویدا پێغەمبەر ﷺ ئەم غەزا خوێناویە ترسناکەی ئەنجامداو ، ڕێنومایی کردن بۆ ناسینی ئەو خەسڵەت و ڕەوشتانەی بوونە هۆی سەرکەوتن لە شەڕەکاندا.

پاشان گوتاری ئاراستەی موشریکان و دووڕووان و جولەکەو دیلەکانی شەڕەکە کردو ، ئامۆژگاریەکی باشی کردن ، بەشێوەیەك کە ڕێنوماییان بکات بۆ ملکەچ بوون بۆ ڕاستی و وابەستە بوون پێیەوەوە .

پاشان لەبارەی دەستکەوتی شەڕەوە گوتاری ئاراستە کردن و ، پرەنسیپ و بنەما سەرەکیەکانی ئەم مەسەلەیەشی بۆ کردن بەیاسا .

پاشان هەموو ئەو یاسایانەی بۆ ڕوون کردنەوە کە تایبەتن بەجەنگ و ئاشتیو، لەو قۆناغەدا زۆر پێویست بوو کە بانگەوازی ئیسلامی پێدا دەگوزەرا ، تاجەنگی موسڵمانەکان جیاوازیەکی هەبێت لەگەڵ ئەو جەنگانەدا کەخەڵکی جاهیلیەت ئەنجامیان دەداو ، بالادەستی و گەورەیێتی ئەوان دەرکەوێت لە ڕەوشت و بەهاو نموونە جوانەکانداو ، بۆ دونیاش بسەلمێنێت کە ئیسلام تەنها بۆچوونێکی تیۆریی نیە و بەس ، بەڵکو بە شێوەیەکی کرداریی شوێنکەوتوانی ڕادەهێنێت لەسەر ئەو بنەماو پرەنسیپانەی بانگەشی بۆ دەکات .

پاشان لەسەر چەند بەندێکی یاساکانی دەوڵەتی ئیسلامی پەسەندکرد کە لەڕووی مافەوە جیاوازی دەکات لەنێوان دانیشتوانی نێو سنوورەکانی و نیشتەجێیانی دەرەوەی سنوری دەوڵەتی ئیسلامیدا.

لەساڵی دووەمی کۆچیشدا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و سەرفیترە فەرز کران و ، پشکی جۆرەکانی تری زەکاتیش دیاریکران و ، بەو پێیە فەریزەی زەکات و پشکەکانی باسیان لێوەکراو بوونەهۆی بار سووککردنی بژێوی ئەو کۆچکەرە پەنابەرانەی کە نەیاندەتوانی هیچ جۆرە کاسبیەك بکەن .

یەکێك لەجوانترین هەڵوێستەکان ئەوەبوو کە یەکەم جەژنێك لە ژیانی موسڵماناندا بریتی بوو لەو جەژنەی کەوتە مانگی شەوالی ساڵی دووەمی کۆچی ، لەئاکامی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەدا کە لەبەدردا بەدەستیان هێنا ، چەندە جوانە جەژنی لەو شێوەیە پڕ لەئاسوودەیی و خۆشی خودا بیهێنێت و نێوچەوانیان بەتاجی سەرکەوتن وسەربڵندی برازێنێتەوە .

چەند گەورەە ئەو دیمەنی نوێژانەی ئەنجامیان دەدا پاش دەرچوونیان لەماڵەکانیان ، بە ڕەزامەندی خودا پڕ دەبوو ، ئاشوفتەی بەزەیی و ڕەزامەندی ئەو دەبوون لەدوای ئەو نازو نیعمەتانەی بەسەریاندا ڕژاندی و ، سەری خستن و باسی کردن و فەرمووی : ﴿ وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ الانفال : ٢٦ واتە : لە یادتان بێت ، کاتێك ئێوە کەمینەیەکی لاوازو ژێردەست بوون و لەوە دەترسان خەڵك لە زەوی خۆتاندا وەدەرتان بنێن ، کەچی خودای گەورە پەنای دان و سەری خستن و لە ڕۆزی جوان بەشی دان ، سا بەڵکو سوپاسی خودا بکەن .

## چالاكی سەربازیی لەنێوان بەدر و ئوحوددا

غەزای بەدر یەكەم ڕووبەڕوو بوونەوەبوو لەنێوان موسڵمانان و موشریكاندا ، جەنگێكی یەكلاكەرەوە بوو ، دەسەڵات و سەركەوتنێكی وای بەخشی بە موسڵمانەكان كە هەموو عەرەب شایەتیان بۆ بدەن ، ئەوانەی كە زۆر بێ تاقەت بوون بەئەنجامی شەڕەكە بریتی بوون لەوانەی ڕاستەوخۆ شەڕەكەیان دۆڕاندبوو ، لە موشریكان ، یان ئەوانەی سەركەوتن و سەرفرازی موسوڵمانەكانیان بەگورزی كەمەرشكێن بۆ قەوارەی ئاستی و ئابووری خۆیان دەزانی كە ئەوانیش جولەكە بوون ، هەر لەوكاتەوە كە موسڵمانەكان لەجەنگی بەدرا سەركەوتنیان بەدەست هێنا ئەو دووتاقمە ڕق و كینە داخی دڵیان كەف و كوڵی دەدا دژ بە موسڵمانەكان : ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ المائدة :٨٢ واتە: دەبینیت كە داخ لەدڵترین كەس بەرامبەر بە ئیمانداران جولەكە و موشریكانن ، تاقمێكی كەش دروست بوون بۆ هاوپشتی ئەم دوو تاقمەی تر ئەمانە بەڕواڵەت هاتنە ناو ئیسلام ، لەناو مەدینەدا هیچ ڕێزو هەیبەتێكیان نەمابوو ئەوانیش (عبدالله)ی كوڕی (ابی) و تاقمەكەی بوون ، ئەم تاقمە ڕق و كینەیان لەوان كەمتر نەبوو .

تاقمی چوارەمین بریتی بوون لە عەرەبە دەشتەكیەكانی دەوروبەری مەدینە ، مەسەلەی كوفرو ئیمان بەلایانەوە زۆر گرنگ نەبوو ، بەڵام خەڵكی تاڵانی و فەرهود بوون ، ئەمانە دڵەڕاوكێیان پێ كەوتبوو، بەم سەركەوتنە شڵەژان ، لەوە دەترسان كەلە مەدینەدا دەوڵەتێكی بەهێزی وەها دروست ببێت ئەو هێزو دەسەلاتەیان نەهێڵێت كە لە ڕێگەی تالانكارییەوە دەستیان دەكەوت ، بۆیە كەوتنە ڕقەبەرایەتی لەگەڵ موسڵمانەكانداو بوون بە دوژمنیان.

بەم شێوەیە لە هەمولایەكەوە مەترسی چواردەوری موسڵمانەكانی دابوو ، لە هەمولایەكەوە ، بەڵام لە شێوازی مامەڵەدا جیاوازیان هەبوو لەگەڵ موسڵماناندا و ، هەر كۆمەڵێكیان ڕێگەی تایبەتی خۆی گرت بۆگەیشتن بەئامانجەكانی خۆی ، لەكاتێكدا كە خەڵكی دەوروبەری مەدینە خۆیان بەموسڵمانی دەردەخست لە ژێریشەوە ڕێگەی پڕ لە پیلان و دەسیسەو شەڕ پێفرۆشتن و ڕقیان دەگرتەبەر، گروپێكی جولەكە دوژمنایەتی خۆیان ئاشكرا دەكردو، بێشەرمانە ڕقەبەرایەتیو كینەیان دەنواند، مەككەش هەڕەشەی لێدانێكی تۆڵەی كەمەرشكێنی دەكردو

بانگەشەی بۆ تۆڵەسەندنەوە دەکرد، خۆی ئامادە دەکردو شەیپوری جەنگی گشتی لێدەداو، زمانحاڵی دەنارد بۆ موسڵمانەکان تاپێیان بڵێت:

ولابــد من يوم اغر محجل    يطول استمــاعي بعده للنوادب

هەرواش بوو، قورەیش کەوتە پێش جەنگێکی ترسناك بەرەو قەڵاکانی مەدینە ، ئەو شەڕەش لە مێژوودا بە شەڕی (احد) ناسراوەو ، ڕۆڵێکی خراپی هەبوو لەسەر هەیبەت و ناوبانگ و سامی موسڵمانەکان.

موسڵمانەکان ڕۆڵی گرنگیان بینی لەزاڵ بوون بەسەر ئەو مەترسیانەدا کەتیایدا بلیمەتیی سەرکردایەتیی پێغەمبەر ﷺ لەحاڵەتی وریایی و پارێزی لەو مەترسیانەو بەرنامە دانان بۆ زاڵ بوون بەسەریدا دەرکەوت ، لەم چەند درێژەی دواییدا چەند دیمەنێکی بچوکیان دەخەینە ڕوو .

## غەزای (بنی سلیم) لە (کدر) دا

یەکەم هەواڵێکی هەواڵگرەکانی مەدینە گەیاندبێتیان بەپێغەمبەر ﷺ دوای جەنگی بەدر ئەوە بوو ، کە تیرەی (بنی سلیم) لەناو خێڵی (غطفان)دا هێزەکانیان کۆ دەکەنەوە بۆ هەڵکوتانە سەر مەدینە ، پێغەمبەر ﷺ بە دووسەد سوارەوە لەناکاو دای بەسەر ئەو تیرە خۆئامادەکردوانەداو لەناو جێگەکانی خۆیاندا شپرزەی کردن ، لە شوێنێکدا کەپێی دەڵێن (الکدر) جۆگە ئاوێکی (بنی سلیم) بوو لە (نجد) ، لەسەر ڕێگەی بازگرانی ڕۆژهەڵاتی نێوان مەککەو شام ، لەوێدا گەیشتە سەریان (بنو سلیم) فریانەکەوتن و هەلاتن و لە شیوەکەدا پێنج سەد وشتریان بەجێهێشت و دەست سوپای مەدینە کەوت ، پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی پێنجیەکی لێدەرکردو دابەشی کردن بەسەر موسڵمانانەکاندا ، هەر پیاوێکیان دوو وشتری بەرکەوت ، غولامێکیشیان دەستگیرکرد ناوی (سپار) بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کرد ، لەو جێگە و ماڵانەدا سێ ڕۆژ مایەوەو پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە.

ئەم غەزایە لەشەوالی ساڵی(٢)ی کۆچیدا بوو ، پاشگەڕانەوە لە بەدر بە حەوت ڕۆژ ، لەو شەڕەدا لەدوای خۆی (سباع)ی کوڕی (عرفظە)ی بەجێهێشت بەسەر شانی مەدینەوە دەشڵێن : (ابن ام مکتوم)ی بەجێهێشتووە [١].

---

[١] زاد المعاد ٢/٩٠ ، ابن هشام ٢/٤٣ ، ٤٤ ، مختصر سیرة الرسول ، نووسینی شێخ عەبدوڵلای نەجدی ٢/٢٣٦ .

## پیلانێك بۆ تیرۆركردنی پێغەمبەر ﷺ

لەئەنجامی شكستەكەی بێباوەڕاندا لەشەڕی بەدر ، زۆر ڕقیان هەستابوو ، مەككە وەكو ئاوی سەرئاگر كوڵ قوڵپی دەدا دژ بەپێغەمبەر ﷺ ، تا دوو پاڵەوانیان نەخشەیان دانا بۆ لەناوبردنی ئەوكەسەی جیاوازیی تێداناونەتەوەو ئەو شكستەی بەسەردا هێناون بەڕای ئەوان گوایە ئەوكەسە (پێغەمبەرە ﷺ)، پاش غەزای بەدر بە چەند ڕۆژێك (عمیر)ی كوڕی (وهب) الجمحی، لەگەڵ (صفوان)ی كوڕی (امیە) لەپاڵ دیواری كابەدا دانیشتبوون (عمیر) یەكێك بوو لەپیاوە شەیتان و فێڵبازەكانی قوڕەیش و لەناوشاری مەككە زۆر ئازاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەكانی دەدا، (وهب) ی كوڕیشی لای موسڵمانەكان دیل بوو، باسی كوژراوەكانی قولەیب و كارەساتەكانی كرد، (صفوان) وتی: سوێندبێت دوای ئەوان ژیان هیچ مانایەكی نییە.

( عمیر) پێی وت: وەڵڵاهی ڕاست دەكەیت ، سوێندبەخوا منیش ئەگەر ئەوقەرزەم لەسەر نەبوایەو ماڵ و منداڵەكەم نەبوایە كە دەترسم بمرن ، ئێستا سوار دەبووم دەچووم موحەممەدم دەكوشت ، بەهانەشم هەیە ، كوڕەكەم لای ئەوان دیلە.

(صفوان) ئەمەی بەهەلزانی و وتی: من قەرزەكەت دەدەمەوە ، خاوو خێزانیشت لەگەڵ خاوو خێزانی خۆمدا دەبن ، تا لە ژیاندا بن و دڵیان دەدەمەوە ، هەرچیەكم هەبێت دەیاندەمێ .

(عمیر) پێی وت : با ئەم مەسەلەیە لەنێوان من و تۆدا بێت . وتی : باشە .

پاشان (عمیر) فەرمانیدا شمشێرەكەیان بۆ تیژو ژەهراوی كرد ، ئەنجا كەوتەڕێ بەرەو مەدینە ، گەیشتە مەدینە لە كاتێكدا كەلە (پاڵ دەرگای مزگەوتەكەدا بوو ، وشترەكەی ڕادەگرت ، (عومەر)ی كوڕی (الخطاب) ، لەگەڵ كۆمەڵە موسڵمانێكی تردا خەریكی باسی شەڕەكەی بەدر بوون لە دورەوە بینی ، (عومەر) (ڕ) فەرمووی: ئەوە (عمیر)ە سەگی دوژمنی خودایە ، بۆ شەڕ نەبێت هیچی بەدەستەوە نیە ، پاشان چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە دوژمنی خوایە شمشێری بەدەستەوەیە هاتووە بۆ مەدینە ، فەرمووی : بۆم بكەرە ژوورەوە ، كە (عمیر) هات ، عومەر (ڕ) بەقایشی شمشێرەكەی دەسبەستی كردو ، بەپیاوێكی ئەنساری وت: بڕۆنە ژوورەوە لای پێغەمبەری خودا بوەستن و ، ئاگاتان لەم پیاوە خراپە بێت ، دڵنیانەبن لێی ، پاشان بردیە ژوورەوە ، كە پێغەمبەری ﷺ بەو شێوە بینی فەرمووی : (عمر) دەستی بكەرەوە ، ئەنجا ڕووی

کردە (عمیر) و فەرمووی : نزیك بەرەوە ، نزیك بوەوە ، (عمیر) وتی: (انعموا صباحا) ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : خوای گەورە بەسلاوێکی تر فێری کردووین کە لەوەی تۆ باشترە ، بەسلاو فێری کردووین ، ئەمە مەرحەبایی خەڵکی بەهەشتە .

پاشان فەرمووی : (عمیر) چی تۆی هێناوە ؟ (عمیر) وتی: هاتووم بۆلای ئەو دیلەی لاتانە بەڵکو لەگەڵیدا چاك بن ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی ئەو شمشێرە چیە لەخۆت داوە ؟ وتی : خوا لەناوی بەرێت چ شمشێرێکە ، ئەمە چی بۆ ئێمە کردووە؟ فەرمووی : ڕاستم لەگەڵدا بڵێ بۆچی هاتویت ؟ عمیر وتی : تەنها بۆ ئەوە هاتووم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر وانیە ، ڕۆژێکیان تۆو (صفوان) لەپاڵ دیواری کابەدا دانیشتبوون ، باسی کوژراوەکانی (قلیب) تان دەکرد ، پاشان تۆ وتت : ئەگەر قەرزم بەسەرەوە نەبوایەتەو لەماڵ و منالم نەترساما یە ئێستا دەچووم موحەممەدم دەکوشت ، ئەوەبوو (صفوان) قەرزو بژێوی ماڵ و منالەکانتی لە ئەستۆی گرت لەسەر ئەوەی تۆ من بکوژیت ، دڵنیاشبە خودا ناهێڵێت تۆ من بکوژیت .

( عمیر) وتی : شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت ، پێغەمبەری خوا ئێمە هەموومان بەدرۆمان دەخستیتەوە کە تۆ هەواڵت لەئاسمانەوە پێدەگەیشت و نیگات بۆ دەهات ، ئەم مەسەلەیە تەنها لەنێوان من و (صفوان)دا بوو ، وەڵڵاهی ئەم هەواڵە جگە لەخودا کەس بەتۆی نەگەیاندوە ، سوپاسی خوادەکەم کە ڕێنوێنی کردم بۆ ڕێبازی ئیسلامەتی و ، ملی ئەم ڕێیەی پێگرتم ، پاشان شایەتومانی بەهەقی هێنا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: براکەتان تێبگەیەنن لە ئاینەکەیی و ، فێری قورئان خوێندنی بکەن و ، دیلەکەشی بۆ بەربدەن .

(صفوان) یش لەمەککە زوو زوو دەیوت بەخەڵکی مەککە : مژدە بێت هەواڵێکی ئەوەندە خۆش دەبیستن ڕووداوێك تۆڵەی بەدرتان لەبیر دەباتەوە ، هەمووجارێك پرسیاری لەرێبواران و ئەسپ سواران دەکرد لەبارەی (عمیر)ە وە ، تا یەکێکیان هەواڵی موسڵمان بوونەکەی دایە ، (صفوان) سوێندی خوارد کە قسەی لەگەڵدا نەکات و ، هیچی نەداتێ .

(عمیر) هاتەوە بۆ مەککەو مایەوەو خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئیسلامەتی ، لەسەر دەستیدا زۆرکەس موسڵمان بوو[1].

---

[1] ابن هشام ، ٦٦١/١ ، ٦٦٢ ، ٦٦٣ .

## غەزای (بنو قینقاع)

پێشتر باسی ئەو پەیماننامەیەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جولەکەدا بەستی ، زۆر سوور بوو ، لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو خاڵانەی لەپەیماننامەکەدا هاتبوون ، هەروەاش بوو هیچ موسڵمانێك کارێکی نەکرد پێچەوانەی دەقێکی پەیماننامەکە بێت . بەڵام جولەکە ، کە مێژووی خۆیان پڕکرد بوو لەخیانەت و ناپاکی و پەیمانشکێنی ، زۆری پێنەچوو چوونەوە سەرحاڵەتە کۆنەکانی خۆیان و ، دەستیان کرد بەپیلان و گۆبەنگنانەوەو شەڕ فرۆشتن و ئاژاوەگێری و شڵەقاندنی ریزەکانی موسڵمانان ، ئەمەش چەند نموونەیەکە :

## نموونەیەك لە فرت و فێڵی جولەکە

(ابن اسحاق) دەڵێت : (شاس)ی کوڕی (قیس)* جولەکە بوو ، زۆر بە تەمەن بوو ، زۆریش بێباوەڕ بوو، ڕق و کینەی لەدڵدا بوو بەرامبەر بەموسڵمانان و، حەسوودی پێ دەبردن ، جارێکیان بەلای کۆمەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی ، لە ئەوس و خەزرەجدا دانیشتبوون قسەوباسی خۆیان دەکرد، زۆری پێناخۆش بوو کە بەو شێوەیە ئەوانی بینی وەکو برا لەژێر سێبەری ئیسلامدا دەژیان، پاش ئەو دوژمنایەتیەی کە لەسەردەمی جاهیلیەتدا هەیانبوو ، وتی: ئەوە خێڵی (قیلە) لەم شارەدا پێکەوە دانیشتوون ، وەڵڵاهی ئەگەر ئاوابن ئێمە هیچ بڕیارێکمان بۆ جێبەجێ ناکرێت ، وتی بەگەنجێکی جولەکە کە لەگەڵیدا بوو ، بڕۆ بۆلایان ، لەگەڵیان دانیشە ، پاشان باسی ڕۆژی (بعاث) بکەو پێشتر چی ڕوویداوە ، هەندێك لەو شیعرانەی ئەو کاتانەیان بەسەردا بخوێنەرەوە ، گەنجە چی پێ وترا بوو ئەنجامی‌دا ، ئیدی ئەوان کەوتنە قسەوتن بەیەك و ، شانازی بەخۆوە کردن . تا دوو پیاویان ئامبازی یەکتری بوون و دەستیان کرد بەشەڕە قسە، پاشان یەکێکیان وتی بەئەوی تریان: ئەگەر حەزتان لێیە شەڕی ئەهلی هەڵدەگیرسێنینەوە، هەردوولا تووڕەبوون هەستانەوە بۆ یەکترو وتیان بەیەك : دەست بدەنە چەك ، چوونە دەرەوە بۆ شەڕ خەریك بوو شەڕ هەڵگیرسێت .

هەواڵ گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆچکەراندا چوو بۆ لایان، تا گەیشتە لایان ، فەرمووی : گرۆی موسڵمانان ، بۆ خاتری خوا ، تازە دەست دەکەنەوە بەقسەوباسی سەردەمی جاهیلیەت ؟ لەکاتێکدا کە من هێشتا لەناوتاندام ، پاش ئەوەی خودا ڕێنومایی کردن بۆ ئیسلام و ڕێزی لێنان و ، بەئایینی ئیسلام پەیوەندی جاهیلیەتی بڕی و ، لەکوفر ڕزگاری کردن و ، دڵی هەمووتانی کرد بە یەك ؟

ئیدی خەڵکەکە زانیان کە ئەمە لەشەیتانەوە بووەو ، دەسیسەی دوژمنانیانە ، دەستیان کرد بەگریان ، پیاوانی هەردوولا دەستیان کردەوە ملی یەك، پاشان ملیان کەچ کردەوەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاوەیان لێکردو دڵ و دەروونیان پاك بوەوە لە فێڵی (شاس)ی کوڕی (قیس)[1].

ئەمە نمونەیەك بوو لەو کارانەی جوولەکە پێی هەڵدەستان و هەوڵیان دەدا بەهۆیەوە ئاژاوەو شەڕ لەناو موسڵماناندا دەست پێ بکەن و ، کۆسپ دابنێن لەبەردەم ڕێبازی بانگەوازی ئیسلامیدا ، هەر لەو ڕێگەیەوە چەندین پلان و نەخشەیان هەبوو ، پڕوپاگەندەی درۆیان بڵاودەکردەوەو ، ڕۆژی نیوەڕۆ باوەڕیان دەهێنا ، ئێوارەکەی کافر دەبوونەوە ، بۆئەوەی گومان لەدڵی مرۆڤە دڵ لاوازەکاندا بچێنن ، دەستیان دەنوقاند لە بەرامبەر ئەوانەدا کە باوەڕیان هێنابوو پەیوەندی داراییان لەگەڵیاندا هەبوو ، قەرزیان لە لای هەر موسڵمانێك بوایە شەوو ڕۆژ دەچوونە سەری ، ئەگەر قەرزاریشیان بوونایە دەیانخواردو بە ناهەقی نەیاندەدایەوەو ، دەیانوت : کاتێك تۆ قەرزت لای ئێمە هەبوو کە لەسەر ئایینی باوو باپیرانی خۆت بویت ، ئێستاکە وازت هێناوە هەقمان نیە بەسەرتەوە[2].

ئەمە ڕەفتاریان بوو لە پێش شەڕی (بدر)دا ، سەرباری ئەو پەیماننامەیەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەستبوویان ، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی ئارامیان لەسەری دەگرت ، نەبادا شتێك ڕوو بدات و مەبەستیان بوو کەهێمنی و ئاشتی ناوچەکە بپارێزن.

---

[1] ابن هشام ١/٥٥٥ ، ٥٥٦ .

[2] زانایانی بواری تەفسیر چەندین نموونەیان باس کردوە لەکردەوەکانیان ( تەفسیری سورەی (ال عمران) دا .

## بنو قینقاع پەیمان دەشكێنن

كاتێك (بنو قینقاع) بینیان كەخودای گەورە سەركەوتنێكی گەورەی‌دا بە موسڵمانان لەشەڕی بەدراو ، دەسەڵاتیان پەیدا كردو سام و شەوكەتیان چووە دڵی گەورەو بچوكەوە ، ئاستی ڕق و كینەیان زیاتری كردو بەئاشكرا دوژمنایەتیان دەكردو دەستدرێژی ئازاردانیان كەوتە بەرچاوان.

لە هەموویان كینە لە دڵترو داخ لە دڵتر (كعب)ی كوڕی (اشرف) بوو . دوایش باسەكەی دێت . هەروەها خراپترین و شەڕەنگێزترین تایەفەی جولەكە (بنو قینقاع) بوون ، نیشتەجێی ناو شاری مەدینە بوون . لە گەڕەكێكدا بوون بەناوی خۆیانەوە ناویان نابوو ، ـ زۆربەیان زەڕەنگەرو ئاسنگەرو وەستای قاپ و قاچاخ بوون ، لەبەرە ئەم ڕەوشتەیان هەموو یەكێكیان چەكی جەنگی هەبوو ، ژمارەی شەڕكەرانیان حەوت سەد كەس دەبوون ، ئازاترین جولەكەی مەدینە بوون ، یەكەم تاقمیش بوون كە وادەو بەڵێنیان شكاند لەناو جولەكەدا.

كاتێك كەخودای گەورە موسڵمانەكانی لە شەڕی بەدرا سەرخست ، ملهوڕیی ئەمان زیادی كرد ، دەستیان كرد بەزیاتر شەڕفرۆشتن و ڕق هەستاندنی موسڵمانان ، ئاژاوەیان دەنایەوە ، گاڵتەیان پێدەكردن ، وای لێهات شەڕیان بە ژنە موسڵمانەكان دەفرۆشت.

كاتێك كە مەسەلەكە گەورە بوو دەست درێژیەكانیان توندتر بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ كۆی كردنەوەو ، وتاری بۆدان و بانگەشەی كردن بۆ مەنتیقی عەقڵ و ڕێنوێنی و ، ئاگاداری كردنەوە لە هەر دەست درێژی و دوژمنكاریەك ، بەڵام ئەوان لە شەڕەنگێزی و لووت بەرزیدا پێی زیاتریان لێ ڕاكێشا.

(ابوداود) و ئەوانی تر دەگێڕنەوە لە(ابن اسحاق)ە وە (ر) دەڵێت: كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەشەڕی بەدردا سەركەوت بەسەر قورەیشداو، گەڕایەوە بۆ مەدینە، جولەكەكانی لەبازاڕی (بنو قینقاع)دا كۆكردەوە، پێی فەرموون : خێڵی جولەكە ، ملكەچ بن پێش ئەوەی ڕووداوێكی وەك ئەوەی قورەیشتان بەسەردابێت . وتیان : ئەی موحەممەد ، لە خۆت بایی مەبە كەچەند پیاوێكت لەقورەیش كوشتوە ، ئەوانە هەرزەبوون شەڕیان نەدەزانی ، ئەگەر شەڕمان لەگەڵدا بكەیت ئەوجا دەزانیت كە خەڵكی شەڕكەر ئێمەین ، تۆ تا ئێستا شەڕت لەگەڵ خەڵكی وەك

ئێمەدا نەکردووە ، خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە : ﴿ قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمِهَادُ قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُمْ مِثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَنْ يَشَاءُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِأُولِي الْأَبْصَارِ ﴾ آل عمران : ١٢،١٣ [١]. واتە : بڵێ بە بێباوەڕان ژێردەکەون و حەشر دەکرێن بەرەو دۆزەخ و خراپترین شوێن ، لەو دووکۆمەڵەدا کە بەیەکگەیشتن بەڵگەو پەندێکی تەواوی تێدا بوو بۆ ئێوە ، کۆمەڵێکیان لەپێناوی خوادا جەنگی دەکردو ، کۆمەڵێکیشیان کافر بوون ، بەو ئەندازەیە کۆمەڵێکی تریان بەچاوی خۆیان دەبینی ، خوای گەورە خواستی لەسەر بێت پشتیوانی هەرکەسێك دەکات خۆی بیەوێت ، ئەمە پەندی تێدایە بۆ بینایان .

وەلامی (بنو قینقاع) بۆ ئەم ئایەتانە ڕاگەیاندنی جەنگ بوو ، بەلاَم پێغەمبەر ﷺ ڕقەکەی خواردەوەو موسڵمانیش دانایان بەخۆیاندا گرت ، چاوەڕوانی ڕۆژگار بوون ، زۆری پێ‌نەچوو لەناو مەدینەدا (بنو قینقاع) ئاژاوەو پشێویان دروست کردو ، بە دەستی خۆیان چاڵی مەرگیان بۆ خۆیان هەڵکەندو، ڕێگاکانی ژیانیان لەخۆیان بڕی .

(ابن هشام) لە (ابی عون)ەوە دەگێڕێتەوە ، جارێکیان ژنە عەرەبێك شمەکی هێنابوو، لە بازاڕی (بنو قینقاع) فرۆشتی ، لای کابرایەکی زەڕەنگەر دانیشت ، چەند جولەکەیەك داوایان لێ‌کرد کە دەموچاوی خۆی دەربخات ، ڕازی نەبوو ، زەڕنگەرەکە لایەکی کراسەکەی بەستەوە بەپشتیەوە ژنەکە ئاگای لێ‌نەبوو . کە هەستا عەورەتی دەرکەوت ، جولەکەکانت کەوتنە گاڵتەو پێکەنین ، ژنەکە هاواری لێ هەستا ، پیاوێکی موسڵمان ئامبازی زەڕەنگەرە جولەکەکە بوو کوشتی ، جولەکەکانی تر هەڵیان کوتایە سەر پیاوە موسڵمانەکەو کوشتیان ، کەسوکاری پیاوە موسڵمانەکە هانای هێنا بۆ موسڵمانەکان دژ بە جولەکە شەڕ دەستی پێ‌کرد لەنێوان ئەمان و جولەکەی (بنو قینقاع) دا [٢].

---

[١] سنن ابی داود لەگەڵ (عون المعبود) ٣/١١٥ ، ابن هشام ١/٥٥٢ .
[٢] ابن هشام ٢/٤٧ ، ٤٨ .

ئیدی پێغەمبەر ﷺ ئارامی لێ بڕا ، (لبابە)ی کوڕی (عبد المنذر)ی بەسەر مەدینەوە داناوئالآی موسڵمانای‌دا بەدەست (حمزە)ی کوڕی (عبد المطلب)ە وە ﷺ سەربازانی خودای ڕێکخست بەرەو (بنو قینقاع) کەبینیان واسوپای موسڵمانەکان هات، ڕایانکردە ناو قەلاّکانیانەوە، موسڵمانان بەتوندی ئابلۆقەیاندان، ئەم ڕووداوە لەڕۆژی شەممەی نیوەی مانگی شەوالی ساڵی (٢)ی کۆچیدا بوو، ئابلۆقەکەکە ماوەی (١٥) ڕۆژی خایاند تا شەوی یەکەمی مانگی (ذي القعدة) ترسێکی زۆر کەوتە دڵیانەوە ئەو ترسە بوو کە خودا بیویستایە هەر کۆمەڵێك سەر شۆڕ بکات دەیخستە دڵیانەوە . ئیدی ملیان کەچ کرد بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەردنی خۆیان و ماڵ و منالّ و ژنیاندا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا باڵبەست کران .

ئیدی (عبدالله)ی کوڕی (ابی) کوڕی (سلول) بەدەوری دووڕووانەی خۆی هەستا، زۆرلالآیەوە لەپێغەمبەر ﷺ کە چاوپۆشیان لێبکات ، وتی: ئەی موحەممەد" داوات لێدەکەم چاك بە لەگەڵ هاوپەیمانەکانم . (بنو قینقاع) هاوپەیمانی (خرزج) بوون . پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵی گەرم و گوڕ نەبوو ، (ابی) جارێکی تر وتیەوە ، پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخاند ، دەستی گرت بەئەڵقەیەکی قەڵغانەکەیەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەرم بدەو ، تورە بوو هەتا دەموچاوی پیرۆزی ڕەش داگەڕا ، پاشان فەرمووی: دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات بەرم بدە، بەلاّم کابرای دووڕوو هەر سوور بوو ، وتی : نەوەڵلاّ بەرت نادەم هەتا چاك نەبیت لەگەڵ دۆستەکانمدا ، چوارسەد کەس سەرپەتی و سێ سەدی کلاّوپۆش لە هەموو حاڵەتێك بەرگریان لێکردووم ، ئێستا تۆ دەتەوێت لە بەرەبەیانێکدا دروێنەیان بکەیت؟ سوێند بێت من کابرایەکم دەترسم شتێکم بەسەردابێت .

ئەم پیاوە دووڕووەکە هێشتا مانگێك بەسەر موسڵمان بونیدا نەگوزەرا بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ڕاگیرکرد ، بەخشینی بە ئەوو فەرمانی پێدان کە لەمەدینە دەرچن و لەنزیکیەوە نیشتەجێ نەبن ، ئەوەبوو دەرچوون بەرەو (اذرعات)ی شام ، کەمێکیان لەوێ مانەوە ئەوانی تریان لەناوچوون .

پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و سامانەکەیانی لێ سەندن و دووقەڵغان و سێ شمشێرو سێ ڕمی لێدەرهێنا لەگەڵ پێنجیەکی دەستکەوتەکانیان ، ئەوکەسەش هەستا بەکۆکردنەوەی دەستکەوتی شەڕەکە (محمد)ی کوڕی (مسلمە) بوو [1].

---

[1] زاد المعاد ( ٢/ ٧١ ، ٩١ ، ابن هشام ٢/ ٤٧ ، ٤٨ ، ٤٩ ) .

## غەزای قاوت (سويق)

لەکاتێکدا کە (صفوان)ی کوڕی (اميە) و (جولەکە) و دووڕووان خەریکی دەسیسەو پیلانگێڕان بوون ، (ابو سفيان) بیری لەکارێکی کەم زیانی ناوبانگ زل دەکردەوە ، کە بەخێرایی بیکات ، تا پلەوپایەی خێڵەکەی پێ بپارێزێت و ، هێزی خۆی دەربخات ، ئاهی کردبوو کە ئاو بەرسەری نەکەوێت تا شەڕ لەگەڵ موحەممەددا نەکات ، دووسەد سواری لەگەڵ خۆیدا بردو تا سوێندەکەی بەجێ بهێنێت لەسەر جۆگە ئاوێکی ڕوو بەشاخی (نيب) دابەزی نزیك بوو لە مەدینە بەڵام نەیوێرا بەڕۆژ هێرش بکاتە سەر مەدینە ، هەستا بەئەنجامدانی کارێك کە لەچەتەگەریی دەچوو ، بەشەو بەشێوەیەکی نهێنی نزیك قەراغی شار بۆوەو ، چووەلای (حيي) کوڕی (اخطب) دای لە دەرگا ، نەیوێرا بیکاتە ژوورەوە ، چوو بۆ لای (سلام)ی کوڕی (مشكم) سەرۆکی (بنی النضير) و خاوەنی گەنجینەکەیان بوو لەوکاتەدا ، داوای هاتنە ژوورەوەی کرد ، فەرموویان لێکرد ، ڕێزی گرت و شەرابی پێشکەش کرد ، هەواڵەکەی لای کەس نەدرکاند ، دوای ئەوە (ابو سفيان) هاتەوە لای هاوڕێکانی و ، مەفرەزەیەکی ناردن و ، چوونە سەر شوێنێکی قەراغی شاری مەدینە پێیان دەوت (عەریق) لەوێدا باخێکی خورمایان سووتاندو ، پیاوێکی ئەنساری هاوپەیمانێکیان بینی هەردووکیان کوشت و ، ڕایان کردەوە بەرەو مەککە.

هەواڵەکە گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ دەسبەجێ بەدوایاندا چوو ، بەڵام ئەوان خێرا تر ڕایان کردبوو ، لەڕێگە (قاوت) یێکی زۆریان فرێدا بوو لەگەڵ برێکی زۆر خۆراك و شمەك بۆ ئەوەی لە ڕاکردندا سووکەڵە بن ، ئەوەبوو دەربازبوو بوون لەدەستیان، پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە (قرقره الكدر)، پاشان گەڕایەوە، موسڵمانان هەموو قاوەتەکەیان کۆکردەوە، ئەم بگرەو بەردەیان ناونا (غەزای قاوت)، ئەم غەزایە لە مانگی ذیالحجة ساڵی (٢) کۆچی دوای جەنگی بەدر بەدوو مانگ ڕوویدا ، پێغەمبەر ﷺ لەوشەڕەدا (ابا لبابە)ی کوڕی (عبدالمنذر)ی بەسەر مەدینەوە جێهێشت [١].

---

[١] زاد المعاد ٢/٩٠ ، ٩١ ، ابن هشام ٢/٤٤ ، ٤٥ .

## غەزای (ذي امر)

ئەم غەزایە گەورەترین شالاْوی سەربازیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش جەنگی ئوحودو سەرۆکایەتی کردبێت ، ئەم شالاْوەی لە (محرم)ی ساڵی (٣) ی کۆچیدا ئەنجامدا .

هۆیەکەی ئەوەبوو ، هەواڵگرەکانی مەدینە هەواڵیاندا بەپێغەمبەر ﷺ کە کۆمەڵێکی زۆری خێڵی (بني ثعلبة) و (محارب) کۆبوونەتەوەو، دەیانەوێت بدەن بەسەر شاری مەدینەدا پێغەمبەری خوا ﷺ، لەگەڵ چوارسەدو پەنجا جەنگاوەری پیادەو سوارو بەڕێ کەوت، (عثمان)ی کوڕی (عفان)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت.

لە ڕێگەدا کابرایەکیان گرت ناوی (جبار) بوو لە خێڵی (بنی ثعلبة) کرایە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام موسڵمان بوو ، کردی بە هاوەڵی بیلال و بو بەڕێبەری موسڵمانەکان بۆ سەر شوێنی دوژمن.

دوژمنان کە هەواڵی هاتنی سوپاکەی مەدینەیان بیست بە شاخ و داخەدا بلاْوەیان لێکرد، پێغەمبەریش ﷺ بەخۆی و سوپاکەیەوە گەیشتە شوێنی کۆبوونەکەیان کە لەسەر ئاوێك بوو، پێیان دەوت (ذي امر) لەو شوێنەدا هەموو مانگی (صفر)ەکەی بەسەر برد ، لەساڵی (٣)ی کۆچیدا بوو، یان نزیکبوبوەوە لەو ساڵە، ئەم مانەوەیە بۆ ئەوەبوو عەرەبە دەشتەکیەکان هەست بەهێزو دەسەلاْتی موسڵمانەکان بکەن و لێیان بترسن ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە[٢].

## کوشتنی (کعب) ی کوڕی (أشرف)

(کعب)ی کوڕی (اشرف) داخ لەدڵترین جولەکە بوو ، دژ بە ئیسلام و موسڵمانان ، زۆر ئازاری پێغەمبەری دەدا ﷺ و بە ئاشکرا دژایەتی دەکرد.

لەتیرەی (طيء)ی - بنی نبهان - بوو، دایکی لەخێڵی (بني النضير) بوو، کابرایەکی دەوڵەمەندی سەرومڕی قۆزی ناو خێڵەکانی عەرەب بوو، یەکێك بوو لە شاعیرەکانیان، قەلاْکەی کەوتبوە باشووری ڕۆژهەلاْتی مەدینە لە پشت ماڵەکانی (بني النضير)ەوە.

---

[٢] ابن هشام ٤٦/٢ ، زاد المعاد ٩١/٢ ، دەڵێن هەوڵەکەی (دعثور) یان (غورث)ی (محارب)ی لەم غەزایەدا بووە ، بەلاْم ڕاستتر ئەوەیە کە لە غەزایەکی تردا بووە ، بڕوانە صحیح البخاری ٢/ ٥٩٣ .

که هەواڵی یەکەم سەرکەوتنی موسڵمانەکان و کوشتنی پاڵەوانەکانی قورەیشی پێگەیشت لەبەدردا وتبوی : ئەرێ ئەو هەواڵە ڕاستە؟ ئەوانە پیاوماقوڵ و شای خەڵکین ، وەڵڵاهی ئەگەر موحەممەد ئەوانەی کوشتبێ ژێرزەوی بۆ من باشترە لەسەر زەوی .

که هەواڵی سەرکەوتنی موسوڵمانەکانی بیست ، دەستی کرد بەجنێودان و خراپە وتنی پێغەمبەر ﷺ موسڵمانەکان و پیاهەڵدانی دوژمنەکانیان و ، هاندانیان دژ به پێغەمبەر ، بەوەشەوە نەوەستا ، سواربوو بۆلای قورەیش لەلای (المطلب)ی کوڕی (ابی وداعه السهمی) دابەزی ، دەستی کرد بەخوێندنەوەی شیعرو گریان بۆ کوژراوە موشریکەکانی (قلیب) ، بۆ ورژاندنی غیرەتیان و قوڵترکردنەوەی ڕق و کینەیان دژ به پێغەمبەرو ، بانگی دەکردن بۆ شەڕکردن لەگەڵیدا ، کاتێك له مەککه بوو (ابو سفیان) و موشریکان پرسیاریان لێکرد : ئایا ئاینی ئێمەت بەلاوە خۆشەویستترە یان ئاینەکەی موحەممەدو هاوەڵەکانی ؟ کاممان لەسەر ڕێگەی هیدایەته ؟ وتی : بەڕاستی ئێوە لەسەر ڕێگەی هیدایەتن ، باشترن ، لەم بارییەوە ئایەت دابەزی ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيباً مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلاً﴾ النساء : ٥٠ واته : ئایا سەیری کەسانێك ناکەیت که بەهرەیەکیان له کتێبی ئاسمانی پێدراوە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بەفاڵچی و جادووگەریی هەیه ، دەربارەی ئەوانەش که کافرن دەڵێن : ئەوانە چاکترن و ڕێبازی ڕاستریان گرتووە لەوانەی که باوەڕیان به ئایینی ئیسلام هێناوە.

پاشان (کعب) بەو شێوەیه گەڕایەوە بۆ مەدینه ، دەستی کرد به هەرزە گوێی کردن بەرامبەر بەژنانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو زمانه پیس و خراپەی ئازاری دەدان.

ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( کێ دەتوانێت (کعب)ی کوڕی (اشرف) لەناو بەرێت ؟ چونکه بەڕاستی ئازاری خوداو پێغەمبەری داوە)) (محمد)ی کوڕی (مسلمه) و (عباد)ی کوڕی (بشر) و (ابو نائله) که ناوی (سلکان)ی کوڕی (سلامه) بوو برای شیری (کعب) بوو ، هەروەها (الحارث)ی کوڕی (اوس) و (ابو عبس)ی کوڕی (حبر) خۆیان تەرخان کرد بۆ ئەو کارە . فەرماندەی مەفرەزەکه (محمد)ی کوڕی (مسلمه) بوو.

ڕیوایەتەکان لەبارەی کوشتنی (کعب)ی کوڕی (اشرف)ە وە دەڵێن :ـ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : کێ دەتوانێت (کعب) بکوژێت ، چونکە بەڕاستی ئازاری خوداو پێغەمبەرەکەی داوە؟ (محمد)ی کوڕی (مسلمە) وتی: من ئامادەم پێغەمبەری خوا ، ئایا حەز دەکەی بیکوژم؟ فەرمووی: بەڵێ ، وتی: مۆڵەتم بدەرێ با خۆم بڕۆم قسەیەکی لەگەڵدا بکەم ، فەرمووی: بڕۆ قسەی لەگەڵدا بکە.

(محمد)ی کوڕی (مسلمە) چوو بۆلای (کعب) و پێی وت : بەڕاستی ئەم پیاوە پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە لامان وداوای سەدەقەمان لێ دەکات ، شکست وماندووی کردووین.

( کعب) وتی : بێگومان کە ئێوە لێی بێزارن .

(محمد)ی کوڕی (مسلمە) وتی : ئێمە بەم حاڵە شوێنی کەوتووین ، حەز ناکەین بەجێی بهێڵین تابزانین چی لێ بەسەر دێت ؟ ئێستا هاتووین بە قەرز هۆقەیەك یان چەند هۆقەیەککمان بدەیتێ.

(کعب) وتی : باشە ، بارمتەم دەوێت .

(ابن مسلمە) وتی : چیت دەوێت بۆت بارمتە بکەین ؟

وتی : ژنەکانتان.

( ابن مسلمە) وتی : چۆن ژنەکانمان دادەنێین ، لەکاتێکدا تۆ قۆزترین پیاوی عەرەبیت ؟

(کعب) وتی : کوڕەکانتانم لە لا دابنێن.

(ابن مسلمە) وتی : چۆن کوڕەکانمان لای تۆ بێت ، جنێو بە هەریەکێکیان بدرێت و پێیان بوترێت : ئەمە بارمتەی هۆقەیەك یان دوو هۆقەیە . بەڵام چەکت بۆ بارمتە دەکەین.

بەڵێنی پێدا کە بێتەوە بۆلای . (ابو نائلە)ش هەمان شێوەی (محمد)ی کوڕی (مسلمە)ی کرد ، چوە لای (کعب)و چەند ساتێك شیعریان بۆ یەکتریی خوێندەوە ، پاشان پێی وت : (ابن الْشرف) دایکت سنگت بۆ بکوتێت ، من بۆ شتێك هاتوومە لات ئەمەوێت بۆت باس بکەم ، بەمەرجێك نەیدرکێنیت.

(کعب) وتی : باشە.

(ابو نائلة) وتی : هاتنی ئەم کابرایە مەبەستی (پێغەمبەر بوو ﷺ) بوو بە بەلاَ بۆ ئێمە ، عەرەب کەوتنە دژایەتی کردنمان و ، ئابلۆقەیان لەسەردانائین ،

هەموو ڕێگاکانیان لێگرتین ، تا ماڵ و منداڵمان زایەبوو ماندوو بووین ، خۆمان و ماڵ و مناڵمان تیاچووین ، قسەو گفتوگۆ بەردەوام بوو بەو شێوەیەی کە لەگەڵ (ابن مسلمە)دا ڕووی‌دا (ابو نائلە) لە قسەکانیدا وتی : چەند هاوەڵێکم لەگەڵدایە هەمان ڕاوبۆچوونی منیان هەیە ، حەزم کرد بیانهێنم شتیان پێ بفرۆشیت و چاك بیت لەگەڵیاندا.

(ابو نائلە) و (محمد بن مسلمە) لەوەدا کە مەبەستیان بوو سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، ئیدی (کعب) بەلایەوە ئاسایی بوو کە چەکی پێ بدینایەو لەگەڵ ئەوانی‌تریشدا بونایە .

لە شەوێکی مانگەشەوی چواردەی مانگی ڕەبیعی‌یەکەمی ساڵی (٣)ی کۆچی ، مەفرەزەکە لەگەڵ پێغەمبەردا کۆبوەوەوە لەگەڵیان چوو هەتا (بقیع الغرقد) و ڕەوانەی کردن و ، پاشان ئامۆژگاریی کردن و فەرمووی : (بڕۆن بە ناوی خواوە ، خوایە هاوکاریان بکە) ، پاشان گەڕایەوە ماڵ و دەستی کرد بەنوێژکردن و پاڕانەوە لە پەروەردگار.

مەفرەزەکە گەیشتە قەڵاکەی (کعب)ی کوڕی (اشرف) ، (ابو نائلە) بانگی لێکرد ، هەستا بێتەخوارەوە بۆلایان ژنەکەی کە هێشتا تازەبووك بوو پێی وت : لەم درەنگ وەختەدا بۆ کوێ دەچیت ؟ گوێم لە دەنگێکە دەڵێیت خوێنی لێ دەتکێت.

(کعب) وتی: ئەوە (محمد)ی کوڕی (مسلمە)ی برام و (ابونائلە)ی برای شیریمە ، پیاوی پایەدار ئەگەر بۆکوشتنیش بانگ بکرێت دەڕوات بەدەمیەوە ، پاشان هاتەدەرەوە بۆلایان بۆنی عەتری لەخۆی دابوو ، پرچی بەردابووەوە.

پێشتر (ابو نائلە) بەهاوەڵەکانی وت ، ئەگەر (کعب) هات من قژی دەگرم و بۆنی پێوە دەکەم ، کە بینیتان من بە تەواوی دەستم لەسەری گیربوو ، ئێوە بە شمشێر لێی بدەن ، کە (کعب) دابەزیە ناویان ساتێك قسەی لەگەڵدا کردن ، پاشان (ابو نائلە) پێی وت : (ابن الاشرف) دەکرێت بە شیوی (عجوز) دا کەمێك بچینە خوارەوەو قسەکانی ترمان لەوێ تەواو بکەین ؟ وتی : ئەگەر ئێوە پێتان خۆش بێت قەیدی نیە . دەرچوون و کەوتنە پیاسە کردن ، لە ڕێگەدا (ابو نائلە) وتی : شەو نییە لەم شەوە بۆنخۆشتر ، (کعب) کەیفی دەهات ، وتی : بۆنخۆشترین ژنی عەرەب لای منە ، (ابو نائلە) وتی : مۆڵەتم دەدەیت بۆنێکی سەرت بکەم ؟ وتی : بەڵێ دەستی خستە ناو قژی بۆنی کردو وتی : بە هاوەڵەکانی چەند بۆنی خۆشە.

پاشان کەمێکی تر ڕۆشتن ، ئەنجا (ابو نائله) وتی : ئایا جارێکی تریش بۆنی بکەمەوە ؟ (کعب) وتی : بەڵێ : (ابو نائله) دەستی خستە قژی (کعب) تا توندگرتی و دەستی لێی گیربوو ، وتی: دوژمنی خوا بکوژن ، دایانە بەر شمشێر ، هەرمابوو نەمرد ، ئەنجا (محمد)ی کوڕی (مسلمه) پاچێکی هەڵگرت لە پشتیەوە چەقاندیە سەر سێبەندەی و خۆیدا بەسەریدا تا نووکی پاچەکە لەبەرموسەلأنیەوە دەرچوو ، (کعب)ی دوژمنی خوا هاوارێکی ئەوەندە توندی لێ بەرز بوەوەو ، هەموو قەلأکەی بەخەبەر هێناو مرد ، خەڵکی ناو قەلأ هەموویان ئاگریان داگیرساند ، مەفرەزەکە گەڕایەوە لە کاتی لێدانەکەیدا (الحارث) کوڕی (اوس) سەرە نوکی هەندێك لە شمشێرەکان کەمێك برینداری کردبوو بوو ، خوێنی لەبەر دەچوو ، کاتێك مەفرەزەکە گەیشتەوە (حرة العرض) سەیریان کرد (الحارث) یان لەگەڵدا نیە ، کەمێك وەستان سەیریان کرد واهات ، شوێنی جێگە پێیەکانیی کەوتبوو ، هەڵیانگرت ، تاگەیشتە (بقیع الغرقد) (الله اکبر) یان کردو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : یاخوا سەرفراز بن ، ئەوانیش وتیان : لەگەڵ تۆدا پێغەمبەری خوا ، ئەنجا سەری دوژمنی خوایان فرێدایە بەردەمی ، سوپاسی خوای کرد لەسەر ناوبردنی (کعب) ، ئەنجا تفی کردە سەر برینەکەی (حارث) چاك بووەوەو ئازاری نەما [1].

کە جولەکە بەکوشتنی (کعب)ی ستەمکاریان زانی ترس و سام و نیشتە دڵە سەختەکانیان و ، تێگەیشتن کە ئیتر پێغەمبەر لە بەکارهێنانی هێزدا سڵ ناکات لە کەسێك کە ئامۆژگاری دادی نەدا ، ڕێز لە بەرژەوەندی کۆمەڵگای ئیسلامەتی و ئاسایش و پەیماننامەکان نەگرێت ، بۆیە کەسیان نەیوێرا ورتەی لە دەمەوە دەبێت لەسەر کوشتنی (کعب) ، بەڵکو بێدەنگ بوون و ، وایان نیشاندا کە پابەندی پەیماننامەکان دەبن و ، ملیان کەچ کردو ، مارە ژەهراویەکان خێرا خۆیان کردەوە بەکونەکانیاندا بۆ خۆشاردنەوە.

بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەیەك یەکلابوەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو مەترسیانەی پێشبینی دەکرد لەدەرەوەی مەدینەوە ڕووی تێ بکەن ، موسڵمانەکان بەو شێوەیە کەمێك باری سەرشانیان لەناوەوە سووك بوو ، کەدەمێك بوو ئەگەری ئەوەیان دانابوو لە پڕێکدا دەستێك بوەشێنین .

---

[1] درێژەی ئەم بەسەر هاتەمان وەرگرتووە لە ( ابن هشام) ٢/٥١، ٥٢ ، ٥٣ ، ٥٤ ، ٥٥، ٥٦ـ ٥٧ ، هەروەها لە (صحیح البخاری ) ١/ ٣٤١ ، ٤٢٥ ، ٢/ ٥٧٧ ، هەروەها لە (سنن ابی داود) هەروەها لە (سنن ابی داود) لەگەڵ ( عون المعبود ) ٢/٤٢ ، ٤٣ ، و (زاد المعاد) ٢/٩١ .

## غەزای ( بحران )

ئەم غەزایە گروپێکی گەورەی گەڕۆك بوو سێ سەد جەنگاوەر دەبوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرۆکایەتی کردن لە مانگی (ربیعی دووەمی) ساڵی (٣)ی کۆچیدا بەرەو شوێنێك ناوی (بحران) بوو ، شوێنێکە لە (حیجاز) سەر بە ناوچەی (نزع)ە مانگی ڕەبیعی دووەم و پاشان مانگی جەمادی یەکەمیشی لە (ساڵی سێی کۆچی) لەوێ بردە سەر ، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە ، شەڕی تووش نەبوو[١].

## سریەکەی ( زید ) ی کوڕی ( حارثة )

ئەم سریەیە دواترین و سەرکەوتووترین سریەی گەڕۆکی شەڕ بوون کە موسڵمانەکان پێش ئوحود پێی هەستابن ، لەمانگی جەمادی دووەمی ساڵی (٣)ی کۆچیدا ڕوویدا.

درێژەی باسەکەم بەم شێوەیە ، دوای جەنگی بەدر قوڕەیشیەکان کەوتبوونە دڵە ڕاوکێ و پشێوی ، هاوین هات و وەرزی کاروانی ڕوەو شام نزیکتر بوەوە ، خەمێکی کەیان بۆ دروست بوو.

(صفوان)ی کوڕی (امیە) کە بۆ سەرۆکایەتیی کاروانی ئەمساڵی قوڕەیشیەکان بەرەو شام هەڵبژێردرا بوو ، وتی بەقوڕەیش: موحەممەدو هاوەڵەکانی ڕێگەی بازرگانیان لێ تێکداوین ، نازانین چی بکەین لەهاوەڵەکانی و ، ئەوانە کەنار دەریا جێ ناهێڵن ؟ خەڵکی کەناری دەریاش لەگەڵیانن و زۆربەشیان چوونەتە ناویانەوە ، نازانین لەکوێوە بڕۆین؟ ئەگەر لێرە دانیشن و هیچ نەکەین ماڵەکەمان دەخوێن و، هیچی نامێنێت ، ژیانی مەککەش بەندە بەبازرگانی هاوینەوە بۆ شام و بەزستانەوە بۆ حەبەشە.

لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە گفتوگۆی زۆر کرا ، (اسود)ی کوڕی (عبد المطلب) بە (صفوان)ی وت : لاشانی ڕێگەی کەنار دەریا بەردەو ڕێگەی عێراق بگرەبەر . ئەوە ڕێگەیەکی زۆر دوورو درێژەو دەبێت بەناو (نجد)دا بڕۆیت بەرەو شام و لە دووریەکی زۆرەوە لای ڕۆژهەلاتی مەدینە بگریت ، قوڕەیش هیچیان لە بارەی ئەو ڕێگەیەوە نەدەزانی ، (اسود)ی کوڕی (عبد المطلب) ئاماژەی کرد بۆ (صفوان) کە (فرات)ی کوڕی (حیان) لەخێڵی (بنی بکر بن وائل) بکاتە ڕێبەری و ڕێنوینی بکات بۆ ئەو سەفەرە.

---

[١] ابن هشام ٢/٥٠ ، ٥١ ، زاد المعاد ٢/٩١ جیاوازی هەیە لەسەر هۆی ئەم جەنگە ، وتراوە کە هەواڵگرانی مەدینە ، هەواڵیان دا بە پێغەمبەر ﷺ کە ( بنی سلیم) هێزێکی زۆریان کۆکردۆتەوە بۆ هەڵکوتانە سەر مەدینە و دەوروبەری ، وتراویشە: بەڵکو سوپاکەی بۆ قوڕەیش دەرچووە ، (ابن هشام) و (ابن القیم) باشی ئەم ڕایەیان کردووەو قسەیان لەسەر ڕای یەکەم نەکردوە ، چونکە ماڵەکانی (بنی سلیم) نا کەو ئەوناوچەی (نزع) بەڵکو دەکەونە (نجد) و زۆر دوورن لەناوچەی (نزع) ەوە .

کاروانەکەی قورەیش دەرچوو (صفوان)ی کوڕی (امیە) بەرپرسی بوو ، بەڕێگە تازەکەدا چوون ، بەڵام هەواڵی ئەم کاروانەو ئاراستەی ڕێگەکەش گەیشتەوە مەدینە ، ئەمەش بەشێوەیەك بوو ، (سلیط)ی کوڕی (نعمان) موسڵمان بوو بوو . لە دانیشتنێکی شەراب خواردنەوەدا دانیشتبوو ـ ئەوکاتە هێشتا شەراب حەرام نەکرابوو . لەگەڵ (نعیم)ی کوڕی (مسعود الاخصی) دا ئەوکاتە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو کاتێك کە سەرخۆش دەبێت و ، وردو درشتی ڕێگەی کاروانەکەو نەخشەکەی لەدەم دەرئەچێت ، دەسبەجێ (سلیط) خۆی دەگەیەنێتە لای پێغەمبەر ﷺ بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە .

خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ سەد سوارێك کۆدەکاتەوە بە سەرۆکایەتی (زید)ی کوڕی (حارثة الکلبي) سازیان دەکات و ، بەپەلەو لەناکاودا دەدەن بەسەر کاروانەکەدا . لەکاتێکدا کاروانچیان لەسەر کانیاوێکی خاکی (نجد) لایاندا بوو پێی دەڵێن (قردە) دایان بەسەر هەموو کاروانەکەدا ، (صفوان) و پاسەوانەکانی جگە لە ڕاکردن و خۆ قوتار کردن هیچیان بۆ نەمایەوە.

موسڵمانەکان ڕێبەری کاروانەکە (فرات)ی کوڕی (حیان) یان دەستگیر کرد ، وتراوە دوانی تریشی لەگەڵدابووە بڕێکی زۆر دەفری زیویان غەنیمەت کرد کە کاروانەکە هەڵی گرتبوو ، نرخی شتەکان بە سەدهەزار خەمڵێنرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ پاش دەرکردنی پێنج یەك هەموو دەستکەوتەکەی دابەشکرد بەسەر بەشداربوانی سریەکەداو لەوێشدا لەسەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ ، (فرات)ی کوڕی (حیان) موسڵمان بوو [1].

ئەمە کارەساتێکی سەخت و نەگبەتیەکی گەورەبوو لەدوای بەدر تووشی موشریکان بوو ، ئەوەندەی تر دڵەڕاوکێی قورەیش زیادی کردو خەم و پەژارە دڵی گرتن ، ئیدی لەبەردەمیاندا هیچ نەما جگە لەدوو ڕێگە ، یان ئەوەیە وازبهێنن لە ملهوڕی و لوتبەرزی خۆیان و ڕێگەی ئاشتی و ئاشتبوونەتەوە بگرنەبەر لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، یان دەبێت هەستن بەجەنگێکی سەرانسەریی وەها کە ڕۆڵ و پلەوپایەی جارانیان بۆ بگێڕێتەوەو ، هێزی موسڵمانان سەرکوت بکەن ، بەشێوەیەکی دەسەلاتیان نەهێڵێت لەم شوێن و ئەو شوێندا ، مەککە ڕێگەی دووەمی هەڵبژارد ، داواکاری تۆڵەکردنەوەو خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانەکاندا زیادی کرد بە خۆسازدانێکی تەواوەتی و، بەنیازی هەڵکوتانە سەر موسڵمانەکان لەماڵەکانی خۆیاندا ، ئەمانەو ئەو ڕووداوانەی پێشتریش ڕێ خۆشکەرێکی بەهێزبوون بۆ هەڵگیرسانی شەڕی ئوحود.

---

[1] ابن هشام ٢/٥٠ ، ٥١ فقه السيرة ل ١٩٠ ، رحمة للعالمين ٢/ ٢١٩ .

## ( غەزای ئوحود ) و
## خۆ ئامادەکردنی قورەیش بۆ شـەڕی تۆڵەسێن

مەککە ئاگر لەجەرگ و هەناوی بەربوو بەهۆی کارەساتی جەنگی بەدرو ئەو شکستە گەورەو کوژرانی پیاوماقوڵان و پاڵەوانەکانیانەوە، ئارەزووی تۆڵەو هەق سەندنەوەیان لەناخدا دەجوڵاندن ، تاڕادەیەك گریانیان لەسەر کوژراوانی بەدر قەدەغە کردبوو ، بەخێرایش نەچوون بەدەم دیلەکانیانەوە نەبادا موسڵمانەکان هەست بکەن بەڕادەی خەم و پەژارەی دڵیان.

پاش غەزای بەدر قوڕەیشیەکان ڕێککەوتن لەسەر هەستان بەجەنگێکی سەرانسەری دژ بەموسڵمانەکان بەشێوەیەك شیفای دڵیان بدات و، ئاگری دەروونیان دامرکێنێتەوە دەستیان کرد بەخۆسازدان بۆ ئەو جەنگە .

(عکرمە)ی کوڕی (ابو جهل) و (صفوان)ی کوڕی (امیە) و (ابوسفیان)ی کوڕی (حرب) و (عبداللە)ی کوڕی (ابی ربیعە) لە هەموو سەرکردەکانی تری قوڕەیش زیاتر دڵیان گەرم بوو بۆ ئەنجامدانی ئەو شەڕە.

یەکەم کارێك کردیان ئەوەبوو ئەو کاروانەی بەهۆیەوە جەنگی بەدر ڕوویدا دەستیان بەسەراگرت و، وتیان بەو کەسانەی ماڵیانی تێدابوو، ئەی گرۆی قوڕەیش، موحەممەد تاقیکردونەتەوە چاکترینی کەسەکانی ئێوەی کوشت ، بەم سامانە یارمەتیمان بدەن با جەنگی پێ بکەین لەگەڵ موحەممەددا ، بەڵکو تۆڵەی لێبکەینەوەو ، بەدەمیانەوە هاتن و ، فرۆشتیان بریتی بوو لە هەزار وشترو پارەکەش بایی پەنجا هەزار درهەم بوو ، لەم بارەیەوە خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ﴾ الانفال : ٣٦ واتە : بێباوەڕان پارەو ماڵی خۆیان خەرج دەکەن بۆلادان لەڕێگەی خودا ، ئەوانە پارەی خۆیان خەرج دەکەن و ، پاشان لە دواڕۆژدا دەبێتە پەشیمانی بۆیان و ژێریش دەکەون.

پاشان ڕێگەی خۆبەخشی کرایەوە بۆ هەرکەسێك حەزبکات ، لە حەبەشی و خێڵی کینانەو تیهامە بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین ڕێگەی هاندانیان گرتەبەر ، تاڕادەیەك (صفوان)ی کوڕی (امیە) هەستا بەفریودانی (اباغرە)ی شاعیر کە لە شەڕی بەدردا بەدیلی گیرا بوو ، پێغەمبەر ﷺ

بەبێ بەرامبەر بەری دابوو ، پەیمانی لێ وەرگرتبوو کە دژی نەوەستێتەوە (صفوان) کلاَوی نابوە سەر ئەم پیاوەکە هەستێت بەهاندانی خێڵەکان دژ بەموسڵمانەکان و ، بەڵێنی پێدابوو کە ئەگەر لە شەڕەکە بەزیندویی هاتەوە دەوڵەمەندی بکات ، ئەگەر مردیش کەفالەتی کچەکانی بکات ، ئیدی (ابو غرە) هەستا بەهاندانی تیرەکان بە شیعرەکانی و هەست و ناخی دەبزواندن ، هەروەها شاعیرێکی تریشیان هەڵبژارد بوو بۆ هەمان کار ناوی (مسافع)ی کوڕی (عبد مناف الجمحی) بوو.

(ابو سفیان) یش پاش گەڕانەوەی لە جەنگی (قاوت) و بێ ئومێد بوونی و زایەکردنی بڕێکی زۆر لە ئاڵف و قاوتی سوپاکەی لە هەموو کەسێك زیاتر هانی خەڵکی دەدا دژ بە موسڵمانەکان.

ئەوەی زیاتر قوڕەکەی خەست کردەوە ، ئەگەر ڕاست بێ بڵێین: ئەوەی بڵیسەی ئاگرەکەی زیاترکرد ئەو کارەساتە بوو کە لەم دواییدا بەسەر قوڕەیشدا هات لەڕێگەی سریەکەی (زید)ی کوڕی (حارث) و ئەو زیانە گەورەیە پشتی ئابووریی قوڕەیشی نوشتانەوە، ئەوەندە قاروخەفەتی خستبووە دڵیانەوە سنووری نەبێت ، ئیدی پەلە کردنی قوڕەیش بۆ یەکلایی کردنەوەی مەسەلەکە لەنێوان خۆیان و موسڵمانەکاندا زیاتری کرد.

## ژمارە و سەرکردایەتی سوپای قوڕەیش

کەساڵ هاتەوە مەککەییەکان ئامادەیی تەواویان وەرگرتبوو ، سێهەزار جەنگاوەر لە قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان و حەبەشیە موشریکەکان کۆببونەوە ، سەرکردەکانی قوڕەیش پێیان وابوو کە ژنان لەگەڵ خۆیاندا بەرن ، تا ئەوە کاریگەری زیاتر بێت بۆ ڕاکێشانی پیاوان و بەرگری کردن لەحورمەت و شەرەفیان ، ژمارەی ژنان لە شەڕەکەدا (١٥) بوو، بەهۆی سێ هەزار وشترەوە سوپاکەیان گوێزایەوە، دووسەد سوارچاکیش [١] بەدرێژایی ڕێگاکە لەئەم لاولای سوپاکەوە دەڕۆشتن، حەوت سەد قەڵغانی خۆپارێزیشیان پێ بوو.

## سوپای مەککە دەکەوێتە جوڵە

پاش ئەم ئامادەگییە ، سوپای مەککە کەوتەرێ بەرەو مەککە، ئاهو حەسرەتە کۆنەکە ئاگری بەردابوو لەجەرگیان و، ئەم شەڕە سوکنایی بەدڵدا دەهێنان .

---

[١] زاد المعاد ٩٢/٢ باسکراوە لە (فتح الباری) یشدا باسی سەد ئەسپ هاتووە ٧/ ٣٤٦ .

## هەواڵگریەکانی پێغەمبەر ﷺ

## هەواڵی جووڵەی دوژمنیان پێدەگات

(عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب) چاودێری جموجوڵ و ئامادەگی سەربازەکانی قوڕەیشی دەکرد هەرکە ئەم سوپایە کەوتە جووڵە، (عباس) نامەیەکی بەپەلەی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ، درێژەی دەنگوباسی سوپاکەی تێدا بوو.

نێرراوەکەی (عباس) بەپەلە کەوتەڕێ ، ئەوەندە خێرا ڕۆشت ماوەی نێوان مەککەو مەدینەی بە سێ ڕۆژ بڕی کە پێنج سەد کیلۆمەتر دەبێت ، نامەکەی دایە دەست پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی (قباء) بوو .

( ابی) کوڕی (کعب) نامەکەی بۆ خوێندەوە، فەرمانی پێدا کەنهێنی بپارێزێت و ، بەپەلە گەڕایەوە بۆ مەدینەو باسی مەسەلەکەی لای سەرکردەکانی کۆچکەران و ئەنساریەکان کرد.

## خۆ ئامادەکردنی موسڵمانان بۆ حاڵەتی ناکاو

ئاگاهی لەمەدینەدا لێ درا ، پیاوان هەمیشە چەکیان پێ بوو ، لەکاتی نوێژیشدا لێیان نەدەکردەوە نە بادا شتێك ڕوو بدات .

مەفرەزەیەکی ئەنساریەکان کە (سعد)ی کوڕی (معاذ) و (اسید)ی کوڕی (حضیر)یان تێدا بوو هەستان بەپاسەوانی کردنی پێغەمبەر ﷺ بەچەکەوە تا بەرەبەیان لەبەر دەرکەکەیدا دەوەستان .

لەسەر هەموو ڕێگەکانی دەرەوەی مەدینە مەفرەزەی چەکدار دانرابوون ، بۆ حاڵەتی ناکاویش چەند گروپێکی موسڵمانەکان . بۆ زانینی جموجوڵی دوژمن . هەڵدەستان بە چاودێری کردنی ئەو ڕێگاوبانەی کە لەوانەبوو موشریکان لێیەوە هێرش بهێنن بۆ سەر موسڵمانەکان .

## سوپای مەککە بەرەو قەڵاکانی مەدینە دەکەوێتە ڕێ

سوپاکەی قوڕەیش لەڕێگە سەرەکیە باوەکەی ڕۆژئاواوە کەوتەڕێ ، کەگەیشتنە ناوچەی (الابواء) ، لەوێدا (هند)ی کچی (عتبە) ، ژنی (ابو سفیان) پێشنیاری کرد گۆڕی دایکی پێغەمبەر ﷺ هەڵبدەنەوە ، بەڵام سەرکردەکانی قوڕەیش ڕێگەیان نەداو ، ترسان لە چارەنووسی خراپی هەستان بەو جۆرەکارانە .

پاشان سوپاکەی مەککە کەوتەوە ڕێ تا لە مەدینە نزیك بووەوە ، دۆڵی (العقیق)ی گرتەبەر پاشان لێیەوە لایدا بەرەو لای ڕاست، تا لەنزیك ئوحودەوە لەشوێنێکدا کاروانیان خست پێی دەڵێن (عینین) لە ناوەوەی (السبخة)دا ، لەسەر

جۆگە ئاوێکی دەمی دۆڵەکەدا کە دەکەوێتە باکوری مەدینەوە . رۆژی هەینی شەشی مانگی شەوالی ساڵی سێیەمی کۆچی لەم شوێنەدا ئۆردویان دروست کرد.

## ئەنجوومەنی راوێژکاری پێکهات بۆ دانانی نەخشەی بەرگری کردن

هەواڵگریەکانی مەدینە هەواڵەکانی مەککەیان یەك لە دوای یەك هێنا ، تادواین هەواڵ کە دروست کردنی سەربازگەکە بوو ، لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجومەنێکی بالاّی راوێژکاری دانا ، ئاڵوویری راوبۆچونەکانی تێدا کرابوو ، بۆ هەڵوێست وەرگرتن و، هەواڵی خەونێکی خۆی پێراگەیاندن و، فەرمووی: (وەڵلاّهی خودا بەخێری بگێرێت ئەمشەو خەونێکم بینی ، مانگایەکی سەربراوم بینی و ، بینیم نوکی شمشێرەکەم کەلێکی تێکەوتبوو ، هەروەها سەیرم کرد دەستم چوو بوو بەقەڵغانێکی پتەودا، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ خەونەکەی والێکدایەوە ، کە لەسەر برینی مانگاکە بریتیە لە شەهیدبوونی هەندێك لە هاوەڵەکانی و، کەلبوونی شمشێرەکەش بەپێکرانی پیاوێکی ئال و بەیتی خۆی لێکدایەوە ، قەڵغانەکەشی بەشاری مەدینە لێکدایەوە.

پاشان رای خۆی خستە بەردەست هاوەڵەکانی و پێ وابوو کە باشتروایە لە مەدینە نەرۆنە دەرەوەو، خۆیان لەقەلاّکانیدا پەنابدەن، ئەگەر موشریکان لە سەربازگەکەیاندا مانەوە ئەوا جێگەو رێگەیان زۆرخراپ دەبێت و هیچ سوودێکیشی نابێت ، ئەگەر هاتنە ناو مەدینەیشەوە موسڵمانان شەری کۆلاّن و کۆلاّنیان لەگەڵدا دەکەن و ، ژنانیش لەسەرماڵەکانەوە . ئەمە رای پێغەمبەر بوو (عبداللە)ی کوری (ابی) کوری (سلول) سەرکردەی دووروان کە بەسیفەتی یەکێك لە سەرکردەکانی خەزرەج لەوێدا ئامادە بوو، هەمان رای پێغەمبەری هەبوو ، وا دیاربوو هەماهەنگ بوونی رایەکەی لەگەڵ راوبۆچونەکەی پێغەمبەردا لەبەرئەوە نەبوو کە ئەو هەڵوێستە بەراست بزانێت ، بەڵکو بۆ ئەوەبوو تابتوانێت ژێر بەژێری خۆی لە شەرەکە بدزێتەوەو کەس پێی نەزانێت ، ویستی خوای گەورەش وابوو کەخۆی و هاورێکانی بۆ یەکەمجار لەبەردەم موسڵمانەکاندا ئابروویان بچێت و ، ئەو دەمامکەیان بەسەرەوە لاچێت کە بێباوەری و دووروویییەکەیانی حەشاردابوو ، موسڵمانەکانیشی لە تەنگەتاوترین ساتدا ئەو مارە ژاراویانە ببینن کە لەناو کارژو بەرگ و دەمامکەکانیاندا دەجولاّنەوە .

هەندێك لەو هاوەڵە دڵگەرمانەی کە ڕۆژی بەدریان لەکیس چوو بوو ، داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە بچێتە دەرەوەو ، زۆریان لێکرد تا ڕازی بێت ، تاوای لێهات یەکێکیان وتی : پێغەمبەری خوا ئاواتمان دەخواست بۆ ئەم ڕۆژەو لە خوا دەپاراینەوە کە بێتە دی ، ئەوەتا خوای گەورە بۆی هێناوین و نزیك بۆتەوە ، بڕۆ دەرەوە بۆلای دوژمنەکانت ، باوانەزانن لێیان دەترسین.

(حمزە)ی کوڕی (عبد المطلب)ی مامی پێغەمبەر خوا ﷺ سەرمەشقی ئەو دڵگەرمانە بوو ، پێشتریش بڕندەی شمشێرەکەی خۆی لە غەزای بەدرا دیبوو . وتی: بە پێغەمبەری خوا ﷺ : سوێندم بەو کەسەی قورئانی بۆ تۆ ناردووە دەم لە نان نادەم هەتا لە دەرەوەی مەدینەدا شەڕیان لەگەڵدا نەکەم.

پێغەمبەریش ﷺ لەبەردەم ڕای زۆرینەدا ڕایەکەی کشانەوەو ، ڕای گشتی جێگیر بوو ، کە چوونە دەرەوە لە مەدینە ، ڕووبەڕوو بوونەوە لە مەیدانی جەنگدا.

## بەش بەشکردنی سوپای ئیسلام و
## دەرچوونی بۆ مەیدانی جەنگ

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی هەینی بۆ خەڵکەکە کرد ، وتارێکی بۆدان و هانی دان بۆ خۆکۆکردنەوەو جیهاد کردن و ، هەواڵی پێدان کە ئەگەر ئارام بگرن سەردەکەون ، فەرمانی پێدان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ دوژمن ، خەڵکی بەوە دڵخۆش بوون .

پاشان نوێژی عەسری پێکردن ، خەڵکی لە هەمووولایەکەوە کۆبووبوونەوە ، پاشان چووەماڵەوە ، هەردوو هاوەڵەکەی (ابوبکر) و (عمر)ی لەگەڵدا بوو ، مێزەریان لەسەری پێچاو ، خۆشی چەکی بەست و ، دوو زنجیر بەستی لەبەر کردو شمشێری کردە مل و هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵك .

خەڵك چاوەڕوانی دەرچوونی پێغەمبەریان دەکرد ، (سعد)ی کوڕی (معاذ) و (اسید)ی کوڕی (حضیر)یش بە خەڵکەکەیان وتبوو : ئێوە پێغەمبەرتان ناچارکرد ﷺ بۆ دەرچوون لە مەدینە ، کارەکە بدەنەوە دەستی خۆی ، هەموویان پەشیمان بوونەوە لەو کارەی خۆیان ، کە پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە ، عەرزیان کرد : پێغەمبەری خوا بەڕاستی مەبەستمان سەرپێچی کردنی فەرمانی تۆ نەبوو ، چۆنت پێ خۆشە وابکە ، ئەگەر حەز دەکەیت لە مەدینە بمێنیتەوە بەو شێوەیە بکە ،

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەر پێغەمبەرێك جل و بەرگی شەڕی پۆشی نابێت لای بدات ، تا ئەو کاتەی خودا نێوان ئەوو دوژمنەکەی یەکلا دەکاتەوە [1].

پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی کرد بەسێ بەشەوە :

١. کەتیبەی کۆچکەران ، ئالآکەیانی دایەدەست (مصعب)ی کوڕی (عمیر)ی (العبدری)

٢. کەتیبەی خێڵی ئەوس لە ئەنساریەکان ، ئالآکەیانی دایەدەست (اسید)ی کوڕی (حضیر)

٣. کەتیبەی خێڵی خەزرەج لەئەنساریەکان، ئالآکەیانی دایەدەست (حباب)ی کوڕی (المنذر)

سوپاکە لەهەزار چەکدار پێکهاتبوو ، سەد زنجیربەست و پەنجا ئەسپ سورایان تێدابوو [2]، وتراویشە کەهیچ ئەسپ سواریان لەگەڵدا نەبوە، (ابن ام کتوم)ی بۆ نوێژکردن بەجێهێشت لە مەدینە بەسەر ئەوانەوە کەمابوونەوە ، ئەنجا فەرمانیدا بەڕێکەون ، سوپاکە بەرەو باکوور کەوتەڕێ ، هەردوو (سعد)ە کە بە زنجیربەندەوە بەبەردەم پێغەمبەردا ڕۆشتن کە لە (ثنیة الوداع) تێنەپەڕین پێغەمبەر ﷺ کەتیبەیەکی چەکداری پۆشتەو پەرداخی بینی بەجیا لەسوپاکە بەڕێوە دەهاتن ، فەرمووی : ئەوانە کێن ؟ هەواڵی درایە ئەوانە جولەکە هاوپەیمانەکانی خەزرەجن [3]، حەزدەکەن لەگەڵتاندا بەشداری شەڕی موشریکان بکەن ، فەرمووی : ئایا ئەوانە موسڵمان بوون ؟ وتیان : نەخێر ، ئیدی پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو یارمەتی لە کافران وەربگرێت بۆ شەڕکردن لەگەڵ موشریکاندا.

## نمایش کردنی سوپاکە

کاتێك گەیشتە شوێنێك پێی دەڵێن: (الشیخان) سەیرێکی سوپاکەی کرد ، هەرچیەکی بینی کەم تەمەن بوو کەبەرگەی ئەو شەڕە ناگرێت گێڕایەوە، ئەوانە ئەم کەسانەیان تێدابوو ، (عبدالله)ی کوڕی (عمر)ی کوڕی (خطاب) و (اسامە)ی کوڕی

---

[1] / ئەحمەدو نەسائی و حاکم و (ابن اسحاق) گێڕاویانەتەوە .

[2] / ( ابن القیم) لە (الهدی ٢/٩٢) دا ئەمەی وتووە ، (ابن حجر) دەڵێت ئەمە هەڵەیەکی ئاشکرایە ، (موسی) کوڕی (عقبە) سوورە لەسەر ئەوەی هیچ سوارێکیان لەگەڵدا نەبووە ، (واقدی) یش دەڵێت پێغەمبەر ﷺ ئەسپەکەی (ابی بردە) یان لەگەڵدا بووە ، (فتح الباری) ٧/ ٣٥٠.

[3] / ( ابن سعد) ریوایەتی کردووە ، تیایدا هاتووە ئەو تاقمە (بنی قینقاع) بوون ٢/٣٤ ، ڕوونیشە کەپێشتر (بنو قینقاع) لەناوچەکە دەرکرابوون.

(زید) و (اسید)ی کوڕی (ظهیر) و (زید)ی کوڕی (ارقم) و (عرابه)ی کوڕی (اوس) و (عمرو)ی کوڕی (حزم) و (ابوسعید الخدری) و (زید)ی کوڕی (حارثة)ی ئەنساری و (سعد)ی کوڕی (حبه)و، لەناویاندا باسی (براء) ی کوڕی (عازب)یش کراوە، بەڵام بوونی فەرموودەکەی لە بوخاریدا بەڵگەیە لەسەر بەشداری کردنی لەو غەزایەدا.

پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دابە (رافع)ی کوڕی (خدیج) و (سمرە)ی کوڕی (جندب) هەر چەندە منالیش بوون ، لەبەرئەوەی (رافع) لە تیر هاویشتندا کارامە بوو ، (سمرە) وتی : من بەهێزترم لە (رافع) و دەیدەم بە زەویدا ، کە ئەو هەواڵە درا بە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدان زۆرانبازیەك بگرن ، زۆرانبازیان گرت (سمرە) ، (رافع)ی دا بەزەویدا ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بەویشدا بەشداری بکات .

## مانەوە لەنێوان ئوحود و مەدینەدا

لەوێدا بوون ئێوارەیان بەسەرا هات ، نوێژی شێوانی کردو ، پاشان نوێژی خەوتنانیشی کردو ، لەوێدا مایەوە . پەنجا پیاوی هەڵبژارد بۆ پاسەوانی سەربازگەکەو دەورو خولی بدەن ، (محمد)ی کوڕی (مسلمه)ی ئەنساری سەرکردەیان بوو ، پاڵەوانی سریەکەی کوشتنی (کعب)ی کوڕی (اشرف) ، (ذکوان)ی کوڕی (عبد قیس) یش بە تایبەتی پاسەوانیی پێغەمبەری دەکرد ﷺ .

## یاخی بوونی ( عبداللە ) ی کوڕی ( ابی ) و هاوڕێکانی

پێش کەمێك لەهەڵهاتنی بەرەبەیان دەرچوو ، کە گەیشتە (شوط) نوێژی بەیانی کرد ، زۆر نزیکبوو لە دوژمنەوە، دەیبینین و ئەوانیش ئەمیان دەبینی ، لەوێدا (عبدالله)ی کوڕی (ابی) دووڕوو یاخیبوو، بەخۆی و سێسەد جەنگاوەرەوە پاشەکشەی کرد کە دەیکردە سێیەکی سوپاکەو پێیان وتن: نازانین لەسەرچی خۆمان بدەین بەکوشت ؟ خۆی واپیشاندا کە ناڕەزایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وازی لە ڕاکەی ئەو هێناوەو بەگوێی خەڵکی تری کردووە.

گومانیش نەبوو لەوەدا کەئەو خۆ تاککردنەوەیە لەبەرئەو هۆیە نەبوو پیشانی دا گوایە پێغەمبەر ﷺ وازی لەڕاکەی ئەو هێناوە ، وەگەرنا دەرچوونی لەگەڵ سوپاکەی پێغەمبەردا ﷺ هیچ مانایەکی نەبوو ، بگەرە ئەگەر هۆیەکەی ئەوە بوایە هەر لەسەرەتاوە لەسوپاکەی جیادەبووەوە، بەڵکو مەبەستی سەرەکی لەو یاخی بوونە - لەوکاتە هەستیارەدا - ئەوەبوو پشێوی و شپرزەیی لەناو سوپای

موسڵمانەکاندا بنێتەوەو لەبەرچاو گوێی دوژمنەکانیاندا زۆربەی سوپاکە لە پێغەمبەر ﷺ بتەکێتەوەو، ئەوەشی بەدەوریدا دەمێنێتەوە ورەیان بڕوخێت و ، دوژمنیش لەبەرامبەردا ورەی بەرزبێتەوەو، بەو دیمەنە سەریان بڵندبێت و زوو هەڵمەت بهێنن بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە دڵسۆزەکانی و ئنجا کەش و هەوا بڕەخسێتەوە بۆ گەڕانەوەی سەرۆکایەتی بۆ ئەو دووڕووەو هاوڕێکانی.

خەریکبوو کابرای دووڕوو لەکارەکەیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت دوو کۆمەڵی ناو موسڵمانەکانیش (بنو حارثة) لەخێڵی (اوس) و (بنومسلمة)ش لە (خەزرەج) شکست بهێنن ، بەڵام خوای گەورە ڕاگیری کردن ، پاش ئەو شپرزەییە کە خەریکبوو بگەڕێنەوەو پاشەکشە بکەن دڵیان دامەزرایەوە ، لەوێدا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴾ ال عمران:١٢٢ واتە : خەریکبوو دوو دەستە لەئێوە پەشیمان ببنەوە ، بەڵام خوا یارو یاوەریان بوو ، دەبا ئیمانداران هەرپشت بەخوا ببەستن.

(عبدالله)ی کوڕی (حرام) یش - باوکی جابر - هەوڵیدا ئەو دووڕووانە بە ئەرکی خۆیان بیربخاتەوە لەو بارودۆخە ناسکەدا ، شوێنیان کەوت بەتانەو تەشەر لێدان و ، هانیدان بەگەڕانەوە بۆناو سوپاکەو پێی دەوتن : وەرن لەپێناوی خوادا شەڕ بکەن یان هیچ نەبێت بەرگری لەخۆتان بکەن ، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە شەڕ دەکەن نەدەگەڕاینەوە ، ئەنجا (عبدالله)ی کوڕی (حرام) وازی لێهێنان و پێی وتن : خوا لەوەولاترتان ببات ، دوژمنانی خوا ، خوای گەورەیش هەرگیز پشتی پێغەمبەرەکەی بەرنادات.

خوای گەورە لەبارەی ئەو دووڕووانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالاً لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾ ال عمران : ١٦٧ واتە : با ئەو دووڕووانە بزانن کەپێیان گوترا وەرن شەڕ بکەن لەپێناوی خوادا ، یان هیچ نەبێت بەرگری بکەن ، وتیان ئەگەر شەڕمان بزانیبایە شوێنتان دەکەوتین ، ئەوانە لەکوفرەوە زیاتر نزیکن تا لە باوەڕ ، ئەوەی بە دەمیان دەیڵێن ئەوە نیە کە لە دڵیاندایە ، خودای گەورە دەزانێت چیان لەناخدا حەشارداوە.

## پاشماوەی سوپای ئیسلام بەرەو ئوحود

پاش ئەم یاخی بوون و کشانەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی هەستاند ـ کە حەوت سەد جەنگاوەر دەبوون ـ بەڕێکەوتن بەرەو دوژمن ، سوپای دوژمن لەنێوان ئەمان وکێوی ئوحوددا لەچەند شوێنێکدا بارگەیان خستبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چ پیاوێك دەتوانێت لەم نزیکانەوە دەرمان کات لە ڕێگەیەکەوە بەسەریاندا نەڕۆین؟

(ابو خثیمة) وتی: من دەتوانم پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان ڕێگەیەکی کورتی هەڵبژاردو بەرەو ئوحود بەناو (حرە)ی (بني حارثة)و مەزراکانیاندا تێدەپەڕیو ، سوپای موشریکانی دەخستە پشتی خۆیەوەو بەدیوی ڕۆژئاوادا.

سوپای موسڵمانەکان لەو ڕێگەیەدا تێپەڕی بەلای باخی (مربع)ی کوڕی (قیظي) کە دووڕوویەکی کوێر بوو ـ کە هەستی بەهاتنی سوپاکە کرد بەمشت خۆڵی هەوا دەدا بە ڕووی موسڵمانەکانداو ، دەیوت: ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوایت ڕێگەت نادەم بچیتە ناو باخەکەمەوە ، چەند موسڵمانێك پەلاماریان دایە بیکوژن ، پێغەمبەر فەرمووی : مەیکوژن ئەو چاوو دڵی کوێر بۆتەوە.

پێغەمبەر ﷺ چووە ناوەوە ، تاگەیشتە شیوەکەی کێوی ئوحود ، بەو شێوەیە سوپای دوژمن کەوتە نێوان موسڵمانەکان و شاری مەدینەوە.

## نەخشەی بەرگری

لەوێدا پێغەمبەر ﷺ هێزەکەی کۆکردەوە ، ڕیزی کردن بۆ شەڕ ، مەفرەزەیەکی تیرهاوێژی کارامەی لێ هەڵبژاردن ، پەنجا کەس دەبوون ، (عبدالله)ی کوڕی (جبیر)ی کوڕی (النعمان)ی ئەوسی بەدری کردە بەرپرسیان ، فەرمانی پێدان لەسەر گردێك کۆببنەوەو کەدەکەوێتە بەشی باشووری شیوی (قناة) لەدواییدا بەشاخی تیرهاوێژەکان ناوی دەرکرد ـ دەکەوتە باشووری سوپای موسڵمانەکانەوە ، نزیکەی سەدو پەنجا مەتر لە بارەگای سوپای موسڵمانەکانەوە دوور بوو .

مەبەست لەوەش ئەوچەند وشەیە بوو کەپێغەمبەر ﷺ ئاراستەی تیر هاوێژەکانی کردو فەرمووی بەسەرکردەکەیان : بەتیر هاوێشتن ئەسپ سوارەکانمان لێ دووربخەرەوە ، نەبادا لەپشتەوە بدەن بەسەرماندا ، شەڕمان بردەوە یان ژێرکەوتین شوێنی خۆت بەجێ مەهێڵە نەبادا لەڕێگەکەی تۆوە بدەن بەسەرماندا [1] ، پاشان فەرمووی بە تیر هاوێژەکان : پشتەوەمان بپارێزن ، ئەگەر بینیتان کوژراین مەیەن بەدەممانەوە ، ئەگەر بینیشتان دەستکەوت کۆدەکەینەوە بەشداری مەکەن

---

[1] ابن هشام ٦٥/٢ ، ٦٦ .

[2] لە ڕیوایەتێكی بوخاریدا هاتووە ، فەرموویەتی: ئەگەر ئێمەتان دی پەلەوەر سەری هەڵكەندین شوێنەكەتان جێ مەهێڵن تا دەنێرم بەشوێنتاندا ، خۆ ئەگەر ئێمەتان دی ئەوانمان فڕاندو چووین بەسەریاندا ، شوێنی خۆتان جێمەهێڵن تا دەنێرم بەدواتاندا [3] .

بەدانانی ئەو گرووپە لەسەر شاخەكەو پێدانی ئەو فەرمانە توندە سەربازیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو تەنها كەلێنەشی گرت كە لەوانەوە بوو ئەسپ سواری بێ باوەڕەكان دزەی لێوە بكەن بەرەو ڕیزی موسڵمانەكان و گەمارۆیان بدەن.

سەبارەت بەپاشماوەی سوپاكەی ، (منذر)ی كوڕی (عمرو) لەسەر باڵی ڕاست دانا ، (الزبیر)ی كوڕی (عوام) یشی لەسەر باڵی چەپ دانا بە هاوپشتی (مقداد)ی كوڕی (اسود) (الزبیر) كاری ڕووبەڕووبنەوەی ئەسپ سوارەكانی (خالد)ی كوڕی (ولید)ی پێ سپێرا بوو، لەپێشەنگی ڕیزەكانیشدا كۆمەڵێك پیاوی هەڵبژاردەی ئازای لە موسڵمانەكان دانا كەلەناو خەڵكدا بە زبری و پاڵەوانێتی ناویان دەركردبوو ، ئەوانەی كە سەنگ و قورسایی سەربازییان هەبوو.

بەڕاستی نەخشەكەی پێغەمبەر ﷺ نەخشەیەكی دانایانەی وردبوو ، لێهاتوویی سەركردەیەتی سەربازی پێغەمبەری تێدا دەردەكەوت ﷺ كە هەرگیز ناكرێت بۆ هیچ سەركردەیەك هەرچەندە شیاوو لێهاتووبێت بتوانێت نەخشەیەكی پتەوترو وردتر لەوەدا بنێت ، باشترین مەیدانی شەڕەكەی هەڵبژارد ، لەگەڵ ئەوەشدا كەدوای دوژمن چوە ئەوێ ، پشت و لای ڕاستی خۆی بەشاخەكە پاراست ، لای چەپ و پشتی خۆیشی بەوە پاراست . كاتێك كە شەڕ هەڵدەگیرسێت بە پڕكردنەوەی ئەو تەنها كەلێنەی كە لە ڕیزی موسڵمانەكاندا هەبوو ، سەربازگەكەیشی لە شوێنێكی بەرزدا دانا تاپاڵی پێوەبدا ئەگەر هات و توشی شكست بوون و ، پەنا نەبات بۆ هەڵاتن و بكەوێتە دەستی دوژمنەكانی و دیل بكرێن و ئەگەر دوژمنان بۆی سەركەوتن زیانی گەورەیان پێ بگەیەنێت ، دوژمنەكانیشی ناچاركرد كە لەشوێنێكی نزمدا سەربازگە دابنێن بەشێوەیەك زۆرگران بێت كەهیچ تالآنیەكی سەركەوتنەكەیان دەستكەوێت ئەگەر سەركەوتن و ، بەزەحمەت بتوانن دەربچن ئەگەر ژێركەوتن ، كەمی ژمارەكەشی بە هەڵبژاردنی كۆمەڵە پیاوێكی هەڵبژاردەی ئازاو دیار قەرەبوو كردەوە .

بەو شێوەیە سوپاكەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی شەممە حەوتی مانگی شەوالی (٣)ی كۆچیدا ڕیزی بەست .

---

[2] (احمد) و (طبراني) و (حاكم) لە ( بان عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە ، بڕوانە (فتح الباري)٧/٣٥٠.
[3] صحيح البخاري ، كتاب الجهاد ١/ ٤٢٦ .

## پێغەمبەر ﷺ گیانی ئازایەتی دەکا بەبەری سوپاکەیدا

پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا شەڕ نەکەن هەتا فەرمانیان دەداتێ ، دوو زنجیر بەندی پۆشی و هانی هاوەڵەکانیدا بۆ شەڕ کردن و دان بەخۆداگرتن و توندوتۆڵی لە ڕووبەڕوو بوونەوەداو دەستی کرد بەهاندانی هاوەڵەکانی بەگیانی دڵ گەرمی و ئازایەتی ، هەتا شمشێرە بڕندەکەی خۆی دەرهێناو بانگی کردە هاوەڵانی فەرمووی : کێ بەهەقی خۆی ئەم شمشێرە هەڵدەگرێت ؟ چەند پیاوێك هەستان وەری بگرن ، لەوانە (علی) کوڕی (ابي طالب) و (الزبیر)ی کوڕی (عوام) و (عمر)ی کوڕی (خطاب) ، هەتا (ابو دجانە)ی کوڕی (سماك)ی کوڕی (خرشە) بۆی هەستا ، وتی: پێغەمبەری خوا هەقەکەی چیە؟ فەرمووی: ئەوەندە بدەی لە دوژمنان تا لار دەبێتەوە ، وتی : من بەهەقی خۆی هەڵی دەگرم ، پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرەکەی دایە .

(ابو دجانە) پیاوێکی ئازابوو ، لەجەنگدا دزەی دەکرد ، پەڕۆیەکی سووری هەبوو هەرکاتێك لەسەری ببەستایە خەڵکی دەیزانی تامردن شەڕ دەکات، کە شمشێرەکەی وەرگرت بەو پەڕۆسوورە سەری بەست و، دەستیکرد بەخۆ ڕاوەشاندن لەنێوان هەردوو سوپاکەدا ، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە ئەو ڕۆشتنەیە کە خودا پێی ناخۆشە جگە لەم شوێنە.

## ڕێکخستنی سوپاکەی مەککە

موشریکانیش بەپێی سیستمی ریزبەندی سوپاکەیان ڕێکخست سەرکردایەتی گشتی بەدەست (ابی سفیان)ی کوڕی (حرب)ەوە بوو ، کە لە ناوەڕاستی سوپاکەدا وەستابوو ، لای ڕاستەوە (خالد)ی کوڕی (ولید) یان دانا لەو کاتەدا موشریك بوو - لەلای چەپیشەوە (عکرمە)ی کوڕی (ابی جهل) یان دانابوو ، جەنگاوەرانی پیادەش (صفوان)ی کوڕی (امیە) سەرۆکیان بوو ، سەرکردەی تیر هاوێژەکانیشیان (عبدالله)ی کوڕی (ابی ربیعە) بوو.

ئاڵاکەش بەدەست مەفرەزەکەیەوە بوو لەخێڵی (بنی عبدالدار) ئەمەش پلەو پایەی ئەوان بوو هەر لەوکاتەوە (بنو عبد المناف) لەنێوان خۆیاندا ئەو پلەوپایەیان دابەشکرد کەلە (قصی) کوڕی (کلاب)ە وە بۆیان مابووەوە - هەروەکو لەسەرەتادا باسمان کرد - کەس لەوەدا ململانێی لەگەڵدا نەدەکردن ، وەکو پابەندبونێك بەمیراتێکەوە کە پشتاوپشت بۆیان مابووەوە ، بەڵام سەرکردەی گشتی ابو سفیان - ئەوەی بیرخستنەوە کە لە بەدردا تووشی (قریش) بوو کاتێك کە هەڵگری ئاڵاکەیان (نضر)ی کوڕی (الحارث) بەدیل گیرا ، بۆ ڕق هەستاندن و

ورووژاندنیان وتی : خێڵی (بنی عبد الدار) لە ڕۆژی بەردا ئاڵاکەی ئێمەتان سەرشۆڕ کردو بینیتان چیمان بەسەرا هات ، خەڵك دەست لە ئاڵاکەی دەوەشێنرێت کە ئەما ئەوانیش نامێنن ، جا یان ئەوەیە ئاڵاکەمان بەرز ڕابگرن ، یان بیدەنەوە دەستی خۆمان ئێمە دەیپارێزین .

(ابو سفیان) لەئامانجەکەیدا سەرکەوتوو بوو ، خێڵی (بنو عبدالدار) زۆر بە توندی لەقسەکەی (ابو سفیان) سەغڵەت بوون خەریکبوو هەستن بۆی و هەڕەشەیان لێکردو، وتیان پێی: ئێمە ئاڵاکەمان دەدەینەوە دەست تۆ ؟ سبەینێ دەبینی لە کاتی شەڕدا چی دەکەین، ئەوەبوو لەشەڕەکەدا مانەوە هەتا تاك و تەرایان کوژرا.

## مانۆڕێکی سیاسیانە لەلایەن قورەیشەوە

پێش دەست پێکردنی جەنگەکە قورەیش ویستی دووبەرەکی بخاتە ناو ڕیزی موسڵمانەکانەوە (ابو سفیان) پیاوێکی نارد بە ئەنساریەکانی وت : وازیان لێ بهێنن با شەڕ لەگەڵ کەس و کارەکانی خۆماندا بکەین و واز لە ئێوە دەهێنین و ، پێویستمان بەشەڕی ئێوە نیە، بەلاَم ئەم هەوڵە چ سوودێکی هەیە لەبەردەم باوەڕێکدا کێو بەچۆکدا دەهێنێت ، ئەنساریەکان بەتوندی ڕەتیان دایەوەو قسەی خراپیان پێ وت .

کاتژمێری سفر نزیك بوەوە هەردوولا لەیەکتر نزیك بوونەوە ، قورەیش بۆ هەمان مەبەست هەوڵێکی تریان دایەوە ، بەکرێگیراوێکی خیانەتکار هاتە دەرەوە بەناوی (ابا عامر الفاسق) ناوەکەی (عبد عمرو)ی کوڕی (صیفی) بوو ، بە (راهب) ناودەبرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوینا (فاسق) لەجاهلیەتدا سەرۆکی خێڵی (اوس) بوو، کە ئیسلام هات ئەم لێی هەڵگەڕایەوەو ، بەئاشکرا دژایەتی پێغەمبەری کرد ﷺ لەمەدینە چوە دەرەوە بۆلای قورەیش و دژ بە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەدان بۆ ئەوەی شەڕی لەگەڵدا بکەن، وادەی دابوو بەقورەیشیەکان کە ئەگەر خێڵەکەی بینیان دەست بەجێ شوێنی دەکەون قورەیشیش مەیلیاندا بەلایدا .

یەکەم کەس کە هاتە دەرەوە بۆ موسڵمانەکان لەناو ئەحابیشدابوو لەگەڵ دوو کۆیلەی مەککەییدا ، (ابوعامر) خێڵەکەی ناسیەوەو هاواری لێکردن و ، وتی : ئەی خێڵی ئەوس ، من ( ابو عامر)م ، وتیان : خوا لە ئێمەت بسێنێت هەی فاسق ، (ابو عامر) وتی : خێڵەکەم دوای من تووشی شەڕ بوون کە شەڕ دەستی پێکرد بە توندی شەڕی لەگەڵدا کردن و بەردبارانی کردن .

بەم شێوەیە قوڕەیش لەهەوڵی دووەمیشدا شکستی هێنا ، کەبتوانێت دوو بەرەکی بخاتە نێوان ئیماندارانەوەو ئەم کارەشیان بەڵگەبوو لەسەرئەو ترس وهەیبەتەی کە لەموسڵمانەکانیان دەکرد ، لەگەڵ زۆری و گەورەیی چەك و تفاقی جەنگیان.

## هەوڵەکانی ژنانی قوڕەیش لە دڵ گەرم کردندا

ژنانی قوڕەیش بەئەندازەی خۆیان لەشەڕەکەدا بەشداریان کرد ، (هند)ی کچی (عتبە) هاوسەری (ابو سفیان) دەیجولاندن ، ژنان بەناو ریزەکاندا دەهاتن و دەچوون و دەفیان لێدەدا ، پیاوانیان دەوروژاند ، هانیان دەدان بۆ شەڕکردن ، باسی قارەمانێتیان بۆدەکردن ، خەڵکە کۆست کەوتوو دڵبریندارەکانیان دەبزواند ، جار جارەش ئالاّ هەڵگەرەکانیان دەدواندو دەیانوت :

وَيهـــا بَني عبـــد الدار وَيهـــا حُمـــاة الاديَـــار

ضَربـــاً بِكُـــلِ بَتّـــار

جارێکیش هانی خێڵەکەی خۆیان دەدا بۆ شەڕکردن و شیعریان دەوت :

ان تُقبِلـــوا نعُـــانق وَنَفـــرِشُ النمَـــارِق

او تُدبِـــروا نُفـــارِق فِـــراقَ غَيـــر وامِق

## یەکەم سووتەمەنی جەنگەکە

هەردوو سوپاکە لێك نزیك بوونەوە ، وردە وردە جەنگ دەستی پێکرد ، یەکەم سووتەمەنی شەڕەکە ئالاّ هەڵگری موشریکان (طلحة) کوڕی (ابي طلحة العبدري) بوو ، ئازاترین سوارچاکی قوڕەیش بوو ، موسڵمانەکان ناویان نابوو بەرانی کەتیبەکە ، سواری وشترێك بووبوو ، بانگەشەی کرد بۆ شەڕە شمشێر ، لەبەر ئازایەتی کەس نەیوێرا لێی نزیك ببێتەوە ، بەلاّم (الزبير) بۆی چووە پێشەوە ، نەیهێلاّ دەست بکاتەوە وەك شێر هەڵی کوتایە سەری بۆ سەر وشترەکەی و ، فڕێدایە خوارەوە ، دای بەزەویدا بەشمشێرەکەی سەری بڕی .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم زۆرانبازیە کەم وێنەیەی بینی (الله اكبر)ی کردو موسڵمانەکانیش بەدوایدا وتیانەوەو ، دەست خۆشی کرد لە (الزبير)و لەبارەیەوە فەرمووی : هەموو پێغەمبەرێك حەواریەکی هەیە ، حەواریەکەی من (زبير)ە [١]

---

[١] خاوەنی (السيره الحلبيه) باسی کردووە ٢/١٨.

# گەرم بوونی جەنگ لە دەوری ئالاّ هەڵگرەکە و لەناوبردنی

پاشان جەنگ هەڵگیرسا ، شەڕ گەرم بوو لەنێوان هەردوولادا، لە هەموولایەکی مەیدانەکەوە هەرابوو ، قورسایی شەڕەکە بەدەوری ئالاّهەڵگەرەکەی موشریکەکاندا هەڵدەسوڕا ، دوای کوژرانی (طلحة)ی سەرکردەیان یەکێکی دیکە لە (بنو عبدالدار) کەناوی (عثمان) بوو ئالاّکەی هەڵگرت و هاتەناو مەیدانی جەنگەکەوە دەیوت :

ان على أهل اللواء حقـاً ان تخضب الصعدة أوتندقـا

(حمزة) هەڵی کوتایە سەری ، شمشێرێکیدا لەشانی و دەستی پێوە قرتاند تا ناوکی هەڵدرێت و سیەکانی دەرکەوتن.

پاشان (ابو سعد)ی کوڕی (ابو طلحة) ئالاّکەی هەڵگرت (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) یەك تیری دا لە ملی ، زمانی دەرپەڕییە دەرەوەو دەسبەجێ مرد ، وتراویشە (ابو سعد) هاتۆتە دەرەوە بۆ زۆرانبازی (علی) کوڕی (ابي طالب) بۆی چووەتە دەرەوە ، پاش دوولێدان (علی) لێیداوەو کوشتویەتی .

پاشان (مسافع)ی کوڕی (طلحة)ی کوڕی (ابی طلحة) ئالاّکەی بەرزکردەوە ، (عاصم)ی کوڕی (ثابت)ی کوڕی ((ابي الافح) تیرێکی لێداو کوشتی ، پاش ئەوە (کلاب)ی برای ئالاّکەی هەڵگرت (الزبیر)ی کوڕی (عوام) هەڵی کوتایە سەری کوشتی ، پاشان (الجلاس)ی برایان ئالاّکەی هەڵگرت ، (طلحة)ی کوڕی (عبدالله) لێی داو کوشتی وتراویشە (عاصم)ی کوڕی (ثابت)ی کوڕی (ابی الافلح) یەك تیری لێداو کوشتی .

ئەوانە شەش کەس بوون لەیەك ماڵدا ، ماڵی (ابي طلحة) (عبدالله) کوڕی (عثمان) لەخێڵی (بنی عبدالدار) هەموویان بەدەوری ئالاّکەی بێ باوەڕاند کوژران . پاشان (ارطأة) کوڕی (شرحبیل) لە (بنی عبدالدار) ئالاّکەی هەڵگرت ، (علی) کوڕی (ابي طالب) کوشتی ، وتراویشە: (حمزە) کوشتویەتی . پاشان (شریح)ی کوڕی (قارظ) هەڵی گرت ، ئەویش (قزمان) کوشتی ئەو پیاوە دووڕوو بوو لەبەر خێلگەریی لەگەڵ موسڵمانەکاندا شەڕی دەکرد نەك بۆ ئیسلام - پاشان (ابو زید عمرو) کوڕی (عبد مناف العبدری) ئالاّکەی هەڵگرت ، (قزمان) ئەویشی کوشت ، پاشان کوڕێکی (شرحبیل) هەڵی گرت (قزمان) ئەویشی کوشت.

ئەوانە دە کەس بوون لە (بنی عبدالدار) ئالاّ هەڵگربوون - سەروبەر لەناوچوون - کەسیان نەما ئالاّکە هەڵگرێت ، غولاّمێکی حەبەشی ناوی (صواب) بوو ئالاّکەی هەڵگرت ، ئازایەتیەکی کەم وێنەو زیاتری نواند کە پێشتر هەڵیان گرت و کوژران ، شەڕی کرد تا هەردوو دەستی قرتێنرا ، خۆیدا بەسەر ئالاّکەو بەمل گرتی نەبادا بکەوێت تا ئەوە بوو کوژرا ، ئەم غولاّمە لەوکاتەدا دەیوت : خوایە ئەریٚ هیچ بەهانەیەك ماوە ، بەڕاستی بەهانە نەما.

پاش ئەوەی غولاّمەکە کوژرا ، ئالاّکە کەوتە سەرزەوی ، کەس نەما هەڵی بگرێت تاکۆتایی شەڕەکە لە زەویدا بوو.

## شەڕ لە شوێنەکانی تردا

لەکاتێکدا کە قورسایی جەنگەکە بەدەوری ئالاّکەدا بوو، شەڕ لە شوێنەکانی تریشدا گەرم بوو ، گیانی باوەڕ لەناو ئیمانداراندا جۆشی دەخوارد ، وەك شالاّوی لافاو هەڵمەتیان دەبردو هیچ بەربەستێك لەبەردەمیاندا خۆی ڕانەدەگرت و دەیانوت : (بمرن ، بمرن) ئەمە دروشمیان بوو لەجەنگی ئوحوددا .

(ابو دجانە) بەپەرۆ سوورەکەی سەریەوە هات ، شمشێرەکەی پێغەمبەری خوای بەدەستەوە بوو ﷺ سوور بوو لەسەر پێدانی هەقی شمشێرەکە ، ئەوەندە شەڕی کرد چوە ناویانەوە ، هەر موشرێکێکی پیٚ بگەیشتایە دەیکوشت ، درزو شلۆقی خستە ناو ڕیزی موشریکانەوە ، (زبیر)* ی کوڕی (عوام) دەڵێت : شتێك لە دڵمدا دروست بوو کاتێك داوام کرد لەپێغەمبەر ﷺ شمشێرەکەم بداتیٚ و نەیدامیٚ ، کەچی دایە دەست (ابو دجانە) لەدڵی خۆمدا وتم : بەکوڕی (صفیە)ی پوریم و ، لە قورەیشم ، بۆشی هەستام ، پێش ئەویش داوام کرد دای بەو نەیدا بەمن ، وەڵلاّهی دەبێت سەیر بکەم بزانم ئەم پیاوە چی دەکات ؟ شوێنی کەوتم ، پەڕۆ سوورەکەی دەرهێناو ، سەری پیٚبەست ، ئەنساریەکان وتیان : ئەریٚ وەڵلاّ (ابو دجانە) پەرچەمی مردنی بەست (ابو دجانە) بەدەم چوونە ناو سوپاکەوە دەیوت :

انـــا الذي عـــاهدني خليلي   ونحن بـــالسفح لدى النخيل

ان لا اقوم الدهر في الكيول   اضرب بسيف الله والرسول

هەرچی پیٚ بگەیشتایە دەیکوشت ، کابرایەکی موشریك هەر بریندارێکی موسڵمانی بدیایە دەچووە سەری و دەیکوشت لەگەڵ (ابو دجانە) لەیەك نزیك بوونەوە ، لەخوا پاڕامەوە لەگەڵ (ابو دجانە) شەڕ بکات ، شەڕیان کردو چەند

شمشێرێکیاندا لەیەکتر، کابرای موشریك شمشێرێکیدا لە(ابو دجانە) بە قەڵغانەکەی خۆی پاراست ، ئەنجا (ابو دجانە) یەك شمشێری لێداو کوشتی[1].

پاشان (ابو دجانە) کەوتە تێك و پێك شکاندنی ڕیزەکانی موشریکان ، تا گەیشتە سەرۆکی ژنانی قورەیش ، نەیناسی کە ژنە ، (ابو دجانە) دەڵێت : کەسێکم دی دەم و چاوی مردووەکانی دەڕنییەوە ، بۆی وەستام ، شمشێرێکم لێ ڕاست کردەوە بیکوژم ، قیژاندنی ، ژن بوو ، حەزم نەکرد بەشمشێری پێغەمبەری خوا ﷺ ژن بکوژم ، ئەو ژنە (هند)ی کچی (عتبە) بوو ، (زبیر)ی کوڕی (عوام) دەڵێت : (ابو دجانە)م بینی شمشێرەکەی لەسەرسەری (هند)ی کچی (عتبە) بەرز کردەوە لێ بدات، پاشان دەستی گێڕایەوە، منیش لەدڵی خۆمدا وتم : خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن[2].

(حمزة)ی کوڕی (عبدالمطلب) یش وەك شێری دڕ ووڕژابوو دەجەنگاو بێ باکانەو چاونەترسانە خۆی فڕێدایە ناوجەرگەی شەڕەکەو ، وەك چۆن پەروپوش لەبەردەم هەوادا پەرش و بڵاو دەکات بەو شێوەیە پاڵەوانەکانی قورەیش لەبەردەم (حمزە)دا بە چواردەوردا بڵاوەیان لێ کرد ، لەگەڵ ئەو بەشداریە کاریگەریەی کردی لە تەفروتونا کردنی ئاڵا هەڵگرانی موشریکەکاندا ، پاڵەوانەکانی تریشی تەفروتونا کردن تا ئەوەبوو لە ڕیزی پێشەوە شەهید بوو ، بەڵام نەك لە ڕووبەڕوو بوونەوەی پاڵەواناندا ، بەڵکو وەك لە تاریکی نیوە شەودا پایەداران دەکوژرێن ئاوا شەهید کرا.

## کوژرانی شێری خودا ( حمزە ) ی کوڕی ( عبدالمطلب )

بکوژی (حمزة) (وەحشی) کوڕی (حرب) دەڵێت : غولامی (جبیر)ی کوڕی (مطعم) بووم ، (ظعیمة)ی کوڕی (عدی) مامی لەڕۆژی بەدردا کوژرا بوو ، کە قورەیش کەوتەڕێ بۆ ئوحود (جبیر) پێی وتم : ئەگەر تۆ (حمزە)ی مامی موحەممەدم بۆ بکوژیت ئازادت دەکەم ، دەڵێت : لەگەڵ خەڵکیدا دەرچووم ، من پیاوێکی حەبەشی بووم ڕمباز بووم کە ڕمم فڕێ بدایە کەمجار هەڵەم دەکرد . کە دووسوپاکە بە یەك گەیشتن گەڕام بەشوێن (حمزە)دا ، تا لەناو قەرەباڵغەیەکەدا بینیم وەك شۆڕە سوارێکی لێهاتوو دڕی ئەدا بەڕیزەکان و لەهەرچییەکی دەدا هەڵنەدەسایەوە ، خۆم ئامادەکرد لێی دەم ، خۆم لە پاڵ درەختێکدا یان بەردێکدا حەشاردا تا لێم نزیك بێتەوە پێش من

---

[1] ابن هشام ٢/ ٦٨ ، ٦٩ .
[2] هەمان سەرچاوە ٢/ ٦٩ .

(سباع)ی کوڕی (عبد العزی) لێی نزیك بووەوە ، کە (حمزە) بینی هاواری لێکرد : وەرە هەی کوڕی ژنە خەتەنەچییەکە ـ دایکی (سباع) ژنانی خەتەنە دەکرد . وەحشی دەڵێت : یەك شمشێری دا لەملی (سباع) ئەوندە خێرا بوو وامزانی بەری نەکەوت.

دەڵێت : ڕمەکەم ئامادەکرد ، کە قەرەوڵم بۆ گرت تێم گرت ، دای لە کەلەکەی ، هەناوی بڕی و لە پشتیەوە دەرچوو ، ویستی بەرەو ڕووم بێت نەیتوانی و کەوت ، وازم لێهێنا تا مرد ، پاشان چوومە سەری ڕمەکەم دەرهێناو گەڕامەوە نێو سەربازگە ، لەوێ دانیشتم کارم بەکەسی تر نەبوو ، بۆیە ئەویشم کوشت تا ڕزگاربم ، کە گەڕامەوە بۆ مەککە ئازاد کرام[1] .

## بالادەست بوون بەسەر ڕەوشەکەدا

لەگەڵ ئەو ژیانە زۆرەی بەر موسڵمانان کەوت بە شەهیدبوونی شێری خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ (حمزە)ی کوڕی (عبد المطلب) ، موسڵمانەکان زاڵ بوون بەسەر شەڕەکەدا ، لەو ڕۆژەدا (ابوبکر) و(عمر)ی کوڕی (خطاب) و (علي) کوڕی (ابو طالب) و(الزبير)ی کوڕی (عوام) و (مصعب)ی کوڕی (عمير) و (طلحة)ی کوڕی (عبيدالله) و (عبدالله)ی کوڕی (جحش) و(سعد) کوڕی (معاذ) و(سعد)ی کوڕی (عبادە) و(سعد)ی کوڕ (الربيع) و (انس)ی کوڕی (النضر) و چەندینی تر شەڕێکیان دەکرد ورەی دوژمنانی خوای ڕووخاندبوو ، پەرتەوازەی کردبوون.

## لە ئامێزی ژنەوە بۆ ناو بریسکەی شمشێرو ڕم

یەکێك لە پاڵەوانە کەم وێنەکانی ئەو ڕۆژە (حنظلة)ی شۆڕاو بوو ـ ناوی (حنظلة)ی کوڕی (ابی عامر)ە ، ئەم (ابو عامر)ە بریتی‌یە لە ڕاهیبە فاسقەکەی پێشتر باسی لێوە کرا ، (حنظلة) تازە ژنی گواستبوویەوە ، کە گوێی لەدەنگی جەنگ بوو ، لەو کاتەدا کەهێشتا تازە زاوا بوو . دەستبەجێ ژنەکەی بەجێ هێڵاو چوو بۆ جیهاد ، کە گەیشت بەسوپای موشریکان لەمەیدانی جەنگدا ، خۆی کرد بەناو ڕیزەکانیاندا ، تا گەیشتە سەر سەرکردەی موشریکان (ابو سفيان)ی کوڕی (حرب) ، خەریکبوو لەناوی بەرێت ئەگەر خودا شەهید بوونی بەنسیب نەکردایە ، ئەوەبوو کەوتە سەر (ابو سفيان) و بەگیری هێنا تا (شداد)ی کوڕی (اسود) شمشێرێکی لێداو شەهیدی کرد.

---

[1] ابن هشام ٢/ ٦٩ ، ٧٠ ، ٧١ ، ٧٢ صحيح البخاري ٢/ ٥٨٢ . (وحشي) لەدوای جەنگی (طائف)ەوە موسڵمان بوو، هەربەو ڕمەی دەستی (مسيلمة)ی درۆزنی کوشت و، شەڕی (يرموك) یشی دژ بە ڕۆمەکان بینی.

## پشکی تیر هاوێژەکان لە شەڕەکەدا

ئەو گروپەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر شاخەکە داینابوون دەستی بالأیان هەبوو لە پاراستنی هاوسەنگی شەڕەکە لە بەرژەوەندی موسڵمانان ، ئەسپ سوارەکانی مەککە بەیارمەتی (ابو عامر)ی فاسق سێ جار هێرشیان هێنا بۆ تێکشکاندنی باڵی چەپی سوپای موسڵمانەکان ، تابگەنەوە پشتی موسڵمانەکان و شپرزەو پەرتەوازەیان بکەن و، شکستیان پێ بهێنن ، بەلأم تیرهاوێژەکان تیر بارانیان کردن و نەیانهێلأ نزیك بکەونەوە [1].

## شکست خواردنی سوپای موشریکان

بەو شێوەیە شەڕ بەقورسی بەردەوام بوو ، سوپا بچوکەکەی ئیسلام کۆنترۆڵی مەیدانەکەی کرد ، موشریکان ورەیان ڕووخا ، لە هەموولایەکەوە ڕیزەکانیان هەرەسی هێناو تێکشکا ، وەك ئەوە وەهابوو ئەو سێهەزار موشریکە رووبەرووی سیهەزار موسڵمان بووبنەوە، نەك چەند سەد جەنگاوەرێك ، موسڵمانەکان جوانترین وێنەی قارەمانێتیان نیشاندا.

هەرچی قوڕەیشیشە هەموو توانایەکی خۆی خستەگەڕ بۆ وەستاندنی هێرشی موسڵمانەکان هیچ سوودی نەبوو زیاتر سست دەبوون ، شەوکەتیان نەما ، تا وای لێهات کەس نەیدەوێرا لەئالأکە نزیك ببێتەوە دوای کوشتنی (صواب) بۆ ئەوەی هەڵی بگرێت و شەرکەرەکان بەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوە، بۆیە دەستی کردە پاشەکشێ و، پاشان هەلأتن ئەوەی لەبیرچوو کە لەدڵی خۆیدا باس و خواسی تۆڵە سەندنەوەو ، گێڕانەوەی نەمریی بۆ قوڕەیش دەکرد.

(ابن اسحاق) دەڵێت: پاشان خوایگەورە سەرکەوتنی خۆی بۆ ناردنە خوارەوەو ، بەڵێنەکەی بۆ هێنانەدی ، بەشمشێر ڕەدویان کەوتن هەتا لە سەربازگەشدا هەڵیان بڕین ، ئیتر سەرکەوتن هیچ گومانێکی تێدا نەما ، (عبدالله)ی کوڕی (زبیر) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو، فەرموویەتی: وەڵلأهی بەچاوی خۆم (هند) کچی (عتبە)و کارەکەرەکانیم بینی ڕایاندەکردو شپرزە بووبوون و هەرچیان هەبوو لە زۆرو لەکەم فڕێیان دابوو... هتد [2] لەفەرموودەیەکی (براء) یشدا لە (صحیح

---

[1] بڕوانە (فتح الباری) ٧/ ٣٦٤ .
[2] ابن هشام ، ٢/ ٧٧ .

البخاري)دا هاتووه: كاتێك كەوتینە شەڕ رایانكرد، تاوای لێهات ژنەكانیانم بینی خۆیان بە گوریس بەستبۆوە ، قاچەكانیان بەرز دەكردەوە تا خڕخاڵەكانی پێیان دەركەوت[٣]، موسڵمانەكان شوێنیان كەوتن ، بەچەك تێیان بەربوون و ،كەوتنە كۆكردنەوەی تاڵانی جەنگ.

## هەڵە گەورەكەی تیرهاوێژان

لەكاتێكدا كە خەریك بوو سوپا خنجیلانەكەی ئیسلام سەركەوتنێكی گەورەی تری تۆمار دەكرد بەسەر سوپاكەی مەككە كەهیچی كەمتر نەبوو، لەلایەن زۆرینەی تیر هاوێژەكانەوە هەڵەیەكی گەورە ڕوویدا ڕەوشەكەی تەواو سەرەو لێژ كردەوەو ، بووە هۆی گەیاندنی زیانێكی گەورە بەموسڵمانەكان ، خەریكبوو ببێتە هۆی شەهید كردنی پێغەمبەریش ﷺ و ، كارێكی خراپی كردە سەر ناوبانگیان و ، ئەو سام و بیمەی هەیانبوو لەدوای جەنگی بەدرەوە.

پێشتریش باسی ئەو فەرمانە توندوتیژانەمان كرد كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڕاستەی ئەو تیرهاوێژانەی كرد ، بەمانەوە لەجێگەی خۆیاندا لە هەمووحاڵەتێكدا سەركەوتن بێت یان ژێركەوتن ، كەچی لەگەڵ ئەو فەرمانە توندو تیژانەشدا ، كاتێك بینیان موسڵمانەكان تاڵانی جەنگی بێباوەڕان دەماشنەوە ، خۆشەویستی دونیا سواری ملیان بوو ، هەندێكیان بەیەكتریان وت: فریاكەون تاڵانیتان لەدەست نەچێت. ئەوە هاوڕێكانتان سەركەوتن ، چاوەڕێی چی دەكەن ؟

بەڵام (عبیداللە)ی كوڕی (جبیر)ی سەركردەیان ، گوتەكانی پێغەمبەری خودای بیر خستنەوەو پێی وتن : ئەریٚ لە بیرتان چوو پێغەمبەری خوا ﷺ چیٚ پیٚ فەرموون ؟

بەڵام زۆرینەیان گوێیان نەدایە ئەو بیرخستنەوەیەو ، وتیان : ئێمەش دەڕۆین بۆ لای ئەو خەڵكەو غەنیمەت كۆ ئەكەینەوە[١]. پاشان چل پیاو لەو تیر هاوێژانە كێوەكەیان چۆڵكردو، هاتنە خوارەوە بۆناو سوپاكە بۆ كۆكردنەوەی تاڵانی بەو شێوەیە پشتی موسڵمانەكان چۆڵ بوو ، جگە (ابن جبیر)و نۆ كەسی تری هاوەڵی كە لەوێدا مانەوەو بڕیاریاندا كەلەوێدا بمێننەوە تا لەناودەچن یان مۆڵەت دەدرێن، ئیدی ئەوانی‌تر كێوەكەیان بەجیٚهێشت و هاتنە خوارەوە.

---

[٣] صحیح البخاری ٢/ ٥٧٩ .
[١] (بخاری ) ئەمەی گێراوەتەوە ، لە فەرموودەیەكی (براء) كوڕی ( عازب) ەوە ١/ ٤٢٦ .

## خالیدی کوڕی وەلید هەڵدەسێت بەئابلوقەدانی سوپای ئیسلامی

(خالد)ی کوڕی (ولید) ئەم دەرفەتە ئاڵتونیەی قۆستەوە ، بەخێراییەکی زۆر بە پشتی شاخەکە سوڕایەوە ، تا گەیشتەوە پشتەوەی سوپای ئیسلام ، زۆری پیٚنەچوو ، (عبیداللە)ی کوڕی (جبیر) و هاوەڵەکانی لەناوبردو ، پاشان هێرشی بردە سەر موسڵمانەکان لەپشتەوەو ، ئەسپ سوارەکانی هاوڕێی هاوارێکیان کرد موشریکە هەڵاتوەکان زانیان کەشتێکی نویٚ ڕووی داوە ، هەڵگەڕانەوە بەڕووی موسڵمانەکانداو ، ژنێکیان کە (عمرة) کچی (علقمە)ی (حارثیة) بوو ئاڵا خۆڵاویەکەی لەسەر زەوی هەڵگرتەوەو ، موشریکانی بەدەوریدا خڕبوونەوەو هاتنەوە پەنایەوەو ، کەوتنە بانگ کردنی یەکتر تاکۆبوونەو بۆ موسڵمانەکان ، خۆیان گرتەوە بۆ شەڕ ، موسڵمانەکانیش لە بەرودواوە ڕێگەیان لیٚ گیرا ، کەوتنە نێوان ئەوان و دەستکەوانەکەوە .

## هەڵوێستی نەبەردانەی پێغەمبەر ﷺ لەبەردەم ئابلوقەکەدا

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا لەگەڵ مەفرەزەیەکی بچووکدا بوو ـ کە نۆ کەس بوون لەهاوەڵەکانی[٢] لەپشتەوە سوپای موسڵمانەکاندا بوون[٣] ، چاودێری ئازایەتی موسڵمانەکانی دەکرد کەچۆن موشریکان ڕاودەنێن، لەپڕێکدا لەلایەن ئەسپ سوارەکانی خالیدەوە بەتەواوی درا بەسەریاندا ، تەنها دووڕێگە چارەی لەبەردەمدا بوو، یان ڕزگاری بێت بەخێرایی ـ بەخۆی و هاوەڵەکانیەوە بەرەو پەناگە بێوەکەی خۆی و واز لە سوپا ئابڵووقەدراوەکەی بهێنێت بەرەو چارەنووسی چاوەڕوانکراوی بڕوات، یان خۆی بخاتە بەرمەترسی و هاوەڵەکانی بانگبکات تا لەدەوری کۆببنەوەو بیانکاتە بەربەستێکی بەهێزو لەناو سوپاکەی قوڕەیشدا دڕیان پیٚ بدات بەرەو گردۆڵکەکانی ئوحود.

لێرەدا ئازایەتی و لێهاتوویی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت ، بەدەنگی بەرز هاواری کردە هاوەڵانیو فەرمووی: (بەندەکانی خوا) باش دەیزانی کەموشریکان پێش موسڵمانەکان گوێیان لەدەنگی دەبێت ، بەڵام خۆی خستە نێو مەترسیەکەو لەوکاتە ناسکەدا هاواری لێکردن .

---

[٢] لە (صحیح)ی (مسلم) داهاتووە (١٠٧/٢) پێغەمبەر ﷺ لەرۆژی (ئوحود) دا (٧) ئەنساری و (٢) قوڕەیشی هەڵبژارد لەگەڵیدا بن .

[٣] ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەو حاڵەتە ﴿ والرسول یدعوکم فی اخراکم ﴾ ٣/ ١٥٣ .

## پەرتەوازە بوونی موسڵمانەکان لە شەڕەکەدا

موسڵمانەکان کەوتنە ناو ئابڵوقەکەوە هەندێکیان عەقڵ لەکەللەیاندا نەما ، جگە لەخۆیان چی دیان مەبەست نەبوو ، کەوتنە هەڵاتن و ، مەیدانی شەڕەکەیان بەجێ هێشت و ، بێ ئەوەی بزانن چی لەدواوەیە ؟ هەندێك لەوانە تا ناو مەدینە بە ڕاکردن نەوەستابوون ، هەندێکی تریان بەرەو بەرزایی شاخەکە ڕایانکرد ، کۆمەڵێکی تریشیان گەڕانەوە ناو سوپای موشریکان ، لێك پژان و لەیەکتری جیا نەدەکرانەوە ، موسڵمانەکان بەهەڵە هەندێکیان لەیەکتری کوشت ، بوخاری لە عائشەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی : لە ڕۆژی شەڕی ئوحوددا موشریکان بەئاشکرا شکان ، ئیبلیس هاواری کردە موشریکان خەڵکینە بگەڕێنەوە دواوە ، پێشەنگە هەڵاتوەکە گەڕایەوە ، لەگەڵ دواییینەکەدا یەکیان گرتەوەو هاتنەوە دەست (حذیفة) سەیری کرد باوکی بینی هاواری کردە موسڵمانەکان وتی: موسڵمانینە ئاگاتان لە باوکم بێت مەیکوژن ، موسڵمانەکان ئەوەندە شپرزە بوون پێیان نەزانی و کوشتیان ، (حذیفة) وتی : خوا لێتان خۆشبێت ، (عروه) دەڵێت : وەڵڵاهی دوای ئەوەش (حذیفة) هەر پیاوێکی چاك بوو تا وەفاتی کرد [١].

ئەم کۆمەڵەیان بەتەواوی بەیەکدا هاتن و ، پشێویان تێدا دروست بوو ، لە یەکتری وون بوون و ، نەیاندەزانی ڕوو لەکوێ بکەن ، لەو حاڵەتە ناخۆشەدا بوون ، یەکێك هاواری کرد (محمد) کوژرا ، ئیدی عەقڵیان لەسەردا نەماو ، چەکەکانیان فڕێدا ، هەندێکی تریان بیریان لەوە دەکردەوە خۆیان بدەن بە دەستەوە بۆ (عبدالله)ی کوڕی (ابی) سەرکردەی دووڕووەکان ، بۆ ئەوە لە دەست (ابو سفیان) پەنایان بدات.

(انس)ی کوڕی (نضر) بەلای ئەمانەدا تێپەڕی بینی چەکیان فڕێداوە ، پێی وتن : چاوەڕوانی چی دەکەن ؟

وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ شەهید کراوە ، وتی: ئیتر دوای ئەو ژیانتان بۆ چییە ؟

---

[١] صحیح البخاری ٥٣٩/١ ، ٥٨١/٢ فتح الباری ٣٥١/٧ ، ٣٦٢ ، ٣٦٣ ، ، جگە لەبوخاری ئەوانی دیکەش گوتویانە کە پێغەمبەر ﷺ ویستی خوێنەکەی بدات ، (حذیفە)وتی : خوێنەکەیم کرد بە سەدەقە بۆ موسڵمانان ، بەو هەڵوێستە (حذیفە)ئەوەندەی‌تر لای پێغەمبەر ﷺ خۆشەویست بوو ، بڕوانە (مختصر سیرة الرسول) نوسینی شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل ١٤٦ .

هەستن لەسەر ئەو ڕێگەیە بمرن کە ئەوی لەسەر مرد ، پاشان وتی : خوایە من داوای لێبوردنت لێ دەکەم لەسەر ئەوەی ئەمانە دەیکەن (مەبەستی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە بوو) بێ بەریشم لەکاری ئەو موشریکانە ، پاشان چووە پێشەوە (سعد)ی کوڕی (معاذ)ی پێگەیشت ، وتی : بۆ کوێ دەچی (ابو عمر) ؟

(انس) وتی: هەست بەبۆنی بەهەشت دەکەم (سعد) ، لەپاڵ کێوی ئوحوددا هەستی پێ دەکەم ، پاشان خۆی فڕێدایە ناو شەڕەکە هەتا شەهیدکرا ، لەبەر زۆری برینەکانی نەناسرایەوە ، دوای شەڕەکە - تاخوشکەکەی بەسەری پەنجەکانیدا ناسیەوە، هەشتاو ئەوەندە برینی جێگەی لێدانی ڕم و شمشێرو تیری پێوەبوو[1].

(ثابت)ی کوڕی (دحدام) یش خێڵەکەی بانگ کردو وتی : ئەی خەڵکی ئەنسار ، کە موحەممەد مرد بێت ئەوە خودا زیندووەو نامرێت ، لەسەر دینەکەتان شەڕ بکەن ، خوا پشتیوانتانەو سەرتان دەخات ، چەند کەسێکی ئەنساری لەگەڵیدا هەستانەوەو هەڵیان کوتایە سەر کەتیبەکەی (خالد) کەوتنە جەنگ لەگەڵیان ، تا (خالد) بە ڕم کوشتی و دوای ئەو هاوەڵەکانیشی کوژران[2].

پیاوێکی کۆچکەران بەلای ئەنساریەکدا تێپەڕی خەڵتانی خوێن بووبوو ، وتی: فلانەکەس زانیوتە کە موحەممەد شەهیدکراوە؟ کابرای ئەنساری وتی: ئەگەر موحەممەد ﷺ کوژرا بێت ئەوە بۆ خۆی پەیامەکەی گەیاندوە ، ئێوەش لە پێناوی ئایینەکەتاندا شەڕ بکەن[3].

بەم شێوە قارەمانێتیە موسڵمانەکان ورەیان بەرز بوەوەو هاتنەوە هۆش خۆیان و وازیان لە بیرۆکەی خۆ بەدەستەوەدان و پەیوەندی کردن بە (ابن ابی) یەوە هێناو دەستیان دایەوە چەك و شاڵاویان کردە سەر تەوژمی موشریکان لەکاتێکدا کە دەیانویست بگەنە بنکەی سەرکردایەتی موسڵمانەکان چونکە بیستبویان هەواڵی شەهید کردنی پێغەمبەر ﷺ درۆیە و هەڵبەستراوە ، ئەمەش هێزو تینی پێدانەوەو توانیان لەو ئابلۆقەیە خۆیان ڕزگار بکەن و ، بنکەیەکی پتەو لەمەیدانەکەدا دروست بکەن و شەڕێکی قارەمانانە تۆمار بکەن .

---

[1] زاد المعاد ٢/٩٦،٩٣ (صحیح البخاری) ٢/٥٧٩ .
[2] السیرة الحلبیة ٢/٢٢ .
[3] زاد المعاد ٢/ ٩٦ .

کۆمەڵێکی تریش جگە لە پێغەمبەر ﷺ هیچ خەمێکی تریان نەبوو ، بەخێرایی لەدەوری خڕبوونەوەو لەهەر چوارلاوە پاراستیان ، لە سەرووی هەموویانەوە (ابوبکر)ی (صدیق) و (عمر)ی کوڕی (خطاب) و (علی) کوڕی (ابي طالب) و چەند کەسێکی دیکە بوون ئەمانە لەپێشەوەی شەڕکەراندا بوون ، بەڵام کە هەستیان کرد بەبوونی مەترسی لەسەر جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ کەوتنە ڕیزی پێشەوەی بەرگری کەران .

## گەرم بوونی شەڕ بە دەوری پێغەمبەردا ﷺ

لەکاتێکدا کە کۆمەڵێ لەموسڵمانەکان کەوتبوونە ئابڵوقەکەو ، لە هەموو لایەکەوە لێیان دەدرا ، لەملاشەوە شەڕ بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ گەرم بووبوو ، پێشتریش وتمان کاتێك موشریکان دەستیان کرد بەئابڵوقەدانی موسڵمانەکان ، پێغەمبەری خوا ﷺ ، جگە لە نۆ کەس کەسێکی دیکەی لەگەڵدا نەبوو ، کە بانگی کردە موسڵمانەکان و فەرمووی : ئادەی وەرن بۆ لام ، من پێغەمبەری خوام ، موشریکان گوێیان لەدەنگی بوو ناسیانەوە ، هاتنە سەری بەهەموو هێزێکیانەوە شاڵاویان بۆ هێنا پێش ئەوەی کەسێك لە موسڵمانەکان بگاتەوە لای ، لەنێوان موشریکان و ئەو نۆ کەسەدا شەڕێکی توند ڕوویدا کەتیایدا وێنەیەك لە پاڵەوانێتی و ئازایەتی و گیانی خۆبەخت کردن دەرکەوت.

(موسلیم) دەگێڕێتەوە لە (انس)ی کوڕی (مالك)ە وە دەڵێت : لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا لەگەڵ نۆ کەسی هاوەڵیدا مایەوە ، حەوتیان ئەنساری و دووانیان کۆچکەران بوون ، کە ئابڵوقەیاندان و زۆریان بۆ هێنان، فەرمووی : کێ دەتوانێت ئەمانەمان لێ دور بخاتەوە ، بەهەشتی بەنسیب دەبێت ؟ یان ئەو دەبێتە هاوڕێی من لە بەهەشتدا ؟ پیاوێکی ئەنساری چووە پێشەوە کەوتە شەڕ هەتا شەهید بوو ، پاشان هاتنەوە سەری بەم شێوەیە شەڕ بەردەوام بوو تا حەوت ئەنسارییەکە شەهید بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەردوو هاوەڵە قوڕەیشییەکەی فەرموو : (بەڕاستی ویژدانمان نەبوو لەگەڵ هاوەڵەکانی ترماندا) [1].

دوایین شەهیدی ئەو حەوت کەسە (عمارە)ی کوڕی (یزید)ی کوڕی (سکن) بوو ، شەڕی کرد ، برینەکانی زۆریان بۆ هێناو کەوت [2].

---

[1] صحیح مسلم باب غزوە احد ۲/۱۰۷ .

[2] پاش ساتێك کۆمەڵێ لەموسڵمانەکان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و هەڵیان کوتایە سەر ئەو بێباوەڕانەی بەسەر (عمارە) ەوە بوون ، دەریان هێناو بردیانە لای پێغەمبەر ﷺ قاچی بۆ کرد بەسەرین ، بەو حاڵەوە کاتێ سەری لەسەر ڕانی پێغەمبەر بوو ﷺ کۆچی دوایی کرد ، ( ابن هشام) ۲/۸۱) .

## ناخۆشترین کات لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ

پاش کەوتنی (عمارە)ی کوڕی (سکن) ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەنها لەگەڵ دوو قورەیشیەکەدا مایەوە ، لە (صحیحین)دا هاتووە لە (ابی عثمان)ەوە ، دەڵێت: لەو ڕۆژەدا جگە لە (طلحة)ی کوڕی (عبید الله) و (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص)[٣] کەس بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ نەمابوو ، ئەو ساتەوەختە ناخۆشترین کات بوو لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕێت و، دەرفەتێکی ڕەخساویش بوو بۆ موشریکان، موشریکانیش هیچ دوانەکەوتن لە قۆستنەوەی ئەو دەرفەتەدا ، هەڵگەڕانەوە سەر پێغەمبەر ﷺ و بەنیاز بوون لە ناوی بەرن ، (عتبە)ی کوڕی (ابی وقاص) بەردێکی تێگرت کێشای بە دانی پیرۆزیدا دانە خڕێنەکەی خوارەوەی شکاند ، (عبدالله)ی کوڕی (شهاب الزهری) یش نێو چەوانی پیرۆزی بریندار کرد ئەسپ سوارێکی سەرسەخت کە ناوی (عبدالله)ی کوڕی (قمئة) لە دوورەوە هات شمشێرێکیدا لەلا شانی پیرۆزی ، تاماوەی یەك مانگ ئازاری هەبوو، بەڵام نەیتوانی زنجیربەندەکانی شانی ببڕێت، پاشان شمشێرێکی تریدا لەسەر ڕوومەتی پیرۆزی توندبوو وەکو یەکەمیان بەشێوەیەك ئەڵقەبەندی زنجیرەکەی سەرسنگی پیرۆزی لە ڕوومەتی گیربوو، ئەنجا وتی: دەبخۆ ئەوە منم (ابن قمئة) پێغەمبەری خواش ﷺ لەکاتێکدا کە خوێنی نێوچاوانی دەسڕی فەرمووی : خوا لەت و پەتت بکات[١].

لە (صحیح)یشدا هاتووە ، دانە چوارینەکەی پێغەمبەر ﷺ شکاو ، سەری بریندار بوو ، خوێنی لێ دەچۆڕاو دەیفەرموو : چۆن گەلێك ڕزگاریان دەبێت ئاوا پێغەمبەرەکەیان بریندار بکەن و دانی بشکێنن ، لەکاتێکدا ئەو بۆ لای خوا بانگیان بکات ، خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە : ﴿ ليس لك من الامر شيء أو يتوب عليهم أو يعذبهم فانهم ظالمون ﴾[٢] واتە : تۆ هیچ شتێکت لەکاروباری بەندەکان بەدەست نیە ، هەموو شت بەدەستی خوا خۆیەتی ئەگەر تەوبە و پەشیمانی یان لێ وەربگرێت ، یان سزاو ئازاریان بدات ( خوا سەربەست و بێباکە) چونکە ئەوانە ستەمکارن .

---

(٣) صحیح البخاری ١/٥٢٧ ، ٢/٥٨١ .

(١) خوای گەورە دۆعاکەی پێغەمبەری گیراکردو ﷺ لە (ابن عائذ)ەوە دەڵێت: جارێکیان (ابن قمئة) بۆ ماڵ دەچوو ، جێگەکەی برد بۆ سەرشاخێك ، مەرێك شاخی لێ توند دەکات و لەبەرزایی شاخەکەوە فڕێی دەداتە خوارەوەو لەت و پەت دەبێت ، ( فتح الباری) ٧/٣٧٣ ـ لای (طبراني یش هاتووە ، خوا بەرانە کێویەکی تێ بەرداو ، بەقۆچ لێیدا تا پارچە پارچەی کردو خستیە خوارەوە (فتح الباری ٧/ ٣٦٦)

(٢) صحیح البخاري ٢/ ٥٨٢ ، هەروەها (صحیح مسلم) ٢/ ١٠٨ .

لەگێڕانەوەیەکی (طبراني) یدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا فەرمووی : خودای گەورە زۆر ڕقی هەستا لەو گەلەی دەم و چاوی پێغەمبەرەکەیان خوێناوی کرد ، پاش کەمێك وەستان فەرمووی : خوایە لە گەلەکەم خۆش ببەو چونکە هیچ نازانن [٣].

بەو شێوەیەش لە (صحیح)ی (مسلم)دا هاتووە فەرموویەتی : پەروەردگارم لە گەلەکەم ببورە چونکە هیچ نازانن [٤] هەروەها (الشفاء)ی قازی (العیاض)دا هاتووە فەرموویەتی : خوایە گەلەکەم هیدایەت بدە چونکە نازانن [٥].

گومانی تێدانیە کە موشریکان مەبەستیان لەناو بردنی پێغەمبەر بوو ، بەڵام هەردوو هاوەڵە قوڕەیشیەکەی (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) و (طلحة)ی کوڕی (عبید الله) قارەمانێتیەکی کەم وێنەیان نیشاندا ، بەهەردووکیانەوە یەك بواریان نەدا موشریکان بێنە پێشەوەو ، کارامەترین تیر هاوێژی عەرەب بوون ، زۆر هەوڵیاندا تا لە کۆتایی‌دا هەموو هەوڵەکانی موشریکانیان لەگەیشتندا بەپێغەمبەر پووچەڵ کردەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ تیرەکانی خۆی هەڵڕشت بۆ (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) و پێی فەرموو : تیربارانیان بکە دایك و باوکم بەقوربانت بێت [١] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شیاوێتی (سعد) ، چونکە پێغەمبەر دایك و بابی پێکەوە نەکردوە بە قوربانی کەس جگە لە (سعد) [٢].

سەبارەت بە (طلحة)ش ، نەسائی لە(جابر)ەوە بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە ، باس لە کۆبوونەوەی موشریکان دەکات بە دەوری پێغەمبەردا ﷺ کاتێك کەچەند کەسێکی ئەنساری لەگەڵدا بوو ، (جابر) دەڵێت : موشریکان چاویان کەوت بە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی چوون ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : کێ دەتوانێت ئەوانە بگێڕێتەوە ؟ (طلحة) وتی: من ، پاشان (جابر) باسی هاتنە پێشەوەی ئەنساریەکان و یەك لەدوای یەك شەهیدبونیانی کرد بەو شێوەیەی لە ریوایەتەکەی (مسلم) دا هات ، کە هەموو ئەنساریەکان شەهید کران (طلحة) چووە پێشەوە ، (جابر) دەڵێت

---

[٣] فتح الباری ٣٧٣/٧ .
[٤] صحیح مسلم باب غزوة احد ٢/ ١٠٨ .
[٥] (کتاب الشفاء بتعریف حقوق المصطفی )٨١/١ .
[١] صحیح البخاری ٤١٧/١ ، ٢/ ٥٨٠ ، ٥٨١ .
[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

: (طلحة) به ئەندازەی یانزە کەس شەڕی کرد تا شمشێرێك درا لە دەستی و پەنجەکانی قرتاند ، وتی : باشە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : ئەگەر (بسم الله) ت بکردایە بە بەرچاوی خەڵکەوە فریشتەکان هەڵیان دەگرتی ، دەڵێت پاش ئەوەی خوای گەورە دەستی موشریکانی کۆتا کرد [٣] لەلای (حاکم) لە (الاکلیل) دا هاتووە دەڵێت : لە ڕۆژی (ئوحود) دا سی و نۆ کەس یان سی و پێنج کەس برینداربوون ، پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستی (طلحە)ش لەکار کەوت [٤] .

(بخاری)یش دەگێڕێتەوە لە(قیس)ی کوڕی (ابی حازم)ەوە، دەڵێت: دەستی (طلحة)م بەئیفلیجی بینی لەڕۆژی ئوحوددا بەرگری پێکردبوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ [٥] .

(ترمذي)یش دەگێڕێتەوە ، کە پێغەمبەر ﷺ لەوڕۆژەدا لە بارەیەوە فەرمووی : هەر کەسێك دەیەوێت سەیری شەهیدێك بکات کە بەسەر زەویدا دەڕوات باسەیری (طلحة)ی کوڕی (عبید الله) بکات [٦] .

(ابو داود)ی (طیالیسي) دەگێڕێتەوە لە (عائشە)ە وە ، کە وتویەتی هەرکاتێك لای (ابوبکر) باسی ڕۆژی (احد) بکردایە دەیفەرموو : ئەو ڕۆژە ڕۆژی (طلحة) بوو [٧] .

هەروەها (ابوبکر) لەبارەیەوە فەرموویەتی :

یـــا طلحة بن عبيد الله قد وجبت لك الجنان وبوأت ألمها العينـــا [٨]

لەوکاتە ناسك و ساتەناخۆش و تەنگەدا خوای گەورە لەپشت پەردەوە سەرکەوتنی نارد ، لە (صحیحین)دا هاتووە لە (سعد)ە وە دەڵێت : ڕۆژی (احد) دوو پیاوی سەرتاپا سپیم بینی لە پاڵ پێغەمبەردا ﷺ شەڕیان دەکردو بەسەختی دەجەنگان . نە پێش و نە پاشی شەڕەکە نەم دیبوون ، لە ڕیوایەتێکدا بە مانا (جبریل) و (میکائیل) هاتوون [٩] .

---

[٣] فتح الباري ٧/ ٣٦١ . هەروەها ( سنن النسائي) ٢/ ٥٢ ، ٥٣ .
[٤] هەمان سەرچاوەی یەکەم ٧/ ٣٦١ .
[٥] صحیح البخاری ١ ٥٢٧ ، ٢/ ٥٨١ .
[٦] مشكاة المصابيح ٢/ ٥٦٦ / ( چاپی دار الفكر) ، ابن هشام ٢/ ٨٦ .
[٧] فتح الباری ٧/ ٣٦٧ .
[٨] کورتەی (تاريخ دمشق) ٧/٨٧ لەپەراوێزی (ذور الذهب) ەوە لا ١١٤ .
[٩] صحیح البخاري ٢/ ٥٨٠ .

## سەرەتای کۆبوونەوەی هاوەلان بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ

ئەم ڕووداوانە بەخێراییەکی زۆرو لەیەك چاوتروکاندا ڕوویاندا ، هاوەڵە لێهاتوە لێوەشاوەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لەپێشەوە دەجەنگان ، لەگەڵ بینیان ڕەوشەکە گۆڕا ، یان کەگوێیان لەدەنگی پێغەمبەر بوو ﷺ دەسبەجێ چوون بە دەمیەوە ، نەبادا پێش ئەمان تووشی شتێك ببێت ، بەلام کاتێك گەیشتن ، پێغەمبەری خودایان بەو خوێن و برینەوە بینی و جەستەی شەش شەهیدە ئەنساریەکەشیان بەدی کرد سەیریان کرد حەوتەمیان بەسەختی بریندارەو ، (سعد) و (طلحة)ش قارەمانانە شەڕ دەکەن کەگەیشتن پەرژینێکی ئەستووریان بە چواردەوری پێغەمبەردا ﷺ کێشا بەلاشەو چەکەکانیان توندو تۆڵ لە شالاوەکانی دوژمن پاراستیان ، یەکەمین کەسێك کە گەڕایەوە لای ، هاوەڵەکەی غار (ابو بکر الصدیق) بوو ﷺ .

(ابن حبان) لە (عائشە)ە وە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : (ابوبکر الصدیق) فەرمووی : لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا خەڵك بەدەوری پێغەمبەردا نەمان ﷺ ، یەکەم کەس بووم گەڕامەوە بۆ خزمەتی ، پیاوێکم بینی لە نزیکیەوە شەڕی دەکردو پێغەمبەری دەپاراست ، وتم : لەوانەیە (طلحة) بێت ، دایك و بابم بەقوربانت بێت ، یاخوا (طلحة) بێت ، دایك و بابم بەقوربانت بێت ، هێشتا دەستم نەکردبووەوە (ابو عبیدە) گەیشتە لام ، وەك باڵدار باڵی گرتبۆوە ، پێم گەیشتەوە ، تەکانماندا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بینیمان (طلحة) کەوتووە ، گیانی یەکپارچە خوێنە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەنە لای براکەتان ئەوا بەهەشتی مسۆگەرکرد، پێغەمبەر خۆشی ڕوومەتی پیرۆزی تیرێکی بەرکەوتبوو ، دوو ئەڵقەی زنجیر بەندەکەی سنگیشی لە ڕوومەتی پیرۆزیدا چەقی بوون ، چووم دەری بهێنم (ابو عبیدە) وتی : سوێندت دەدەم بەخوا ئەگەر وازم لێ نەهێنی باخۆم دەری بهێنم ، ئەنجا بەدەمی شیرەکەی دەری هێنا نەبادا پێغەمبەر ﷺ ئازاری زۆری پێ بگات . لەئەنجامدا دانێکی (ابو عبیدە) کەوت ، (ابوبکر) دەفەرموێت : چووم ئەڵقەی زنجیر بەندەکە دەربهێنم (ابو عبیدە) بۆ ئەویش سوێندی خوارد کەخۆی دەری بهێنێت ، بەدانی ئەڵقەکەی گرت ڕای کێشاو دەری هێنا، دانێکی تریشی کەوت، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی فریای براکەتان بکەون ، دەسبەجێ چووینە لای (طلحة) تاچارەسەرێکی بکەین ، دە برین زیاتری پێوەبوو[1] ، ئەمەش

---

[1] زاد المعاد ٢/٩٥ .

بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئازایەتی و شیاویێتی (طلحة) و ئەو بەرەنگاریەی کردوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ.

لەو ئانوساتە دژوارەدا کۆمەڵێك لەموسڵمانە پاڵەوانەکان بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ کۆبوونەوە، لەوانە (ابو دجانە) و (مصعب)ی کوڕی (عمیر)و (علی) کوڕی (ابي طالب) و (سهیل)ی کوڕی (حنیف)و (مالك)ی (سنان) باوکی (ابیسعید الخدری) و (ام عمارة نسیبیة)ی کچی (کعب المازنیە) و (قتادة)ی کوڕی (النعمان) و (عمر)ی کوڕی (الخطاب) و (حاطب)ی کوڕی (ابی بلتعە) و (سهیل)ی کوڕی (حنیف) و (ابو طلحة).

## زیاد بوونی فشاری موشریکان

هەروەها ژمارەی موشریکان سات لەدوای سات زیاتری دەکردو ، فشارو زۆر بۆهێنانیان قورستر دەبوو ، فشاریان لەسەر موسڵمانەکان زیاتری دەکرد ، تاپێغەمبەر ﷺ کەوتە چاڵێکەوە لەو چاڵانەی (ابو عامر الفاسق) هەڵی کەندبوون ، ئەژنۆی پیرۆزی بریندار بوو ، (علی) دەستی گرت و هێنایە دەرەوەو (طلحة)ی کوڕی (عبید الله) باوەشی پێداکرد تا هەڵی ساندەوە ، (نافع)ی کوڕی (جبیر) دەڵێت: گوێم لێ بوو یەکێك لەکۆچکەران دەیوت : من جەنگی ئوحودم بینیوە ، چاوم لێبوو تیر وەك باران دادەباری بەسەر پێغەمبەردا ﷺ هیچی بەرنەکەوت ، (عبدالله)ی کوڕی (شهاب الزهری)یشم بینی لەو ڕۆژەدا هاواری دەکرد : ئەرێ موحەممەدم نیشاندەن خوا بمکوژێت ئەگەر بهێڵم دەربچێت ، پێغەمبەری خواش لەپاڵیدا بوو ، کەسی لەگەڵدا نەبوو ، پاشان تێپەڕی (صفوان) زۆر سەرزەنشتی کابرای کردو پێی وت : لە پاڵتدا بوو کابرا وتی : وەڵڵاهی نەمبینی ، وەڵڵاهی ئەو پیاوە دەستی ئێمەی ناگاتێ ، هەر چوارمان بۆی چووین ، بەڵێنمانداو ئاهو سوێندمان کرد کە دەبێت بیکوژین ، کەچی نەمانتوانی[1].

---

[1] زاد المعاد ٢/ ٩٧.

## قارەمانێتی کەم وێنە

موسڵمانەکان لەو ڕۆژەدا قارەمانێتیەکی کەم وێنەو قوربانیەکی گەورەیان پێشکەش کرد ، کە لە مێژوودا ڕووی نەداوە ، (ابو طلحة) (خۆی کردبوو بەپەرژین بۆ پێغەمبەر ﷺ و سنگی بەرز دەکردەوە تا پێغەمبەر ﷺ لەتیری دوژمنان بپارێزێت . (انس) دەڵێت : لە ڕۆژی ئوحوددا خەڵك بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ نەمان ، کەچی (طلحة) بە تیرو کەوانەکەی بەرگری لێ‌دەکرد ، کابرایەکی تیرئەندازە بوو، لەو ڕۆژەدا دوو تا سێ کەوانی بەدەستەوە شکا هەرکەسێکی بەلادا بگوزەرایە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێ‌ی دەفەرموو: تیرەکانت هەڵڕێژە بۆ (ابو طلحة) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سەیری ناو شەڕەکەی دەکرد (ابو طلحة) دەیوت : دایك و بابم بە فیدات بێت سەرت نەوی کە نەبادا تیرێکت بەر بکەوێت ، گیانم پێش گیانت بە قوربان دەکەم .[٢]

هەر لە (انس)وە دەڵێت: (ابو طلحة) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەیەك قەڵغان خۆیان دەپاراست ، (ابو طلحة) دەستی ڕاست بوو ، کە تیرێکی دەهاویشت پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرز دەکردەوە بزانێت بەرکوێ دەکەوێت [٣].

(ابو دجانە)ش لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ وەستاو پشتی کردبوو بەقەڵغان ، ئەو هەموو تیرەی بەردەکەوت جوڵەی نەدەکرد.

(حاطب) کوڕی (ابي بلتعة)ش کەوتە سەر (عتبە)ی کوڕی (ابی وقاص) کە دانە خرپێەکەی پێغەمبەری خوای شکاندبوو شمشێرێکی لێدا سەری لەلاشەی کردەوە، پاشان شمشێری هەڵگرت و ئەسپەکەشی هێنایەوە (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) زۆر دەگەڕا بەشوێن ئەو برایەیدا تابیکوژێت ، بەڵام دەستی نەکەوت ، ئەوەبوو (حاطب) کوشتی.

(سهل)ی کوڕی (حنیف) یش یەکێك بوو لە تیرهاوێژە پاڵەوانەکان ، پەیمانی‌دا بوو بەپێغەمبەر ﷺ هەتا مردن ، ئەویش ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لە دوورخستنەوەی موشریکاندا.

پێغەمبەر ﷺ خۆیشی تیری دەهاویشت ، لە (قتادە)ی کوڕی (نعمان)ەوە ، دەڵێت: پێغەمبەر ئەوەندە تیری هاویشت تاجەمسەری کەوانەکەی شەقی‌برد ،

---

[٢] صحیح البخاری ٢/ ٩٨١ .

[٣] هەمان سەرچاوە ١/ ٤٠٦ .

ئەنجا (قتادە)ی کوڕی (نعمان) هەڵی گرت لەلای ئەوبوو ، لەو ڕۆژەدا چاوی بەسەختی بریندار بوو تا کەوتە بەر ڕوومەتی ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵی‌گرتەوە گێڕایەوە شوێنی خۆی ، لە جاران چاکترو تیژتر دەیبینی.

(عبد الرحمن)ی کوڕی (عەوف) لەو ڕۆژەدا شەڕی کرد تا ناودەمی بریندار بوو دانەکانی دواوەی شکان ، زیاتر لە بیست شوێنەوە بریندار بوو ، هەندێك لەو برینانە بەقاچیەوە بوون شەلیان کردبوو.

(مالك)ی کوڕی (سنان) باوکی (ابی سعید الخدری) خوێنی سەر ڕوومەتی پێغەمبەری خوای مژی ﷺ تاپاکی کردەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: تفی کەرەوە وتی: وەڵلاهی تفی ناکەمەوە ، پاشان چوو بۆ شەڕ کردن ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك دەیەوێت سەیری مرۆڤێکی بەهەشتی بکات ، با سەیری ئەو پیاوە بکات ، (مالك) لەو شەڕەدا شەهید کرا .

(ام عمارە) ش شەڕی کرد ، لەگەڵ چەند موسڵمانێکی تردا چوونە ڕێگەی (ابن قمئة) ، (ابن قمئة) شمشێرێکی‌دا لەشانی (ام عمارە) بەسەختی برینداری کرد، ئەویش بەشمشێرەکەی چەند شمشێرێکی‌دا لە (ابن قمئة). بەڵام ئەو دوو زنجیربەندەی پێوەبوو هیچی لێنەهات. (ام عمارە) مایەوە هەرشەڕی دەکرد تا لەدوانزە شوێندا برینداربوو.

(مصعب)ی کوڕی (عمیر) جەسوورانە شەڕی دەکرد، بەرگری دەکرد لەپێغەمبەر ﷺ دژ بەهێرشەکانی (ابن قمئة) و هاوڕێکانی ، ئاڵای موسڵمانەکانی بەدەستەوە بوو ، دایان لەدەستی ڕاستی لێ بووەوە، ئەنجا بەدەستی چەپی ئاڵاکەی گرت ، لەڕووی بێ باوەڕاندا مایەوە تادەستی چەپیشی بڕا، پاشان خۆیدا بەسەریدا، بەسنگ و ملی ئاڵاکەی گرت تا شەهید کرا ، (ابن قمئة) شەهیدی کرد ، وایدەزانی پێغەمبەری خوایە ﷺ چونکە زۆر لەو دەچوو ، خێرا (ابن قمئة) ڕای کرد بەرەو لای موشریکان و هاواری کرد : موحەممەد کوژرا [1].

---

[1] بڕوانە ( سیرة ابن هشام) ٢/٧٣ ، ٨٠ ، ٨١ ، ٨٢ ، ٨٣ ، و (زاد المعاد) ٢/ ٩٧ .

## بلاوبوونەوەی هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەر ﷺ و کاریگەریی لەسەر جەنگەکە

چەند ساتێك بەسەر ئەو هاوارەدا تێنەپەری بوو ، دەسبەجێ هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر ﷺ لەناو هەردوولادا بلاوبوەوە ، ئەمە ئەو ساتە بوو کە تیایدا ورەی هەندێك لە ئابلۆقەدراوەکان ڕووخا ، ئەوانەی دوور بوون لە پێغەمبەرەوە هێزی ئەژنۆیان شکا ، شلەژان و شپرزەیی کەوتە ڕیزەکانیان و ، پشێوی تێدا دروست بوو هاوکات ئەو هاوارە ورەو جۆشی موشریکانیشی زیاتر بەرز کردەوە شالاوەکانی زیاتر کردن .

چونکە باوەڕیان وابوو گەیشتونەتە ئامانجی خۆیان ، هەندێکی تریشیان خەریکی شێواندنی جەستەی موسڵمانە شەهیدەکان بوون.

## پێغەمبەر ﷺ بەردەوامە لەجەنگ و هەڵوێستەکەی وەرگرتەوە

کە (مصعب) شەهیدکرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئالاکەی دایە دەست (علی) کوڕی (ابی طالب) شەڕێکی ئازایانەی کرد ، هاوەڵەکانی تریش شەڕی قارەمانانەیان کردو بەرگری سەختیان دەکرد .

ئیدی پێغەمبەر ﷺ توانی ڕێگە بە سوپاکەی ببڕێت و لەو گەمارۆدانە ڕزگاریان بکات ، ڕووی تێ کردن ، (کعب)ی کوڕی (مالك) یەکەم کەس بوو ناسیەوەو بەدەنگی بەرز هاواریکرد : موسڵمانینە مژدەبێت پێغەمبەری خوا زیندووە ، ئاماژەی بۆکرد بێ دەنگ بێت ، بۆئەوەی موشریکان بەشوێنەکەی نەزانن ، بەلام دەنگەکە کەوتە بەر گوێی موسڵمانەکان و، خێراهاتن بۆلای و نزیکەی سی کەسێك دەبوون بەدەوریدا خڕبوونەوە.

پاش ئەو کۆبوونەوەیە پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە پاشەکشەیەکی ڕێك بەرەو لاپاڵی شاخەکە ، ڕێگە بڕی دەکرد بەناو موشریکە هێرش بەرەکاندا ، موشریکان هێرشەکانیان توندتر دەکرد ، بۆ ڕێگە گرتن لەو پاشەکشێیە بەلام لەبەر دەم بەرەنگاری شێرانەی سەربازانی ئیسلامدا هیچیان بۆ نەکرا .

یەکێك لە ئەسپ سوارە موشریکەکان بەناوی (عثمان)ی کوڕی (عبید الله)ی کوڕی (مغیرە) هات بەرەو ڕووی پێغەمبەرو ﷺ وتی : خوا بمکوژێت گەر بهێڵم دەربازبێت ، پێغەمبەری خوا خۆی هەستا بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بەلام ئەسپەکەی کەوتە یەکێك لە چاڵەکانەوە، ئەنجا (حارث) کوڕی (ضمّة) چوو بۆی ، شمشێرێکیدا لەقاچی ئەسپەکەی خستیە خوارەوە ، دای بەزەویداو کوشتی و شمشێرەکەی بردو گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ .

(عبدالله)ی کوڕی (جابر) کە ئەسپ سوارێکی موشریکان بوو هات بۆ (حارث)ی کوڕی (ضمّة) شمشێرێکیدا لە شانی و بریندار کرد ، موسڵمانەکان هەڵیان گرت ، بەڵام (ابو دجانە) بواری نەدایەوە هەڵی کوتایە سەر (عبدالله) و بەخۆی و پەرۆ سوورەکەی سەریەوە ، بۆی چوو شمشێرێکی لێداو سەری پەڕاند.

لەکاتی ئەم شەڕە سەختەدا ، موسڵمانان بۆ دڵ ئارام بوونەوەیان لەلایەن خواوە خەوەنوچکە دەیبردنەوە ، هەروەکو قورئانی پیرۆزیش باسی کردووە (ابو طلحة) دەڵێت : من یەکێك بووم لەوانەی لەڕۆژی ئوحوددا خەوەنوچکە دەیبردمەوە تارادەیەك چەند جارێك شمشێرەکەم لەدەست کەوتەخوارەوە دەکەوت و هەڵم دەگرتەوە، دەکەوت و هەڵم دەگرتەوە[١].

بەو قارەمانێتیە ئەو کەتیبەیە لە پاشەکشەیەکی ڕێکدا توانیان بگەنەوە لاپاڵی شاخەکەو ڕێگە بڕێکیش بکەن بۆ پاشماوەی سوپاکەیان بەرەو ئەو ڕێگە بێوەیە ، کە شاخەکەی بەپاڵەوەیە ، بەو شێوەیە زیرەکی (خالد) لەبەردەم لێهاتوویی پێغەمبەردا شکستی خوارد.

## کوژرانی ( ابی ) کوڕی ( خلف )

(ابن اسحاق) دەڵێت : کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە لاپاڵی شاخەکە ، (ابی) کوڕی (خلف)ی بەدی کردو وتی: کوا موحەممەد خوا بمکوژێت ئەگەر نەیکوژم ؟ هاوەڵان وتیان : پێغەمبەری خوا یەکێکمان بەری لێبگرین ؟ فەرمووی وازی لێ بهێنن . کە لێی نزیك بوەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕمێکی لە (حارث)ی کوڕی (ضمّة) وەرگرت ، کە لێی وەرگرت ، تەکانێکی ئەوەندە توندیدا موچڕکی دەهێنا بەجەستەدا ، ئەنجا ڕووبەڕووی وەستا ، لەنێو دەفەی شانی و زنجیر بەندەکەیەوە کونێکی بەدی کرد ڕمەکەی تێگرت ، چەقیە شوێنی خۆی و لەسەر ئەسپەکە هەڵیدایە خوارەوەو لە خۆڵەکەدا گەوزاندی ، برینەکەی گەورە نەبوو تەنها ملی ڕووشاند بوو ، خوێنی زۆری تێزا ، وتی : وەڵڵاهی موحەممەد کوشتمی ، پێیان وت: وەڵڵاهی زەندەقت چووە لە موحەممەد ، برینەکەت باش نیە ، وتی : لەکاتی خۆیدا لە مەککە پێی وتوم : من دەتکوژم[٢]. وەڵڵاهی ئەگەر تفی لێ بکردمایە دەیکوشتم ، دوژمنی خوا لەکاتی گەڕانەوەدا بەرەو مەککە لە (سرف) مرد [٣]، لە

---

[١] / صحیح البخاي ٥٨٢/١.

[٢] ئەوە لەکاتێکدا بوو لەمەککەدا کە (ابی) پێی دەگەیشت دەیوت: ئەی موحەممەد ئەسپێکم هەیە هەموو ڕۆژێك ئاڵفی زەراتی دەدەمێ ، بەو ئەسپە ڕۆژێك دەتکوژم . پێغەمبەریش دەیفەرموو : بەڵکو انشاء الله من دەتکوژم .

[٣] ابن هشام ٨٤/٢ ، (زاد المعاد) ٢/ ٩٧ .

ریوایەتەکەی (ابی اسود) لە (عروه)وە هاتووە دەڵێت : (ابی) وەکو گا دەیبۆڕاندو دەیوت : سوێند بێت ئەو ئازارەی بە منەوەیە ئەگەر بەهەموو خەڵکی (ذي المجاز) یشەوە بوایە دەمردن[١].

## (طلحة) پێغەمبەری خوا هەڵدەسێنێتەوە

لەکاتی پاشە کشە کردنی پێغەمبەردا ﷺ بەرەو شاخەکە بەردێك کەوتە بەردەمی دەستی پێوەگرت بۆ ئەوەی بڕواتە سەری ، نەیتوانی چونکە کەمێك گۆشتی گرتبوو ، دوو زنجیر بەندیشی بەستبوو ، بەسەختیش بریندارکرابوو ، (طلحة)ی کوڕی (عبدالله) چووە ژێر باڵی پیرۆزی و ، هەڵی ساندەوە تا لەسەری وەستاو ، فەرمووی : بەڕاستی (طلحة) بەهەشتی حاسڵ کرد[٢].

## دوا هێرشی موشریکان

کەپێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە بنکەی سەرکردایەتیەکەی لەبناری شاخەکەدا ، موشریکان شالاوی خۆیان دەست پێکرد بۆ دەست وەشاندنی تەواو لە موسڵمانەکان (ابن اسحاق) دەڵێت : لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا لەبناری شاخەکەدا بوو، چەند ئەسپ سوارێکی قوڕەیش کە (ابو سفیان) و(خالد)ی کوڕی (وەلید) سەرۆکایەتیان دەکرد بەشاخەکەدا هەڵدەزنان ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوایە مەهێڵە بچنە سەرمانەوە) ، ئەوەبوو (عمر)ی کوڕی (خطاب) لەگەڵ چەند پیاوێکی ئەنساریدا چوون بۆیان و بەرەو خوارەوە ڕاویان نانەوە[٣].

لە (مغازی الاموی)دا هاتووە موشریکان چوونە سەر شاخەکە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (سعد) : دووریان بخەرەوەو ـ دەیفەرموو : بەرپەرچیان بدەرەوە ـ (سعد) وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : چۆن خۆم تەنها دووریان بخەمەوە ؟ سێجار ئەمەی وتەوە (سعد) لە هەگبەکەیدا تیرێکی دەرهێناو گرتیە پیاوێکیان و کوشتی ، (سعد) دەڵێت : پاشان تیرەکەی خۆشم وەشاند بۆ یەکێکیان و کوشتم ، پاشان چووم و دەرم هێناو گرتمەوە یەکێکی تریان ئەویشم کوشت ، ئیتر لە شاخەکە هاتنە خوارەوەو دابەزین، وتم : ئەمە تیرێکی پیرۆزە، خستمەوە هەگبەکەی خۆم ، ئەو تیرە لای (سعد) مایەوە هەتا مرد، پاشان کەوتەلای کوڕەکانی[٤].

---

(١) مختصر سیره الرسول ﷺ نووسینی شێخ عەبدوڵلای نەجدی ل ٢٥ .
(٢) ابن هشام ٢/ ٨٦ .
(٣) هەمان سەرچاوە .
(٤) زاد المعاد ٢/٩٥ .

## شێواندنی جەستەی شەهیدەکان

ئەوە دواین هێرش بوو موشریکان دژ بە پێغەمبەر ﷺ کردیان ، لەکاتێکدا کە ئەوان تەواو نەیاندەزانی پێغەمبەر ﷺ چی لێ بەسەرهاتووە ، نیمچە متمانەیەکیان هەبوو لەکوشتنی ـ بۆیە گەڕانەوە بۆ بنکەکانی خۆیان ، دەستیان کرد بە خۆئامادەکردن بۆ گەڕانەوە بەرەو مەککە ، هەریەکەیان سەرقاڵ بوو بەشتێکەوە بەهەمان شێوە ژنەکانیشیان سەرقاڵی شێواندنی جەستەی شەهیدەکان بوون ، گوێ و لوت و ئەندامەکانی لەشیان دەبڕین و سکیان هەڵدەدڕین ، (هند)ی کچی (عتبە) جگەری (حمزە)ی دەرهێنا . خستیە دەمیەوە بۆی قوت نەدەدرا ، تفی کردەوە ، لە پارچە لوت و گوێی کوژراوەکان تەزبیح و ملوانکەی هۆنیبووەوە [1] .

## ڕادەی ئامادەیی پاڵەوانە موسوڵمانەکان بۆ شەڕکردن تا کۆتایی جەنگەکە

لەدوا ساتی جەنگەکەدا دوو شت ڕوویاندا، کە بەڵگەن لەسەر ڕادەی ئامادەگی پاڵەوانە موسڵمانەکان بۆ شەڕ کردن و ڕادەی بەرخۆدانیان لەپێناوی خوادا .

١. (کعب)ی کوڕی (مالك) دەڵێت : من یەکێك بووم لەوانەی دەرچووم و ڕزگارم بوو ، حاڵەتی شێواندنی موسڵمانەکانم لەلایەن موشریکانەوە بینی، خۆم پێنەگیراو گەڕامەوە ، بینیم کابرایەکی موشریك کەلوپەل کۆدەکاتەوەو بەسەر لاشەی موسڵمانەکاندا دەگوزەرێ و دەڵێت: سەری موسڵمانەکان وەك سەرەڕیێ کۆبکەنەوە ، لەو لاشەوە پیاوێکی موسڵمان چاوەڕێی دەکرد دەماخی پۆشیبوو ، بەدوایدا ڕۆشتم ، پاشان سەیری موسڵمان و کافرەکەم کرد بینیم کافرەکە لە سیماو ئامادە باشیدا چاکتر بوو ، چاوەڕێم کردن تا بەیەکگەیشتن موسوڵمانەکە یەك شمشێری لێدا کردی بەدووکەرتەوە ، ئەنجا ڕووی هەڵماڵی و پێی وتم: پێت چۆن بوو (کعب) ؟ من (ابو دجانە)م [2].

---

(١) ابن هشام ٢/ ٩٠ .

(٢) البداية والنهاية ١٧/٤ .

٢. چەند ژنە ئیمانداریَك دوای کۆتایی جەنگەکە هاتبوونە ناو گۆڕەپانی شەڕەکە ، (انس) دەڵێت (عائشە)ی کچی (ابوبکر) و (ام سلیم)م بینی ڕوویان پۆشیبوو چاوم لە خزمەتکارەنیشیان بوو شەربەی ئاویان پڕدەکردو دەیانخستە سەرشانیان دەیانکرد بەدەمی براکانیانەوە ، پاشان دەگەڕانەوە پڕیان دەکردەوە ، جارێکیتر دەهاتنەوە دەیانکردەوە بەدەمیانەوە[1] (عمر) دەڵێت : (ام سلیم) لە ڕۆژی ئوحوددا شەربەی بۆ پڕ دەکردین لە ئاو[2] ، (ام ایمن) لەناو ئەو ژنانەدا بوو کاتێك بینی هەندێ موسوڵمانی هەڵاتوو دەیانەوێت بەرەو مەدینە بڕۆن ، مشتێك خۆڵ فڕێدەدا بەرەو ڕوویان و ، پێی دەوتن : ئەوە تیرەوکەوان و ئەوە شمشێرەکانتان ، پاشان خۆی دەسبەجێ گەڕایەوە بۆ مەیدانی جەنگ ، ئاوی دەکرد بەدەمی بریندارەکانەوە ، (حبان)ی کوڕی (عرفە) تیرێکی لێدا ، کەوت و گیانی دەرکەوت ، دوژمنی خوا دەستی کرد بەپێکەنین ، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی زۆر بەلاوە ناخۆش بوو ، تیرێکی بێنووکی دایەدەست (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص)ە وە و پێی فەرموو: بیهاوێژە (سعد) تیرەکەی گرتە (حبان) و دای لە ملی، بەپشتاکەوت و گیان و عەورەتی دەرکەوت . پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە پێکەنی تا دانەخڕێکانی دواوەی دەرکەوت ، پاشان فەرمووی بەڕاستی (سعد) تۆڵەی (ام ایمن)ی کردەوەو ، دۆعاکەی گیرا کرد[3] .

## پاش گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بە لاپاڵی شاخەکە

کە پێغەمبەر ﷺلەبنکەکەی خۆی بە لاپاڵەکەوە ئارامی گرت ، (علی) کوڕی (ابو طالب) چووە دەرەوە قەڵغانەکەی پڕکرد لە ئاوی (مهراس) ، وتراویشە : بەردێکی کون بووە زۆر فراوان بووە ، وتراویشە : ناوی چاڵاوێکە لە (ئوحوددا) ، لەوێ ئاوی هێنا بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لێی بخواتەوە ، بۆنێکی ناخۆشی هەبوو نەیخواردەوە ، خوێنەکەی دەم و چاوی پێ شۆردو ئاوی کرد بەسەری خۆیداو فەرمووی : تووڕەیی خودا بەر ئەو کەسە کەوت کە دەم و چاوی پێغەمبەرەکەی بریندار کرد[4] .

---

[1] / صحيح البخاري ٤٠٣/١ ، ٥٨١/٢ .
[2] / هەمان سەرچاوە ٤٠١/١ .
[3] / السيرة الحلبية ٢٢/٢ .
[4] / ابن هشام ٨٥/٢ .

(سهل) دەڵێت : وەڵلاهی من دەزانم کێ بوو برینەکەی پێغەمبەری خوای شۆردو کێ ئاوی دەکرد بەدەستیداو بە چیش تیمارکرا؟ (فاطمە)ی کچی شۆردی (علی) کوڕی (ابی طالب)یش بەقەڵغانەکە ئاوی دەکرد بەدەستیدا کە (فاطمە) بینی ئاوەکە خوێنەکە لانابات و زیاتری دەکات پارچە حەسیرێکی هێناو سوتاندی و نوساندی بەبرینەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەنجا خوێنەکە وەستایەوە[1].

(محمد)ی کوڕی (مسلمە) ئاوێکی پاك و سازگاری هێنا ، پێغەمبەری خوا ﷺ تێری لێخواردەوەو نزای خێری بۆ کرد[2]، نوێژی نیوەڕۆشی لەبەرسەختی برینەکەی بەدانیشتنانەوە کردو موسڵمانەکانیش هەر بەدانیشتنەوە نوێژیان لەدوایەوە دابەست[3].

## خۆشحاڵبوونی (ابو سفیان) دوای جەنگەکەو قسەکردنی لەگەڵ (عمر)دا

کە موشریکەکان خۆیان سازدا بۆ گەڕانەوە ، (ابو سفیان) هات بەرەو شاخەکە ، بانگی کرد : ئایا (محمد) تان لەناودایە ؟ وەڵامیان نەدایەوە . وتی: ئەی (ابی قحافە) تان لەگەڵدایە ؟ وەڵامیان نەدایەوە ، وتی: ئەی (عمر)ی کوڕی (خطاب) تان لەناودایە ؟ وەڵامیان نەدایەوە - پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەهێشت وەڵامی بدەنەوە ئەنجا (ابو سفیان) وتی : ئەوانەمان لەناو برد ،

(عمر) خۆی پێڕانەگیراو وتی: دوژمنی خوا ناوی هەرکەسێکت برد هەموویان زیندوون ، خوا هێشتوونی بۆ داخی دڵی تۆ ،

(ابو سفیان) وتی: لاشەکانی ئێوەیان شێواندوە من فەرمانم پێنەداون پێشم ناخۆش نەبووە.

پاشان وتی: بەرز بێت (هبل)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەرێ وەڵامی نادەنەوە ؟ وتیان: چی بڵێین ؟ فەرمووی: بڵێن : خودا گەورەترو بڵند ترە.

پاشان (ابو سفیان) وتی : ئێمە (عزی) مان هەیە و ئێوە نیتانە.

---

[1] / صحيح البخاري ٢/ ٥٨٤/٢ .
[2] / السيرة الحلبية ٣٠/٢ .
[3] / ابن هشام ٢/ ٨٧ .

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ئایا وەڵامی نادەنەوە ؟ وتیان : چی بڵێین ؟ فەرمووی : بڵێن : خوا خاوەنمانەو ئێوە خاوەنتان نیە.

(ابو سفیان) وتی : لە نازونیعمەتداین و ئەوەمان زۆرباشە ، ئەم ڕۆژە بەڕۆژەکەی بەدر ، جەنگیش سەر بەسەرە ، (عمر) وەڵامی دایەوەو ، فەرمووی : هیچ وەکو یەك نین ، کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدان، کوژراوەکانی ئێوەش لە دۆزەخدان.

پاشان (ابو سفیان) وتی : ئەرێ (عمر) گوێم بۆ ڕابگرە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە (عمر) : بڕۆ بزانە چی دەڵێت ؟

(عمر) هات بۆلای (ابو سفیان) ، (ابو سفیان) پێی وت : ئەی (عمر) سوێندت دەدەم بە خوا ، ئەرێ موحەممەدمان کوشتوە یان نەء؟ (عمر) فەرمووی : سوێندم بەخوا ، نەخێر ، ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە قسەکانتە ، (ابو سفیان) وتی : بەڕاستی بەلای منەوە تۆ ڕاستگۆترو چاکتری تا (ابن قمئە)[1].

## بەڵێنی بەیەکگەیشتنەوە لە بەدردا

ابن اسحاق دەڵێت: کە (ابو سفیان) و پیاوەکانی دەوروبەری بڵاوەیان لێکرد بانگی کردە موسڵمانەکان و وتی: وادەمان ساڵی داهاتوو دەبێت لە بەدردا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەیەکێك لەهاوەڵەکانی ، بڵێ : باشە ، ئەوە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا وادەیە[2].

## دڵنیابوون لە هەڵوێستی موشریکەکان

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ (علی) کوڕی (ابی طالب)ی ناردو پێی فەرموو : دوا بەدوایان بڕۆ بزانە بەنیازی چین ؟ چی دەکەن ؟ ئەگەر سواری وشترەکانیان بوون و وازیان لە ئەسپەکانیان هێنا ئەوە بەرەو مەککە دەڕۆن ... خۆ ئەگەر سواری ئەسپەکانیان بوون و وشترەکانیان دایەبەر ئەوە بۆ مەدینە دەڕۆن ، سوێندم بەخوا ئەگەر بەرەو مەدینە بڕۆن ئەوا بەدوایاندا دەڕۆم و ، شەڕیان لەگەڵدا دەکەم ، (علی) دەفەرمووێت: بەدوایاندا دەرچووم و سەیرم کرد بزانم چی دەکەن ، ئەوەبوو لە ئەسپەکانیان دابەزین و سواری وشترەکانیان بوون و ، ڕوەو مەککە گەڕانەوە[3] .

---

[1] / ابن هشام /٩٣ ، ٩٤ ، زاد المعاد ٢/٩٤ ، صحيح البخاری ٢/٥٧٩ .

[2] ابن هشام ٢/٩٤ .

[3] / ابن هشام ٢/٩٤ ، له (فتح الباری) يشدا هاتوه ، ئەو کەسەی بەدوای موشریکەکاندا چوو (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) ە ، (٧/٣٤٧) .

## گەڕان بەدوای شەهیدو بریندارەکـاندا

پاش بڵاوە لێکردنی قورەیش موسڵمانەکان کەوتنە گەڕان بەدوای شەهیدو بریندارەکاندا ، (زید)ی کوڕی (ثابت) دەڵێت : لەڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی تا بگەڕێم بەشوێن (سعد)ی کوڕی (ربیع)دا پێی فەرمووم : ئەگەر بینیت سلاَوی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوت لێدەکات و دەڵێت : حاڵی چۆنە ؟ (زید) دەڵێت : لەناو کوژراو بریندارەکاندا دەگەڕام ، بینیم کەوتوەو لەدوا ساتەکانی هەناسەیدایە ، زیاتر لە حەفتا برینی پێوەیە ، لەنێوان لێدانی ڕم و شمشێرو ، تیردا ، وتم : (سعد) پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوت لێدەکات و پێت دەڵێت : حاڵت چۆنە ؟ وتی : سڵاو لەپێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم ، عەرزی بکە : پێغەمبەری خوا هەست بەبۆنی بەهەشت دەکەم ، بڵێ: بەخزمانی ئەنساریشم: ئەمڕۆ لەبەردەم خوادا هیچ بیانویەکتان نیە ئەگەر دەستی دوژمن بگاتە پێغەمبەرو ئێوەش بە بەرچاوەوە بن ، ئەمەی وت و گیانی پاکی سپارد[1].

لەنێو بریندارەکاندا (اصیرم) - (عمرو)ی کوڕی (ثابت)یشیان بینی نوزەیەکی تێدامابوو ، ئەم پیاوە پێشتر باسی ئیسلامیان بۆ دەکرد پشتی هەڵدەکرد، دەیانوت: ئەم (اصیرم)ە چی هێناویەتی بۆ شەڕ ؟ کە ئێمە بەجێمان هێشت حەزی بەم کارە نەبوو ، پاشان پرسیاریان لێکرد : چی تۆی هێناوە ؟ ئایا بۆ خێڵگەرایەتی هاتوویت ، یان بۆ بەگری لە ئیسلام ؟ وتی : بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام هاتووم، باوەڕم هێنا بەخوداو پێغەمبەرەکەی و ، پاشان بەپاڵ پێغەمبەرەوە ﷺ دەجەنگام ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەو پیاوە خەڵکی بەهەشتە ، (ابو هریرە) دەڵێت : ئەم پیاوە فریای یەك نوێژ نەکەوت بیکات بۆ خوا[2].

هەر لەناو بریندارەکاندا (قزمان) یان بینی - وەك پاڵەوان لە شەڕەکەدا دەجەنگا ، بەتەنها خۆی ، حەوت تاهەشت موشریکی کوشت - بینیان برینە سەختەکانی خستویانە ، هەڵیانگرت و بردیانە ماڵی (بني ظفر) ، موسڵمانەکان مژدەیان دەدایە ، (قزمان) وتی : وەڵڵاهی تەنها بۆ خێڵەکەم ئەمەم کردووە ، ئەگەر ئەوە نەبوایە هەرگیز شەڕم نەدەکرد ، کە برینەکەی زۆری بۆ هێنا خۆی کوشت .

---

(١) زاد المعاد ٩٦/٢ .

(٢) هەمان سەرچاوە ٩٤/٢ ، ابن هشام ٩٠/٢ .

که باسی ئەم پیاوە بکرایە لای پێغەمبەری خوادا ﷺ دەیفەرموو : خەڵکی دۆزەخە[1] . ئەمە چارەنووسی هەرکەسێکە لەپێناوی خوادا نەجەنگێت - با لەژێر ئاڵای ئیسلام و لەناو سوپاکەی پێغەمبەری خواداو هاوەڵانیشدا شەڕ بکات.

بەپێچەوانەی ئەوەشەوە لەناو کوژراوەکاندا پیاوێکی تێدابوو لە جولەکەی (بني ثعلبة) بوو ، ئەم پیاوە وتبوی بە جولەکە خزمەکانی : ئەی خێڵی جولەکە وەڵلاهی ئێوە دەزانن کە سەرکەوتنی موحەممەد بەسەر ئێوەدا بەهەق بوو ، پێیان وتبوو : ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە ، پێی وتبوون : خوا شەممەکەشتان بېڕێت ، ئەنجا شمشێری هەڵگرتبوو تاقمی لەخۆ بەستبوو ، وتبووی : ئەگەر کوژرام ماڵەکەم بۆ موحەممەدە ، چی لێدەکات بابیکات ، ئیتر لەگەڵ سوپای موسڵماناندا دەرچوو ، شەڕی کرد تاکوژرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرمووی : (مخيريق - کە ناوی جولەکەکەیە) باشترین کەسی جولەکە بوو[2] .

## کۆکـردنەوەی شەهیدەکان و ئەسپەردەکردنیان

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر شەهیدەکان و فەرمووی : من شایەتم بەسەر ئەم شەهیدانەوە ، هیچ کەسێك بریندار نابێت لەپێناوی خوادا ، مەگەر خودا لە ڕۆژی دواییدا زیندووی دەکاتەوە ، خوێن لە برینەکەی دەچۆڕێت ڕەنگەکەشی ڕەنگی خوێنە ، بۆنەکەشی بۆنی (میسك) ە[3] .

هەندێك لە هاوەڵان ویستیان شەهیدەکانیان بگوازنەوە بۆ مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی‌دا بیانگێڕنەوە لەوێدا بیاننێژن کە شەهید کراون ، نە شۆرێن ، هەر بەو شێوەیە پاش لابردنی تاقم و زنجیربەستەکانیان بە جلەکانیانەوە بیاننێژن ، دوان و سیانی دەخستە یەك گۆڕەوە ، دوو شەهیدی دەخستە یەك جلەوەو ، دەیفەرموو : کامەیان قورئانی زیاتری لەبەربوو ؟ ئەگەر ئاماژەیان بکردایە بۆ هەرکەسێکیان لە گۆڕیچکەکەدا ئەوەیانی پێش دەخست دەیفەرموو : خوایە من شایەتم لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر ئەمانەوە ، (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (حرام) و (عمرو)ی کوڕی (جموح)ی لەیەك گۆڕدا ناشت بەهۆی ئەو خۆشەویستیەوە کە لە نێوانیاندا هەبوو[4] .

---

[1] / هەمان سەرچاوەی یەکەم ٢/٩٧، ٩٨ ابن هشام ٢/٨٨ .

[2] / ابن هشام ٢/٨٨ ، ٨٩ .

[3] / هەمان سەرچاوە ٢/ ٩٨ .

[4] / زاد المعاد ٢/٩٨ ، صحيح البخاری ٢/٥٨٤ .

لاشەکەی (حنظلة) یان بۆ نەدەدۆزرایەوە ، بەدوایدا گەڕان ، لەشوێنێکی بەرزدا بینیان کەوتوەو ئاوی لێدەچۆڕێت ، هەواڵ درا بەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەهاوەڵان ئەوە فریشتەکانن دەیشۆرن ، پاشان فەرمووی : پرسیار بکەن لەخێزانی بزانن چی‌یە ؟ پرسیاریان کرد لەخێزانی ، هەواڵی پێدان ، لێرەوە (حنظلة) ناونرا فریشتە شۆر (غسیل الملائكه).

کاتێك پێغەمبەر ﷺ حاڵی (حمزة)ی مامی بینی چی لێ هاتبوو - کە مامیەتی و برای شیریشیەتی - زۆر بێتاقەت بوو ، (صفیة)ی پوری کە خوشکی (حمزة)یە ویستی براکەی ببینێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە (زبیر)ی کوڕی ، بە (صفیة) بڵێ با بڕوات ، بابراکەی بەو شێوەیە نەبینێت ، (صفیة) وتی : بۆچی ؟ هەواڵم پیێگەیشتوە کە لاشەی براکەمیان شێواندوە ، ئەوە لەپێناوی خوادایە ، ئێمە ڕازین کە لەبەر خوا ئەوەمان بەسەردا هاتوە ، ئارام دەگرم و چاوەڕوانی پاداشتم لەخوا ، پاشان هاتە سەری ، تێر سەیری کرد ، نوێژی لەسەر کردو ، دۆعای خێری بۆ کرد - وتی (انا لله وانا الیه راجعون) و داوای لێبوردنی لەخوا بۆ کرد - پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی‌دا لەگەڵ (عبدالله)ی کوڕی (جحش)دا - کە خوشکەزاو برای شیریی بوو ئەسپەردە بکرێت.

(ابن مسعود) دەڵێت : هەرگیز پێغەمبەرمان نەدیوە ﷺ ئەوەندە بەکوڵ بگری بەئەندازەی ئەو ڕۆژەی کە بۆ (حمزة) ی کوڕی (عبد المطلب) گریا ، ئەنجا ڕوی کردە قیبلە و ، پاشان لەسەر تەرمەکەی وەستا ، دەستی کرد بەگریان و دەنگی لێ بەرز بوەوە فرمێسك بارانی کرد [1] .

بەڕاستی دیمەنی شەهیدەکان خەمناك و دڵتەزێن بوو ، (خباب) دەڵێت: (حمزة) کفنی نەبوو، بوردەیەکی گوڵەنگ سپی نەبێت ، کەدەدرا بەسەریدا قاچی دەردەکەوت ، کە دەدرا بەسەر قاچیدا سەری دەردەکەوت ، تادرا بەسەریداو قاچەکانیشی بە گەڵای (اذخر) داپۆشرا - گەڵایەکی سەوزی بۆن خۆشە [2] .

(عبد الرحمن) کوڕی (عوف) دەڵێت : (مصعب)ی کوڕی (عمیر) شەهید کرا ، ئەو لە من باشتر بوو ، لە بوردەیەکدا کفن پۆشکرا ، کە سەری پێدادەپۆشرا قاچەکانی دەردەکەوت . کە قاچەکانیان دادەپۆشی سەری دەردەکەوت ، (خباب) یش هەمان شتی گێڕاوەتەوەو ، ئەوەشی تێداهاتوە : پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرموو : بەو بوردەیە سەری داپۆشن و قاچەکانیشی بە گەڵای (اذخر)[3] .

---

( ١) (ابن شاذان) ریوایەتی کردوە، بڕوانە (مختصر سیرە الرسول ﷺ نوسینی شێخ عەبدوڵلای نەجدی ل٥٥ .

(٢) ( احمد ) ریوایەتی کردوە ، مشکاە المصابیح ١/ ١٤٠.

(٣) (صحیح البخاری) ٢/٥٧٩ ، ٥٨٤ .

## پێغەمبەر ﷺ وەسف و سەنای خوا دەکات و دەپاڕێتەوە

ئیمامی ئەحمەد گێڕاویێتیەوە ، لە ڕۆژی ئوحوددا کە موشریکان گەڕانەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە ئیمانداران : ریز بن هەتا وەسف و سەنایەکی خودای خۆم بکەم ، هەموویان بەچەند ریزێك لە پشتیەوە وەستان . فەرمووی :

(خوایە سوپاسی تۆ دەکەم ، خوایە هەر تۆ دەست دەگریتەوە لەوەی والآت کردوە، والآشی دەکەیت بۆئەوەی گرتووتە ، سەر لەهەرکەسێك بشێوێنیت تازە هیدایەت نادرێت ، گومڕاش نابێت ئەو کەسەی تۆ ڕێنومایی بکەیت ، بەری ناکەوێت ئەو کەسەی تۆ لێی قەدەغە بکەیت ، کەس ناتوانێت ڕێگە بگرێت لەشتێك تۆ بیبەخشیت ، نزیککەرەوە نیە بۆ هەرچیەك تۆ دووری بخەیتەوە ، دوور خەرەوەش نیە بۆ هەرچیەك تۆ بتەوێت نزیکی بخەیتەوە ، خوایە : بەرەکەت و بەزەیی و چاکە و ڕۆزی خۆتمان بەسەردا ببارێنە)).

((خوایە داوای بەهەشتی (نعیم)ی (مقیم)ت لێ دەکەم ، ئەو نیعمەتەی لاناچێت و فەنا نابێت، خوایە: داوای کۆمەکیت لێدەکەم لە ڕۆژی لێقەوماندا ، داوای هێمنایەتیت لێ دەکەم لە ترس و دڵەڕاوکێدا ، خوایە : من پەنادەگرم بەزاتی خۆت لەخراپەی ئەو شتەی پێت داوین یان خراپەی ئەوەی لێت قەدەغە کردووین ، خوایە : ئیمانمان لەلا خۆشەویست بکەو لەدڵەکانماندا بیڕازێنەرەوە ، کوفرو لەسنوور دەرچوون و یاخی بوونیشمان لەلا ناشیرین بکەو، ڕێنوینیمان بکە، خوایە بەموسڵمانی بمانمرێنە، بە موسڵمانی بمانژێنە، بمانگەیەنە بەساڵحان با سەرشۆڕو سەرلێشێواونەبین ، خوایە: ئەی لەناوبەری ئەو کافرانەی پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخەنەوەو، ڕێگە دەگرن لە ڕێبازەکەی تۆ ، خوایە سزاو خەشمی خۆتیان بەسەردا ببارێنە ، خوایە بکوژی کافران ئەوانەی ئەهلی کیتابن ، ئەی خوای هەق و ڕاستی ، نزامان قەبوڵ بفەرموو)

## گەڕانەوە بۆ مەدینە و هەڵوێستی پڕ لە خۆشەویستی و بۆ خوا بوون

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەسپەردەکردنی شەهیدەکان و وەسف و سەنای خودا بووەوە گەڕایەوە بەرەو مەدینەو ، لەوێدا هەڵوێستە جوانەکانی خۆشەویستی و گیانفیدایی لە ئافرەتە ئیماندارەکانەوە دەرکەوت ، هەروەکو لە پیاوە ئیماندارەکانیشدا لەکاتی شەڕەکەدا دەرکەوت .

له ڕێگەدا (حمنة) کچی (جحش)ی پێگەیشت ، سەرە خۆشی لێکرا بە بۆنەی شەهید بوونی (عبدالله)ی کوڕی (جحش)ی برایەوە ، وتی: ( انا لله وانا اليه راجعون) و داوای لێخۆشبوونی بۆکرد، پاشان سەرەخۆشیان لێکرد بەهۆی شەهیدبوونی (حمزة)ی خاڵیەوە ، هەمان شتی کرد، پاشان سەرەخۆشیان لێکرد بەهۆی شەهیدبوونی (مصعب) ی مێردیەوە ، ئەنجا هاواری کرد هەلهەلەی کێشا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هاوسەری ئەم ژنە لە شوێنێکی زۆر باشدایە[1].

بەلای ژنێکی تریشدا تێپەڕین لەخێڵی (بنی دینار) بوو ، لە ڕۆژی ئوحوددا مێردەکەی و براکەی و باوکی شەهید بووبوون ، کە سەرەخۆشیان لێکرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حاڵی چۆنە ؟ وتیان : حاڵی باشە (دایکی فلأنە کەش) ، سوپاس بۆ خوا بەو شێوەیە کە تۆ پێت خۆشە ، وتی :پیشانم بدەن باخۆم ببینم ، نیشانیاندا ، کە بینی ئەنجا وتی : هەموو کارەساتێك دوای تۆ ئاسانە[2] .

دایکی (سعد)ی کوڕی (معاذ)یش بە ڕاکردن دەهات ، لەو کاتەدا (سعد) جڵەوی ئەسپەکەی گرتبوو، وتی بەپێغەمبەر ﷺ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە دایکمە ، فەرمووی : مەرحەبای لێ بێت ، بۆی وەستا ، کەنزیك بوەوە سەرە خۆشی لێکرد بەهۆی شەهید بوونی (عمرو)ی کوڕیەوە ، دایکی (سعد) وتی : ئەوەندە خەمم بوو کە تۆم بینی ، ئیتر هەربەلأیەك بێت ئاسانە ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نزای کرد بۆ کەسوکاری شەهیدانی (ئوحود)و فەرمووی: دایکی (سعد) مژدەت لێبێت و مژدە بدە بە کەسوکاریان، دایکی (سعد) وتی: پێغەمبەری خوا ئێمە ڕەزامەندین، کێ دوای ئەم مژدە خۆشە بۆ مردووی خۆی دەگری ؟ پاشان وتی : پێغەمبەری خوا ، نزایش بکە بۆ ئەوانەی دوای ئەوان ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : خوایە خەمی دڵەکانیان مەهێڵەو کارەساتەکەیان بۆ قەرەبوو بفەرموو ، ئەوانەی دواوەش چاك و خێردار بکە[3].

---

[1] ابن هشام ٢/٩٨ .
[2] هەمان سەرچاوە ٢/ ٩٩ .
[3] السيرة الحلبية ٢/٤٧ .

## پێغەمبــەری خوا ﷺ دەگاتەوە مەدینە

پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوارەی ئەو ڕۆژە ، ڕۆژی شەممەی حەوتی مانگی شەوالی ساڵی سێی کۆچی گەیشتەوە مەدینە ، کە چووەماڵەوە شمشێرەکەی دا بەدەست (فاطمة)ی کچی‌یەوە ، فەرمووی : ((کچم ئەو شمشێرە بشۆ باخوێنەکەی پێوە نەمێنێت ، وەڵڵاهی باش بەدەستمەوە هات)) ، هەروەها (علی)ی کوڕی (ابی طالب)یش فەرمووی : ئەم شمشێرەی منیش بشۆ ، بەڕاستی لەگەڵمدا ڕاستگۆ بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ڕاستە تۆ ڕاستگۆ بوویت لەو شەڕەدا ، بەڕاستی (سهل)ی کوڕی (حنیف) و (ابو دجانە) ش ڕاستگۆ بوون [1] .

## ژمارەی کوژراوەکــانی هەردوولا

زۆرینەی سەرچاوەکان لەسەرئەوە ڕێکن کەکوژراوی موسڵمانەکان (٧٠) کەس بووەو ، زۆرینەیان لە ئەنسارەکان بوون ، شەست و پێنج پیاویان لێ شەهید کرا ، چل و یەك کەسیان لە خەزرەج و بیست و چواریان لە خێڵی ئەوس ، جولەکەیەکیش کوژرا ، لەکۆچکەرانیش تەنها چوار پیاو شەهید بوون .

سەبارەت بەکوژراوی موشریکان ، (ابن اسحاق) دەڵێت : بیست و دوو کەسن ، بەڵام پاش ئەنجامدانی ئامارێکی وردو وورد بونەوەیەکی تەواو لەسەر درێژەی شەڕەکەو باسی (مغازی)نووس و (اثر)ناسەکان ، کەئاماژە دەکەن بۆ ژمارەی کوژراوەکانی موشریکەکان لەهەموو قۆناغەکانی شەڕدا، ئەوە دەگەیەنێت ژمارەی کوژراوەکانی موشریکەکان لەجەنگی ئوحوددا سی و حەوت کەسن نەك بیست و دوو، (والله اعلم) [2] .

## حاڵەتی نائاسایی لەناو مەدینەدا

شەوی یەك شەممە ، هەشتی شەوالی ساڵی سێ‌ی کۆچی ، موسڵمانەکان لەناو مەدینەدا بەشێوەیەکی نائاسایی ڕۆژیان کردەوە ، ماندوێتی تەواو شەکەتی کردبوون ، بەو شەکەتی و ماندوێتی‌یە ڕێگا دەرەکیەکانی شاری مەدینەیان لە دەرەوە گرتبوو بەتایبەتی پاسەوانێتی پێغەمبەری سەرکردەیان دەکرد ﷺ ، گومان و دڵەڕاوکێیان بوو، نەبادا موشریکەکان لەپڕێکدا بدەن بەسەر شاری مەدینەدا .

---

[1] / ابن هشام ٢/١٠٠ .

[2] / سەیرکە (سیرة ابن هشام) ١٢٢/٢ ، ١٢٤ ، ١٢٥ ، ١٢٦ ، ١٢٧ ، ١٢٨ ، ١٢٩ ، هەروەها (فتح الباري) ٣٥١/٧ و غەزای (احد) نوسینی (محمد احمد باشمیل) ل ٢٧٨ ، ٢٧٩ ، ٢٨٠.

## غەزای ( حمـراء الأسـد )

پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لە ڕەوشەکە دەکردەوە ، لەوە دەترسا کە موشریکان بیر لەوە بکەنەوە کە ئەوان سوودێکی ئەوتۆیان لەو سەرکەوتنە نەبینی کە لەمەیدانی شەڕدا بەدەستیان هێناو لەوانەیە پەشیمان ببنەوەو جارێکی دی بگەڕێنەوەو بدەن بەسەر شاری مەدینەدا ، بۆیە بڕیاریدا پرۆسەی ڕاوەدونانی سوپای مەککە دەست پێ بکات .

(مغازی) نووسان دەڵێن : پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵکیدا جاڕیداو ، هانیدان بۆ ڕۆشتن بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن ، ئەمەش لەبەیانی ڕۆژی دوای جەنگی ئوحوددا بوو، واتە لەڕۆژی هەشتی مانگی شەوالی ساڵی سێ‌ی کۆچیدا ، فەرمووی : تەنها ئەو کەسانەمان لەگەڵدا دەرچن کە پێریێ بەشداری شەڕیان کردبوو ، (عبدالله)ی کوڕی (ابی) وتی : بێم لەگەڵت ؟ فەرمووی : نەخێر ، موسڵمانەکانیش لەگەڵ ئەوەدا برینداریێکی زۆریان هەبوو، لەترس و دڵەڕاوکێدا بوون ، هاتن بەدەمیەوە ، وتیان: بەسەرچاوان پێغەمبەری خوا ، (جابر)ی کوڕی (عبدالله)ش داوای مۆڵەتی کرد، وتی: پێغەمبەری خوا، پێم خۆشە لەهەموو ڕووداوو هەڵوێستەکاندا لە خزمەتتدا بم ، ئەو ڕۆژە باوکم بەلای کچەکانەوە بەجێی هێشتم ، مۆڵەتم بدە ، با لەخزمەتتدا بێم ، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان ڕۆشتن ، تاگەیشتنە (حمراء الاسد) ، کە (هەشت میل) لە مەدینەوە دوورە ، لەوێدا سەربازگەیان دانا.

لەوێدا (معبد)ی کوڕی (ابی معبد الخزاعی) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوو ، دەشڵێن : لەسەر بت پەرستی مابووەوە ، بەڵام دڵسۆز بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو هاوپەیمانێتیەوە کە لەنێوان (خزاعە) و (بنی هاشم)دا هەبوو ، وتی : ئەی موحەممەد ، بەڕاستی زۆرمان پێ‌ناخۆش بوو ، ئەو کارەساتە هات بەسەر تۆو هاوەڵەکانتدا ، دەخوازین کە خوا شیفات بدات ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : کە بڕوات (ابو سفیان) بەچە ترسێن بکات.

ئەو ترسەی پێغەمبەر ﷺ هەیبوو لە گەڕانەوەی موشریکان جارێکی‌تر بۆ مەدینە ڕاست دەرچوو ، سوپای موشریکان کاتێك لە (روحاء) دادەبەزن ، کە (سی و شەش میل) لەمەدینەوە دوورە، دەکەونە سەرزەنشت کردنی یەکتری ،

هەندێکیان بەوانی تریان دەڵێن : هیچتان نەکرد ، تەنها سامی ئەوانتان شکاند ، پاشان وازتان هێنا لە سەرە گەورەکانیان ، دەتوانن خۆیان کۆکەنەوە بۆتان ، بگەڕێنەوە با لەڕیشەوە دەریان بکێشین .

پێ دەچێت ئەم ڕایە سادە بوو بێت ، چونکە بێئاگا بووە لەهێزو توانای هەردوولا ، لەبەرئەوە لێپرسراوێکیان کە (صفوان)ی کوڕی (امیه)یە وتی : خەڵکینە شتی وانەکەن ، لەوە دەترسم ئەوانەش کە دەرنەچووبوون بۆ شەڕ ئەمجارە ئەوانیش بێنە دەرەوە ، بگەڕێنەوە ئەوە بردنەوەی ئەمجارە بۆ ئێوە بوو ، دڵنیانیم لەوەی ئەگەر بگەڕێنەوە سەربکەون ، بەلاّم پێش ئەوەی (ابو سفیان) لە بنکەکەی خۆی بجوڵێت (معبد)ی کوڕی (ابی معبد) گەیشتە سەری ، (ابو سفیان) ئەوکاتە نەیدەزانی کە موسڵمان بووە ، پێی وت : هەواڵی چیت پێیە ؟ (معبد) یش کە جەنگێکی دەروونی سەختی کرد لەگەڵ (ابو سفیان)دا وتی: موحەممەدو هاوەڵەکانی بە ژمارەیەکی زۆرەوە کە هەرگیز نەمدیوە بۆتان هاتوون ، داخیان لەدڵدایە بۆ شەڕکردن لەگەڵتاندا ، ئەوانەش کە ئەو ڕۆژە لەگەڵی نەچوو بوون ئەمڕۆ لەگەڵی هاتوونەتە دەرەوە بۆتان ، پەشیمانن لەوەی کە بەشداریان نەکردوە ، ئەوەندە ڕق ئەستوورن بەرامبەرتان شتی وەهام نەدیوە.

(ابوسفیان) وتی : دایك و ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ، ئەوەچی دەڵێت ؟ (معبد) وتی: وەڵلاهی حەزدەکەم پێش ئەوەی بڕۆیت سەیرێکی پێش و پاشی سوارەکان بکەیت ، یان لەپشتی ئەوگردەوە سەیرێکی پێشەنگی ئەسپەکانی بکەیت.(ابو سفیان) وتی: سوێند بێت ئێستا خۆمان کۆکردۆتەوە تا لە ڕەگ و ڕیشەوە دەریان بهێنین . (معبد) وتی : شتی وانەکەیت ، من بۆ تۆمە.

ئیدی لەوێدا سوپای مەککە ورەی ڕووخا ، ترس و بیمیان لێ نیشت ، کەوتنە سەر ئەوەی بەخێرایی بگەڕێنەوە بۆ مەککە ، بەلاّم (ابو سفیان) هەستا بەجەنگێکی پڕوپاگەندەیی دوژمنکارانەو دژ بەسوپای ئیسلامی ، سابەڵکو سوپای ئیسلام وازێ بکات شوێنیان نەکەون ، بێگومانیش کە خۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوە لادەدا ، ئەوەبوو کاروانێکی (عبد القس) بەرەو مەدینە دەڕۆیشت ، پێی وتن : دەکرێت ئەم قسەیەم بگەیەنن بەموحەممەد؟ ئەگەر ئەمەتان کرد ، کە هاتن بۆ مەککە ، لە(عکاظ) کاروانەکەتان بۆ باردەکەم لە شەرابی (زبیب) ؟ وتیان : بەڵێ ، باشە.

وتی : بڵێن بە موحەممەد ، کە ئێمە خۆمان کۆکردۆتەوە بۆیان ، بۆ ئەوەی ڕەگ و ڕیشەی خۆی و هاوڵەکانی لەبن دەرکێشین.

کاروانەکە بەلای پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانیدا گوزەران ، لەکاتێکدا کە لە (حمراء الاسد) بوون ، ئەو قسانەیان پێ وتن کە (ابو سفیان) پێی وتبوون ، وتیان : خەڵکی بۆتان کۆبوونەتەوە ، خۆتان لادەن ، ئەم قسەیە ئیمانی موسڵمانەکانی زیاتر کردو ، وتیان : ﴿ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴾ آل عمران : ١٧٣- ١٧٤.

پێغەمبەری خوا ﷺ پاش هاتنی بۆ ئەو شوێنە (حمراء الاسد) لە ڕۆژی یەك شەممەدا ڕۆژانی دووشەممەو سێ شەممەو چوارشەممەش مایەوە واتە (٩- ١٠- ١١)ی مانگی شەوالی سێی کۆچی ، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە ، پێش گەڕانەوە بۆ مەدینە (ابا عزە)ی (جحمی) یان گرت ـ ئەمە ئەو پیاوە بوو کە لە ڕۆژی بەدردا گیراو ، بەهۆی هەژاریی و زۆریی کچەکانییەوە بەبێ بەرامبەر بەڕەڵا کرابوو ، بەمەرجێك دوژمنایەتی موسڵمانەکان نەکات ، کەچی پەشیمان بوبوەوە و خیانەتی لە پێغەمبەر کرد ﷺ ، بە شیعر خوێندنەوە هانی خەڵکی دەدا دژ بەموسڵمانەکان هەروەکو پێشتریش باسمان کرد ، لەجەنگی ئوحودیشدا لەگەڵ موشریکاندا چووە دەرەوە بۆ شەڕی موسڵمانەکان ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتی ، وتی: موحەممەد بەرەڵڵام بکەو ، مەمکوژە لەبەر خاتری کچەکانم ، پەیمانت دەدەمێ کە جارێکی‌تر شتی لەو شێوەیە نەکەم ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەرت نادەم بڕۆیتەوە بۆ مەککەو شان ڕاوەشێنێت و بڵێت : دووجار موحەممەدم فریودا ، هەرگیز نابێت مرۆڤی ئیماندار دووجار لەکونێکدا بگەزرێت ، پاشان فەرمانیدا بە (زبیر) یان (عاصم)ی کوڕی ( ثابت) و کوشتیان.

هەروەها فەرمانی کوشتنی‌دا بەسەر سیخوڕێکی مەککەدا ، کە (معاویە)ی کوڕی (مغیرە)ی کوڕی (ابی العاص) بوو ، کە دەکاتە باپیرەی (عبد الملك)ی کوڕی (مروان) لەسەری دایکیەوە ، ئەمەیش لەکاتێکدا بوو کە ڕۆژی (ئوحود) موشریکان دەگەڕانەوە بۆ مەککە ، ئەم کابرایە هات بۆلای (عثمان) کوڕی (عفان)ی ئامۆزای (ڕ) ، (عثمان) لە پێغەمبەری خوا پەنابەری بۆ وەرگرت ، بەمەرجێك ئەگەر دوای سێ ڕۆژ بینرا لەناو ببرێت ، کە شاری مەدینە سوپای ئیسلامی تێدا نەما ، ئەم کابرایە

هەرمایەوە ، لەوێ سیخوڕی دەکرد بۆ قوڕەیش و زیاتر لە سێ ڕۆژەکەشی بەسەردا چوو کە سوپاکە گەڕایەوە بۆ مەدینە ، (معاویە) ڕای کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بە (زید)ی کوڕی (حارثة) و (عمار)ی کوڕی (یاسر) شوێنی بکەون ، ئەوانیش شوێنی کەوتن گرتیان و کوشتیان [1].

گومانیشی تێدایە نیە کە غەزای (حمراء الاسد) غەزایەکی سەربەخۆ نیە ، بەڵکو بەشێکە لەغەزای ئوحودو تەواوکەریەتی و لاپەڕەیەك لەلاپەڕەکانی ئەو جەنگە.

ئەوە جەنگی ئوحود بوو بەدووری درێژی و هەموو قۆناغەکانیەوە ، توێژەرەوانیش چەندین جار بەدوای دوا چارەنووسی ئەو جەنگەدا چوون ، کە ئایا شکست بوە یان نەء؟ ئەوەش کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە سەرکەوتنی سەربازیی بۆ موشریکان بوو ، کۆنترۆڵی تەواوی مەیدانی شەڕەکەشیان کرد ، زیانی گیانی ناو موسڵمانەکانیش زۆرترو گەورەتر بوون ، هەندێك لە ئیماندارانیش بەتەواوەتی شکستیان هێناو ، دەورانی شەڕ لە بەرژەوەندی سوپای مەککە بوو ، بەڵام هەندێك خاڵ هەیە وامان لێدەکات ، ئەو سەرکەوتنە ناو نەنێین (نصر) یان (فتح).

گومانی تێدانیە ، کەسوپای مەککە نەیتوانی سەربازگەی موسڵمانەکان بگرێت ، زۆرینەی سوپاکەی مەدینەش ڕایان نەکرد - لەگەڵ ئەو هەموو شپرزەیی و پشێویە گشتیەدا کە لەناویاندا کەوتەوە - بەڵکو شەڕی پاڵەوانانە یان کردو لە دەوروبەری سەرکردەیەتیەکەی خۆیاندا مانەوە ، حاڵیش نەگەیشتە ئەوەی سوپای مەککە ڕاویان بنێت ، تەنها سەربازێکی موسڵمان لەو شەڕەدا بەدیلی نەکەوتە دەست موشریکان ، سەرباری ئەوە بێباوەڕان نەیانتوانی دەست بگرن بەسەر تالآنی و دەستکەوتەکانی موسڵماناندا، ئەنجا کافران نەیانتوانی لاپەڕەی سێیەمی جەنگەکە لەگەڵ موسڵمانەکاندا تەواو هەڵدەنەوە لەکاتێکدا کەهێشتا سوپای موسڵمانەکان لەشوێنی خۆیدا مابوەوەو ، لە مەیدانی شەڕەکەشدا ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ نەمانەوە کە ئەمە نەریتی هەموو سەرکەوتوەکانی ئەو ڕۆژگارە بوو ، بەڵکو بەخێرایی مەیدانی شەڕەکەیان بەجێ هێڵاو پاشەکشەیان کرد ، پێش

---

[1] درێژەی غەزای ئوحود (حمراء الاسد)مان لەم سەرچاوانە وەرگرت: ابن هشام ٢/٦٠ تا١٢٩، زاد المعاد ٢/٩١ تا١٠٨، فتح الباری٧/٣٤٥ تا٣٧٧ لەگەڵ (صحیح البخاری)دا، هەروەها (مختصرسیرەالرسول) نوسینی (شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل٢٤٢ تا٢٥٧، لەشوێنی خۆیشیدا خوێنەرمان هەواڵەکەی سەرچاوەی تر کردووە.

ئەوەی موسڵمانەکان بەجێی بهێڵن ، زاتیشیان نەبوو بچنە ناو مەدینەوە بۆ تالانکردنی ماڵ و کەنیزەك ، لەگەڵ ئەوەدا کە چەند هەنگاوێك لە مەیدانی شەڕەکەوە دوور بوو ، بگرە بە تەواوی چۆڵ و هۆڵ بوو .

ئەمانە هەموو ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ئەوەی بۆ قورەیش هەڵکەوت ، دەرفەتێك بوو، توانیان تیایدا زیانێکی گەورە بەموسڵمانەکان بگەیەنن، کەچی نەیاتوانی سوپای ئیسلام تەفروتوانا بکەن ، بەتایبەتی دوای گەمارۆدانەکە ، زۆرجاریش سەرکردەی دونیا تووشی زیانی لەو جۆرە دەبن کە موسڵمانەکان تووشیان بوو . بۆیە هەرگیز ناکرێت ئەوە ناو بنێین سەرکەوتن و فەتح.

بەڵکو پەلەکردنی (ابوسفیان) بۆ پاشەکشەو گەڕانەوە ، بەهۆی ئەوەوە بوو دەترسا ئەگەر لاپەڕەی کۆتایی شەڕەکە هەڵبداتەوە توشی شکست ببێت ، کەسەیری هەڵوێستی (ابوسفیان) دەکەین لەغەزای (حمراء الاسد)دا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

کەواتە ئەو جەنگە بۆ خۆی جەنگێکی دابڕاو نەبوو، هەر دەستەیەکیان ئەندازەیەك بردنەوەو شکستی بەرکەوت ، پاش هەریەکەیان بەشێوەیەمك لە شەڕ کشانەوە بێ‌ئەوەی لە گۆڕەپانی شەڕ رابکات و بنکەکەی بەجێ بهێڵێت بۆ داگیرکردنی دوژمن ، ئەمەیە مانای جەنگی دانەبڕاو ، ئایەتیش ئاماژە دەکات بۆ ئەوە دەفەرموێت ﴿وَلا تَهِنُوا فِي ابْتِغَاءِ الْقَوْمِ إِنْ تَكُونُوا تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ اللَّهِ مَا لا يَرْجُونَ﴾ النساء : ١٠٤ . واتە : کەم و کوڕی مەکەن لە داواکردنی دوژمندا ئەگەر ئێوە ئازارتان پێ بگات ئەوانیش وەك ئێوە ئازاریان پێ‌دەگات ، بەڵام ئێوە ئومێدێکتان بەخوا خۆتان هەیە کە ئەوان نیانە ، دەبینین ئایەتەکە هەردوو ئۆردوەکەی لەئێش پێ‌گەیشتن و ئازاردا بەیەك چواند ، ئەمەش ئەو مانایە دەدا بەدەستەوە کە هەردوو هەڵوێستەکە لە یەك دەچن و ، هەردوولا گەڕانەوە بەبێ سەرکەوتن.

## قورئان لەبارەی جەنگەکەوە دەدوێت

قورئانی پیرۆز هاتەخوارەوە تیشکی دەخستەسەر هەموو قۆناغە گرنگەکانی ئەم جەنگەو ڕای خۆشی خستەڕوو سەبارەت بەوهۆیانەی ئەم شکستە گەورەیان لێ کەوتەوە ، ئەو لایەنە لاوازانەشی ڕوون کردەوە کە پێشتر لە هەر کۆمەڵێکی ئیمانداری ترداو لەهەڵویستی یەکلاکەرەوەی لەم جۆرەدا هەبوون ، هەروەها سەبارەت بەو ئامانجە بەرزە گەورانەی دانراون بۆ ئەوەی ئەم ئومەتە دەستی بکەوێت ، کە جیاوازی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئەوەیە ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ آل عمران : ١١٠.

هەروەها قورئان باسی دووڕوانی کردو ئابڕووی بردن ، هەرچی لەناخیاندا بوو لە دژایەتی کردنی خوداو پێغەمبەر ﷺ هێنایە دەرەوە ، ئەو دڵەڕاوکێ و خوت خوتانەی دڵی هەندێك لەباوەڕ لاوازە موسڵمانەکانیشی گرتبوو هەڵمالی ، کە دووڕووان و خێڵی جولەکەی برایان - لەپیلان گێڕو فیتنەچیان - دەیانوروژاند ، هەروەها ئامازەشی کرد بۆ حیکمەت و مەبەستە گرنگەکانی جەنگەکە.

لەبارەی شەڕەکەوە نزیکەی شەست ئایەت لە سورەتی ال عمران هاتە خوارەوە کە بە یەکەم قۆناغی جەنگەکە دەست پێ دەکات : ﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ ﴾ ال عمران : ١٢١ واتە : کە بەرەبەیان لای ماڵەکەت دەرچویت و جێگەو ڕیزەکانی ئیماندارنت دیاری کرد بۆ شەڕ ، لەکۆتایشدا لێدوانێکی هەمەلایەنە دەدات لەسەر ئاکام و حیکمەتەکانی ئەم جەنگە ، خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِنْ رُسُلِهِ مَنْ يَشَاءُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَإِنْ تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ال عمران : ١٧٩ واتە : خوا واز لە ئیمانداران ناهێنێت هەر وەکو ئەوەی کە ئێستا ئێوە هەن ، تا پیس و پاك لەیەکتری جیا نەکاتەوە ، نەبوە کە خودای گەورە غەیبتان نیشان بدات ، بەڵکو خودا بەویستی خۆی لەپێغەمبەرەکان هەڵدەبژێرێت ، باوەڕبهێنن بەخواو پێغەمبەرەکەی ، ئەگەر ئیمان بهێنن و لەخوا بترسن پاداشتێکی گەورەتان هەیە.

# حیكمەت و وانەكـانی جەنگی ئوحود

(ابن القیم) بەدرێژی باسێكی ئەم بابەتەی كردووە[1] (ابن حجر) یش دەڵێت : زانایان وتویانە : لە بەسەرهاتی ئوحودو ئەو زیانانەدا كە بەموسڵمانەكان گەیشت، دەیان پەندو ئامۆژگاری خودایی گەورەی تێدایە، لەوانە: ئاگادار كردنەوەی موسڵمانەكان لەچارەنووسی هەر یاخی بونێك و چارەڕەشی گوناهكردن و وەك چارەنووسی ئەو تیر هاوێژانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر شاخەكە داینابوون و پێی فەرمووبوون كە بەجێی نەهێڵن ، لەوانەش نەریتی پێغەمبەران (س) وایە كە تاقی بكرێنەوەو بەڵام سەرەنجام هەر بۆ ئەوانە ، حیكمەتیش لەوەدا ئەوەیە ئەگەر هەمیشە سەركەون ناحەزیان تێدەكەوێت و، ڕاستگۆ لەدرۆزن جیاناكرێتەوە ، خۆئەگەر هەمیشە شكستیش بهێنن ئەوا مەبەستی ناردنی پێغەمبەران (س) نایەتە دی ، بۆیە حیكمەت وابوو كە هەردوو هەڵوێستەكە كۆبكرێتەوە بۆ جیا كردنەوەی ڕاستگۆ لە درۆزن ، چونكە دووڕوویی دووڕووان لە موسڵمانەكانەوە دیارنەبوو ، كە ئەو بەسەرهاتە ڕووی‌دا ، دووڕووان ناخی خۆیان دەرخست بەگوتارو كردار ، ئیدی هیچ بەنهێنی نەمایەوەو ئیمانداران تێگەیشتن كە لە خانووماڵەكانی خۆیاندا دوژمنیان بۆ پەیدابوو ، خۆیان بۆ ئامادەكردن و خۆپارێزیان لێ كردن ، لەو بەندانەی تریش خوای گەورە چەندین جێگەو پلەوپایەی لە دیوانی شكۆداری خۆیدا ئامادە كردووە بۆ ئیماندارانێك كە بەكردەوە نایگەنێ ، بەڵكو دەبێت تاقیكردنەوەو ئەزمونیش بكرێن تابگەنە ئەو شوێن و پلەوپایانە، هەر لەو پەندانەش شەهیدبوون بەرزترین پلەی ئەولیایە ئەوەتا خوای گەورە بۆی هێنانە پێشەوە ، لەو بەندانەش خوای گەورە دەیەوێت دوژمنانی لەناو بچن ، بۆیە ئەو هۆیانە دەهێنێتە كایەوە بۆ ئەوەی بەهۆی كوفرو دەستدرێژی ستەمكاریانەوە بەدەستی ئەولیاكانی خۆی لەناویان بەرێت بەو شێوەیەش گوناهی ئیماندارانی سڕی و كافرانیشی تەفرو توناكرد[2] .

---

[1] / بڕوانە (زاد المعاد) ٢/٩٩ تا /١٠٨ .

[2] / فتح الباری ٧/٢٤٧ .

## سریە و نێرراوەکانی نێوان (ئوحود) و (ئەحزاب)

ئەو کارەساتە کاریگەرییەکی خراپی هەبوو لەسەر ناوبانگی ئیمانداران ، هەیبەتیان نەما لەناودڵاندا ، سەرئێشەو کێشەناوەکی و دەرەکییەکان بۆ سەر ئیمانداران زیاتری کرد ، مەترسی لە هەموولایەکەوە ڕووی کردە مەدینە ، جولەکەو دووڕووەکان و عەرەبە موشریکەکان بەئاشکرا دژایەتی پێغەمبەری خوایان دەکرد ﷺ ، هەندێکیان خەریك بوو دەست لەکۆمەڵی ئیمانداران بوەشێنن ، زیاد لەوەش بە نیاز بوون لەناویان بەرن و ، بنبڕیان بکەن.

هێشتا دوومانگ بەسەر ئەو جەنگەدا تێنەپەڕی بوو ، (بنو اسد) خۆیان سازدا بۆ هەڵکوتانە سەر شاری مەدینە ، پاشان تیرەی (عضل) و (قارە) لە مانگی سەفەری ساڵی چواری کۆچیدا هەستان بە فێڵێك ، بووە هۆی کوژرانی دە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ ، لەهەمان مانگدا (بنو عامر) یش هەستان بەهەمان فێڵ ، بووە هۆی کوژرانی حەفتا هاوەڵی تری پێغەمبەر ﷺ ، ئەو ڕووداوە بە کارەساتی بیری (مؤونة) ناسراوە ، هەر لەو ماوەیەدا (بنو نضیر)ی جولەکەش زاتیان کرد بەئاشکرا دوژمنایەتیان دەربڕی و لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چواری کۆچیدا داوێکیان نایەوە بۆ شەهید کردنی پێغەمبەر ﷺ ، (بنو غطفان) یش زاتیان دایە بەرخۆیان ، بەنیازبوون لە (جمادی) یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچیدا بدەن بەسەر مەدینەدا .

هەیبەت و سامی موسڵمانەکان کە بەهۆی جەنگی ئوحودەوە ـ بۆ ماوەیەك ـ نەما بوو موسڵمانەکانی خستە بەر مەترسییەوە ، بەڵام دانایی و گەورەیێتی پێغەمبەر ﷺ ، ڕووی ئەو تەوژمانەی وەرچەرخاندو جارێکی‌تر سام و بیمی بۆ موسڵمانەکان گێڕایەوەو سەرلەنوێ سەری بەرزو بڵندکردنەوە ، یەکەم کارێك کەپێی هەستا ڕاونانەکەی (حمراء الاسد) بوو ، بەمە ئەندازەیەکی زۆری لەناوبانگی سوپاکە پاراست ، ئەم کارە جولەکەو دووڕووەکانی سەرسام و سەرگەردان کرد، پاشان هەستان بەچەند مانۆڕێکی ترو سامی بۆ گێڕانەوە . بەڵکو زیاد لەوەش لەم چەند پەڕەیەی دواییدا چەند باسێکی لەو بارەیەوە تێدایە .

## سریەی (ابی سلمه)

یەکەم کۆمەڵێك کە دوای نسکۆکەی ئوحود هەستان دژ بە موسڵمانەکان خێڵی (بنو اسد)ی کوڕی (خزیمه) بوون ، هەواڵگرەکانی مەدینە هەواڵیان هێنا ، کە (طلحة) و (سلمة) هەردوو کوڕەکەی (خویلد) لەگەڵ گوێ مشتەکانیان کۆبونەتەوەو بانگەشەی خێڵی (بنی اسد) دەکەن بۆ جەنگ کردن دژ بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

خێرا پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نارد ژمارەیان ـ سەدو پەنجا کەس دەبوو لە کۆچکەران و ئەنسارەکان ، ( ابو سلمه ) ی کردە سەرۆکیان و ئاڵاکەی دایەدەستی ، (ابو سلمه) لە پڕێکدا دای بەسەر (بنی اسد)دا لەناو خانەو ماڵی خۆیاندا ، پێش ئەوەی ئەوان هێرشەکەیان دەست پێ بکەن پەرتەوازەیان کردن ، موسڵمانەکان ژمارەیەکی زۆر وشترو مەڕیان دەستکەوت و دانیانە بەرو گەڕانەوە بۆ مەدینە بێ ئەوەی تووشی هیچ شەڕێك ببن .

ناردنی ئەم سریەیە لە سەرەتای دەرکەوتنی هیلالی مانگی موحەڕەمی ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو ، کە (ابو سلمه) گەڕایەوە شوێنی خۆی ، شوێنی زامێکی کە لە ئوحوددا برینداربوو بوو سەری هەڵدایەوەو لێی پیس کرد ماوەیەکی پێ چوو پاشان کوشتی [1].

## ناردنی ( عبدالله ) ی کوڕی ( انیس )

لەڕۆژی پێنجەمی هەمان مانگدا ـ موحەڕەمی ساڵی چوارەمی کۆچی ـ هەواڵ گرەکان هەواڵیان هێنا کە (خالد)ی کوڕی (سفیان)ی (هندی) خەڵك کۆ دەکاتەوە بۆ جەنگ لەگەڵ موسڵمانەکان ، پێغەمبەری خوا ﷺ (عبدالله) ی کوڕی (انیس)ی بۆ نارد تا لەناوی بەرێت .

(عبدالله) ماوەی هەژدە شەوی پێ چوو هەر نەهاتەوە بۆ مەدینە ، پاشان لە ڕۆژی شەممەدا کە مانگی موحەڕەم حەوت ڕۆژی مابوو گەڕایەوە (خالد)ی کوشتبوو[2]. کەللە سەرەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو ، لەبەردەم پێغەمبەردا داینا ، پێغەمبەری خوا گۆچانێکی دایە ، (عبدالله) وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە نیشانە بێت لەنێوان من و تۆدا لە ڕۆژی قیامەتدا ، کە کاتی مردنیشی نزیك بوەوە وەسێتی کرد کە ئەو دارە بخرێتە نێو کفنەکەیەوە[3].

---

[1] زاد المعاد ١٠٨/٢ .

[2] واتە (خالد) ی کوڕی ( سفیان ) ی (هذلي) .

[3] هەمان سەرچاوە ١٠٩/٢ ، ابن هشام ٦٠٩/٢ ، ٦٢٠ .

## شاندەکەی (رەجیع)

لە مانگی سەفەری هەمان ساڵدا - واتە ساڵی چوارەمی کۆچی ، چەند کەسێك لە خێڵی (عضل) و (قارە) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ، وتیان ئیسلامەتیمان تێدایەو ، داوایان کرد کە چەند کەسێکیان بۆ بنێرێت تا فێری ئایینەکەیان بکات و قورئانیان پێ بخوێنێتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ شەش کەسی لەگەڵدا ناردن ، لە ریوایەتەکەی (ابن اسحاق) و لای (بوخاری) یش هاتووە کە بریتی بوون لە (١٠) کەس و (مرثد)ی کوڕی (ابی مرثد)ی (غنوی) دەکاتە ئەمیریان ، لەگوتەیەکی (ابن اسحاق) و (بخاری)یشدا هاتووە، کە ئەمیرەکەیان (عاصم)ی کوڕی (ثابت) بوە ، باپیرەی (عاصم)ی کوڕی (عمر)ی کوڕی (خطاب) بووە (لەگەڵ شاندەکەدا دەڕۆن ، تادەگەنە ناوچەی (رجیع) کە ئاوێکی خێڵی (هذیل)ە بە رووی (حجان)دا لەنێوان (رابغ) و (جدە) دایە ، تیرەیەکی خێڵی (هذیل)ە بە رووی (حجان)دا لەنێوان (رابغ) و (جدە) دایە ، تیرەیەکی خێڵی (هذیل) یان لێدەنگدان پێیان دەوتن (بنو لحیان) ، نزیکەی سەد کەسێکی تیر هاوێژ شوێنیان کەوتن ، بەشوێنیاندا چوون تاگەیشتنە سەریان ، لە هەموولایەکەوە چواردەوریان دان دە کەسە موسڵمانەکە پەنایان برد بووە لای (فدفد) پێیان وتن : وادەو پەیمانتان دەدەینێ ئەگەر خۆتان بەدەستەوە بدەن کەستان لێ نەکوژین . بەڵام (عاصم) دانەبەزی و شەڕی لەگەڵیاندا کرد ، بەتیر حەوت کەسیان لێ کوژرا ، تەنها (خبیب) و (زید)ی کوڕی (الدثنة) و پیاوێکی تریان لێمایەوە ، بێباوەڕان جارێکیتر وادەو پەیمانیان پێدان نەیانکوژن ، ئەنجا خۆیاندا بەدەستەوە ، بەڵام ئەوان بێ پەیمان دەرچوون ، بەپەتی وشترەکانیان هەرسێکیان بەستنەوە ، سێیەم پیاویان وتی : ئەمە سەرەتای پەیمان شکاندنە بەدوای خۆیاندا ڕایان کێشا ویستیان بیدەنە بەر ، لەگەڵیان نەڕۆیشت کوشتیان ، ئەنجا (خبیب) بە بەندەیی لە مەککە مایەوە ، پاشان بڕیاریاندا بیکوژن ، بۆیە لە (حرم) بەرەو (تنعیم) بردیانە دەرەوە کە ویستیان چوارمێخەی بکێشن ، فەرمووی : مۆڵەتم بدەن با دوو ڕکات نوێژ بکەم ، وازیان لێ هێناو دوو ڕکات نوێژەکەی کرد ، پاشان سڵاوی دایەوەو فەرمووی : وەڵڵاهی ئەگەر گومانتان وانەبوایە کە گوایە دەترسم نوێژی زیاترم دەکرد ، پاشان فەرمووی : خوایە قڕیان تێخەی ، کوشت و بڕیان بکەیت ، تاقیان نەهێڵیت لەسەر زەویدا ، پاشان ئەم شیعرەی خوێندەوە [1] .

---

(1) دەقی شیعرەکە بەعەرەبی بەم دێڕە دەست پێ دەکات ، ( لقد اجمع الاحزاب حولي والبوا قبائلهم واستجمعوا كل مجمع ) بۆ خوێنەری کوردی دڵسۆز دەقی شیعرەکەمان بەکوردی نوسیەوە ، کە ڕێزدار مامۆستا (نوری فارس حەمە خان) لەکتێبی (التاج الجامع للاصول) کوردیەکەی بەشی هەشتەمدا بڵاوی کردۆتەوە.

دەست و پـام بەكۆت لە لەشم بارە — بۆم هەڵخـــراوە پەتی سێدارە
دوژمن لەدەورم بەبێ شومـــــارە — لـێوە كرۆژەی چوون فیشكەی مارە
خاووخێزانی ئەو گورگە هــــارە — هاتوون بۆ سەیری منی بێچـــارە
كەسی بێكەسان خۆی ئاگـــادارە — لەحاڵی دڵم چەندە زامــــــارە
بۆخۆم غەریبم لەم دوورە شـــارە — ئەڵهـام بینینی ڕووخساری یارە !
هەمیشە دڵم لای كەس و كـــارە — دڵم لە زۆری زۆردار بێـــــزارە !
وەلێ ئەبـــــــاتم لە زارا ژارە — لەجێی ڕووی ئازیز چارەی بەدكارە !
سكالام لەلای خوای كردگـــــارە — تۆڵەم بسێنێت لە چـــــی زۆردارە
عەرشی تۆ خودا قیبلـەی هەژارە — تـاقە ڕوانگەی بەندەی بێچـــــارە
بێچارەیی من لە عالەم دیــــارە — جـەستەم پڕ لە خار بوە ئەمجارە
ئەوەی ئاوی تۆی لە نـــاوی زارە — لە سەرە مەرگـــــا شادو ڕزگارە
بۆ ڕەزامەندی تۆ ئەم ئـــــازارە — دەكێشم ، باكم نی یە لەم بـــارە !
ئەگەر مەیلت بێ گوڵ و گوڵـزارە — كـــەلاوە كۆنیش كۆشك و تەلارە !
دەڵێن كافربە سەرت قوتـــــارە — گەر وابێت مردن دەكرم بە پــــارە
چاوم بەوێنەی هەوری بەهــــارە — خونچەی گوڵ بەدەم شەونم لەزارە
لە مەرگ سڵناكەم مردن یەكجارە — سەرم شۆڕ ناكەم بۆ ئەو خوێنخوارە
مادەم بۆئیسلام دەمدەن لەم دارە — بە پێی خۆم دەچمە بەر پێی قەنارە

(ابوسفیان) وتی بە(خبیب) : ئایا حەزدەكەیت ئێستا لەگەردنی موحەممەد بدەین و ، تۆش بڕۆیتەوە بۆ ناو ماڵ و منالی خۆت ؟

فەرمووی : نەخێر سوێندم بەخوا حەز ناكەم لەناو ماڵ و منالی خۆمدا بم و ئەویش یەك دڕكی بەپێدا بچێت.

پاشان لەخاچیانداو پاسەوانیان دانا بەدیاریەوە ، (عمرو)ی كوڕی (امیە)ی (ضمری) هات و شەو بەفێڵێك لاشەكەی لێكردەوەو ، بردی ناشتی ، ئەوكەسەی (خبیب) ی شەهیدكرد (عقبة)ی كوڕی (حارث) بوو ، (خبیب) لەجەنگی بەدردا (حارث)ی باوكی كوشتبوو.

لە (صحیح) یشدا هاتوە كە (خبیب) یەكەم كەس بوو ، دوو ڕكات نوێژی پێش شەهید بوونی داهێنا ، دەڵێن لەكاتی بەند بونەكەیدا بینراوە كە بۆشكێ ترێ و خورمای خواردوە ، لەكاتێكدا ئەو دوو میوەیە لە هەموو مەككەدا نەبووە.

(زید)ی کوڕی (دثنه)ش، (صفوان)یکوڕی (امیه) لەجیاتی باوکی کوشتیەوە.

قوڕەیش خەڵکیان نارد بۆ هێنانی لاشەی (عاصم) تا بیفرۆشن بە قوڕەیش ، لە شەڕی بەدرا (عاصم) یەکێك لە گەورەکانی قوڕەیشی کوشتبوو ، کە چوونە سەر لاشەکەی دەبینن کۆمەڵێکی زۆر زەردەواڵە بەسەریەوە وەستاون ، بواریان نەدەدا کەس نزیك بێتەوە ، خەڵکەکە هیچیان بۆ نەکراو گەڕانەوە ، پێشتر (عاصم) نزای لای خوا کردبوو کەدەستی موشریك بەرجەستەی نەکەوێت و دەستی ئەویش بەموشریك نەکەوێت کە (عمر) ئەم هەواڵەی (عاصم)ی پێگەیشت ، فەرمووی : خوای گەورە دوای مردنیش جەستەی ئیماندار دەپارێزێت هەروەکو لە ژیانیشدا دەیپارێزێت [1].

## کارەساتی بیری ( معونه )

لەو مانگەدا کە ڕووداووی (رجیع) ڕوویدا ، کارەساتێکی تریش ڕوویدا کە خەمناکترو ترسناکتر بوو لەیەکەم ، ئەو کارەساتە بەکارەساتی بیری (معونة) ناسراوە.

پوختەکەی ئەوەیە کە (ابو براء) (عامر)ی کوڕی (مالك) کە بە (ملاعب الاسنه) بانگ دەکرا ، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە ، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام موسڵمان نەبوو ناڕازیش نەبوو ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بکرێت هەندێك لە هاوەڵەکانت بنێرە بۆلای خەڵکی (نجد) تاخەڵکی بانگ بکەن بۆ ئاینەکەت ، ئومێدم وایە کە بەدەمتەوە بێن ، فەرمووی : دەترسم خەڵکی (نجد) شتێکیان لێ بکەن ، (ابو براء) وتی : من پەنایان دەدەم ، پێغەمبەری خوا چل پیاوی لەگەڵیاندا نارد ـ لە گوتەیەکی (ابن اسحاق) داو لە (صحیح) یشدا هاتووە کە حەفتا کەس بوون ئەوەش کە لە (صحیح)دا هاتووە ڕاستترە (منذر)ی کوڕی (عمرو)ی کردە میریان کە لە خێڵی (بنی ساعدە) بوو شۆرەتەکەی (المعتق) بوو ئەوانە لە پیاوە هەڵبژاردەو پیاوماقوڵ و قورئان خوێنەکان بوون ، لەناو مەدینەدا بە ڕۆژ یان داریان دەهێنا دەیانفرۆشت و پارەکەیان دەدا بەموسڵمانەکانی خەڵکی (صفە)و قورئانیان بەوانە دەوتەوەو ، شەونوێژیان دەکرد ، ئەم کۆمەڵە گەیشتنە بیری (معونە) ـ ناوچەیەکە دەکەوێتە نێوان هەوارگەی خێڵی (بنی عامر) و سارای (بنی سلیم) لەوێ دابەزین ، پاشان بە (حرام)ی کوڕی (ملحان)دا کە برای (ام سلیم)ە نامەکەی پێغەمبەری خوایان نارد بۆ دوژمنی خوا

---

[1] ابن هشام ۱٦۹/۲ تا ۱۷۹ (زاد المعاد ) ۱۰۹/۲ صحیح البخاری ٥٦٨/۲ ، ٥٦۹ ، ٥٨٥ .

(عامر)ی کوڕی (طفیل) سەیری نەکرد ، فەرمانیدا پیاوێك لەپشتەوە رمێکی لێداو شەهیدی کرد ، کە ڕمەکە لەسنگەیەوە دەرچوو ، خوێن فیچەقەی کرد ، (حرام) هاواری کرد : (الله اکبر) بە پەروەردگاری کابەی شەریف سەرکەوتم .

پاشان خێرا دوژمنی خوا داوای کرد لە (بنی عامر) دەست بکەن بەشەڕ لەگەڵ ئەوانی تریشدا ، ئەوان نەهاتن بەدەمیەوە لەبەر پەنادانی (ابو براء) ، داوای کرد لە خێڵی (بنی سلیم) لەو خێڵە تیرەی (عصفە) (رعل) و (ذکوان) چوون بەهانایەوە تا گەمارۆی هاوەڵەکانی پێغەمبەریاندا ﷺ دەستیان کرد بە شەڕ تا دواکەسیان شەهید کران. جگە لە (کعب)ی کوڕی (زید)ی کوڕی (نجار) بە بریننداری خۆی کرد بوو بە مردوو لەنێوان کوژراوەکاندا ، ئەم پیاوە ژیا تا لە ڕۆژی (خندق) دا شەهید کرا.

(عمرو) کوڕی (امیە الضمری) و (منذر)ی کوڕی (عقبە) لە دەرەوەی سەربازگە بوون ، کەهاتنەوە لەدوورەوە داڵ و قەلەرەشیان بینی بەسەر سەربازگەوە دەسوڕانەوە ، ((منذر) دابەزی و کەوتە شەڕ لەگەڵ موشریکاندا تا لەگەڵ هاوەڵانی شەهیدکرا . (عمرو)ی کوڕی (امیە الضمری) یش بەدیل گیرا ، کە هەواڵ درا (عمرو) لە خێڵی (بنی مضر)ە (عامر) کێشای بەنێوچاوانی خۆیدا، ڕزگاری کرد لەپای ڕزگارکردنی بەندەیەکدا کە لەگەردنی دایکیدا بوو...

(عمرو)ی کوڕی (امیە الضمری) گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، هەواڵی ئەو کارەساتە جەرگ برەی پێ بوو ، شەهید بوونی ئەو حەفتا هاوەڵە کارەساتی ئوحودی وەبیر هێنایەوە ، ئەوانەی ئوحود لە شەڕێکی ڕوون و ئاشکرادا شەهید بوون ، بەڵام ئەمانەی (معونە) بەهۆی ناپیاوی و پەیمانشکێنیەوە شەهید کران .

کە (عمرو)ی کوڕی (امیە) لە ڕێگەدا بوو گەیشتە (مرمرە) لە سەرەوەی (قناة)دا ، لە ژێر سێبەری درەختێکدا دابەزی بحەوێتەوە ، دوو پیاوی خێڵی (بنی کلاب) یش دابەزین لە هەمان شوێندا ، کە نوستن (عمرو) هەردووکیانی کوشت ، پێی وابوو کە هەقی هاوەڵەکانی سەندۆتەوە ، کەچی لە ڕاستیدا ئەو دوانە پەیمانی پێغەمبەریان لە گەردندا بوو ﷺ ، (عمرو) بەوەی نەزانیبوو ، کە هاتەوە هەواڵیدا بە پێغەمبەر ﷺ کەچی کردووە ، فەرمووی : تۆ دوو کەست کوشتوە دەبێت خوێنەکەیان بدەم و سەرقاڵی کۆکردنەوەی فیدیەکەی بم لای موسڵمانان و جولەکە هاوپەیمانەکانیان [1] ، هەر ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی غەزای (بنو نضیر) .

---

[1] بڕوانە (سیرة ابن هشام) ١٨٣/٢ تا ١٨٨ ، (زاد المعاد) ١٠٩/٢ ، ١١٠ صحیح البخاري ٢/ ٥٨٤ ـ ٥٨٦ .

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خەفەتی بەم کارەساتەو کارەساتی (رجیع)یش خوارد کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا ڕوویاندا[٢] ، بەتەواوی خەم و پەژارە دایگرت [٣] ، تا گەیشتە نزاکردن لە ئەو خێڵ و تیرانەی ئەو ناپیاوییی و پەیمانشکێنییەیان کردبوو بەرامبەر بەهاوەڵەکانی ، لە (صحیح) داهاتووە لە (انس)ەوە ، دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ سی بەرەبەیانی لەسەر یەك نزای دەکرد لەو کەسانەی هاوەڵەکانیان شەهید کرد لە بیری (معونە)دا ، لەنوێژی بەیانیدا دۆعای دەکرد لەخێڵی (رعل) و (ذکوان) و (لحیان) و (عصبة)و دەیفەرموو : بەڕاستی (عصبة) لەخواو پێغەمبەرەکەی یاخیبوو، تا قورئانیش لەبارەیانەوە هاتە خوارەوە تا سڕایەوە بەو هەواڵەی لەلایەن خواوە درا بە پێغەمبەر ﷺ کە دەڵێت: شەهیدان وتیان: ئێمە بەخودای خۆمان گەیشتین لێمان ڕازی بوو ئێمە ڕەزامەند بووین ، ئیتر پێغەمبەر ﷺ وازی لە دۆعای (قنوت)ەکەی هێنا[٤] .

## غەزای (بنی النضیر)

پێشتر وتمان : کە جولەکە داخی زۆریان لەدڵدا بوو بەرامبەر بە موسڵمانەکان ، بەڵام نەیاندەوێرا شەڕو پێکدادان بکەن، بەڵکو پەنایان دەبردە بەر فێڵ و پیلانی ژێر بە ژێری ، بەئاشکرا ڕقە بەرایەتی و دوژمنایەتیان دەکرد ، چەندین جۆری فێڵ و تەڵەکەیان بەکاردەهێنا ، بۆ ئازاردانی موسڵمانەکان ، دوای ڕووداوی (بنی قینقاع) و کوژرانی (کعب)ی کوڕی (اشرف) زۆر لەخۆیان دەترسان، بێدەنگو سەرکز دانیشتبوون .

بەڵام دوای ڕووداوی (ئوحود) زاتیان دایەبەرخۆیان دەستیان کردەوە بە دوژمنایەتی و پەیمانشکێنی و بەنهێنیش پەیوەندیان کرد بەدووڕوان و موشریکانی مەککەوەو بۆ بەرژەوەندی ئەوان کاریان دەکرد[١] .

پێغەمبەری خوا ﷺ دانی بەخۆدا گرت تادوای کارەساتی (رجیع) و (معونە) کە زاتیان دایەبەرخۆیان و هەستان بەپیلانێك بۆ شەهید کردنی خودی پێغەمبەر ﷺ .

---

(٢) واقدی وتویەتی : هەواڵی هاوەڵەکانی (رجیع) و (معونە) لەیەك شەودا بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت .

(٣) (ابن سعد) لە (انس)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەر ﷺ بەئەندازەی هەواڵی هاوەڵانی بیری (معونە) خەم و پەژارە دڵی گرتبێت، بڕوانە: مختصرسیرە الرسول ﷺ نوسینی: شێخ عەبدوڵڵای نەجدی.ل٢٦٠.

(٤) (بخاری) ٥٨٦/٢ ، ٥٨٧ ، ٥٨٨ .

[١] / ئەم باسە لەوێوە وەرگیراوە کە (ابو داود) لە (باب خبر النضیر)دا گێراوێتیەوە ٣/ ١١٦ ، ١١٧ . (عون المعبود ، شرح سنن ابی داود).

ڕووداوەکەش بەم شێوەیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا چوو بۆ لایان تاقسەیان لەگەڵدا بکات بۆ خوێنبایی ئەو دووپیاوەی خێڵی (کیلاب) کە (عمرو) ی کوڕی (امیە) بەهەڵە کوشتبوونی، ئەمەش دەبووە ئەرك لەسەر جولەکە بەپێی بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە ، جولەکەکان وتیان: باشە (ابو القاسم) ، لێرە دانیشە تا کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکەین ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاڵ دیوارێکی ماڵە جولەکەیەکدا دانیشت تا لەسەر وادەی خۆیان پارەکە بهێنن ، (ابوبکر) و (عمر) و (علی) و کۆمەڵێکی تریش لە هاوەڵان لەگەڵیدا دانیشتن.

جولەکەکانیش لەملاوە سەریان کرد بەیەکدا ، شەیتان سەرسەختیەکی تری پێکردن ، پیلانیان دانا بۆ شەهید کردنی پێغەمبەر ﷺ ، وتیان : کێ لە ئێوە دەتوانێت ئەم بەردە گەورەیە هەڵگرێت و بەری داتەوە بەسەر سەریداو بیکوژێت...؟ سەرسەختترینیان (عمرو)ی کوڕی (جحاش) وتی: من دەتوانم. (سلام)ی کوڕی (مشکم) پێی وتن شتی وامەکەن ، وەڵلاهی هەواڵی دەدرێتێ لەبارەی ئەم کارەتانەوە ، ئەمەش پەیمانشکێنیە لەنێوان ئێمەو ئەودا ، بەڵام لەسەر خیانەتەکەیان سوور بوون.

(جبریل) (ع) لەلایەن پەروەردگارەوە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پیلانەکەی پێ فەرموو ، خێرا پێغەمبەر ﷺ لەجێگەکەی خۆی هەستاو چوو بەرەو مەدینە ، هاوەڵەکانی بەدوایدا ڕۆشتن ، وتیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ نەمانزانی بۆ هەستایت ؟ ئەویش هەواڵی نیازە خراپەکەی جولەکەی پێدان.

زۆری پێ نەچوو پێغەمبەر ﷺ (محمد)ی کوڕی (مسلمە)ی نارد بۆلای (بنی النضیر) و پێی وتن : (لە مەدینە بڕۆنە دەرەوەو دراوسێیەتیم مەکەن ، دە ڕۆژ بوارتان دەدەمێ ، دوای ئەو ماوەیە هەرکەسێکتان ببینم دەدەم لە ملی). ئیدی جولەکە جگە لە دەرچوون هیچ دەرفەتێکی تریان نەما ، چەند ڕۆژێك مانەوە بۆ خۆ سازکردن ، بەڵام سەرۆکی دووڕووان (عبدالله)ی کوڕی (ابی) هەواڵی بۆ ناردن کە بمێننەوەو دەرنەچن و بڕۆنە ناو قەڵاکانتانەوەو ، دووهەزار کەسم لەگەڵدایە لەگەڵتان دێن بۆ ناو قەڵاکەتان و خۆیان لەپێناوی ئێوەدا دەدەن بەکوشت : ﴿ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَداً أَبَداً وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ ﴾ الحشر: ١١، ئەنجا هاوپەیمانەکانتان (قریظة) و (غطفان) پشتتان دەگرن.

لێرەدا جولەکە ئاهێکیان هاتەوە بەبەرداو ، بڕیاریاندا دوژمنایەتی پێغەمبەر ﷺ بکەن ، (حی) کوڕی (ئەخطب)ی سەرکردەیان چاوی بڕیە ئەو قسانەی سەرکردەی دووڕوان بۆی دەکرد ، بۆیە هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و پێ وت : ئێمە لەماڵ و حاڵی خۆمان ناڕۆینە دەرەوە چیت لە دەست دێت بیکە.

بێگومان ڕەوشەکە سەبارەت بەموسڵمانەکان زۆرناخۆش بوو ، چونکە بەگژدا چوونی دوژمنان لەوماوە تەنگەتاوە هەڵایساوەدا ئاسان نەبوو ئەنجامەکەی دیار نەبوو ، بینیشمان کە چۆن عەرەب لێیان هەڵگەڕانەوەو ، هەموو شاندەکانی پێغەمبەریان شەهید کرد ، پاشان جولەکەی (بنی النضیر) بەهێزو پڕچەك بوون ، خۆ بەدەستەوە دانیان ئاسان نەبوو ، دەرفەتی شەڕکردنیش لەگەڵیاندا مەترسی تێدابوو ، ئەو گۆڕانکاریانەش کەدوای کارەساتی بیری (معونە)و پێش ئەوەش هاتبوونە کایەوە موسوڵمانەکانی زۆرتر هەستیار کرد بوو بەرامبەر بەتاوانی تیرۆرو پەیمانشکێنی دوژمنان کە ڕۆژانە بەکۆمەڵ و تاك تووشی دەبوون و ، ڕقیان بەرامبەر بەو تاوانبارانە ئەستوورتر دەبوو ، بۆیە بڕیاریان دابوو شەڕیکەن لەگەڵ جولەکەی (بنی النضیر)دا پاش ئەو نیاز خراپیەی کردیان دژ بە پێغەمبەر ﷺ ، کە ئەنجامەکەی هەرچییەك بێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامەکەی (حیی) کوڕی (ئەخطب)ی پێگەیشتەوەو خۆی و هاوەڵان بەیەك دەنگ وتیان : (الله اكبر) . پاشان هەستا بۆ تەمێ کردنی (بني النضير) و (ابن ام مكتوم)ی لەسەر مەدینە داناو چوو بۆیان (علی) کوڕی (ابی طالب) ئاڵای هەڵگرت کە گەیشتە ئەوێ ئابڵوقەی قەڵاکانیدان .

(بنو النضير) خۆیان خزاندە نێو قەڵاکانیان ، تیایدا دانیشتن و لەوێوە بەردیان دەگرتە موسڵمانەکان ، باخە خورماو بێستانەکانیان کۆمەکی دەرەکیان بوو لەو پشت ئەستوریەدا ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەبڕین و سوتاندنیان ، لەو بارەیەوە (حسان) وتویەتی :

وهان على بني سراة بني لؤي　　　　حريق بالبويرة مستطـــيرٌ

بویرە : لەو دێرە شیعریەدا ناوی باخە خورماکانی (بني نضيرة) ، لەو بارەیەوە ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ﴾ الحشر : ٥ ، واتە : هەر ساقی دارخورمایەك دەبڕن یان دەیهێڵنەوە هەمووی بە ئیزنی خودایە .

(قريظة) نزيك نەكەوتنەوە ، (ابن ابی) و (غطفان) و هاوپەیمانەکانیشیان خیانەتیان لێکردن ، کەسیش هەوڵی نەدا خێرێکیان بۆ ببات ، یان بارێکیان لەسەر کەم بکات، لەبەرئەوە خوای گەورە ژیانی ئەوانەی چواند بەژیانی شەیتان و فەرمووی:﴿ كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ ﴾ الحشر : ١٦ واتە : وەك شەیتانیان لێهات کە وتی بە مرۆڤ کافربە ، کە کافر بوو ئەنجا پێی وت: من بەدەرم لە تۆ.

گەمارۆدانەکە زۆری نەخایاند . تەنها شەش شەو بەردەوامی هەبوو . وتراویشە پانزە شەوی خایاند . تاخوای گەورە دڵی پڕکردن لەترس و بیم ، ملیان کەچ کردو خۆیان ئامادە کرد بۆ خۆبەدەستەوەدان و چەك فرێدان ، هەواڵیان نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئێمە لە مەدینە دەردەچین ، پێغەمبەریش ﷺ ڕازی بوو بەمەرجێك تەنها خۆیان و ژن و منداڵ دەربکەن ، هەرچیەکیش وشتر هەڵی بگرێت بیبەن جگە لەچەك .

بەوە ڕازی بوون و ، بەدەستی خۆیان ماڵەکانیان ڕووخاند ، بۆ ئەوەی دەرگاو پەنجەرەکانی لەگەڵ خۆیاندا ببەن ، زیادلەوەش هەندێکیان کۆڵەکەو دارە ڕای ماڵەکانیان هەڵگرت و، منداڵ و ژنەکانیان لەگەڵ خۆیاندا برد، هەمووشتێکیان لە شەش سەد وشتر بارکرد، گەورەکانیان وەکو (حیی)ی کوڕی (اخطب) و (سلام)ی کوڕی (ابی الحقیق) بەرەو (خیبر) ڕۆشتن ، هەندێکیشیان چوون بەرەو شام ، تەنها دوو پیاویشیان موسڵمان بوون کە (یاسین)ی کوڕی (عمرو) و (ابو سعد)ی کوڕی (وهب) بوون ، ماڵەکانی خۆیان بردەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرت بەسەر چەکی (بنو نضیر)داو ، زەوی و ماڵ و موڵکی لێسەندن ، لەناو چەکەکاندا پەنجا قەڵغان و ، پەنجا زنجیر بەست و سێسەدو چل شمشێریان تێدابوو.

ماڵ و موڵکی (بنو نضیر) تایبەت بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ لە کوێدا بخوازێت دایبنێت ، پێنجیەکی نەکرد چونکە خوا هەموویدا بەخۆی و دابەشی نەکرد بەسەر هەموو موسڵماناندا ، بەڵکو دابەشی کرد بەسەر کۆچکەرانی یەکەمداو ، سەرو پشکی دا بە (ابو دجانە) و (سهل)ی کوڕی (حنیف) لەبەر هەژارییان ، پێغەمبەر ﷺ خەرجیەك ماڵی خانەوادەی دەکێشاو ، ئەوەشی کە مایەوە لە چەك و تفاق و کەرەستەی شەڕ لەپێناوی خوادا دەیبەخشی .

غەزای (بنو النضیر) لە رەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو ، بەرامبەر بە (ئۆگستۆس)ی ساڵی ٦٣٥ی زایین ، لەم غەزایەدا خودای گەورە سورەتی (الحشر)ی بە تەواوی ناردە خوارەوەو ڕێبازی دووڕوانی ئابڕوو بردو ، ئەحکامەکانی (فـيء)ی ڕوونکردەوەو هەڵیدا بە بالآی کۆچکەران و ئەنسارداو ڕەوایەتی برین و سوتاندنی دارو زەوی دوژمنی ڕوونکردەوە لەحاڵەتی جەنگداو ئەو کارەی دانەنا بەبەشێك لە بلآو کردنەوەی خراپە لەزەویداو هەروەها ئیمانداارانی ڕاسپارد کە پابەندی لە خوا ترسان و خۆ ئامادە کردن بن بۆ ئاخیرەت ، پاشان کۆتایی سورەتەکەی هێنا بەوەسف و سەنای زاتی خۆی و ناوو سیفەتە جوانەکانی .

(ابن عباس) بە سورەتی (الحشر)ی دەوت : سورەتی (النضیر)[1] .

## غەزای ( نەجد )

بەو سەرکەوتنەی موسڵمانەکان بەدەستیان هێنا بەبێ قوربانی لە غەزای (بنو نضیر)دا زیاتر دەسەلآتیان ڕەگ و ڕیشەی داکوتا ، دووڕووەکانیش سەریان کزکردو ئیتر نەیانوێرا بەئاشکرا دژایەتی بکەن ، ئەمەش بواری زیاتری ڕەخساند بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە یەکلابێتەوە بۆ سەرکوتکردنی ئەو دەشتەکیانەی هەمیشە ئازاری موسڵمانەکانیان دەداو فێری کوشتنی شاندی موسڵمانەکان بووبوون و پەیمانشکێنیان دەکرد[2] ، خەریك بوو زاتی ئەوە بکەن بدەن بەسەر مەدینەشدا.

پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەستێت بە تەمێ کردنی ئەو ئەعرابانە ، هەواڵی بۆهات کە کۆمەڵێکی دەشتەکی لەخێڵی (بنی محارب) و (بنی ثعلبة)ی (غطفان) خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ شەڕ ، پێغەمبەر ﷺ خێرا بۆیان چووە دەرەوە بە تانوپۆی نەجدا گەڕاو ، ترس و بیمێکی زۆری خستە دڵی ئەو عەرەبە دەشتەکیە سەرسەختانەوە ، تا جارێکی تر زاتی دەست وەشاندن نەکەن وەك ئەوەی پێشتر دەیانکرد لەگەڵ موسڵمانەکاندا .

---

[1] / ابن هشام ٢/١٩٠ ، ١٩١ ، ١٩٢ ، زاد المعاد ٢/٧١، ١١٠ ، صحیح البخاري ٢/ ٥٧٤ ، ٥٧٥ .

[2] / وتەیەکی (محمد الغزالی)یە لە (فقه السیره)دا هاتووە ، ل ٢١٤.

وای لێهات ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی کە فێری تالآنی و چەتەگەری بووبوون لەگەڵ دەیانبیست موسڵمانەکان هاتوون دەترسان و خۆیان دەخزاندە کون و کەلەبەری شاخەکانەوە ، بەو شێوەیە موسڵمانەکان زەندەقی ئەو خێڵە عەرەبە چەتانەیان بردو ترسیان لەدڵیاندا ڕواندو خۆشیان بە بیٚ وەی گەڕانەوە .

(مغازی) نووس و (سیرەت) نووسەکان لەو بارەیەوە باسی شەڕێك دەکەن موسڵمانەکان لەخاکی (نجد)دا کردویانە لەمانگی ڕەبیعی دووەم یان جەمادی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچیدا ، ئەو غەزایە ناودەنێن غەزای (ذات الرقاع) . ڕوودانی جەنگەکە لەو ماوەیەدا گومانی تێدانیە ئەمەش هەلومەرجی ڕەوشی مەدینە دەیخواست ، وەرزی هاتنەوەی شەڕی بەدرو بەڵێنی (ابو سفیان) لەکاتی بلاّوە پێکردنی سوپاکەدا نزیك بووبوەوە ، بەجێهێشتنی مەدینە ، لەگەڵ وازهێنان لەعەرەبە دەشتەکەیان بەو هەموو ملهوڕی و سەرسەختیەی خۆیانەوە ، دەرچوون بۆ ئەو شەڕە ترسناکە هەرگیز لە بەرژەوەندی سیاسیانەی جەنگ نەبوو ، بەڵکو پێویست وابوو نینۆکی ئەوانە بقرتێنێت و پێش دەرچوون بۆ هەر شەڕێکی گەورە دەستیان کۆتا بکات .

سەبارەت بە ئەو جەنگەش کەپێغەمبەر ﷺ سەرۆکایەتی کردو، لەمانگی (ڕەبیع) یان (جەمادی یەکەمی) ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو ، بێگومان کە غەزای (ذات الرقاع) نیە چونکە (ابو هریرە) و (ابو موسی)ی (اشعری) هەردووکیان شەڕی (ذات الرقاع) یان دیوە ، (ابو هریرە) بۆ خۆی پێش جەنگی (خیبر) بەچەند ڕۆژێك موسوڵمان بوو ، هەروەها (ابو موسی)ی (اشعری) یش لەخەیبەردا موسڵمان بوو ، کەواتە غەزای (ذات الرقاع) دوای جەنگی خەیبەر ڕوویداوە ، بەڵگەش لەسەر دواکەوتنی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی تێدا کردووە ، یەکەم نوێژێکی ترسیش کە ئەنجام درا لە غەزای (عسفان) دابوو ، گومانیشی تێدانیە کە غەزای (عسفان) دوای جەنگی (خەندەق) ە ، غەزای خەندەقیش لە کۆتاییەکانی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا ڕوویداوە.

## غەزای (بەدری دووەم)

کە موسڵمانەکان دڕکی عەرەبە دەشتەکیەکانیان دەرکێشاو دەستیان کۆتاکردن ، خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمنە هەرە گەورەکەیاندا ، ساڵ هاتەوە ، ژوانی دیاریکراو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ قوڕەیشدا هاتەوە کە لە غەزای ئوحوددا دیاری کرابوو ، مافی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی بوو کە بڕۆنە دەرەوە بۆیان تا ڕووبەڕووی (ابو سفیان) و خێڵەکەی ببنەوەو ، جارێکی‌تر شەپیۆری شەڕ لێبدەنەوە لەگەڵیاندا [1] .

لە مانگی (شعبان)ی ساڵی (٤)ی (ینایر)ی ساڵی ٦٢٦ی زاینیدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخۆی و هەزارو پێنج سەد کەسەوە لە مەدینە دەرچوو ، دە سواری لەگەڵدا بوو (علی) کوڕی (ابو طالب) ئالاکەی هەڵگرتبوو ، (عبدالله)ی کوڕی (رواحە)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت ، گەیشتە بەدر ، لەوێ مایەوە چاوەڕوانی موشریکانی دەکرد.

(ابو سفیان)یش بەخۆی و (دوو هەزار) موشریکەوە لە مەککە دەرچوون پەنجا ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو ، تا گەیشتە (مر الظهران) کە قۆناغێك لە مەککەوە دوورە لە (مجنە) دابەزی کە شوێنێکی ئەو ناوچەیەیە .

(ابو سفیان) بەسستی و بێتاقەتی لە مەککەوە دەرچوو ، بیری لەئەنجامی شەڕکردن دەکردەوە لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، ترسی لێ نیشتبوو ، سام دای گرتبوو ، کە لە (مر الظهران) دابەزی بەتەواوی ورەی ڕووخا ، فێڵێکی دۆزیەوە بۆ گەڕانەوە ، وتی بە هاوڕێکانی لەخەڵکی قوڕەیش ، ساڵێك بچن بۆ شەڕ باشە کە ساڵی تێراویی و سەوزایی بێت و درەختی تێدا ئاوبدەن و تێر شیرو ماست بخۆن ، ئەمساڵیشتان ساڵی ووشك و بێئاویە ، من دەگەڕێمەوە ئێوەش بگەڕێنەوە .

پێدەچێت سوپاکەش ترس و سام گرتبێتی ، هەموویان گەڕانەوە ، بێئەوەی یەك کەس ناڕەزایی بۆ ئەم هەڵوێستە نیشان بدات و سووربێت لەسەر شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانەکاندا .

موسڵمانەکانیش بۆ ماوەی هەشت ڕۆژ لە بەدر مانەوە چاوەڕوانی دوژمنیان دەکرد ، هەرچی شمەکێکی بازرگانیان پێبوو فرۆشتیان بەدوو درهەم و

---

[1] وتەیەکی (محمد الغزالی)یە لە (فقه السیرە)دا هاتووە ، ل ٣١٥.

یەك درهەمیان قازانج کرد ، پاشان گەڕانەوە بەرەو مەدینەو ئیدی جڵەوی دەسەڵات و دەست لەپێشی کەوتەوە دەست خۆیان ، سام و ترسیان لەدڵی خەڵکیدا زیاتری کردو بوونە باڵادەستی ناوچەکە .

ئەم غەزایە بەغەزای (بدر الموعد) یان (بەدری دووەم) یان (بدر الاخره) یان (بدر الصغری)ش ناوبانگی هەیە[1] .

## غەزای (دومة الجندل)

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەدر گەڕایەوە ، ناوچەکە هێمنی و ئاشتی تێدا بڵاو بوەوە ، دەستی بەتاڵ بوو بۆ ڕووکردنە سنوورەکانی عەرەب ، تاهەموو هەڵوێستەکان بۆ خۆی یەکلا بکاتەوەو دۆست و دوژمن دان بەوەدا بنێن .

دوای ڕووداوی بەدری بچووك لەمەدینەدا شەش مانگ مایەوە، پاشان هەواڵی بۆ هات ، کە خێڵەکانی دەوروبەری (دومە الجندل) کە ناوچەیەکی نزیکە لە شامەوە ڕێگریی و چەتەگەری لە کاروانەکان دەکەن و، هەرچیەك بەلایاندا تێپەڕێت ڕاوەڕووتی دەکەن ، خەریکی خۆ کۆکردنەوەن و دەیانەوێت بدەن بەسەر مەدینەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ (سباع)ی کوڕی (عرفظة) (غفاری) بەسەر مەدینەوە داناو، هێشتا مانگی ڕەبیعی یەکەم (٥) شەوی مابوو لەساڵی (٥)ی کۆچیدا بەهەزار سوارەوە بۆیان دەرچوو ، پیاوێکی ڕێبەری لەگەڵ خۆیدا برد لەخێڵی (بني عذرة) ، ناوی (مذکور) بوو.

بە شەو دەڕۆشت و بەڕۆژ خۆی پەنادەدا، بۆئەوەی لەپڕێکدا بدا بەسەر دوژمناندا ، دەمەو شێوان لێیان نزیکبوەوە، هێرشی کردە سەر مەڕومالاَت و موڵکەکانیان، دەستکەوتێکی زۆری دەستکەوت و هەندێکیشیان هەڵهاتن.

خەڵکی ناو (دومة الجندل) هەریەکەیان بەلایەکدا هەڵهاتن کە موسڵمانەکان چوونە سەر شوێنەکانیان کەسی تێدا نەمابوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕۆژێك مایەوە . سریەو تیپی سەربازی بە هەموولایەکدا نارد، کەسی نەدیەوە پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە ، لەو غەزایەدا پێغەمبەر ﷺ ڕێککەوتنی ئاشتی مۆر کرد لەگەڵ (عینە)ی کوڕی (حصن) لە (دومە الجندل) کە شوێنێکی بەناوبانگە لەنزیك شامەوە ، هەتا دیمەشق بە پیادە ڕێ پێنج شەو دەبێت ، لە مەدینەش پانزە شەو دوورە .

---

[1] / بۆ درێژەی باسی ئەم غەزایە بڕوانە (ابن هشام) ٢/٢٠٩ ، ٢١٠ هەروەها (زاد المعاد) ٢/١١٢ .

بەم دەستپێشخەریە خێراو پلانە ژیرە دەست و بردانە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە بەرقەرارکرنی ئاسایش و کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکەدا ، چەرخی ڕۆژگاریش جارێکی دی بە بەرژەوەندی موسڵمانان هەڵگەڕایەوە ، هەموو ئەو سەرئێشە ناوەکیانەش سووك بوون، دووڕووان بێدەنگ بوون و سەریان شۆڕکردو تیرەیەکی تری جولەکەش دەرکران ، ئەعرابە دەشتەکیەکانیش سەریان شۆڕکردو ئەوانی دیکەش خۆیان بەڕواڵەت کردە دۆست و پارێزەری بەڵێن و پەیماننامە ، کەفو کۆی هەڵچوونی قورەیشیش دامرکایەوە، دەرفەتێکی باش بوو بۆ موسڵمانەکان ڕەخسا تا پەیامی خوای جیهانیان بە دەوروبەردا بڵاوبکەنەوە.

## غەزای ( ئەحزاب )

پاش ئەو شەڕو سریانەی کە زیاتر لە ساڵێکی خایاند هێمنی و ئاسایش بڵاو بوەوەو دورگەی عەرەب هێور بوەوە ، بەڵام جولەکە هەمیشە لە ئاکامی پەیمانشکێنی و خیانەتکاری و پیلانگێرانی خراپی خۆیانەوە تووشی چەندین جۆری سەرشۆڕی و نەهامەتی دەبوون ـ ئەوانە هێشتا هۆشیان نەهاتبوەوە بەبەردا ، پەندیان وەرنەگرتبوو لە هەموو ئەوخیانەت و خراپەکاریانە ، ئەوە بوو پاش دوورخستنەوەیان بۆ خەیبەر چاوەڕوانی ئەنجامی بگرەو بەردەی نێوان موسڵمانەکان و بت پەرستەکانیان دەکرد . کە ڕۆژگاریش بە بەرژەوەندی موسڵمانەکان وەرچەرخاو دەسەلأت و هەژموونی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا سەپاند ، ئیتر جولەکە ناخیان جۆشی دەخوارد ، ڕق و کینەی دڵیان ئەوەندەی تر زیادی دەکرد .

دیسان دەستیان کردەوە بەپیلان گێران دژ بەموسڵمانەکان و خۆیان سازدا بۆ دەست وەشاندنێکی وەها لە موسڵمانەکان کە ئیتر ڕاست نەبنەوە ، بەڵام ئەوان زاتی ئەوەیان نەدەکرد ڕووبەڕوو ئەو کارە بکەن ، نەخشەو پیلانیان دانا بۆ ئەو مەبەستە.

بیست پیاو لەسەرکردەکانی جولەکەو پیاوانی (بنی النضیر) کەوتنەرێ بۆلای قورەیش لەمەککەو هانیاندان بۆ شەڕکردن دژ بەپێغەمبەر ﷺ و پشتیوانی خۆیان دەربڕی و بەڵێنی سەرکەوتنیان پێدان، قورەیشیش کەپێشتر بۆ وادەی ساڵانەکەی بەدر نەیوێرا بوو بڕواتە دەرەوە، لێرەدا دەرفەتێکی گونجاوی دەستکەوت بۆ کڕینەوەی ناوبانگی وونبووی خۆی ، بۆیە ڕازی بوون .

پاشان شاندە جولەکەکە چوون بۆلای (غطفان) چییان بە قورەیش وتبوو بە ئەمانیشیان وت ، ئەوانیش هاتن بەدەمیانەوە ، ئەنجا شاندەکە بەناو خێڵ و تیرەکانی عەرەبدا گەڕاو ژمارەیەکی تریشیان ڕازی کرد کەلەگەڵیان بن، بەو شێوەیە سەرکردەکانی جولەکە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لەجۆشدانی بێباوەڕاندا دژ بەبانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ .

ئەوەبوو لەباشوورەوە (قورەیش) و (کنانە) و هاوپەیمانەکانیان لە (تهامە) بە سەرکردایەتی (ابو سفیان) لەگەڵ چوار هەزار کەسدا کەوتنەڕێ ، لە (مر الظهران) (بنو سليم) یشیان پێگەیشت ، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە خێڵەکانی (غطفان) (بنو فزارة) بەسەرکردایەتی (عينيه)ی کوڕی (حصن) و (بنی مره)ش بە سەرکردایەتی (الحارث)ی کوڕی (عوف) و (بني اشجع) بە سەرکردایەتی (مسعر)ی کوڕی (رخيلة) و (بنو اسد) و چەندین خێڵی تریش لەگەڵیان دەرچوون بەرەو مەدینە.

ئەو هەموو خێڵ و گرۆهانە لەسەر وادەیەکی دیاریکراوی خۆیان بەرەو مەدینە کەوتنە جوڵە .

پاش چەند ڕۆژێك بە چواردەوری شاری مەدینەدا سوپایەکی زەبەلاحی دەهەزار کەسی کۆبوەوەو ژمارەی ئەو سوپایە لەوا نەبوو لە ژمارەی خەڵکی هەموو شاری مەدینە بەژن و پیاوو منداڵیشەوە زیاتر بووبێت .

خۆ ئەگەر ئەو سوپا گەورەیە لەناکاودا بیاندایە بەسەر قەڵاکانی مەدینەدا گەورەترین مەترسی دروست دەکرد لەسەر موسڵمانەکان و تەفروتونای دەکردن و لەوانەش بوو لە ڕەگوڕیشەوە دەریانبکێشێت، بەڵام سەرکردایەتی شاری مەدینە هۆشیاربوو، پێشتر چاوو ڕووی خۆی لەسەر هەموو ڕێگاکان دانابوو، چاوەڕوانی بارو دۆخەکەی دەکرد، دایناببوو کەداهاتوو چی لەگۆڕێدایە هێشتا ئەو سوپایە لەجێگەی خۆی نەجولابوو، هەواڵ هات بۆ پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو سوپا زەبەللاحە ترسناکە.

دەستبەجێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری باڵای پێکهێنا بۆ باسی شێوەی بەرگری کردن لەشاری مەدینە، پاش گفتوگۆکردن لەنێوان سەرکردەو ئەندامانی شورادا، پێکهاتن لەسەر بڕیارێك کەهاوەڵی خۆشەویست (سەلمان - ر -) خستیەڕوو، سەلمان وتی: پێغەمبەری خوا، ئێمە لەوڵاتی فارسدا کە گەمارۆ بدراینایە بە چواردەوری خۆماندا یەغانمان لێدەدا . نەخشەی خەنەك هەڵکەندن پێشتر عەرەب نەیبیستبوو - .

دەستبەجێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بەجێبەجێ کردنی نەخشەکە ، ڕای سپارد کە هەر دە پیاو دەبێت چل گەز لەو خەنەکە هەڵکەنن .

موسڵمانەکان بەخێرایی دەستیان کرد بەهەڵکەندنی خەنەك و، پێغەمبەری خواش ﷺ هانیدەدان و لەگەڵیاندا بەشداری دەکرد ، (بوخاری) دەگێڕێتەوە لە (سهل)ی کوڕی (سعد)ەوە، دەڵێت: لەخەنەکەکەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ ئەوان هەڵیان دەکەندو ئێمەش بەکۆڵ خۆڵەکەیمان دەبردە دەرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

اللهم لاعيش الا عيش الاخرة فاغفر للمهاجرين والانصار [1]

هەروەها لە(انس)ەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆناو خەنەکەکە لە بەرە بەیانێکی ساردا سەیری کرد ئەوەتا (ئەنسار)و(کۆچکەران) خەریکی چاڵ هەڵکەندن ، هیچ کۆیلەیەکیان نەبوو ئەوەیان بۆ بکات ، کە بینی وا بەوشێوەیە شەکەت و ماندوو برسین فەرمووی :

اللهم لاعيش الا عيش الاخرة فـــاغفر للانصار والمهاجرة

ئەوانیش وەڵامیان دایەوە وتیان :

نحن الذيـــن بايعـــوا محمداً على الجهـــاد مابقينـــا ابدا [2]

(براء)ی کوڕی (عازب)یش دەڵێت: چاوم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ خۆڵی دەگواستەوە لەتاو تەپ و تۆز سنگی پێغەمبەرم نەدەبینی ، ئەو ڕۆژە ، پێغەمبەری خوا ﷺ قژی پیرۆزی زۆربوو ، گوێم لێ بوو جۆشی خواردبوو لەگەڵ شیعرێکی (ابن رواحە)دا کە لەکاتی خۆڵ بارکردندا دەیوت :

اللهم لولا انت مـــاهتدينـــا و لا تصدقنـــا و لا صلينـــا

فـــانـــزلن سكـــينة علينـــا وثبت الاقـــدام ان لاقينـــا

ان الالـــى قـــدبغـــوا علينا وان ارادوا فتنـــة ابيـــنـــا

دەڵێت : ئەم دێڕەی کۆتایی درێژ دەکردەوە ، لە ڕیوایەتێکیدا هاتووە کە ئەم دێڕە هاتوە:

ان الالى قد بغوا علينا وان ارادوا فتنة ابينا [3]

موسڵمانەکان لەگەڵ ئەوەدا کە بەم گورج و گۆڵیەوە کاریان دەکرد برسێتی هەناوی پێ نەهێشتبوون ، (انس) دەڵێت : خەڵکی خەنەك پڕ بەمشتێك جۆیان بۆ

---

[1] / صحيح البخاري ( با غزوة الخندق ) ٢/ ٥٨٨ .

[2] / هەمان سەرچاوە .

[3] / هەمان سەرچاوە ٢/ ٥٨٩ .

دەهێنرا کە کەمێك زەیت یان بەزیان تێکەڵاو دەکرد لەبەر کۆنی ڕەنگی دەگۆڕاو ، ئەوەندە ڕەق و بۆن ناخۆش بوو لەبەر بینیان دەگیرا [1] .

(ابو طلحة) دەڵێت : دەردەدڵی خۆمان بردە لای پێغەمبەر ﷺ و سکی خۆمان نیشاندا کەیەکی بەردێکمان پێوە بەستبوو لەتاو برسێتی کەچی ئەو کە سکی هەڵدایەوە دوو بەردی لەتاو برسێتی بەستبوو [2] .

لەکاتی هەڵکەندنی خەنەکەدا نیشانەیەکی پێغەمبەرێتی ڕوویدا ، (جابر)ی کوڕی (عبدالله) بینی وا پێغەمبەر ﷺ بەتەواوی لاوازو زەرد هەڵگەڕاوە ، چووەوە ماڵێ مەرێکی سەربڕی بەژنەکەی وت جامێك جۆی کرد بە ئارد، ئەنجا بەپەنامەکی پێغەمبەری ﷺ ئاگادارکرد ، کە لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا تەشریف بهێنن . پێغەمبەری خواش ﷺ هەرچی کەسی ناو خەنەکە هەیە بانگی کرد ، کە هەزار کەس دەبوون ، هەمویان لەو خواردنەیان خواردو تێربوون هێشتا پارچە گۆشتەکە لەناو دەفرەکەدا مابوو ، نانەکەش وەك خۆی مابوەوە [3] .

خوشکەکەی (نعمان)ی کوڕی (بشیر) مشتێك خورمای هێنابوو بۆ خەنەکە تا باوك و خاڵۆکەی لێی بخۆن ، بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕیی داوای خورماکەی لێ کرد ئەویش هەمووی کردە توێشە بەرەیەکەوە ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ خەڵکی خەنەکی بانگ کرد ، هەموویان لێیان خوارد ، خوارماکە لە زیادبوندا بوو ، هەموویان لێیان خواردو هەستان ، توێشە بەرەکە ئەوەندە پڕ بووبوو سەرو بەر لێی دەڕژا [4] .

موعجیزەیەکی لەودوانە گەورەتر لە خەنەکەکەدا ڕویدا ، (بوخاری) لە (جابر)ەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت : لە ڕۆژی هەڵکەندنی خەنەکەکەدا ، تاشە بەردێکی گەورە هاتە بەردەممان ، هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان : ئەمە تاشە بەردێکی گەورەیە لە خەنەکەکەدا چی بکەین ؟ فەرمووی : من خۆم دادەبەزم ، لەو کاتەدا سکی پیرۆزی لەتاو برسێتی بە بەردێك بەستبوو ، سێ ڕۆژ بوو دەممان لە هیچ نەدابوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ پاچێکی هەڵگرت ، یەك پاچی لێدا وردو خاشی کردو وەك لمی لێهات [5] .

(براء) دەڵێت : لەو ڕۆژەدا لە چاڵێکیاندا بەردێك هاتە ڕێگەمان هەرچییەکیان لێکرد دادی نەدا ، پاچ و چەکوش کاری تێ نەدەکرد ، سکاڵامان بردە لای پێغەمبەری

---

1 / هەمان سەرچاوە ٢/٥٨٨ .
2 / (ترمذي) ریوایەتیکردوە لە (مشکاة المصابیح) ٢/ ٤٤٨ .
3 / بوخاری ئەم ڕووداوەی گێڕاوەتەوە ٢/ ٥٨٨ ، ٥٨٩ .
4 / (ابن هشام) ٢/٢١٨ .
5 / صحیح البخاري ، ٢/٥٨٨ .

خوا ﷺ ، تەشریفی هێنا پاچێکی هەڵگرت و فەرمووی : (بسم الله) یەك پاچی لێدا ، پاشان فەرمووی (الله اکبر) ئەوا کلیلەکەی وڵاتی شامم پێدرا وەڵلاهی چاوم لە کۆشکە سوورەکانیەتی ، پاشان جارێکی تر لێیدایەوە پارچەیەکی تری لێ شکاند ، فەرمووی (الله اکبر) موڵکی فارسم پێدرا ، وەڵلاهی ئێستا چاوم لە کۆشك و تەلارەکانی شاری (مدائن) ە ، پاشان بۆ سێیەم جار لێیدایەوە ، فەرمووی : (بسم الله) ، ئەنجا ئەوی تریشی وردوخاش کردو فەرمووی (الله اکبر) ، کلیلەکانی وڵاتی یەمەنم درا بەدەست ، وەڵلاهی لەم جێگەیەی خۆمەوە چاوم لە دەروازەکانی شاری (صنعاء)[1] .

(ابن اسحاق)یش هەمان ئەو ریوایەتە لە(سلمان)ی فارسیەوە دەگێڕێتەوە(ر)[2] .

شاری (مەدینە) جگە لە باکووری لە هەموولایەکەوە بەشاخ و بەردەلآن و باخ و بێستانی دارخورما گیرابوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو شارەزاییەکی سەربازیی لێهاتوو دەیزانی کە سوپایەکی زەبەللاحی لەو شێوەیە تەنها لە باکورەوە دەتوانێت هێرش بهێنێتە سەر شارەکە بۆیە خەنەکەکەی لە باکورەوە هەڵکەند .

موسڵمانەکان بەردەوام بوون لەسەر هەڵکەندنی خەنەکەکە ، بەدرێژایی ڕۆژەکە خەریك بوون ، ئێواران دەگەڕانەوەماڵەوە ، تا بەپێی نەخشە دانراوەکەی پێغەمبەر ﷺ خەنەکەکە تەواوکرا ، پێش ئەوەی سوپا زەبەللاحەکەی موشریکان بگاتە قەراغ شاری مەدینە[3] .

قورەیش بەچوار هەزار کەسەوە گەیشتنە نزیك مەدینە ، بەکۆمەڵ لە (اسیال)ی ناوچەی (رومە) لەنێوان (جرف) و (زعابە)دا دابەزین ، (غطفان) و شوێنکەوتوانیان لەخەڵکی (نجد)یش بە شەش هەزار کەسەوە هاتن و بەرووی (ئوحود) دا لە (ذنب لقمي) دابەزین .

﴿ وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَاناً وَتَسْلِيماً ﴾ الاحزاب :٢٢ واتە : کاتێك ئیمانداران ئەو گرۆهانەیان بینی وتیان: ئەمە ئەو بەڵێنەبوو کە خوداو پێغەمبەرەکەی فەرموویان ، بەڕاستی خوداو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو : ئەمەش جگە لەباوەڕ بەرزبوونەوەو ملکەچ بوون بۆ خودا، هیچ کاریگەریەکی لێنەکردن.

---

[1] / سنن النسائي ٥٦/٢ ، هەروەها (احمد) لە (مسند) ە کەیدا دەستەواژەکە هی نسائی نیە ، تێیداهاتووە کە لەهاوەڵێکەوە گێڕاوەتەوە .

[2] / ابن هشام ٢/ ٢١٩ .

[3] / هەمان سەرچاوە ٣٣٠/٣ ، ٣٣١ .

بەڵام دووڕوان و دڵ نەخۆشەکان ، دڵیان کەوتە لەرزە داخورپان لە ترسی ئەو سوپایە ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُوراً﴾ الاحزاب : ١٢ واتە : دووڕووەکان و ئەوانەی دڵەکانیان نەخۆشە وتیان: ئەوەی خوداو پێغەمبەرەکەی بە ئێمەیان وت جگە لە لەخۆبایی بوون چی دیکە نەبوو .

پێغەمبەری خوا ﷺ سێ‌هەزار چەکداری لەگەڵدا بوو ، پشتیان کردە شاخی (سلع) و خەنەکەکەیان خستە نێوان خۆیان و بێ‌باوەڕان ، دروشمیان ئەوەبوو: (سەرناکەون) (ابن ام کتوم)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت و ، فەرمانی‌دا بەژن و منداڵ لە ماڵەکاندا بمێننەوە .

کە موشریکەکان ویستیان هێرش بهێنن و بدەن بەسەر مەدینەدا ، خەنەکێکی پانیان بینی لەبەردەمیاندا هەڵکەنرابوو ، بەناچاری گەمارۆی موسڵمانەکانیاندا ، ئەوان کاتێك دەرچوو بوون هیچ جۆرە خۆ ئامادەکردنێکیان نەکردبوو بۆ ئەو نەخشەیە ، چونکە ئەو پلانە وەکو دەیانوت ـ فێڵێکە پێشتر خێڵەکانی عەرەب نەیانزانیوەو ، بەهیچ شێوەیەك خۆیان بۆ ساز نەدابوو.

موشریکان لە داخ و ڕقی بێ‌سنوریاندا بەچوار دەوری خەنەکەکەدا دەهاتن و دەچوون، بەدوای خاڵێکی لاوازدا دەگەڕان ، تالێوەی دزەبکەن ، موسڵمانەکانیش بە وردی چاودێری جموجوڵی موشریکەکانیان دەکرد ، تیربارانیان دەکردن بۆ ئەوەی لێی نزیك نەکەونەوەو ، لێیەوە بکەنە ئەم بەرەوە .

هەندێك لە سوارەکانی قوڕەیش زۆر بێتاقەت بوون بەوە کە بێ‌سوود بەدەوری خەنەکەکەدا بێن و بچن و چاوەڕوانی ئەو گەمارۆیە بکەن ، ئەوە نەریتی ئەوان نەبوو ، بۆیە کۆمەڵێکیان خۆیان پێ ڕانەگیرا لەوانە (عمرو)ی کوڕی (عبدود) و (عکرمە)ی کوڕی (ابو جهل) و (ضرار)ی کوڕی (خطاب) چەند کەسێکی تریان تێدابوو ، ڕێگەیەکی بەرتەسکیان بەدی کرد لەو ڕێگەیەوە کردیانە ئەم بەرەوە ، ئەسپەکانیان کەوتە ناو قوڕاوێك لەنێوان شاخی (سلع)دا ، (علی) کوڕی (ابو طالب) و چەند موسڵمانێکی‌تر بۆیان چوون و دەرچەکەیان لێگرتن (عمرو) داوای شەڕە شمشێری کرد (علی) کوڕی (ابو طالب) چووە مەیدانی ، وتەیەکی لە دەم دەرچوو کابرای گەرم کرد (عمرو) یەکێك بوو لە پاڵەوانە ئازاکانی موشریکان ، هات ئەسپەکەی خستیە خوارەوە لەداخدا سکی هەڵدڕی و دای لە دەم و چاوی ، ئەنجا چوو بۆ (علی) دەستیان کرد بە شەڕ زۆر یەکتریان هێناو برد ، تا (علی) ﷺ کوشتی ، ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لەترساندا لەهەمان دەرچەکەوە کەلێی هاتبوون هەڵهاتن ، ئەوەندە ترسان (عکرمە) لەکاتی ڕاکردندا ڕمەکەی لە بیرچوو .

لە ڕۆژەکانی تریشدا موشریکان چەند هەوڵێکی تریاندا بۆ پەڕینەوە لە خەنەکەکەیان بۆ کردنەوەی ڕێگەیەك بۆ پەڕینەوە ، بەڵام موسڵمانەکان بەرگریەکی ئازایانەیان دەکرد ، لەو دورەوە تیر بارانیان دەکردن و نەیاندەهێڵا لە خەنەکەکە بێنە ئەمبەرەوە تا شکستیان پێ هێنان .

بەهۆی سەرقاڵبوونی موسڵمانەکانەوە بەو شەڕە تیرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانەکان هەندێك نوێژیان لە کیس چوو ، لە (صحیحین) داهاتووە لە (جابر)ەوە (ر) : (عمر)ی کوڕی (خطاب) لە ڕۆژی خەنەکدا هات و ، دەستی کرد بە قسە وتن بە کافرانی قوڕەیش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە نوێژەکەم دواکەوت خەریك بوو ڕۆژ ئاوابێت پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : وەڵلاهی منیش نوێژەکەم بۆ نەکرا ، (جابر) دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە (طحان) دابەزین ، ئەنجا دەستنوێژی شۆردو ئێمەش دەستنوێژمان شوشت ، پاش خۆرئاوا بوون نوێژی عەسرمان کرد ، پاشان نوێژی شێوانیشمان کرد[1] .

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لەدەست چوونی ئەم نوێژانە زۆر بێتاقەت بوو تا نزای کرد لە موشریکان ، لە (بخاری)دا هاتووە لە (علی) یەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەنەکدا فەرمووی : خوا ماڵ و گۆڕیان پڕبکات لەئاگر، هەروەکو چۆن سەریان قاڵکردین لە نوێژەکانمان تا خۆر ئاوابوو لەکیسمان چوو[2] .

هەروەها لە(مسند)ی پێشەوا ئەحمەدو (شافعی)دا هاتووە، ئەو موشریکانە پێغەمبەری خوایان ﷺ سەرقاڵ کرد لە نوێژی نیوەڕۆو ئێوارەو شێوان و خەوتنان ، ئەوەبوو هەموویانی پێکەوە کرد ، پێشەوا (نووی) دەڵێت : شێوازی کۆکردنەوەی ئەو ریوایەتانە ، بەوەدەبێت کە غەزای خەنەك چەند ڕۆژێکی خایاندوە ، هەندێك نوێژی لە ڕۆژێکدا کردووەو هەندێکی تریشی لەچەند ڕۆژێکی تردا کردووە، تەواو[3] .

لێرەوە تێدەگەین کە هەوڵدانی موشریکان بۆ پەڕینەوە بۆ ئەمبەری خەنەکەو بەرگری کردنی موسوڵمانەکان ماوەی چەند ڕۆژێکی خایاندوە ، بەڵام لەبەرئەوەی خەنەکەکە کەوتبوە نێوانیانەوە هیچ شەڕێکی خوێناوی و ڕاستەوخۆ لەنێوانیاندا ڕووی نەدا ، بەڵکو تەنها شەڕەشیرو تیرو ڕمبازی تاکەکەسی هەبوو .

---

[1] صحیح البخاري ٢/٥٩٠ .
[2] هەمان سەرچاوە .
[3] (مختصر سیرە الرسول) ﷺ نوسینی شێخ عەبدڵلای نەجدی ل٢٨٧ ، هەروەها شەرحی (مسلم) لەلایەن (نووی)یەوە ١/ ٢٢٧ .

لەو شەڕەتیرەدا چەند پیاوێك لەهەردوولا کوژران کە بەپەنجەکان دەژمێردرێن شەش کەس لە موسڵمانەکان و دە کەس لە موشریکەکان بە تیر کوژران یەکێك یان دوانیش بە شمشێر کوژران .

لەو تیرئەندازییەدا (سعد)ی کوڕی (معاذ) تیرێك بەربالّی کەوت شاڕەگێکی بڕی ، کابرایەکی قوڕەیشی بەناوی (حبان العرفه)وە لێیدا، بۆیە نزای لێ‌کردو فەرمووی: خوایە تۆ دەزانیت هیچ شتێك لەلام ئەوەندە خۆشەویست نیە بەئەندازەی ئەوەی لە پێناوی تۆدا خەبات بکەم و دژ بەکەسانێك پێغەمبەرەکەی تۆیان بەدرۆ خستۆتەوەو شار بەدەریان کردووە ، خوایە وادەزانم کەبەم جەنگە لەنێوان ئێمەو ئەواندا شەڕ کۆتایی پێدێت ، خوایە ئەگەر شەڕێکمان لەگەڵ قوڕەیشدا ماوە بمهێڵە بۆیان ، تا لەپێناوی تۆدا لەگەڵیاندا بجەنگم ، خۆ ئەگەر شەڕ کۆتایی پێدەهێنیت ئەوا ئەم ڕەگی دەمارەم بتەقێنەو باپێیەوە بمرم[1] لەکۆتایی نزاکەیدا فەرمووی : خوایە نەمکوژی هەتا سەرشۆڕی (بنو قريظة) بەچاوی خۆم دەبینم[2] .

لەکاتێکدا کەموسڵمانەکان لەناو بەرەکانی جەنگدا ڕووبەڕووی سەرسەختیەکان دەبونەوە ، لەملاشەوە مارو دوپشکی پیلانگێڕیی لەکونەکانی خۆیدا گێنگڵی دەداو دەیوست بدا بەجەستەی موسڵمانەکانەوە ، بۆیە گەورە تاوانباری (بني نضير) (حيى) کوڕی (اخطب) چووە ماڵەکانی (بنو قريظة) و سەری‌دا لە (كعب)ی کوڕی (اسد القرظي) کە سەرۆکی (بني قريظة) بوو ، مۆرکەری گرێبەندو پەیمانی جولەکەی (بنو قريظة) بۆو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ، پەیمانی دابوو بەپێغەمبەر ﷺ ، کە ئەگەر هاتوو تووشی شەڕهات پشتی بگرێت هەروەکو پێشتر باسکرا ، (حيى) دای لەدەرگای ماڵەکەی، (كعب) لەسەری داخست، وازی لێ نەهێنا تا دەرگاکەی پی‌کردەوە ، (حيى) وتی : من سەر بەرزیی هەتا هەتایی و دەریای (طام) م بۆهێناوی ، هەموو قوڕەیشم بە پیاوماقوڵ و سەرکردەیانەوە هێناوەتە (مجمع الاسيال) لە (رومه) ، (غطفان) و هەموو سەرکردەو پیاو ماقوڵەکانی ئەوانیشم لە (ذنب نقمي) دابەزاندوە بەتەنیشت (ئوحود)ەوە، بەڵێن و پەیمانیان پێداوم کەتا لە ڕەگ و ڕیشەوە موحەممەد دەرنەکێشن وازنەهێنن.

(كعب) پێی وت: وەڵڵاهی تۆ زەلیلیی ڕۆژگارو دەریایەکی بێ‌ئاوت بۆ هێناوم ، تەنها دەنگی هەیەو ڕەنگی نیە، خوا لەناوت بەرێت (حيى) ! وازم لێبهێنە

---

[1] / صحيح البخاري ٣/ ٥٩١ .
[2] / ابن هشام ٣/٢٢٧ .

بائەم حاڵەم لێ تێك نەچێت ، من جگە لەڕاستگۆیی و ئەمەکداریی هیچی ترم لە موحەممەد نەدیوە.

(حیی) هەر وازی لێ نەهێناو لەکۆڵی نەبۆوە ، تا(کعب) ڕێگەی‌دا ، بەمەرجێك پەیمانی بداتێ ئەگەر هاتوو قورەیش و غەطفان گەڕانەوە، لەگەڵ موحەممەددا هیچیان پێ‌نەکرا ئەوا (حیی)یش لەگەڵ (کعب)دا بچێتە قەڵاکانی ئەوانەوە بۆ ئەوەی وەکو یەك زیانیان بەربکەوێت (کعب)یش خۆی بێ‌لایەن کرد لەو بەڵێن و پەیمانەی کە هەیبوو لەگەڵ موسڵمانەکانداو هەڵیوەشاندەوەو ئیتر چووە ڕیزی موشریکان و بەرەی دژ بە موسڵمانەکانی گرت[1].

بەکردەیش (بنو قریظة) هەستان بەچەند کارێکی سەربازیی ، (ابن اسحاق) دەڵێت : (صفیە)ی کچی (عبدالمطلب) لەناو قەڵایەکدا بوو (حسان)ی کوڕی (ثابت) یشیان لەگەڵدا بوو، (حسان) لەو قەڵایەدا لەگەڵ ژن و منداڵەکاندا دانرابوو ، (صفیة) دەڵێت : پیاوێکی جولەکە بەلاماندا تێپەڕی و بەدەوری قەڵاکەدا هاتوچۆی دەکرد ، (بنو قریظة) کەوتبوونە جەنگ و پەیمانیان شکاندبوو، کەسێکیش نەبوو لەو ناوەدا بەرگریمان لێ بکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان لە سەنگەرەکاندا بەرامبەر دوژمن وەستابوون و ، هەرکەسێك بیدایە بەسەرماندا کەس نەیدەتوانی بیگێڕێتەوە ، وتم بە (حسان) کوڕە ئەوە جولەکەیە بەدەوری قەڵاکەدا دێت و دەچێت دڵنیانیم کە پشتەوەی موسڵمانان ئاشکرا نەکات بۆ بێ‌باوەڕان ، دەبینی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان سەرقاڵن و لێرەنین ، ئادەی (حسان) دابەزە بیکوژە ، کەچی (حسان) وتی : وەڵڵاهی تۆ دەزانی ئەوە بەمن ناکرێت ، (صفیة) دەڵێت : کوڵەکەیەکم هەڵگرت لە قەڵاکە دابەزیمە خوارەوە ، کێشام بەسەریدا کوشتم پاشان گەڕامەوە ناو قەڵاکەو ، وتم (حسان) دابەزە چەك و تفاقەکەی لێبکەرەوە ، لەبەرئەوە پیاوە من نەمتوانی لێی بکەمەوە ، کەچی (حسان) وتی : پێویستم پێی نیە[2].

ئەم کارە گەورەیەی پوری پێغەمبەر ﷺ ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پاراستنی ژن و منداڵی موسڵماناندا ، پێدەچێت جولەکەکان وایان زانیبێت کە ئەو قەڵایە پڕە لە

---

[1] / ابن هشام ٢/٢٢٠ ، ٢٢١ .

[2] / ابن هشام ٢/٢٢٨، ئەم فەرموودەیە وا لێکدەدرێتەوە کە(حسان) پیاوێکی ترسنۆك بوبێ، هەندێك لەزانایان ئەو بۆچوونەیان بەرپەرچ داوەتەوەو بەخراپی دەزانن، چونکە فەرموودەکە بچڕان لە (اسناد)ەکەیدا هەیە ئەگەر ڕاست بوایە(حسان)ی پێ‌ناشرین دەبوو، خۆ ئەگەر ڕاستیش بێ ئەوە پێدەچێ (حسان) لەو ڕۆژەدا نەخۆش بو بێ، ئەمە باشترین لێکدانەوەیە.

چەکداری سوپای ئیسلام و زەحمەتە کەس بتوانێت بچێتە سەریان . لەکاتێکدا کە هیچ پیاوێکی چەکداری تێدا نەبوو بۆیە نەیانوێرا جارێکی تر ئەوکارە دووبارە بکەنەوە ، بەلاّم بە بەردەوامی نامەو قسەیان دەنارد بۆ بت پەرستەکان وەك بەڵگەیەکی کردبێت بۆ دانەپاڵی موشریکان، تاڕادەیەك موسڵمانەکان بیست وشتری ئازوقەی جولەکەیان گرت کە بۆ سوپای موشریکانیان ناردبوو .

هەواڵی پەیمانشکێنیەکە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان ، بۆیە دەستبەجێ دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە تاهەڵوێستی (بنو قریظة)ی بۆ ڕوون بێتەوە ، لە ڕووی سەربازییەوە حسابی بۆ بکات ، بۆ لێکۆڵینەوەی هەواڵەکە هەردوو (سعد) ە کە ، (سعد)ی کوڕی (معاذ) و (سعد)ی کوڕی (عبادە)و (عبدالله)ی کوڕی (رواحە)و (خوات)ی کوڕی (جبیر)ی ناردو پێیانی فەرموو : بڕۆن بزانن ئەو هەواڵە ڕاستە ، کە لەبارەی ئەوانەوە پێمان گەیشتوە ؟ ئەگەر ڕاست بوو بە ئیشارەتێك تێم بگەیەنن کەلێی حاڵی ببم و هەواڵەکە لەناو خەڵکدا بلاّومەکەنەوە ، خۆ ئەگەر لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆیان مابوونەوە ئەوا ئاشکرای بکەن بۆ خەڵك . کەمەفرەزەکە نزیکبوونەوە لەجولەکە ، هەڵوێستیان زۆر ناشیرین و بیّڕێز بوو، بەئاشکرا دوژمنایەتیان کردن و جنێویاندا بە خۆیان و بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها وتیان: پێغەمبەری خوا کیّیە؟ هیچ بەڵێن و پەیمانێك لەنێوان ئێمەو موحەممەددا نیە، موسڵمانەکان گەڕانەوەو بەئیشارەت تێیان گەیاند کە جولەکە پەشیمان بونەتەوەو پەیمانیان شکاندووە ، وتیان : وەکو (عضل) و (قارە)ن ، واتە پەیمانشکێنیان کردووە (عضل) و (قارە) ئەوانە بوون کە خیانەتکاریەکەی (رجیع) یان ئەنجامدا.

لەگەڵ ئەوەدا کە ویستیان هەواڵەکە بشارنەوە بەلاّم خەڵك بەدەمودویاندا تێگەیشتن کە مەسەلەکە چۆنە، هەستیان کرد ڕووبەڕووی مەترسیەکی گەورە دەبنەوە.

بەڕاستی ساتە وەختێکی ترسناك بوو بۆ موسڵمانەکان ، هیچ بەربەستێك نەبوو لەنێوان موسڵمانەکان و جولەکەی (بنو قریظة)دا کە لەپشتەوە لێیان بدەن ، لەبەردەمیشەوە سوپایەکی زەبەللاحی ئەوەندە گەورە وەستابوو ئەستەم بوو بتوانن خۆیانی لیّ لابدەن ، ژن و منالّەکانیشیان لەبەردەم ئەو پەیمانشکێنانەدا بوو بەبیّ هیچ بەربەستێك ، بەشێوەیەك بوون هەروەکو خودای گەورە دەفەرمویّت : ﴿وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ

وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾ الاحزاب : ١٠،١١ واته : چاوەکان ئەبلەق بوون و ، دلەکانتان هاتبوه گەروو ، گومانی جۆراو جۆرتان هەبوو لە بەرامبەر بەلێنەکانی خوا بە سەرخستنی ئیمانداران ، ئا لەو کاتەدا ئیمانداران تووشی تاقیکردنەوە بوون و زەمین لەرزەیان پێکەوت، تاهەندێکیان دەیانوت: موحەممەد بەلێنی گەنجینەی کیسراو قەیسەرمان دەداتێ ، کەچی کەسمان ناوێرێت بڕوات بۆ سەرئاو ، هەندێکی تریشیان لەبەردەم کۆمەلێك خەلکی خزمیاندا وتیان : مالمان بەدەرەوەیە مۆلەتمان بدە بابڕۆینەوە مالێ ، چونکە لەدەرەوەی مەدینەدان ، هەتا خێلی (بنو سلمە) خەریکبوو بگەڕێنەوەو شکست بهێنن ، لەبارەی دووڕووەکانەوە ئایەت هاتە خوارەوە : ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُوراً وَإِذْ قَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَاراً﴾ الاحزاب : ١٢ ، ١٣ واتە : ئا لەوکاتەدا دووڕووەکان و دڵ نەخۆشەکان دەیانوت: بەڕاستی بەلێنی خواو پێغەمبەرەکەی تەنها لەخۆبایی بوون بوو ، دەستەیەکیش لە دووڕووەکان وتیان : خەلکی (یثرب) ئەمە شوێنی مانەوەتان نیە ، بگەڕێنەوە بۆ ناوشار ، دەستەیەکیشیان مۆلەتیان لە پێغەمبەر ﷺ دەخواست و دەیانوت مالەکانمان بەدەرەوەیە لەڕاستیدا وانەبوو ، ئەوانە تەنها دەیانەوێت لە مەیدانی جەنگەکە هەلبێن.

پێغەمبەریش ﷺ کە هەوالی پەیمانشکێنی (بنو قریظة)ی پێگەیشت جلەکانیدا بەسەر خۆیداو بۆ ماوەیەك پالکەوت ، تا بەلاو کارەساتەکە تەواو لەسەر موسلمانان سەخت بوو ، پاشان هیوای هاتەوە بەبەرداو ، هەستایەوەو فەرمووی : (الله اکبر ، مژدەی سەرکەوتنتان لێ بێت موسلمانان) پاشان دەستی کرد بەنەخشە دانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بارودۆخەکە ، وەکو بەشێکیش لەو نەخشەیە ، مەفرەزەی پاسەوانی دەناردەوە بۆ مەدینە نەبادا لەناکاوداو لەپشتەوە شالاو بکرێتە سەرژن و منالەکان ، بەلام هەلوێستەکە پێویستی بەهاتنە پێشەوەیەکی یەکلاکەرەوە هەبوو ، کە هەموو گرۆهەکانی پێ سەرشۆڕ بکات ، بۆ ئەو مەبەستە ویستی سولحێك بکات لەگەل (عینیە) کوڕی (حصن) و (حارث)ی کوڕی (عوف) کە هەردووکیان سەرکردەی (غطفان) بوون ، لەسەر سێیەکی بەروبومەکانی مەدینە ، لە بەرامبەر ئەوەدا بەخۆیان و سوپاکەیانەوە بگەڕێنەوە ، موسلمانەکانیش یەکلاببنەوە بۆ سوپاکەی قورەیش ، کە هێزو زەبرو زەنگیان دەناسی و باش تاقیان کردبۆوەو لەناویان بەرن.

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسی بەهەردوو (سعد)ەکە کرد، ئەوان وتیان : پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەگەر خوا ئەم فەرمانەی پێداویت ئەوا قسەمان نیە ، ئێمە کاتێك خەڵکێکی بت پەرست و گومڕابووین ، ئەوانە نەیانتوانیوە دەنکە خورمایەکی ئێمە بخۆن مەگەر بەئاڵ و وێریان فرۆشتن ، ئێستا پاش ئەوەی خوا بەئیسلام ڕێزی گرتین و هیدایەتی داین و بەتۆوە سەری بەرز کردینەوە ، تازە بچین ماڵی خۆمانیان بدەینێ ؟ وەڵلاهی جگە لە شمشێر هیچی تریان نادەینێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵوێستەکەیانی پێ چاك بوو ، فەرمووی : ئەمە ڕاوێژێکە بەئێوەی دەکەم بۆ ئەوەم کرد ، کەبینیم عەرەب لە هەموو لایەکەوە هاتونەتە سەرمان وتم : بەم پێشنیارە کەمێك بارەکە سووك بکەین .

پاشان خوای گەورە کارێکی ڕەخساندو دوژمنی پێ سەرشۆڕ کردو دایمرکاندنەوە ، خودا کردی ئەوەبوو پیاوێکی (غطفان)ی بەناوی (نعیم)ی کوڕی (مسعود)ی کوڕی (عامر)ی (اشجعی) (ر) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ من موسڵمان بووم ، کەسوکارم بەموسڵمان بونم نازانن ، فەرمانم پێ بدە بەئارەزووی خۆت بۆت جێبەجێ دەکەم ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی تۆ تەنها پیاوێکی ، دەتوانی کێ پەشیمان بکەیتەوە بیکە ، چونکە شەڕ تەکتیك و فێڵە ، خێرا (نعیم) چوو بۆلای (بنی قریظة) کە لەسەردەمی نەفامیدا دۆستیان بوو . چووە ناویان وتی: خەڵکینە ئێوە دەزانم من ئێوەم چەندە خۆش دەوێت ، دەشزانن چەندە نێوانمان خۆشە ، وتیان : ڕاست دەکەیت ، وتی : حاڵی قورەیش وەکو ئێوە نیە ، ئەم شوێنە شوێنی ئێوەیەو ماڵ و موڵك و مناڵی ئێوەی تێدایە ، ناتوانن بەجێی بهێڵن و بڕۆن بۆ شوێنێکی‌تر ، قورەیش و (غطفان)یش هاتوون بۆ شەڕی موحەممەدو هاوەڵەکانی ئێوەش پشتان گرتوون ، لەکاتێکدا کەشوێن و ماڵ و ژن و منداڵیان لە شوێنێکی دیکەیە ، ئەگەر دەرفەتێکیان دەست بکەوێت دەی قۆزنەوە ، ئەگەر هیچیان پێ‌نەکرا ئەوا بەجێتان دەهێڵن و دەڕۆنەوە بۆ شوێن و مەنزڵگای خۆیان ، ئەنجا موحەممەد لەپای ئەوەدا تۆڵەتان لێ‌دەکاتەوە ، وتیان : (نعیم) چی بکەین باشە ؟ (نعیم) وتی : لەگەڵیاندا شەڕ مەکەن تا بارمتەیان لێ وەرنەگرن ، وتیان : ئەمە ڕایەکی زۆر باشە .

پاشان (نعیم) چوو بۆلای (قورەیش) ، پێی وتن : خۆتان دەزانن کەمن چەندە ئێوەم خۆشدەوێت ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: جولەکە پەشیمان بونەتەوە لەو پەیمانشکێنیەی کردیان بەرامبەر بەموحەممەدو هاوەڵەکانی ، بۆیە هەواڵیان داوە

به موحەممەد کە چەند بارمتەیەك لە ئێوە وەربگرن و بیدەن بە موحەممەد ، پاشان دەڕۆنەوە پاڵ ئەو دژ بە ئێوە شەڕ دەکەن ، ئەگەر داوای بارمتە یان لێ کردن نەیاندەنێ ، پاشان چوو بۆ لای (غطفان) و هەمان شتی پێوتن .

شەوی شەممە بوو ، لەمانگی شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا، سوپای قورەیش و غەتەفان ناردیان بەشوێن جولەکەی (بنو قريظة)داو پێیان وتن: ئەمە جێگەو مەنزڵگای ئێمە نیە ، هیچمان بەدەستەوە نەما ، هەستن بابدەین بەسەر موحەممەدا ، جولەکە وەڵامیان ناردەوە کە ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە ، ئێوە باش دەزانن کە پێشینەکانی ئێمە لەو ڕۆژەدا شەڕیان کرد چیان بەسەرهات ، زیاد لەوەش ئێمە شەڕتان لەگەڵ ناکەین تا بارمتەمان بۆ نەنێرن ، کە پەیامنێرەکانی جولەکە ئەم هەواڵەیان هێنا ، قورەیش و (غطفان) وتیان : وەڵڵاهی (نعيم) ڕاستی پێگوتین ، وەڵامیان ناردەوە بۆ جولەکە کە وەڵڵاهی ئێمە کەستان بۆ نانێرین ، وەرنە دەرەوە با شەڕ بکەین لەگەڵ موحەممەد ، (بنو قريظة)ش وتیان : وەڵڵاهی (نعيم) ڕاستی پێ وتین ، ئیتر هەردوولا پشتی یەکتریان بەردا ، دووبەرەکی کەوتە نێوانیانەوە و ورەیان ڕووخا .

موسڵمانەکانیش لەخوا دەپاڕانەوەو دەیانوت : خوایە لەکەمان بپۆشەو دڵمان ئارام بکەرەوە ، پێغەمبەری خواش ﷺ نزای کرد لە ئەحزاب و فەرمووی : خوایە ، ئەی نێرەری قورئان ، دادگەری خێرا ، خوایە ، ئەحزابەکان سەر شۆڕ بکەیت ، خوایە ژێریان بخەیت و جێگەیان پێ لێژ بکەیت .

خوای گەورە نزای پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانەکانی گیرا کرد ، پاش ئەوەی کە دووبەرەکی کەوتە نێو ڕیزی موشریکەکانەوە ، پشتیان لە یەکتری کردو ، خوای گەورە ڕەشەبایەکی توندی بۆ ناردن ، دەوارو خێمەکانی لێ هەڵپێکان و شپرزەی کردن ، هەموو ئاگرەکانی کوژاندنەوەو ، ئارامی لێ هەڵگرتن چەندین سەربازی لە فریشتەکان بۆ ناردن جێگە پێیەکانی پێ لەق کردن و ترس کەوتە دڵیانەوە .

لەو شەوە تاریکە سەرمایەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ (حذيفه)ی کوڕی (يمان) ی نارد هەواڵی سوپای موشریکانی بۆ بهێنێت ، کەچوو بەو حاڵە شپرزەیەوە بەدی کردن ، سەرنجیدا خەریکی خۆسازدانن بۆ ڕۆیشتن ، گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، هەواڵی ڕۆیشتنی سوپاکەی پێدا ، خودای گەورە بە ڕق و کینەی خۆیانەوە ناچاری گەڕانەوەی کردن وهیچیشیان دەستکەوت نەبوو ، خودای گەورە نەیهێشت موسڵمانان تووشی شەڕ بن ، ئەوەبوو بەڵێنی خۆی بەجێهێناو سەری

سەربازەکانی خۆی بڵندکردەوە ، پێغەمبەرەکەی سەرخست و ئەحزابەکانی ژێرخست و پێغەمبەریش ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە .

غەزای خەنەك لەساڵی پێنجەمی کۆچی لەمانگی شەوالدا ڕوویدا بەپێی ڕاستترین گێڕانەوە ، موشریکان لەو شەڕەدا بۆ ماوەی یەك مانگ یان نزیکەی مانگێك گەمارۆی موسڵمانەکانیانداو ، بەکۆکردنەوەو لێك نزیك کردنەوەی ریوایەتەکانیش دەردەکەوێت کە لەسەرەتای دەستپێکردنی ئابلۆقەکە لە مانگی شەوالدا بوەو کۆتاییەکەشی کەوتۆتە مانگی (ذي القعدة)ەوە ، لای (ابن سعد)یش هاتوە ، کە پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی چوارشەممەی هەفتەی سێیەمی مانگی (ذي القعدة) دا لە خەنەکەکە گەڕایەوە بۆ مەدینە .

غەزای ئەحزاب غەزای کوشتارو زیان نەبوو ، بەڵکو شەڕی دەروونی بوو ، کوشتارێکی خوێناوی ئەوتۆ تێدا ڕووی نەدا ، بەڵام یەکلاکەرەوەترین جەنگیش بوو لە مێژووی ئیسلامیدا ، بەسەر شۆڕیی موشریکان کۆتایی هات و پەیامێکیدا بەگوێی دونیادا کە هەموو عەرەب چیتر ناتوانێت ئەو هێزە بچوکە چالاکەی مەدینە لەناو بەرێت ، چونکە هەموو عەرەب نەیاندەتوانی کۆمەڵێکی گەورەتر کۆبکەنەوە کە لە شەڕی ئەحزابدا کۆیان کردبوەوە ، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی خوای گەورە بڵاوەی کرد بە سوپای ئەحزاب فەرمووی : ئێتر لەمەودوا ناتوانن بێنە سەرمان بەڵکو ئێمە دەچینە سەریان [1].

---

[1] صحيح البخاري ٢/٥٩٠ .

## غەزای (بني قريظة)

لەو ڕۆژەدا کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی گەڕایەوە بۆ مەدینە ، لە نیوەڕۆدا (جبريل ﷺ) هاتەلای لەو کاتەدا لەماڵی (ام سلمه) خۆی دەشۆرد، پێی فەرموو : دەڵێی چەکت داناوە؟ خۆ هێشتا فریشتەکان چەکیان دانەناوە ، منیش لەسەر داوای ئەوان هاتمەوە لات ، خۆت و هەرکەسێکت لەگەڵدایە هەر ئێستە بکەونە ڕێ بەرەو (بنو قريظة) ، ئەوا منیش لەپێشتەوە دەڕۆم قەڵاکانیان لەژێر پێدا دەلەرزێنم و ، ترس و بیم دەخەمە دڵەکانیانەوە ، جبريل لەکەژاوەیەکی فریشتەییدا بەڕێ کەوت .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بانگکەرێك بانگ بدا بەگوێ خەڵکیداو بڵێ هەرچی گوێی لێیەو گوێڕایەڵە با لە (بنو قريظة) نەبێت نوێژی عەسر نەکات ، (ابن ام کتوم)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت و ئاڵاکەی دایەدەست (علی) کوڕی (ابی طالب) و بەرەو (بنو قريظة) پێشی خست ، (علی) کەوتە پێشەوە هەتا لە قەڵاکانیان نزیك بوەوە گوێی لە وتەیەکی ناشیرین بوو وترا بەپێغەمبەری خوا ﷺ .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کاروانێکی کۆچکەران و ئەنساردا کەوتەڕێ ، تا لەسەر بیرێکی (بنی قریظة) دابەزی پێیان دەوت بیری (انا) ، موسوڵمانەکان دەستەو نەزەر لە خزمەتیدا بوون ، کەوتنە ڕێ ، لە ڕێگەدا بوون کاتی نوێژی عەسر هات ، هەندێکیان وتیان : لە (بنو قريظة) نەبێت نوێژ ناکەین ، هەندێکی تریشیان وتیان : مەبەست لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە نەبووە کە نوێژ لە (بنو قريظة) بکرێت بەڵکو مەبەستی پەلە کردن بووە بەرەو (بنو قريظة) بۆیە لە ڕێگە نوێژەکەیان کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزەنشی هیچ کۆمەڵێکیانی نەکرد .

بەو شێوەیە سوپای ئیسلام بەڕێ کەوت بەرەو (بنو قريظة) ، پۆل پۆل بە پێغەمبەری خوا گەیشتن ﷺ ، بریتی بوون لە سێ هەزار چەکدار ، سی ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو ، لەقەڵاکانی (بنو قريظة) نزیك بوونەوەو گەمارۆیاندان.

کە ئابڵوقەکەیان لەسەر توند بوو ، (کعب)ی کوڕی (اسد)ی سەرکردەیان سێ پێشنیاری خستە بەردەستیان یان موسڵمان بن و بڕۆنە سەر ئاینەکەی موحەممەد ﷺ ، ئەوجا خوێن و ماڵ و ژن و منداڵیان سەلامەت دەبن ، پێشی وتن : دەزانن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە ، ئەمە ئەو کەسەیە ئێوە لەکتێبەکەی

خۆتاندا بەدی دەکەن ، یان ئەوەیە بەدەستی خۆیان ژن و منداڵی خۆیان بکوژن و بەشمشێری دەستەوە بێنە دەرەوە بۆ محەممەد ﷺ یان بەسەریدا زاڵ دەبن ، یان سەرلەبەریان دەکوژرێن ، یان ئەوەیە هێرش بکەنە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی و لە ڕۆژی شەممەدا لێیان بدەن ، چونکە ئەوان دڵنیان کە ئێمە لە ڕۆژی شەممەدا شەڕ ناکەین ، کەچی ئەوان بەدەم هیچ پێشنیارێکی (کعب)ە وە نەهاتن ، ئیتر (کعب)ی سەرۆکیان بە تووڕەیی و بێزاریەکەوە پێی وتن : لەوەتی لە دایک بوون پیاوتان تێدا هەڵنەکەوتووە بتوانێت بڕیارێك بدات .

پاش بەرپەرچ دانەوەی هەر سێ پێشنیارەکە (بنو قريظة) هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت کە لە قەڵاکانیان دابەزن بۆ حوکم و بڕیاری پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵام ویستیان پەیوەندیەك بکەن بەهەندێك لە هاوپەیمانە موسڵمانەکانیانەوە ، سا بەڵکو بزانن ئەگەر دابەزین بۆ حوکمی پێغەمبەر ﷺ چیان لێ بەسەردێت ، داوایان کرد لەپێغەمبەر ﷺ ، کە (ابو لبابە) یان بۆ بنێرێت قسەیەکی لەگەڵدا بکەن و ڕاوێژی پێ بکەن ، (ابو لبابە) بەحوکمی ئەوەی ماڵ و منداڵەکەی کەوتبوە ناوچەی ئەوانەوە ، هاوپەیمانیان بووە ، (ابو لبابە) چوو بۆلایان کە بینیان ژن و منداڵەکانیان دەستیان کرد بە هاوارو شین و گریان ، دڵی نەرم بوو بۆیان ، وتیان (ابا لبابە) پێت وایە کە ملکەچ بین بۆ حوکمی موحەممەد ؟ وتی : بەڵێ بەدەستی ئیشارەتی کرد بۆ گەردنی - مەبەستی ئەوەبوو کە سەرتان دەبڕێت - یەکسەر (ابو لبابە) پەشیمان بوەوەو زانی کە خیانەتی کردووە لە خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ ، بۆیە خێرا ئەوێی بەجێهێشت و نەگەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ، چوو بۆ مزگەوتی مەدینە ، خۆی بەکۆڵەکەی مزگەوتەوەکەوە بەستەوەو سوێندی خوارد کە خۆی نەکاتەوە هەتا خودی پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی دەیکاتەوە ، سوێندیشی خوارد هەرگیز نەڕواتە خاکی (بنی قريظة) ، کە هەواڵی بەسەرهاتەکەی گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ پێشتریش چاوەڕوانی زۆری (ابو لبابە)ی کردبوو - فەرمووی : ئەگەر بهاتایە بۆ لام لێی خۆش دەبوم ، بەڵام مادام ئەو کارەی کردووە من ئەو کەسە نیم کە بەرەڵڵای بکەم تا خوا تەوبەی لێ قەبوڵ نەکات .

لەگەڵ ئەوەشدا کە (ابو لبابە) پێی وتبوون کەچی (بنو قريظة) بە ناچاریی ملکەچ بوون بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ، لەکاتێکدا کە دەیانتوانی بۆ ماوەیەکی

دوورو درێژ بەرگەی گەمارۆکەش بگرن ، چونکە ئازووقەیان زۆر بوو کانیاو کارێز لە قەلاًکەدا هەبوو ، سەرباری پتەوی قەلاًکەیان و، سەرباری ئەوەش دونیا ساردبوو موسڵمانەکان بەبەر ئەو سەرماوسۆڵەیەوە بوون و شەڕی خەندەق شەکەتی کردبوون و، نەیان دەتوانی درێژە بەکارە جەنگیەکان بدەن ، بەڵام جەنگی (بنی قریظة) جەنگێکی دەروونی بوو ، خوا ترسی خستبوە دڵەکانیانەوە ، ورەیان بە تەواوی ڕووخا بوو ، گەیشتە ڕادەیەك (علی) کوڕی (ابی طالب) و (الزبیر)ی کوڕی (عوام) چوونە پێشەوە ، (علی) ڕووی کردە ئیمانداران و هاواری کرد: ئەی گرۆهی ئیمانداران وەڵڵاهی یان دەبێت وەکو حەمزە شەهیدم بکەن یان قەلاًکەیان دەکەمەوە.

ئیتر جولەکە خۆیان پێڕانەگیراو لە قەلاًکەیان هاتنە خوارەوە بۆ حوکمی پێغەمبەر ﷺ ، دەسبەجێ فەرمانیدا بە گرتنی پیاوەکانیان ، بەسەرپەرشتی (محمد)ی کوڕی (مسلمە) کۆت و زنجیرکران ، ژن و منداڵەکانیش بەجیا لە جێیەکی تردا دانران ، خێڵی (اوس) چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان : پێغەمبەری خوا ﷺ خۆت دەزانی چیت کرد بە (بنو قینقاع) ئەوان هاوپەیمانی خێڵی خەزرەجی برامان بوون ، ئەمانیش دۆستی ئێمەن ، چاك بە لەگەڵیاندا ، فەرمووی : ئایا ئێوە ڕازین پیاوێك لەخۆتان فەرمان بدا بەسەریاندا ؟ وتیان : بەڵێ :- فەرمووی : ئەوە بڕیارم دایە دەستی (سعد)ی کوڕی (معاذ) وتیان: ئێمەش ڕازین .

پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن (سعد) کوڕی (معاذ)دا ، لە مەدینە بوو ، بەهۆی ئەو برینەوە کە دەماری دەستی بڕی بوو نەیتوانی بوو لەگەڵ موسڵمانان بڕواتە دەرەوە بۆ ئەم جەنگە ، سواری گوێدرێژێك کراو ، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، خزمەکانی چوونە لای و پێیان وت : چاك بە لەگەڵ دۆستەکانت ، پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی کردووە بە ناوبژیوان تا چاکەیان لەگەڵدا بکەیت ، (سعد) یش بێدەنگ بوو وەلاًمی کەسی نەئەدایەوە کە زۆریان بۆ هێنا (سعد) وتی: بەڕاستی کاتی ئەوە هاتوە ئیتر (سعد) گوێ نەداتە لۆمەی لۆمەکاران ، کە گوێیان لەو قسانە بو هەندێکیان بە غەمباری گەڕانەوە بۆ مەدینە .

کە (سعد) گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەهاوەڵان : ئادەی هەستن بڕۆن بەدەم گەورەکەتانەوە ، کە دایانبەزاند وتیان : (سعد) (بنو قریظة) بۆ

فەرمانی تۆ هاتنە خوارەوە ، وتی : ئایا حوکم و بڕیاری منیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت ؟ وتیان : بەڵێ ، وتی : بەسەر موسڵمانەکانیشدا؟ وتیان : بەڵێ ، وتی : بەسەر ئەو کەسەشدا کە لێرەیە ؟ لەوێدا ڕووی وەرچەرخاندو بەدەست ئیشارەتی کرد بۆ ئەو ڕوەی پێغەمبەری لێ وەستا بوو ، لەبەر ڕێزو گەورەیی پێغەمبەر ﷺ وای کرد ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەڵێ ، فەرمانت جێبەجێ دەکرێت بەسەر منیشدا ، (سعد) وتی: من فەرمان دەدەم بەکوشتنی پیاوەکانیان و ئەسیر کردنی ژن و منداڵەکانیان و دابەش کردنی ماڵ و سامانەکەیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی (سعد) بە حوکمی خودا کارت کرد لە سەرووی حەوت چینی ئاسمانەوە.

حوکمەکەی (سعد) دادپەروەری تێدابوو ، (بني قريظة) زیاد لەوەی کە خیانەتی گەورەیان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەزارو پێنج سەد شمشێرو دووهەزار ڕم و سێ سەد قەڵغان و پێنج سەد زنجیر بەست و خودەی سەریان کۆ کردبووەوە بۆ جەنگی موسڵمانەکان ، ئەم شتانە دوای گرتنی قەڵاکەیان کەوتە دەست موسڵمانەکانەوە.

ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا (بنو قريظة) بەندکران لەماڵی کچی (الحارث)دا کە ژنێك بوو لە (بني النجار) لەبازاری مەدینەداو چاڵیان بۆ هەڵکەنرا ، پاشان فەرمانیدا پۆل پۆل نێرران بۆ خەنەکەکان ، لەوێدا درا لەملی هەموویان . ئەوانەیان کە هێشتا مابوونەوەو سەرەیان نەهاتبوو بە (کعب)ی کوڕی (اسد)ی سەرکردەیان دەوت : تۆ بڵێی لەم خەنەکەدا چیمان لێ بکرێت ؟

(کعب) وتی : ئێوە بەهەموو تەمەنتان عاقڵ نابن ، ئەی نابینن بەسەرە بانگتان دەکەن و ئیتر ناگەڕێنەوە ؟ وەڵڵاهی هەمووتان دەکوژن . ژمارەیان شەش سەد تا حەوت سەد پیاو دەبوون درا لەملی هەموویان .

بەو شێوەیە سەری ماری ژاراوی پەیمانشکێنی و خیانەتکاری پان کرایەوە ، ئەوانە پەیمانیان شکاندو لەکاتێکی زۆر ناخۆش و تەنگدا ئەو چەند هەزار کەسەیان هێنایە سەر موسڵمانەکان و بەوکارە بوونە گەورەترین تاوانباری جەنگ و خۆیان شایستەی دادگای کردن و لەناوبردن کرد.

لەناو کوژراوەکاندا شەیتانەکەی (بنو نضير) و یەکێك لە گەورەترین تاوانبارەکانی جەنگی تێدابوو کە (حيي) کوڕی (اخطب) باوکی (صفية)ی خێزانی

پێغەمبەر بووە ﷺ. ئەوەبوو لەگەڵ (بنو قریظة)دا چووبوە ناو قەڵاکەیانەوە ، وەك وەفادارییەك بۆ (کعب)ی کوڕی (اسد) کە لە سەرەتادا هاتەلای و پەیمانشکێنیەکەی جەنگی ئەحزابی پێکرد کەهێنرا بۆ کوشتن ، ملوانکەیەکی لەملدا بوو پارچە پارچەی کردبوو بۆ ئەوەی دەست موسڵمانەکان نەکەوێت ، دەستی بەگەردنیەوە پێچرابوو ، وتی بەپێغەمبەری خوا ﷺ : وەڵڵاهی هەرگیز لەسەر دوژمنایەتی تۆ پەشیمان نیم ، بەڵام هەر کەسێك ململانێ لەگەڵ خوادا بکات ژێردەکەوێت ، پاشان بەدەنگی بەرز وتی : خەڵکینە بۆ فەرمانی خوا قەیدی نیە ، ئەمەش قەزاو قەدەرێکی نوسراوەو ، خوا لەسەر (بنو اسرائیل)ی نوسیوە ، پاشان ملی کەچ کردو درا لە ملی.

لەناو (بنو قریظة) تەنها یەك ژنیان لێ کوژرا ، لەبەر ئەوەی لەسەربانەوە جەنجەڕێکی فڕێدابوو بەسەر (حلاد)ی کوڕی (سوید)داو کوشتبووی ، لەبەرامبەر ئەوەدا کوژرایەوە.

پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمانیدا بەکوشتنی هەرپیاوێکیان کە مووی لێ هاتبێت و ، هەرچییەك مووی لێنەهاتبایە وازی لێدەهێنا ، (عطیة القرظي) یەکێك بوو لەوانەی مووی لێنەهاتبوو ، وازی لێهێنراو موسڵمان بوو ، ماوەیەکیش لە خزمەت پێغەمبەردا بوو ﷺ .

(ثابت)ی کوڕی (قیس)یش (زبیر)ی کوڕی (باطا)و منداڵەکەی بەخشی ، زبیر چاکەیەکی لای (ثابت) هەبوو ، (ثابت) پێی بەخشیەوەو ، پێی وت : پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی لەبەر من بەخشی و ماڵ و منداڵەکەشی بە من بەخشی ، ئەوا دەیاندەمەوە دەست خۆت . بەڵام (زبیر) کەزانی هەموو پیاوەکانی (بنو قریظة) کوژران (ثابت) دەستم دامێنت منیش بگەیەنە بەخزمە کوژراوەکانی ترم ، ئەویش دای لەملی و گەیاندی بە خۆشەویستانی خۆی لە خزمە جولەکەکانی ، (ثابت) کوڕێکی (زبیر)ی لای خۆی هێشتەوە ناوی (عبدالرحمن) بوو ، پاشان موسڵمان بوو ، ماوەیەکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوو ، (ام منذر) (سلمی) کچی (قیس)ی (نجاری) داوای بەخشینی (رفاعە) کوڕی (صموئیل)ی (قرظي) کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش بەخشی ، ماوەیەك مایەوەو دوایی موسڵمان بوو، ماوەیەکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ .

جولەکە لە شەوی دابەزینەکەیاندا چەند کەسێکی تریشیان موسڵمان بوون ، گیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان پاراست ، لەو شەوەدا (عمرو) لە قەڵاکە هاتە دەرەوە ، ئەم پیاوە لە پەیمانشکێنیەکەی (بني قریظة)دا بەشداری نەکردبوو لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆیە لەکاتی هاتنە دەرەوەدا (محمد)ی کوڕی (مسلمە) سەرکردەی پاسەوانەکانی پێغەمبەر بینی کەناسیەوە بەریدا ، پاشان دیار نەما نازانرێت چی لێ بەسەرهات .

پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و سامانەکەی (بنو قریظة)ی دوای دەرهێنانی پێنجیەك دابەش کرد ، بۆ ئەسپ سوار سێ پشکی دانا ، دوو پشك بۆ ئەسپەکە یەك پشکیش بۆ سوارەکە ، بۆ پیادەش یەك پشکی دانا ، دیلەکانیشی نارد بۆ (نجد) بەسەر پەرشتی (سعد)ی کوڕی (زید) (انصاری) و لەجیاتیاندا ئەسپ و چەکی هێنا.

لە ژنەکانیان پێغەمبەری خوا ﷺ (ریحانە)ی کچی (عمرو)ی کوڕی (خناقە)ی هەڵبژاردو لەلای بوو هەتا کۆچی دوایی کرد ، ئەمە گوتەی (ابن اسحاق)ە[1] . (کلبی)یش دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ژنەی ئازاد کردو لە ساڵی (٦)ی کۆچیدا مارەی کرد ، لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەردا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی (بقیع) ئەسپەردە کرا[2] .

کە شەڕی (بنو قریظة) کۆتایی هات نزاکەی (سعد)ی کوڕی (معاذ) (ر) هاتە دی ، کە پێشتر لە باسی غەزای ئەحزابدا باسمان لێوە کرد . پێغەمبەری خوا چادرێکی بۆ هەڵدا لە نزیك مزگەوتەوە بۆ ئەوەی زوو زوو سەری لێ بدا ، کە کێشەی (قریظة) تەواو بوو برینەکەی (سعد) کولایەوە ، (عائشە) دەڵێت : کە خوێنی لێهات خوێنی دەستی ڕۆیشت بۆ ناو خێوەتەکەی (بنی غفار) کە لەناو مزگەوتەکەدا بوو ، (بنی غفار) هاواریان لێهەستا و ، وتیان : ئەرێ خەڵکی ناوخێوەت ، ئەو خوێنە چیە لای ئێوەوە بەرەو خێوەتەکەی ئێمە دێت ، سەیریان کرد خوێنی (سعد)ە و لە برینەکەی دەچۆڕێت ، لە ئەنجامی ئەم خوێن بەر بوونە (سعد) کۆچی دوایی کرد[3] .

---

[1] / بروانە (ابن هشام) ٢/٢٤٥.
[2] / تلقیح فهوم اهل الاثر ل ٢.
[3] / صحیح البخاري ٢/ ٥٩١ .

له (صحيحين) يشدا هاتوه له (جابر)ه وه ، له پێغەمبەری خواوه ﷺ فەرمووی : بەڕاستی عەرشی خوا بەمردنی (سعد)ی کوڕی (معاذ) هاتەلەرزە[1].
(ترمذي) فەرموودیەکی (صحیح)ی لە (انس)ە وە هێناوە دەفەرمووی : کە تەرمەکەی (سعد)ی کوڕی (معاذ)یان خستە سەرشان ، دووڕووەکان وتیان : ئەم تەرمە چەندە سووکەڵەیە ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : فریشتەکان هەڵیان گرتبوو[2].

لە ئابلۆقەدانەکەی (بنو قریظة)دا پیاوێکی موسڵمان شەهید کرا ، ئەویش (خلاد)ی کوڕی (سوید) بوو کە لەسەر قەڵاکەوە ژنە جولەکەیەك جەنجەڕێکی فڕێدابوە خوارەوە بەسەریدا ، هەر لەو ئابلۆقەیەدا (ابو سنان) کوڕی (محصن) برای (عکاشە)ش وەفاتی کرد.

(ابو لبابە)ش شەش شەو بەکۆڵەکەکەی مزگەوتەوە مایەوە ، لەکاتی نوێژەکاندا ژنەکەی دەهاتە لای و دەیکردەوە بۆ نوێژ ، پاشان دەگەڕایەوە خۆی دەبەستەوە بەکۆڵەکەکەوە ، پاشان لە پارشێوێکدا هەواڵی وەرگتنی تەوبەکەی (ابو لبابە) درا بە پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا کە لە ماڵی (ام سلمە) بوو ، لەبەردەم ژوورەکەیدا وەستابوو ، وتی بە (ابا لبابە) : مژدەت لێ بێت خوای گەورە تەوبەی لێ قەبوڵ کردیت ، خەڵکی ووروژان بۆ بەردانی (ابو لبابە) ، ڕازی نەبوو وتی: دەبێت پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بمکاتەوە ، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ خۆی تەشریفی چوو بۆ نوێژی بەیانی کردیەوەو بەڕەڵای کرد .

غەزای (بنو قریظة) لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (٥)ی کۆچیدا ڕوویدا ، ئابلۆقەدانەکەش ماوەی (٢٥) بیست و پێنج شەوی خایاند[3].

لەغەزای ئەحزاب و (بنو قریظة)دا خوای گەورە چەندین ئایەتی لە سورەتی ئەحزاب ناردەخوارەوە ، تیایدا باسی گرنگترین لایەنی حاڵەتی ئیمانداران و دووڕووان و سەرشۆڕیی ئەحزاب و ئاکامەکانی پەیمانشکێنی جولەکەی کرد بوو.

---

[1] / صحیح البخاري ١/ ٥٣٦ ، صحیح مسلم ٢/ ٢٩٤ ، جامعه الترمذي ٢/٢٢٥ .
[2] / جامع الترمذي ٢/٢٢٥ .
[3] / ابن هشام ، ٢/٢٢٧ ، ٢٢٨ ، لەبارەی درێژەی ئەم باسەوە بڕوانە ( ابن هشام) ٢/٢٣٣ تا ٢٧٣و (صحیح البخاري) ٢/ ٥٩٠ ، ٥٩١ ، (زاد المعاد) ٢/٧٢، ٧٣ ، ٧٤ (مختصر سیرة الرسول) نوسینی شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل ٢٨٧ .

## چالاکی سەربازیی دوای ئەو جەنگە

### کوژرانی (سلام)ی کوڕی (ابی الحقیق)

(سلامی کوڕی ابی الحقیق) کە شۆرەتەکەی (ابو رافع)ە ، یەکێك بوو لە گەورە تاوانبارەکانی جولەکەو ئەوانەی ئەحزابیان دژ بەموسڵمانەکان کۆکردەوەو بە ئازوقەو ماڵ وسامان کۆمەکی دەکردن[1] ، ئازاری زۆری پێغەمبەری دەدا ﷺ ، کە موسڵمانەکان لە غەزای (بنو قریظة) بوونەوە ، خێڵی (خەزرەج) مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت بۆ کوشتنی.

پێشتریش چەند پیاوێکی ئەوسی (کعبی کوڕی اشرف) یان کوشت . خەزرەجیش پێیان خۆش بوو شکۆمەندیان وەکو ئەوەی ( ئەوس) دەست بکەوێت. بۆیە پەلەیان بوو لە وەرگرتنی ئەو مۆڵەتە.

پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدان کە بیکوژن‌و ڕێگەی نەدان دەست لە ژن و منالّ بکەنەوە، مەفرەزەیەکی خەزرەجی کەبریتی بوو لە (٥) کەس دەرچوون، هەموویان لە تیرەی (بنی سلمە)ی (خەزرەجی) بوون ، (عبداللە)ی کوڕی (عتیك) سەرۆکیان بوو.

مەفرەزەکە دەرچوون بەرەو خەیبەرو ڕوویان کردە قەلاّی (ئەبو ڕافع) ، کاتێك خۆر ئاوا بوو کە نزیك بوونەوە لە قەلاّکە ، خەڵك بەرەو حەوانەوەو خەوتن دەچوون ، (عبداللە)ی کوڕی (عتیك) بەهاوەڵەکانی وت: لەشوێنی خۆتان دانیشن ، من ئەڕۆم ، قسەی خۆش لەگەڵ کابرای دەرگاواندا دەکەم و دەڕۆمە ژوورەوە . لە دەرگاکە نزیك بووەوە ، پاشان جلەکانی بەخۆیەوە ئالاّند وەکو بیەوێت سەر ئاوێك بکات ، لەو کاتەدا خەڵك چووبوونە ژوورەوە ، کابرای دەرگەوان هاواری لێکرد: ئەریّ کابرا گەر دەتەوێت وەرە ژوورەوە چونکە من دەرگاکە دادەخەم.

(عبداللە)ی کوڕی (عتیك) وتی: چوومە ژوورەوەو خۆم حەشاردا ، کە خەڵك هەموو چوونە ژوورەوە ، کابرا دەرگاکەی داخست‌و کلیلەکانی بەدارێکدا هەڵواسی ، دەڵێت: هەستام کلیلەکانم هێناو ، دەرگاکەم کردەوە ، (ئەبو ڕافع) لەویّ شەوی بەسەر ئەبرد ، لەگەڵ پێڕێکی هاوخوانی خۆیا بوو ، کە پێڕەکەی بەجێیان هێشت بۆی چوومە سەرەوە ، لە ژوورێکی سەرەوەیا بوو ، ئەچوومە هەر ژوورێك دەرگاکەم لەسەر دائەخرا ، وتم لەدڵی خۆما: ئەوانەی لەگەڵمان چاوەڕوانی دەستی منن تابیکوژم ، چووم‌و گەیشتمەلای ، لەگەڵ ژنەکەیدا لەژوورێکی تاریکابوون ،

---

(١) بڕوانە (فتح الباری) ٧/٣٤٢.

ئەمدەزانی لەکوێی ژوورەکەدایە ، بانگم کرد: (ئەبا ڕافع) ، وتی: ئەوە کێیە ؟ هەڵمەتم برد بەرەو شوێنی دەنگەکەو بێئەوەی بزانم لەکوێدایە شمشێرێکم لێدا ، سوودی نەبوو ، هاواری لێ هەستا ، لە ژوورەکە چوومە دەرەوەو کەمێك لە نزیکەوە وەستام ، پاشان چوومەوە ژوورەوە بۆ سەرەوە ، وتم: ئەو دەنگە چی بوو (ئەبو ڕافع)؟ وتی: دایکت بە دۆزەخ چێ ، پیاوێك لەماڵەکەدا شمشێرێکی لێدام، (عبدالله) وتی: یەك شمشێری ترم لێدا خستم ، هێشتا نەمردبوو ، ئەنجا نوکی شمشێرەکەم خستە سەرسکیو خۆمدا بەسەریدا تا نوکەکەی لە پشتیەوە دەرچوو ئیتر زانیم کوشتومە، خێرا گەڕامەوە دەرگاکانم یەك یەك کردەوە تاگەیشتمە پلیکانەیەك قاچم دانا ، وامزانی گەیشتومەتە سەر زەوی ، شەوێکی مانگەشەو بوو کەوتم ، لاقم شکا ، بەمێزەرێك بەستم ، پاشان دەرچووم بەرەو دەرگای دەرەوەو لەوێ وەستام ، وتم: ئەمشەو ناچمە دەرەوەو هەتا نەزانم کوشتومە یان نەء؟

لەگەڵ خوێندنی کەڵەشێری بەیانیدا لەسەر دیواری قەڵاکەوە باوکەڕۆو براڕۆ بۆ (ئەبو رافیع) دەستی پێکرد ، ئەیانوت: بازرگانەکەی ڕێی (حیجان)م ڕۆ ، خێرا گەڕامەوە بۆ لای هاوەڵەکانم ، وتم: ڕزگارمان بوو ، (ئەبا ڕافیع)یش کوژرا ، گەڕاینەوە تاچووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ قسەم لەگەڵدا کردو باسی قاچە شکاوەکەشم بۆ کرد . فەرمووی: قاچت ڕاکێشە ، قاچم درێژ کرد ، دەستی پیرۆزی پێدا هێنا ، ئازاری تیادا نەما.[1]

ئەمە گێڕانەوەی (بخاری)یە ، لە (ابن اسحاق)یشەوە ، ئەڵێت: هەموو ئەندامانی مەفرەزەکە چوونە سەر (ئەبو رافع)و بەشدار بوون لەکوشتنیداو ئەو کەسەی بە شمشێرەکەیەوە خۆیدا بەسەریداو کوشتی (عبدالله)ی کوڕی (انیس) بووە، ئەوەشی تێدا هاتووە کە بەشەو کوشتویانەو، لاقی (عبدالله)ی کوڕی (عتیك)یش شکاوەو هەڵیان گرتووەو خۆیان فڕێ داوەتە جۆبارێك تا لێیانەوە دیارنەبن ، جولەکەش مەشخەڵی ئاگرەکانیان دادەگیرسێنن‌و بەدوایاندا دەگەڕێن ، کە نائومێددەبن‌و دەگەڕێنەوە بۆلای (ئەبو ڕافع)، تاقمی مەفرەزەکەش کە دەگەڕێنەوەو (عبدالله)ی کوڕی (عتیك) هەڵدەگرن‌و دێنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ[2].

دەرچونی ئەم سریەیە لەمانگی (ذي القعدة) یان (ذي الحجة) ی ساڵی (٥)ی کۆچیدا بوو[3].

---

(١) صحيح البخاري ٢/٥٧٧

(٢) ابن هشام ٢/٢٧٥،٢٧٣

(٣) رحمة للعالمين ٢/٢٢٣، لەگەڵ ئەو باسانەیا کەلە سەرچاوەکانی تر وەرگیراون لە غەزای ئەحزاب و (قريظة).

## سریەی ( محمد ) ی کوڕی ( مسلمە )

دوای تەواوبونی جەنگی (ئەحزاب) و (قریظة) ، ئەم سریەیە کە بریتی بوو لە (٣٠) ئەسپ سوار یەکەم سریە بوو دەرچوو. ئەم سریەیە بەرەو (قرطاء) دەرچوو ، بەلای (ضریة)ی ناوچەی (بکرات)ی خاکی (نجد) تێپەڕی ، ماوەی نێوان (ضریة) و (مەدینە) حەوت شەو ڕێگەیە ، دە شەو لە مانگی (محرم)ی ساڵی (٦)ی کۆچی کەوتنە ڕێ بەرەو ناوەوەی خێڵی (بکر بن کلاب) کە دایان بەسەریاندا خێڵەکە هەڵات ، موسڵمانەکان مەڕو وشترو ماڵاتەکەیان دانەبەر، مانگی (محرم) یەك شەوی مابوو لە شەوەکەیدا گەیشتنەوە مەدینەو (ثمامة)ی کوڕی (أثال) گەورەی (بنی حنیفە) یان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بوو، کە بەنیاز بوو بوو بە فەرمانی (مسیلمە)ی درۆزن پێغەمبەری خوا ﷺ شەهید بکات[1].

موسڵمانەکان گرتبویان کەهێنایان بەیەکێك لەپایەکانی مزگەوتەوە بەستیانەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: چیت ئەوێت ؟ وتی: چاکەم پێیە ، ئەگەر بمکوژیت خاوەن خوێنم هەیە ، خۆ ئەگەر بەرەڵام بکەیت سوپاسگوزارت دەبم ، ئەگەر ماڵ و سامانت ئەوێت ، داوا بکە چەندت ئەوێت پێت ئەدرێت . پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێی هێشت ، جارێکی تر پێغەمبەر ﷺ بەلایدا تێپەڕیو هەمان شتی پێ فەرموو ، ئەویش وەك جاری یەکەم وەڵامیدایەوە ، پاشان جاری سێیەمیش لێدوانەکە دووبارە بووەوە ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ثمامة) بەرەڵا بکەن. بەرەڵایان کرد ، چوو بۆ باخە خورمایەکی نزیك مزگەوت خۆی شۆرد ، پاشان هاتەوەو موسوڵمان بوو ، وتی: وەڵاهی لە هەموو دنیادا کەسێك نەبوو لە تۆ زیاتر ڕقم لێی بێت ، ئێستا دەمو چاوو ڕووی تۆ بەلامەوە لە هەموو دنیا خۆشەویسترە ، وەڵڵاهی هیچ ئاینێکیش لە دنیایا نەبووە بەئەندازەی ئاینەکەی تۆ ڕقم لێی بوو بێت ، ئێستا بووە خۆشەویسترین ئاین لەلام ، کاتێکیش ئەسپ سوارەکانی تۆ گرتمیان بەنیازی عومرە بووم. پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێداو، فەرمانی دایە عومرەکەی بکات ، کە (ثمامة) هات بۆ مەککە ، قورەیش پێیان وت: (ثمامة) تۆ لەئاینی باپیرانت هەڵگەڕاویتەوە ، وتی: نەخێر وەڵڵاهی لەگەڵ موحەممەدا بوومو موسوڵمان بووم ، سوێند بێت بەخوا لە (یمامة) وە یەك دەنکە

---

(١) السيرة الحلبية ٢/٢٩٧

گەنم ناگاتە لای ئێوە هەتا پێغەمبەر ﷺ فەرمانم پێ نەدات . لە یەمامەوە گەنم دەهات بۆ مەککە ، (ثمامة) گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی ، ڕێگەی گرت لە ناردنی گەنم بۆ مەککە ، تا قورەیشی ماندوو بێ تاقەت کرد ، نامەیان نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ ، داوایان لێ کرد لەبەر خاتری خزمایەتی نامە بنووسێت بۆ (ثمامة) ، تا ڕێگە بدات خواردن بڕوات بۆ مەککە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدا کە ڕێگە بدات.[1]

## غەزای (بنو لحيان)

(بنو لحيان) ئەو خێڵەبوون کە خیانەتیان کرد لە دە هاوەڵەکەی پێغەمبەر ﷺ لە (الرجيع) داو بوونە هۆی شەهید کردنیان ، شوێن و مەنزڵگاکانیان لەناو (حجاز)دا بوو ، بەرەو سنوری مەککە ، هێشتا بگرەو بەردەی نێوان موسڵمانەکان و (قريش) و (اعراب) لەگەرمەیدا بوو ، پێغەمبەر ﷺ پێی باش نەبوو کە زۆر بڕۆنە ناوەوەو لەگەڵ دوژمنە هەرە گەورەکە نزیك ببنەوە کاتێك کە شەڕی ئەحزاب کۆتایی هات ، سوپاکە بە سەرشۆڕی گەڕایەوە ، ورەیان دابەزی بوو ، بزێوی و جموجۆڵیان نەمابوو ، تارادەیەك ملکەچی ئەمری واقع بوون ، پێغەمبەر ﷺ لەو قۆناغەدا پێی باش بوو کە کاتی ئەوە هاتووە تۆڵەی ئەو هاوەڵە شەهیدانەی خۆی لە (بنو لحيان) بکاتەوە ، لە مانگی (ربيع الاول)ی ساڵی (٦)ی کۆچیدا بە دووسەد کەسەوە بۆیان چووە دەرەوە ، (ابن ام مكتوم)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت ، وای نیشاندا کەبەرەو شام دەڕۆن ، پاشان بەخێرایی ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوجەرگەی (غران) کە دۆڵێکە لەنێوان (امج) و (عسفان)دا ، ئەو شوێنەی هاوەڵەکانی تێدا شەهید بوو ، لەوێدا نزای لێخۆشبوونی بۆ کردن ، (بنو لحيان) بەمەیان زانیو بەرەو شاخ رایانکرد ، کەسیان دەست نەکەوت ، دوو ڕۆژ لەوێ مانەوەو بە چوارلادا سریەیان نارد ، کەسیان دەستگیر نەبوو ، ئەنجا ڕۆیشتن بەرەو (عسفان) ، پێغەمبەر ﷺ دە ئەسپ سواری نارد بۆ (كراع الغميم) تا قورەیش بەر گوێی بکەوێت ، پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە ، چواردە شەویان پێ چوو.

---

(١) زاد المعاد ١١٩/٢، مختصر سيرة الرسول، نووسینی شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل٢٩٣/٢٩/٢.

## به بەردەوامی ناردنی مەفرەزەو سریەکان

پاشان پێغەمبەر ﷺ بە بەردەوامی کەوتە ناردنی مەفرەزەو سریە بە هەر چوارلادا ، ئەمەش چەند حاڵەتێکە ، لەوانە:

١. سریەی (عکاشە)ی کوڕی (محصن) بە چل کەسەوە دەرچوو بەرەو (غمر) ، کە کانیاوێکی (بنی ئەسەد) ە ، خێڵەکە ڕایانکرد ، لەو سریەیەدا موسڵمانەکان دووسەد وشتریان دەستکەوت و گەڕانەوە بۆ مەدینە.

٢. سریەی (محمد)ی کوڕی (مسلمە) بەرەو (ذی القصة) ، لەمانگی (ربیع)ی یەکەم یان دووەمی ساڵی (٦) کۆچیدا. (ابن مسلمە) لەگەڵ دە پیاودا دەرچوون بەرەو (قصە)و مەنزڵگاکانی (بنی ثعلبة) سەد کەس دەبوون ، ئەوان پێشتر زانیبوویان بۆسەیان دانا بۆ سریەکە ، لەکاتی نوستندا هەموویان شەهیدکردن جگە لە (محمد)ی کوڕی (مسلمە) کە بەبریندار هەڵهاتبوو.

٣. سریەی (ابی عبیدە)ی کوڕی (جراح) بەرەو (ذي القصة) لە مانگی (ربیع)ی دووەمی ساڵی (٦)ی کۆچیدا. پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای شەهید بوونی مەفرەزەکەی (محمد)ی کوڕی (مسلمە)دا ناردنی. چل پیاوی لەگەڵدا بوو ، ڕۆیشتن گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە ، بە شەو دەڕۆشتن ، لەگەڵ بەرەبەیاندا دایان بەسەر (بنی ثعلبة) دا ، ناچاریان کردن هەڵبێن بەرەو شاخ ، پیاوێکیان لێ گرتن لەدوایدا موسڵمان بوو ، وشترو مەڕو ماڵاتەکەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە بۆ مەدینە.

٤. سریەی (زید)ی کوڕی (حارثة) بەرەو (جموم) ، لە مانگی (ربیع)ی دووەمی ساڵی (٦)ی کۆچیدا ، (جموم) ئاوێکی (بنی سلیم)ە ، لە (مر الظهران) ، (زید) ژنێکی خێڵی (مزینە)ی گرت ناوی (حلیمە) بوو ، شوێنی (بنی سلیم)ی نیشاندان ، چوونە سەری و دیل و وشترو مەڕوماڵاتێکی زۆریان دەستکەوت ، کە (زید) گەڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ژنە (مزینە) یەکەی ئازاد کردو دای بەشوو.

٥. سریەی (زید) بەرەو (عیص) ، لە مانگی (جمادی الاولی)ی ساڵی (٦)ی کۆچیدا ، بە سەدو حەفتا سوارەوە ، لەو سریەیەدا ماڵ و سامانی قوڕەیش گیرا ، سەرۆکی کاروانەکە (ابو العاص)ی زاوای پێغەمبەر بوو ﷺ ، (ابو

العاص) دەرباز بوو ، هاتە لای (زینب)ی هاوسەری کە کچی پێغەمبەرە ﷺ هانای بۆ برد ، کە داوایماڵو سامانەکەی بۆ بکات لە پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ بەخەڵکی وت ماڵو سامانەکە بگێڕنەوە بۆ (ابو العاصی) بێ ئەوەی زۆر بکات لە هیچ کەسێك ، زۆروکەم و گەورەوبچوکیان دایەوە ، (ابو العاصی) گەڕایەوە بۆ مەککە ، هەموو سپاردەکانی دایەوە بەخاوەنەکانیان ، ئەنجا موسڵمان بوو ، پاشان کۆچی کرد ، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی بەپێی نیکاحی یەکەم کە سێ ساڵ و نیوی خایاند ، پێدایەوە هەروەکو لە فەرموودەی (صحیح) دا [1] هاتووە ، بەپێی نیکاحی یەکەم پێی دایەوە ، چونکە هێشتا ئایەتی حەرامکردنی ژنی موسڵمان لە کافران نەهاتبووە خوارەوە سەبارەت بەوەش گوایە فەرموودە هەیە دەڵێت: بە نیکاحێکی نوێ (زینب)ی پێدرایەوە ، یان پاش شەش ساڵ پێی درایەوە ، ئەوە ڕاست نییە ، سەرباری ئەوەی لە ڕووی (سند) یشەوە ڕاست نیە[2]، سەبارەت بەو کەسانەی دەست دەگرن بەو فەرموودە لاوازانەوەو، دەڵێن: (ابو العاص) لەکۆتایی ساڵی هەشتی کۆچیدا پێش فەتح موسڵمان بووە ، پاشان دژەوانەی خۆیان دەبنەوەو ، دەڵێن: زەینەب لەکۆتایی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کرد ، پێشتریش کە بە بەڵگەوە قسەمان کرد لەسەر کتێبی (بلوغ المرام) ، (موسای کوڕی عەقەبە) بۆچوونی وایە کە ئەو ڕووداوە لەساڵی (٧)ی پێش مەسەلەی (ابو بصیرە)و هاوەڵەکانی ڕووی داوە ، بەڵام ئەمە لەگەڵ فەرموودە ڕاست و لاوازەکەشدا یەك ناگرێتەوە.

٦. دیسان سریەیەکی تری (زید) بۆ (طرف) یان (طرق) لە (جمادي الآخرة)ی ساڵی (٦)ی کۆچیدا. (زید) بە (١٥) کەسەوە دەرچوو بۆ (بنی ثعلبة) ، کە گەیشتنە سەریان ڕایان کرد ، لەوە ترسان کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دابێتی بەسەریاندا ، (زید) لەو سریەیەدا بیست وشتری دەست کەوت ، چوار شەوی پێ چوو.

---

[1] / بروانە (سنن ابی داود) لەگەڵ شەرحەکەیدا (عون المعبود) (باب /الی متی ترد علیه إمراتة اذا اسلم بعدها).

[2] / بۆ قسە کردن لەسەر هەردوو فەرموودەکە بروانە (تحفة الأحوذي) ٢/١٩٥،١٩٦.

٧. دیسانەوە سریەیەکی تری (زید) بۆ (وادی القری) لە (رجب)ی ساڵی (٦)ی کۆچیدا . (زید) (١٢) پیادەی بردو ڕۆیشت بەرەو (وادی القری) بۆ پەیدۆزی جمو جۆڵی دوژمن ئەگەر لەوێ بن ، خەڵکی (وادی القری) هێرشیان کردە سەریان ، نۆ کەسیان لێ شەهید کردن ، سیانیان ڕزگاریان بوو (زید) یەکێك بوو لەو سیانە[1].

٨. سریەی (خبط) کە لە (رجب)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا باسی دەکرێت ، بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکە واپیشان دەدات کە پێش سوڵحی حودەیبیە بووە ، (جابر) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرۆکایەتی (ابو عبیدة)ی کوڕی (الجراح) لەگەڵ سێسەد سواردا ئێمەی نارد تاچاوەڕوانی کاروانێکی قوڕەیش بکەین ، تووشی برسێتیەکی زۆر بووین ناچاربووین گەڵای (خبط)مان خوارد ، بۆیە سوپاکە ناونرا سوپای (خبط) سێسەر وشتر سەربڕا ، پاشان سیانی ترو ، پاشان سیانی تر ، پاشان (ابو عبیدة) قەدەغەی کرد ، لەناو دەریادا گیاندارێکمان ڕاو کرد ، پێی دەڵێن (عنبر) ، بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لێمان خوارد ، لێی تێر بووین و گیان و جەستەمان هاتە سەر خۆو چاك بووینەوە ، پاشان (ابو عبیدة) باڵی یەکێك لەو گیاندارانەی هەڵگرت ، سەیری کەڵەگەترین پیاو و بەرزترین وشتری کرد ، خستیە سەری و ، لێمان خوارد ، تاگەیشتینە مەدینە ، چوینە خزمەت پێغەمبەر و ﷺ باسی ئەو گیاندارەمان بۆ کرد ، فەرمووی: (ئەوە ڕۆزی خودایە بۆ ئێوەی ناردووە ، ئەگەر پارچەی گۆشتەکەتان پێماوە بەشمان بدەن ، ئێمەش پارچەیەکمان نارده خزمەتی.[2] لەبەرئەوە بوو وتمان : کە ڕەوتی ئەم سریەیە وانیشان دەدات کە پێش (حدیبیة) بوو بێت ، چونکە موسڵمانەکان دوای پەیمانی حودیبیە ڕێیان نەگرت لە کاروانەکانی قوڕەیش.

---

[1] / رحمة العالمین ٢/٢٢٦،سەبارەت بە سریەکانیش سەیری سەرچاوەی ناو براو بکە، لەگەڵ (زاد المعاد) ٢/١٢٠، ١٢١، ١٢٢، هەروەها پەراوێزی (تلقیح فهوم اهل الاثر) / لاپەرە ٢٩،٢٨.

[2] / صحیح البخاری ،٢/٦٢٥، ٦٢٦، (صحیح مسلم) ، ٢/١٤٥، ١٤٦.

## غەزای (بنو المصطلق) یان غەزای (مریسیع) له شەعبانی ساڵی (٦) ی کۆچیدا

ئەم غەزایە هەرچەندە پەڵو پۆی زۆری نەبووە ، لەلایەنی سەربازییەوە ، بەڵام چەند ڕووداوێکی تێدا ڕوویدا ، پشێوی خستە ناو کۆمەڵگای ئیسلامییەوە ، بووە هۆی ئابڕوچوونی دووڕوان ، دانانی چەند دەقێکی یاسایی تەعزیری کە وێنەیەکی تایبەتی شکۆداری و دەروون پاکی بەخشیە کۆمەڵگای ئیسلامی ، با لە سەرەتاوە باسی ئەم غەزایە بکەین ، پاشان باسی ئەو ڕووداوانە دەکەین.

ئەو غەزایە لەمانگی (شعبان)ی ساڵی شەشی کۆچیدا ڕوویداوە (بەپێی ڕاسترین گێڕانەوە)[١]، هۆیەکەشی ئەوە بوو ، هەواڵ گەیشت بەپێغەمبەر ﷺ کە گەورەی خێڵی (بنی المصطلق) (حارث)ی کوڕی (ابی ضرار) خۆی و خێڵەکەی و هەرچیەکی پێ کۆکرابێتەوە لەگەڵ خۆیدا بەڕێی کردون بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ (بریدە)ی کوڕی (حصیب)ی (اسلمی) نارد بۆ هەواڵ زانین ، چوو بۆلایان ، (حارث)ی کوڕی (ابی ضرار)ی بەدی کردن و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ ، هەواڵەکەی پێدا.

پاش ئەوەی لە ڕاستی هەواڵەکە دڵنیا بوو، هاوەڵانی کۆکردەوەو ، بەخێرایی بۆیان دەرچوو ، دوو شەو لە مانگی شەعبان تێپەڕی بوو ، ئەمجارەیان کۆمەڵێك دووڕوو لەگەڵیدا دەرچوون کە پێشتر لە هیچ غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرنەچوو بوون ، (زید)ی کوڕی (حارث)ی بەسەر مەدینەوە دانا (وتراویشە

---

[١] / بەڵگە لەسەر ئەو گێڕانەوەیە کە لەڕووداوی (افك)دا هاتوەو دەڵێت" ڕووداوەکە دوای واجب بوونی حیجاب بووە، ئایەتی حیجابیش لەبارەی زەینەبەوە دابەزی ، لەوکاتەدا زەینەب خێزانی پێغەمبەربوو ﷺ، پێغەمبەری خودا لەبارەی (عائیشە) وە پرسیاری لێ کردووە ؟ زەینەب وتی: چاووگوێی خۆم دەپارێزم هیچ ناڵێم، (عائیشە) دەڵێت: لەناو هاوسەرەکانی پێغەمبەردا ﷺ تەنها (زەینەب) لە من خانومانتر بوو، سەبارەت بەوەش کە لە ڕووداوی (افك) هەڵبەستنەکەدا هاتووە گوایە (سعدی کوڕی معاذ)و (سعدی کوڕی عبادة) بووە بەکێشەیان لەبارەی درۆ بەستەکانی ڕووداوەکە ، زانراوە کە (سعدی کوری معاذ) دوای غەزای (بنوقریظة) وەفاتی کرد، پێدەچێت ئەمە هەڵەی ڕاوی بێت، (ابن اسحاق) ڕووداوی بوختان هەڵبەستنەکە دەگێڕێتەوە لە (زهری)یەوە لە (عبداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عتبە) وە لە (عائیشە)وە، باسی (سعدی کوڕی معاذ)ی نەکردووە بەڵکو باسی (اسدی کوڕی حضیر) لەئارادایە، (ابومحمدی کوڕی حزم) دەڵێت: ئەمە ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیەو، باسی (سعدی کوڕی معاذ)یشی کردووە. (بڕوانە (زادالمعاد ٢/١١٥). جێگەی سەرسوڕمانە کە (محمد الغزالی) ئەوە دەداتە پاڵ (ابن قیم) کە غەزای (مریسیع)ی بەیەکێك لەغەزاکانی سەدەی پێنجەم داناوە (فقه السیرة ل٢٢٢) لەکاتێکدا کە گوتەکانی لە (الهدی) دا (١١٥/٢ ) دژ بەوە دەوەستێتەوە.

(ابوذر)ی دانا)و ، وتراویشه (ثمیلة)ی کوڕی (عبدالله)ی (لیثی) دانا. (حارث)ی کوڕی (ضرار) سیخوڕێکی دانا بوو ، بۆ ئەوەی هەواڵی سوپای ئیسلامی بۆ بهێنن ، موسوڵمانەکان گرتیان و کوشتیان .

کاتێك هەواڵی هاتنەکەی پێغەمبەر ﷺ و کوشتنی سیخوڕەکە گەیشتەوە بە (حارث) و هاوڕێکانی ، زەندەقیان چوو زۆر ترسان هەرچی عەرەبێکی دەشتییەکان لەگەڵدا بوو بلاوەیان لیّ کرد ، پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتە ناوچەی (مریسیع) کە ناوی ئاوێکە لە ئاوەکانی (بني المصطلق) لە ناوچەی (قدید)دا بەرەو کەناری دەریا ، خێرا خۆیان ئامادە کرد بۆ شەڕ پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی ڕیز کرد ، ئالآی کۆچەرانی دایە دەست (ابوبکر الصدیق) ، ئالآی ئەنسارەکانیشی دایە دەست (سعد)ی کوڕی (عبادة) ، چەند ساتێك تیربارانی یەکتریان کرد ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌دا بەهێرش کردنێکی تەواو ، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. موشریکان شکستیان هێنا ، ئەوەی کوژرا کوژراو ژن و منالّ و سامان و وشترو مەڕومالآتیان کەوتە دەست موسوڵمانەکان ، لە موسوڵمانەکانیش تەنها یەك پیاو شەهید بوو ، ئەویش پیاوێکی ئەنساری بە هەڵە کوشتی وایزانی لە ڕیزی موشریکەکاندایە.

(مغازی) نووس‌و (سیرەت) ناسەکان دەڵێن ، (ابن قیم) دەڵێت: ئەوە هەڵەیە ، شەڕو کوشتار ڕووی نەداوە ، دای بەسەریاندا لەسەر ئاوەکەو دەستی گرت بەسەر ژن و منالّ‌و مالّ‌و سامانیاندا ، هەروەکو لە (صحیح)دا هاتووە: پێغەمبەری خودا ﷺ دای بەسەریانداو ئەوان ڕایانکرد ، ئەنجا فەرموودەکەی باس کرد[1]. کۆتایی .

یەکێك لە کۆیلەکراوەکان (جویریە)ی کچی (الحارث) بوو ، کەوتە پشکی (ثابت)ی کوڕی (قیس) ، وە ئەویش بە (مکاتبة) ئازادی کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ پارەی (مکاتبة) کەی بۆداو مارەی کرد ، بەو ژنهێنانە هەموو موسوڵمانەکان و هەرچی کەسیان لە خزم و کەس و کاری (جویریە)و (بنی المصطلق) ئازاد کرد کە موسوڵمان بوون وتیان: تازە ئەوانە بوونە خزمی پێغەمبەر ﷺ[2].

سەبارەت بەو ڕووداوانەش کە لەو شەڕەدا ڕوویاندا ، لەبەرئەوەی کە سەرچاوەکانیان سەرکردەی دووڕوان (عبدالله)ی کوڕی (ابی)ی و هاوڕێکانی بوون ، واباشە کە سەرەتا باسی کردەوەکانیان بکەین لەکۆمەڵگای ئیسلامی‌دا.

---

[1] / بڕوانە (صحیح البخاری) ، (الکتاب عتق) ١/٣٤٥ ، هەروەها بڕوانە (فتح الباری ) ٣٤١/٧.
[2] / زاد المعاد ١١٢/٢ . ابن هشام ، ٢٨٩/٢ . ٢٩٠، ٢٩٤، ٢٩٥.

## ڕۆڵی دووڕوان پێش غەزای (بني المصطلق)

پێشتر وتمان کە (عبدالله)ی کوڕی (ابی) زۆر ڕقی لەئیسلام و موسوڵمانان دەبووەوە ، بەتایبەتی زۆر ڕقی لە پێغەمبەری خودا بووە ﷺ ، چونکە (ئەوس) و (خەزرەج) لەسەر سەرۆکایەتی ئەم ڕێکەوتبوون و یەك دەست بوون بۆ کردنی مەلیکی خۆیان ، لەو کاتەدا ئیسلام چووە ناویانەوەو ، ڕوویان لە (ابن ابی) وەرچەرخاندو ڕوویان کردە پێغەمبەر ﷺ ، بۆیە پێی وابوو ، کە پێغەمبەر ﷺ موڵکەکەی لێ داگیر کردوە.

ئەم ڕق و کینەیەی (ابن ابی) هەر لەسەرەتای کۆچەوە دەرکەوت پێش ئەوەی کە واپیشانی بدات موسوڵمانەو ، پاش ئەوەش کە خۆی وەك موسوڵمانێك نیشادا. جارێکیان پێغەمبەر ﷺ سواری گوێدرێژێك بووبوو ، بۆ زیارەی (سعد)ی کوڕی (عبادة) دەچوو ، بەلای مەجلیسەکەی (عبدالله)ی کوڕی (ابی)دا تێپەڕی (عبدالله) لووتی سوور هەڵگەڕاو وتی: مەیەنە سەرمان ، کە پێغەمبەر ﷺ لە مەجلیسەکەدا قورئانی خوێند ، (عبدالله) وتی: لەماڵەکەی خۆت دانیشەو ، ئەم مەجلیسانەمان لێ مەشێوێنە.[1]

ئەم هەڵوێستەی (عبدالله) پێش ئاشکرا کردنی ئیسلامەتییەکەی بوو ، کە دوای شەڕی بەدریش بەڕواڵەت خۆی وەك موسوڵمان خستە ڕوو ، بەبەردەوامی دوژمنایەتی خوداو پێغەمبەر ﷺ و ئیماندارانی دەکردو تەنها بیری لەلای پەرتەوازە کردن و تێکدانی کۆمەڵگای ئیسلامیو سوککردنی گوتاری ئیسلام بوو ، دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنانی خوادا دەکرد ، وەك پێشتریش وتمان دەستی وەردایە مەسەلەکەی (بنو قینقاع)ە وە ، بەهەمان شێوە لە شەڕی ئوحوددا ئەو پەیمانشکێنی و خیانەتەی ئاشکرا کرد دژ بەموسوڵمانانو ، هەوڵی ئاژاوەو پشێوی نانەوەیدا لەناو موسوڵمانەکاندا.

یەکێك لەفێڵ و تەڵەکە خراپەکانی ئەم دووڕووە ئەوەبوو، پاش خۆدەرخستنی بەموسوڵمان ، هەموو ڕۆژێکی هەینی کەپێغەمبەری خودا ﷺ دادەنیشت بۆ وتار خوێندنەوە ، دەیووت: خەڵکینە ئەوە پێغەمبەری خودایە لەنێوان ئێوەدا ، ڕێزدارترین و شکۆدارترین کەسە لەلای خوا ، پشتیوانی بکەن ،

[1] / ابن هشام ٥٨٤/١ ، ٥٨٧ ، صحيح البخاري ٩٢٤/٢ ،(صحيح مسلم ) ٩/٢

پشتگیری لێ بکەن ، گوێڕایەڵی بکەن. ئەنجا پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵدەساو وتاری دەخوێندەوە. یەکێك لە ڕەفتارە بێ ئەقڵیەکانی ئەم پیاوە ئەوە بوو کە لەڕۆژی هەینی دوای جەنگی ئوحودداو پاش ئەو خیانەتو پەیمانشکێنیەی ئەنجامی دابوو، هەستاو شتەکانی پێشتری وتەوە ، موسوڵمانەکان لە چوارلاوە چمکی جلەکانیان ڕاکێشاو پێیان وت: دانیشە دوژمنی خوا ، تۆ پیاوی ئەو قسانە نیت ، تۆ ئەو کەسەیت کە ئەو خیانەتو پەیمانشکێنیەت کرد. کابرا بەسەر شان و ملی خەڵکیدا هەنگاوی ناو چووە دەرەوەو بەدەم ڕێگەوە دەیووت: دەڵێی من شتی خراپم وتووە ، من وتوومە پشتی بگرن. کابرایەکی ئەنساری لەبەر دەرگاکەی مزگەوتدا یەخەی گرتو پێی وت: دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ، بگەڕێوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ خۆشبوونت بۆ بکات. کەچی وتی: وەڵاهی هیچ پێویستیم بەداوای لێ خۆشبوونی ئەو نییە.[1]

پەیوەندی هەبوو لەگەڵ (بني نضير)داو پیلانی دەگێڕا لەگەڵیاندا دژ بەموسوڵمانەکان ، تا جارێکیان پێی وتن: ئەگەر ئێوە دەربکرێن ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین ، ئەگەر شەڕتان لەگەڵدا بکرێت ئێمەش پشتیوانیتان لێ دەکەین ، لە شەڕی (ئەحزاب)یشدا خۆیو هاوڕێکانی دەستیان کرد بەپشێوی نانەوە ، ترسو دڵەڕاوکێی خستە ناودڵی موسوڵمانەکانەوە بەشێوەیەك کە خوای گەورە باسی لێوە دەکات لە سورەی (احزاب)دا: ﴿ وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلاَّ غُرُورًا ﴾ تا ئایەتی ﴿ يَحْسَبُونَ الأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا وَإِنْ يَأْتِ الأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُمْ بَادُونَ فِي الأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنْبَائِكُمْ وَلَوْ كَانُوا فِيكُمْ مَا قَاتَلُوا إِلاَّ قَلِيلاً ﴾، واتە: ئەوانە وایاندەزانی کە ئەحزاب ئەوێ بەجێ ناهێڵن ، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە ، ئەو دووڕووانە حەزیان دەکرد لە بیابانو دەوارنشینەکان بونایەو لەوێوە هەواڵی ئێوەیان بزانیایە ، خۆ ئەگەر لەناوتاندا بوونایە ، مەگەر بە کەمی وەگەرنا شەڕیشیان نەدەکرد.

سەرباری ئەوە هەموو دوژمنانی ئیسلام جولەکەو دووڕووان و موشریکان باش دەیانزانی کە هۆی سەرەکی سەرکەوتنەکانی سوپای ئیسلام بریتی نییە لەهۆی ماددی و ، زۆری چەك و جبەخانەو ژمارەی سەرباز ، بەڵکو هۆیەکەی ئەو

---

[1] ابن هشام ۲/۱۰۵ .

بەهاو ڕەوشت هەڵس و کەوت و جوانانە بوو کەسەراپای کۆمەڵگای ئیسلامیو هەموو کەسێکی پەیوەندیداری بەم ئاینەوە جاوان کرد بوو ، دەیزانی کە چاوگەی ئەو جوانیانە پێغەمبەری خوایە ﷺ کە بەرزترین نمونەی ڕەوشت بوو ، بە بەهاو ڕەوشتی جوانی خۆی دونیای سەراسام کرد بوو.

دەیانزانی کە پاش ئیدارەکردنی جەنگەکان لە مەودای پێنج ساڵدا ، زاڵ بوون بەسەر ئەو ئایینەدا بەڕێگای چەك شتێکی ئاستەمە ، بۆیە بڕیاریاندا شاڵاوی جەنگێکی پڕو پاگەندەیی بەرفراوان دژ بەڕەوشتو نەریتی ئەم ئاینە بەرپابکەنو کەسێتی پێغەمبەریان ﷺ کردە یەکەم ئامانجی ئەو شاڵاوە پڕوپاگەندەیە ، دووڕووەکانیش تابووری پێنجەمی ئەو شاڵاوە بوون لەناو ڕیزی موسوڵمانەکاندا ، بەحوکمی ئەوەی دانیشتووی مەدینە بوون ، هەرکاتێکیان بویستایە دەیانتوانی تەماس بکەن بە موسوڵمانەکانەوەو گەمە بەهەست و سۆزی ئاینیان بکەن . (ابن ابی) سەرۆکی دووڕووان و هاوڕێکانی ئەو ئەرکەیان لەئەستۆ گرت. ئەم پیلانە لەدوای جەنگی ئەحزابەوە دەرکەوت ، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دایکی ئیمانداران (زینب)ی کچی (جحش)ی مارە کرد ، پاش ئەوەی (زید) تەڵاقیدا ، نەریتی عەرەب وەهابوو کوڕی بە کوڕکراو (تبنی) وەکو کوڕی باوكو دایکی سەیریان دەکرد ، پێیان وابوو کە ژنی کوڕی بە کوڕکراو حەرامە لەسەر ئەو کەسەی کە کردویەتی بە کوڕی خۆی ، کە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی مارە کرد ، دووڕووان دوو کەلێنیان بەدی کرد. کە بۆ ئاژاوەنانەوە دژ بە پێغەمبەر ﷺ ، دەست بدات.

یەکەم / ئەم ژنە پێنجەم ژنی پێغەمبەرە ﷺ. لەکاتێکدا قورئان مۆڵەتی نەداوە بە چوار ژن زیاتر، چۆن ئەم ژنهێنانە ڕاست دەردەچێت؟

دووەم / زەینەب خێزانی بە کوڕکراوەکەی پێغەمبەرە ﷺ ئەمە گوناهێکی هەرە گەورەیە ، بەپێی داب و نەریتی عەرەب ، بۆیە لەو بارەیەوە کەوتنە پڕوپاگەندەو وتی وتی ، دەیان بەسەرهاتو قسەی پڕوپوچیان ڕێکخستو ، وتیان : موحەمەد لەپڕێکدا دیوێتی دڵی پێدا چووەو عاشقی بووە ، کە (زید)ی کوڕیشی بەمەی زانیوە تەڵاقی داوە بۆ موحەمەد ئەو پڕوپاگەندەیان بەشێوەیەکی قووڵ و بەر بڵاو بڵاو کردۆتەوە تائێستاش ئاسەواری لەناو کتێبەکانی تەفسیرو فەرموودەی ئەمڕۆشدا هەر ماوە ، ئەم پڕوپاگەندەیە کاریگەری خراپی هەبووە

لەسەر دڵ‌و دەروونی نەخۆشەکان تا ئایەت هاتەخوارەوەو ڕوونی کردەوە ، ئاوی بەسەر کەف‌و کوَی دڵەکاندا کردو ، ئامادەشی کرد بە بەر فراوانی ئەو پڕوپاگەندەیەی دژ بەپێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام درا ، بەشێوەیەك سەرەتای سورەتی ئەحزابی پێدەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تُطِعْ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ الأحزاب. واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ، لەخوا بترسەو بەگوێی کافران‌و دووڕووان مەکە ، خودای گەورە خۆی زاناو دانایە.

ئەمە چەند ئاماژەیەکی سەرپێیی‌و، وردە هەڵوێستە لەو کارە دزێوانەی دووڕووان پێش جەنگی (بني المصطلق) پێی هەڵدەسان ، پێغەمبەریش ﷺ بەدانبەخۆدا گرتن و ئارام گرتن و نەرمی ڕووبەڕوویان دەبۆوە ، بەگشتی موسوڵمانەکانیش بەئارام گرتن خۆیان لە شەڕی نیاز خراپان دەپاراست ، چونکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەهۆی ئابڕو چونییانەوە زیاتر ئاشکرا دەبوون ، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَوَلاَ يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لاَ يَتُوبُونَ وَلاَ هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ التوبة/ ١٢٦. واتە: ئایا ئەو دووڕووانە نابینن کە هەموو ساڵێك یەك جار یان دووجار تاقی دەکرێنەوەو ئابڕوویان دەچێت و کەچی هەر تەوبەش ناکەن و، بیر ناکەنەوە؟

# ڕۆڵی دووڕووان لە غەزای (بني المصطلق) دا

لە شەڕی (بني المصطلق)دا ، دووڕووان لەگەڵ موسوڵمانەکان چوونە دەرەوە ، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَا زَادُوكُمْ إِلاَّ خَبَالاً وَلَأَوْضَعُوا خِلاَلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ ﴾ لەو دەرچوونەدا بوارێکی تری گۆبەنگ‌و ئاژاوەگێڕیان بۆ کرایەوە ، پشێوی‌و ئاژاوەیەکی ترسناکیان لە ڕیزی موسوڵمانەکاندا نایەوەو ، دەستیان کرد بەئاژاوە دژی خودی پێغەمبەر ﷺ ، ئەمەش درێژەی ئەو باسانەیە:

١ـ دووڕووان وتیان: ﴿ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ ﴾ المنافقون /٨ پاش لێبوونەوە لە جەنگی (مریسیع) ، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئاوەکەی (مریسیع) خێوەتی هەڵدا ، خەڵك هاتن بۆ ئاو بردن ، (عمر)ی کوڕی (خەتاب) ، کابرایەکی کرێگرتەی لەگەڵدا بوو ناوی (جهجاه)ی غەفاری بوو، ئەم پیاوە لەسەر ئاوەکە لەگەڵ (سنان)ی کوڕی (وبر)ی (جهنی)دا بوو بە دەمەقاڵێیان وە شەڕ دروست بوو، کابرای (جهنی) هاواری کردە ئەنسارییەکان ، (جهجاه)یش هاواری کردە کۆچەران ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئایا بانگەشە بەدروشمی جاهلی دەکەن ، لەکاتێکدا هێشتا من لەناوتاندام؟ وازی لێ بهێنن ئەمە بۆگەنەو خراپە. ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە (عبدالله)ی کوڕی (ابی). لەناو خزمانیدا خۆی تووڕە کرد ، (زید)ی کوڕی (ارقم) کە کوڕێکی مێرد منداڵ بوو لەوێدا دانیشتبوو ، (عبدالله) وتی: ئەمەشیان کرد؟ هاتنە سەرمان‌و ماڵ‌و حاڵیان لێ داگیر کردین ، وەڵڵاهی ئێمەو ئەوان وەك ئەوە وایە ، یەکەم بڵێت: سەگەکەت تێر بکە با بتخوات ، سوێنددەخۆم بەخوا کەگەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێت ڕێزدارەکەمان بێ ڕێزەکەمان شاربەدەر بکات. پاشان ڕووی کردە ئەوانەی دەوروبەری‌و پێی وتن: دەبخۆن دەی ، ئەمە خۆتان بەخۆتان کرد ، هێناتانن بۆ سەر خاك‌و ئاوی خۆتان ، ماڵتان لەگەڵ بەش کردن ، وەڵڵاهی ئەگەر نانیان نەدەنێ لەوێ بار دەکەن‌و دەڕۆن ، (زید)ی کوڕی (ارقم) هەواڵی ئەم قسانەی دا بەمامی ، مامیشی گوتەکانی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا (عمر) دانیشتبوو ، (عمر) وتی: پێغەمبەری خودا فەرمان بدە بە (عباد)ی کوڕی (بشیر) با بیکوژێت. فەرمووی: (عمر) چی بڵێین ، ئەگەر خەڵکی وتیان محەمەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت؟ نا نەخێر شتی وا ناکەم ، فەرمان بدە با بڕۆین و بار بکەین. ئەم بڕیارە لەکاتێکدا بوو کە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا کۆچ و ڕەوی نەدەکرد ، خەڵکیش لەگەڵیدا هەستان ، (اسید)ی کوڕی (حضیر)ی پێگەیشت سڵاوی لێ کردو عەرزی کرد: قوربان هەرگیز لەم کاتانەدا سەفەر ناکەیت ، خێرە؟ فەرمووی: ئەی پێت نەگەیشتوە ئەو برادەرەتان چی دەڵێت؟ ـ مەبەستی (ابن

ابی) بوو ـ وتی: چی بووه؟ فەرمووی: (ابن ابی) وتویەتی: کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە سوێند بێت ڕێزدارەکەمان بێ ڕێزەکەمان شار بەدەر بکەین ، (اسد) وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ تۆ ڕێزداریت ، ئەگەر حەز دەکەیت شار بەدەری بکە ، پاشان وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵی نەرمو نیان بە ، وەڵلاهی کە خوا تۆی بۆ ناردین خەڵکی خەریکی تاجو کورسی دروست کردن بوون بۆ ئەوەی بیکەینە سەرۆکی مەدینە ، ئەو پێی وایە تۆ موڵکەکەت لەو زەوت کردووە.

پاشان ئەو ڕۆژە ، پێغەمبەر ﷺ خەڵکەکەی جوڵاند تا سەر لە ئێوارەو شەوەکەشی تا ڕۆژ بووەوەو بۆ سبەینێ خەویان لێ کەوت ، پاشان دابەزینو ماندوو شەکەت بوونو نوستن ، ئەمەش بۆ ئەوە بوو خەڵکی سەرقاڵ بکات لەو قسەو باسانەو وازبهێنن لە وتی وتی.

(ابن ابی)یش کەزانی (زید)ی کوڕی (ارقم) قسەکانی گێڕاوەتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، هات سوێندی خوارد بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: من شتی وەهام نەگوتووەو ، شتیوا بەدەمی مندا نەهاتوە. هەندێك لەو ئەنسارانەی لەوێدا دانیشتبوون وتیان: پێغەمبەری خوا ، لەوانەیە منداڵە بەهەڵەدا چووبێت ، باش قسەکەی بەگوێدا نەچووبێت و ، هەروا گێڕابێتیەوە ، (زید) وتی: دوای ئەو قسەیە توشی خەمێکی زۆر بووم ، لە ماڵەوە دانیشتم خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە: ﴿ إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ... ﴾ تا ئایەتی ﴿ هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لاَ تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا... ﴾ تائایەتی ﴿لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ ﴾، (زید) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێنمداو چوومە خزمەتی ، ئایەتەکانی بۆ خوێندمەوە ، فەرمووی: خوای گەورە ڕاستیی قسەکەی تۆی دەرخست.[1]

(عبدالله)ی کوڕی (ابی) دووڕوو. کە یەکێك بوو لە هاوڕێ چاکەکانی پێغەمبەر ﷺ خۆی بێ گوناه کرد لە تاوانەکانی باوکیو ، لە دەروازەی شاری مەدینەدا وەستا، شمشێرەکەی دەرهێنا، کە باوکی هات پێی وت: وەڵلاهی ڕێگەت نادەم بڕۆی هەتا پێغەمبەری خوا ئیزنت نەدات، ئەوە تۆ زەلیلو سەرشۆڕیتو پێغەمبەریش ڕێزدارو شکۆدارە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێناو ئیزنی دا بە (عبدالله) کە ڕێگەی باوکی بکات تا بڕواتە شارەوە ، ئەویش ڕێگەی دا بڕوات ، پێشتریش (عبدالله)ی کوڕی (ابن ابی) مۆڵەتی وەرگرتبوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ و عەرزی کردبوو: پێغەمبەری خوا ئەگەر ئەتەوێت بیکوژێت فەرمانم پێ بدە ، وەڵلاهی سەریت بۆ دەهێنم.[2]

---

[1] / بڕوانە ( صحیح البخاری ) ١/٤٩٩ ، ٢/٧٢٧ ، ٧٢٨، ٧٢٩ ، ( ابن هشام ) ٢/٢٩٠ ، ٢٩١ ، ٢٩٢.
[2] / هەمان سەرچاوە. (مختصر سیره الرسول ) نوسینی ( شیخ عبد الله ) ی نەجدی ل ٢٧٧.

## ڕووداوی هەڵبەستنەکە ( حادثة الأفك )

هەر لەو غەزایەدا بوو ڕووداوی هەڵبەستنەکە سەری هەڵدا ، کورتەکەی ئەوەیە (عائشە) لەو سەفەرەدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەهۆی تیروپشکەوە ، پێغەمبەر ﷺ نەریتی وابوو کە دەرچوایە تیروپشکی بۆ هاوسەرەکانی دەکرد. کە لە غەزاکە گەڕانەوە لە چەند شوێنێك دابەزین ، عائیشە بۆ کارێکی پێویستی خۆی چووە دەرەوە ، ملوانکەیەکی خوشکەکەی ون کرد کە لەو سەفەرەدا لە ملی کردبوو ، گەڕایەوە بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە ، ئەوانەش کە کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو لەبەر سوکەڵەیی عائیشە ، هەستیان نەکردبوو کە لەناو کەژاوەکەدا نییەو بردبوویانەوە ، چونکە عائیشە لاوازو کەم کێش بوو ، ئەوانەش کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو چەند کەسێك بوون ، ئەگەر یەك یان دوو کەسێك بوونایە هەستیان پێدەکرد ، لەم لاشەوە عائیشە گەڕایەوە بۆ مەنزڵگای کەژاوەکەی خۆی ، پاش دۆزینەوەی ملوانکەکە ، سەیری کرد کەسی لێ نەماوە ، لە شوێنی خۆیدا دانیشت ، دەیزانی کە پاش ئەوەی زانیان هەڵیان نەگرتووە دەگەڕێنەوە بۆی ، بەڵام خوا بەخواست و ویستی خۆی کاروباری دونیا هەڵدەسوڕێنێت ، بەسەر عەرشی خۆیەوە. ئەوە بوو (عائیشە) کە گەڕایەوە خەو زۆری بۆهێناو نوست ، بەدەنگە دەنگی (صفوان)ی کوڕی (معطل) خەبەری بۆوە کە دەیووت: (انا لله وانا الیه راجعون) ئەوە ژنەکەی پێغەمبەرە؟ (صفوان) لەکاروانی سوپاکە دواکەوتبوو چونکە پیاوێکی خەواڵو بوو ، کە (عائیشە)ی بینی ناسییەوە ، پێشتر پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب بینیبوی ، ئیرتجاعی کردو چۆکی بەحوشترەکەی داداو ، لێی نزیك کردەوە ، (عائیشە) سواری وشترەکە بوو ، بێ ئەوەی یەك گوتەی لەگەڵدا بڵێت، (عائیشە)ش جگە لە وشەی (انا لله وانا الیه راجعون) هیچی تری لێ نەبیست ، پاشان (صفوان) جڵەوی وشترەکەی گرتو ، بردیەوە بۆلای سوپاکە ، کەلە (نحر الظهیرة) لای دابوو ، کە خەڵك ئەوەیان بینی هەرکەس بەویستی خۆی قسەی کرد، دوژمنی خوا (عبدالله)ی کوڕی (أبی)ی دڵ نەخۆش کەلێنێکی دەستکەوت کەلێیەوە ڕقوکینەی پڕ لەدووڕوویی خۆی لێوە بڕژێنێت ، دەستی کرد بەهۆنینەوەی چیرۆکی هەڵبەستراوو ، بڵاوکردنەوەی لەشوێنە قەرەباڵغەکاندا هەرجارەی بەشێوەیەك دەیگێڕایەوە ، هاوڕێکانیشی لێی جەم بوو بوون ، کە گەیشتنەوە شاری مەدینە دووڕوان تەواو دەستیاندایە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو بوختانی ناشیرین ، پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ بوو هیچی

نەدەوت ، پاشان ڕاوێژی کرد بە هاوەڵەکانی ـ کە وەحی دواکەوت ـ (علی) وتی: تەلاقی بدەو ، ژنێکی‌تر بهێنە ، ئەمەی بە ئاماژە وت نەك بەئاشکرا ، (اسامە)و چەند کەسێکی تر وتیان: تەلاقی مەدەو ، گوێ مەدەرە قسەوباسی دوژمنان. پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەرو چاوی دەگێڕا بۆ (عبدالله)ی کوڕی (ابی) نەیبینی. (اسید)ی کوڕی (حضیر) دەردەدڵی خۆی بۆ ڕشت ، (سعد)ی کوڕی (عبادە)ش ـ کە گەورەی خەزرەج‌و خێڵەکەی (ابن ابی) بوو ـ دەمارگیری خێڵایەتی گرتی‌و بوو بەدەمەقاڵێیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگی کردن‌و پاشان خۆشی بێدەنگ بوو.

(عائیشە) کە گەڕایەوە نەخۆشیەکی سەختی گرت ، بێ ئەوەی لەبارەی ڕووداوی هەڵبەستنەوە (افك) هیچ بزانێت ، ئەوە نەبێت کە کەم لوتفیەکی لە پێغەمبەر هەست پێکرد بوو ، کە ئەگەر جاران بەو شێوەیە نەخۆش بوایە وانەدەبوو ، کە چاك بووەوە لەگەڵ دایکی (مسطح) شەو چوونە دەرەوە بۆ دەست بە ئاوگەیاندن ، دایکی (مسطح) ساتمەیەکی کرد ، دوعایەکی شەڕی کرد لە کوڕەکەی ، (عائیشە) ئەوەی پێ ناخۆش بوو ، دایکی (مسطح) هەواڵەکەی گێڕایەوە بۆ (عائیشە) ، (عائیشە) گەڕایەوەو مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر ﷺ تا بڕواتەوە ماڵی باوکی‌و لەوێ هەواڵەکە بزانێت ، پاشان هات بۆ ماڵی باوکی‌و مەسەلەکەی بۆ ڕوون بۆوە ، دەستی کرد بەگریان ، دوو شەوو ڕۆژێك دەگریا ، خەو نەدەچووە چاوی ، فرمێسکەکانی وشك نەدەبونەوە وایدەزانی ئەو گریانە جەرگی دەبڕێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای (عائیشە)و پاش شایەتمان ، فەرمووی: (عائیشە ، لەبارەی تۆوە ئەوەو ئەوەم پێگەیشتوە ، ئەگەر بێ گوناه بیت ئەوا خوا بێ گوناهیت دەردەخات ، خۆ ئەگەر بەنیازی تاوانێکیش بوو بیت ئەوا داوای لێ خۆش بوون بکەو بگەڕێوە بۆ لای خوای خۆت ، چونکە ئەگەر عەبد گوناهێکی کردو دانی‌نا بەگوناهەکەی‌داو گەڕایەوە بۆ لای خوا ، ئەوا خوا تۆبەی لێ گیرا دەکات . ئیدی فرمێسکەکانی (عائیشە) کەم بووە ، وتی بە باوك‌و دایکی وەڵام بدەنەوە ، نەیاندەزانی چی بڵێن ، (عائیشە) وتی: وەڵڵاهی دەزانم ، کە ئەو قسەیە چووە بەگوێتانداو ئێستا لەدڵتاندا جێگیر بووەو باوەڕتان پێ کردوە ، ئەگەر پێتان بڵێم " بێگوناهم ـ خوا دەزانێت کە بێ‌گوناهم ـ ئێوە باوەڕم پێ ناکەن ، خۆ ئەگەر دان بنێم بەهەرشتێکدا ـ خوا ئەزانێت کە من بێگوناهم ـ ئەو کاتە ئێوە باوەڕم پێ دەکەن ، وەڵڵاهی هیچ وتەیەکم نییە بەئێوەی بڵێم جگە لەگوتەکەی باوکی یوسف ، کە فەرمووی: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى

مَا تَصِفُونَ ﴾ واته: ئارام گرتنێکی جوان ، ئارام دەگرم ، خوا یارمەتی دەرم بێت ، بەسەر ئەوەدا ئێوە باسی دەکەن . پاشان ڕۆیشتو نوست . لەو کاتەدا وەحی هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی خۆش بوو پێدەکەنی ، یەکەم وشە لە دەمی پیرۆزی دەرچوو فەرمووی: عائیشە ، خوای گەورە بێگوناهیی تۆی ڕاگەیاند . دایکی (عائیشە) پێی وت: هەستە بڕۆ بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ . (عائیشە)ش بە نازی بێ گوناهیو بەمتمانەی تەواوی خۆشەویستی پێغەمبەرەوە وتی: وەڵلاهی ناچم بە دەمیەوە ، جگە لە خوا سوپاسی کەس ناکەم.

ئەو ئایەتانەی لە بارەی (افك)ە وە هاتنە خوارەوە بریتی بوون لە ﴿ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ ﴾... تا دە ئایەت.

ئەوانەی بەشداریان کردبوو لە هەڵبەستنی تۆمەتەکەدا ، جەڵدیان لێدرا ، کە بریتی بوون (مسطح)ی کوڕی (اثاثة)و (حسن)ی کوڕی (ثابت)و (حمنه)ی کچی (جحش) ، یەکی هەشتا جەڵدەیان لێدرا ، بەڵام (عبدالله)ی کوڕی (ابی) کە ڕۆڵی گەورەی بینی لە تۆمەتە ترسناکەکەداو قورئان پێی فەرموو: ﴿ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ ﴾ هیچ جەڵدەی لێ نەدرا چونکە جەڵدە لێدان کەمکەرەوەی سزای دۆزەخ بوو بۆ ئەو ، خوای گەورەیش هەڕەشەی سزای سەختی کرد لە (ابن ابی) لە قیامەتدا ، یان پێدەچێت لەبەر هەمان هۆی نەکوشتنەکەشی بوو بێت.[1]

بەو شێوەیە پاش یەك مانگ ، هەوری گومان و دڵەڕاوکێ و پشێوی لەئاسمانی شاری مەدینەدا ڕەوییەوە ، سەرکردەی دووڕووان بەشێوەیەك ئابڕووی چوو دوای ئەوە نەیتوانی لەهیچ جێگەیەك سەر بەرزبکاتەوە ، (ابن ابی) دەڵێت: دوای ئەوە هەرچییەك ڕووی بدایەو قسەیەکی بکردایە هاوڕێ و خزمانی پێش هەمووکەس لۆمەو سەرزەنشتیان دەکردو پێیدا هەڵدەشاخان. پێغەمبەری خوا ﷺ بەعومەری فەرموو: ئێستا بارودۆخەکەت پێ چۆنە؟ وەڵلاهی ئەو ڕۆژەی تۆ وتت بمانکوشتایە دەیان کەسمان لێ ڕاست دەبۆوە ، ئەگەر ئەوانە ئێستا فەرمانیان پێبدرێت خۆیان دەیکوژن . عومەر فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵلاهی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەترە لە فەرمانی من[2].

---

(١) صحيح البخاري ١/٣٦٤ ، ٢/٦٩٦ ، ٦٩٧ ،٦٩٨، (زا د المعاد) ٢/١١٣ ، ١١٤، ١١٥، (ابن هشام) ٢/٢٩٧ ، تا ٣٠٧.

(٢) ابن هشام ٢/٢٩٣.

## ناردنی مەفرەزەو ( سریە ) دوای غەزای ( مریسیع )

١. سریەی (عبدالرحمان)ی کوڕی (عوف) بەرەو ماڵەکانی (بني كلب) لە (دومة الجندل) ، لە (شعبانی ساڵی ٦ی کۆچی)دا ، پێغەمبەری خوا ﷺ (عبد الرحمن)ی دانیشاندو پێی فەرموو: ئەگەر بەگوێیان کردی ئەوا کچی مەلیکەکەیان مارەبکە. (عبدالرحمن) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەناویاندا مایەوەو بانگی کردن بۆ ئیسلام ، خەڵکەکە ئیسلام بوون و (عبدالرحمن) کچی سەرۆکەکەیانی مارەکرد کە ناوی (تماضر)ی کچی (اصبغ) بوو ، ئەم ژنە بە دایکی (ابو سلمة) ناسرا.

٢. سریەی (علی) کوڕی (ابی طالب) بۆ (بنی سعد)ی کوڕی (بکر) لە ناوچەی (فدك) ، لە مانگی (شعبانی ساڵی ٦ ی کۆچی)دا ، ئەوەش بەو شێوەیە بوو، هەواڵ هات بۆ پێغەمبەر ﷺ کە لەو شوێنەدا کۆمەڵێك کۆبوونەتەوەو دەیانەوێت یارمەتی جولەکە بدەن ، پێغەمبەریش ﷺ (علی) بۆ ناردن بە دووسەد پیاوەوە . (علی) بە شەو دەڕۆیشتو بە ڕۆژ خۆی پەنا دەدا ، پیاوێکی سیخوڕی ئەوانیان گرت ، دانی نا بەوەدا کە ئەمان ناردوویانە بۆلای جولەکەی خەیبەر تاپێیان بڵێت پشتیوانیان لێ دەکەین بەمەرجێك خورمای خەیبەریان بدەنێ. سیخوڕەکە شوێنی کۆبونەوەی خێڵی (بنی سعد)ی پێ وتن ، (علی) لەناکاودا دای بەسەریاندا ، پێنج سەد وشترو هەزار سەر مەڕی دەستکەوتو ، (بنی سعد)یش بەکەژاوەی ژنەکانیانەوە ڕایان کرد ، سەرۆکەکەیان (وبرا)ی کوڕی (علیم) بوو.

٣. سریەی (ابی‌بکر الصدیق) یان (زید)ی کوڕی (حارثة) بۆ (وادی القری) ، لە (ڕەمەزانی ساڵی ٦ ی کۆچی)دا. تیرەی (فزارە) بەنیازی تیرۆر کردنی پێغەمبەر بوون ﷺ (ئەبوبەکری صدیق)ی بۆ ناردن. (سلمة)ی کوڕی (اکوع) دەڵێت: لەگەڵیدا چوومە دەرەوە ، نوێژی بەیانیمان کردو دامان بەسەریاندا ، چوینە سەر ئاوەکە ، (ابوبکر) چەند کەسێکی لێ کوشتن ، کۆمەڵێکم تێدا بینین کە ژن‌و منداڵەکانیان لەگەڵدا بوو ، ترسام کە پێش من بگەنە شاخەکە ، تیرێکم هاویشتە بەردەمیان ، کە تیرەکەیان بینی لە پێش خۆیانەوە وەستان ، ژنێکیان لەناودا بوو ناوی (ام قرفة) بوو ، پارچە پێستێکی ناسکی بەسەرەوە بوو ، کچێکی

لەگەڵدا بوو ، هەموویانم دایە بەرو هێنامنن بۆلای (ابوبکر) ، ئەو کچە لە دابەشکردنەکەدا بەر من کەوت ، من دەستم بۆ جلەکانیشی نەبرد ، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی کچەکەی (ام قرفة)ی پرسی ، ناردی بۆ مەککەو لەگەڵ دیلێکی موسوڵماندا گۆڕییەوە.[1]

ئەم (ام قرفة)یە شەیتانێکی فێڵباز بوو دەیویست پێغەمبەری خوا ﷺ شەهید بکات ، سی کەسی سوارچاکی خزم و خۆیشی خۆی ساز کردبوو بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ ، ئەوەبوو خۆی و هەر سی سوارەکە کوژران و بەسزای خۆیان گەیشتن.

٤. سریەی (کرز)ی کوڕی (جابر)ی (فهری)[2] بۆ (عرنیین) ، لە مانگی (شەوالی ساڵی ٦ی کۆچی)دا ، ئەوەش لەبەرئەوە بوو کۆمەڵێك لەخێڵی (عکل) و (عرینە) خۆیان بەموسوڵمان نیشاندا ، هاتنە مەدینەوەو حاڵیان باش نەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ، ناردنی بۆلای وشتر گەلێك و ، پێی فەرموون: کە لەشیرەکەی بخۆنەوە ، کە چاك بوونەوە شوانەکەی پێغەمبەریان کوشت ﷺ ، ئەنجا هەڵگەڕانەوەو وشترەکانیان دایەبەرو ڕایانکرد ، پێغەمبەریش ﷺ (کرز)ی (فهری) نارد بەشوێنیاندا لەگەڵ (٢٠) هاوەڵدا، ئەنجا نزای کرد لە (عرنی)یەکان و فەرمووی: خوایە سەریان لێ تێك بدەیت و ، دنیایان لێ بەرتەسك بکەیتەوە . خوای گەورە سەری لێتێکدان. دۆزرانەوەو ، دەست و قاچیان بڕراو ، چاویان دەرهێنرا ، لە تۆڵەی ئەو تاوانە گەورەیەی کە کردبوویان ، پاشان فڕێدرانە بەر گەرماکە تا مردن[3]. ڕووداوەکەیان لە (صحیح)دا هاتووە لە (انس)ە وە.[4]

سیرەتناسەکان دوای ئەوە باسی سریەی (عمرو)ی کوڕی (أمیة)ی (ضمری) دەکەن لەگەڵ (سلمة)ی کوڕی (أبي سلمة)دا ، لە مانگی (شەوالی ساڵی ٦ی کۆچی)دا ، ئەو سریەیە ڕۆشتووە بۆ مەککە بەمەبەستی کوشتنی (أبو سفیان) ، چونکە (ابو سفیان) عەرەبێکی دەشتەکی نارد بوو بۆ شەهید کردنی پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام هەردوو نوێنەرەکە سەرکەوتوو نەبوون لەبەجێهێنانی کارەکەیاندا . دەڵێن: لە ڕێگا (عمرو) سێ کەسی کوشتووە. هەروەها دەڵێن : کە (عمرو) لەو سەفەرەیدا لاشەکەی (خبیب)ی

---

[1] / (صحیح البخاری)دا هاتووە ٨٩/٢ ، وتراوە کە ئەو سرییە لە ساڵی حەوتی کۆچیدا دەرچووە.

[2] / ئەمە ئەوکەسە بوو کە شاڵاوە ناکاوەکەی کردە سەرمەدینە لەغەزای (صفوان)دا پێش جەنگی بەدر، پاشان موسوڵمان بوو لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا شەهید بوو.

[3] / زاد المعاد ١٢٢/٢.

[4] / صحیح البخاری ٦٠٢/٢.

بردۆتەوە . لەڕاستیدا زانراوە کە (خبیب) دوای ڕووداوی (رجیع) بەچەند ڕۆژێك یان چەند مانگێك شەهیدکراوە ، ڕووداوی (رجیع)یش لەمانگی (صەفری ساڵی ٤ی کۆچی)دا ڕووی داوە. نازانم تۆبڵێیت ئەو دووسەفەرە لەسیرەتنوسەکان تێکەڵ بووبێت، یان هەردوو مەسەلەکە لەیەك سەفەردا بووە لەساڵی (٤ی کۆچی)دا ، عەللامە (المنصورفوری) نکۆڵی لەوە دەکات کە ئەو سریەیە سریەی شەڕ یان سریەی شەڕەتیر بووبێت (والله أعلم).

ئەمە ئەو (سریە)و (غەزا)یانە بوون کە لەدوای غەزای (أحزاب)و (بني قريظة)وە ڕوویان داوە ، لەهیچ غەزایەکیاندا شەڕی خوێناوی سەخت ڕووی نەداوە ، ئەوەی ڕووی داوە پێکدادانێکی سووك بووە ، ئەو دەوریاتانەش تەنها بۆ پەیدۆزیو چاودێری دوژمن بووە ، یان بۆ دەرس دادانی خێڵێك بووە ، بۆ ترساندنی عەرەبی دەشتەکی و ئەو دوژمنانەی کەهێشتا لە دەرفەت دەگەڕان و جموجۆڵیان دەکرد، پاش تێڕامانیش لە بارو دۆخەکە دەردەکەوێت کەچەرخی ڕۆژگار دوای جەنگی (ئەحزاب) پێشکەوتنی بەخۆوە بینیو، دوژمنانی ئیسلام لەورەبەردانو ڕووخانی یەکجارەکیدا بوون ، هیچ ئومێدێکیان نەمابوو بۆ لێدانو ئازاردانی بانگەوازی ئیسلامی، ئەم پێشکەوتنە بەڕوونتر لەپەیمانی حودەیبیەدا دەردەکەوێت ، شەڕ وەستانەکە بۆ خۆی داننان بوو بەهێزو دەستەلاتی ئیسلامیداو ، ڕازی بوون بەمانەوەی لەخاکی دورگەی عەرەبیدا.

## ( ڕووداوی حودەیبیە )

## لە مانگی ( ذی القعدة ) ی ساڵی ٦ ی کۆچیدا

### هۆی عەمرە کردنی حودیبیە

کە ئەو هەموو گۆڕانە ڕوویدا لە بەرژەوەندی موسوڵمانەکان ، وردە وردە سەرەتاکانی فەتحی گەورەو سەرکەوتنی ئیسلام دەرکەوتن ، ڕێخۆشکەری کرا بۆ ئەوەی موسوڵمانەکان مافی خۆیان لەخودا پەرستیدا بەجێ بهێنن و بڕۆنە ناو ئەو مزگەوتە پیرۆزەی کە موشریکان شەش ساڵ دەبوو لەموسوڵمانەکانیان حەرام کردبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێکی بینی ، لەمەدینەدا بوو ، خۆی و هاوەڵەکانی چوونە ناو (بیت الحرام) ، کلیلی کابەی پیرۆزی وەرگرتو تەواف و عەمرەیان کردو هەندێکیان قژەسەری هەندێکی تریان کەمکردەوە ، ئەم هەواڵەی فەرموو بە هاوەڵەکانی زۆر دڵیان خۆشبوو، وایانزانی ئەم ساڵ دەڕۆنەوە ناو مەککەوە ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی فەرموو بەهاوەڵەکانی خۆیان سازبدەن بۆ سەفەری عومرە.

### خۆ کـۆکردنەوەی موسوڵمانەکـان

خێڵە عەرەبەکانی دەوروبەریش خۆیان سازدا بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا بڕۆن ، زۆریشیان دواکەوتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ جلەکانی شوشت و سواری (قصواء) بوو ، (ابن ام مكتوم) یان (نميلة)ی (ليثی) بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت ، لەسەری مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی٦ی کۆچیدا تەشریفی دەرچوو لەمەدینە، (ام سلمة)ی هاوسەری و هەزارو چوارسەد کەس ، یان هەزارو پێنج سەد کەسی لەگەڵدا بوو ، چەکی جەنگ کردنی بەتەواوی نەبرد ، مەگەر تفاقی ڕێبواران ، شمشێریش لە کێلان ئاخنرا.

### موسوڵمانەکان بەرەو مەککـە دەجوڵێن

پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕووی مەککە کەوتە جوڵە ، کەگەیشتە (ذي الحليفة)، (هدی) یەکەی دیاریکردو ، بەرگی ئیحرامی پۆشی بۆ ئەوەی خەڵك دڵنیابن لەوەی کە جەنگ ناکات، پێش خۆی چاودێرێکی ناردبوو لەخێڵی (خزاعە) تاهەواڵی قورەیشی بۆ بهێنێت ، کەگەیشتە (عسفان) چاودێرەکەی گەڕایەوەو وتی: کە من لەوێ هاتمەوە (کعبی) کوڕی (لؤی) حەبەشیەکانی بۆ کۆکردویتەوەو، کۆمەڵێکی تریشی خڕکردۆتەوەو دەیانەوێت شەڕت لەگەڵدابکەن و نەهێڵن بچنە (بيت)ەوە .

پێغەمبەریش ﷺ ڕاوێژی کرد بە هاوەڵەکانی و فەرمووی: ئایا پێتان وایە کەبدەین بەسەر حاڵ و ماڵی ئەوانەدا کە یارمەتی ئەوانەیان داوەو دەستیان لێ بوەشێنین؟ ئەوجا دەستەو ئەژنۆ دادەنیشن بەخەم و خەفەتەوە دەژین ، خۆ ئەگەر ڕزگاریشیان بێت ئەوا خوا بیانکوژێت ، یان دەتانەوێت ڕووبکەینە (بیت)ە وە ، هەرکەسێك هاتە ڕێمان شەڕی لەگەڵدا بکەین؟ (ابوبکر) فەرمووی : خواو پێغەمبەرەکەی باشتر لێی دەزانن ، ئێمە بۆ عومرە هاتووین ، نەهاتوین بۆ شەڕی کەس . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیدی سەری لێ بنێنەوەو دڵئارام بن. ئەوانیش هێواش بوونەوە.

## هەوڵدانی قورەیش بۆ ڕێگەگرتن لە موسوڵمانەکان

کە قورەیش هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەریان بیست ﷺ کۆبوونەوەیەکیان بەست و بڕیاریاندا کە هەرچۆنێك بووە ، ڕێگە بگرن لەوەی کە موسوڵمانەکان بڕۆنە (بیت)ە وە. پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پشتی کردە حەبەشیەکان ، کابرایەکی خێڵی (بنی کعب) هەواڵی هێنا کە قورەیش لە (ذي طوى) دابەزیوە ، دووسەد سواری (خالد)ی کوڕی (ولید)یش ، لە (کراع الغمیم)دا خۆیان ئامادە کردوە ، لەسەر ئەو ڕێگا سەرەکیەی کە دەڕواتەوە بۆ مەککە ، (خالد) ویستی ڕێ لە موسوڵمانەکان بگرێت ، بەخۆی و دوو سەد سوارەکەیەوە بەرامبەریان ڕاوەستا، کاتێك بینی لە نوێژی نیوەڕۆدا کڕنوش و سوژدە دەبەن ، وتی: بەڕاستی بێئاگا بوون ، ئەگەر بماندایە بەسەریاندا لەناومان دەبردن ، پاشان بڕیاریدا کە لەکاتی نوێژی عەسردا بدات بەسەریاندا ، بەڵام خوای گەورە حوکمی نوێژی ترسی ناردە خوارەوە ، (خالد) ئەو دەرفەتەشی لەکیس چوو.

## ڕێگە گۆڕین و هەوڵی خۆلادان لە شەڕی خوێناوی

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیەکی خراپ و سەختی گرتەبەر بەناو شیوو دۆڵەکاندا ، بەلای ڕاستداو بەپشت (الخمش) دا لەڕێگەیەکەوە کەوتەڕێ لەسەر (ثنية المرار) جێگەوتەی (حودەیبیە) لە خواروی مەککەوەو ، لەو ڕێگە سەرەکیە لایدا کە لە (تنعیم)ە وە ڕاستەخۆ دەڕواتە ناو حەرەم ، ئەو ڕێگەی خستەلای چەپی خۆی ، کە (خالد) بینی سوپای ئیسلام لەڕێگە سەرەکیەکەی لای داوە بەرەو لای قورەیش دایە غارو ئاگاداری کردن.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتەڕێ تاگەیشتە (ثنية المرار) لەوێدا وشترەکەی چۆکی دادا ، خەڵکی وتیان: (قصواء) مانی گرتوە ناڕوات. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قصواء) مانی نەگرتوە ئەوە خوی ئەو نیە ، بەڵام ڕووداوی ساڵی فیلەکە گرتویەتی. پاشان فەرمووی: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە داوای هەر شتێکم لێ بکەن کە ڕێزی تێدا بێت بۆ پیرۆزیەکانی خواوەند دەیاندەمێ. پاشان خوڕیە (قصواء) هەستایەوە ، کەوتەڕێ تاگەیشتە حودەیبیە ، لەسەر ئاوێکی کەم دابەزین و موسوڵمانەکان بەمشت کەم کەم ئاویان لێ دەخواردەوە ، زۆری پێنەچوو هەستان ، خەڵکەکە لەبەر تینوێتی هانایان برد بۆلای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش ﷺ تیرێکی لەهەگبەی تیرەکانی دەرهێناو فەرمانی پێدان بیخەنە نێو ئاوەکە ، ئەوەندە ئاوی تێهات تا هەموویانی تێر ئاو کرد ئەنجا ڕۆشتن.

## ( بدیل ) دەکەوێتە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و قوڕیشەوە.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەقامگیر بوو ، (بدیل)ی کوڕی (ورقائ)ی (خزاعی) لەگەڵ چەند کەسێکی (خزاعە)ییدا هاتنە خزمەتی و، خێڵی (خزاعە) نهێنی پۆشی پێغەمبەر بوون ﷺ لەناو خەڵکی (تهامە)دا. (بدیل) وتی: کە هاتم (کعب)ی کوڕی (لؤی) بەژمارەیەکی زۆرەوە هاتوونەتە سەر ئاوی حودەیبیەو گروگاڵیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە، بەنیازن شەڕت لەگەڵدا بکەن و نەهێڵن بڕۆیتە مەککەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکو هاتووین عومرە بکەین ، شەڕو کوشتاریش قوڕەیشی شەکەت وماندوو کردووە، ئەگەر بیانەوێت وادەیەکیان لەگەڵدا دادەنێم بۆ گفتوگۆ ، با وازبهێنن لە پەیوەندی نێوان من و خێڵە عەرەبەکان ، با ئەوان بەخواستی خۆیان بێت چوونە پەیمانی هەرکەسێك بابڕۆن ، وەگەرنا با کۆبن، خۆ ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، لەسەر ئەم کارە شەڕیان لەگەڵدا ئەکەم تا لەڕێیدا لەناوئەچم ، یان خوا سەری دەخات.

(بدیل) وتی: ئەم وتەیەی تۆیان پێ دەگەیێنم ، هات بۆ لای قوڕەیش و پێی وتن: من لای موحەممەدەوە هاتووم بۆلاتان ، گوێم لێ گرت گوتەیەکی وت ، ئەگەر پێتان باشە بۆتان باس دەکەم . گەمژەو هەرزەکارەکانیان وتیان: پێویستمان بەگوێگرتن نیە لە قسەکانی ئەو ، ڕیش سپی و پیاو ماقوڵەکانیان وتیان: پێمان بڵێ چی وت؟ (بدیل) وتی: ئاوای وت و ئاوای وت ، ئیدی (قوڕەیش) (مکرز)ی نارد

بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ، کە پێغەمبەر بینی لە دوورەوە فەرمووی: ئەوە کابرایەکی پەیمان شکێنە. کە هات دەستی کرد بەقسە کردن ، پێغەمبەر ﷺ هەمان ئەو شتانەی پێ فەرموو کە بە (بدیل) و هاوەڵەکانی فەرموو بوو ، (مکرز)یش گەڕایەوە بۆ لای (قورەیش)و هەواڵەکەی پێدان.

## شاندەکانی قورەیش

پاشان کابرایەکی خێڵی (کنانە) ناوی (حلیس)ی کوڕی (علقمە) بوو. وتی: ڕێگەم بدەن بامن بڕۆم بۆلای ، وتیان: بڕۆ. کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە فلان کەسە لەخێڵێکە زۆر حەزیان لە وشترە ، وشترەکانی نیشاندەن ، نیشانیانداو خەڵکەکە بەدەم هاتنەوە (تلبیە)یان دەکرد ، کە (حلیس) ئەو حاڵەی بینی وتی: (سبحان الله) هیچ مانای نیە ئەمانە نەهێڵرێت بچنە بەیتەوە. ئەنجا گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکانیو پێی وتن: ئەو هەموو وشترە قەڵەوو دابەستانەم بینی ، پێم باش نیە ڕێگەیان لێ بگیرێت ، دوای ئەوە گفتوگۆو قسەو باسێك لەو نێوانەدا دەستی پێ کرد.

(عروە)ی کوڕی (مسعود)ی (ثقفی) وتی: ئەو پیاوە ـ واتە پێغەمبەر ﷺ ـ ڕایەکی ژیرانەی خستۆتە بەردەستان پێی ڕازی بن ، ڕێگەی منیش بدەن باقسەیەکی لەگەڵدا بکەم، وتیان: بڕۆ. چووە خزمەتیو قسەی لەگەڵدا کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکی لەجۆری قسەکانی (بدیل)ی پێ وت، (عروە) وتی بە پێغەمبەر ﷺ: موحەممەد ، چۆن مرۆڤ کەسوکاری خۆی ڕیشە کێش دەکات ، ئایا پێش خۆت بیستوتە هیچ کەسێك خزموخوێشی خۆی ڕامالێت؟ خۆ ئەگەر ئەوی تریشیان بێت وەڵڵاهی من کۆمەڵێك دەمو چاوو هەرچیو پەرچی دەبینم لە پشتتەوەن هەر کە لێت قەوما ڕادەکەنو بێکەس دەمێنیتەوە ، ئەبوبەکر هەڵدایەو وتی: قوڕ بەسەر عەقڵی تۆو (لات)یش ، ئێمە هەڵدێینو ڕادەکەین؟ (عروە) وتی: ئەوە کێ بوو وەلامی دایەوە؟ وتیان: ئەبوبەکرە. وتی: وەڵڵاهی چاکەت بەسەرمەوە نەبوایە دەمزانی چۆن وەڵامت دەدەمەوە. ئەنجا دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ، کەقسەی دەکرد دەستی دەبرد بۆ ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ ، (مغیرە)ی کوڕی (شعبە)ش بەپشت سەری پێغەمبەرەوە ﷺ وەستابوو، شمشێرێکی بەدەستەوە گرتبوو ، شتێکی دابوو بەسەریدا، لەگەڵ دەست بردنی (عروە) دا بۆ

ڕیشی پێغەمبەر ﷺ ، خێرا (مغیرە) بەکلکی شمشێرەکەی دەیدا بەسەر دەستی (عروە)داو پێی دەوت: دەستت دوور خەرەوە لە ڕیشی پێغەمبەر ﷺ . (عروە) سەری بەرز کردەوەو وتی: ئەوە کێیە؟ وتیان: (مغیرە)ی کوڕی (شعبە)یە، (عروە) وتی: هەی پەیمانشکێن، ئەرێ من نەبووم پینەو پەڕۆم بۆ دەکردی بۆ پەیمانشکێنیەکەت؟ (مغیرە) لەسەردەمی نەفامی خۆیدا ببوە هاوڕێی چەند کەسێك هەموویانی کوشتبوو ،ماڵو سامانەکەشی بردبوون ، پاشان چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺو موسوڵمان بوو ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ئێمە ئیسلامەتیەکەت قبوڵ دەکەین ، بەلاَم ماڵ و سامانەکەتمان ناوێت . (مغیرە) برازای (عروە) بوو.

﴿ وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ ﴾

کاتێك کە گەنجە هەڵەشەو تینو بە جەنگەکانی قوڕەیش بینیان گەورەکانیان حەزیان لە ئاشتیە، بیریان لە نەخشەیەك کردەوە ئەو سوڵحە هەرەس پێ بێنین ، بڕیاریاندا شەو بەدزیەوە بڕۆن و ئاگر بەردەنە سەربازگەی موسوڵمانەکانو ، ئاگری شەڕ هەڵگیرسێنن ، ئەوەبوو هەستان بەجێبەجێ کردنی بڕیارەکەیان ، حەفتا تا هەشتا کەسیان شەو چوون لەشاخی (تنعیم) دابەزین، هەوڵیاندا دزە بکەنە ناو سەربازگەی موسوڵمانەکان، بەلاَم (محمد)ی کوڕی (مسلمە) سەرۆکی پاسەوانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویانی قۆڵ بەست کرد ، پێغەمبەر ﷺ لەبەر مەسەلەی سوڵح کردن لێیان خۆش بوو بەرەلاَی کردن، لەوبارەیەوە ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿ وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ﴾ الفتح/٢٤. واتە : هەر خوای گەورە بوو ، کە نەیهێشت کافرەکان دەستتان لێ بکەنەوە ، دەستی ئێوەشی گرتەوە لەوان ، دوای ئەوەی کە لەناو جەرگەی مەککەدا سەری خستن بەسەریاندا.

## شاندی ( عثمان )ی کوڕی ( عفان ) بۆ لای قوڕەیش

لەوێدا پێغەمبەر ﷺ پێی باش بوو کە نێرراوێکی خۆی بنێرێت بۆلای قوڕەیش ، تا ئامانجو مەبەستی خۆیان بۆ قوڕەیش ڕوون بکاتەوە لەو سەفەرە ، (عومەر)ی بانگ کرد تابینێرێت بۆلایان ، پۆزشی هێنایەوەو وتی پێغەمبەری خوا ﷺ من کەسێکم نیە لەناو خێڵی (بنی کعب)دا لەسەرم بکەنەوە ، ئەگەر ئازار بدرێم لەبەرئەوە (عثمان)ی کوڕی (عفان) بنێرە ، خێڵەکەی لەوێیە ، تۆ هەرچیەك بفەرموویت دەتوانێت بیگەیێنێت . ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ (عثمان)ی نارد بۆلای قوڕەیش ، فەرمووی: پێیان بڵێ ئێمە نەهاتووین بۆ جەنگ ، بەڵکو هاتوین بۆ عومرە ، بانگەشەیان بکە بۆ سەر ئیسلامەتی ، ئەنجا فەرمانی پێدا کە سەردانی ژن و پیاوە ئیماندارەکانی ناو شاری مەککە بکات و مژدەی فەتحیان بداتێ و پێیان بلێت کە خوا ئاینەکەی خۆی لە مەککەدا سەردەخات ، تاوای لێ دێت کەس باوەڕەکەی خۆی لەناو شاردا نەشار ێتەوە.

(عثمان) دەرچوو لە (بلدح) بەقوڕەیشیەکان گەیشت وتیان: بۆ کوێ دەڕۆیت ؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ بەوەو بەوە ناردومی. وتیان: تێگەیشتین چی دەڵێیت ، بڕۆ بەدەم کارەکەتەوە . (أبان)ی کوڕی (سعید)ی کوڕی (عاص) چوو بە دەمیەوە ، بەخێرهاتنی کردو ئەسپەکەی بۆ زین کردو سواری کردو پەنایداو خستیە پشت خۆی تاگەیشتنە مەککە ، پەیامەکەی پێغەمبەری ﷺ گەیاند بەسەرکردەکانی قوڕەیش ، کە لێبووەوە پێیان وت: دەتوانی تەواف بکەیت بە دەوری کابەدا ، بەلاّم (عثمان) ئەو داوایەی ڕەت کردەوەو وتی: تەواف ناکەم تا پێغەمبەری خوا ﷺ تەواف نەکات.

## هەواڵی شەهیدکردنی ( عثمان ) و بەیعەتی ( رضوان )

قوڕەیش (عثمان) یان لای خۆیان گل دایەوە . لەوانەیە بۆ ئەوە بوو بێت کە لەنێوان خۆیاندا پرس وڕا بکەن لەسەر ڕەوشەکەو بڕیارێك بدەن و بە(عثمان)دا وەلاّمی نامەکە بنێرنەوە بەلاّم گیرخواردنەکە زۆری خایاند. لەناو موسوڵمانەکاندا هەواڵی شەهید بوونی (عثمان) بلاّوبووەوە، پێغەمبەر ﷺ کەئەو هەواڵەی پێگەیشت فەرمووی: ئێرە بەجێ ناهێڵین تا ڕووبەڕووی قوڕەیش دەبینەوە . پاشان موسوڵمانانی بانگ کرد بۆ بەیعەتدان ، هەموویان بەیعەتیاندا بە پێغەمبەر ﷺ کە لە

دوژمن ڕانەکەن ، هەندێکیشیان بەیعەتی مردنیاندا بەپێغەمبەر ﷺ ، یەکەم کەس بەیعەتیدا (ابو سنان)ی (اسدی) بوو ، (سلمة)ی کوڕی (اکوع)یش سێ جار بەیعەتی مردنیدا بە پێغەمبەر ﷺ ، جارێکیان لە سەرەتاو جارێکیان لەناوەڕستداو دواجاریش لەکۆتاییدا. ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی خۆیشی گرتو فەرمووی: ئەمەش لەجیاتی (عثمان). کە بەیعەتەکە تەواوبوو (عثمان)یش گەڕایەوەو بەیعەتیدا بەپێغەمبەر ﷺ ، کەس لەم بەیعەتە دوانەکەوت جگە لە کابرایەکی دووڕوو، ناوی (جدی) کوڕی (قیس) بوو. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم بەیعەتەی لە ژێر درەختێکدا لەموسوڵمانەکان وەرگرت ، (عمر)ی کوڕی (خطاب) دەستی گرتبوو ، (معقل)ی کوڕی (یسار) یش لق وپۆپی درەختەکەی بەرزدەکردەوە ، بۆ ئەوەی ئازاری پێغەمبەر نەدات ، ئەمەیە بەیعەتی ڕیزوان (بیعة الرضوان) ، کەخودای گەورە لە بارەیەوە ئایەتی ناردە خوارەوە: ﴿ لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ ﴾ الفتح/١٨. واتە: خودای گەورە ڕازی بوو لە ئیمانداران کاتێك لەژێر درەختەکەدا بەیعەتیان بەتۆدا.

## بەستنی پەیمانی ئاشتبوونەوەو بەندەکانی

قورەیش هەستی بەتەنگەتاوی ڕەوشەکە کرد ، بەپەلە (سهیل)ی کوڕی (عمرو) یان نارد بۆ بەستنی پەیمانەکە ، جەختیان لێ کردەوە کە دەبێت ساڵێکیتر بێنەوە بۆ ناو مەککە ، بۆئەوەی خێڵە عەرەبەکان نەڵێن بە زۆرە ملی خۆیان کرد بەمەککەدا. (سهیل) هات ، کە پێغەمبەر ﷺ بینی فەرمووی: ئەم پیاوە هات کار ئاسانیتان بۆ بکات ، مادامەکی ئەمەیان ناردبێت کەواتە قورەیش سوڵحی پێ خۆشە. (سهیل) هاتو قسەی زۆری کرد ، هەردوولا ڕێکەوتن لەسەر ڕێسا سەرەکیەکانی پەیمانەکە ، کە بریتین لە:

١. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسوڵمانەکاندا ئەمساڵ دەگەڕێنەوەو ناڕۆنە مەککەوە ، ساڵی داهاتوو دێنەوە دەڕۆنەوە مەککەو سێ ڕۆژ دەمێننەوە ، چەکی سواریان پێبێت و شمشێر لەکێلاندا بێت ، نابێت قورەیش بەهیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێ بگرێت.

٢. وەستاندنی جەنگ لەنێوان هەردوولادا بۆماوەی دە ساڵ ، ژیان و ماڵی خەڵکی تیایدا پارێزراو بێت و کەس دەست درێژی نەکاتە سەر کەسی تر.

٣. هەرکەسێك دەیەوێت ببێتە هاوپەیمانی محەممەد ئازادە هەر کەسێکیش دەیەوێت ببێتە هاوپەیمانی قورەیش ئازادە ، هەرخێڵێکیش پاڵ دەدات بە هەر لایەکەوە دەبێتە بەشێك لەو لایەنە، توشی هەر دەستدرێژیەك ببێت دادەنرێت بەدەست درێژی بۆ لایەنە گەورەکە.

٤. هەر پیاوێك بەبێ پرسی خاوەنەکەی بڕواتە لای محەممەد ـ واتە هەڵبێت ـ دەبێت محەممەد بیداتەوە بە قورەیش ، هەرکەسێکیش لای محەممەدەوە ڕابکات بۆ لای قورەیش ئەوا نادرێتەوە بە محەممەد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ (علی) بانگ کرد بۆ ئەوەی پەیمانەکە بنوسێت .

پێی فەرموو بنووسە: (بسم الله الرحمن الرحیم).

(سهیل) وتی: ئێمە نازانین مانای (رحمن) چیە ، بنوسە (باسمك اللهم) .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە (علی): بنوسە (باسمك اللهم) .

پاشان علی نووسی: لەسەر ئەم پەیمانە محەممەدی پێغەمبەری خوا ڕێکەوت لەگەڵ (سهیل)دا.

(سهیل) وتی: ئەگەر باوەڕمان وابویە کە تۆ پێغەمبەری خوایت ، ڕێگەمان لێ نەدەگرتی بۆ چوونە ناو بەیتەوەو شەڕمان لەگەڵدا نەدەکردیت ، بنووسە (موحەممەد)ی کوڕی (عبدالله).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با ئێوەش بەدرۆم بخەنەوە من هەر پێغەمبەری خوام . بەڵام فەرمانی فەرموو بە (علی) کە بنوسێت (موحەممەد)ی کوڕی (عبدالله)و وشەی (رسول الله) بکوژێنێتەوە ، (علی) نەیکوژاندەوە ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی کوژاندیەوە.

پاشان پەیمانەکە تەواوکرا کە مۆرکرا خێڵی (خزاعة) چوونە ناو هاوپەیمانی پێغەمبەرەوە ﷺ، لەسەردەمی (عبد المطلب)یشەوە هاوپەیمانی (بنی هاشم) بوون، هەروەکو لە سەرەتا ئاماژەمان پێکرد ، بۆیە هاتنە ناو ئەم هاوپەیمانێتیە ، ئەمەش درێژەپێدانی ئەو پەیمانە کۆنە بوو، خێڵی (بنوبکر)یش چوونە هاوپەیمانیی قورەیشەوە.

## گێڕانەوەی (أبی جندل)

لەکاتی نوسینی نوسراوەکەدا (أبوجندل)ی کوڕی (سهیل) بەکۆتو زنجیرەکەیەوە خۆی کرد بەناو موسوڵماناندا ، لەبەشی خوارووی مەککەوە دەرچوو بوو ڕای کردبوو هەتا مەدینە نەوەستابوو ، (سهیل) کە (ابوجندل)ی بینی . وتی بە پێغەمبەر ﷺ ئەمە یەکەم کەس دەبێت کەداوای دەکەمەوە بەپێی پەیمانەکە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هێشتا تەواومان نەکردوە. (سهیل) وتی: وەڵڵاهی هەرگیز دادبینیت لەلا ناکەم ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مۆڵەتم بدەرێ بابێتە ناومانەوە. (سهیل) وتی: وەڵڵاهی ڕێگەی نادەم بێتە ناوتانەوە. فەرمووی: داوات لێ دەکەم بماندەرەوە. وتی: شتیوا ناکەم

ئەنجا (سهیل) شەپازلەیەکی کێشا بەدەمو چاوی (ابا جندل)دا ، بەرۆکی گرت و بەدوای خۆییدا ڕایکێشا تا بیباتەوە بۆلای موشریکان ، (ابو جندل) بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەرێ موسوڵمانینە ئێوە ڕازین من بگێڕرێمەوە بۆ ناو موشریکان و لە ئاینەکەم وەرمگێڕنەوە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو فەرمووی: (ابا جندل) ئارام بگرەو چاوەڕوانی پاداشتی خوابە ، خوا یاربێت ، خوای گەورە چارەسەرێك بۆ تۆو هاوڕێکانت دەدۆزێتەوە . ئێمە تازە بەڵێنو پەیمانمان بەستووە لەگەڵ ئەواندا پەیمانی ئاشت بوونەوەمان بەستوە ، ئێمە ئەو وادەیەمان پێداون ، ئەوانیش بەڵێنیان بەئێمە داوە ، نابێت پەیمانشکێنیان لەگەڵدا بکەین.

(عمر) هەستایە سەرپێو بەپاڵ (ابی جندل)ەوە دەڕۆیشتو پێی دەوت: (ابو جندل) ئارام بگرە، ئەوانە موشریکن، خوێنیان وەك خوێنی سەگ وایە. کلکی شمشێرەکەی لێ نزیك کردەوە ، (عمر) دەڵێت: ئاواتم دەخواست شمشێرەکەی منی بفڕاندایەو بیدایە لەملی باوکی ، (ابوجندل) بەزەیی بەباوکیدا هاتەوەو ، ئەو ئاواتەی (عمر)یش نەهاتە دی.

## قوربانی کردن و سەرتاشین بۆ خۆکردنەوە لە عومرە

کە پێغەمبەر ﷺ لە نووسینی پەیمانەکە بووەوە فەرمووی: هەستن ، قوربانی بکەن . دوای سێ جار دووبارە کردنەوەش هەر هەڵنەستان ، کە کەس هەڵنەستا ئەنجا تەشریفی چووە ژوورەوە بۆ لای (أم سلمه) باسەکەی بۆ گێڕایەوە کە خەڵك چیدەکەن ، (أم سلمه) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ئەگەر تۆ ئەوەت پێ خۆشە ، هەستە بچۆ دەرەوە ، لەگەڵ کەسدا قسە مەکە تا قوربانیەکەی خۆت سەردەبڕیت ،

ئەنجا بانگ بکە با سەرت بۆ چاك بکەن . پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هەستاو چووە دەرەوە قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد تا ئەو کارەی کرد ، قوربانیەکەی سەربڕی و سەرتاشەکەی بانگ کرد سەری تاشی ، کە موسوڵمانەکان ئەوەیان بینی هەموویان هەستان قوربانیان کردو دەستیان کرد بەتاشینی سەری یەکتری ، خەریکبوو لە خەمو پەژارەدا یەکتری خوێناوی بکەن ، وشترو مانگای حەوت ساڵەیان سەربڕی ، پێغەمبەر ﷺ وشترێکی سەربڕی کاتی خۆی هی (ابا جهل) بوو لوتەوانەیەکی زیوی لە لوتدا بوو ، بۆ ئەوەی ڕقی موشریکەکان هەستێنێت ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار دوعای خێری کرد بۆ ئەوانەی سەریان تاشیو یەکجاریش بۆ ئەوانەی کورتیان کردەوە ، هەر لەو سەفەرەدا بوو خوای گەورە ئایەتی سەبارەت بە (کعب)ی کوڕی (عجرە) ناردە خوارەوە کە تایبەتە بەفیدیەی ئازار (أذى)، بۆ ئەو کەسانەی بەهۆی (ڕۆژوو) یان (سەدەقە) یان (نسك) سەریان تاشی .

## نەگێڕانەوەی ژنانی ئیمانداری کۆچکەر

پاشان چەند ژنێکی ئیماندار هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و کەسوکاریان لەسەر دەقی پەیمانەکە هاتن بەدوایاندا تابیاندەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبوو، بە بەڵگەی بوونی وشەیەك کە لەپەیماننامەکەدا نوسرابوو دەڵێت: (بەمەرجێك هەر پیاوێکی ئێمە هات بۆلای تۆ ، با لەسەر ئاینەکەی تۆش بێت دەبێت بۆمان بگێڕیتەوە)[1]. بۆیە ڕاستەوخۆ ژنان نەکەوتنە بەردەقی ڕێکەوتننامەکە. ئایەتیش لەبارەیانەوە هاتەخوارەوە ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا إذَا جَاءَكُمْ الْمُؤْمنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ﴾ تاگەیشتە ئایەتی ﴿ بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ ﴾ ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ژنانەی تاقیکردەوە تابزانێت ئیماندارن یان نەء ، بەم ئایەتە ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَيُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا ﴾... هتد. هەرژنێك دانی بنایە بەم مەرجانەدا ، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو: ئەوا بەیعەتم پێدایت. پاشان نەیدەگێڕانەوە بۆ موشریکان. بەوجۆرە پیاوە موسوڵمانەکان ژنە کافرەکانی خۆیان تەڵاقدا، لەو ڕۆژەدا (عمر) دووژنی هەبوو موشریك بوون هەردووکیانی تەڵاقدا ، (معاویە) یەکێکیانی خواست و، ئەویشیان شووی کرد بە (صفوان)ی کوڕی (أمیە).

---

[1] / صحيح البخاری ١/٣٨٠

## چی لە بەندەکانی پەیماننامەکە هاتە کایەوە

ئەمە بریتی بوو لە پەیمانی حودەیبیە ، بە لێکدانەوەی بەندەکانیو ورد کردنەوەی پێشینەی ئەو پەیمانە فەتحێکی گەورە دەردەکەوێت بۆ موسوڵمانەکان ، چونکە پێشتر قورەیشیەکان دانیان نەدەنا بەموسوڵمانەکاندا ، بەڵکو ئامانجیان ڕیشە کێش کردنی موسوڵمانەکان بوو ، چاوەڕوان بوون ڕۆژێك لە ڕۆژان کۆتایی تەمەنیان ببینن و ، بە هەموو توانایەکەوە هەوڵیاندەدا بانگەوازی ئیسلام شکست پێ بهێنن و لەخەڵکی دووربخەنەوە بەو سیفەتەی کە خۆیان بەنوێنەری سەرمەشقەیەتی ئایینی و تەختی دونیایی لەدورگەی عەرەبدا، تەنها بادانەوەیەکیش بەلای ئاشتبوونەوەدا مانای دانپیانان دەگەیێنێت بەموسوڵمانەکانداو ، ئەومانایە دەبەخشێت کە قورەیش ناتوانێت بەرەنگاری موسوڵمانەکان بکات ، پاشان بەندی سێیەمی پەیماننامەکە ئەوە دەگەیەنێت کە قورەیش سەر دەستەیەتی دونیاییو دەستەڵاتە ئاینیەکەی لەبیر چووەو جگە لە بەرژەوەندی خۆی هیچی تری مەبەست نیە ، خۆ ئەگەر خەڵکانی ترو پاشماوەی خەڵکی دوورگەی عەرەبی هەموویان موسوڵمان بن قورەیش بەلایەوە گرنگ نیە ، بەهیچ جۆرێك خۆی لەوە ناگەیەنێت. ئایا ئەمە شکستێکی تەواو نیە بۆ قورەیش؟ سەرکەوتنێکی گەورەو ڕوون نیە بۆ موسوڵمانەکانیش؟ ئەو جەنگە خوێناویانەی لەنێوان موسوڵمانانو بێباوەڕاندا ڕوویان دابوو- سەبارەت بە موسوڵمانەکان - ئامانج تیایدا ماڵ تالآن کردن و مرۆڤ کوشتنو خەڵك لەناو بردن نەبوو ، یان بۆ زۆر بۆ هێنانی دوژمن نەبوو تا موسوڵمان ببێت ، بەڵکو مەبەست لەو جەنگانە بریتی بوو لە دابینکردنی ئازادی تەواو بۆ خەڵك لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕو ئایندا ﴿ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ واتە: کێ باوەڕ دەهێنێت با باوەڕ بهێنێت و کێ نایەوێت با کافر بێت. بۆ ئەوەی هیچ هێزێك نەکەوێتە نێوان ئەوان و بیروباوەڕەکەیانەوە، ئەو ئامانجەش بەهەموو پێداویستیەکانەوە هاتەدی و بەڕێگەیەکیش کە هەرگیز ناکرێت لە ڕێگەی شەڕو شۆڕەوە ئەو سەرکەوتنە گەورەیە تۆمار بکرێت موسوڵمانەکانیش بە دابین کردنی ئەو ئازادیە سەرکەوتنی گەورەیان لەبواری بانگەوازدا بەدەست هێنا ، لەکاتێکدا پێش وەستانی شەڕ ژمارەی موسوڵمانەکان نەدەگەیشتە سێ هەزار کەس ، کەچی لە ماوەی دوو ساڵدا لەو کاتەدا کە فەتحی مەککە کرا ژمارەی موسوڵمانەکان دە هەزار کەس بوون.

بەندی دووەمی پەیمان نامەکەش بریتی بوو لە بەشی دووەمی ئەو فەتحە گەورەیە، خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَهُمْ بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ دەرچوونی مەفرەزەی موسوڵمانەکانیش بۆ بەئاگا هێنانەوەی قورەیش بوو لەملهوڕیی و دژایەتی کردنی ئاینی خوداو ئاکامی خراپی ئەو ڕێبازەیان ، موسوڵمانەکانیش هەوڵیاندەدا وەکو یەك بن ، هەریەکەیان بەپێی تواناو لێهاتنی خۆی کاربکات چونکە ڕێکەوتن لەسەر وەستانی جەنگ بۆماوەی دە ساڵ سنوور دانانێکە بۆ ئەو سەرسەختیی و سنوور شکێنیەو بەڵگەیە لەسەر شکست هێنانی ئەو لایەنەی شەڕی دەستپێکرد.

خۆ ئەوە بەندی یەکەمیش سنووردانانە بۆ ڕێگەگرتنی قورەیش لە چوونە ناو (بیت الحرام) . ئەوەش شکستێکی تر بوو بۆ قورەیش ، لە پەیمانەکەدا شتێکی تێدا نەبوو ئاوی دڵی قورەیش بدا جگە لەوەی کە سەرکەوتوو بوو لەوەدا کە نەیهێشت موسوڵمانەکان بۆ ئەو ساڵە بڕۆنە (بیت الحرام)ە وە.

قوریش ئەو سێ کەلێنەی‌دا بەدەستەوە بۆ موسوڵمانەکان و لە بەرابەریدا یەك کەلێنی دەستکەوت ، ئەویش خاڵێکە لە بەندی چوارەمدا هاتووەو زۆر بێ نرخەو بەهایەکی وای نیەو زیانێکی ئەوتۆی بە موسوڵمانان نەدەگەیاند ، دیارە کە موسوڵمان مادامێکی بەموسوڵمانەتی مابێتەوە هەرگیز لە خوداو پێغەمبەرەکەی ڕاناکاتو ، لە شاری ئیسلامەتی هەڵنایەت ، لەکاتێکدا ڕادەکات کە بەنهێنی یان ئاشکرا هەڵگەڕابێتەوە لە ئیسلام ، خۆ ئەگەر هەڵگەڕابێتەوە ئەوە موسوڵمانان پێویستییان پێی نیە، جیابوونەوەشی لە کۆمەڵگای ئیسلامی باشترە لە مانەوەی تیایدا ، ئەمەش ئەوخاڵە بوو پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد بە فەرموودەی: هەرکەسێك لە ئێمە بڕواتە لای ئەوان خوا لەوەولاتری ببات[1]. ئەو کەسەش خەڵکی مەککەیەو موسوڵمان دەبێت با نەشتوانێت پەنا بهێنێت بۆ شاری مەدینە. خۆ زەوی خوا بەرفراوانە ، ئایا خاکی حەبەشە بەرفراوان نەبوو بۆ موسوڵمانەکان لەو کاتەشدا کە حەبەشیەکان هیچیان لە ئیسلام نەدەزانی؟ ئەمە ئەو فەرمایشتە بوو کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێدا: هەرکەسێکیش لای ئەوانەوە بێت بۆلای ئێمە ئەوە خوا دەرووی لێ دەکاتەوە[2].

---

[1] / صحيح مسلم ( باب صلح الحديبية ) ٢/١٠٥.

[2] / هەمان سەرچاوە.

وەرگرتنەوەی نۆ موسوڵمانەکان ئەگەر بەڕواڵەت سەروەریەکی تێدا بێت بۆ قورەیش ، بەڵام لەناخدا بەڵگەیە لەسەر بێزاریی و ساردبوونەوەو وەڕەس بوونی قورەیش و ترسی زۆریان لەو قەوارە بتپەرستییەی هەیانبوو ، هەروەکو هەستیان بەوە کردبێت کە خەریکە دەکەونە لێواری هەرەسێکی چاوەڕوانکراو ، پێویستە خۆیانی لێ لادەن. لەولاشەوە ڕێگەدانی پێغەمبەر ﷺ بەوەرنەگرتنەوەی نۆ موسوڵمانەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەیەوێت جێگە پێی خۆی زیاتر قایم بکات و متمانەی تەواوی بەخۆی هەیەو لەو جۆرە مەرجانە ناترسێت.

## خەمداگرتنی موسوڵمانەکان و گفتوگۆی (عمر) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ

ئەمە کرۆکی ڕاستەقینەی بەندەکانی شەڕ وەستانە، بەڵام دوو دیاردە هەبوون ، بوونە هۆی خەمو پەژارەیەکی زۆر بۆ موسوڵمانەکان ، یەکەمیان: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئێمە دەڕۆینە (بیت)و تەوافی تێدا دەکەین . ئەی بۆچی ئێستا دەگەڕێتەوەو تەوافیش ناکات؟ دووەمیان: ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ و لەسەر ڕاستیە ، خوای گەورەش بەڵێنی سەرخستنی ئاینەکەی داوە ، ئەی بۆچی فشارەکانی قورەیشی قبوڵ کردو ، موسوڵمانەکانیشی ملکەچی خاڵەکانی قورەیش کرد؟

ئەم دوو دیاردەیە گومان و دڵەڕاوکێیان لە دڵی موسوڵمانەکاندا پەیدا کرد. هەستی ئیماندارانی پێ بریندار بوو، بەشێوەیەك خەمی دواڕۆژی پەیماننامەکە موسوڵمانەکانی داگرت. لەوانەیە لەهەموویان غەمبارتر (عمر)ی کوڕی (خطاب) بووبێت ، ئەوەبوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ، ئایا ئێمە لەسەر ڕاستی نین و ئەوانیش لەسەر ناهەق؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: ئایا کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدا نین و هی ئەوانیش لە دۆزەخدا؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: کەواتە ئیتر بۆچی ملکەچی لەئاینی خۆماندا بکەین؟ بۆچی بگەڕێینەوە کە هێشتا خودا حوکمی نێوانمانی نەکردووە؟ فەرمووی: کوڕی (خطاب) من پێغەمبەری خودام و سەرپێچی فەرمانەکانی خواناکەم ، خوای گەورە پشتیوانیم دەکات و ، هەرگیز دەستبەردارم نابێت . وتی: ئەی بەڕێزت نەتفەرموو کە ئێمە دەڕۆینە (بیت)ەوەو تەوافیشی بە دەوردا دەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئایا من پێم وتیت کەئەمساڵ ئەڕۆینە بەیتەوە؟ عومەر وتی: نەخێر. فەرمووی: دڵنیابە دێیتەوە (بیت)و تەوافیشی بەدەوردا دەکەیت.

پاشان (عمر) هەستاو چوو بۆلای (ابوبكر) ، هەرچی وتبوو بە پێغەمبەر ﷺ بەویشی وت ، (ابوبكر)یش هەمان وەڵامی پێغەمبەری دایەوە ، ئەمەیشی بۆ زیاد كرد: ئەی (عومەر) دەست بگرە بەچمكی كراسەكەیەوە تا دەمریت ، وەڵڵاهی پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەق و ڕاستیە.

پاشان ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا ﴾ واتە: بەڕاستی ئێمە فەتحێكی گەورەو ڕوونمان بۆ تۆ ئەنجامدا. ئەنجا پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێن (عومەر)داو ئایەتەكانی بۆ خوێندەوە. وتی: پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئەوە فەتحە؟ فەرمووی: بەڵێ. دڵی ئارام بوەوەو گەڕایەوە.

پاشان (عمر) لە هەڵچوونەكەی خۆی پەشیمان بووە. جا دەڵێت: چەندین كارم كرد بۆ سڕینەوەی ئەو كارەم ، بەردەوام خێرم دەكردو ڕۆژووم دەگرت و نوێژم دەكردو بەندەم ئازاد دەكرد لە پای ئەو كارەدا كە لێم وەشایەوەو لە ترسی ئەو قسانەدا كردبووم ، تائاواتم خواست خێری بەدواوە بێت.[1]

## چارەسەربوونی قەیرانی ژێردەستەكان

كە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینەو ، سەقامگیر بوو تیایدا ، پیاوێكی موسوڵمان لەوانەی كە لە مەككەدا ئازاردەدران هەڵهات بۆ مەدینە ، ئەویش (ابو بصير) ی خێڵی (سيف)ی هاوپەیمانی قورەیش بوو ، موشریكان دووپیاویان نارد بەشوێنیدا بۆ لای پێغەمبەر ﷺو پێیان وت: كە لەسەر پەیمانەكە هاتووین بماندەیتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ (ابو بصير)ی پێدانەوە ، دوو پیاوەكە (ابو بصير)یان بردو گەڕانەوە تاگەیشتنە (ذي الحليفة) ، لەوێ دابەزین بۆ حەوانەوەو خورماخواردن ، (ابو بصير) بەیەكێكیانی وت: وەڵڵاهی سەیر ئەكەم شمشێرەكەت زۆرچاكە ، ئەوی تریان لەكێلانەكە دەری هێناو ، وتی: بەڵێ زۆر چاكە ، من چەند جارێك تاقیم كردۆتەوە. (ابوبصير) وتی: ئادەی پیشانم بدە باسەیرێكی بكەم. كابرای پێ خستە ژێرو بە شمشێرەكە كوشتی. ئەوی تریشیان ڕایكردو گەڕایەوە بۆ مەدینە ، بەڕاكردن خۆی كرد بەناو مزگەوتدا ، كە پێغەمبەر

---

[1] بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە ، فتح الباري ٤٣٩/٧ تا ٤٥٨ ، صحيح البخاری ٢٧٨/١ ، ٢٧٩ ، ٢٨٠ ، ٢٨١ ، ٢٩٨/٢ ، ٦٠٠ ، ٧١٧ ، صحيح مسلم ١٠٤/٢ ، ١٠٥ ، ١٠٦ ، ابن هشام ٣٨٠/٢ تا ٣٢٢ ، زاد المعاد ١٢٢/٢ ، ١٢٣ ، ١٢٤ ، ١٢٥ ، ١٢٦ ، ١٢٧ ، مختصر سيرة الرسول ﷺ شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل٢٠٧ ، تا٣٠٥ ، تاريخ عمر بن الخطاب ، نوسینی (ابن الجوزی) ل٣٩،٤٠.

ﷺ لە دوورەوە بینی فەرمووی: ئەو کابرایە شتێکی لێ بەسەر هاتوە. کە گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: هاوڕێکەمی کوشت ، منیش ئەکوژرێم. ئەنجا (ابو بصیر) پەیدابوو وتی: پێغەمبەری خوا ، ئیدی خوا ئێمەی لەسەر ئەستۆی تۆدا لابرد ، ئەوە ئێمەت گێرایەوە بۆ لایان‌و خوای گەورە لە دەستیان ڕزگاری کردم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دایك ڕۆڵە ڕۆی بۆ بکات ، ئەم پیاوە کەسێکی تری لەگەڵدا بێت شەڕ هەڵئەگیرسێنێت. کە (ابو بصیر) گوێی لەم قسەیە بوو تێگەیشت کە دەیداتەوە دەست مەککەیەکان ، بۆیە لەوێ دەرچوو تاگەیشتە (سیف البحر). لەولاشەوە (ابوجندل)ی کوڕی (سهیل) لە دەست موشریکەکان هەڵهات‌و پەیوەندی کرد بە (ابو بصیر)ەوە ، وای لێهات هەر کەسێك لەناو قوڕەیشدا موسوڵمان بوایە خۆی دەگەیاندە (ابو بصیر) ، تا گروپێکیان لێ دروست بوو ، هەر بیانبیستایە کاروانێکی قوڕەیش بەرەو شام بەڕێوەیە ئەمان ڕێگەیان پێ دەگرت‌و دەیانکوشتن‌و ماڵ‌و سامانەکەیان بەتاڵانی دەبرد ، قوڕەیش بە ناچاری خەڵکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و تکای خزمانەیان لێ کرد کە ئەوانە بهێنێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی‌و هەر کەسێك پەیوەندی پێیانەوە کرد نەگەڕێتەوە ژیانی سەلامەت دەبێت. ئیتر پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوایاندا‌و هەموویان گەڕانەوە بۆ مەدینە.[١]

## موسوڵمان بوونی پاڵەوانەکانی قوڕەیش

لە سەرەتاکانی ساڵی (٧)ی کۆچیدا پاش ئەم شەڕ وەستانە (عمرو)ی کوڕی (عاص)و (خالد)ی کوڕی (ولید) و (عثمان)ی کوڕی (طلحة) موسوڵمان بوون ، کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە مەککەیە جگەرگۆشەکانی خۆی خستە بەردەستان[٢].

---

[١] / هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[٢] / ڕاوبۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ساڵی موسوڵمان بوونی ئەو هاوەڵانە، زۆرینەی سەرچاوەکانی تایبەت بەناوی کەسێتیەکان ئەڵێن ساڵی هەشتەمە، بەڵام بەسەرهاتی موسوڵمانبوونی (عمرو)ی کوڕی (عاص) لای نەجاشی دیارەو ئەزانرێت، (خالد) و (طلحة)ش کاتێك موسوڵمان بوون کە (عمرو) لە حەبەشە گەڕایەوە دوای ئەو گەڕانەوەیە کەوتەڕێ بەرەو مەدینەو ئەمان لەڕێگەدا بینییان‌و، هەرسێکیان چونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ موسوڵمان بوون ، ئەوەش ئەو مانایە ئەگەێنێت کە لە سەرەتاکانی ساڵی (٧)ی کۆچیدا موسوڵمان بوون . (والله اعلم).

پەیمانی حودەیبیە لەسەرەتادا هەنگاوێکی نوێ بوو لەژیانی ئیسلامەتیی و موسوڵمانەکاندا ، قورەیش کە بەهێزترین دەسەڵات و سەرسەخترین دوژمنی ئیسلام بوو ، بە پاشەکشە کردنی ئەو هێزە گەورەیە لە مەیدانی شەڕو ئامێز گرتنەوەی بۆ هێمنیی و ئاشتی ، بەهێزترین باڵ لە هەر سێ باڵی ئەحزاب تێکشکا - (قورەیش) و (غطفان) و (جولەکە) - کە قورەیش نوێنەری بتپەرستان بوو ، توندوتیژی بتپەرستانی پێ کەم بووە لە دورگەی عەرەبیداو ورەیان ڕووخا ، بۆیە دوای ئەو پەیمانە نابینین (غطفان) شەڕ فرۆشی بکات ، ئەوەی هەبوو تەنها لەلایەنی جولەکەی خەیبەرەوە دەکرا.

جولەکەش لەدوای دەرکردنیان لە(یثرب) خەیبەریان کردە حەشارگەی فێڵ و تەڵەکەو پیلانگێڕی ، شەیتانەکانیان لەو قەڵایەدا زاووزێیان دەکردو ئاگری شەڕیان هەڵدەگیرساندو عەرەبە دەشتەکیەکانی دەوری مەدینەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەگێڕایەوەو بەنیازی لەناوبردنی پێغەمبەر ﷺو موسوڵمانەکان بوون ، یان هیچ نەبێت زیانێکی گەورەیان پێ بگەیێنن ، لەبەرئەوە یەکەم هەنگاوێکی یەکلاکەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ بردیە پێشەوە ، بریتی بوو لە ئەنجامدانی شەڕێکی یەکلاکەرەوە دژ بە ئەو حەشارگەی پیلان و ئاشووبگێڕیە.

ئەم قۆناغی شەڕوەستان و پەیمان بەستنەش دەرفەتێکی باشی دا بە موسوڵمانەکان ، بۆ بڵاو کردنەوەو گەیاندنی بانگەوازی ئیسلامیی ، بۆیە چالاکی موسوڵمانەکانیش دوو ئەوەندە زیادی کرد ، چالاکیەکانیشیان لەم ڕووەوە زیاتر خستە سەر لایەنی سەربازی ، بۆیە ئەم قۆناغە دەکەین بە دوو بەشەوە:

١. چالاکی لەبواری بانگەوازدا ، یان نامە نوسین بۆ پاشاو میرەکان.

٢. چالاکی سەربازیی.

پێش ئەوەی باسی چالاکیە سەبازییەکان بکەین لەم قۆناغەدا ، دەچینە سەر باسی نامە نوسین بۆ پاشاو میرەکان ، چونکە بانگەوازی ئیسلامیی لە پێشترە ، بگرە ئەمە ئەو مەبەست و ئامانجەیە کە موسوڵمانەکان لەپێناویدا توشی ئەو هەموو ئازارو چەرمەسەریە بوون.

## نامە نووسین بۆ پادشاو میرەکان

لەکۆتاییەکانی ساڵی شەشەمدا کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبیە گەڕایەوە نامەی نوسی بۆ پاشاکان و تیایدا بانگی کردن بۆ ئیسلامەتی.

کە ویستی نامە بنوسێت بۆ ئەو پاشایانە عەرزی کرا:

هەر نامەیەك مۆری لەسەر نەبێت ئەوان وەری ناگرن ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی زیوی لە دەست کردو ئەم نەخشەی لەسەر هەڵکەند : (مُحَمَّدٌ رَسُول الله) ، نەخشەکەش سێ دێڕ بوو، ( **محمد** ) یەك دێڕ ، ( **رسول** ) یەك دێڕ ، ( **اللــه** ) یەك دێڕ ، بەم شێوەیە: ( **مُحَمَّـدٌ رَسُول اللــه** ) .[1]

لەنێو هاوەڵەکانیدا چەند کەسێکی شارەزاو وریای هەڵبژارد بۆ ناردنی نامەکان و ، ناردنی بۆلای پاشاکانی دونیا ، عەلامە شێخ (المنصور فوری) لەسەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو نێرراوانەی لەسەرەتای مانگی (موحەڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچی) دا ناردووە پێش دەرچوونی بۆ خەیبەر بەچەند ڕۆژێك[2]. ئەمەش دەقی ئەو نامانەو ئاکامەکانیشیانە.

## ١ـ نامە بۆ (نەجاشی) پادشای حەبەشە

نەجاشی ناوی (أصحمه)ی کوڕی (ابجر) بوو ، پێغەمبەر ﷺ بە(عمرو)ی کوڕی (أمية)ی (ضميری)دا نامەیەکی لە(کۆتایی ساڵی شەشەم) یان (موحەڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچی)دا بۆ نووسی. (طبري) دەقی نامەکەی باسکردوە، بەڵام سەیر کردنێکی وردی نامەکە دەردەکەوێت کەئەوە دەقی ئەو نامەیە نیە کە لەدوای سوڵحی حودەیبیە نووسیویەتی، پێدەچێت ئەو نامەیە بێت کە بە (جعفر)دا ناردویەتی ئەو کاتەی خۆی و هاوەڵەکانی کۆچیان کرد بەرەو حەبەشە لە سەردەمی مەککەدا ، چونکە لەکۆتایی نامەکەدا باسی ئەو کۆچەرانەی بەم دستەواژەیە کردووە : (ئەوا (جعفر)ی ئامۆزام و چەند کەسێکی ترم لە موسوڵمانان نارد بۆ لاتان ، ئەگەر هاتنە لات داڵدەیان بدەو ئازاریان مەدە) . (بیهقی)یش لە (ابن اسحاق)ەوە باسی دەقی نامەیەك دەکات کە پێغەمبەر ﷺ بۆ (نەجاشی) نوسیوەو دەڵێت: (ئەمە نامەیەکە لەموحەمەدی پێغەمبەرەوە بۆ نەجاشی (أصحم) گەورەی حەبەشە، سڵاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت، باوەڕ بهێنە بەخواو پێغەمبەرەکەی ، شایەتومان بهێنە کەخودا

---

[1] / صحيح البخاري ٢/٨٧٢ ، ٨٧٣.

[2] / رحمة للعالمين ١/١٧١.

یەکەو هاوەڵی نیە ، نە هاوڕێی هەیەو نە ڕۆڵە ، هەروەها شایەتی بدە کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە ، بەبانگەوازی ئیسلام بانگت دەکەم ، من پێغەمبەری خودام موسوڵمانبە سەلامەت دەبیت ، ﴿ قُلْ يَاأَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللَّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ خۆ ئەگەر ملکەچ نەکەیت ئەوا گوناهی هەموو نەسرانیەکانی گەلەکەت لە ئەستۆی تۆدایە.

توێژەری پایەبەرز دکتۆر (حميدالله باريس) دەقی نوسراوێکی هێناوە ، کە پێش ماوەیەك دەستی کەوتوە ـ هەروەکو (ابن قيم)یش هێناویەتی بەجیاوازی تەنها یەك وشە ـ دکتۆر ئەرکی زۆری کێشاوە تاگەیشتوە بەو ئەنجامەو سوودی لەداهێنانە نوێیەکانیش وەرگرتووە ، وێنەی نامەکەشی لەکتێبەکەیدا هێناوە بەم شێوەیە:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴾

لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ نەجاشی گەورەی حەبەشە ، سڵاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت کەوتووە ، پاشان: سوپاسگوزاری خودا دەکەم ، ئەو خوایەی کە ( مَلِك ) و ( قُدّوس ) و ( مُؤمن ) و ( مُهَيمن ) ەوە. هیچ هاوەڵی نیە ، شایەتی دەدەم کە (عیسا)ی کوڕی (مريم) (روح) و (كلمه)ی خوایەو بەخشیوویەتی بە (مريم)ی پاکداوێنی ڕەوشت بەرزو دووگیان بە (عیسی) ، هەروەکو ئادەمی بەدی هێنا ، من ئەم بانگەوازە دەکەم بۆلای یەکتایی خوداو سووربوون لەسەر گوێڕایەڵی کردنی، داوات لێدەکەم شوێنم بکەوە ، باوەڕ بهێنە بەو پەیامەی بۆ من هاتووە ، من پێغەمبەری خوام ﷺ ، ئەوە من خۆت و سەربازەکانت بانگ دەکەم بۆلای خوا ، من پەیامەکەم گەیاندو ئامۆژگاریم کرد ، مۆچیاریم قەبوڵ بکە ، سڵاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت.[1]

دکتۆری ڕێزدار جەخت دەکاتەوە کە ئەمە دەقی ئەو نوسراوەیە پێغەمبەر ﷺ بۆ نەجاشی نووسیوە لە پاش سوڵحی حودەیبیە ، دەقەکەش پاش لێوردبوونەوە گومانی تێدانیە کەبەڵگەیە ، بەڵام بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەوەی ئەو نوسراوە دوای سوڵحی حودەیبیە نوسرا بێت ، ئەوەش کە (بيهقی) لە (ابن اسحاق)ەوە هێناویەتی لەو نوسینانە دەچێت کە پێغەمبەر ﷺ نوسیویەتی بۆ پادشاو میرە نەسرانیەکان لەدوای

[1] / بڕوانە کتێبی (رسول اکرم کی سیاسی زندگی) بەزمانی (ئوردو). ل۱۰۸ ، ۱۰۹، ۱۲۲، ۱۲۳، ۱۲٤ ، ۱۲٥. لە (زاد المعاد)یشدا هاتووە دەقەکە دەڵێت: (أسلم انت بدل والسلام على من اتبع الهدى) بڕوانە ( زاد المعاد ) ۳/٦۰.

حوديبييەوەو ئەم ئايەتەی تێدایە ﴿ قُلْ يَاأَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ ﴾ هتد ، هەروەها نەریتی وابوو کە لەو نووسراوانەدا ناوی (اصحمه) بەڕاشکاوی بهێنێت ، سەبارەت بەو دەقەش دکتۆر (حمیدالله) هێناویەتی ، پێم وایە دەقی ئەو نوسراوە بێت پێغەمبەر ﷺ پاش مردنی (أصحمه) نوسیویەتی بۆ جێنشینەکەی ، ئەمەش هۆی سەرەکی نەنووسینی ناوەکەی (اصحمه)یە. ئەم شێوە ڕیزکردنەش لای من بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی لەسەرنیە جگە لەو شایەتیە ناوەکیانەی مانای دەقی نوسراوەکان دەیدات بەدەستەوە. سەیر ئەوەیە دکتۆر (حمیدالله) جەخت دەکات لەسەر ئەوەی گوایە ئەو دەقەی (بیهقی) هێناویەتی لە (ابن عباس)ەوە، دەقی ئەو نامەیەیە کە پێغەمبەر ﷺ دوای مردنی (أصحمه) نوسیویەتی بۆ جێنشینەکەی ، لەکاتێکدا کە ناوی (اصحمه) بەڕوونی لەدەقی نامەکەدا هاتووە (والعلم عند الله)[1]. کە (عمرو)ی کوڕی (امیة)ی (ضمری) نامەکەی پێغەمبەر ﷺ ی دایە دەست نەجاشی ، لێی وەرگرتو خستیە سەر چاوانی و لەسەر تەخت هاتە خوارەوە بۆ سەر زەویەکە ، لەسەر دەستی (جعفر)ی کوڕی (ابو طالب)دا موسوڵمان بوو ، بەو بۆنەیەوە نامەی نوسی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەمەش دەقەکەیەتی:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم ﴾

بۆ پێغەمبەری خوا ، لە نەجاشی (اصحمه)ەوە سڵاوو ڕەحمەتو بەرەکاتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا ، سڵاو لەو خوایەی کە هیچ خوایەکی تری نیە ، پاشان:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نامەیەتم پێگەیشت کە بۆت ناردبووم و باسی (عیسی)ت تێدا کرد بوو ، بە پەروەردگاری ئاسمان و زەمین ، بەئەندازەی تاڵە موویەك باسی (عیسا) جیاوازی نیە لەوەی تۆ ، ئەو بەو شێوەیە کەتۆ فەرمووتە ، لەوە تێگەیشتین کە بۆت ناردوین ، ئێمەش ئامۆزاکەتو هاوەڵەکانی تۆمان داڵدەداو لەنزیك خۆمانەوە نیشتەجێمان کردن ، بەڕاستگۆیانەو متمانەوە شایەتی دەدەم : تۆ پێغەمبەری خوایت ، بەیعەتم داوە بەئامۆزاکەتو لەسەر دەستی ئەودا خۆم دایەدەست پەروەردگاری جیهانیان.[2]

---

[1] / بۆ درێژەی ئەم باسانە بڕوانە کتێبی دکتۆر (حمیدالله) (رسول لکرم کی سیاسی زیندگی) ل١٠٨ تا١١٤، لە لاپەڕە ١٢١ تا ١٣١.

[2] / زاد المعاد ٣/٦١.

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردبوو لە نەجاشی کە (جعفر) و کۆچکەرەکانی بۆ بنێرێتەوە ، ئەویش دوو کەشتی بۆ گرتن و لەگەڵ (عمر)ی کوڕی (امیة)ی (ضمری)دا ناردنیەوە ، کە گەیشتنەوە مەدینە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو.[1]

نەجاشی لە (رەجەبی ساڵی نۆی کۆچە)دا دوای جەنگی (تەبوك) کۆچی دوایی کرد ، پێغەمبەر ﷺ خەمی بۆ خواردو نوێژی (غائب)ی بۆ کرد. کە مرد پادشایەکی تر هاتە جێگای ، پێغەمبەر ﷺ نامەی بۆ ئەویش نارد بەڵام نازانرێت موسوڵمان بوو یان نەء ؟[2]

## ٢ـ نامە بۆ (مقوقس)ی پادشای مصر

پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نووسی بۆ (جریج)ی کوڕی (متی)[3] کە شۆرەتەکەی (مقوقس)ە ، پادشای میسرو ئەسکەندەریە بوو ، بەم شێوەیە:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾

لە موحەمەدی بەندەی خوداو پێغەمبەریەوە بۆ (مقوقس) گەورەی قیبتیەکان ، سلاو لەوکەسەی لەسەر هیدایەتە، پاشان ، بەبانگەوازی ئیسلام بانگت ئەکەم، موسوڵمانبە سەلامەت ئەبیت ، موسوڵمانبە ، خودای گەورە دووجار پاداشتت دەداتەوە ، خۆ ئەگەر ملکەچ نەبوویت ئەوا ئۆباڵی هەموو قیبتیەکان لەگەردنی تۆدایە ﴿ قُلْ يَاأَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللَّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾.[4]

(حاطب)ی کوڕی (ابي بلتعة)ی هەڵبژارد بۆ گەیاندنی ئەم نامەیە ، کە (حاطب) چووە لای (مقوقس) پێی وت: پێش تۆ کابرایەك لەم وڵاتەدا بانگەشەی خوایەتی دەکرد ، خوا کردنی بەپەندی دونیاو ئاخیرەت ، تۆڵەی پێسەندو تۆڵەشی لێسەندنەوە ، تۆش پەند لەوە وەربگرە ، باکەس پەند لە تۆ وەرنەگرێت.

---

[1] / ابن هشام ٣٥٩/٢.

[2] / لەوانەیە ئەمە لەوەوە وەرگیرابێ کە ( مسلم ) لە ( انس ) ەوە ڕیوایەتی کردووە ٩٩/٢

[3] / ئەمە لەسەر ڕاو بۆچونی عەللامە (المنصور فوری) لە کتێبی (رحمة للعالمین)دا ١٧٨/١ ، دکتۆر (حمیدالله) دەڵێت: ئەو کابرایە ناوی (بنیامین) بووە، بڕوانە (رسول اکرم کی سیاسی زندگی) ل١٤١.

[4] / ئەم دەقە (ابن القیم) لە (زاد المعاد)دا باسی کردووە ٦١/٢، ئەوەش دکتۆر (حمیدالله) باسی کردووە کەوێنەی ئەو کتێبەیە ڕوونی کردوە لەهەندێك وشەدا لەگەڵ ئەم دەقەدا جیاوازی هەیە ، دەقەکە دەڵێت: (اسلم تسلم یؤتیك الله) هەروەها تێدا هاتووە (إثم القبط) لەجیاتی (إثم اهل القبط)، بڕوانە: (رسول اکرم کی سیاسی زندگی) ل١٣٦.

(مقوقس) وتی: ئێمە ئاینی خۆمان هەیە ، وازی لێ ناهێنین مەگەر بۆ ئاینێکی لەوە باشتر.

(حاطب) وتی: ئێمە بەبانگەوازی ئیسلام بانگت ئەکەین کە لەجێگەی هەموو ئاینەکانی ترە ، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بانگ کرد بۆ ئەم ئاینە قورەیش لە هەموو کەس توندتر بەرپەرچیان دایەوە ، جولەکە لە هەمووکەس زیاتر دوژمنی بوون ، نەسرانیەکان لە هەمووکەس نزیکتر بوون لێیانەوە ، سوێند دەخۆم کە مژدەدانی (موسا) بەهاتنی (عیسی) وەك مژدەدانی (عیسی) وەهایە بەهاتنی (محەمەد). بانگ کردنی تۆ بۆ لای قورئان وەکو بانگکردنی شوێنکەوتوانی تەورات وەهایە بۆ ئینجیل. هەر پێغەمبەرێکیش بەگەلێك گەیشتبێت بووە بەمیللەتی ئەو پێغەمبەرە ، پێویست بووە کە گوێڕایەڵی بکەن ، تۆش یەکێکیت لەو کەسانە بەڕۆژگاری ئەم پێغەمبەرە گەیشتویت . ئێمە لە ئاینی مەسیح قەدەغەت ناکەین ، بەڵکو فەرمانت پێ دەکەین.

(مقوقس) وتی: من وردبوومەتەوە لەپەیامی ئەم پێغەمبەرە ، بینیوومە فەرمان نادات بەشتی خراپ، ڕێگەیش ناگرێت لەهیچ کارێکی باش ، نەساحیرەو نەجادووگەری درۆزن ، لەپاڵ ئەوەشدا من بەڵگەی پێغەمبەرایەتیم تێدا بینیوە بە دەرخستنی نهێنیەکان و هەواڵدان بە شتە پەنامەکیەکان ، لێم بوەستە بیرێکی لێ دەکەمەوە.

ئەنجا نامەکەی لێ وەرگرت وخستیە ناو دەفرێکی عاجەوە، مۆری کردو دایە دەست کەنیزەکێکی خۆی و پاشان نوسەرێکی بانگ کردو بە عەرەبی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ :

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾

بۆ محەممەدی کوڕی عبدالله لە (مقوقس) گەورەی (قبط)ە وە ، سلاوت لێ بێت ، پاشان ، نوسراوەکەتم خوێندەوە ، لەوە تێگەیشتم کە تێیدا باست کردووەو بانگی بۆ دەکەیت، دەشزانم کە پێغەمبەرێك ماوەو بەڕێوەیە ، پێم وابوو کە لەشامەوە دەربکەوێت. ڕێزم گرت لەنێرراوەکەت . دوو کەنیزەکت بۆ دەنێرم ، کە لەناو قیبتیەکاندا پلەوپایەیان هەیە ، لەگەڵ جل و بەرگدا ، هێسترێکیشم بۆ ناردیت تاسواری بیت ، جارێکیتر سلاوت لێ بێت.

لەوە زیاتر هیچی نەوت و موسوڵمانیش نەبوو، دوو کەنیزەکەکەش (ماریە)و (سیرین) بوون ، هێسترەکەش ناوی (دلدل) بوو ، تا سەردەمی (معاویە)ش هەر مابوو[1] ، پێغەمبەریش ﷺ (ماریە)ی کردە کەنیزەکی خۆیو هاوسەریو (ابراهیم)ی لێ بوو ، (سیرین)شی دا بە (حسان)ی کوڕی (ثابت)ی (انصاري).

## ٣ـ نامە بۆ (کیسرا) ی پادشای فارسەکان

هەروەها پێغەمبەر ﷺ نامەی نووسی بۆ کیسرای پادشای فارسەکان ، بەم شێوەیە:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾

لە موحەممەد پێغەمبەری خوداوە بۆ کیسرای گەورەی فارسەکان ، سڵاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت و باوەڕدەهێنێت بە خوداو پێغەمبەرەکەی و شایەتیدەدا کە جگە لە (الله) خودایەکی تر نیەو موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەرێتی ، من بەبانگەوازی خودایی بانگت دەکەم ، من پێغەمبەری خودام بۆ هەموو خەڵك ، تا زیندوان بێدار بکەمەوەو بەهانەش بەدەست کافرانەوە نەهێڵێت ، موسوڵمانبە سەلامەت دەبیت ، خۆ ئەگەر ملکەچ نەکەیت ئۆباڵی گوناهی هەموو ئاگرپەرستان لە ئەستۆی تۆدایە.

ئەم نامەیەشی دایەدەست (عبدالله)ی کوڕی (حذافة)ی (سهمی) ، دایەدەست لێپرسراوی (بحرین) ، جانازانین لێپرسراوی (بحرین) بەیەکێك لە پیاوەکانی خۆیدا ناردی یان (عبدالله)ی (سهمی) نارد ، هەرکامێکیان بێت کە نامەکە خوێنرایەوە بۆ کیسرا دڕاندی ، بە لەخۆبایی بونێکەوە وتی: چۆن دەبێت بەندەیەکی بێبەها لە ڕەعیەتەکەی خۆم ناوی خۆی لەپێش ناوی منەوە بنووسێت ؟

کە ئەو هەواڵە گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا موڵك و دەسەڵاتی لەناو بەرێت. هەرواش بوو ، کیسرا نامەیەکی نووسی بۆ (بازان)ی سەرکاری لە یەمەن و پێی وت: دوو پیاوی جەربەزەی خۆت بنێرە بۆ ئەو پیاوەی لە حیجازەو بۆم بهێنە. (بازان) دوو پیاوی خۆی ناردو نامەیەکیشی پێدا ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ و تیایدا فەرمانی دابوو بەپێغەمبەر ﷺ کە لەگەڵ هەردوو پیاوەکەیدا بڕوات بۆلای کیسرا. کە گەیشتنە مەدینەو بەپێغەمبەر ﷺ گەیشتن یەکێکیان وتی: شاهانشاه (پادشای شاهان) نامەی نووسیوە بۆ شابازان و فەرمانی پێداوە کەتۆی بۆ بەرێت،

---

[1] / زادالعاد ٣/٦١.

ئێمەشی ناردوە تا لەگەڵمان بێیتو، هەڕەشەشیان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدان سبەینێ بێنەوە.

لەو کاتەدا ئاشووبێك هەستابوو دژ بە کیسرا لەناو بنەماڵەکەی خۆیدا پاش ئەوەی سەربازەکانی کیسرا لەبەردەم سوپای قەیسەردا تێك شکابوون (شیرەوەیهی) کوڕی کیسرا باوکی خۆی کوشت و دەستی گرت بەسەر موڵکەکەیدا بۆ خۆی، ئەم ڕووداوە لەشەوی سێشەممە پاش تێپەڕبوونی دە ڕۆژدا بوو بەسەر مانگی (جماد الاولی) ی ساڵی حەوتەمی کۆچی)دا.[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی بە وەحی پێگەیشت ، کە سبەینێ هاتنەوە ئەم هەواڵەی پێدان ، وتیان: تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟ ئێمە کەمتر لەم قسەیەشمان پێ قەبوڵ نەدەکرا ، ئایا ئەمەشت لەبارەوە بنووسین و بیدەین بەپادشای گەورە؟ فەرمووی : بەڵێ ئەم هەواڵەی لەبارەی منەوە پێبدەن و پێی بڵێن: ئەم ئایین و دەسەلاتەی من دەگاتە ئەو شوێنەی کیسرای پێگەیشتوە! لەو شوێنەدا کۆتایی دێت کە سم وناڵی ئەسپی نەگاتێ و پێیشی بڵێن: ئەگەر موسڵمان ببێت هەرچیەك لەژێر دەستیدایە دەیدەمەوە بەخۆتو دەتکەمەوە بەمیری ڕۆڵەکانی گەلەکەت ، هەردوو پیاوەکە بەبیستنی ئەو وتانە گەڕانەوە و هەواڵەکەیان دا بە(بازان) ، زۆری پێنەچوو هەواڵی کوژرانی (کیسرا) گەیشت ، لە نامەیەکدا کە (شیرەوەیهی) نووسیبوی بۆ بازان تیایدا وتبووی: چاوەڕوانی ئەو پیاوە بکە کە پێشتر باوکم نامەی لەبارەوە بۆ نووسیبویت ، جارێ لەسەری بوەستە هەتا فەرمانی منت پێ دەگات . ئەمە بووە هۆی موسڵمان بوونی بازان و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە فارسەکانی ولاتی یەمەن .[2]

## ٤ ـ نامە بۆ قەیسەری پادشای ڕۆمەکان

بوخاری لەمیانەی فەرموودەیەکی درێژدا دەقی ئەو نامەیەی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ناردویەتی بۆ (هەرقل)ی پادشای ڕۆمەکان، ئەمەش دەقەکەیەتی:

﴿ بِسْمِ اللــــهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ ﴾

لە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوداوە بۆ (هەرقل) گەورەی ڕۆمەکان ، سلاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت، موسوڵمانبە سەلامەت دەبیت،

---

[1] / فتح الباري ٨/١٢٧.

[2] / محاضرات تاريخ الامم الاسلامية للخضري ١/١٤٧ ، فتح الباري ٨/١٢٧، ١٢٨ ، هەروەها بڕوانە : (رحمة للعالمين)

موسڵمانبە خودای گەورە دووچەندانە پاداشتت دەداتەوە، ئەگەر ملت نەدا ئەوا گوناهی هەموو ئەریسییەکان لەگەردنتایە ﴿ قُلْ يَاأَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَاوَبَيْنَكُمْ أَلاَّنَعْبُدَ إِلاَّاللَّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾[٢].

بۆ گەیاندنی ئەم نامەیە (دحیە)ی کوڕی (خلیفە)ی (کلبی) هەڵبژارد ، فەرمانی پێدا کە بیداتە دەست گەورەی (بصری) تائەویش بیداتە دەست (هرقل) ، بوخاری لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە کە (ابو سفیان)ی کوڕی (حرب) هەواڵی پێداوە جارێکیان (هرقل) دەنێرێت بە شوێنیاندا ، ئەمان لەکاروانێکی بازرگانیدا دەبن لەشام ، ئەوکاتە بووە کەمۆڵەتی وەستانی شەڕەکە والأکرابوو، (ابو سفیان)و گرۆهەکەی چوون بۆلای (هرقل) لە(ئیلیاء) بوو[٣] (هەرقل) بانگی کرد بۆ دیوەخانی خۆی‌و هەموو گەورەکانی ڕۆمی بەدەوردا بوو، بانگی کردن‌و وەرگێڕێکی بانگ کرد و وتی: کێ لەئێوە لەهەمووتان خزمایەتی نزیکترە لەو پیاوەوە کە دەڵێت من پێغەمبەرم؟

(ابو سفیان) وتی : من ، وتم : من لە هەموویان نزیکترم .

(هەرقل) وتی : خۆی و هاوەڵەکانیم لێ نزیك بکەنەوە ، با لەپشتیەوە بوەستن ، پاشان وتی بە وەرگێڕەکەی: من دەمەوێت پرسیار لەو پیاوە بکەم لەبارەی ئەو پیاوەوە کە دەڵێت من پێغەمبەرم ، ئەگەر درۆی لەگەڵدا کردم بەدرۆی بخەنەوە ، (ابو سفیان) دەڵێت: لە شەرمی ئەوەدا نەبوایە کە دەترسام بەدرۆم بخەنەوە درۆم بەدەمەوە دەکرد.

پاشان وتی: یەکەم پرسیار لێی کردم ئەوە بوو: ئەم پیاوە ڕەچەڵەك‌و بنەماڵەی لەناوتاندا چۆنە؟ وتم : خاوەن بنەماڵەیەکی خانەدانە .

وتی : پێش ئەو کەسی تر لەناوتاندا لەم جۆرە قسانەی ئەوی کردوە؟

وتم : نەخێر .

وتی : ئایا هیچ یەکێك لە باووباپیرانی پادشا بوون؟ وتم: نەخێر.

---

[٢] صحیح البخاری ١ /٤ ،٥

[٣] قەیسەر لەوکاتەدا لە (حمص)ەوە هاتبور بۆ (ئیلیاء) . بیت المقدس . بۆ سوپاسکردنی خوداوەند لەسەر ئەو شکستەی بەسەر فارسەکاندا هێنابووی (بڕوانە صحیح المسلم ٢/٩٩). پێشتر فارسەکان (پەروێز)ی کیسرایان کوشتبو، سوڵحیان لەگەڵ ڕۆمەکاندا کردبوو لەسەر پێدانەوەی هەموو ئەوخاکوزەویانەی لەوڵاتی قەیسەردا داگیریان کردبوو، ئەوخاچەشیان بۆگێڕابونەوە کەنەسرانیەکان دەڵێن گوایە (مەسیح)ی لەسەر خاچ دراوە ، قەیسەر هاتبور بۆ ئیلیا و(بیت المقدس) لەساڵی (٦٢٩)ی زاینیدا واتە (ساڵی حەوتی کۆچی) بۆئەوەی خاچەکە لەشوێنی خۆیدا دابنێتەوەو سوپاسی خوابکات لەسەرئەو سەرکەوتنە گەورەیە.

وتی : ئایا سەردەستەو گەورەکانتان شوێنی کەوتوون یان ژێردەست و لاوازەکانتان ؟ وتم: ژێردەستەکان.

وتی : ئایا زیاد ئەکەن یان کەم دەکەن؟ وتم: زیاد ئەکەن .

وتی : ئایا دوای باوەڕهێنان بەئایینەکەی کەس لێی وەڕس دەبێت و پەشیمان ببێتەوە؟ وتم : نەخێر .

وتی: ئایا پێش ئەم حاڵەتەی پێشتر ئێوە درۆتان لێ دیوە؟ وتم: نەء .

وتی: ئایا پەیمانشکێنی دەکات؟

وتم: نەء . ئێمە ئێستا لەگەڵیدا شەڕمان وەستاندوەو ناشزانین چی دەکات تیایدا .

وتی: هیچ وشەیەکی دیکەم نەدی غەیری ئەم وشەیە شتی لەدڵدا دروست بکات

وتی: شەڕتان لەگەڵدا کردوە؟ وتم: بەڵێ

وتی: چۆن شەڕتان لەگەڵدا کردووە ؟

ابو سفیان دەڵێت وتم : شەڕ بە نۆبە بووە جارێك ئێمە سەرکەوتوین و جارێکیش ئەو

وتی: بەچی فەرمانتان پێ دەدات؟

وتم: دەڵێت تەنها خوداپەرستن ، هاوەڵی بۆ پەیدامەکەن ، واز لە قسەی باوو باپیرانتان بهێنن ، فەرمانمان پێدەدات بەنوێژو دەستو دەم پاکی و پەیوەندی خزمایەتی.

(هرقل) وتی بەوەرگێڕەکە: پێی بڵێ لەبارەی باوان و ڕەچەڵەکیەوە پرسیارم لێ کردیت وتت: خاوەن بنەماڵەو خانەدانە ، پێغەمبەرانیش لەناو خانەوادەوە بنەماڵەو گەلەکانیاندا دەنێرێن ، پرسیارم لێ کردیت ئایا پێشتر کەس ئەم قسانەی ئەوی گوتوە وتت: نەخێر ، وتم: ئەگەر پێشتر کەسێکی دیکە ئەم قسەیەی پێشتر کردبێت ئەوا ئەم لاسایی ئەودەکاتەوە ، پرسیارم کرد ئایا کەسێك هەیە لە باپیرانی ئەم پیاوە پادشا بووبێت ، ئەگەر لەباوو باپیرانیدا پادشا هەبوایە دەمووت: ئەم کابرایە داوای تەختی باووباپیرانی خۆی دەکات ، پرسیارم لێ کردیت ئایا پێشتر درۆتان لێ دیوە ، وتتان: نەخێر ، منیش لەدڵی خۆمدا وتم: مەحاڵە درۆ بەدەم خەڵکیەوە نەکات و بچێت درۆ بەدەم خواوە بکات، پرسیارم لێکردیت ئایا گەورەو سەردەستەکانتان شوێنی دەکەون

یان ژێر دەستەکانتان ، وتت: ژێردەستەکان شوێنی دەکەون ، هەمیشە شوێنکەوتوانی پێغەمبەران ژێردەستەکان بوون ، پرسیارم لێ کردیت: ئایا زۆرتر دەبن یان کەم دەبنەوە ، تۆ وتت: زۆر دەبن ، ئیمانیش بەو شێوەیە هەتا تێرو تەواو دەبێت ، پرسیارم لێ کردیت ئایا پاش چوونە ناو ئایینەکەی کەسی لێ وەڕس دەبێت و پەشیمان ببنەوە؟ وتت: نەخێر، ئیمانیش بەو شێوەیەیە هەتا بەتەواوی خۆشیەکەی دەچێتە دڵەوە ، پرسیاریشم لێکردیت فەرمان بەچی دەدات؟ وتت: فەرمانمان پێ دەدات بە یەك خوا پەرستیو هاوەڵدانەنان بۆ خوداو وازهێنان لە بتپەرستیو فەرمانمان دەدا بە نوێژ کردن و دەم ودەست پاکی و خۆنەگەر ئەم قسانە ڕاست بن ئەوا ڕۆژێك لە ڕۆژان دەگاتە ئەم جێگە پێیەی منیش ، وامدەزانی لەناو ئێوەدا نەبێت ، نەمدەزانی کە لەناو ئێوەدا دەرکەوتوە ، خۆ ئەگەر بمزانیایە دەتوانم بچمەلای هەڵپەم دەکرد بۆ بینینی ، ئەگەر لەگەڵیدا بومایە قاچەکانیم بۆ دەشۆرد. پاشان بانگی کرد نامەکەی پێغەمبەریان بۆهێنا ﷺ و خوێندیەوە ، کە لەخوێندنەوەی نامەکە بوەوە ، بوو بەدەنگە دەنگو گەڕەلاوژێ ، فەرمانیدا کراینە دەرەوە ، لەکاتی کردنەدەرەوەیاندا وتم بەپیاوەکانی: بەراستی فەرمانی (ابن ابی کبشە) ی بەجێ هێنا ، ئەو پیاوە پادشای (بنی الأصفر)یش لێی دەترسێت ، متمانەی تەواوم پەیدا کرد بەکارەکەی پێغەمبەر ﷺ و گومانم نەبوو کە سەردەکەوێت تاخوای گەورە ئیسلامەتی خستە دڵمەوە.[1]

(ابو سفیان) ئەم کاریگەریەی نامەکەی پێغەمبەرمان ﷺ بەسەر (هەرقل)ەوە بۆ دەگێڕێتەوە ، کاریگەریەکە ئەوەندە زۆر بوو خەڵاتی (دحیە)ی کوڕی (خلیفە)ی (کلبی) کرد بەپارەو جلوبەرگ ، کە (دحیە) گەڕایەوە گەیشتە (مسمی) لە ڕێگەدا چەند کەسێکی خێڵی (جذام) ڕوتیان کردەوەو هیچیان پێ نەهێشت ، (دحیە)ش پێش ئەوەی بڕواتەماڵێ چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی پێدا ، پێغەمبەر ﷺ خێرا (زید)ی کوڕی (حارثة)ی بە پێنج سەد پیاوەوە نارد بۆ (حسمی) لەپشت (وادی القری) وەیە ، (زید) دای بەسەر خێڵی (حزام)دا ، کوشتارێکی زۆری لێ کردن و مەڕو ماڵاتو ژنەکانی هێنان، هەزار وشترو پێنج هەزار سەر مەڕ بوو لەگەڵ سەد کەنیزەکدا.

لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و خێڵی (جذام)دا دۆستایەتی هەبوو ، خێرا (زید)ی کوڕی (رفاعە)ی (جذام)یی کە یەکێك بوو لەسەرانی ئەو خێڵە ناڕەزایی دەربڕی لای پێغەمبەر ﷺ ، چونکە پێشتر خۆی و چەند پیاوێکی تری خێڵەکە موسڵمان بوو

---

[1] / صحيح البخاري ١/ ٤ ، صحيح مسلم ٢/ ٩٧ ، ٩٨، ٩٩.

بوون و لەکاتی ڕاووڕووت کردنەکەشدا پشتیوانیان لە (دحیە) کردبوو ، پێغەمبەر ﷺ ناڕەزاییەکەی وەرگرت و فەرمانیدا بەگێڕانەوەی دەستکەوت و کەنیزەکەکان.

زۆرینەی (سیرەت) نووسەکان پێش سوڵحی حودەیبیە باسی ئەم سریەیە دەکەن ، ئەمەش هەڵەیەکی ڕوونە ، گومانی تێدانیە کە ناردنی نامە بۆ قەیسەر دوای سوڵحی حودەیبیە بوو ، لەبەرئەوە (ابن قیم)یش دەڵێت: بێ گومان کە ئەم ڕووداوە دوای سوڵحی حودەیبیە بووە.[1]

## ٥ ـ نامە بۆ (منـذر) ی کوڕی (ساوی)

پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ (منذر)ی کوڕی (ساوی) فەرمانڕەوای (بحرین)و تیایدا بانگی کرد بوو بۆ ئیسلام ، نامەکەشی بە (علاء)ی کوڕی (حضرمی)دا بۆ نارد ، (منذر)یش نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەمە دەقەکەیەتی: (پاشان ، پێغەمبەری خوا ، من نامەکەی بەڕێزتانم خوێندەوە بەسەر خەڵکی بەحرەیندا ، هەندێکیان حەزیان لەئیسلام کردو پێیان خۆش بوو باوەڕیان پێهێنا ، هەندێکیشیان حەزیان لێی نەبوو ، لەخاکی مندا ئاگر پەرست و جولەکە هەن ، لەو بارەیەوە فەرمانی خۆتم پێ بفەرموو). ئەنجا پێغەمبەر ﷺ نامەی بۆ نووسی:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾ ،

لە موحەممەد پێغەمبەری خواوە بۆ (منذر)ی کوڕی (ساوی) ، سلاوت لێ بێت ، سوپاسی ئەو خودایە دەکەم کە جگە لە خۆی کەس خودا نیە ، شایەتی دەدەم موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە ، پاشان من یادی خودات وەبیر دەخەمەوە ، هەرکەسێك ئامۆژگاری بکات ئەوە بۆ خۆیەتی ، هەرکەسێکیش گوێڕایەڵی نێراوەکانم بێت ئەوە گوێڕایەڵی فەرمانی منی کردوە ، هەرکەسێك وتەی باشیان لەگەڵدا بڵێت ئەوە باشی لەگەڵ منیشدا گوتوە ، نێرراوەکانم بەچاکی باسی تۆیان بۆ کردوم ، من تۆم کرد بەتکاکاری گەلەکەت ، واز لە موسڵمانەکان بهێنە با لەسەر ئیسلامەتی خۆیان بمێنەوە ، لە گوناهکارەکانیشیان خۆش بووم لێیان قەبوڵ بکەو تاکو چاکەی زیاتر بکەیت ئێمە لەسەرکاری خۆت دەتهێڵینەوە ، هەرکەسێکیش لەسەر ئایینی جولەکە یان ئاگرپەرستی دەمێنێتەوە ئەوە پێویستە لەسەری (جزیە) بدات.[2]

---

[1] / بڕوانە (زاد المعاد) ٢/١٢٢ ،پەراوێزی (تلقیح مفهوم اهل الاثر) ل ٢٩.

[2] / زاد المعاد ٣ / ٦١ ،٦٢ ئەو دەقەش (د. حمیدالله) هێناویەتی لە وێنەی ئەو کتێبەوە کەدەستی کەوتوە ، لەیەك وشەدا جیاوازە ، تیایدا هاتوە (لا اله غیره) لەجیاتی (لا اله الا هو).

## ٦ـ نامە بۆ ( هوذة )ی کوڕی ( علی ) سەرۆکی ( یەمامە )

پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نووسی بۆ (هوذة)ی کوڕی (علی) سەرۆکی یەمامە ، ئەمە دەقەکەیەتی:

﴿ بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴾

لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ (هوذة)ی کوڕی (علی) سڵاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت ، بزانە کە ئەم ئایینە تا سمو ناڵی ئەسپ بڕ بکات دەڕوات ، موسڵمانبە سەلامەت دەبیت ، موڵك‌و دەسەڵاتی خۆتت بۆ دەهێڵمەوە.

(سلیط)ی کوڕی (عمرو)ی (عامری) هەڵبژارد بۆ گەیاندنی ئەم نامەیە ، کە (سلیط) نامە مۆرکراوەکەی پێغەمبەری دایە دەستی ، میوانداری کردو ڕێزی لێ گرت ، نامەکەی بۆ خوێندەوە ، وەڵامی دایەوەو نامەی نووسی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و تیایدا وتبووی: (ئەمەی تۆ بانگی بۆدەکەیت چەندە جوان و شیرینە ، منیش هەموو عەرەب لە پلەوپایەکەم سڵ دەکاتەوە ، هەندێك دەسکەوتم بدەرێ شوێنت دەکەوم) . خەڵاتێکیشی دا بە (سلیط)و لە ڕست‌و چنینی (هجر)یش جلوبەرگی دایە ، ئەمانەی هێنایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی پێدایەوە ، پێغەمبەر ﷺ نامەکەی خوێندەوەو فەرمووی : ئەگەر داوای بستێك زەویشم لێ بکات نایدەمێ ، موڵك‌و ماڵی لەناو دەچێت . کە پێغەمبەر ﷺ لە (فەتح) بووەوە ، (جبریل) هەواڵی دایە کە (هوذة) مردوە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : لەم یەمامەیەدا کابرایەکی درۆزن پەیدا دەبێت بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەکات ، دوای من دەکوژرێت. یەکێك وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کێ دەیکوژێت ؟ فەرمووی : تۆو هاوەڵەکانت ، هەرواش بوو.[1]

---

[1] / زادالمعاد ٦٣/٣.

## ٧ـ نامە بۆ (حارث) ی کوڕی (أبی شمر) ی (غسانی) گەورەی (دیمەشق)

پێغەمبەر ﷺ نامەی بۆ نووسی:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾

لە موحوممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ (حارث)ی کوڕی (أبی شمر)، سلاّو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت کەوتوەو ئیمانی پیّهێناوەو متمانەی پێکردوە، بانگت دەکەم کە باوەڕ بهێنی بە تاكو تەنهایی خودای بیّ هاوتا، موڵكو دەسەلاّتەکەت بۆ دەمێنێتەوە.

(شجاع)ی کوڕی (وهب)ی هەڵبژارد لەخێڵی (بنی اسد)ی کوڕی (خزیمة) بۆ ناردنی ئەم نامەیە، کە نامەکەی گەیاندبووە دەستی وتبووی: کیّ دەتوانێت موڵكو دەسەلاّت لە من بسێنێت؟ من دەڕۆمە سەر ئەو، موسڵمان نەبوو.[1]

## ٨ ـ نامە بۆ پادشای عومان

پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نوسی بۆ پادشای عومان (جیفر)و (عبد) هەردوو کوڕی (جلند) ئەمەش دەقەکەیەتی:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾

لە موحەممەدی کوڕی عبداللە وە بۆ (جیفر)و (عبد) هەردوو کوڕی (جلند)، سلاّو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت، پاش ئەوە، من بانگتان دەکەم بۆ سەر ئایینی ئیسلام، هەردوکتان موسڵمان بن سەلامەت دەبن، من پێغەمبەری خودام بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بۆ ئەوەی زیندوان بێدار بکەمەوەو کافرانیش بەدەردی خۆیان بچن، ئێوە ئەگەر دان بەئیسلامدا بنێن لەشوێنی خۆتان دەتانهێڵمەوە، ئەگەر ملکەچ نەکەن بۆ ئیسلام ئەوا موڵك و دەسەلاّتتان لەناو دەچێت و ئەسپ سوار دێتە سەرتان بۆ ئێرەو پێغەمبەرێتی منتان بۆ دەردەکەوێت.

(عمرو)ی کوڕی (عاص)ی هەڵبژارد بۆ گەیاندنی ئەم نامەیە، (عمرو) وتی: دەرچووم تا گەیشتمە (عومان)، مەبەستم گەیشتن بوو بە (عبد)، چونکە ئەو لە براکەی ژیرترو هێمنتر بوو، وتم: من نێرراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ لای تۆو براکەت، وتی: براکەم لە من گەورەترە لە تەمەن و دەسەلاّتیشدا، من دەتگەیەنمە لای ئەو هەتاکو نامەکەت دەخوێنێتەوە.

---

[1] / هەمان سەرچاوە ٦٢/٣، محاضرات تاريخ الامم الاسلامية للخضرى ١٤٦/١.

پاشان وتی: بانگەواز بۆچی دەکەیت؟

وتم : بانگەواز دەکەم بۆ یەکتایی خودای بێ شەریك و وازهێنان لە بتپەرستیی و شایەتی بدەیت کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە.

وتی: ئەی (عمرو) تۆ کوڕی پیاو ماقوڵی گەلەکەتی، باوکی تۆ چیکرد؟ ئێمە ئەو دەکەینە دەم ڕاستی خۆمان.

وتم: مردو باوەڕی نەهێنا بە ئایینەکەی پێغەمبەر ﷺ ، حەزم دەکرد باوەڕی پێ بهێنایەو موسڵمان ببوایە ، منیش لەسەر باوەڕەکەی ئەو بووم ، تاخوا هیدایەتی دام.

وتی: لەکەیەوە شوێنی کەوتی؟ وتم: ماوەیەکی کەمە . پرسیاری لێکردم لەکوێ موسڵمان بویت ؟ وتم: لەلای نەجاشی موسڵمان بووم ، هەواڵیشم دایە کە نەجاشی موسڵمان بووە . وتی: کە نەجاشی موسڵمان بوو گەلەکەی چیان لێکرد.

وتم: پێی ڕازی بوون و شوێنی کەوتن .

وتی: ئەی کەشیش و چلەکێشەکانیان شوێنی کەوتن ؟

وتم : بەڵێ .

وتی: (عمرو) بزانە چی دەڵێیت ، چونکە لە درۆ خراپتر نیە لە دنیادا.

وتم: درۆم نەکردوەو درۆکردنیش لەئایینی ئێمەدا گوناهە .

پاشان وتی: وابزانم (هەرقل) بە موسڵمانبوونی نەجاشی نەزانیوە .

وتم: بەڵێ زانیویەتی . وتی: بەچیدا دەزانیت؟

وتم: نەجاشی باجی دەدا بە (هەرقل)، کە موسڵمان بوو، باوەڕی هێنا بە موحەممەد ﷺ، وتی: وەڵڵاهی لەمەودوا یەك درهەم نانێرم بۆ (هەرقل)، قسەکە گەیشتەوە بە (هەرقل) ، (نیاق)ی برای پێی وت: ئاوا بەم ئاسانیە وازدەهێنیت لە کۆیلەیەکی خۆت کە باجت بۆ نانێرێت و باوەڕی بەئایینێکی نوێ هێناوە؟

(هەرقل) وتی: کابرایەکەو حەزی لەو ئایینە کردوەو بۆ خۆی هەڵیبژاردوە ، چی لێ بکەم؟ وەڵڵاهی ترسی لەدەستچوونی دەسەڵاتەکەم نەبوایە منیش وەکو ئەوم دەکرد. (عبد) وتی: ئەی (عمرو) بزانە چی دەڵێیت؟

منیش وتم: وەڵڵاهی ڕاستگۆم لەگەڵتدا .

پاشان وتی ئەو پیاوە فەرمانی چیتان پێدەدات؟

وتم: فەرمان دەدا بەگوێڕایەڵی خواو یاخی نەبوون لێی و فەرمان دەدا بەچاکەو پەیوەندی خزمایەتی و ڕێگە نادا بەزوڵم و دەستدرێژی و شەرواڵ پیسیی و مەی خواردنەوەو بتپەرستی و خاچپەرستی.

وتی: ئەمە چەند جوانە بانگی بۆ دەکات ، ئەگەر براکەم بەگوێی بکردمایە ئێستا سواردەبووین و باوەڕمان بەموحەممەد ﷺ دەهێنا، بەڵام جێگەی داخە براکەم ترسی لە دەستچوونی موڵکەکەی هەیەو حەزیش ناکات بەدوای کەسەوە بێت .

وتم: ئەگەر ئەو موسڵمان ببێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکاتەوە پادشای گەلەکەی خۆی . بۆئەوەی سەدەقە لەدەوڵەمەندەکان وەربگرێت و بیداتەوە بەهەژارەکانی ، وتی: ئەم ڕەوشتە چەندە جوانە ، ئەی سەدەقە چیە؟

منیش هەواڵم پیَدا ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خێرو بێر چی سەپاندوە بەسەر ساماندا تاگەیشتمە باسی وشتر.

وتی: ئەریَ (عمرو) لەو ئاژەڵانەشمان کە دەلەوەڕێنرێن و تێر ئاو دەکرێن؟

وتم: بەڵیَ .

وتی: وەڵڵاهی باوەڕناکەم گەلەکەم بەهۆی دووری ماڵەکانیان و زۆریانەوە بەرگەی ئەو داوایە بگرن .

(عمرو) دەڵێت: چەند ڕۆژێك چاوەڕوانیم کرد، ئەم پیاوە هەواڵی منی دەگەیاند بەبراکەی، پاشان ڕۆژێکیان داوای کردم چوومە ژوورەوە بۆلای سەیرم کرد.

وتی: چیت دەوێت ، منیش نامەیەکی مۆر کراوم دایەو کردیەوە ، هەمووی خوێندەوە تاگەیشتە کۆتاییەکەی ، پاشان دایە دەست براکەی ئەویش تاکۆتاییەکەی خوێندەوە ، بەڵام تێبینیم کرد براکەی نەرمو نیانتر بوو .

وتی: هەواڵم بدەریَ بزانم قوڕەیش چیان کرد؟

وتم: شوێنی کەوتون ، هەندێکیان بەحەزی خۆیان و هەندێکیشیان لە ترسی شمشێر .

وتی:کێی لەگەڵدایە؟ وتم: خەڵك شوێنی کەوتون و ئەویان پیَ باشترە لە هەرکەسێکی تر، بە عەقڵ زانیان کە لەپێشتر لە گومڕایی و سەرلێشێواویدا بوون و باوەڕیان پیَ هێناوە ، نابینم جگە لە تۆ کەسێکی دیکە لێرەدا مابێتەوە ، خۆ ئەگەر

تۆش موسڵمان نەبیتو شوێنی نەکەویت ، بەخوا ئەسپ سوار دەگەنە سەرت و تەرو وشکت کاول دەکەن ، بۆیە موسڵمانبە تا سەلامەت بیت ، دەتخاتەوە سەرکارەکەی خۆتو ئەسپو ولاخیش نایەنە سەرت .

وتی: وازم لیٚ بهێنە ، سبەینیٚ وەرەوە.

گەڕامەوە بۆلای براکەی وتی: (عمرو) ئومێدەوارم موسڵمان ببێت ، ئەگەر لە موڵکەکەی نەترسێت ، بۆ سبەینیٚ هاتەوە چوومەوە لای ، ڕێگەی نەدا بڕۆمە ژورەوە ، چووم براکەییم هێنا . وتم: نەمتوانیوە بڕۆمە ژورەوە بەڵکو بمگەیەنیتەوە لای .

وتی: بیرم کردەوە لەوەی بانگت بۆ کردم ، ئەگەر من لاوازترین کەسی عەرەبیش بم یەك پیاویشم بەدەوردا نەمێنێت ، ئەسپ سواری ئەو ناتوانێت بگاتە من ، ئەگەر بگەنە ئێرە شەڕێکی وای لەگەڵدا دەکەین کە نەی دی بێت .

وتم: باشە من سبەینیٚ دەردەچم ، کە دڵنیابوو دەرئەچمو ئەگەڕێمەوە ، لەگەڵ براکەیدا کۆبووەوە .

وتی: ئێمە چین لەچاو ئەوانەدا کە ئەو سەرکەوتوە بەسەریاندا ، نامەشی بۆ هەرکەسێك ناردبێت بەدەمیەوە چووە ، کە ڕۆژ بووەوە ناردیەوە بەشوێنمدا ، هەردووکیان موسڵمان بوون و باوەڕیان هێنا بەپێغەمبەر ﷺ و ڕێگەشیاندا سەدەقە کۆبکەمەوەو بکەومە نێوانیان و یارمەتیەکی زۆریشیان دام دژ بە سەرپێچی کەران.[1]

ڕەوتی ئەم بەسەر هاتە ئەوە دەگەیەنێت کە ناردنی ئەو نامەیە بۆ ئەم دوانە زۆر دواتر بووە لەنامەی پادشاکانی تر ، ڕاستریشە بڵێین دوای فەتح بوە.

بەم نامانە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازەکەی خۆی گەیاند بەپادشاکانی سەرزەمین ، هەندێکیان باوەڕیان پیٚ هێناو هەندێکیشیان بیٚ باوەڕ بوون ، بەلاٌم لەگەڵ ئەوەشدا سەری ئەو بێباوەڕانەی قاڵکردو ناوی خۆی و ئایینەکەشی ناسرا لە لایان.

---

[1] زاد المعاد ٦٢/٣، ٦٣

## چالاکی سەربازیی پاش پەیمانی حودەیبیە

### غەزای ( غابە ) یان غەزای ( ذی القرد )

ئەم غەزایە بریتی بوو لە ڕاونانی پۆلێك خێڵی (فزارة) کە خەریکی چەتەگەرێتی بوون لە سەرە ڕێگەی پێغەمبەری خوادا ﷺ .

ئەمە یەکەم غەزایە کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دابێت دوای سوڵحی حودەیبیەو پێش جەنگی خەیبەر ، (بخاری) لەباسێکدا دەڵێت ئەم غەزایە پێش خەیبەر بووە بە سێ ساڵ ، (مسلم)یش ئەوەی گێڕاوەتەوە بە (مسند)ی خۆی لە فەرموودەیەکی (سلمة)ی کوڕی (اکوع)ە وە ، زۆرینەی (سیرەت) نووسان دەڵێن پێش سوڵحی حودەیبیە بووە ، لە (صحیح) یشدا شتێك نیە ڕاستتر بێت لەوەی (سیرەت)ناسان دەیڵێن[1] .

پوختەی ڕیوایەتەکان لە (سلمة)ی کوڕی (أکوع)ەوەیە ، کە پاڵەوانی ئەم غەزایەیەو وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترگەلێکی لەگەڵ (رباح)ی غولامیدا ناردە دەرەوە ، منیش ئەسپەکەی (أبو طلحة)م پێبوو لەگەڵیدا بووم ، کە ڕۆژمان کردەوە سەیر دەکەین (عبدالرحمن الفزاری) داویەتی بەسەر وشترگەلەکەداو هەموویانی داوەتە بەرخۆی و شوانەکەشی کوشتوە ، وتم: (رباح) ئەو ئەسپە ببەو بیگەیەنە بە (طلحة)و هەواڵیش بدە بەپێغەمبەر ﷺ. پاشان لەسەر گردێك نووستم و ڕووم لە مەدینە بوو سێجار هاوارم کرد (یا صباحاه) پاشان چووم بەدوای ئاسەواری فەزاریەکاندا و تیرم تێدەگرتن و خۆم کەنار دەداو دەم وت:

أنا ابن الأكـــوع والیوم یوم الرضـــع .

بەردەوام بووم لە تیر هاویشتن و بریندارکردنیان ، هەر کە ئەسپ سوارێکیان بیویستایە بگەڕێتەوە دەچوومە بن درەختەکەو تیرم تێدەگرت و دەم گەڕانەوە ، تاخۆیان کرد بەناو تەنگە بەری شاخێکدا چوومە سەرشاخەکە بۆیان و بەردم بەسەردا گلۆر کردنەوە ، بەم شێوەیە بەردەوام بووم تا وشتر نەما لە وشتر گەلەکەی پێغەمبەر ﷺ نەیخەمە پشتی خۆمەوە ، ئەوان وازیان هێنا ، من هەردوایان کەوتم ، تیرم تێگرتن تا سی بوردەیان لێ بەجێماو سی ڕمیشیان لەبەر بارسووکی

---

[1] / بڕوانە (صحیح البخاری )، (باب غزوة ذات قرد )٢/٦٠٣ ، هەروەها (صحیح مسلم) باب غزوە (ذی قرد)و هیتیرش ٢ /١١٣، ١١٤ ، ١١٥ . (فتح الباری) ٧/ ٤٦٠ ، ٤٦١ ، ٤٦٢.

بەجێ هێشت، هەرچیەکیشیان بەجێ دەهێلاّ کۆم دەکردەوەو کەڵەکە بەردم بەسەرەوە هەڵدەچنی تا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵاّن بیناسنەوە ، ئەوان ڕایان کرد تاگەیشتنە تەنگەبەرێك دابەزین بۆ نان خواردن منیش بەسەر لوتکەکەیەوە دانیشتم ، چوارکەسیان بۆم سەرکەوتن ، وتم: ئێوە من دەناسن؟ من (سلمە)ی کوڕی (أکوع)م ، هەرکامێکتانم بوێت دەیکوژم، کەستان من نابینن . لە ترساندا گەڕانەوە ، لەشوێنی خۆم نەجولاّم تا ئەسپ سوارەکانی پێغەمبەرم دی ﷺ گەیشتنە ناو درەختەکان . یەکەمیان (أخرم) بوو ، بەدوای ئەودا (قتادة)و بەدوای ئەویشدا (مقداد)ی کوڕی (أسود) هاتن ، (عبدالرحمن)ی (فزاری)و (أخرم) بوو بە شەڕیان ، ئەسپەکەی (عبدالرحمن) بریندداربوو ، (عبدالرحمن) کوشتی ، ئەنجا چووە سەر ئەسپێکی‌تر (قتادة) فریای‌کەوت‌و کوشتی ، ئەوانی‌تر هەموویان ڕایانکرد ، ئێمەش بەدوایاندا من بەپێ ڕامدەکرد ، تادەمەو ڕۆژئاوا بوون لەشیوێك لایاندا ، ئاوێکی تێدابوو پێی دەوترا (ذا القرد) بۆ ئەوەی لێی بخۆنەوە ، زۆر تینوویان بوو ، لەسەری هەڵم برین نەمهێلاّ دڵۆپێکی لێ بخۆنەوە ، کاتی خەوتنان پێغەمبەر ﷺ و ئەسپ سوارەکانم پێگەیشتەوە ، وتم: پێغەمبەری خوا ئەوانە ئێستا تینوو شەکەتن ، ئەگەر سەد پیاوم لەگەڵدا بنێریت زینی هەموو ئەسپەکانیان لێ دەستێنم‌و پەت دەخەمە ملیانەوە ، فەرمووی: (ابن الاكوع) زاڵ بویت وازیان لێ بهێنە. پاشان فەرمووی: ئێستا لە (غطفان) تۆز ئەکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی چاکترین ئەسپ سوارمان (قتادة) بوو ، باشترین پیادەشمان (سلمة) بوو ، دووپشکی پێبەخشیم ، پشکی پیادەیەك و پشکی سوارێك ، لەسەر (عضباء) لە پشتی خۆیەوە دایناو و گەڕاینەوە بۆ مەدینە.

لەو غەزایەدا پێغەمبەری خوا ﷺ (ابن أم مكتوم)ی بەسەر مەدینەوە دانا ، ئالاّکەشی دایە دەست (مقداد)ی کوڕی (عمرو).[1]

[1] بڕوانە دوو سەرچاوەکەی پێشوو ، هەروەها (زاد المعاد) ٢/١٢٠.

## غەزای ( خەیبەر ) و ( وادی القری )

## لە موحەڕەمی ساڵی ( ٧ ) کۆچیدا

خەیبەر شارێکی گەورەی پڕ لەقەڵاو باخی خورماو مەزراو کشتوکاڵ بوو، لە دووری شەست یان هەشتا میلەوەیە لە شاری مەدینەو کەوتۆتە بەشی باکوریەوە ، ئێستا گوندێکەو کەش و هەوایەکی بۆگەنی هەیە.

### هـۆی غـەزاکـە

کە پێغەمبەر ﷺ دڵنیابوو لە بەهێزترین باڵەکانی سێ حیزبە پیلانگێڕەکە ، بە تەواوی پشتێنی لێیان کردەوە لە دوای شەڕ وەستانەکەوە ، ئەنجا ویستی تەمێیەکی دوو باڵەکەی تریش بکات ، کە بریتی بوون لە جولەکەو خێڵەکانی نەجد ، تا هێمنایەتیو ئاشتی بەتەواوی بەرقەرار بێت لەناوچەکەداو موسڵمانەکانیش دەستیان بێتەوە لە شەڕی خوێناوی و یەکلاببنەوە بۆ گەیاندنی پەیامی خوایی.

خەیبەریش کە حەشارگەی پیلان و نەخشەی ترسناکو مەڵبەندی شەڕ فرۆشی سەربازیی و کوانوی ئاژاوەو ئاشووبگێڕیی بوو بەلای موسڵمانەکانەوە گرنگی زیاتری هەبوو.

ئەمە حاڵی خەیبەر بوو ، لەبیریشمان نەچێت کە جولەکەی خەیبەر بوون هەموو ئەحزابیان دژ بە موسڵمانەکان کۆ کردەوەو هانی (بنو قريظة)شیاندا بۆ خیانەت کردن و پەیمانشکێنی ، پاشان دەستیان کردە پەیوەندی کردن بە دووڕووەکانی تابووری پێنجەمی کۆمەڵگای ئیسلامی غەتەفان و عەرەبە دەشتەکیەکانەوە ، کە باڵی سێیەمی هەرسێ حیزبەکە بوون ، سەرباری ئەوە خۆشیان سازدا بوو بۆ شەڕو کوشتارو بەو کارانەیان لەچەند لایەکەوە موسڵمانانیان تووشی ناڕەحەتیو کارەساتی خوێناوی کرد ، تائەوەی نەخشەیان داڕشت بۆ تیرۆرکردنی خودی پێغەمبەر ﷺ، لەو ئاقارەدا موسڵمانەکانیش ناچاربوون جارناجارە سریەو مەفرەزە بنێرنە سەریانو دەستیان لێ بوەشێننو سەری پیلانگێڕان پان بکەنەوە ، وەکو (سلام)ی کوڕی (ابی الحقيق)و (أسير)ی کوڕی (زارم). بەلام گرنگی پێدانی موسڵمانەکان بە جولەکە زۆرلەوانە گەورەتر بووە بۆیە دەستیان لێ نەدەوەشاندن چونکە دوژمنێکی سەرسەختتر لە ئارادا هەبوو کە بریتی بوو لە قوڕەیش بەرامبەر موسڵمانان وەستابوو ، کە ئەو بەرامبەر کێیە کۆتایی هات کەش و هەوا ساز بوو بۆ تەمێ کردنی ئەو تاوانبارانەو کاتی لێپرسینەوەیان نزیك بوو بووەوە.

## دەرچوون بەرەو خەیبەر

(ابن اسحاق) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای گەڕانەوەی لە حودەیبیە مانگی (ذی الحجة)و هەندێك لە مانگی موحەڕەمیش تێپەڕی لە مەدینەدا مایەوە ، هەر لە مانگی موحەڕەمدا بەرەو خەیبەر کەوتە ڕێ.

زانایانی تەفسیر دەڵێن: فەتح کردنی خەیبەر بەڵێنێکی خودایی بوو لە ئایەتدا باسکراوە ﴿ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَذِهِ ﴾ الفتح/٢٠. واتە : خودای گەورە بەڵێنی دەستکەوتێکی زۆری پێداون کە لەدوژمنانی دەستێنن، بەڵام ئەمەی بۆ پێشخستن. (واتە سوڵحی حودەیبیە)، مەبەست لەدەستکەوتە گەورەکەش خەیبەرە.

## ژمارەی سوپای ئیسلامیی

کاتێك کە دووڕووان و دەروون نەخۆشەکان لە سوڵحی حودەیبیەدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دواکەوتن ، خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرمانی‌دا بە پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ﴿ سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَى مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ قُلْ لَنْ تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِنْ قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لاَ يَفْقَهُونَ إِلاَّ قَلِيلاً ﴾ الفتح/١٥. واتە: دواکەوتەکان دەڵێن ئەگەر دەرچوون بۆ سەندنی دەستکەوت ڕێگەمان بدەن باشوێنتان بکەوین ، ئەوانە دەیانەوێت کەلامی خودا بگۆڕن ، پێیان بڵێ هەرگیز بەدواماندا نایەن ، خوای گەورەیش پێشتر وای فەرمووە ، ئەوانە دەڵێن ئێوە حەسوودیمان پێ دەبەن ، بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە کەمێك نەبێت لە هیچ تێناگەن.

کە پێغەمبەر ﷺ ویستی بڕوات بۆ خەیبەر ، ڕایگەیاند کە شەیدایانی جیهاد نەبێت نابێت کەس لەگەڵیدا بڕواتە دەرەوە ، بۆیە جگە لەو هەزارو چوارسەد کەسەی ژێر درەختەکە کەس لەگەڵیدا نەکەوتە ڕێ.

(سباع)ی کوڕی (عرفطة)ی (غفاری)ی بەسەر مەدینەوە دانا ، بەڵام (ابن اسحاق) دەڵێت : (نمیلة)ی کوڕی (عبدالله) ی (لیثی) داناوە ، پێدەچێت ڕای یەکەم لای لێکۆڵەرەوان ڕاستتر بێت.

---

[1] بڕوانە (فتح الباری) ٧/٤٦٥. (زاد المعاد) ٢/١٢٣.

لەوکاتەدا بوو (أبو هريرة) هات بۆ مەدینەو موسڵمان بوو ، چووە لای (سباع)ی کوڕی (عرفطة)ی (غفاري) لە نوێژی بەیانیدا ، کە لە نوێژەکەی بوەوە چووە لای و توێشووی ڕێگەی لێ وەرگرت ، ئەنجا چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و قسەی لەگەڵ موسوڵمانەکاندا کردو لەپشکی دەستکەوت بەشیاندا.

## پەیوەندی کردنی دووڕووان بە جولەکەوە

دووڕووان کاریان بۆ جولەکە دەکرد ، سەرکردەی دووڕووان (عبدالله)ی کوڕی (أبي) هەواڵیدا بەجولەکەی خەیبەر کە موحوممەد بەرەو ئێوە دێ ، ئاگاداربن و هیچ لێی مەترسن ، ئێوە ژمارەتان زۆرەو چەك‌و تفاقی باشتان هەیە ، کۆمەڵەکەی موحەممەدیش چەند کەسێکی پەرتەوازەی کەمن ، چەك‌و تفاقێکی کەمیان پێیە. کە خەڵکی خەیبەر بەوەیانزانی (کنانە)ی کوڕی (أبي الحقيق)و (هوذة)ی کوڕی (قيس)یان نارد بۆلای (غطفان) بۆ داوای کۆمەك ، چونکە هاوپەیمانی جولەکەی خەیبەر بوون ، دژ بە موسوڵمانەکان هەموو پیشتیوانیەکیان دەکردن . (غطفان) ئەو مەرجەیان لەسەر جولەکەی خەیبەر دانا کە ئەگەر هاتوو سەرکەوتن بەسەر موسوڵمانەکاندا نیوەی بەروبوومی خەیبەریان بدەنێ.

## ڕێگەی چوون بەرەو خەیبەر

پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆشتنیدا بەرەو خەیبەر شاخی (عصر)ی گرتەبەر ، پاشان بەرەو (صهباء)و پاشان چووە چەقێك پێی دەڵێن (رجيع) ، لەو شوێنەوە تا (غطفان) ماوەی شەوو ڕۆژێك پیادە ڕێیە ، کە (غطفان) هەواڵیان پێگەیشت ، کەوتنە ڕێ بەرەو خەیبەر بۆ یارمەتیدانی جولەکە ، کە گەیشتنە نیوەی ڕێگە دەنگوباسێك کەوتە بەرگوێیان وایان زانی موسوڵمانەکان داویانە بەسەر ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانەکەیاندا ، بۆیە خێرا گەڕانەوەو نەیانتوانی هیچ کۆمەکیەکی جولەکەی خەیبەر بکەن.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو ڕێبەری سوپاکەی بانگکرد ، یەکێکیان ناوی (حسيل) بوو ، تا گونجاوترین ڕێگەیان نیشان بدەن ، لە ڕێگەی باکورەوە - واتە لە ڕووی شامەوە - خۆیان بکەن بە خەیبەرداو نەهێڵن جولەکەی خەیبەر بەرەو شام یان خێڵی (غطفان) هەڵبێن.

یەکێك لە دوو ڕێبەرەکە وتی: من ڕێگەت نیشان دەدەم پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتەڕێ تا گەیشتە چەند ڕیانێك وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەریەکێك لەم ڕێگایانە دەکرێت بمانگەیەنێتە شوێنی مەبەست . پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدا کە

ناوی سەرە ڕێگاکانی پێ بڵێت ، ڕێبەرەکە وتی : یەکێکیان ناوی ڕێگای (حزن) ە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی نەدا لەوێوە بڕۆن. کابرا وتی: ڕێگەیەکی تریان ناوی (شاش)ە. ئەویشی ڕەت کردەوە. وتی: یەکێکی تریان ناوی (حاطب)ە. لەوێشەوە نەڕۆشت. ئەنجا (حسیل) وتی: تەنها یەك ڕێگەیان ماوە. (عمر) فەرمووی: ناوی چی‌یە؟ کابرا وتی: ناوی (مرحب)ە. پێغەمبەر ﷺ لەو ڕێگەیەوە ڕۆشت.

## چەند ڕووداوێك لە ڕێگەدا

[1]. لە (سلمە)ی کوڕی (أکوع)ەوە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا بەشەو دەرچووین بەرەو خەیبەر ، پیاوێکی ناو سوپاکە بە (عامر)ی شاعیری وت: ئەرێ شیعرێکی خۆتمان نادەی بەگوێدا ؟ (عامر) بەدەنگەوە کەوتە شیعر خوێندنەوەو وتی:

اللهم لولا أنت ما اهتدينا ولا تصدقنـــا ولاصلينا

فاغفر فداء لك ما اتقينا وثبت الأقدام إن لاقينـــا

وألقـــين سكـــينة علينا إنا إذا صيح بنا أبينـــا

وبالصياح عولوا علينا

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە کێیە ئەو شیعرە دەخوێنێتەوە؟ وتیان: (عامر)ی کوڕی (أکواع)ە. فەرمووی: خوا ڕەحمی پێ بکات. کابرایەك وتی: بەڕاستی ئەو دوعایە بووە ماڵ بەسەریەوە ، خۆزگە زیاتر لەناوماندا بوایە . هاوەڵان دەیانزانی کە پێغەمبەر ﷺ دوعای لێخۆشبوونی تایبەتی کرد بۆ هەرکەسێك شەهید دەکرێت ، ئەوەبوو لە جەنگی خەیبەردا (عامر) شەهید بوو.

[2]. لە ڕێگەدا خەڵکەکە گەیشتنە سەر دۆڵێك بەدەنگی بەرز دەستیان کرد بەوتنی (الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله). پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەمێك لەسەرخۆ بن ، ئێوە کەسێك بانگ دەکەن کە چاوو گوێی لێتانەو زۆر نزیکە .

[3]. لە (صهباء)ی نزیك خەیبەریشەوە نوێژی (عصر)ی کردو ، بانگی کرد توێشووی خواردنەکە بهێنن ، جگە لە (قاوت) شتێکی دیکەیان پێنەبوو ، فەرمانی دا دانرێت ، خۆی لێی خوارد ، موسوڵمانانیش لێیان خوارد. پاشان تەشریفی هەستاو نوێژی مەغریبی کردو کەمێك وەستا ، خەڵکەکەش وەستان ، پاشان هەستاو بێ دووبارە کردنەوەی دەست نوێژ نوێژی عیشای بۆ کردن.

---

[1] / صحيح البخاري، باب (غزوة خيبر) ٦٠٣/٢. صحيح مسلم، باب غزوة (ذي قرد)و هي‌تریش ١١٥/٢.

[2] / هەمان دوا سەرچاوە.

[3] / صحيح البخاري ٦٠٥/٢.

[4] / هەمان سەرچاوە ٦٠٣/٢.

[5] / مغازي الواقدي (غزوة خيبر) ل١١٢.

## سوپای ئیسلام بەرەو شوراکانی خەیبەر

ئەو شەوە کە بۆ سبەینێ شەڕی خەیبەری تێدا قەوما ، موسوڵمانەکان لە نزیك خەیبەرەوە شەویان کردەوە ، جولەکە هیچ هەستیان پێنەکردن ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچوایە سەر هەر کۆمەڵێك تا بەرەبەیان نزیکیان نەدەکەوتەوە ، کە بەرەبەیان بوو نوێژی بەیانی بەتاریکی کرد ، موسوڵمانان سوار بوون ، کە ڕۆژ بوەوە خەڵکی خەیبەر بەبێ ئاگایی بەپاچ و خاکەنازەوە بەرەو مەزراکانیان دەچوون ، کە سوپاکەیان بینی هاواریان کرد: ئەرێ وەڵڵا ئەوە موحەممەدە هاتە سەرمان. بەڕاکردن گەڕانەوە بەرەو شار. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الله أکبر ، خەیبەر وێران بوو ، الله أکبر ، خەیبەر وێران بوو ، هەرکاتێك چووینە مەیدانی کۆمەڵێك ، خوایە ڕۆژێکی خراپیان بەسەردا بهێنێت).[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنێکی دیاری کرد بوو بۆ سەربازگەکەی ، (حباب)ی کوڕی (منذر) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دابەزینەت لێرەدا فەرمانی خودایە ، یان هەڵوێستێکی سەربازیە؟ فەرمووی: بەڵکو ئەمە ڕاو هەڵوێستێکی سەربازییە دەکرێت قسەی تێدا بکەین . وتی: پێغەمبەری خوا ، ئەم جێگەیە لە قەڵای (نطاة)ەوە نزیکە. هەموو جەنگاوەرەکانی خەیبەر لەوێدان ، ئەوان ئێمە دەبینین و دەڕوانن بەسەرماندا ، لەکاتێکدا ئێمە ئەوان نابینین ، تیریان دەگاتە ئێمە ، بەڵام تیرەکانی ئێمە ناگاتە ئەوان. دڵنیاش نابین لەوان ، زیاد لەوە ئێمە لەناو ئەم دارخورمایانەدا بوار دەدەین شەو بدەن بەسەرماندا. ئینجا ئێرە زەویەکی فشەڵە ، ئەگەر فەرمان بدەیت لەم شوێنە خراپەوە بڕۆینە شوێنێکی‌تر. فەرمووی: ڕایەکەتم پێ باشە. ئەوەبوو چوونە شوێنێکی ترەوە.

کە نزیکبوونەوە لە خەیبەرو ڕوانیان بەسەر شارەکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بوەستن . سوپاکە وەستا. ئەم نزایەی خوێند:

﴿ اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ ، وَرَبَّ الأَرْضِينَ السَّبْعِ وَمَا أَقْلَلْنَ ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضْلَلْنَ ، فَإِنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ القَرْيَةِ ، وَخَيْرَ أَهْلِهَا ، وَخَيْرَ مَا فِيهَا ، وَنَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ هَذِهِ القَرْيَةِ ، وَشَرِّ أَهْلِهَا ، وَشَرِّ مَا فِيهَا ، أَقْدِمُوا بِاسْمِ اللهِ ﴾ .

---

[1] / صحيح البخاري، باب (غزوة خيبر) ٢/٦٠٣، ٦٠٤.

## خۆ سازدان بۆ شەڕو قەلاَكانی خەیبەر

كە شەوی پێكدادانەكە هات ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم ئالأیە دەدەمە دەست كەسێك خوداو پێغەمبەری خۆش بوێت و خوداو پێغەمبەریش ئەویان خۆش بوێت. كە ڕۆژ بووەوە هەموو هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ وەستان ، هەموویان ئاواتیان دەخواست ئالأكەی بدرێتە دەست ، فەرمووی: كوا (علی) كوڕی (أبی طالب). وتیان: پێغەمبەری خوا ، چاوی دەئێشێت . فەرمووی: بنێرن بەشوێنیدا. هێنایان. پێغەمبەری خوا ﷺ تفیدا لەچاوی و دوعای بەسەردا خوێند چاك بووەوە ، وەكو هیچ ئازارێكی نەبووبێت ، ئەنجا ئالأكەی دایەدەست، (علی) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەڕیان لەگەڵدا دەكەم تا دەیانشكێنین. فەرمووی: لەسەرخۆ بڕۆ ، تادەڕۆیتە مەیدانیان ، پاشان بانگیان بكە بۆ ئیسلام و پێیان بڵێ ئەگەر موسوڵمان ببن ماف و ئەركەكانیان چی و چۆن دەبێت ، وەڵڵاهی ئەگەر خودا بەهۆی تۆوە هیدایەتی یەك كەس بدات بۆ تۆ باشترە لە موڵكی (حمر النعم).

شاری خەیبەر دوو بەش بوو ، بەشێكیان پێنج قەلأی تێدا بوو:

١. قـەلأی (ناعم).

٢. قـەلأی (صعب)ی كوڕی (معاذ).

٣. قـەلأی (زبیر).

٤. قـەلأی (أبی).

٥. قـەلأی (نزار).

سێ قەلأی یەكەم دەكەوتنە شوێنێكەوە پێی دەوترا (نطاة) ، دوو قەلأكەی تریش دەكەوتنە شوێنێكەوە پێی دەوترا (شق).

بەشی دووەمیش بە (كتیبە) ناودەبرا ، سێ قەلأی تێدا بوو:

١. قـەلأی (قموص) ، كەبریتی بوو لەقەلأكەی (بنی ابی‌الحقیق) لەخێڵی (بنی النضیر).

٢. قـەلأی (وطیح).

٣. قـەلأی (سلالم).

لەناو خەیبەردا جگە لەو قەلأو شوورایانە هی‌تریش هەبوو، بەلأم بچوك بوون و نەدەگەیشتنە ئاستی قەلأكانی تر ، لە پتەوی و بەرزیدا.

شەڕە خوێناویەكە لەبەشی یەكەمی قەلأكاندا بوو، سەبارەت بەبەشی دووەمیش لەگەڵ بوونی ژمارەیەكی زۆری چەكدار لەناویاندا ، كەچی بەبێ شەڕ خۆیاندا بەدەستەوە.

---

١ / هەرلەبەر ئەو ئازارە بوو كەلەسەرەتادا نەیتوانی لەگەڵ سوپاكەدا بكەوێتە ڕێ و، دوایی پێیان گەیشتەوە.

٢ /صحیح البخاری (باب غزوة خیبر) ٢/٥٠٥، ٦٠٦. لەهەندێ ریوایەتدا هاتووە كەدوای ئەوەی چەندجارێ هێرشی موسوڵمانەكان شكست دەهێنێت ئەنجا ئالأكە دەدرێتە دەست (علی). بەلأم ڕاوبۆچوونی یەكەم لای لێكۆڵەرەوان پەسەندترە.

## دەستپێکردنی شەڕو ڕزگارکردنی قەڵای (ناعم)

یەکەم قەڵایەك لەنێوەندی هەموو قەڵاکاندا ، کە موسوڵمانەکان هێرشیان کردە سەری قەڵای (ناعم) بوو، چونکە ئەو قەڵایە هێڵی بەرگریی ستراتیژی یەکەمی جولەکە بوو، ئەم قەڵایە ، قەڵای (مرحب)ی پاڵەوان بوو کەزیاتر لەهەزار کەسی تێدا بوو.

(علی) کوڕی (ابی طالب) چووە بەردەم ئەو قەڵایەو بانگی جولەکەی کرد بۆ ئیسلامەتی ، ڕەتیان دایەوەو ، لەگەڵ (مرحب)ی سەرۆکیاندا کەوتنە سنگ دەرپەڕاندن ، کە هاتەدەرەوە چووە مەیدانی شەڕو بانگی کرد بۆ شەڕی یەك بەیەك. (سلمە)ی کوڕی (أکواع) وتی: کە چووینە خەیبەر (مرحب)ی سەرۆکیان شمشێرەکەی گرت بەدەستەوەو ڕای دەوەشاندو دەیوت:

قد علمت خيـــبر أني مـــرحب    شـــاكي السلاح بطـــل مـــجرب

اذا الحـــروب أقبـــلت تلـــهب

ئەوجا (عامر)ی مامم بۆی چوو دەیوت:

قد علمت خيـــبر أنـــي عـــامر    شـــاكي السلاح بطـــل مغـــامر

کەوتنە شەڕ لەگەڵ یەکدا ، شمشێرەکەی (مرحب) چوو بەناو قەڵغانەکەی (عامر)دا ، (عامر) ویستی شمشێرێکی لێبدا ، شمشێرەکەی کورت بوو نەیگەشتێ ، ویستی بیدا لە قاچی کابرای جولەکە بەری نەکەوت ، دەستی هەڵگەڕایەوەو نوکی شمشێرەکەی بەر کڵاوەی ئەژنۆی کەوتو وەفاتی کرد . پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرمووی : ئەو پیاوە دوو پاداشتی هەیە ـ لەگەڵ وتنی ئەم ڕستەیەدا هەردوو پەنجەی پێکەوە لکاند ـ ئەو پیاوە (جاهد)و (مجاهد)ەو کەم کەسی عەرەب هەیە ئەو شەرەفەی وەرگرتبێت.

دوای ئەوە جارێکیتر (مرحب) بانگەشەی کردەوە بۆ شەڕی یەك بەیەكو دەستی کرد بە خۆڕاوەشاندنو شیعر خوێندنەوە:

قد علمت خيـــبر أني مـــرحب ... هتد.

(علی) کوڕی (ابی طالب) بۆی چووە دەرەوە ، (سلمە)ی کوڕی (أکوع) دەڵێت: (علی) فەرمووی:

أنا الذي ســـمتني أمي حيـــدره    كليث غـــابات كـــريه المنظـــره

أو فيـــم بالصاع كيـــل السنـــدره

[1] / صحيح مسلم ، باب (غزوة خيبر) ١٢٢/٢، باب (ذي قرد وغيرها) ١١٥/٢، صحيح البخاري (باب غزوة خيبر) ٦٠٣/٢.

(علی) شمشێرێکی‌دا لەسەری (مرحب)و کوشتی‌و فەتح‌و ڕزگاری لەسەر دەستیدا پەیدابوو.

کە (علی) لەقەڵاکانیان نزیکبوەوە جولەکەیەك لەسەر قەڵاکەوە سەری دەرکێشاو وتی: تۆ کێیت؟ فەرمووی: من (علی) کوڕی (ابی طالب)م. کابرای جولەکە وتی: سوێندم بەو پەڕاوەی دابەزیوە بۆ سەر موسا ، ئێوە سەرکەوتن بەسەرماندا.

پاشان (یاسر)ی کوڕی (مرحب) هاتە دەرەوەو هاواری کرد: کێ دێتە مەیدانم؟

(زبیر) چووە مەیدانی.

(صفیة)ی دایکی (زبیر) خەم دایگرت‌و وتی بە پێغەمبەر ﷺ : پێغەمبەری خوا کوڕەکەم ، ئەو کوڕەکەم دەکوژێت.پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەڵکو کوڕەکەی تۆ ئەو دەکوژێت ، ئەوە بوو (زبیر) (یاسر)ی کوشت.

ئیدی شەڕێکی خوێناوی بەدەوری قەڵای (ناعم)دا بەرپابوو ، چەندین سەرکردەی جولەکەی تێدا کوژراو بەهۆیەوە ورەی جولەکە ڕووخاو نەیان دەتوانی بەری شاڵاوی موسوڵمانەکان بگرن. سەرچاوەکان دەڵێن کە موسوڵمانان لەو ڕۆژەدا بەرەنگاریەکی زۆر توند کراون ، بەڵام لەکۆتاییدا جولەکە نائومێد بوون لە وەستاندنی هێرشی موسوڵمانەکان ، وردە وردە لەم قەڵاوە بۆ قەڵای (صعب) کەوتنە ڕاکردن و هەڵاتن ، ئیتر موسوڵمانەکان قەڵای (ناعم)یان گرت.

## ڕزگارکردنی قەڵای (صعب) ی کوڕی (معاذ)

لە ڕووی هێزو پتەویەوە قەڵای (صعب) دووەمین قەڵابوو ، موسوڵمانەکان شاڵاویان بردە سەری بە سەرکردایەتی (حباب)ی کوڕی (منذر)ی (انصاری)و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئابڵوقەیاندا ، لە ڕۆژی سێیەمدا پێغەمبەر ﷺ نزایەکی تایبەتی کرد بۆ گرتنی ئەو قەڵایە.

(ابن اسحاق) دەگێڕێتەوە: کە خێڵی (بنی سهم) هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و عەرزیان کرد: بەڕاستی ماندووبووین و هیچمان بەدەستەوە نەماوە چی بکەین ؟ ئەنجا پێغەمبەری خوا نزای کرد فەرمووی: (خوای گەورە ، تۆ بە حاڵیان

---

[1] / لەنێو سەرچاوەکاندا جیاوازی هەیە لەسەر ئەو کەسەی (مرحب)ی کوشتووەو ئەو ڕۆژەی کەتیایدا کوژراو ڕۆژی گرتنی قەڵاکە، هەندێ لەجیاوازیەکن کەتوونەتە دەقە (صحیح)ەکانیشەوە، ئەم بۆچوونەمان پاش هەڵسەنگاندنی ڕاکان لە ڕیوایەتێکی بوخاریەوە وەرگرتووە.

دەزانی ، ئەمانە هێزیان لەبەر براوە ، منیش هیچم لەدەستدا نی‌یە ، بۆیان بکەم ، خوایە گەورەترین قەلاّیان بدەیتە دەست موسولّمانان ، ئەو قەلاّیەیان کە دەولّەمەند ترینیانەو زۆرترین خۆراكو گۆشتی تێدایە). ئەو ڕۆژە شالاّویان بردە سەر قەلاّکەو گرتیان ، لە هەموو خەیبەردا قەلاّی تێدا نەبوو بەئەندازەی قەلاّی (صعب) خۆراكو گۆشتی تێدا بێت.

کە پێغەمبەر ﷺ هانی موسولّمانانی‌دا بۆ هێرش کردنە سەر ئەو قەلاّیە پاش خوێندنی نزاکەی ، (بنو أسلم) لەپێشەوەی هێرش بەرەکاندا بوون ، لەبەردەم قەلاّکەدا شەڕو کوشتارێکی خوێناوی ڕوویدا ، پاشان هەر لەو ڕۆژەدا پێش خۆرئاوا بوون قەلاّکە گیرا ، موسولّمانەکان لەو قەلاّیەدا چەندین مەنجەنیق و ئاگرپڕژێن‌و کەرەستەی جەنگیان گرت.

بەهۆی برسێتی ئەو ڕۆژەوە کە لە ریوایەتەکەی (ابن اسحاق)دا هاتووە هەندێك لە ئەندامانی سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ گوێدرێژیان سەربڕی و خستیانە سەر مەنجەڵ بۆ خواردن ، کە پێغەمبەر ﷺ بەوەی زانی قەدەغەی کرد گۆشتی گوێدرێژ بخۆن.

## فەتح کردنی قەلاّی (زبیر)

پاش ڕزگارکردنی هەردوو قەلاّی (ناعم)و (صعب) ، جولەکە لە هەموو قەلاّکانی (نطاة) ڕایانکرد بۆقەلاّی (زبیر) ، ئەم قەلاّیە قەلاّیەکی پتەوی سەختە لەسەر قوللەیەکە ، مرۆڤو ئەسپ ناتوانن بەهۆی سەختیەوە پێیدا سەربکەون ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئابلّوقەیدان ، ئابلّووقەکە سێ ڕۆژی خایاند ، ئەنجا کابرایەکی جولەکە هاتو وتی: (أبو القاسم) ئەگەر تۆ لێرەدا یەك مانگی تریش ئابلّوقەیان بدەیت هیچ باکیان نی‌یەو گوێ نادەنێ ، چونکە ڕێچکەی ئاوو کانیاویان هەیە لەژێر زەویداو ، شەوانە دەردەچن و لێی دەخۆنەوەو ، دەگەڕێنەوە بۆناو قەلاّکەو بەرگریی دەکەن ، خۆ ئەگەر ئەو سەرچاوەی ئاوەیان لێ ببڕیت چۆك دادەدەن و بۆت دێنە دەرەوە. ئاوەکەیان بڕین ، هاتنە دەرەوەو شەڕێکی سەختیان کردو هەندێك لە موسولّمانەکانیشیان شەهید کرد ، دە کەسیش لە جولەکە کوژران‌و لەئاکامدا پێغەمبەر ﷺ ئەو قەلاّیەشی ڕزگار کرد.

[1] / ابن هشام (بە پوختەیی) ٢/٣٣٢.

## فەتح کردنی قەڵای ( أبـی )

پاش فەتحکردنی قەڵای (زبیر) جولەکە خۆیان کرد بە قەڵای (أبی)داو خۆیان تێدا حەشاردا ، موسوڵمانەکان ئابڵوقەی ئەویشیاندا ، دوو پیاوی جولەکە بەدوای یەکدا هاتنە مەیدانی شەڕی یەك بەیەك ، دوو پیاوی موسوڵمانیان بۆ چوو هەردووکیان کوشتن ، ئەو کەسەی پیاوە جولەکەکەی دووەمی کوشت پاڵەوانی ناودار (أبو دجانه) (سماك)ی کوڕی (خرشه)ی (انصاری) بوو کە هەموو جارێك پەڕۆ سوورەکەی بەسەریەوە دەبەست ، دوای کوشتنی ئەو جولەکەیە (أبو دجانه) بەرەو قەڵاکە ڕایکرد بۆ فەتحکردنی ، موسوڵمانەکانیش بەدوایدا هێرشیان برد ، لەناو قەڵاکە شەڕێکی خوێناویی ڕوویدا ، لەوێش هەڵیانکەندن‌و ڕایانکرد بەرەو قەڵای (نزار) کەدوا قەڵاگەی بەشی یەکەمی قەڵاکانی خەیبەر بوو.

## فەتح کردنی قەڵای ( نـزار )

ئەم قەڵایە پتەوترین قەڵای بەشی یەکەم بوو ، جولەکە متمانەی تەواویان هەبوو ، کە هەرگیز ئەو قەڵایە ناگیرێت ، باهەموو توانایەکیشیان بخەنەگەڕ لەو ڕێگەیەدا ، لەبەرئەوە لەو قەڵایەدا لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان دانیشتن ، پێشتر قەڵاکانی دیکەیان لە ژن‌و منداڵ چۆڵ کردبوو.

موسوڵمانەکان ئابڵوقەیەکی زۆر توندیان بەسەر قەڵاکەوە دانا ، بەتوندی فشاریان دەخستە سەریان بەڵام لەبەر ئەوەی قەڵاکە بەشاخێکی بەرزەوە بوو هیچ بوارێك نەبوو بۆ هێرش کردنە سەری ، جولەکەش نەیاندەوێرا لە قەڵاکە بێنە خوارەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ هێزە ئیسلامیەکەدا ، بەڵام بە تیر هاوێشتن‌و بەرد باران بەرەنگاریان دەکرد.

کە موسوڵمانەکان نەیانتوانی قەڵاکەی (نزار) بگرن ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا ئاگرپڕژێنەکان ئامادەو ساز بکرێن ، پێدەچێت چەند ئاگرکۆیەکیان هەڵدابێتە ئەو دیو قەڵاکەوەو دیوارو پایەکانیان لەرزاندبێت و چووبنە ناویەوەو، لەناو قەڵاکەدا شەڕێکی قورس ڕوویدا، جولەکە لەوێدا توشی شکستێکی خراپ هاتن، چونکە نەیان توانی لەو قەڵایە ڕاکەن بۆ قەڵایەکی‌تر، هەروەکو لە قەڵاکانی تردا ئەوەیان دەکرد، بەڵکو ئەوەی کەبۆی کرا ڕابکات هەڵات لەو قەڵایەو ژن‌و منداڵەکانی بەجێهێشت بەدوای خۆیدا.

پاش فەتحکردنی ئەو قەڵایەش بەشی یەکەمی قەڵاکانی خەیبەر فەتح کرا ، کە بریتی بوو لە دیوی (نطاة)و (شق) هەر لەو جێگەیەدا چەند قەڵایەکی بچووکی تری

تێدابوو، بەڵام جولەکە کەبینیان ئەو قەڵاسەختە گیرا ، دەستبەجی ئەو قەڵایانەشیان بەجێهێشت ، هەڵاتن بەرەو بەشی دووەمی خەیبەر.

## فەتح کردنی بەشی دووەمی قەڵاکانی خەیبەر

کە هەردووبەشی (نطاة)و(شق) فەتح کران، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپاکەیەوە ڕووی کردە خەڵکی کەتیبەو (وطیح) و (سلالم) لە قەڵاکەی (أبی الحقیق) ی خێڵی (بنی نظیر) دا ، هەرچی هەڵاتووەکانی بەشی (نطاة)و (شق) هەبوو ڕایان کردبووە ئەوێ و لەو قەڵایەدا خۆیان توند کردبوو.

(سیرەت)نووسان جیاوازیان هەیە لەوەدا ئایا لەو قەڵایانەدا شەڕ ڕووی دابێت یان نا، چونکە ڕەوتی گێڕانەوەکەی (ابن اسحاق) ڕوونە لەبارەی گرتنی قەڵای (حموص) ەوە. بگرە لەڕەوتی گێڕانەوەکەدا ئەوە دەردەکەوێت کە بەشەڕ گیرابێت و هیچ دانوستان و سوڵحێك نەبووبێت بۆ خۆبەدەستەوەدان .

(واقدی)یش ڕاشکاوانە دەڵێت: قەڵاکانی ئەم سێ بەشە پاش دانوستان گیراون، دەکرێت دانوستانەکە بۆ بە دەستەوەدانی قەڵای (حموص) بووبێت پاش ئەوجەنگە خوێناویە ، دووقەڵاکەی تریش بەبێ شەڕ دراونەتە دەست موسوڵمانان.

هەرچۆنێك بێت کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ئەم بەشە - کەتیبە - ئابلۆقەیەکی توندی سەپاند بەسەریاندا ، چواردە ڕۆژی خایاند ، جولەکە لە قەڵاکانیان نەهاتنە دەرەوە ، تاگەیشتە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەئاگرپڕژێن لێیان بدات ، کە دڵنیا بوون لە تیاچوون داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ سوڵحیان لەگەڵدا بکات.

## دانـــوستـــــان

(إبن أبی الحقیق) نامەی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ و تیایدا وتبوی: ئەکرێت دابەزمو قسەت لەگەڵدا بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ. سوڵحیان کرد لەسەر نەڕشتنی خوێنی ئەوانەی لەناو قەڵاکەدانو دەستبەردار بوونی ژنو منداڵەکان تا لەگەڵیان بڕۆنو ، خۆیانو ماڵومناڵیان ئەبێت لەخەیبەر دەرچن و جگە لەبارێك بەئەندازەی کۆڵە پشتێکی مرۆڤ هەرچی ماڵو سامانو خاكو زێڕو زیویان هەیە ، بەجێبهێڵن بۆ پێغەمبەر ﷺ .

---

[1] / ابن هشام ٢/٣٣١، ٣٣٦، ٣٣٧.

[2] / بەڵام لەگێڕانەوەکەی (ابی داود)دا موسوڵمانەکان بەڵێنیاندا ڕێگە بدەن جولەکە لەخەیبەر دەربچێت و هەرچی ماڵو سامانێك بە سواری وشتر دەڕوات لەگەڵ خۆیاندا ببەن . (بڕوانە . سنن ابی داود . باب ماجاء في حکم أرض خیبر ٢/٧٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەرچییەکم لێ بشارنەوە لە وادەو پەیمانی خوداو پێغەمبەرەکەی بێبەش بن. ئەوانیش لەسەرئەوە سوڵحیان لەگەڵدا کرد ، پاش ئەو سوڵحکردنە هەموو قەلاکان درانە دەست پێغەمبەر ﷺ و بەو شێوەیە قەلای خەیبەر فەتح کرا.

## کوشتنی ( إبن أبی الحقیق ) لەسەر پەیمانشکێنی

لەگەڵ بەستنی ئەو رێککەوتنەشدا هەردوو کوڕەکەی (ابی الحقیق) ماڵ و سامانێکی زۆریان شاردبووەوە ، بڕێکی زۆر ماڵ و خشڵی (حیی) کوڕی (أخطب) یان حەشاردابوو کە پێشتر لە دەرکردنی (بنو النضیر)دا لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆ خەیبەر.

(ابن اسحاق) دەڵێت: (کنانة)ی کوڕی (ربیع)یان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، کە گەنجینەکەی (بنو نضیر)ی لەلا بوو ، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد ، نکوڵی کرد کە بزانێت شوێنەکەی لەکوێدایە ، کابرایەکی جولەکە هات وتی: من (کنانة)م چەند جارێك دیوە بە دەوری ئەو کەلاوەیەدا بەیانیان دەهات و دەچوو ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە (کنانة): ئەگەر لەلای تۆ دۆزیمانەوە بتکوژین؟ وتی: بەڵێ. ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە هەڵکەندنی شوێنەکە. هەڵکەنرا ، هەندێك لەگەنجینەکەی تێدا دۆزرایەوە ، پاشان هەواڵی بەشەکەی تری لێ پرسی. (کنانة) هیچی نەوت. ئەنجا دایەدەست (زبیر)و فەرمووی: ئازاری بدە تا قسە دەکاتو شوێنی ئەوەکەی ترمان پێدەڵێت. (زبیر) ئەڵقەیەکی کردە ملی (کنانة)و چووە سەرسنگی تەنگە نەفەسی کرد ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دایەدەست (محمد)ی کوڕی (سلمه)و لەجیاتی (محمود)ی کوڕی (مسلمە)دا دای لە ملی (ئەم محمودە لەژێر قەلای ناعمدا لەپاڵ دیوارێکدا وەستا بوو جولەکە جەنجەرێکیان دابوو بەسەریدا وەفاتی کردبوو).

(ابن قیم)یش دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەکوشتنی هەردوو کوڕەکەی (ابی الحقیق) ئەو کەسەش دانیناا بەدەستی ئەم دووانەدا لە شاردنەوەی گەنجینەکەدا ئامۆزای (کنانة) بوو.

(صفیة)ی کچی (حیی) کوڕی (أخطب) بەکۆیلەیی هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ ژنی (کنانة)ی کوڕی (أبی الحقیق) بوو، تازە بووك بوو.

---

[1] / زاد المعاد ٢/١٣٦.

## دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ

پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی جولەکە لە خەیبەریش دەربکات ، وتیان: ئەی موحەممەد، ڕێگەمان بدە با لەم زەویەدا بمێنینەوەو چاکی بکەین‌و ، سەروکاری دەکەین ، ئێمە لە ئێوە باشتر زەویەکە دەناسین. پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانیش کوڕانێکی وەهایان نەبوو سەروکاری ئەو زەویانە بکات ، بۆیە خەیبەری دایەوە بەجولەکە بە مەرجێك لەهەر زەویەکدا نیوەی بەروبومەکەیان هەبێت ، (عبدالله)ی کوڕی (رواحة)ی کردە سەرپەرشتیار بەسەریەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ خەیبەری کرد بە سی‌وشەش پشکەوە ، هەرپشکێك سەد بەش بوو ، بۆیە بەشەکان بوونە سێ هەزارو شەش سەد پشك ، نیوەی ئەوە دانرا بۆ پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانەکان کە بریتی بوو لەهەزارو هەشت سەد پشك ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو یەکێك لە موسوڵمانان یەك پشکی بەرکەوت ، نیوەکەی تری جیاکردەوە کە بریتی بوو لەهەزارو هەشت سەد پشك، پشکێك بۆ لێقەوماوی‌و پێویستیی موسوڵمانان ، چونکە دابەشکرا بوو بەسەر هەزارو هەشت سەد پشکداو ، نازو نیعمەتێك بوو ڕژا بوو بەسەر خەڵکی حودەیبیەدا ئەوانەی لەوێدا بوون و ئەوانەش نەهاتبوون ، بۆ خۆیان هەزارو چوارسەد کەس بوون ، دووسەد سواریشیان لەگەڵدابوو هەر ئەسپێکیش دوو پشکی بەردەکەوت ، بۆیە دابەشکرا بەسەر هەزارو هەشت سەد پشکدا ، ئەسپ سوار سێ پشك‌و ، پیادەکانیش یەکی یەك پشکیان بەرکەوت.

ریوایەتەکەی (بخاری) لەبارەی زۆریی دەستکەوتەکانی خەیبەرەوە دیارە ، کە (ابن عمر) فەرموویەتی: پێشتر تێر بەسکی خۆمان نەبووین هەتا خەیبەرمان فەتح کرد ، هەروەها ئەو ریوایەتەی بوخاری لە (عائیشە)وە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: کاتێك فەتحی قەڵاکانی خەیبەر کرا، وتمان: ئیتر لەمەودوا تێر خورما دەخۆین . کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی گەڕایەوە بۆ مەدینە ، کۆچکەران پاش ئەوەی کە لەخەیبەردا ماڵ و باخی خورمایان دەستکەوت هەموو ئەو بەخششانەیان گێڕایەوە بۆ ئەنسارەکان کە پێشتر لە دارخورما و باخ پێیان دابوون.

---

[1] / زاد المعاد ٢/١٣٧، ١٣٨.

[2] / صحيح البخاري ٢/٦٠٩.

[3] / زاد المعاد ٢/١٤٨، صحيح مسلم ٢/٩٦.

## گەڕانەوەی

## ( جعفر )ی كوڕی ( أبي طالب ) و ئەشعەریەكان

لەم غەزایەدا بوو كە (جعفر)ی كوڕی (ابو طالب)ی ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەكانی و (أبو موسی)و ئەشعەریەكانی تریش گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ.

(ابو موسی) دەڵێت: ئێمە لە یەمەن بووین كە هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەرمان پێگەیشت ، بەكۆچەریی چووینە ئەوێ ـ منو دوو برای ترم بووین ـ لەگەڵ پەنجاو ئەوەندە كەسی خزمی خۆمدا، سواری كەشتی بووین ، كەشتیەكە لای نەجاشی دایبەزاندین ، لەوێ گەیشتین بە (جعفر)و هاوەڵەكانی ، (جعفر) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی ناردووە كە لێرە نیشتەجێ ببین ، ئێوەش لەگەڵ ئێمەدا بن. لەگەڵیان ماینەوە تا لەفەتحی خەیبەردا گەڕاینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، پشكی بەئێمەشدا، لەكاتێكدا پشكی نەدا بەهیچ كەسێك كە لەفەتحی خەیبەردا بەشداریی نەكردبێت ، ئەوە تەنها بۆ سەرنشینانی كەشتیەكە بوو.[1]

كە جەعفەر گەیشت بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لێكردو ماچی كردو فەرمووی : وەڵلاهی نازانم بەكامیان دڵم خۆش بێت ؟ بەهاتنەوەی (جعفر) یان بە فەتح كردنی (خیبر).[2]

هاتنەوەی ئەوانە دوای ناردنی (عمرو)ی كوڕی (أمیە)ی (ضمیری) بوو لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ نەجاشیو، داوای فەرموو بوو كە بیان نێرێتەوە بۆی. نەجاشی بە دوو كەشتیدا هەموویانی ناردەوە ، ژمارەیان شانزە پیاو بوو لەگەڵ ئەو ژن و منالانەی لەوێ مابوونەوە ، پێشتریش هەندێكیان گەڕابوونەوە بۆ مەدینە.[3]

---

[1] / صحیح البخاری ١/٤٤٣، هەروەها بڕوانە (فتح الباری) ٧/ ٤٨٤، ٤٨٥، ٤٨٦، ٤٨٧.

[2] / زاد المعاد ٢/١٣٩.

[3] / محاظرات تاریخ الأمم الإسلامیة للخضري ١/١٢٨.

## ماره كردنی (صفيه)

پاش كوژرانی (كنانة)ی كوڕی (أبی الحقيق)ی هاوسەری (صفية) بەهۆی پەيمانشكێنيەوە ، كەنيزەكەكان كۆكرانەوە ، بەپێی سيستمی جەنگی ئەوكاتە (دحيە) داوای كرد لەپێغەمبەر ﷺ كەنيزەكێكی پێ ببەخشێت ، فەرمووی: ئەو كەنيزەكە بۆ تۆ. (دحيە)ش (صفيە)ی كچی (اخطب)ی هەڵبژارد ، پياوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (صفية)ی كچی (حيی) كە خانمی (بني قريظة)و (بنی نضير)ە بەخشيوتە بە(دحية)ی كوڕی (خليفة)، ئەو خانمە بۆ تۆ باشترە، فەرمووی: پێی بڵێن بابيهێنێتەوە. هێنايەوە، كەپێغەمبەر ﷺ بينی فەرمووی كەنيزەكێكی تر ببە ، ئەنجا ڕووی كردە (صفيە)و بانگیكرد بۆ ئيسلام ، لەوێدا (صفية) موسوڵمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی كردو مارەی كرد ، ئازادكردنەكەشی كردە مارەيی بۆی ، كەگەيشتنە بەنداوی (صهباء) بۆی حەلاڵ بوو ، (أم سليم) جيازيی بۆ كردو، شەو بۆيان گواستەوەو بوو بەژنی پێغەمبەر ﷺ . وەليمەيەكی بۆ كرد بەهەندێك خورماو ڕۆن و قاوت و لە ڕێگە سێ ڕۆژ لەلای مايەوە.[1]

نيشانەيەكی سەوزی بەدەموچاوی (صفيە)وە بينی پرسياری كرد: ئەوە چی‌يە؟ وتی: پێغەمبەری خوا پێش تەشريف هێنانی بەڕێزتان بۆ لای ئێمە ، لە خەومدا مانگم بينی وەكو لەجێگەی خۆی لاچوبێت كەوتە كۆشمەوە ، هيچم لەبارەی تۆشەوە نەدەزانی ، خەونەكەم گێڕايەوە بۆ مێردەكەم ، زللەيەكیدا لە دەموچاوم و وتی: خەون بەو پادشايەوە دەبينيت كە لە مەدينەيە.[2]

## باسی مەڕە ژەهراويەكە

كە پێغەمبەر ﷺ لە خەيبەر سەقامگير بوو ، (زينب)ی كچی (حارث) ـ هاوسەری (سلام)ی كوڕی (مشكم) مەڕێكی سورەوەكراوی بەديارى بۆ هێنا ، پرسياری كرد بوو پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لەكام بەشيەتی؟ پێيان وتبوو: باڵەكەی . ژەهرێكی زۆری پێوە كردبوو ، پاشان پارچەكانی تريشی ژەهراوی كردبوو ، ئەنجا هێنابووی بۆ بەردەم پێغەمبەر ﷺ ، كە هێنرايە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ يەكەم شت دەستی برد بۆ باڵەكەی ، خستيە دەمی جووی و بۆی قووت نەدراو تفی كردەوە. پاشان فەرمووی: ئەم پارچە

---

[1] / صحيح البخاري ١/٥٤، ٢/٦٠٤، ٦٠٦. زاد المعاد ٢/١٣٧.
[2] / هەمان سەرچاوەی كۆتايی، (ابن هشام) ٢/٣٣٦.

ئێسقانە پێم دەڵێت ژەهراویە. پاشان بانگکراو دانینا بەتاوانەکەیدا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی وای لێکردیت ئەوکارە بکەیت؟ ژنەکە وتی: لەدڵی خۆمدا وتم: ئەگەر ئەم پیاوە پادشایەکی دونیایی بێت ڕزگارم دەبێت لەدەستی ، ئەگەر پێغەمبەریش بێت هەواڵی پێدەدرێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خۆش بوو.

لەکاتی خواردنەکەدا (بشر)ی کوڕی (براء)ی کوڕی (معرور) ، پارچەیەکی لێخواردو قوتیدا، لەئەنجامدا وەفاتی کرد. گێڕانەوەکان جیاوازن سەبارەت بە بەرەڵڵا کردن یان کوشتنی ژنەکە ، لەسەرئەوە یەکدەنگن کە یەکەمجار چاوپۆشی لێکردوە ، بەڵام کە (بشر) وەفاتی کرد لە تۆڵەیدا کوژرایەوە.[1]

## کوژراوانی هەردوولا

## لە شەڕەکانی خەیبەردا

کۆی شەهیدانی موسڵمانان لە شەڕەکانی خەیبەردا شانزە پیاو بوو ، چوار لە قوڕەیش و یەکێك لە (أشجع)و یەکێك لە (أسلم) ، یەکێك لەخەڵکی خەیبەرو ئەوانی تریش لەئەنسارەکان بوون.

هەروەها دەگوترێت کە شەهیدی موسڵمانەکان لەو شەڕانەدا (٨) پیاو بووە ، عەللامە (منصور فوری) باسی (١٩) کوژراوی کردوە ، پاشان دەڵێت: پاش بەدوادا گەڕانی زیاتر ناوی (٢٣) کەسم دۆزیوەتەوە ، یەکێکیش بەهۆی خواردنی مەڕە ژاراویەکەوەو لەیەکێکیشدا جیاوازیان هەیە لەوەدا ئایا لە (بدر) یان (خیبر) شەهید کراوە ، ڕاست وایە کە لە (بدر) شەهید کراوە[2] .

ژمارەی کوژراوەکانی جولەکەش (٩٣) کەس بوە .

## فەدەك

کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە خەیبەر، (محیصە)ی کوڕی (مسعود)ی نارد بۆ ناو جولەکەی فەدەك ، تا بانگیان بکات بۆ ڕێبازی ئیسلام ، دەستی دەستیان پێ کردبوو ، کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری بەخشی بە موسڵمانەکان ، ترس کەوتە

---

[1] / بڕوانە (زاد المعاد) ١٣٩/٢ ، ١٤٠ ، فتح الباری ٤٩٧/٧ ، بنەڕەتی ئەو بەسەرهاتە بە درێژی لە بوخاریدا باسکراوە ، ٤٤٩/١ ، ٦١٠/٢ ، هەروەها لە (ابن هاشم)دا ٣٣٧/٢ ، ٣٣٨.

[2] / رحمة للعالمین ٢٦٨/٢ ، ٢٦٩ ، ٢٧٠.

دڵیانەوە خێرا شاندێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تاسوڵحیان لەگەڵدا بکات لەسەر نیوەی فەدەك ، بەو شێوەیەی کە لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا ڕێککەوت ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیاندا ڕێکەوت ، لەسەر ئەوەی فەدەك تایبەت بێ بۆ خۆی ، چونکە ئەسپ سوارو چەکداری موسڵمانەکان نەیانگرت[1].

## وادی القری

کە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوەوە ، ڕووی کردە (وادی القری) ، کۆمەڵێك جولەکەی تێدابوو ، پاشان هەندێك عەرەبی موشرکیش پاڵیان پێوە دابوون.

کە لێیان نزیك بونەوە ، لە دورەوە جولەکە لە ئامادەباشیدا بوون‌و تیر بارانیان کردن، (مدعم) غولامێکی پێغەمبەری کوشت ، خەڵکی وتیان: مژدەی لێبێت چووە بەهەشت ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ، نەخێر ، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەو هەندەشتەی لەڕۆژی خەیبەردا لە غەنیمەت لایدا بۆ خۆی ، کە لەدابەشکردنەکەدا بەری نەکەوتبو ، ئێستا بۆتە ئەڵقەی ئاگر لەگەردنیدایە ، کە خەڵکی ئەوەیان گوێ لێ بوو پیاوێك تاکە نەعلێك یان جوتێك نەعلی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەعلێك یان دوونەعل لە دۆزەخ[2].

پاشان پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی سازدا بۆ شەڕو ڕیزی کردن ، ئاڵاکەی خۆی دایەدەست (سعد)ی کوڕی (عبادە) ئاڵایەکی تری دایەدەست (حباب)ی کوڕی (منذر)و یەکێکیش بۆ (سهل)ی کوڕی (حنیف)و یەکێکی تریش بۆ (عبادە)ی کوڕی (بشر) ، ئەنجا بانگی جولەکەیان کرد بۆ ئیسلام ، ڕازی نەبوون ، پیاوێکیان هاتە دەرەوە بۆ شەڕ (زبیر)ی کوڕی (عوام) بۆی چوو کوشتی ، یەکێکی تریش هاتە دەرەوە ئەویشی کوشت ، پاشان یەکێکی دیکە هاتەدەرەوە (علی) کوڕی (ابوطالب) بۆی چوو کوشتی، بەو شێوەیە شەڕی ڕووبەڕوو بەردەوام بوو تا یانزە پیاویان لێ کوشتن ، دوای کوشتنی هەر پیاوێك بانگی ئەوانی تری دەکرد بۆ ئەوەی ئیقامەی بەڵگەی لەسەر بکات.

لەو ڕۆژەدا کاتی نوێژ هات ، نوێژی بەهاوەڵەکانی کرد پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای جولەکەو بانگی دەکردن بۆلای خوداو پێغەمبەرو ئایینی پیرۆزی ئیسلام ،

---

[1] / ابن هاشم ۲/۳۳۷، ۳۵۲.

[2] / صحیح البخاری ۲/۶۰۸.

شەڕ شەوی بەسەردا هاتووو ڕۆژ بوەوە ، دیسان شەڕیان لەگەڵدا کردنەوە ، هێشتا خۆر بە ئەندازەی ڕمێك بەرز نەبوبوەوە خۆیاندا بەدەستەوە ، بێشەڕ گیران ، ماڵو سامانیان بووە دەسکەوت بۆ موسڵمانان و کەلوپەل و کەرەستەیەکی زۆریان گرت.

پێغەمبەر ﷺ چوار ڕۆژ لە(ذی القری) مایەوە ، دەستکەوتەکانی دابەشکرد بەسەر هاوەڵەکانیداو زەوی خورماکانی هێشتەوە بۆ جولەکە، کردنیە سەرکار بەسەر دار خورماکانەوە[1] وەکو حاڵەتی خەڵکی خەیبەری لێکردن.

## تــەیمــاء

کە هەواڵی خۆ بەدەستەوەدانی خەڵکی (خەیبەر) و (فەدەك) و (وادی القری) گەیشتە گوێی جولەکەی (تەیماء) ، هیچ بەرەنگاریەکی موسڵمانەکانیان نەکردو نوێنەری خۆیان نارد بۆ سوڵح کردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لێ قەبوڵ کردن و لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان مانەوە[2] ، لەو بارەیەوە نوسراوێکی بۆ نووسین ، ئەمە دەقەکەیەتی: (ئەمە نووسراوی موحەمەدی پێغەمبەری خودایە بۆ (بنی عادیا) ، ئەوان بەڵێن و پەیمانیان لەگەردنی ئێمە دایە ، جزیەیان لەسەرە ، نە دوژمنایەتیتان دەکرێت و نە دەردەکرێن ، بەدرێژای ژیانتان لێرە دەمێننەوە.) ئەم نوسراوە (خالد)ی کوڕی (سعید) نووسی[3].

## گەڕانەوە بۆ مەدینە

پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینەو، لەشەوەکەیدا درەنگ وەخت بوو لە ڕێگە نوستن فەرمووی بە بیلال: ئێشکگری ئەمشەومان بۆ بکە ، کەچی بیلال لەبەر ماندویی زۆر بەپاڵ وشترەکەیەوە خەوی لێ کەوتبوو ، کەس خەبەری نەبوەوە ، تاخۆر لە هەموویانیدا ، یەکەم کەس کە خەبەری بوەوە پێغەمبەر ﷺ بوو ، پاشان لە شیوەکە چوونە دەرەوە ، چووە پێشەوە ، نوێژی بەیانی بۆ کردن ، وتراوە: کە ئەو بەسەر هاتە لەو سەفەرەدا نەبووە[4].

---

[1] / زاد المعاد ٢/ ١٤٦ ،١٤٧.

[2] / هەمان سەرچاوە٢ /١٤٧.

[3] / ابن سعد

[4] / ابن هشام٢/ ٣٤٠ . بەسەرهاتەکە بلاوە و لەزۆرینەی کتێبەکانی فەرمودودا باسی کراوە . بڕوانە (زادالمعاد) ٢/ ١٤٧.

## سریەی ( أبان )ی کوڕی ( سعید )

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو سەرکردەیەکی سەربازی دیکە باشتر دەیزانی کە چۆڵکردنی شاری مەدینە پاش کۆتای هاتنی مانگە حەرامەکان کارێکی گونجاو نیە ، لەکاتێکدا کە دەوروبەری شار بەعەرەبی دەشتەکی گیرابێت و لەوانەیە لەپڕێکدا بدەن بەسەر موسڵمانەکاندا بەمەبەستی تالآنی و چەتەگەرێتی ، لەبەرئەوە سریەیەکی نارد بۆ تۆقاندنی عەرەبە دەشتەکیەکان بەسەرۆکایەتی (أبان)ی کوڕی (سعید) لەوکاتەدا کە هێشتا لە خەیبەر بوو ، (ابان)ی کوڕی (سعید) پاش بەجێهێنانی فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە خزمەتی لە خەیبەر ، کە پێی گەیشتەوە فەتح کرابوو.

ڕای تەواو ئەوەیە کە ئەم سریەیە لە مانگی (صفر)ی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا دەرچووە ، باسی ئەم سریەیە لە (بوخاری)دا هاتووە[1] ، (ابن حجر) دەڵێت: من باسی ئەم سریەیەم نەبیستوە[2] .

---

[1] / بروانە (صحيح البخاري) ، (باب غزوه خيبر) ٦٠٨/٢، ٦٠٩.

[2] / فتح الباري ٤٩١/٧ .

## پاشماوەی سریەو غەزاکانی ساڵی حەوتەم

### غەزای (ذات الرقاع)

کە پێغەمبەر ﷺ لەشکاندنی هەردووباڵی سەرەکی و بەهێزی سێ حیزبەکە بوەوە ، تەواو یەکلابوەوە بۆ باڵی سێیەم ، واتە عەرەبە کەللە شەقەکانی قوڵایی دەشتی نەجد، ئەوانەی کەبەردەوام خەریکی ڕاوەدونان و چەتەگەریی و تاڵانکاریی بوون.

لەبەرئەوەی کە ئەو عەرەبە دەشتەکیانە لەشوێنێکی دیاری کراودا نەبوون ، لە قەڵاو شوورای بەرزدا نەبوون ، بۆیە زاڵ بوون بەسەریانداو سەرکوتکردنیان زۆر گرانتر بوو بەپێوەری شەڕی خەیبەرو مەککەییەکان ، بۆیە جگە لەهەڵمەتی تەمێکردن و ترساندن و ڕاوەدونان هیچ شتێك کاریگەری نەبوو ، موسڵمانەکانیش ساتەو سات لەم جۆرە هەڵمەتانەیان دەبردە سەریان.

بۆ خۆسەپاندنیش بەسەر ئەو کۆمەڵە دەشتەکیانەی خۆیان کۆکردبوەوە بۆ هەڵکوتانە سەر دەوروبەری مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتێکی تەمێ کردنی کردە سەریان ئەو هەڵمەتە ناسراوە بە غەزای (ذات الرقاع).

زۆرینەی (سیرەت)ناسەکان لەساڵی چوارەمدا باسی ئەم غەزایە دەکەن بەڵام بەشداری کردنی (ابو موسی)ی (اشعری) و (أبو هریره) لەم غەزایەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەدوای خەیبەردا ڕوی دابێت ، ڕاستر وایە کە ئەو غەزایە لە مانگی (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی ٧ی کۆچیدا ڕووی داوە.

پوختەی ڕووداوەکە بەو شێوەیەی کە (سیرەت)ناسان باسی دەکەن ئەوەیە ، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی کۆبونەوەیەکی (أنمار) یان (بنی ثعلبة) و (بنی محارب)ی سەر بە (غطفان)ی کەوتە بەرگوێ ، بەخێرایی لەگەڵ چوارسەد کەس یان حەوت سەد کەسی هاوەڵیدا بۆیان دەرچوو ، (ابو ذر) یان (عثمان)ی کوڕی (عفان)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت ، چووە ناوەوە بۆ خاك و ئاویان و گەیشتە شوێنێك پێی دەوترێت (نخل) ، دوو ڕۆژ لە مەدینەوە دوورە ، گەیشت بەکۆمەڵێکی (غطفان) بەرامبەر یەك وەستان بەڵام شەڕ ڕووی نەدا ، پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا نوێژی ترسی بۆ کردن.

لە (بوخاری)یشدا هاتووە لە (ابو موسی)ی (اشعری)ە وە دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چوینە دەرەوە ئێمە شەش کەس بوین وشترێکمان پێ بوو

بەسەرە سواری دەبووین ، قاچەکانمان هەڵقلیشابوو ، قاچی من قلیشابوو نینۆکەکانم کەوتن ، پەڕۆمان لە قاچ و قولمان دەبەست ، لەبەر ئەو پەڕۆ زۆرەی لە قاچمان دەبەست غەزاکە ناونرا (ذات الرقاع)[1] .

هەروەها تێیدا هاتوە لە (جابر)ەوە: دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەردا بوین ﷺ لە غەزای (ذات الرقاع)دا ، گەیشتینە لای درەختێکی سێبەردار جێمان هێشت بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ دابەزیو خەڵکەکەی تریش بلاوەیان لێکرد بەو ناوەداو دەچوونە ژێر سێبەری دارو درەختەوە ، پێغەمبەریش لەژێر درەختێکدا پاڵی دایەوەو شمشێرەکەی پێدا هەڵواسی ، (جابر) دەڵێت: خەومان لێکەوت ، کابرایەکی موشریك هات ، شمشێرەکەی پێغەمبەری ﷺ دەرهێناو گرتی بەدەستیەوەو وتی بەپێغەمبەر ﷺ: لێم دەترسی؟ فەرمووی: نەخێر ، وتی: چی دەستم دەگرێت ئەگەر بتکوژم؟ فەرمووی: (ﷲ).

(جابر) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بانگی کردین ، چووینە خزمەتی دەبینین عەرەبێکی دەشتەکی لەپاڵیدا دانیشتوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم کابرایە شمشێرەکەی منی دەرهێنا لەکاتێکدا من نوستبووم ، کە هەستام شمشێرەکەی بەدەستەوە گرتبوو ، پێی وتم: چی دەستم دەگرێت ئەگەر بتکوژم ؟ وتم: ( ﷲ ) ، ئەوە دەبینن دانیشتوە. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ سەرزەنشتێکی نەکرد.

لە ریوایەتێکی تردا هاتوە ، نوێژ دابەستراو دووڕکاتی پێکردن ، پاشان دواکەوتن ، دوو ڕکاتی کرد بۆ کۆمەڵەکەی تریش ، پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکاتی کردوو دوو کۆمەڵەکەش یەکی دوو ڕکاتی بۆ کردن.[2]

لە ڕیوایەتەکەی (أبی عوانە)شدا هاتوە: شمشێرەکە لەدەست کابرا کەوتە خوارەوە ، ئەنجا پێغەمبەری ﷺ هەڵی گرت ، فەرمووی: چی ڕێگریت دەکا لە من؟ کابرا وتی: مەردی خودابە ڕەحمم پێ بکە ، فەرمووی: شایەتی دەدەی کە جگە لە (ﷲ) خودای تر نیەو منیش پێغەمبەری خودام؟ کابرای ئەعرابی وتی: پەیمانت پێ دەدەم شەڕت لەگەڵدا نەکەمو لەناو کۆمەڵێکیشدا نەبم دژایەتی تۆ بکەن. دەڵێت: بەڕەڵای کرد ، ئەنجا دەشتەکیەکە چوەوە بۆلای خزمانیو وتی: لای پیاوێك بووم باشترین مرۆڤە لە دونیادا[3] .

---

[1] / صحیح البخاری باب (غزوة ذات الرقاع) ٥٩٢/٢ ، (صحیح المسلم)باب (غزوة ذات الرقاع) ١١٨/٢.
[2] / صحیح البخاری ٤٠٧/١ ، ٥٩٣
[3] / مختصر سیرة الرسول ، نووسینی شێخ عبدوڵلای نەجدی ل ٢٦٤ - بروانە (فتح الباری) ٧ / ٤١٦ .

له ڕیوایەتەکەی (بخاری)یشدا هاتوە: له (مسدد)ەوە له (أبی عوانە)و ئەویش له (أبی بشیر)ەوە دەڵێت: ئەو کابرایە ناوی (غورث)ی کوڕی (حارث) بوو [1]، (أبی حجر) دەڵێت: بەسەرهاتەکە لای (واقدی) واهاتوە ، کە کابرا ناوی (دعثور)ە و دوایش موسڵمان بووە ، بەڵام پێ دەچێت دوو بەسەرهاتەکە له دوو غەزای جیاوازدا ڕوویان دابێت ، (والله أعلم)[2].

لەگەڕانەوەیاندا لەو شەوە کابرایەکی موشریك سوێندو ئاهی کرد کە نەگەڕێتەوە تاخوێنی یەکێك له هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ نەڕژێت ، شەوهات پێغەمبەر ﷺ دوو پیاوی دانا بەچاودێری شەو بۆ ئاگابوون لەجموجوڵی دوژمن، کەبریتی بوون (عباد)ی کوڕی (بشر)و (عمار)ی کوڕی (یاسر) ، کابرا تیرێکی گرتە (عباد) لەکاتی نوێژدا بوو ، ئەو تیرەی دەرهێناو نوێژەکەی نەبڕی ، تا سێ تیری لێدا ، نوێژەکەی نەبڕی تا سلاوی دایەوە ، ئەنجا هاوەڵەکەی هەستاند ، (عمار) وتی: (سبحان الله) ئەی بۆچی بێدارت نەکردمەوە. (عباد) وتی: بەڕاستی له سورەتێکدا بووم دەم خوێند حەزم نەکرد بیبڕم[3].

ئەم غەزایە دەورێکی گەورەی هەبوو لەترس خستنە ناودڵی عەرەبە دەشتەکیەکاندا ، ئەگەر سەیرێکی درێژی ئەو سریانە بکەین لەدوای ئەو غەزایەوە ڕوویانداوە ، دەبینین هیچ یەکێك له تیرەکانی (غطفان) زاتیان نەکرد کە دوای ئەو غەزایە سەر بەرز بکەنەوە ، بگرە سەریان شۆڕکردو وردە وردە خۆیان دەدا بەدەستەوەو موسڵمان دەبوون ، بەڵکو دەبینین چەندین تیرەی ئەو خێڵە لەفەتح کردنی مەککەدا بەشدارییان کرد لەگەڵ موسڵمانەکانداو شەڕی (حنین)یشیان کردو غەنیمەشیان بەرکەوت ، دوای ئەوەش پیاویان بۆ نێررا بۆ کۆکردنەوەی سەدەقە لەدوای فەتحیشەوە دەیاندا ، بەو شێوەیە هەرسێ باڵەکە تێکشکان و هێمنایەتی و ئاشتی لەناوچەکەدا بەرقەرار بوو ، موسڵمانەکان دوای ئەوە توانیان بەئاسانی هەرچی کەلێن و کەمو کووڕی هەیە بیگرن ، لەپاش ئەو غەزایەوە ڕێخۆشکەری کرا بۆ فەتح کردنی ناوچەکانی ترو شوێنە گەورەکان ، چونکە ناوخۆی وڵات بەرەو ئاڕاستەی بەرژەوەندی موسڵمانەکان دەچوو.

---

[1] / صحیح البخاری ٢ / ٥٩٣ .
[2] / فتح الباری ٧ / ٤٢٨ .
[3] / زاد المعاد ٢ / ١١٢ ، بۆ درێژەی ئەم غەزایە بڕوانە (ابن هشام) ٢ / ٢٠٣ تا ٢٠٩ ، زاد المعاد ٢ / ١١٠ و ١١١ و ١١٢ ، فتح الباری ٧ /٤١٧ ، ٤٢٨.

پاش گەڕانەوە لەو غەزایە پێغەمبەری ﷺ بۆماوەی مانگی (شەوال)ی ساڵی (٧) ی کۆچی دانیشت ، لەو ماوەیەدا چەند سریەیەکی بە ئەملاو ئەولادا نارد ، ئەمەش درێژەیەتی:

١. سریەی (غالب)ی کوڕی (عبدالله)ی (لیثی) بەرەو (بنی ملوح) لە (قدید) ، لە مانگی (صفر) یان (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی (٧)کۆچیدا. (بنو ملوح) ئەو خێڵە بوون کە هاوەڵەکانی (بشیر)ی کوڕی (سوید)یان شەهید کرد بوو ، ئەم سریەیەی نارد بۆ تۆڵەکردنەوە لێیان ، بەشەودا دایان بەسەریاندا ئەوەی کوژرا کوژراو مەڕو ماڵاتەکەیان دانەبەر ، سوپایەکی گەورە کەوتنە دوای موسڵمانەکان نزیکبونەوە بارانێکی زۆرباری ، لافاوێکی گەورەی هەستاندو نەیهێڵا بگەنە سەر موسڵمانەکان ، موسڵمانەکان بەبێوەیی گەیشتنەوە جێ.

٢. سریەی (حسمی) لە (جمادی دووەم)ی ساڵی (٧)ی کۆچیدا ، باسی لەنامەی پادشاکاندا هات.

٣. سریەی (عمر)ی کوڕی (خطاب) بۆ (تربة) لە مانگی (شعبان)ی ساڵی (٧)ی کۆچیدا ، سی پیاوی لەگەڵدا بوو ، بە شەو دەڕۆشتن و بە ڕۆژ خۆیان حەشار دەدا ، هەواڵ گەیشتە (هوازن) هەڵاتن ، (عمر) هاتە سەر ماڵو حاڵەکانیان کەسی نەبینی و گەڕایەوە بۆ مەدینە.

٤. سریەی (بشیر)ی کوڕی (سعد)ی (أنصاری) بۆ (بنی مرة) لە ناوچەی (فدك) لە (شعبان)ی ساڵی (٧)ی کۆچیدا ، لەگەڵ سی پیاودا ، بۆیان دەرچوو مەڕو ماڵاتەکەی هێنان ، شەو ئەوان دایان بەسەریانداو تیربارانیان کردن تا هیچ تیریان پێ نەما ، هەموویان کوژران جگە لە (بشیر) لەلای جولەکەیەك خۆی حەشاردا تا چاك بوەوە ، ئەنجا گەڕایەوە بۆ مەدینە.

٥. سریەی (غالب)ی کوڕی (عبدالله)ی (لیثی) لە (ڕەمەزان)ی ساڵی (٧)ی کۆچیدا بۆ (بنی عوال) و (بنی عبد)ی کوڕی (بنی کلبە) لە (میفعە) ، وتراویشە کە بۆ (حرقات) بووە لەناوچەی (جحیفە) لەگەڵ سەدو سی پیاودا، هێرش دەکەنە سەریان و هەرچی بەرەنگار دەبێتەوە دەیکوژن و مەڕو ماڵاتەکەیان دێنن، لەو سریەیەدا (أسامەی کوڕی زید) (مرداس)ی کوڕی (نهیك)ی کوشت پاش ئەوەش کە وتی (لااله الا الله) ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەر زەنشتی کردو پێی فەرموو: ئەرێ تۆ دڵت لەت کردبوو تا بزانی ڕاست دەکات یان درۆ؟

٦. سریەی (عبدالله)ی کوڕی (رواحه) بەرەو (خیبر) لە مانگی (شەوال)ی ساڵی (٧)ی کۆچی‌دا لەگەڵ (٣٠) ئەسپ سواردا ، لەبەرئەوەی (أسیر) یان (بشیر)ی کوڕی (زرام) خەریکی کۆکردنەوەی خێڵی (غطفان) بوو بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانەکان ، هەرچۆنێك بوو (أسیر)یان لەناو هاوەڵەکانیدا لەگەڵ سی کەسدا هێنایە دەرەوەو هانیاندا کەئەگەر بێت‌و موسڵمان ببێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکاتە سەرکاری خەیبەر ، کە گەیشتە (قرقرەنیار) لەنێوان هەردوو لادا جیاوازی و دووبەرەکی و گومان خراپی دروست بوو ، بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕو کوژرانی (أسیر)و هەموو هاوڕێکانی.

٧. سریەی (بشیر)ی کوڕی (سعد)ی (أنصاری) بەرەو (یەمەن)و (جبار) کە دوو ناوچەی سەر بە (غطفان) یان (فزارة) و(عذرة) بوون، لە مانگی (شەوال)ی ساڵی (٧)ی کۆچی‌دا، لەگەڵ سێ سەد چەکداری موسڵماندا ، بۆ ڕووبەڕوو بونەوە لەگەڵ کۆمەڵێك کە خەریك بوون دەیاندا بەسەر شاری مەدینەدا ، شەو دەڕۆشتن و ڕۆژیش خۆیان حەشاردەدا ، خێڵەکە هەواڵی هاتنی (بشیر)یان پێگەیشت هەڵاتن ، مەڕو ماڵاتێکی زۆریان لێ بەجێماو کەوتە دەست موسڵمانەکان ، دوو پیاویشیان لێ بەدیل گیراو (بشیر) هەردووکیانی هێنا بۆ مەدینەو بردنیە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەوێ موسڵمان بوون.

٨. سریەی (أبی حدرد)ی (أسلمی) بەرەو (غابة) ، (ابن قیم) لەنێوەندی سریەکانی ساڵی حەوتی پێش عومرەی قەزا کردنەوەدا باسی کردوە ، پوختەکەی ئەوەیە کەپیاوێکی خێڵی (جشم)ی کوڕی (معاویە) بەژمارەیەك چەکداری زۆرەوە هاتبوە (غابة)و دەیویست خێڵی (قیس) ڕازی بکات بۆ شەڕی موسڵمانەکان . پێغەمبەری خوا ﷺ (أبا حدرد)ی لەگەڵ دوو پیاوی تردا بۆ ناردن ، (أبو حدرد) نەخشەیەکی جەنگی زۆر مەحکەمی داڕشت بۆ ئەوشەڕە ، بەشێوەیەکی خراپ دوژمنی تێکشکاندو ژمارەیەکی زۆری لە وشترو مەڕوماڵات پێ بەجێهێشتن.[1]

---

[1] / زاد المعاد ٢ / ١٤٩، ١٥٠ بۆ درێژەی باسی ئەو سریانە بڕوانە (رحمة للعالمین) ٢/ ٢٢٩، ٢٣٠، ٢٣١، (زاد المعاد) ٢/ ١٤٨، ١٤٩، ١٥٠، هەروەها (فهوم اهل الاثر) لەگەڵ پەراوێزەکانی ل٢١، (مختصر سیرة الرسول) نوسینی (شیخ عەبدوڵلای نەجدی) ل٣٢٢، ٣٢٣، ٣٢٤.

## عومرەی قەزا کردنەوە

حاکم دەڵێت: هەواڵەکان دەماودەم دەڵێن: لەمانگی (ذو العقدة)دا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی‌دا بەهاوەڵەکانی بەرگی عومرە بپۆشن بەمەبەستی قەزاکردنەوەی عومرە ، فەرمانیشی پێدان ئەو کەسەی پەیمانی حودەیبیەی دیوە دوانەکەوێت ، جگە لە شەهیدەکان کەس دوانەکەوت ، چەندین کەسی تریش بەنیازی عومرە کردن لەگەڵیدا بەڕێ کەوتن ، ژمارەیان جگە لە ژن‌و منداڵ دووهەزار کەس دەبوو.[1]

(عویف)ی (أبا رهم)ی (غفاری) بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت ، شەست وشتریشی دایە بەرخۆی ، (ناجیه)ی کوڕی (جندب)ی (أسلمی) کردە سەروکاریان ، هەر لە (ذي الحليفة)وە ئیحرامی عومرەیان کرد ، دەستیان کرد بەوتنی (لبيك اللهم لبيك) ، هەموو موسڵمانان دەیانوتەوە ، بەتەواوی چەك‌وتفاقی شەڕیان پێبوو، نەبادا قورەیش پەیمانشکێنیەکیان لەگەڵدا بکەن ، کە گەیشتە (یأجج) هەموو کەل و پەلی جەنگی دانا لە شیرو تیرو ڕم‌و گورزو ، (أوس)ی کوڕی (خول)ی (أنصاری) لەگەڵ دووسەد سواردا بەلایەوە بەجێهێشت ئەنجا بەشمشێری ئەسپ سوارو لە کێلاندا خۆی کرد بەناو شاری مەککەدا.[2]

پێغەمبەری ﷺ بەسواری وشترەکەی (قصواء)وە چووە مەککە ، موسڵمانەکان دەوریانداو شمشێرەکانیان هەڵکێشاو ( لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ) یان دەوت.

موشریکەکان چوونە دەرەوە بۆ شاخی (قعیقعان) ـ ئەو شاخەی دەکەوێتە باکووری کابەوە ، بۆ ئەوەی موسڵمانەکان ببینن ، لەبەینی خۆیاندا دەیانوت: سەیرکەن کە هاتن هەموویان قەیەغەی شاری (یثرب) قەڵەوی کردون. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی‌دا بەهاوەڵەکانی هەرسێ قۆناغەکە بڕن‌و ئەمسەرو ئەوسەری (رکن) بکەن ، بۆیە فەرمانی بڕینی هەموو قۆناغەکانی پێنەدان لەبەرمانەوە ، بۆیە ئەمەی کرد تا موشریکان هێزەکەی ببینن[3] ، هەروەها فەرمانی پێدان شانی ڕاستیان ڕووت بکەن و بەرگەکە بدەن بەسەر شانی چەپیاندا.

---

[1] / فتح الباري ٧ / ٧٠٠.

[2] / هەمان سەرچاوە ، هەروەها (زاد المعاد) ٢ / ١٥١.

[3] /صحيح البخاري ٢١٨/١ ، ٦١٠/٢ ، ٦١١ ، صحيح المسلم ٤١٢/١.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ثنیة) چووە ناو مەککە کە دەڕوانێت بەسەر (حجون)دا ، موشریکان ڕیز بوو بوون سەیریان دەکرد ، بەردەوام بوو لە (تلبیة) ، تادەستی گرت بە (رکن)ەوە لە (محجنة)دا ، پاشان تەوافی کرد ، موسڵمانانیش بەدوایدا تەوافیان کرد ، (عبدالله)ی کوڕی (رواحه) لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆشت و شمشێرەکەی هەڵکێشابوو دەیوت:

خلـــو بـــنی الكفـــار عن سبيلـــه    خلـــوا فكـــل الخير في رسولـــه

قد انـــزل الرحمـــن فـــي تنـــزيله    فـــي صحف تتلـــى على رسوله

يـــــارب انـــي مؤمـــن بقيـــلـــه    انـــي رأيـــت الحقَّ في قبولـــــه

بـــــان خـــير القتل فـــي سبيلـــه    الـــيوم نضـــربكم على تنـــزيله

ضربـــــا يزيـــل الهـــام عن مَقيله    ويذهـــلُ الخليـــل عن خليلـــه[1]

لە فەرمودەکەی (أنس)دا ، (عمر) فەرموویی: ئەرێ (ابن رواحه) تۆ شەرم ناکەیت لەبەردەم پێغەمبەری خواداو لەناو حەرەمی خوادا شیعر دەخوێنیتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومەر وازی لێ بهێنە ، ئەو شیعرەی (عبدالله) لە تیر هاویشتن خێراترە بۆ سەردڵ و دەروونیان.[2]

ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان سێ قۆناغەکەیان بڕی ، کە موشریکان بەو گورج و گۆڵیە بینیانن بە یەکتریان وت: بەئەمانەتان دەوت قەڵەوبون و هیچیان پێ ناکرێت ، وەڵڵا هەر ئەوانە لە فلأنە کەس و فیسارە کەس بەهێزترن.[3]

کە لە تەواف کردن بووەوە ، کەوتە ڕاکردنی نێوان (صفا) و (مروة) ، کە لێبووەوە لە (مروه)دا (هدی)ە کەی وەستان ، فەرمووی: (ئەمە قوربانیەکەیە ، هەموو شوێنێکی تری دەوروبەری مەککەش قوربانیگەیە) ، لە (مروه)دا قوربانیەکەی سەربڕی و سەری چاك کرد ، موسڵمانەکانیش بەهەمان شێوەیان کرد ، پاشان چەند کەسێکی نارد بۆ (یاجج) بۆ ئەوەی بەسەر چەك و تفاقەکانەوە بن و ئەوانی تریش بێن و دروشمی خۆیان ئەنجام بدەن ، ئەوانیش هاتن.

پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ لەمەککەدا مایەوە ، کە ڕۆژی چوارەم هات ، موشریکان هاتن بۆ لای (علی) وتیان: بڵێ بەهاوەڵەکەت ، وادەکەی تەواو بوو

---

[1] / بەیتی شیعرەکان پەرتەوازەن و لەچەند شوێنێکدا کۆمان کردنەوە.
[2] / (ترمذی) ریوایەتی کردوە ،(باب الاستئذان)و (الادب) و (انشاء الشعر)٢/١٠٧.
[3] / صحیح المسلم ١/٤١٢.

بابڕواتە دەرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە لە مەککەوە لە (سرف) دابەزی و لەوێدا ماوەیەك مایەوە.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە دەرچوو کچۆڵەکەی (حمزە) (ڕ) بە مامە مامە شوێنیان کەوت ، (علی) هەڵیگرت ، لەوێدا لەسەر ئەو کچۆڵەیە (علی) و (جعفر) و (زید) بوو بەقسەو باسیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ دای بە (جعفر) ، چونکە پوری هاوسەری (جعفر) بوو.

لەڕێگەی ئەم عومرەیەدا بوو ، پێغەمبەر ﷺ (میمونە)ی کچی (الحارث)ی (عامری) خوازبێنی کرد ، پێغەمبەر ﷺ پێش چوونە ناو مەککە (جعفر)ی کوڕی (أبی طالب)ی نارد بۆ خوازبێنی ، (میمونە) کاری خۆی دایەدەست (عباس) چونکە (أم الفضل)ی خوشکی ، خێزانی (عباس) بوو ، ئەویش ڕازی بوو ، کە لە مەککە دەرچوو (أبا رافع)ی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی (میمونە)ی بۆ بگوازێتەوە کە دەڕوات ، لە (سرف) پێغەمبەری خوا ﷺ (میمونە)ی گواستەوە.[1]

ئەم عومرەیە ناونرا عومرەی قەزا، لەبەرئەوەی لەجیاتی عومرەکەی حودەیبیە بوو، یان لەبەرئەوەی بەو پێیە بوو قەزاگەریی یان ئاشتبوونەوەی لەسەرکرا لە حودەیبیەدا ، لێکۆڵەران ڕای دووەم پەسەند دەکەن[2] ، ئەم عومرەیە چوار ناوی هەیە: (عومرەی قەزا ، عومرەی قەزیە ، عومرەی (قصاص) ، عومرەی سوڵح).[3]

دوای گەڕانەوە لە عومرەی قەزا چەند سریەیەکی بە چواردەوردا نارد ، ئەمەش پوختەیانە:

١. سریەی (ابن أبی العوجاء) لەمانگی (ذی الحجة)ی ساڵی (٧)ی کۆچیدا ، لەگەڵ (٥٠) پیاودا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی بۆ خێڵی (بني سليم) ، بۆ ئەوەی بانگیان بکەن بۆ ئیسلامەتی ، وتیان: پێویستمان نیە بەو بانگەوازەی تۆ ، پاشان شەڕێکی سەختیان کرد لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، (ابو العوجاء)ی تێدا بریندار بوو ، دوو کەسیش لە دوژمن بەدیلی گیران.

٢. سریەی (غالب)ی کوڕی (عبدالله) بۆ ئەو شوێنەی هاوەڵەکانی (بشیر)یان تێدا شەهید کرا لە (فدك) ، لەمانگی (صفر)ی ساڵی (٨)ی ساڵی کۆچیدا لەگەڵ دوو سەد پیاودا ، چەند پیاوێکیان لێ کوشتن و ژمارەیەك وشتریشیان دەستکەوت.

---

[1] / زاد المعاد ١٥٢/٢.
[2] / بڕوان (زاد المعاد) ١٧٢/١ و فتح الباری ٥٠٠/٧.
[3] / بڕوانە هەمان سەرچاوە.

٣. سریەی (ذات أطلح) لەمانگی (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا ، خێڵی (بنو قضاعة) کۆمەڵێکی زۆریان کۆکردبوەوە بۆ هەڵکوتانە سەر موسڵمانەکان ، پێغەمبەری خوا ﷺ (کعب)ی کوڕی (عمیر)ی (انصاری) لەگەڵ پانزە پیاودا بۆ ناردن ، بەدوژمن گەیشتن ، بانگیان کردن بۆ ئیسلامەتی ، گوێیان پێ نەدابوون و تیر بارانیان کردبوون و جگە لەپیاوێك هەموویان شەهید کردبوون ، ئەو کەسەش لەنێوان کوژراوەکاندا خۆی کردبوو بە مردوو.[1]

٤. سریەی (ذات عرق) بۆ (بني هوازن) لەمانگی (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا ، خێڵی (هوازن) جارێکی تریش نیازی کۆکردنەوەی دوژمنانیان هەبوو ، (شجاع)ی کوڕی (وهب)ی (أسد)ی بۆ ناردن لەگەڵ بیست و پێنج پیاودا ، کەمینیان نەدیبوو ، بەڵام ژمارەیەك وشتریان دەست کەوتبوو.[2]

## جەنگی (مُؤتــة)

ئەم جەنگە گەورەترین ڕووبەڕووبونەوەی جەنگییە ، گەورەترین شەڕی خوێناویە موسڵمانەکان لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺدا ئەنجامیان دابێت ، ئەم جەنگە بووە پێشەکیو دەستپێکێك بۆ فەتح کردنی ناوچەکانی نەسرانی نشین ، ئەم جەنگە لە (جەمادی یەکەم)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا ڕووی داوە ، بەرامبەر بەمانگی (ئۆگستۆس) یان (سێپتێمبەر)ی ساڵی (٦٢٩)ی زایین.

(مؤتة) گوندێکە دەکەوێتە خوارووی شامەوە ، نێوان (مؤتة) و (بیت المقدس) دوو فەرسەخ ڕێیە.

## هۆی جەنگەکە

هۆی ئەم جەنگە ئەوەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە (حارث)ی کوڕی (عمیر)ی (أزدی)دا نامەیەکی نارد بۆ گەورەی (بصری) ، لەڕێگەدا (شرحبیل)ی کوڕی (عمرو)ی (غسان)ی کە سەرکار بوو بەسەر خاکی (بلقاء)ی شامەوە لەلایەن (قیصر)ەوە دانرابوو، ئەم پیاوە چووە ڕێگەی نێرراوەکەی پێغەمبەر ﷺ ، گرتیو بەستیەوەو کوشتی.

---

[1] / رحمة للعالمین٢/٢٣١.

[2] / هەمان سەرچاوە لەگەڵ (تلقیح فهوم اهل الأثر) نوسینی (ابن الجوزی) ل٣٢.

لەوکاتەدا کوشتنی فروستادەو نێرراو یەکێك بوو لەتاوانە گەورەکان ، وەکو لێدانی شەیپوری شەڕ وابوو ، پێغەمبەر ﷺ ئەمەی زۆر بەلاوە سەختو ناخۆش بوو ، بۆیە کە هەواڵەکەی پێگەیشت سوپایەکی سێ هەزار کەسی بۆ سازدان[1] ئەمەش گەورەترین سوپای ئیسلامیی بوو جگە لەجەنگی ئەحزاب پێشتر موسڵمانان بەو شێوەیە ژمارەیان زۆر نەبوو.

## میرەکانی سوپاو ڕاسپاردەی پێغەمبەر ﷺ بۆیان

پێغەمبەر ﷺ (زید)ی کوڕی (حارثة)ی کرد بەسەرکردەی سوپاو فەرمووی: ئەگەر شەهید بوو (جعفر) دابنێن ، ئەگەر ئەویش کوژرا (عبدالله)ی کوڕی (رواحة) دابنێن[2] ، ئاڵایەکی سپی بۆ دانان و دایە دەست (زید)ی کوڕی (حارثة).[3]

ڕای سپاردن کە بڕۆنە سەرشوێنی شەهید بوونی (حارث)ی کوڕی (عمیر) ، ئەوانەی لەوێدان بانگیان بکەن بۆ ئیسلام ، ئەگەر وەڵامیان دایەوەو هاتن بەدەمتانەوە ئەوە باشە ، وەگەرنا پاش پشت بەستن بەخودا لێیان بدەن و شەڕیان لەگەڵدا بکەن و پێی فەرموون: (بە ناوی خوداوەو لە پێناوی خوادا غەزا بکەن لەگەڵ ئەوانەدا بێ باوەڕن ، پەیمان مەشکێنن و مەدەن بەسەریاندا ، مناڵی شیرەخۆرەو ژن و پیاوی بە تەمەن و بێچەك و خواپەرستانی ناو کڵێساکان مەکوژن ، دارخورما و هیچ دارێکی تر مەبڕن ، هیچ بینایەك مەڕوخێنن).[4]

## ماڵئاوایی کردن لە سوپای ئیسلامیی و گریانی ( ابن رواحه )

کە سوپای ئیسلامی خۆی ئامادەکرد بۆ بەڕێکەوتن، خەڵکی ئامادەبوون و خوا حافیزیان کرد لە میرەکان ، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان سڵاویان لێکردن ، لەوێدا یەکێك لە سەرکردەکانی سوپا دەستی کرد بەگریان ، ئەویش (عبدالله)ی کوڕی (رواحة) بوو، پێیان وت: چی دەتگریەنێت؟ وتی: سوێندم بەخوا مەسەلەکە خۆشەویستی دنیا نیەو دورکەوتنەوەش نیە لەئێوە، بەڵکو هۆکەی ئەوەیە گوێم لێ بوو جارێکیان پێغەمبەر ﷺ ئایەتێکی خوێندەوە باسی ئاگری دۆزەخی تێدابوو: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا﴾ مریم /٧١ (واتە: هیچ یەکێك نیە لە

---

[1] / زاد المعاد ٢/١٥٥ ، فتح الباری ٧/٥١١.
[2] / صحیح البخاری (باب غزوة مؤتة من ارض الشام).
[3] / (مختصر سیرة الرسول) نوسینی شێخ عەبدوڵلای نەجدی).
[4] / هەمان سەرچاوە ، (رحمة للعالمین )٢/٢٧١.

ئێوە بەدۆزەخدا گوزەر نەکات، ئەمە بڕیارێکی یەکلایی خودایە) منیش بیر دەکەمەوە پاش گوزەرکردن چۆن دەتوانم دەربازبم؟

موسڵمانان وتیان: خوا بتانپارێزێت‌و لەشەڕ لاتان بدات و بەبێوەیی‌و سەلامەتی‌و دەسکەوتەوە بتانگێڕێتەوە، (عبدالله)ی کوڕی (رواحة) وتی:

| | |
|---|---|
| لكنّني أسألُ الرحمـــَنَ مغفـــرةً | وضربةً ذات فَرْعٍ[1] تَقْذفُ الزّبَـــدا |
| أو طعنةً بيدى حَـــرّانَ مُجْهِزَةً | بحربةٍ تنفذُ الاحشاءَ و الكَبـــــداً |
| حتى يقالَ اذا مرّوا على جَدَثي[2] | أرشده اللهُ من غازٍ ، وقد رَشـــدا |

دوای ئەوە سوپاکە کەوتەڕێ ، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیان بەڕێکەوت بۆ خوا حافیزی لێ کردن ، تاگەیشتە (ثنية الوداع) ئەنجا وەستاو ، خواحافیزی لێ کردن .[3]

## بە جوڵەکەوتنی سوپای ئیسلامیی ،
## لە پڕدا کەوتن بەسەر بارێکی ترسناکدا

سوپای ئیسلامیی جوڵا بەرەو باکور هەتا گەیشتە (معان) لەخاکی شامدا ، کە پاڵی داوە بە حیجازی باکورەوە ، لەوێدا هەواڵیان بۆ هات کە (هەرقل) بە سەد هەزار چەکداری ڕۆمەوە لە (مآب)ی خاکی (بلقاء) دابەزیوە ، خێڵەکانی (لخم) و (جزام) و (بلقين) و (بهراء) و (بلیی) بە سەد هەزاری ترەوە پاڵیان پێوە داوە.

## ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری ( معان )

موسڵمانەکان هیچ جۆرە ئەژمارێکیان بۆ سوپایەکی زەبەللاحی لەو جۆرە نەکرد بوو ، کە لە زەویەکی دوورە وڵاتدا لەپڕێکدا لێیان پەیدا بێت ، ئایا دەکرێت سوپایەکی بچوکی سێ‌هەزار کەسی هێرش بکاتە سەر سوپایەکی بێ شوماری لەبن نەهاتوو کە دووسەد هەزار کەس دەبێت؟ موسڵمانەکان سەریان سوڕمابوو ، بۆیە دووشەو لە (معان)دا مانەوە بۆ بیرکردنەوە لە ڕەوشەکەو ڕاوێژکردن بەیەکتر لەبارەی بارودۆخەکەوە ، وتیان با نامە بنووسین بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش یان کەسی ترمان بۆ دەنێرێت یان فەرمانێکمان پێدەدات.

---

١ / الفرغ: ناواخن . بۆشایی.
٢ / الجدث : گۆڕ.
٣ / ابن هشام ، ٢/٢٧٣ ، ٢٧٤ ، زاد المعاد ٢/١٥٦ ، مختصر سيرة الرسول ،نووسینی شێخ عبدوڵلای نەجدی ، ل٣٢٧.

بەلاَم (عبدالله)ی کوڕی (رواحة) دژی ئەم بۆچوونە بوو ، هانی خەڵکیدا بۆ شەڕو پێی وتن: ئێوە بۆ ئەو مەبەستە دەرچوون کە ئێستا لەسەر دڵتان گرانە ، ئەویش شەهادەتە ، ئێمە بەژمارە شەڕناکەین لەگەڵ دوژمن ، بەم ئایینە شەڕیان لەگەڵدا دەکەین کە خوا بەهۆیەوە ڕێزی لێ گرتووین ، بەڕێکەون ، یان سەرکەوتنە یان شەهید بوون . لەکۆتاییدا ڕا هاتە سەر ڕایەکەی (عبدالله)ی کوڕی (رواحة).

## سوپای ئیسلام بەرەو لای دوژمن دەجوڵێت

پاش ئەوەی کە سوپای ئیسلام دووشەوی لە (معان)دا بەسەر برد ، بەرەو خاکی دوژمن کەوتنە جوڵە ، هەتا سوپاکەی (هرقل) یان لە گوندێکی (بلقاء)دا پێگەیشت پێی دەڵێن (مشارف) ، دوژمن نزیك بووەوە ، موسڵمانەکان لایاندا بەلای (مؤتة)دا لەوێ سەربازگەیان داناو ، خۆیان سازکرد بۆ شەڕ ، لای ڕاستەوە (قطبة)ی کوڕی (قتادة)ی (عذری)و لای چەپیشەوە (عبادة)ی کوڕی (مالك)ی (انصاری) یان دانا.

## سەرەتای جەنگ و بەدوای یەکداهاتنی سەرکردەکان

لە (مؤتة)دا هەردوولا پێکداهاتن ، شەڕێکی سەخت ڕوویدا ، (سێ هەزار) شەڕکەر دژ بە(دووسەد هەزار) چەکدار وەستاونەتەوە ، شەڕێکی سەرسورهێنەرەو دونیا بەسەرسامییەوە چاوەڕوانی دەکات ، بەلاَم کەگەردەلولی باوەڕ هەڵی کرد ئاکامی سەر سوڕهێنەر دەهێنێتە کایەوە.

ئالاَکە بەدەست (زید)ی کوڕی (حارثة)ەی پیاوە خۆشەویستەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو، بەسەختی شەڕی دەکرد ، شەڕێك کەم کەس لە سەربازانی تر دەتوانن ئەو جەنگە بکەن ، مەگەر سەربازانی ئیسلام ، بەردەوام شەڕی کرد تاکەوتە نێو ڕمو تیری دوژمنانەوەو شەهید کرا.

دوای ئەو (جعفر)ی کوڕی (ابو طالب) ئالاَکەی هەڵگرت ، شەڕێکی قارەمانانەی کرد ، تا شەڕ شەکەتی کرد لەسەر ئەسپەکەی (شقراء) کەوتە خوارەوە ، پاشان دەستی کردەوە بەجەنگ تادەستی ڕاستی قرتا ، ئەنجا ئالاَکەی بە دەستی چەپی هەڵگرت ، دەستی چەپیشیان قرتاند ، ئەنجا خۆیدا بەسەر ئالاَکەدا ڕای گرت هەتا دوا هەناسەو شەهید کرا ، دەڵێن: کابرایەکی ڕۆمی شیرێکی لێداوە لەتی کردوە ئەنجا مردوە ، خوای مەزن لەجیاتی هەردوو باڵیدا دووباڵی پێ بەخشی لەبەهەشتدا پێی بفڕێت بۆ هەر شوێنێك خۆی دەیەوێت ، لەبەرئەوە ناونرا:(جعفر الطیار) جەعفەری باڵدار ، جەعفەری دووباڵ.

(بخاری) دەگێڕێتەوە لە (نافع)ەوە دەڵێت: (ابن عمر) چووە سەرلاشەکەی بینی نزیکەی پەنجا برینی پێوەیە بە ڕمو شیر، هیچ کامیان لەپشتەوە بەری نەکەوتوە.[1]

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتوە، (ابن عمر) دەڵێت: لەو شەڕەدا لەگەڵیاندا بووم، گەڕاین بۆ (جعفر)ی کوڕی (ابو طالب) لەنێو کوژراوەکاندا دۆزیمانەوە، شەست و ئەوەندە برین و شوێنی بەرکەوتنمان بینی بەجەستەیەوە کە ڕمو شمشێر لێیدا بوو[2]. لەڕیوایەتەکەی (العمری)شدا لە (نافع)ەوە ئەم بەشەی لەسەرە: (هەموو ئەو برینانە بەر پێشەوەی جەستەی کەوتبوو).[3]

کە (جعفر)یش شەهید کرا ئیتر (عبدالله)ی کوڕی (رواحة) بەهەمان جۆری قارەمانێتی خۆی فڕێدایەوە ناو گەرمەی شەڕەکەو ئاڵاکەی بردە پێشەوە، بەسواری ئەسپەکەوە دەیویست لە ئەسپەکەی دابەزێت، هاواری دەکردو ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

| | |
|---|---|
| أَقْسَمْتُ يــانفسُ لَتَنْزِلَنَّــــهْ | كارهةً أو لَتُطـــــاوِعَنَّــهْ |
| إنْ أجلبَ الناسُ وشدُّوا الرنَّةْ | مالی أراكِ تكرهينَ الجَنَّةْ ؟! |

پاشان لە ئەسپەکەی دابەزی، ئامۆزایەکی پارچەیەك گۆشتی بۆ هێناو پێی وت: ئەمە بخۆ بابەرگەی ئەو شەڕە بگریت، ئەوە چەند ڕۆژە تۆ هیچت نەخواردوە، لێی وەرگرت یەك پارچەی لێکردەوە، ئەنجا فڕێیداو شمشێرەکەی هەڵگرت و چووەوە ناو شەڕەکە، جەنگا هەتا شەهید کرا.

## ئالاکە بەدەستی شمشێرێکی خوداوە

لەوێدا ئالاکە کەوتە دەست پیاوێکی خێڵی (بنی عجلان) ناوی (ثابت)ی کوڕی (أرقم) بوو ئاڵاکەی بەرز کردەوەو وتی: موسڵمانینە، ڕێکەون لەسەر پیاوێك ئەم ئاڵایە هەڵگرێت، وتیان: تۆ هەڵی بگرە، وتی: من ناتوانم. موسڵمانان بڕیاریاندا لەسەر ئەوەی (خالد)ی کوڕی (وەلید) هەڵی بگرێت، بەرزی کردەوەو شەڕێکی ئازایانەی کرد. (بخاری) لە (خالد)ی کوڕی (ولید)ەوە دەیگێڕێتەوە، وتویەتی: لە ڕۆژی (مؤتة)دا نۆ شمشێر بەدەستمەوە شکاوە لەکۆتاییدا شمشێرێکی یەمانیم بە

---

[1] / صحیح البخاری (باب غزوة مؤتة من أرض الشام ٦١١/٢.
[2] / هەمان سەرچاوە ٦١١/٢.
[3] / بڕوانە (فتح الباری) ٥١٢/٧، ڕوانەتی فەرموده جیاوازی تەنها لەژمارەکەدایە، هەردوو ڕیوایەتەکە کراون بەیەك بەپێی ژمارەی ئەو تیرانەی بەری کەوتون، بڕوانە هەمان سەرچاوە.

دهستەوە مایەوە[1]. لەدەربڕینێکی تردا هاتووە: لە ڕۆژی (مؤتة)دا نۆ شمشێر بە دەستمەوە شەقی برد ، تەنها شمشێرێکی یەمانی بەرگەی گرت بەدەستمەوە.[2]

پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (مؤتة)دا بە(وەحی) هەواڵی شەهیدبوونی هاوەڵەکانی پێگەیشت لەمەدینە، پێش ئەوەی خەڵك هەواڵی شەڕەکە بهێنن ، فەرمووی: ئەوە(زید) ئاڵاکەی هەڵگرت و شەهید بوو ، پاشان (جعفر) هەڵی گرت و ئەویش شەهید بوو ، پاشان (عبدالله)ی کوڕی (رواحة) هەڵی گرت و ئەویش شەهید بوو ـ کە ئەمەی دەوت چاوی پیرۆزی فرمێسکی دەباراند ـ تا شمشێرێکی خودا ئاڵاکەی هەڵگرت و ڕزگاریان بوو.[3]

## کۆتـــایی جەنگەکـە

لەگەڵ نواندنی ئەو ئازایەتیە کەم وێنەیەدا زۆر سەیر بوو کە سوپایەکی وابچوك لەبەر دەم شاڵاوی یەك لەدوای یەکی ئەو سوپا گەورەیەدا بوەستێت. بۆیە لەو هەڵوێستەدا (خالد)ی کوڕی (ولید) لێهاتویی خۆیی دەرخست لە ڕزگارکردنی موسڵمانەکاندا لەو شەڕە قورسەی خۆیان تێئاڵاندبوو.

ریوایەتەکان جیاوازن لەسەر چارەنووسی شەڕەکە ، پاش تێڕامان لە سەرجەم ڕیواتەکان وادەردەکەوێت ، کە (خالد)ی کوڕی (ولید) بەدرێژایی ئەو ڕۆژە توانیویەتی بەرەنگاری ڕۆمەکان بکات ، لە یەکەم ڕۆژی شەڕدا هەستی کردوە کە پێویستە فێڵێکی جەنگی بەکار بهێنێت دژ بەڕۆمەکان و ترس بخاتە دڵیانەوە ، تابتوانێت موسڵمانەکان کەنار بدات بەبێ ئەوەی بوار هەبێت ڕۆمەکان هێرشی بەرامبەرو ڕاوەدونان بکەن ، چونکە زۆرباش دەیزانی قوتار بوون لەو سوپا زەبەلاحە ئەستەمە ئەگەر موسڵمانەکان پاشە کشە بکەن ، بەدوایاندا ڕۆمەکان هێرش دەهێنن‌و تەفرو تونایان دەکەن.

## شــەڕی پاشەکشە

کە ڕۆژی دووەم هات ، باری سوپاکە گۆڕا ، جارێکی تر سازی دانەوە ، شوێنی ڕاست‌و چەپ‌و ناوەڕاستی جێ گۆڕکێ پێ کرد ، کە ڕۆمەکان سەیریان کردن نەیانناسینەوە وایانزانی یارمەتی‌و کۆمەکی نوێیان بۆ هاتووە ، ترسیان لێ نیشت ، ئەنجا (خالد) ورده ورده دەستی کرد بەپاشەکشەیەکی ڕێکوپێك‌و لەسەرخۆ ، لەگەڵ

---

[1] / صحیح البخاری ، باب غزوة مؤتة من ارض الشام ٢/٦١١.
[2] / هەمان سەرچاوە ٢/٦١١.
[3] / هەمان سەرچاوە ٢/٦١١.

پاراستنی ڕێکی ڕیزەکاندا ، ڕۆمەکان شوێنیان نەکەوتن ، چونکە وایانزانی کە ئەمە فێڵی موسڵمانەکانەو بۆ بۆسەنانەوەیە تا بیانخەنە قولایی بیابان و تەفروتونایان بکەن.

بەو شێوەیە سوپای دوژمن بەرەو خاکی خۆی گەڕایەوەو شوێنی موسڵمانەکان نەکەوت ، موسڵمانەکانیش توانیان بەسەلامەتی خۆیان کەناربدەن‌و بگەڕێنەوە بۆ مەدینە [1].

## کوژراوانی هەردوولا

لەو شەڕەدا موسڵمانەکان دوانزە کەسیان لێ شەهید کرا ، ڕۆمەکانیش ژمارەی کوژراوەکانیان نازانرێت ، بەڵام باسی درێژەی شەڕەکە بەڵگەیە لەسەر زۆریی کوژراوەکانیان.

## کاریگەریی جەنگەکە

لەو شەڕەدا هەرچەندە موسڵمانەکان نەیانتوانی تۆڵەی خۆیان بکەنەوە ، بەڵام کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو بۆ ناوبانگی موسڵمانەکان ، هەموو عەرەبی خستە حاڵەتی سەرسوڕمان ئەبلەق بوونەوە ، چونکە لەو ڕۆژگارەدا ڕۆمەکان گەورەترین و تاکە دەسەڵاتداری سەربازیی دونیا بوون، عەرەب پێیان وابوو کە جەنگ کردن لەگەڵ ڕۆمەکاندا مانای خۆکوشتن‌و فەوتانە ، بۆیە جەنگکردنی ئەو سوپا بچوکە لەگەڵ ئەو سوپا زەبەلاحەی سەر زەویدا ، کە دووسەد هەزارسوار دەبوون‌و پاشان گەڕانەوەش بە بێ زیانێکی ئەوتۆ ، بوو بەیەکێك لە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی ڕۆژگارو ئەوەی دەردەخست کە سوپای موسڵمانەکان تەرزێکی نوێیە لە سوپاو لەو جۆرە ئاساییە نیە ، کە عەرەب پێی ڕاهاتووە، بێگومان ئەوانە خوا سەریان دەخات و سەرکردەکەیان پێغەمبەری خوایە، بۆیە دەبینین دوای ئەو ڕووداوە ئەو خێڵە سەرسەختانەی کە هەمیشەو هەردەم هەڵدەگڕان بەڕووی موسڵمانەکاندا ، موسڵمان بوون ، ئەوەبوو خێڵی (بنو سليم)و (أشجع)و (غطفان)و (ذبيان)و (فزارة)و چەندینی تریش موسڵمان بوون .

ئەو جەنگە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕی خوێناوی بوو لەگەڵ ڕۆمەکاندا ، ڕێ خۆشکردن و سەرەتایەك بوو بۆ فەتح کردنی وڵاتەکانی ڕۆم‌و گرتنی زەویە دورەکان لەلایەن موسڵمانەکانەوە.

---

[1] بڕوانە (فتح الباري) ٧/٥١٣، ٥١٤ و (زاد المعاد) ٢/١٥٦ و درێژەی شەڕەکە لەو دوو سەرچاوەیەوە وەرگیراوە لەگەڵ دوو سەرچاوەکەی پێشتر.

## سریەی (ذات السلاسل)

که پێغەمبەر ﷺ هەڵوێستی ئەو خێڵە عەرەبانەی بۆ دەرکەوت کە لە دەورو بەری شامدان و هاوکاری و پشتیوانی ڕۆمەکان دەکەن دژ بەموسڵمانەکان ، هەستی کرد کە پێویستە دانایییەکی تەواو بەکاربهێنێت بۆ تێکدانی نێوان ئەو گرۆهانەو ڕۆمەکان و ببێتە هۆی ئەوەی تا ناچاربن یەکبگرن لەگەڵ موسڵمانەکاندا دژ بە ڕۆمەکان و جارێکی تر کۆمەڵی لەو شێوەیە دژ بە موسڵمانەکان گرد نەکەنەوە.

(عمرو)ی کوڕی (عاصی)ی هەڵبژارد بۆ جێبەجێ کردنی ئەم نەخشەیە ، چونکە نەنکی (دایکی باوکی) سەر بە خێڵی (بلي) بوو ، لە مانگی (جەمادی دوو)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا ناردی بۆ ناویان لەدوای جەنگی (مؤتة)ەوە بۆ ئەوەی ڕایانکێشێت ، لەبارەی ئەم ڕۆشتنەی (عمرو)وە دەڵێت: پێدەچێت کە هەواڵگرەکان هەواڵیان هێنابێت گوایە کۆمەڵێکی خێڵی (قضاعة) کۆبونەتەوە تابدەن بەسەر مەدینەدا ، پێغەمبەریش ﷺ (عمرو)ی ناردووە بۆیان ، لەوانەشە هەردوو هۆیەکە پێکەوە بووبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئالأیەکی سپی دایە دەست (عمرو)ی کوڕی (عاص)و ، هاوڕا ئالأیەکی ڕەشیشی لەگەڵدا ناردو لەگەڵ سێسەد کەسی کۆچکەرو ئەنساریدا بەڕێی کردن ، سی ئەسپ سواریان لەگەڵدابوو ، فەرمانی پێدا کە یارمەتی وەربگرێت لە هەر کەسێکی خێڵی (بلي) و (عزرة) و (بلقين) کە بەلایدا بگوزەرێن ، شەو دەجولاو بە ڕۆژ خۆی کەنار دەدا ، کە لەکۆمەڵەکە نزیك بووەوە هەواڵی بۆ هات کە ژمارەیان زۆر زۆرە ، ئەنجا (رافع)ی کوڕی (مكيث)ی (جهني) نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای کۆمەکی تری لێکرد ، پێغەمبەریش ﷺ بەسەرکردایەتی (ابو عبيدة)ی کوڕی (جراح) دووسەد سواری تری نارد لە کۆچکەران و ئەنسارەکان کە (ابوبكر)و (عمر) یان تێدابوو ، ئالأی دایەدەستیان و فەرمانی پێدان کۆبن و ڕا جیاواز نەبن ، کە (ابو عبيدة) گەیشتە (عمرو) ویستی ئیمامەت بکا بۆ خەڵك ، (عمرو) وتی: تۆ کۆمەکیت بۆ من هێناوە ، من میری سوپاکەم ، (ابو عبيدة) دەستبەجێ بەگوێی کردو، (عمرو) نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد.

ڕۆشتن هەتا گەیشتنە ناوچەی (قضاعة) ، چوە ناوی و ئەوپەڕی شوێنەکەی گرت ، لەکۆتاییدا کۆمەڵێکی بینی ، هێرشیان کردە سەریان ، ئەوانیش ڕایانکردو شوێنەکەیان بەجیٚ هێشتو بڵاوەیان لیٚ کرد.

ئەنجا (عەوف)ی کوڕی (مالك)ی (أشجعی) وەك فروستادەیەك نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی گەڕانەوەو سەلامەتی سوپاکەی پێڕاگەیاندو هەواڵی جەنگەکەی بۆ گێڕایەوە.

(ذات السلاسل) شوێنێکە کەوتۆتە پشت (وادی القری) لەو شوێنەوە بۆ مەدینە (١٠) ڕۆژ پیادەیە ، (ابن اسحاق) یش دەڵێت: موسڵمانەکان لەسەر ئاوێك لایاندا لە خاکی (جذام)دا ، پێی دەڵێن (السلسل) بەو بۆنەیەوە ناونرا بە (ذات السلاسل).[1]

## سریەی (أبی قتادة) بۆ (خضرة)

ئەم سریەیە لەمانگی (شعبان)ی ساڵی ٨ی کۆچی‌دا بوو، چونکە (بنی‌غطفان) لە ناوچەی (خضرة)دا خۆیان مۆڵدا بوو (خضرة) زەوی (محارب)ە لەناو نەجددا ، پێغەمبەری خوا ﷺ (أبا قتادة)ی بۆناردن لەگەڵ (١٥) پیاودا ، ئەوەبوو هەندێکیان لیٚ کوشتن‌و چەند کەسێکیشیان لیٚ گرتن و مەڕومالاٚتێکی زۆریان گرت ، سریەکە (١٥) شەوی پێچوو.[2]

---

[1] / بڕوانە (سیرة ابن هشام) ٢/٦٢٣، ٦٢٤، ٦٢٥، ٦٢٦ و (زاد المعاد) ٢/١٥٧.

[2] / رحمة للعالمین ٢/٢٣٣ ، (تلقیح فهوم أهل الأثر) ل ٣٣.

## غەزای فەتح کردنی مەککە

(ابن قیم) دەڵێت: ڕزگارکردنی مەککە ئەو فەتحە گەورەیە بوو ، کە خودای مەزن بەهۆیەوە ئاین و پێغەمبەرەکەی و سەربازو کۆمەڵەکەی سەرخست و ماڵەکەی خۆی پێ پاککردەوەو کردیە سەکۆی هیدایەتی هەموو جیهانیان و ڕزگارکرد لە دەست موشریکان ، ڕزگارکردنی مەککە ئەو فەتحە بوو کە فریشتەکانی ئاسمان مژدەیان پێدەداو ورشەو جوانی بەئەستێرەکانی ئاسمانیش بەخشی و بەهۆیەوە پۆل پۆل خەڵکان هاتنە سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام و زەوی پێ ڕووناك بەوەوە.[1]

## هۆی غەزاکە

پێشتر لە ڕووداوی (حدیبیة)دا وتمان کە یەکێك لە بەندەکان ئەوەبوو هەر کەسێك ویستی ، بابڕواتە هاوپەیمانی موحەممەدەوە ﷺ ، هەرکەسێکیش ویستی با بڕواتە هاوپەیمانی قورەیشەوە ، هەر تیرەیەکیش دەڕواتە ناو هاوپەیمانێتی هەر لایەنێك ئەوا دەبێتە بەشێك لەولایەنەو هەردەست درێژیەك بۆ سەری دادەنرێت بە دەستدرێژی بۆ سەر لایەنی سەرەکیی هاوپەیمانێك.

بەپێی ئەو بەندە خێڵی (خزاعە) چوونە ناو هاوپەیمانی پێغەمبەرەوە ﷺ و (بنو بکر)یش چوونە ناو هاوپەیمانیی قورەیشەوە ، هەریەکێك لەو دوو تیرە چوونە پەنای یەکێك لە دوولایەنەکە ، لەنێوان ئەو دوو تیرەیەشدا پێشتر دوژمنایەتی جاهیلیەت هەبوو ، جاروبار دەیاندا بەسەر یەکتریدا ، کە ئیسلام هات و ئەم پەیماننامەیە نوسرا ، هەر یەکێکیان بەئارامی دانیشت ، بەڵام (بنو بکر) ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە بۆ سەندنەوەی کۆنە تۆڵەیەك ، (نوفل)ی کوڕی (معاویە)ی (دیلی) لەگەڵ کۆمەڵێك کەسی تیرەی (بنو بکر)دا لە مانگی (شەعبان)ی ساڵی (٨)ی کۆچی‌دا بە شەو دایان بەسەر (خزاعە)دا کە لەکاتێکدا بۆ حەوانەوە لەسەر ئاوێك لایان دابوو ناوی (وتیر) بوو ، چەند پیاوێکیان لێ کوشتن‌و دەستیان لەیەکتر وەشاند ، قورەیش (بنو بکر)یان پڕ چەك کردبوو ، هەندێك چەکداری تری خێڵی قورەیش تاریکی شەویان بە هەل زانیبوو لەگەڵیاندا بەشداریان کردبوو ، تا ناچاریان کرد بوون بەرەو (حەرەم) هەڵبێن ، کە گەیشتبونە (حەرەم) ، خێڵی (بنو بکر) هاواریان کردە (نوفل) ، وتیان : (نوفل) نەکەیت ئەوا گەیشتینە (حەرەم) ، لە خوا بێ ئاگا مەبە. (نوفل) قسەیەکی زۆر خراپی لەدەم دەرچوو ، وتی: (بنی بکر) لەمڕۆ

[1] / زاد المعاد ٢/١٦٠.

بەدواوە ئیتر خوا نیە ، برۆن تۆڵەی کۆنە قینی خۆتان بکەنەوە ، سوێند دەخۆم ئێوە لە حەرەمدا دزیش دەکەن ، چۆن ئێستە تۆڵەی خۆتانی تێدا ناکەنەوە؟

کە (خزاعە) گەیشتنە مەککە پەنایان برد بۆ ماڵەکەی (بدیل)ی کوڕی (ورقاء)ی (خزاعی) لەگەڵ ماڵی دۆستێکیدا کە ناوی (رافع) بوو.

(عمرو)ی کوڕی (سالم)ی (خوزاعی) بە پەلە خۆی گەیاندە مەدینەو چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و لەبەردەمیدا وەستا ، پێغەمبەر ﷺ لەناو مزگەوتدا دانیشتبوو کۆمەڵێك لە موسڵمانانی بەدەوردا بوو ، (عمرو) دەستی کرد بە گوتار خوێندنەوە:

یـــــا ربّ إنّي نــــاشدٌ محمَّـــداَ   حلفَنـــا وحلفَ أبيه الأَ تـــلَدا[1]

قد كنتـــمُ ولداً وكنـــا والداَ[2]   ثـــمَّة أسلمنا ولم نَنْـــزِع يَـــدا

فـــانصُرْ هداكَ الله نصراً أيِّـــدا   وادعُ عبادَ الله يـــأتوا مَـــدَدَا

فيهـــم رســـولُ الله قد تجرّدا   ابيضَ مثلَ البَدرِ يسموا صُعُدا

ان سِيْمَ خسفـــاً وجهُهُ تَرَبَّـــدا   في فريق كالبحر يجري مُزْبِـــدا

ان قـــريشاً أخلـــفوك الموعدا   ونقضـــوا ميثـــاقَكَ المـــؤَكَّدا

وجعلُوا لـــي في كـــداءٍ رَصَدا   وزعموا أن لستُ ادعوا أحَدَا

وهم أذلٌّ ، وأقـــلُّ عـــــددا   هم بَيَّتـــونـــا بـــالوتير هُجَدا

وقتلـــونـــا ركّعـــاً وسُجَّـــداً[3]

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: خەمت نەبێت پشتیوانیت لێ دەکرێت.

پاشان هەورێك کەوتە ڕووی ئاسمان ، فەرمووی : ئەو هەورەش سەرەتای سەرکەوتنی (بنی کعب)ە.

پاشان (بدیل)ی کوڕی (ورقاء)ی (خزاعی) لەگەڵ چەندپیاوێکی خێڵی (خزاعە) دا کەوتنەڕێ بەرەو مەدینە ، ئەوەستان هەتا گەیشتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەوە هەواڵی ڕووداوەکەو کوژراوەکانی خۆیاندایە ، ئەوەشیان پێوت: کە قوڕەیش یارمەتی (بنی بکر)ی داوە لەو هێرشەدا، ئەنجا وەفدەکەی گەڕانەوە بۆ مەککە.

---

[1] / اتلد: واتە: کۆن ، ئاماژەدەکات بۆ ئوپەیمانەی لەکۆندا لەنێوان (خزاعە) و (بنی هاشم)دا لەسەردەمی (عبد المطلب) دا ڕووی داوە.

[2] / ئاماژەیە بۆ دایکی( عبد المناف) کەناوی (حبی)یەو هاوسەری (قصی)یە ، لە خێڵی خزاعە بە.

[3] / لەبەیتێکی تردا دەڵێت : قتلنا وقد أسلمنا.

## ( أبو سفيان ) دەچێت بۆ مەدینە
## بۆ تازەکردنەوەی سوڵحەکە

گومانی تێدانیە ئەو تاوانەی قورەیش و هاوپەیمانەکانی ئەنجامیاندا ، پەیمان شکێنیەکی تەواوو پێشێلکردنی پەیماننامەکەی نێوانیان بوو، بیٚ ئەوەی هیچ بەهانەیەك هەبێت ، لەبەرئەوە کە قوریش هەستی بەو پەیمانشکێنیە کرد ، لە چارەنووسی کارەکەو دەستبەجیٚ ئەنجوومەنێکی ڕاوێژکاریان بەستو بڕیاریاندا کە (أبوسفیان)ی سەرکردەیان وەك نوێنەر بنێرن بۆ تازەکردنەوەی سوڵحەکە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیدا بەهاوەڵانی خۆی ، کە لەدوای ئەم پەیمانشکێنیە قورەیش چی دەکات ، فەرمووی: دەبینن (أبو سفیان) خۆی دەگەیەنێتە ئێرە بۆ توند کردنەوەی عەقدەکەو درێژکردنەوەی ماوەی سوڵحەکە .

(أبو سفیان) بەو پێیەی قورەیش بڕیاریدا دەرچوو ، لە (غطفان) گەیشت بە (بدیل)ی کوڕی (ورقاء) لەو سەرەوە بەرەو مەککە دەگەڕایەوە ،

پێی وت: (بدیل) لە کوێوە دێیت ؟

(أبو سفیان) دەیزانی کە چووەتە لای پێغەمبەر ﷺ.

(بدیل) وتی: لەناو ئەو شیوەدا بەرەو کەناری دەریا سەردانی (خزاعە)م کرد.

(أبو سفیان) وتی: سەردانی (محمد)ت کردوە؟

(بدیل) وتی: نەخێر.

کە لێك جیابونەوەو (بدیل) چوو بەرەو مەککە ، (أبو سفیان) لەدڵی خۆیدا وتی: ئەگەر (بدیل) گەیشتبێتە مەدینە ئەوا لەئاڵفەکەیدا ناوکی تێدایە ، چوو لەلایەکەوە پشقلی وشترەکەی (بدیل)ی پشکنی سەیری کرد ناوکی تێدایە ،

وتی: سوێند دەخۆم بەخوا چووەتە لای (محمد)و تێی گەیاندووە.

(أبو سفیان) گەیشتە مەدینە ، چووە ماڵی (أم حبیبە)ی کچی ، ویستی لەسەر ڕاخەرەکەی پێغەمبەر ﷺ دابنیشێت ، لەژێریدا دەری کێشا ،

وتی: ئەریٚ کچیٚ بۆ وادەکەیت؟

وتی: ئەوە ڕاخەری پێغەمبەری خوایە ﷺ تۆ پیاوێکی موشریکی پیسی.

(أبو سفيان) وتی: وەڵلاهی دوای من ، تووشی خراپە بوویت.

پاشان دەرچوو ، هەتا گەیشتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵدا کرد ، وەلاّمی نەدایەوە ، پاشان چوو قسەی کرد لەگەڵ (أبوبكر)دا ، بەڵکو تکا بکات لای پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵدا بکات . وتی: من شتی واناکەم .

پاشان چووە لای (عمر)ی کوڕی (خطاب) قسەی لەگەڵدا کرد ، (عمر) پێی وت: من تکاتان بۆ بکەم لای پێغەمبەر ﷺ ؟ وەڵلاهی ئەگەر دەنکە زەڕاتێکیش مابێت ، لەسەری ، شەڕتان لەگەڵدا دەکەم .

پاشان چووە لای (علی) کوڕی (أبی طالب) (فاطمة) لای دانیشتبوو، (حسن) یش منالێکی بچوك بوو گەمەو یاری دەکرد لەو ناوەدا ،

وتی: (علی) تۆ لەهەموویان زیاتر لە من نزیکتری ، بۆ کارێك هاتووم ، نامەوێت بەنائومێدی بگەڕێمەوە ، تکام بۆ بکە لای موحەممەد با قسەم لەگەڵدا بکات ،

(علی) پێی وت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات (أبو سفيان) ، پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەر شتێك داوە ، کەسمان ناتوانین قسەی تێدا بکەین ،

ئەنجا لای کردەوە بەلای (فاطمة)دا وتی: ئایا تۆ دەتوانیت کوڕەکەت وا لێ بکەیت پەنای خەڵکی بدات و تا دواڕۆژیش سەرکردەی هەموو عەرەب بێت؟

(فاطمة) وتی: وەڵلاّ کوڕەکەی من ناگاتە ئەوە کە بتوانێت پەنای خەڵکی بدات ، کەسیش ناتوانێت بێ فەرمانی بەسەر پێغەمبەر ﷺ پەنای کەس بدات.

لەوێدا هەموو دونیا لەبەرچاوی (أبو سفيان) تاریك بوو ، بە (علی) کوڕی (أبو طالب)ی وت: بەترس و لەرزو بێتاقەتیو نائومێدیەکی زۆرەوە: (أبو الحسن) وادەبینم سەری دونیام لێ هاتۆتەوە یەك ، تکایە ئامۆژگاریم بکەو چی بکەم باشە؟

وتی: وەڵلاهی نازانم چیت پێبڵێم بەکەڵکت بێت، بەلاّم تۆ گەورەی (بنی کنانە) یت هەستە بڕۆ خۆت پەنابدە لەناوخەڵکیداو خۆت بگەیەنەوە بە خاك و ئاوی خۆت.

وتی: جائەوە هیچ سوودێکی هەیە؟

(علی) وتی: نەوەڵلاّ باوەڕناکەم، بەلاّم جگە لەو قسەیە هیچیتر شك نابەم.

(أبو سفيان) هاتەوە بۆ مزگەوت ، وتی: خەڵکینە ئەوا من خۆم پەناداوە لەناو خەڵکدا . پاشان سواری وشترەکەی بوو ، گەڕایەوە بۆ مەککە.

کەچووە ناو خێڵی قورەیش ، وتیان: چیت کرد؟

وتی: چووم بۆ لای (محمد)و قسەم لەگەڵدا کرد ، وەڵلاهی وەلامی نەدامەوە ، چووم بۆ لای (ابن أبی قحافه) لای ئەویش هیچم پێ نەکرا ، پاشان چووم بۆ لای (عمر)ی کوڕی (خطاب) بینیم لەهەموویان توندتر بوو ، پاشان چوومە لای (علی) لە هەموویان نەرم و نیانتر بوو ، شتێکی پێ وتم بەگوێم کرد ، وەڵلاهی نازانم ئەوە دادم دەدات یان نا؟

وتیان: ئەی چی پێ وتی؟

وتی: پێی وتم: کە خۆم حەشار بدەم لەناو خەڵکیدا ، منیش وام کرد.

وتیان: ئایا موحەمەد ڕێگەی ئەوەی پێدایت؟

وتی: نەخێر ،

وتیان: نەگبەت ، بەخوا موحەمەد گاڵتەی بەعەقڵت هاتووە ،

وتی: نەوەڵلا ، جگە لەوە هیچی ترم بەدەستەوە نەبوو.

# خۆ سازدان بۆ غەزاکەو
# هەوڵی ئاشکرا نەکردنی

لە ڕیوایەتەکەی (طبرانی)دا هاتوە ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەعائیشە ، سێ ڕۆژ پێش هاتنی هەواڵی پەیمان شکێنیەکە ، فەرمانی پێدا کە کەلوپەلی بۆ بپێچێتەوە ، کەس بەمەی نەدەزانی ، (أبوبکر) چووە لای (عائیشە) وتی: کچێ ئەم خۆ پێچانەوەیە چییە؟

(عائشە) وتی: وەڵڵاهی نازانم .

(أبوبکر) وتی: خۆ ئەمڕۆ ڕۆژی غەزای (بنو الاصفر)یش نیە .

ئەنجا وتی: پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت بۆ کوێ تەشریف ببات؟

وتی: وەڵڵاهی هیچ نازانم.

لە بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەمدا (عمرو)ی کوڕی (سالم)ی (خزاعی) لەگەڵ چل ئەسپ سواردا گەیشتنە مەدینە ، هەستاو شیعرەکەی خوێندەوە ( یارب انی ناشد محمداَ... ) ، ئیتر خەڵکەکە بەپەیمانشکێنیەکەیان زانی ، پاش (عمرو) یش ، کە (بدیل) هاتو پاشان (أبو سفیان)یش گەیشتە مەدینە ، ئیتر خەڵکەکە بڕوای تەواوی سەبارەت بە پەیمانشکێنیەکە بۆ دروست بوو ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەخەڵکەکە خۆیان ئامادە بکەنو پێی ڕاگەیاندن کە بۆ مەککە دەڕوات . دوعای کردو فەرمووی: خوایە چاوو دڵیان لە ئاستماندا کوێر بکەیت تا دەدەین بەسەریاندا.

بۆ زیاتر چەواشەکردنو شاردنەوەی حاڵەتەکە ، پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی هەشت کەسی نارد بە سەرۆکایەتی (أبی قتادە)ی (ربعی) بۆ ناو (أضم) لەنێوان (ذي خشب)و (ذي مروة)دا کە سێ قۆناغ لە مەدینەوە دوورە ، لەمانگی (ڕەمەزان)ی ساڵی(٨)ی کۆچیدا ، بۆ ئەوەی بۆچونێك لای خەڵك دروست بکات کە بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات ، هەواڵەکان بەو شێوازە بگاتەوە بە مەککە ، سریەکە کەوتەڕێ ، تاگەیشتە ئەو شوێنەی فەرمانی پێدرابوو ، ئەنجا هەواڵی پێگەیشت کە پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەککە ڕۆشتوە ، گەڕانەوەو خۆیان گەیاندەوە بەکاروانەکەی پێغەمبەر ﷺ.[1]

---

[1] / ئەم سریە دەگەن بە(عامر)ی کوڕی (أضبط)، بەسڵاوی ئیسلامەتی سڵاویان لێ دەکات ، کەچی (محلم)ی کوڕی (جثامة) لەبەرشتێکی نێوانیان لێیداو کوشتی، وشترەکەی برد لەگەڵ خۆیدا ، خوای مەزن ئایەتی نارده خوارەوە ﴿ وَلَا تَقولوا لِمَنْ أَلقى إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤمِنـا ﴾ ئایەتەکە ، ئەوەبوو (محلم) یان هێنا تاپێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات ، کە هاتە بەردەستی فەرمووی: خوایە لە (محلم) خۆش نەبیت، ئەمەی سێجار وتەوە ، کە هەستا پێدەچوو بەچمکی کراسەکەی فرمێسکەکانی بسڕێت ، (ابن اسحاق) دەڵێت: کەسوکارەکەی دەڵێن: دوای ئەوە داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوە ، بڕوانە (زاد المعاد ٢/١٥٠) هەروەها ابن هاشم ٢/٦٢٧، ٦٢٨.

(حاطب)ی کوڕی (ابی بلتعة)یش بەنهێنی نامەیەکی بۆ قوڕەیش نووسی بوو ، تێیگەیاندبوون کە پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەککە دێت ، نامەکەی دا بە ژنێك ناوی (ظعینة) بوو بەڵێنی بەخشیشێکی پێدا بوو ئەگەر بیگەیەنێتە دەست قوڕەیش ، ژنەکە نامەکەی خستە ناو پرچییەوە ، پاشان دەرچوو بەوەحی هەواڵدرا بە پێغەمبەر ﷺ کە (حاطب) چی کردوە، خێرا (علی) و (مقداد)ی نارد بەشوێن ژنەکەداو پێی فەرموون: بڕۆن تا دەگەنە باخچەی (خاخ) ، (ظعینة) لەوێیە نامەیەکی پێیە بۆ قوڕەیشی دەبات ، بە ئەسپ سواری دوای کەوتن تا لە شوێنی دیاریکراودا ژنەکەیان بینی ، پێیان وت: نامەیەکت پێیە؟

ژنەکە وتی: نەخێر، هیچ نامەیەکم پیٚ نیە. کەلوپەلەکەی گەڕان هیچی تێدا نەبوو.

(علی) پێی وت: سوێند دەخۆم بەخوا نە پێغەمبەر ﷺ درۆ دەکات و نە ئێمەش ، یان ئەوەیە ئێستا نامەکە دەردەهێنیت و دەماندەیتیٚ یان بەزۆر لێتدەسێنین ، کە ژنەکە بینی زۆر سوورن لەسەر لێسەندنی نامەکە ،

پێی وتن: ڕوو وەرگێڕە.

(علی) ڕووی وەرگێڕا ، گرێی پرچەکەی کردەوەو نامەکەی تێدا دەرهێناو دایەدەستیان ، ئەوانیش نامەکەیان هێنایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، تیایدا نووسرا بوو: لە (حاطب)ی کوڕی (ابی بلتعة)وە بۆ قوڕەیش)؛ لە نامەکەدا هەواڵی ڕووگەی کەوتنە ڕێی پێغەمبەری ﷺ پیٚ ڕاگەیاندبوون ، پێغەمبەری خودا ﷺ (حاطب)ی بانگ کرد ، فەرمووی: ئەمە چی‌یە (حاطب)؟

(حاطب) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ داوات لیٚ دەکەم پەلەم لیٚمەکە ، وەڵڵاهی باوەڕم بەخواو پێغەمبەرەکەی هەیە ، نە هەڵگەڕاومەتەوەو نە دڵم گۆڕاوە ، بەڵام من کابرایەکی بێگانەم لەناو قوڕەیشدا ، کەسوکارو منداڵەکانم لەناویاندان ، کەسێکم نیە پەنایان بداتو لەدەست قوڕەیش بیانپارێزێت ، ئەوانی‌تر کە لەگەڵتدان هەموویان لە مەککەدا کەسوکاریان هەیە دەیانپارێزن ، پێم وابوو کە ئەو پشتو پەنایەم نەبێت ئەم کارە بکەم بۆ ئەوەی دەست نەبەن بۆ ژنو منداڵەکانم .

(عمر)ی کوڕی (خطاب) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەم بدە با لە ملی بدەم ، چونکە ئەوە خیانەتی کردوە لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺو هەڵگەڕاوەتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازبهێنە عومەر ئەمە یەکێکە لەوانەی شەڕی بەدری دیوە ، لەوانەیە خودا لوتفی زۆری لەگەڵ خەڵکی بەدردا کردبێت و فەرمووبێتی: چی دەکەن بیکەن ئەوا من لێتان خۆش بووم.

ئەنجا چاوانی (عمر) فرمێسکیان پێدا هاتە خوارەوەو فەرمووی: خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ باشتر دەزانن.[1]

بەو شێوەیە خوای مەزن چاوانی دوژمنانی لەئاستدا کوێر کرد ، هیچ هەواڵێکی خۆسازدانی سوپای موسڵمانان بۆ چوونە سەر مەککەو شەڕکردن نەگەیشتە گوێی قورەیش.

## سوپای ئیسلام بەرەو مەککە دەڕوات

دە ڕۆژ لە مانگی ڕەمەزان تێپەڕی بوو لە ساڵی (٨)ی کۆچی ، پێغەمبەری خوا ﷺ مەدینەی بەجێهێشت و بەرەو مەککە کەوتەڕێ ، لەگەڵ دەهەزار هاوەڵی خۆیدا ، بەسەر (مەدینە) شەوە (أبو رهم)ی (غفاری) بەجێهێشت.

کە گەیشتنە (جحفة)یان سەرووی (جحفة) ، (عباس)ی مامی پێگەیشت بەخۆی و ژن و منالیەوە موسڵمان بوو بوون و کۆچیان دەکرد ، کە گەیشتنە (ابواء)یش (ابو سفیان)ی کوڕی (حارث)ی ئامۆزای و (عبدالله)ی کوڕی (أبی أمیه)ی پورزای پێگەیشت پشتی تێکردن ، بەهۆی ئەو هەموو جنێوو سوکایەتی و قسە ناشیرینانەوە کە دەیانکرد دژ بە پێغەمبەر ﷺ ، (أم سلمه)ی هاوسەری عەرزی کرد: بائامۆزاکەت و پورزاکەت لە خەڵکی دڵڕەقتر نەبن لەگەڵتدا ، (علی)یش بە (أبو سفیان)ی کوڕی (حارث)ی وت: لە ڕووەوە بچۆ بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ و وەکو براکانی (یوسف) چیان وت بە (یوسف) تۆش عەرزی بکەو بڵێ: ﴿ قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِنْ كُنَّا لَخَاطِئِينَ ﴾ یوسف/٩١. کەسیش نیە لە دونیا وتار شیرین تر بێت لە پێغەمبەر ﷺ . (أبو سفیان) چوو بەرەوڕووی و بەگوێی (علی) کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ قَالَ لاَتَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ یوسف/٩٢.

لەوێدا (أبو سفیان) چەند بەیتێکی شیعری خوێندەوە کە دەڵێت:

لَـعَمْـرُكَ إني حيـن أحملُ رايةً ... لتغـلـبَ خيلُ اللاّت خيلَ مُحَمَّد

لَكَـالُمدْلـجِ الحيران أظلَم ليلُهُ ... فـهذا أواني حينَ أُهدى فأهتَدي

هـدانيَ هـادٍ غيرُ نفسي ودلّني ... على اللهِ مَـنْ طـردتُه كُلَّ مَطْرَدِ

[1] / بڕوانە (صحيح البخاري) ٤٢٢/١، ٦١٢.

لەم بەیتەی کۆتاییدا دەڵێت: کەسێك ڕێنومایی منی کردو ڕێی نیشاندام بۆ لای خوا ، کە پێشتر من شاربەدەرم کرد ، پێغەمبەریش ﷺ دەستی خستە سەر سنگی (أبو سفیان)و فەرمووی: أَنْتَ طَرَدْتَني كلَّ مَطْرَد [1].

## سوپای ئیسلام لە (مر الظهران) دادەبەزێ

پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێگە ڕۆشتنیشەوە بە ڕۆژوو بوو ، خەڵکەکەش بەڕۆژوو بوون ، تاگەیشتنە ئاوی (کدید) ئاوێکە لەنێوان (عسفان) و (قدید)دا ڕۆژووەکەی شکاند خەڵکیش ڕۆژوویان شکاند [2] ، پاشان لە ڕۆشتن بەردەوام بوو تاگەیشتە (مر الظهران) شیوی (فاطمة) لەخەوتنانەدا گەیشتە ئەوێ ، فەرمانی‌دا بەسوپاکە ، لە هەموولایەکەوە ئاگر هەڵکەن ، دەهەزار مەشخەڵی ئاگر هەڵکرا ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ (عمر)ی کوڕی (خطاب)ی کردە سەرکردەی پاسەوانەکان.

## (أبو سفیان) لەبەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ

(عباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ پاش دابەزینی موسڵمانان لە (مر الظهران) سواری هێسترە سپیەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو بوو ، دەرچوو بووە دەرەوە سابەڵکو داربڕێك ببینێت یا کەسێك بەدی بکات هەواڵ بدات بەقورەیش بۆئەوەی خەڵك بنێرن و داوای پەنادان بکەن ، پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بڕواتە ناو مەککەوە.

خوای مەزن چاوی قورەیشی کوێرکردو هیچ هەواڵێکیان پێ نەگەیشت ، لە حاڵەتی دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانیدا بوون ، (ابو سفیان) دەرچووە دەرەوە هەواڵێك ببیسێت ، (حکیم)ی کوڕی (حزام)ی لەگەڵدا بوو ، لەگەڵ (بدیل)ی کوڕی (ورقاء)دا.

(عباس) دەڵێت: بەسواری وشترەکەی پێغەمبەرەوە بووم ﷺ گوێم لێ بوو (أبو سفیان) بە (بدیل)ی کوڕی (ورقاء)ی وت لەکاتی گەڕانەوەدا: لە تەمەنمدا چاوم بەئەوەندە ئاگر نەکەوتووەو ئەوەندە سەربازم نەدیوە. دەڵێت: (بدیل) وتی: وەڵڵاهی ئەوە (خزاعە)یە شەڕ چووەتە بنکڵێشەیان . (أبو سفیان)یش وتی: خێڵی خوزاعە زۆر لەوە بچوکترو کەمترن کە ئەو سەربازگەو ئاگرەیان هەبێت.

---

[1] / ئەم (ابو سفیانە) دوای ئەوە موسڵمانەتیەکی باشی دەکرد ، دەڵێن دوای موسڵمانبوونی ، لە شەرم و شکۆدا ، سەری بەرز نەدەکردەوە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ زۆری خۆشدەویست ، شایەتی بەهەشتی بۆداو فەرمووی: لەخوا داواکارم ببێتە میراتگری حەمزە ، کەکاتی مردنی هات ، وتی: بە سەرمەوە مەگرین وەڵڵاهی لەوەتەی موسوڵمان بووم وشەیەکی هەڵەم لەدەم دەرنەچوە . (زاد المعاد ٢/ ١٦٢، ١٦٣).

[2] / صحيح البخاري ٢/ ٦١٣.

(عباس) دەڵێت: دەنگیم ناسی ، هاوارم لێ کرد: (ابا حنظلة) ئەوە تۆی؟ ئەویش دەنگی ناسیم ، وتی: ئەوە تۆی (ابا الفضل)؟ وتم: بەڵێ. وتی: چیتە؟ دایكو بابم بەقوربانت بن ، وتم: ئەوە پێغەمبەری خوایە لەناو خەڵكیدا ، سبەینێ بەرەبەیان لەناو قورەیشدا ڕۆژ دەكاتەوە.

(ابو سفیان) وتی: چارە چییە؟ دایكو بابم بەقوربانت بن. وتم: وەڵلاهی ئەگەر زاڵ بێت بەسەرتدا دەدا لە ملت ، وەرە لە پشتمەوە سواری ئەم هێسترە ببە ، تا بتبەمە خزمەت پێغەمبەرﷺ و داوای پەنات بۆ بكەم . لە دوامەوە سواربوو ، دوو هاوەڵەكەشی گەڕانەوە بۆ مەككە.

(عباس) دەڵێت: بردم لەگەڵ خۆمدا ، بەلای هەرئاگرێكی موسڵماناندا تێدەپەڕین ، دەیانپرسی: ئەوە كێیە؟ كە منیان دەبینی بەسەر هێسترەكەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەیانوت: ئەوە مامی پێغەمبەرە بەسەر هێسترەكەیەوە. تا بەلای ئاگرەكەی (عمر)ی كوڕی (خطاب)دا تێپەڕیم ، وتی: ئەوە كێیە؟ ئەمەی وت و هات بۆ لام ، كە (أبو سفیان)ی بینی بەسەر پشتی هێسترەكەوە بوو ، وتی: ئەوە (أبو سفیان) ە هەی دوژمنی خوا؟ سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەبێ وادەو پەیمان تۆی هێنایە بەردەستمان . ئەنجا بەڕاكردن چوو بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ ، هێسترەكەم دایە غارو پێشكەوت ، لەسەری كەوتمە خوارەوە ، چوومە ژورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بەدوای منیشدا عومەر خۆی كرد بە ژووردا. وتی: پێغەمبەری خوا ، ئەوە (أبو سفیان)ە ڕێگەم بدە با بدەم لە ملی ، دەڵێت: وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ من پەنام داوە. پاشان لەخزمەتیدا دانیشتمو دەستم گرت بەسەری (أبو سفیان)ەوەو وتم: دەبێت ئەمشەو ئەم پیاوە ڕزگار بكەم. كە (عمر) لەسەری ڕۆیشت ، وتم: (عمر) لەسەرخۆت بە ، وەڵلاهی ئەگەر ئەم پیاوە كەسێكی (بنی كعب) بوایە ئەم قسەیەت نەدەكرد، وتی: تۆش لەسەرخۆ بە (عباس) ، وەڵلاهی موسڵمانبوونی تۆم بەلاوە خۆشتر بوو تا موسڵمان بوونی (خطاب)ی باوكم ، ئەگەر موسڵمان ببوایە ، ئەمەش تەنها لەبەرئەوە بوو چونكە دەزانم كە موسڵمان بوونی تۆلای پێغەمبەر ﷺ خۆشترە لە موسڵمان بوونی (خطاب).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (عباس) لەگەڵ خۆتدا ببیبە بۆ ناو خێوەتگەكەی خۆت ، سبەینێ بیهێنەرەوە بۆ لام. دەڵێت: ڕۆشتم. كە ڕۆژ بووەوە بۆ

سبەینیٚ بردمەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، کە بینی فەرمووی: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات (أبو سفیان) کاتی ئەوە نەهاتوە ، کە بزانی هیچ خودایەك نیە جگە لە ( اللّٰه ) ؟ وتی: دایكو بابم بە قوربانت بن ، چەندە بەحەوسەڵەو ڕێزدارو خزم دۆستیت؟ پێم وایە ئەگەر جگە لە خودا خوایەکی تر هەبوایە دەستبەرداری من نەدەبوو.

فەرمووی: (أبا سفیان) ئەی کاتی ئەوە نەهاتوە کە بزانیت من پێغەمبەری خودام؟ وتی: دایكو باوکم بەقوربانت بێت ، چەندە بەحەوسەڵەو ڕێزدارو خزم دۆستیت؟ سەبارەت بەمەیان هێشتا لەدڵمدا شتێك ماوە. (عباس) پێی وت: دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات موسڵمان بە ، شایەتومان بهێنە ، پێش ئەوەی بدرێت لە گەردنت . لەوێدا (أبو سفیان) شایەتومانی هێنا.

(عباس) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبو سفیان) کابرایەکە حەزی لە ناوبانگە ، پشکێکی بدەریٚ . فەرمووی: بەڵیٚ باشە، هەرکەسێك بڕواتە ماڵی (أبو سفیان) بێوەی دەبێت ، هەرکەسێك دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات بێوەی دەبێت ، هەرکەسێك بڕواتە (بیت الحرام) ئەویش بێوەی دەبێت.

## سوپای ئیسلام (مر الظهران) بەجیٚ دەهێڵێت بەرەو مەککە

لەو بەیانیەدا ، سەرلەبەیانی (ڕۆژی چوارشەمە (١٧)ی مانگی ڕەمەزانیساڵی هەشتەمی کۆچی) ، پێغەمبەر ﷺ (مر الظهران)ی بەجێهێشت بەرەو مەککە ، فەرمووی بە (عباس)ی مامی کە (أبو سفیان) بهێڵێتەوە لە تەنگەبەری شێوەکەی نێو شاخەکەدا تا بەچاوی خۆی سەربازانی خودا ببینێت . (عباس) بەو شێوەیەی کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرموو بووی ، خێڵو تیرەکان هەریەکەیان بەئاڵای خۆیان تێپەڕین هەر لەگەڵ تیرەیەك بەبەردەمیدا تێدەپەڕین (أبو سفیان) دەیپرسی: ئەریٚ (عباس) ئەمانە کێن؟

ئەویش بۆ نمونە دەیوت ئەوە : (سلیم) ە .

(ابو سفیان)یش دەیوت : ئاخر من چیم داوە لە (سلیم)؟

پاشان تیرەیەکی تر تێدەپەڕی ، دەیوت: (عباس) ئەی ئەوانە کێن؟

(عباس) دەیوت : (مزینة)ن . ئەویش دەیوت: من چیم داوە لە (مزینە)؟

تا هەموو تیرەکان تێپەڕین ، هیچ تیرەیەك تێنەدەپەڕی (أبو سفیان) پرسیاری لە (عباس) نەکات ئەوان کێن ؟

که هەواڵی دەدایە ، دەیوت : ئاخر من چیم داوە لەفلانەو فیسارە تیرە، من چۆن دەرەقەتی ئەم هەمووە دێم؟

تا پێغەمبەری خوا ﷺ بەکەتیبە سەوزەکەی خۆیەوە گوزەران ، کۆچەران و ئەنسارییەکانی تێدابوو، لە تاو زنجیربەندو شمشێری زۆر بریسكو ورشە بەرچاوی دەبرد ، (أبو سفيان) وتی: (سبحان الله) ئەریْ (عباس) ئەوانە کێن؟

(عباس) وتی: ئەوە پێغەمبەری خودایە ﷺ لەناو کۆچەرانو ئەنسارەکاندا ، (ابو سفيان) وتی: باوەڕ ناکەم کەس بەرگەی ئەمانە بگرێت .

پاشان وتی: (أبا الفضل) بەڕاستی برازاکەت ئەمڕۆ زۆرگەورە بووە.

(عباس) وتی: (أبا سفيان) ئەوە نازونیعمەتی پێغەمبەرێتیە .

(ابو سفيان) وتی: بەڕاستی وایە.

ئاڵای ئەنسار بەدەستی (سعد)ی کوڕی (عبادە)وە بوو ، کە بەلای (ابو سفيان) دا تێپەڕی ، (سعد) وتی بە (أبو سفيان): ئەمڕۆ ڕۆژی داستان و شەڕە ، ئەمڕۆ موڵكو ماڵتان حەڵاڵ دەکەین ، ئەمڕۆ خودا قوڕەیشی زەلیلو داماو کرد.

کە پێغەمبەر ﷺ بەلای (ابو سفيان)دا تێپەڕی (أبو سفيان) وتی: پێغەمبەری خودا گوێت لیْ بوو کە (سعد) چی وت ؟

فەرمووی: چی وت؟

وتی: ئەوەو ئەوەی وت .

(عثمان) و (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف) وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێدەچێت ئەم پیاوە شتێك بقەومێنێت لەناو قوڕەیشدا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو ئەمڕۆ کابەی پیرۆز گەورە ڕادەگیرێت ، لە ئەمڕۆدا خوای مەزن قوڕەیشی سەربەرز کرد.

پاشان ناردی بە شوێن (سعد) داو ئاڵاکەی لێسەندەوەو دایەدەست (قيس)ی کوڕی .

پێم وایە کە ئاڵاکە لە دەست (سعد) دەرنەچووبێت ، وتراویشە: داویەتیە دەست (زبير)ەوە.

## قورەیش لەناکاودا بەهاتنی سوپای ئیسلام دەزانێت

که پێغەمبەر ﷺ بەلای (أبو سفیان)دا تێپەڕی ، (عباس) وتی: (أبو سفیان) بڕۆ فریای خزمەکانت بکەوە. (أبو سفیان) بەخێرایی گەڕایەوە بۆ مەککە ، بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی خێڵی قورەیش ، ئەوە موحەممەدە سوپایەکی بۆ هێناون ئێوە دەرەقەتی نایەن ، هەرکەسێك بڕواتە ماڵی (أبو سفیان) بێوەی دەبێت. (هند)ی هاوسەری بۆ دەرچوە دەرەوە ، سمێڵی گرت و وتی: ئەم کابرا ڕووهەڵماڵراوە پێپەتیە بکوژن ، خوا لەناوت بەرێت چ پیاوێکیت.

(أبو سفیان) وتی: دایك ڕۆڵە ڕۆتان بۆ بکات ، لەخۆتان بایی مەبن ، سوپایەکی هێناوە ئێوە چاری ناکەن بۆیە هەرکەسێك بڕواتە ماڵی (أبو سفیان) بێوەی دەبێت. وتیان: خوا بتکوژێت ، ماڵەکەی تۆ ئەتوانێت کێ پەنا بدات؟ وتی: هەرکەسێکیش دەرگای ماڵەکەی خۆی دابخات بێوەی دەبێت ، هەرکەسێکیش بڕواتە مزگەوتی (حەرام) بێوەی دەبێت. خەڵکی بلاوەیان لێ کرد بۆ مزگەوت و ماڵەکانی خۆیان . چەند گەنجێکی هەرزەو بێ عەقڵیان هێشتەوەو وتیان: ئەوانە دەنێرینە پێشەوە ئەگەر شتێکیان کرد بۆ قورەیش ئێمەش دەچینە پاڵیان ، ئەگەر هیچیان پێنەکراو گیران ، چیان لێ داوا بکرێت دەیدەین ، ئەنجا گێل و عەقڵ سووکەکانی قورەیش لە دەوری (عکرمە)ی کوڕی (أبو جهل)و (صفوان)ی کوڕی (أمیە)و (سهیل)ی کوڕی (عمرو) لە (خندمە)دا کۆبونەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، کابرایەکی خێڵی (بنی بکیر)یان لەناودا بوو ناوی (حماس)ی کوڕی (قیس) بوو ، پێشتر خەریکی ئاسنگەری بوو ، شمشێری دروست دەکرد ، ژنەکەی کە بینی خۆی ئامادە دەکات پێ وت: ئەرێ ئەوە بۆچی خۆت ئامادە دەکەیت؟ (حماس) وتی: بۆ شەڕکردن لەگەڵ موحەممەدو هاوەڵەکانی. ژنەکەی وتی: وەڵڵاهی ئەمڕۆ هیچ هێزێك نیە بتوانێت بەرگە بگرێت لەبەردەم سوپاکەی موحەممەدو هاوەڵەکانی. (حماس) وتی: وەڵڵاهی ئاوات دەخوازم کە هەندێکیان بکەمە خزمەتکاری تۆ. پاشان وتی:

إنْ يقبلوا اليومَ فمالي علــَّةُ هذا سلاح كــاملٌ وألــَّةُ

وذو غرارين سريعُ السَّلــَّةِ[1]

ئەم پیاوە یەکێك بوو لەو کەسانەی لە (خندمە)دا کۆبووبووە لەگەڵ (عکرمە) و تاقمەکەیدا.

---

[1] / سرع السلة: بەخێرای لەکێلان دەرکێشان . ذو غرارين: دوو نوك.

## سوپای ئیسلام دەگاتە (ذي طوى)

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە (ذي طوى) ، کە نازو ڕێزی سەرکەوتن و فەتحی بینی سەری دانەواند بۆ خودای تاكو تەنها ، بە شێوەیەك خەریك بوو ڕیشی پیرۆزی بەر پشتی وشترەکەی دەکەوت ، لەوێدا سوپاکەی دابەشکرد ، (خالد)ی کوڕی (ولید) بۆ لای ڕاست ، کە خێڵەکانی (سليم) و (أسلم) و (غفار) و (مزينه) و (جهينه) و چەند تیرەیەکی تری عەرەبی تێدابوو ، فەرمانی پێدا کە لەبەشی خوارەوەی مەککەوە بڕواتە ناو مەککەوەو پێی فەرموو: ئەگەر هەرکەسێکی قوڕەیش هاتە ڕێگەتان و شەڕی لەگەڵ کردن لێیان دەن و دروێنەیان بکەن ، تا لە (صفا) پێم دەگەنەوە.

(زبير)ی کوڕی (عوام)یش لەلای چەپەوە بوو ، ئالاکەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێبوو ، فەرمانی پێدا کە لەبەشی سەرەوە بڕواتە ناو مەککەوە، لەڕێگەی (كداء)ەوە ، ئالاکەی لە (حجون)دا بچەقێنێت و نەجوڵێت هەتا خۆی پێی دەگاتەوە.

(أبو عبيده)ش دانرابوو بە سەرکردەی پیادەو بێچەکەکان ، فەرمانی پێدا کە بەناو دۆڵەکەدا بڕوات تا دەڕواتە ناو مەککەو لەوێ دەگاتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

## سوپای ئیسلام دەڕواتە ناو مەککەوە

هەریەکێك لە کەتیبە سەربازیەکان لەشوێنی دیاری کراوی خۆیانەوە چوونە ژوورەوە ، خالیدیش هەرکەسێك بهاتایەتە ڕێگەیان و بەرەنگاری بکردنایە دەیان کوشت ، دووکەسیش لە هاوەڵەکانی (كرز)ی کوڕی (جابر)ی (فهری) و (خنيس)ی کوڕی (خالد)ی کوڕی (ربيعه) بەهۆی جیابونەوەیان لە سوپاکە کوژران ، هەرزەو عەقڵ ساویلکەکانی قوڕەیشیش ڕووبەڕوی (خالد)و هاوەڵەکانی بوونەوەو بوو بەشەڕی دوراودور ، دوانزە کەسیان لە موشریکان پێکاو لەئەنجامدا موشریکان ڕایانکردو هەڵاتن ، (حماس)ی کوڕی (قيس)یش کە پێشتر چەکی دروست دەکرد بۆ شەڕکردن دژ بەموسڵمانەکان ، هەڵات و خۆی کرد بە ماڵەکەیدا ، وتی بەژنەکەی: دەرگاکە دابخە. ژنەکەی وتی: ئەی ئەو.ڕۆژەت لە چی کە شیعرت دەخوێندەوەو خۆت بادەدا ؟ ئەویش وتی:

إنك لو شهدْتَ يومَ الخندمة ... إذ فرّ صفوانٌ وفرَّ عكْرِمَةْ
واستَقبلتنا بالسيوف المسلمه ... يقطعن كلَّ ساعِدٍ وجُمْجُمَةْ
ضرباً فلا يسمع إلاّ غمغمه ... لهم نَهيتٌ خلَفنا وهَمْهَمَه [1]
لم تنطقى فى اللوم أدنى كلمة

[1] / همهمة : دەنگ و زرنگانەوە .

(خالد) بەناو مەککەدا گەڕا تا لە کۆتاییدا لەسەر (صفا) گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ .

(زبیر)یش پێشڕەوی کرد ، تا لە مزگەوتی (فەتح)دا ئالاَکەی لە (حجون)دا چەقاند ، دوای ئەوە کرایە گومەز ، لە شوێنی خۆی نەجولاَ تا پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێناو پێی گەیشتەوە.

## پێغەمبەر ﷺ دەڕواتە مزگەوتی حەرام و لە بت پاکی دەکاتەوە

ئەنجا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هەستاو ، کۆچکەران و ئەنسارەکانیش بەدەوریدا خۆیان سازدا ، تا چووە ناو مزگەوتەکەوە ، بەرەو (حجر الأسود) چوو ، دەستی پێوەگرت و تەوافی بەیتی کرد ، کەوانێکی بەدەستەوە بوو لە دەوروبەرو سەرو ناوەوەی کابەی پیرۆزدا سێسەدو شەست بتی تێدابوو ، بەکەوانەکەی پێیدا دەکێشان و دەیفەرموو : ﴿ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾ الإسراء/٨١. هەروەها دەیفەرموو: ﴿ قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴾ سبأ/٩٤. بتەکانیش یەکەبەیەکە بەم لاولاداو بەرەو ڕوو دەکەوتن.

بەسەر وشترەکەیەوە تەوافی دەکرد ، هێشتا ئیحرامی نەکردبوو ، تەنها تەوافی دەکرد ، کە تەواوی کرد (عثمان) ی کوڕی (طلحة)ی بانگ کردو کلیلی کابەی لێ وەرگرت ، فەرمانیدا کرایەوە ، چووە ژوورەوە ، چەندین وێنەی تێدا بینی ، وێنەی (ابراهیم)و (أسماعیل)ی تێدا بینی خەریکی تیروپشك بوون ، فەرمووی: خوا ئەمانە بکوژێت ، وەڵڵاهی هەرگیز ئەوان ئەم تیرو پشکەیان نەکردوە ، هەرلەناو کابەدا کۆترێکی بینی لە مۆم دروستڎ کرابوو ، بەدەستی خۆی شکاندی، فەرمانیدا وێنەکانیشیان لابرد.

## پێغەمبەر ﷺ لەکابەدا نوێژ دەکات و لەبەردەم قوڕەیشدا وتار دەخوێنێتەوە

پاشان دەرگاکەی بەسەرخۆیو (أسامە)و (بلال)دا داخست ، ئەنجا ڕووی کردە ئەو دیوارەی ڕووی لە دەرگاکەیەو تائەوەندەی سێ باڵی مابوو بۆ دەرگاکە وەستا ، دوو ستونی ناو کابەی خستەلای دەستی چەپیو یەکێکیشی خستەلای دەستی ڕاستیو سێ شوێنیشی خستە پشتەوەی خۆی و لەو ڕۆژگارەدا کابە

لەسەر شەش ستون ڕاوەستابوون ، پاشان نوێژی کردو بەدەوری (بیت)دا سوڕایەوە ، لە هەموو ڕووەکانیدا (الله أکبر)ی کرد (لا اله الا الله)ی دەخوێندەوە ، ئەنجا دەرگاکەی کردەوە ، مزگەوت پڕبوو لە خەڵك ڕیزبوون و چاوەڕوانیان دەکرد بزانن پێغەمبەر ﷺ چی دەکات ، هەردوو لاشیپانی دەرگاکەی گرت ، ئەوانیش لە خوارەوە دابوون فەرمووی:

جگە لەخوا هیچ پەرستراوێکی تر نیە ، بێ شەریکە ، بەڵێنی خۆی بردە سەر ، بەندەکەی خۆی سەرخست ، هەموو گرۆهەکانی ژێرخست ، هەموو هەق و حسابێك لە ژێر ئەم دوو پێیەی مندایە ، جگە لە زێوانی بەیت و ئاودانی حاجیان ، کوژراوی هەڵە و نیمچە قەستی - قامچی و دار - خوێنباییەکی قورسی لەسەرە ، کە بریتیە لە سەد وشتر بەمەرجێك چل دانەیان دووگیان بن.

ئەی خەڵکی قوڕەیش ، خوای گەورە نەریتی نەفامی و شانازیی باوو باپیرانی هەڵپێچایەوە ، هەموو خەڵك نەوەی ئادەمن ، ئادەمیش لەگڵ دروست بووە ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ الحجرات /١٣.

## ﴿ لا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ ﴾

پاشان فەرمووی: خەڵکی قوڕەیش ، ئێوە پێتان وایە من چیتان لێ دەکەم؟ وتیان: خێروچاکە ، برایەکی بەڕێزو برازایەکی بەڕێزیت. فەرمووی: من ئەوەتان پێدەڵێم کە یوسف بەبراکانی خۆی گوت: ﴿ لاَ تَثْرِيبَ عَلَيْكُمْ الْيَوْمَ ﴾ بڕۆن هەمووتان ئازاد بن.

## کلیلی بەیت دەدرێتەوە بە خەڵکەکەی

پاشان پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا دانیشت ، (علی) چووە خزمەتی ، کلیلەکەی کابەی بەدەستەوە بوو ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگاوانی و ئاودانی حاجیانمان بدەرێ ، خوای مەزن سەلاَواتت لێ بدات .

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتوە: ئەو کەسەی ئەو قسەیەی وت (عباس) بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (عثمان)ی کوڕی (طلحة) لە کوێیە؟ بانگ کرا ، پێی فەرموو: کلیلەکەی دەستم بدەرێ (عثمان) ، ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەو وەفاداریە.

لە ڕیوایەتەکەی (ابن سعد)یشدا هاتووە لە (الطبقات)دا ، دەڵێت:

لەو کاتەدا کە کلیلەکەی پێدا فەرمووی : وەری بگرن تا هەتاهەتایە ، مەگەر زاڵم وەگەرنا کەس بۆی نیە لێتان بسێنێت ، ئەی (عثمان) ، خوای مەزن ئێوەی کردوە بەئەمینداری سەر ماڵەکەی خۆی ، بەچاکەو حەلاڵ لەو پشکە بخۆن کە لە ڕێگەی ئەم (بیت)ە پیرۆزەوە پێتان دەگات.

## (بیلال) لە سەربانی کابەی پیرۆز بانگ دەدات

کاتی نوێژ هات ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە (بیلال) کە بچێتە سەر کابەی پیرۆزو بانگ بدات ، لەو کاتەدا (أبو سفیان)ی کوڕی (حرب)و (عتاب)ی کوڕی (أسید)و (حارث)ی کوڕی (هشام) لە دەرەوەی کابەدا دانیشتبوون

(عتاب) وتی: خوا ڕێزی لە (أسید)ی باوکم گرت کە زوو مردو گوێی لەم قسە ناخۆشانە نەبوو ،

(حارث)یش وتی: وەڵڵاهی ئەگەر بمزانیایە ئەوە هەقە شوێنی دەکەوتم.

(أبو سفیان)یش وتی: وەڵڵاهی من ورتەم لە دەمەوە نایەت ، چونکە ئەگەر قسە بکەم پێم وایە کە ئەو دەنکە زیخە بۆی دەگێڕێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە بۆ لایان و پێی فەرموون: هەرچییەکتان گوت گوێم لێ بوو. پاشان پێی وتن کە چیان وتووە ،

(حارث) و (عتاب) وتیان: بەڕاستی شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خودایت ، چونکە کەس لەوێدا نەبوو ئەم هەواڵەت بداتێ ، جگە لە خودای مەزن.

## نوێژی سەرکەوتن یان نوێژی شوکرانە

ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ چووە ماڵی (أم هانی) کچی (أبو طالب) ، خۆی شۆرد ، هەشت ڕکات نوێژی لە ماڵی (أم هانی)دا کرد ، چێشتەنگاو بوو ، (أم هانی) وایزانی نوێژی چێشتەنگاوە بەلام نوێژی فەتح بوو ، (ام هانی) لە ماڵەکەیدا پەنای دوو هێوەری خۆی دابوو ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (أم هانی) تۆ پەنای هەرکەسێك بدەیت ئێمەش پەنای دەدەین ، لەکاتێکدا کە (علی) کوڕی (أبو طالب)ی برای ویستبووی هەردوکیان بکوژێت ، (أم هانی)یش دەرگاکەی بەسەردا داخستبوون ، ئەو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد بوو ، پێغەمبەریش ﷺ ئەو وەلامەی دابوەوە.

## حەلاڵ کردنی خوێنی چەند پیاوێکی تاوانبار

پێغەمبەر ﷺ خوێنی نۆکەسی گەورە تاوانباری حەلاڵ کردبوو، فەرمانیدا بەکوشتنیان ئەگەر خۆشیان بەدیواری کابەدا هەڵواسن، ئەوانەش بریتی بوون لە:

١. (عبد العزى) کوڕی (خطل)و
٢. (عبدالله)ی کوڕی (أبی سرح)و
٣. (عکرمە)ی کوڕی (أبو جهل)و
٤. (حارث)ی کوڕی (نفیل)و
٥. (مقیس)ی کوڕی (صبابە)و
٦. (هبار)ی کوڕی (أسود)و
٧ ـ ٨ . دوو کەنیزەکی (ابن خطل)یش کە بە شیعری ناشیرین هەجوی پێغەمبەریان دەکرد ﷺ ،
٩. هەروەها (سارە)ی کەنیزەکی تیرەیەك لەخێڵی (عبد المطلب) کە نامەکەی (حاطب)ی هەڵگرتبوو.

سەبارەت بە (ابن أبی سرح) ، (عثمان) هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ، تکای بۆکرد ئەویش چاوپۆشی لێکردو خوێنی نەڕشتو ئیسلامبونەکەی لێ قەبوڵ کرد ، پێشتر لێی وەرنەدەگرت سا بەڵکو یەکێك لە هاوەڵانی بیکوژن ، چونکە پێش ئەوەی موسڵمان بوو کۆچی کرد ، پاشان هەڵگەڕایەوەو گەڕایەوە بۆ مەککە.

(عکرمة)ی کوڕی (أبو جهل)یش هەلات بەرەو یەمەن ، ژنەکەی داوای پەنادانی بۆ کرد لە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ پەنایداو دڵنیای کرد ، ئەنجا چوو بۆلای بۆ یەمەن موسڵمان بوو گەڕایەوەو موسڵمانیەتیەکەشی زۆر باش بوو.

(ابن خطل)یش خۆی هەڵواسیبوو بەدیواری کابەدا ، پیاوێك هات هەواڵی دا بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بیکوژە ، چوو کوشتی.

(نمیلە)ی کوڕی (عبدالله)ش (مقیس)ی کوڕی (صبابە)ی کوشت ، (مقیس) پێشتر موسڵمان بوو بوو ، پاشان بەناهەق پیاوێکی ئەنساری کوشتبوو ، ئەنجا هەڵگەڕابوەوەو پەیوەندی کرد بە موشریکەکانەوە.

(حارث)یش لە مەککەدا زۆر ئازاری پێغەمبەری دەدا ﷺ (علی) کوشتی.

(هبار)ی کوڕی (أسود) ئەوکەسە بوو کە لەکاتی کۆچکردنی (زینب)ی کچی پێغەمبەردا ﷺ چوو بووە ڕێگەی ، ئەویش لەدەستی ڕای کردبوو لەسەر بەردێك کەوتبووە خوارەوەو سکەکەی لەبارچوو بۆو ، لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا (هبار) هەڵات ، پاشان موسڵمان بوو موسڵمانێکی باشی لێ دەرچوو.

دوو کەنیزەکەکەش یەکێکیان کوژراو ، ئەوی تریشیان پەنادراو موسڵمان بوو ، هەروەها (سارە)ش پەنادراو لەدواییدا موسڵمان بوو.

(ابن حجر) دەڵێت: (أبو معشر) لەناو خوێن حەڵاڵکراوەکاندا باسی (حارث)ی کوڕی (طلاطل)ی (خزاعی)یشی کردوە، (علی) کوشتویەتی ، (حاکم)یش دەڵێت: (کعب) ی کوڕی (زهیر)یش یەکێك بووە لەوانە ، بەسەرهاتەکەشی بەناوبانگە ، دوای ئەوە هات و موسڵمان بوو ، (أرنب)ی کەنیزەکی (ابن خطل)یش کوژرا ، بەپێی ڕیوایەتەکەی (ابن اسحاق) (أم سعد)یش کوژراوە ، ژمارەکە بەتەواوی هەشت پیاوو شەش ژنن ، پێدەچێت (أرنب) و (أم سعد) دوو کەنیزەکەکە بن ، جوداوازی هەیە لە ناوەکانیاندا یان بەپێی شورەت و ناوبانگ ناونرا بن.[1]

## موسڵمان بوونی ( صفوان )ی کوڕی ( أمیه ) و ( فضالة )ی کوڕی ( عمیر )

(صفوان) یەکێك نەبوو لەو کەسانەی خوێنیان حەڵاڵ کرابوو ، بەڵام بەو سیفەتەی کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی قوڕەیش لەخۆی ترساو هەڵات ، (عمیر)ی کوڕی (وهب)ی (جمحی) لای پێغەمبەر ﷺ تکای بۆ کرد تکاکەی لێ قەبوڵ کراو پێغەمبەر ﷺ ئەو مێزەرەی پێ بەخشی کە لەکاتی فتحی مەککەدا بەسەریەوە بوو. کە ڕای کرد (عمیر) چوو بەدوایدا ، دەیویست سواری کەشتی بێت لە (جدە)وە بەرەو (یمن) بڕوات گێڕایەوە ، کە هاتەوە عەرزی پێغەمبەری کرد ﷺ کە دوومانگ مۆڵەتی بداتێ ، فەرمووی: چوارمانگ مۆڵەتت دەدەمێ ، پاشان موسڵمان بوو ، پێشتر ژنەکەی پێش خۆی موسوڵمان بوو بوو ، ئەنجا لەسەر نیکاحی یەکەم دایمەزراندنەوە.

(فضالة)ش پیاوێکی بەغیرەت بوو ، لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ تەوافی دەکرد ، هات بۆ کوشتنی ، پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی نیازەکەی دڵی پێ وت ، کابرا دەست بەجێ موسڵمان بوو.

---

[1] / فتح الباری ۱۱/۸و۱۲.

## وتارەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی دووەمی فەتحدا

بۆ سبەینێ ڕۆژی دووەمی فەتحی مەککە ، پێغەمبەر ﷺ وتاریدا ، وەسف و سوپاسی خودای کرد بەو وەسفەی شایستەی بێت ، فەرمووی: خەڵکینە ، خودای مەزن خاکی مەککەی حەرامکردوە لەو ڕۆژەوە ئاسمانەکان و زەمینی بەدیهێناوە ، لەبەرئەوە تاڕۆژی قیامەت بەحەرامی دەمێنێتەوە ، بۆ هیچ کەسێکی ئیماندار نیە خوێنی تێدا بڕژێت ، یان درەختێکی تێدا ببڕێت ، ئەگەر کەسێك ئەوکارەی کردو وتی پێغەمبەریش لەناو مەککەدا کوشتاری کردوە ، بڵێن: خودا ئیزنی داوە بەپێغەمبەر ﷺ و ئیزنی نەداوە بەئێوە. منیش کاتێکێ ڕۆژم بۆ حەلاڵکرا ، دوای ئەوە مەککە وەك جاران حەرام کرایەوە ، با ئەو کەسەی ئامادەیە ئەم هەواڵە بگەیەنێت بەو کەسەی لێرە نیە.

لەریوایەتێکیشدا هاتووە: نابێت دڕکێکیشی تێدا دەربهێنرێت و ڕاوی تێدا بکرێت و ونبووی هەڵگیرێتەوە مەگەر کەسێك بیناسێتەوەو داری سەوزی ببڕێتەوە. (عباس) وتی: پێغەمبەری خودا جگە لەگیای (أذخر) چونکە ماڵوحاڵیان بەو گیایە دادەپۆشن. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کەواتە جگە لە (أذخر).

خێڵی (خزاعة) پیاوێکی خێڵی (بنی لیث) یان کوشتبوو لە بەرامبەر خوێنێکی سەردەمی جاهیلیدا ، لەو بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خێڵی (خزاعة) ئیدی کەس مەکوژن پێشتر خەڵکی زۆر کوژراوە ، یەکێکتان کوشتوە دەبێت هەقی بدەم ، لەدوای ئەم ساتە وەختەوە هەرکەسێك کوژرا ، کەس و کاری دوو مافیان هەیە ، یان بکوژەکەی دەکوژرێتەوە یان خوێنەکەی دەدرێت .

لەریوایەتێکی تریشدا هاتوە ، کابرایەکی یەمەنی ناوی (أبو شاة) بوو ، هەستاو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەم بۆ بنووسە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بینووسن بۆ (أبو شاة).[1]

## خەمخواردنی ئەنساریەکان بۆ مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مەککدا

کە بەتەواوی مەککە ڕزگارکرا ، کە خاكو ئاوو نیشتیمانی پێغەمبەرە ﷺ ، ئەنساریەکان لەناو خۆیاندا بوو بەمقۆ مقۆیان وتیان: پێتان وایە دوای ڕزگارکردنی مەککە ئیتر پێغەمبەر ﷺ لە شارەکەی خۆیدا بمێنێتەوە؟

---

[1] / بۆ ڕاستی ئەم ڕیوایەتانە بڕوانە (صحیح البخاری) ١/٢٠٢،٣٢٩،٣٢٨؛٢٤٧،٢١٦،٢٢/٦١٧،٦١٥ ، صحیح مسلم ١/٤٣٩،٤٣٨،٤٣٧ ، (ابن هشام) ٢/٤١٦،٤١٥ ، هەروەها (ابو داود) ١/٢٧٦.

لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بەسەر کێوی (صفا)وە بوو دۆعای دەکرد ، کە لێبوەوە پێی فەرموون: ئەوە چیتان دەوت؟ وتیان: هیچمان نەدەوت پێغەمبەری خوا. وازی لێ نەهێنان تا پێیان وت ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەنا بەخوا ژیان ئەو ژیانەیە کە لەناو ئێوەدا بێت ، مردنیش ئەو مردنەیە کە لەناو ئێوەدا بێت.

## بەیعەت وەرگرتن

کە مەککە فەتح کرا ، ڕاستی دەرکەوت بۆ خەڵکی مەککەو زانیان کە سەرکەوتوو نابن ئەگەر موسڵمان نەبن ، بۆیە ملیان بۆ کەچ کردو کۆبونەوە بۆ بەیعەتدان ، پێغەمبەر ﷺ لەسەر (صفا) دانیشت بۆ وەرگرتنی بەیعەت لەخەڵك ، (عمر)ی کوڕی (خطاب)یش لە خواریەوە بوو ، خەڵکەکەی ڕێك دەکرد لەسەر گوێڕایەڵی و بەگوێکردن بەگوێرەی توانا بەیعەتیاندا بە پێغەمبەر ﷺ.

لە (المدارك)یشدا هاتووە[1]: دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە بەیعەتی پیاوان بوەوە دەستی کرد بە بەیعەت وەرگرتن لە ژنان ، هێشتا هەر لەسەر (صفا) بوو (عمر)یش لە خواریەوە بوو بەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ بەیعەتیاندا بە(عمر): ئەویش لەجیاتی پێغەمبەر ﷺ لەفەرمانەکان ئاگاداری دەکردن ، (هند)ی کچی (عتبة) هاوسەرەکەی (ابو سفیان) کە هات لە ترسی پێغەمبەرو ﷺ ئەو کارەی کردبووی بە (حمزة) ، سەری خۆی داپۆشی بوو بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە ،

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەیعەتتان لەگەڵدا دەبەستم لەسەر ئەوەی هاوەڵ بۆ خودا پەیدانەکەن. (عمر) بەیعەتی‌دا بەژنەکان کە هاوەڵ بۆ خودا پەیدا نەکەن،

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دزیش نەکەن.

(هند) وتی: (ابو سفیان) پیاوێکی ڕژدە، ئەگەر کەمێك لەماڵەکەی ببەم ڕەوایە ؟

(ابو سفیان) وەستابوو ، وتی: ئەوەش کە بردوتە هەر حەلاڵە ،

پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەپێکەنین و (هند)ی ناسیەوە ،

فەرمووی: ئەوە تۆ (هند)یت؟

---

[1] / بڕوانە (مدارك التنزيل) نوسینی (النسفي) تەفسیری ئایەتی بەیعەت.

وتی: بەڵێ ، پێغەمبەری خوا تکات لێ دەکەم لە کارەکانی پێشووم بمبورە ، خوا لێت خۆش بێت.

فەرمووی: لەسەر ئەوەش نابێت زینا بکەن ،

(هند) وتی: بۆچی ژنی (حر) زینا دەکات ؟

فەرمووی: نابێت ڕۆڵەکانیان لەناوبەرن ،

. (هند) وتی: بەمناڵی پەروەردەمان کردن ، کەچی بەگەورەیی ئێوە هەمویتان کوشت ، ئێوەو ئەوان باش دەزانن ، شایانی باسە کە (حنظلة)ی کوڕی (ابو سفیان) لە جەنگی بەدردا کوژرا بوو.

بەم قسەیە (عمر) ئەوەندە پێکەنی لەسەر گازی پشت کەوت ، پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد.

فەرمووی: نابێت بوختان دروست بکەن ،

(هند) وتی: وەڵڵاهی قسە هەڵبەستن و بوختان کاری ناڕەوایە تۆ تەنها بە کاری باش و ڕەوشتی بەرز فەرمانمان پێدەدەیت.

فەرمووی: نابێت لە فەرمانی چاکی پێغەمبەر ﷺ سەرپێچی بکەن.

(هند) وتی: وەڵڵاهی کەهاتین بۆ خزمەتت وانەهاتین کە سەرپێچیت بکەین.

کە هند گەڕایەوەماڵەوە بەدەستی خۆی بتەکەی شکاندو وتی: بەهۆی تۆوە بوغرا بوو بوین.

## مانەوەی لە مەککەو کارکردنی تێیدا

پێغەمبەر ﷺ ماوەی نۆزدە ڕۆژ لە مەککەدا مایەوەو دروشمەکانی ئیسلامی بۆ نویێ دەکردنەوەو ڕێنومایی خەڵکی دەکرد بۆ هیدایەت و خواپەرستی ، لەو ماوەیەدا فەرمانی‌دا بە (أبا سعید)ی (خزاعی) کە پایەکانی حەرەم تازە بکاتەوەو سریە بە هەر چوارلادا بنێرێت تاخەڵکی بانگ بکەن بۆ ئیسلامەتی و هەموو بتەکانی دەوروبەری مەککە بشکێنێت ، هەموویان شکێنران و بانگخوازێك لەناو مەککەدا بانگی کرد ، با هەرچی بتێکی هەیە لە ماڵەکەیدا بیشکێنێت.

## سریەو نێرراوەكان

١. كە پێغەمبەر ﷺ دوای فەتح دڵنیابوو (خالد)ی كوڕی (ولید)ی نارد بۆ شكاندنی پەیكەری (عزی) ، (ئەو كاتە مانگی ڕەمەزان پێنج ڕۆژی مابوو لە ساڵی (٨)ی كۆچیدا) بۆ ئەوەی بیشكێنێت ، پەیكەری (عزی) لە (نخلە) بوو ، ئەم بتە موڵكی (قریش) و هەموو خێڵی (بنی كنانە) بوو ، گەورەترینیان بوو ، خێڵی (بنو شیبان) زێوانی بوون ، (خالد) بە سی ئەسپ سوارەوە بۆی دەرچوو تاگەیشتە سەری و شكاندی ، كە گەڕایەوە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێكرد ئایا هیچت بینی؟ وتی: نەخێر. فەرمووی: تۆ بتەكەت بەتەواوی نەشكاندوە بگەڕێوە جارێكیتر بیشكێنە ، ئەمجارە (خالد) بە توڕەییەوە شمشێرەكەی هەڵكێشاو گەڕایەوە ، لەوێ ژنێكی ڕەش پێستی ڕووتی سەرپەتی ، هاتە دەرەوە ، (زێوانەكە) هاواری لێ كرد ، (خالد) شمشێرێكی لێدا كردی بەدوو كەرتەوە ، پاشان گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵەكەی پێدا. فەرمووی: بەڵێ ئەوە (عزی) بوو ، ئیتر نائومێد بوو لەوەی لەمەودوا لە وڵاتی ئێوەدا بپەرسترێت.

٢. پاشان (عمرو)ی كوڕی (عاص)ی نارد بۆ ڕووخاندنی پەیكەری (سواع)یش ، (سواع) بتێكی (هزیل) بوو لە (رهاط) ، سێ میل لە مەككەوە دوورە ، كە (عمرو) گەیشتە سەر بتەكە ، زێوانەكە پێی وت: چیت دەوێت ؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداوم كە بیشكێنم. كابرا وتی: ناتوانیت شتی وابكەیت. (عمر) وتی: بۆچی؟ زێوانەكە وتی: چونكە ڕێگەت نادرێت. (عمر) وتی: سەیرە تۆ هێشتا لەسەر بت پەرستیت؟ دایك ڕۆڵەڕۆت بكات ، ئەو بتە ئەتوانێت ببینێت و ببیستێت؟ پاشان لێی نزیكبوەوەو تێكی شكاند، ئەنجا فەرمانیدا بە هاوەڵەكانی ژووری بتەكەش بڕوخێنن ، هیچیان تێدا نەبینیەوە ، پاشان وتی بە زێوانەكە: ئێستا ڕات چۆنە؟ زێوانەكە وتی: ئەوا منیش ملم كەچ كرد بۆ خودا.

٣. لەهەمان مانگدا (سعد)ی كوڕی (زید)ی (أشهلی) لەگەڵ بیست ئەسپ سواردا نارد بۆ شكاندنی پەیكەری (مناة) لە (مشلل) سەر بەناوچەی (قدید) بوو ، بتی (أوس) و (خزرج) و (غسان) و چەند خێڵێكیتر بوو، كە (سعد) گەشتە لای بتەكە زێوانەكانی وتیان: چیت دەوێت؟ وتی: دەمەوێت پەیكەری (مناة) بڕوخێنم ، وتیان: ئەوە تۆو ئەوە (مناة) ، (سعد) چوو بۆ بتەكە ، ژنێكی ڕووتی ڕەش پێستی قژ گژو بژ بەناوی (ویل)ەوە، لە ژوورەكە هاتە دەرەوەو

سنگی دەکوتا، زێوانەکە پێی وت: خەمت نەبێت (مناة) بۆ خۆی تەمێی یاخی بوانی دەکات . (سعد) لێیداو کوشتی، ئەنجا بتەکەشی ڕوخاندو تێك و پێکی شکاند ، لە ژوورەکەیدا هیچیان نەبینی.

٤. کە (خالد)ی کوڕی (ولید) لە ڕووخاندنی پەیکەری (عزی) هاتەوە ، پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (شعبان)ی هەمان ساڵدا (٨ی کۆچی) ناردی بۆ خێڵی (بنی جذیمة) بۆ ئەوەی بانگیان بکات بۆ ئایینی ئیسلام نەك شەڕ بکات ، لەگەڵ سێ سەدو پەنجا پیاوی کۆچەرو ئەنساری خێڵی (بنی سلیم)دا نارد ، کە گەیشتنە لایان ، بانگیان کردن بۆ ئایینی ئیسلام ، بەڵام ئەوان نەیانزانی بەڕێکوپێکی وەڵامیان بدەنەوە لەجیاتی ئەوەی بڵێن (اسلمنا) واتە: موسڵمان بووین ، کەچی وتیان: (صبأنا صبأنا) واتە: بوین بە سابیئە. (خالد) کە لەبارودۆخەکە حاڵی نەبوو کەوتە کوشتو کوشتاریان و هەندێکیانی لێ بەدیل گرتن. هەر دیلێکی دایەدەست پیاوێك و ڕۆژێکیان فەرمانیدا کە هەرکەسەو دیلەکەی خۆی بکوژێت (ابن عمر)و هاوڕێکانی زۆریان پێناخۆش بوو ڕێگەیان نەدا ئەوکارە بکرێت هەتا هاتنەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺو بۆیان باسکرد ، پێغەمبەر ﷺ دەستی نزای بەرز کردەوەو فەرمووی: خوایە من بێگوناهم لەوەی خالد کردویەتی. دووجار ئەم نزایەی وتەوە.[1]

پیاوەکانی خێڵی (بنو سلیم) بوون کە دیلەکانی خۆیان کوشت نەك کۆچەرو ئەنسارەکان ، پێغەمبەر ﷺ (علی) نارد قەرەبووی هەموو زیانەکانی بۆ کردنەوەو خوێنی هەموو کوژراوەکانیشیدا ، لەکاتی خۆیدا لەنێوان (خالد) و (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف)دا دەمەدەمێ و دەنگ هەڵبڕین ڕوویدا لەسەر ئەوە ، باسەکە گەیشتەوە گوێی پێغەمبەر ﷺ ، بە (خالد)ی فەرموو: خالد ، گوێ بگرە ، وازبهێنە لە هاوەڵەکانم و هەقت نەبێت بەسەریانەوە ، وەڵڵاهی هەموو کێوی ئوحود ئاڵتون بێت و تۆ لەپێناوی خوادا بیبەخشیت ، ناتوانی بگەیت بەتۆزی پێی هاتوچۆی یەکێك لە هاوەڵەکانم.[2]

---

[1] / صحیح البخاری ١/ ٤٥٠ ، ٢/٦٢٢.

[2] / درێژەی باسی ئەم غەزایەمان وەرگرتوە لە (ابن هشام) ٢/٣٨٩ تا ٤٣٧ و صحیح البخاری ١/ کتاب الجهادو کتاب المناسك ٢/٦١٢ تا ٦١٥، ٦٢٢ و فتح الباری ٨/٣ تا ٣٧ و صحیح مسلم ١/٤٣٧، ٤٣٨، ٤٣٩ ، ٢/١٠٢، ١٠٣ ، ١٣٠ وزاد المعاد ٢/١٦٠ تا ١٦٨، هەروەها (مختصر سیرة الرسول ﷺ) نوسینی (عبدالله النجدي) ل٣٢٢ تا٣٥١.

ئەوە غەزای فەتحی مەککە بوو ، ئەمەش جەنگی یەکلاکەرەوەو فەتحی هەرەگەورەی موسڵمانان بوو بەسەر قەوارەی بتپەرستیدا ، هیچ بوارو بەهانەیەکی نەهێشت بۆ بتپەرستی لەهەموو دورگەی عەرەبیدا، بەگشتی خێڵە عەرەبەکان چاوەڕوانی ئەوجەنگە سەختەی نێوان موسڵمانان‌و بتپەرستانیان دەکردو دەیانزانی لە جەنگدا کەسێك لەسەر هەق نەبێت ناتوانێت دەورانی شەڕەکە بباتەوە لەکۆتاییدا ، پێشتریش ئەم بڕوایە لەناخیاندا چەسپابوو پێش نیو سەدەو ئەو ڕۆژگارەی خاوەن فیلەکان هاتن بۆ تێکدانی بەیت و هەموویان وەکو کای خوراو تەفروتونا بوون.

سوڵحی حودەیبیە سەرەتای ئەو فەتحە گەورەیە بوو ، لەو قۆناغەدا خەڵك بەئارامی‌و دڵنیاییەوە کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتریدا ، ئیسلامیان بەیەکتری ناساند ، ئەو ژێردەستانەی ناو مەککەش توانیان بیروباوەڕی خۆیان دەربخەن و بانگەشەی بۆ بکەن ، بەو هۆیەوە زۆرێك لەخەڵك هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە ، تا ڕادەیەك ئەو سوپا ئیسلامیەی لە غەزاو جەنگەکانی پێشودا ژمارەی نەدەگەیشتە سێ هەزار کەس لەم فەتحەدا بوو بە دە هەزار چەکدار

ئەم غەزا یەکلاکەرەوەیە بوو چاوی خەڵکی کردەوەو پەردەی سەرچاویانی لابرد بۆ بیستنی ئیسلام و بەو هەڵوێستە موسڵمانەکان بەتەواوی کۆنترۆڵی هەڵوێستە سیاسی و ئایینیەکەیان کرد لەپانتایی دورگەی عەرەبیداو بوونە دەسەڵاتداری ئایینی و دونیایی لە ناوچەکەدا.

ئەو ڕەوشەی کە لەدوای سوڵحی حودەیبیەوە دەستی پێ کرد تێرو تەواو بوو گەیشتە ئەنجام ، بەم فەتحە گەورەیە کامڵ بوو ، دوای ئەوە ڕەوشێکی کە دەستی پێ کرد کە بەتەواوی لە بەرژەوەندی موسڵمانەکان بوو. بۆیە لەبەردەم خێڵ و تیرە عەرەبەکاندا هیچ بوارێك نەما ئەوە نەبێت پۆل پۆل بێنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و موسڵمان بن و بانگەوازەکەشی هەڵگرن بۆ هەموو جیهان ، ئەمەش لە دووساڵی داهاتودا ئامادەگی بۆ کرا.

# قۆناغی سێ هەم

## دوا قۆناغی ژیانی پێغەمبەری مەزنە ﷺ

ئەم قۆناغە دوا قۆناغی ژیانی پێغەمبەری مەزنە ﷺ ، کە بریتیە لەو ئەنجامانەی بانگەوازە ئیسلامیەکە بەدەستی هێنا پاش جیهادێکی دوورو درێژو دەردەسەری و زەحمەتکێشان و خەم و پەژارەو ئاشووب و چەندین شەڕی خوێناویی ، کە لەماوەی بیست و ئەوەندە ساڵدا تووشی بوو.

فەتح کردنی مەککە مەترسیدارترین دەستکەوت بوو موسڵمانەکان لەو ساڵانەدا بەدەستیان هێنا ، بوو بەخاڵی وەرچەرخان ، کەش و هەوای باری عەرەب گۆڕا ، فەتح کردنی مەککە خاڵی جیاکەرەوەی نێوان قۆناغی پێش خۆی و قۆناغی پاش خۆی بوو ، قورەیش لەدیدی عەرەبدا پاسدارو پشتیوانی ئایین بوون و دەبوایە هەموو عەرەب شوێنی قورەیش بکەوتایە ، بۆیە ملکەچکردنی قورەیش دواهەناسەی ئایینی بت پەرستی بوو لە دورگەی عەرەبیدا .

دەکرێت ئەم دوو قۆناغە ، بکەین بە دوو ڕووەوە:

- ڕووی کێبڕکێ و شەڕکردن.
- ڕووی پێشبڕکێی هاتنی گەل و تیرەکان بەرەو ئیسلام.

ئەم دوو دیوە دوو دیوی پێکەوە گرێدراوی ئەم قۆناغەن ، هەرجارەی یەکێکیان پێش ئەوی تریان دەکەوێت ، بەلام ئێمە ڕیزبەندی بابەتیمان هەڵبژاردو لەبەر ئەوەش بوو کە دیوی شەڕو جەنگ کردن نزیکترە بەقۆناغەکانی پێشوو ، هەروەها گونجاوترە لەوی تر ، بۆیە لە ڕیز بەندیەکەدا پێشمان خست.

## غەزای حونەین

فەتح كردنی مەككە گورز وەشاندنێك بوو عەرەبی ڕاچڵەكان و تیرە عەرەبەكانی خستە بەردەم واقیعی حاڵەوەو نەیاندەتوانی بیگۆڕن ، لەبەرئەوە جگە لە چەند تیرەیەكی ملهوڕی سەرسەخت هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لەخۆ بەدەستەوەدان لەسەرو هەموویانەوە لق و پۆپەكانی (هوازن) و(ثقیف) ، ئەنجا خێڵەكانی (نصر) و (جشم) و (سعد)ی كوڕی (بكر)و چەند خەڵكێكی (بنی هلال) كە هەموویان لە (قیس عیلان)ن ، ئەم لق و پۆپانە بە لووت بەرزی خۆیاندا دەنازی و پێیان شوورەیی بوو ملكەچی بكەن ، بۆیە چوونە پاڵ (مالك)ی كوڕی (عوف)ی (نصری)و بڕیاریاندا بڕۆن بۆ شەڕی موسڵمانەكان.

## كەوتنە ڕێی دوژمن و دابەزینیان لە ( أوطاس )

كە فەرماندەی گشتی (مالك)ی كوڕی (عوف) بڕیاری دەرچوونیدا بۆ جەنگی موسڵمانەكان ، هەموو ژن و منداڵ و سەروەت و سامان و مەڕوماڵاتی دایەبەر لەگەڵ خۆیدا ، ڕۆشت تاگەیشتە (أوطاس) ـ أوطاس شوێنێكە لە ناوچەی (هوازن)ەو نزیكە لە (حنین)ەوە ، (حنین)یش شیوێكە بەتەنیشت (ذي مجاز)ەوە ، لە ڕووی (عرفات)ەوە یانزە میل لە مەككە دوورە ـ.[1]

## شارەزایەكی جەنگ ڕای فەرماندەی گشتی پەسەند ناكات

كە (مالك) لە (أوطاس) دابەزی خەڵكی بەدەوریدا كۆبونەوەو (درید)ی كوڕی (صمە)شیان لەگەڵدا بوو ، ئەم كابرایە پیاوێكی ئازاو شارەزا بوو ،

(درید) پرسی : ئەرێ ئێرە كوێیە؟

وتیان : (أوطاس)ە.

وتی: بەڕاستی بوارێكی باشە بۆ ڕمبازێنی ئەسپ ، نە ئەوەیە سەخت بێت و نە ئەوەشە چاڵ و چۆڵ بێت ، ئەی ئەوە چیە گوێم لە پڕمەی وشترو سەڕەی گوێدرێژەو گریانی منداڵ و بارەی مێگەلە؟

وتیان (مالك)ی كوڕی (عوف) لەگەڵ ئەم خەڵكەدا ژن و منداڵ و ماڵ و سامانەكەشی هێناون ، (مالك)ی بانگكردو پرسیاری لێكرد كە بۆچی ئەم بەزمەی ناوەتەوە ،

---

[1] بڕوانە فتح الباري.

وتی: ویستم لە پشت هەموو پیاوێکەوە خاوو خێزانەکەی دابنێم ، بۆ ئەوەی غیرەتی بجولێت و شەڕ بکات.

وتی: وەڵڵاهی تۆ بۆ شوانی باشیت ، ئەریٚ هەرگیز بووە دۆڕاو هیچی پیٚ بکرێت ؟ ئەگەر ئەمڕۆ سەرکەویت تەنها پیاوێك بەکەڵکت دێت شمشێری بەدەستەوە بێت ، ئەگەر بشدۆڕێیت حەیاو ئابڕووت دەچێت . پاشان هەواڵی تیرو سەرۆك خێڵەکانی پرسی ،

ئەنجا وتی: (مالك) تۆ بەم کارەت هیچت پیٚ ناکرێت ، ئەمانە دوور بخەرەوە بۆ شوێنی دوور لە قەڵای مەحکەمدا دایانبنیٚ ، منداڵەکانیش بخەرە سەرپشتی ئەسپ و بیاننێرەوە ، ئەگەر سەرکەوتیت ئەوانیش پێت دەگەنەوە ، خۆ ئەگەر ژێریش کەوتیت ئەوا بەلایەنی کەمەوە ژن و منداڵەکانت پارێزراو دەبن.

بەڵام (مالك) کە سەرکردەی گشتی بوو ئەم داوایەی ڕەتکردەوەو وتی: وەڵڵاهی شتی واناکەم ، تۆ کابرایەکی پیرو خەڵەفاویت ، وەڵڵاهی یان ئەوەیە هەموو (هوازن) لەگەڵم دێن یان سنگ دەخەمە سەر نوکی ئەم شمشێرەو خۆم دەدەم بەسەریدا تا لە پشتمەوە دەردەچێت ، ئیتر حەزی نەدەکرد باس و خواسی (درید) لە مەسەلەکەدا بمێنێت ، بۆیە خەڵکەکە وتیان: ئێمە گوێڕایەڵی تۆین ،

(درید) وتی: بەڕاستی ئەمە ڕۆژێکە من نەمدیوەو لێشم دەرناچێت .

ئەنجا وتی:

يـا لَيْتَـني فيهـا جَـذَعْ أخُـبُ فـيهـا وأضَـعْ
أقـودُ وطـفـاءَ الـزمَعْ كَـأنّهـا شـاةٌ صـدعْ

## سیخوڕەکانی دوژمن

سیخوڕەکانی (مالك) هەواڵی موسڵمانەکانیان بۆ هێنا ، کە گەیشتنەوە قەڵەمی ئەژنۆیان شکابوو ، وتی: کوڕە ئەوە چیتانە ، چیتان لیٚ بەسەر هاتووە؟

وتیان: چەندین پیاوی سەرتاسپیمان بینی بەسواری ئەسپی ڕەنگ تێرەوە بوون ، کە ئەوەمان بینی هێزو تینمان تێدا نەماو ئەوە دەبینی چیمان لیٚ هاتووە.

## چاودێرەکانی پێغەمبەر ﷺ

هەواڵ هات بۆ پێغەمبەر ﷺ لەبارەی جموجوڵی دوژمنەوە ، (أبا حدرد الاسلمی) نارد بۆ لایان و فەرمانی پێدا ، کە دزە بکاتە ناویان و لەناویاندا بمێنێتەوە تا هەواڵیان دەزانێت و پاشان دەنگوباسیان بهێنێتەوە ، ئەویش وایکرد.

## پێغەمبەر ﷺ مەککە بەجێ دەهێڵێت و
## دەڕوات بۆ ( حنين )

(ڕۆژی شەممە شەشی مانگی شەوال ساڵی ٨ی کۆچی) ، پێغەمبەر ﷺ مەککەی بەجێ هێشت ئەوە نۆزدەهەم ڕۆژ بوو کە تەشریفی هاتبووە ناو مەککەوە ، کە دەرچوو دوانزە هەزار موسڵمانی لەگەڵدا بوو ، دە هەزاریان لەوانە بوون کە لەگەڵی دەرچوون بۆ فەتحی مەککە ، دوو هەزاریشیان مەککەیی بوون ، کە زۆرینەیان نۆ موسڵمان بوون پێغەمبەر ﷺ سەد قەڵغانی بەتاقمەکانیانەوە وەرگرت لە (صفوان) و (عتاب)ی کوڕی (أسيد) دانا بەسەر مەککەوە.

کاتی خەوتنان بوو ئەسپ سوارێك هات ، وتی: من سەیری فلآنە شاخ و فیسارە دۆڵم کردو بينيم خێڵی (هوازن) هەڵیان داوەو بە ژن و منداڵ و ماڵ و سامانەوە لەوێ خێوەتیان هەڵداوەو دابەزیون . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : خوا یاربێت سبەینێ ئەوە دەبێتە دەسکەوتی موسڵمانان . بۆ پاسەوانێتی ئەو شەوەش (انس)ی کوڕی (أبي مرثد) ی (غنوي) خۆی ئێشکگریی کرد.[1]

لەڕێگەدا کە بەرەو (حنين) دەچوون درەختێکی سەوزی گەورەیان بینی ، پێی دەوترا (ذات أنواط) واتە نیشانەدار، عەرەبە دەشتەکیەکان چەك و تفاقی خۆیان پێدا هەڵدەواسی و ئاژەڵیان لەبەردەمدا سەردەبڕی و لەژێر سێبەرەکەیدا خواپەرستیان دەکرد ، هەندێك لە موسڵمانانی ناو سوپاکە وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ تۆش درەختێك بۆ ئێمە نیشانە بکە هەروەکو ئەوانە درەختێکی نیشانەداری خۆیان هەیە. فەرمووی: (الله اكبر) ، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئێوەش قسەکانی شوێنکەوتوانی موسا دەڵێنەوە کە دەیانوت: تۆش لە زەویدا خودایەك بۆ ئێمە دروست بکە ، هەروەکو ئەوان خودایان هەیە لە زەویدا. ئەنجا فەرمووی: ئێوە خەڵکێکی نەزانن ، ئەوەی ئێوە دەیڵێن شوێن پێ هەڵگرتنی خەڵکانی ترە ، وەڵلاهی واتان لێ دێت شوێن هەنگاوەکانی میللەتانی پێش خۆتان دەکەون و گوێ نادەنێ.[2]

هەندێکی تریان کە لایەکی کردەوە بەلای سوپاکە سەریان سوڕما لە زۆری ژمارەی سوپاکەو وتیان: ئیتر لەمەودوا لەبەرکەمی ژمارە شکست ناهێنین ، کە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بەرگوێ کەوت ، زۆری پێ ناخۆش بوو.

---

[1] / بڕوانە (سنن أبي داود).
[2] / (ترمزی) ئەمەی ڕیوایەت کردوە .

## تیرهاوێژان شاڵاوی ناکاو دەهێنن

ده شەو لەمانگی (شوال) تێپەڕی بوو سوپای ئیسلام گەیشتە حنین لە شەوی سیٚشەممەدا ، بەڵام (مالك)ی کوڕی (عوف) پێش ئەمان گەیشتبووە شوێنەکەو بەشەودا هەموو چەکدارەکانی لەو شیوەدا حەشار دابوو و کەمینو مەفرەزەکانی بەو دەوروبەردا بڵاوە پیٚ کردبوو ، فەرمانی پێدابوون لەگەڵ دەرکەوتنی موسڵمانەکاندا تیر بارانیان بکەن ، ئەنجا یەك دەستەیی شاڵاوێکی خێرا بکەنە سەریان.

لە بەرەبەیاندا پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی ڕێکخست ، ئاڵاو پەرچەمەکانی دابەش کرد بەسەر سوپادا ، لەگەڵ تاریكو ڕووندا موسڵمانان چوونە ناو شیوی (حنین)ەوەو پێیدا شۆڕ بونەوە ، بیٚئەوەی بزانن لەناو تەنگەبەری شیوەکەدا کەمین هەیە ، کە بەرەو خوار دەبونەوە لە هەمولایەکەوە تیرباران کرانو کەتیبەو پۆلەکانی دوژمن یەکدەستەیی دایان بەسەریاندا ، موسڵمانەکان شپرزە بوون و گەڕانەوە دواوە کەس ئاگای لە کەس نەبوو ، شپرزە بونێکی سەخت بوو (أبو سفیان)ی کوڕی (حرب) کە هێشتا نۆ موسڵمان بوو وتبووی: وەڵڵاهی وابڕوا لە دەریاش ناگرسێنەوە - مەبەستی دەریای سوور بوو -. ئەنجا (جبلە) یان (کلدە)ی کوڕی (جنید) لەناو موشریکاندا هاواری دەکرد: ئەوە جادووەکە بەتاڵ بووەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لای ڕاستی گرت هاواری کرد: خەڵکینە وەرن لە دەورم کۆببنەوە ، من پێغەمبەری خودام ، من (موحەممەد)ی کوڕی (عەبدوڵڵا)م. لەوکاتەدا جگە لەچەند کەسێکی کۆچکەران و ئال و بەیتەکەی کەسی بەدەوردا نەمایەوە ، هەمووی ڕای کرد.

ئیتر لەوێدا ئازایەتی بێوێنەی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت ، بەسواری هێسترەکەیەوە بەتوندی بەرەو کافران دەڕۆیشتو دەیفەرموو:

أنـــا النبي لا كذب          أنـــا ابن عبد المطلب

(أبو سفیان)ی کوڕی (حارث)یش جڵەوی هێسترەکەی گرتبوو ، (عباس) پشتی گرتبوو نەیاندەهێشت پێغەمبەر ﷺ بڕواتە ناو جەنگەکەو عەرزیان کرد: پێغەمبەری خوا ﷺ تکایە پەلە مەکە ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ لە هێسترەکەی دابەزی و پاڕایەوە فەرمووی: خوایە سەرخستنی خۆت بنێرە.

## گەڕانەوەی موسڵمانەکان و گەرم بوونەوەی شەڕ

پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە (عباس) زۆر دەنگی گەورەبوو ، هاوەڵەکانی بانگ بکاتەوە . (عباس) دەڵێت: بەهەموو توانام هاوارم کرد: ئەرێ کوان کوڕانی (سمرە)؟

دەڵێت: وەڵلاهی چۆن ئاژەڵێك سۆزی بۆ بێچوەکەی دەجوڵێت ، کە گوێیان لە دەنگم بوو وتیان: ئەوە هاتینەوە ، ئەوە هاتینەوە.[1]

پیاوی وایان تێدا بوو دەیویست سواری وشترەکەی بێت و بگەڕێتەوە نەیدەتوانی ، خێرا قەڵغانەکەی دەکردەوە ملی و شیرەکەی دەگرتەوە بەدەستەوە و وازی لە وشترەکە دەهێناو بەرەڵای دەکردو بەرەو دەنگەکە دەهات ، تا سەد کەسێکیان لێ هاتەوە ئەنجا دەستیان کردەوە بە شەڕ.

ئەنجا بانگەکە ڕووی کردە ئەنسار ، وتی: ئەرێ خێڵی ئەنسار ، ئەرێ خێڵی ئەنسار ، کەوتە بانگکردنی (بنی الحارث)ی (خزرجی) ئیتر کەتیبەی موسڵمانەکان پۆل پۆل هاتنەوەو گەیشتنەوە ئەو شوێنانەی بەجێیان هێشتبوو ، ئەنجا شەڕ دەستی پێ کردەوە . پێغەمبەر ﷺ سەیری مەیدانی جەنگەکەی کرد کەبینی شەڕ هەڵگیرساوە فەرمووی: (ئێستا شەڕ گەرم بووە). ئەنجا مشتێك خۆڵی هەڵگرت و بەڕووی کافراندا فڕێی‌داو فەرمووی: (خوایە چاوانیان کوێر بێت). لەو ڕۆژەدا چەکداریان نەبوو گەردو تۆزی ئەو مشتەخۆڵە بەچاویاندا نەچووبێت ، بۆیە شکستیان هێناو بەرەودوا کەوتنە هەڵاتن.

## شکست هێنان و ڕووخانی دوژمن

هێندەی نەبرد ـ دوای فڕێدانی مشتە خۆڵەکە ـ دوژمن شکستی هێنا ، شکستێکی خراپ ، خێڵی (ثقیف) حەفتایان لێکوژرا ، وەموسوڵمانەکان دەسکەوتێکی زۆریان دەستکەوت ، لە مەڕو ماڵات و چەك .

وە قورئان ئاماژەی بۆ ئەم شەڕە کرد ، دەفەرموێت : ﴿ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ {٢٥} ثُمَّ أَنَزلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ {٢٦} ﴾ التوبة .

---

[1] / صحيح المسلم ٢/ ١٠٠.

که دوژمن شکستی هێنا هەندێکیان چوونە (طائف) ، هەندێکیشیان چوونە (نخلە) ، هەندێکی تریشیان خۆیان گەیاندە (أوطاس) ، پێغەمبەر ﷺ چەند هاوەڵێکی نارد بۆ ڕاوەدونانی ئەوانەی (أوطاس) بەفەرماندەی (أبو عامر الأشعری) ، هەردوولا بوو بە شەڕیان ، جارێکی تر موشریکان ڕایانکرد ، لەو بگرەو بەردەیەدا (أبو عامر)ی فەرماندە شەهید کرا.

کۆمەڵێکی تر کەوتنە ڕاوەدونانی ئەو موشریکانەی هەڵاتن بۆ (نخلة) لەوێ (ربیعة)ی کوڕی (رفیع) (درید)ی کوڕی (صمة)ی کوشت.

بەڵام زۆرینەی سوپا تێکشکاوەکە پەنایان برد بۆ (طائف) ، پێغەمبەر ﷺ پاش کۆکردنەوەی دەسکەوتەکان بە خودی خۆی چوو بەدوایاندا.

## دەسکەوتەکان

دەسکەوتەکان بەم شێوەیە بوون : شەش هەزار دیل ، بیست و چوار هەزار سەر وشتر ، زیاتر لە چل هەزار سەر مەڕ ، چوار هەزار هۆقە زیو. پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەکۆکردنەوەیان و لە (جعرانة) مەڵۆی کردن و (مسعود)ی کوڕی (عمر)ی (غفاری) کرد بەچاودێر بەسەریەوە ، دابەشی نەکرد تا لە غەزای (طائف) گەڕایەوە.

لەناو ژنە دیلەکاندا (شیماء)ی کچی (حارث)ی (سعد)ی یان تێدا بوو کە خوشکی شیری پێغەمبەرە ﷺ ، کە هێنرایە بەردەم پێغەمبەر ﷺ ، خۆی پێناساندو بەنیشانەیەکدا ناسیەوەو ڕێزی لێ گرت و کراسەکەی خۆی بۆ ڕاخست و دای نیشاند لەسەری ، پاشان ئازادی کردو گێڕایەوە بۆ لای کەسوکاری.

## غەزای ( طائف )

لەڕاستیدا ئەم غەزایە درێژکراوەی غەزای (حنین)ە ، چونکە زۆرینەی خێڵی (هوازن) و ( ثقیف) لەوانەی لەگەڵ (مالك)ی سەرکردەیاندا بون بەرەو (طائف) چوون و لەوێ خۆیان حەشاردا ، پێغەمبەر ﷺ دوای دەست بەتاڵ بوون لە شەڕی (حنین)و کۆکردنەوەی غەنیمەتەکان لە (جعرانة)دا ، لە هەمان مانگی ساڵی (٨)ی کۆچیدا چوو بۆیان.

(خالد)ی بەهەزار سوارەوە خستە پێشی سوپاکە ، پاشان بەرەو (طائف) کەوتە ڕێ ، لەڕێگەدا بەلای (النخلة اليمانية) تێپەڕی و پاشان بۆ (قرن المنازل)و پاشان بۆ (لية)و لەوێدا قەلآیەکی (مالك)ی کوڕی (عوف)ی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا ڕوخاندیان ، پاشان بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن تاگەیشتە (طائف)و لەنزیك قەلآکانیانەوە ئۆردوی وەستاندو سەربازگەی داناو ئابلۆوقەی خەڵکی ناو قەلآکەیدا.

گەمارۆکە ماوەیەکی درێژی خایەند، لە ڕیوایەتێکی (أنس)دا هاتوە لە (مسلم)ە وە دەڵێت : ماوەی گەمارۆکە چل ڕۆژ بووە ، لای (سیرەت)ناسەکانیش ماوەکە جیاوازی لەسەرە ، وتراوە : بیست ڕۆژ ، وتراوە : چەند مانگێك ، وتراوە : هەژدە ڕۆژ ، وتراوە : پانزە ڕۆژ ..[1]

لەو ماوەیەدا لەنێوان هەردوولادا شەڕەتیرو ڕمبازیی ڕوویدا ، کە یەکەمجار موسڵمانەکان گەمارۆیاندان ، خەڵکی ناو قەلآکە وەکو لێشاوی کوللە تیربارانیان کردن ، هەندێك لە موسڵمانەکان بریندار بوون‌و دوانزە کەسیشیان لێ شەهید بوو ، ناچاربوون کەمێك لە قەلآکان دور بکەونەوە تا ئەو شوێنەی دەکەوێتە نزیکی (طائف)ی ئێستاوە لەوێدا سەربازگەیان هەڵدا.

پێغەمبەر ﷺ ئاگرپژێنی دابەست بۆ خەڵکی (طائف)و چەند دانەیەك ئاگر کۆیان تێگرتن ، هەتا درزی خستە نێو دیواری قەلآکەوە ، چەند موسڵمانێك بەژێر دەبابەیەکی تەختەدا چوونە ژوورەوە[2] بۆ ئەوەی دیوارەکە بسوتێنن ، دوژمنیش چەندین پارچە ئاسنی گەرمی سوتێنەریان بۆ هەڵدان ، بەناچاری لە ژێر دەبابە تەختەکەدا هاتنە دەرەوە ئەنجا تیر بارانیان کردن و چەند پیاوێکیان لێ شەهید کردن.

پێغەمبەر ﷺ وەکو بەشێك لەسیاسەتی ناچارکردنی دوژمن بۆ خۆ بەدەستەوە دان ، فەرمانیدا بە بڕین‌و سوتاندنی دارو ڕەزە مێوەکانیان ، موسڵمانەکان بەشێوەیەکی سەخت زۆربەیان بڕی ، (ثقيف) تکای خزمایەتی‌و لە خوا ترسانیان لێ کردن کە نەیانبڕن ، پێغەمبەر ﷺ وازی لەوە هێنا.

---

[1] / فتح الباری ٨/٤٥.

[2] / ئەو دەبابەیەی باسی هاتووە لێرەدا وەك دەبابەکانی ئەمڕۆ نەبوە ، بەڵکو لەدارو دروست کراوە ، خەڵك دەچونە ناویەوە پاشان پاڵیان پێوەدەنا بۆ بنی قەلآکە تا بنکەنی بکەن ، یان لە ڕێگەی کونەکانەوە بڕۆنە ژورەوە.

ئەنجا یەکێك لە بانگخوازانی هاواری کرد: هەرکەسێك لەخەڵکی ناو قەڵاکە دابەزێت ئازادە ، بیست و سێ پیاویان[1] لێ هاتە دەرەوە کە (أبو بكرة)یان تێ دابوو ، ئەم پیاوە خۆی دابوو بەسەر قەڵاکەی (طائف)دا ، بەخڕۆکەیەکی بازنەیی خۆی شۆڕ کردبوەوە ئاوی دەهێنا . بۆیە پێغەمبەر ﷺ ناوی (أبو بكرة)ی لێنا ، هەریەکێك لەو پیاوانەشیدا بەدەست موسڵمانێك کە نان و ئاوی بداتێ ، ئەمە بەلای خەڵکی ناو قەڵاکەوە زۆر سەخت و ناخۆش بوو.

کە ئابڵوقەکە درێژەی کێشاو قەڵاکەش خۆی نەدا بەدەستەوە ، لەو ئاکامەدا موسڵمانەکان بەهۆی تیرباران و ڕمبازی و فڕێدانی پارچە ئاسنەوە تووشی ئەو زیانانە هاتن ، لەڕاستیدا خەڵکی ناو قەڵاکە بەشی بەرگەگرتنی یەك ساڵی گەمارۆدان ئازوقە یان لەلابوو ، پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی کرد بە (نوفل)ی کوڕی (معاویە)ی (دیلی) ، (نوفل) وتی: ئەوانە وەك ڕێوی وەهان لەکونەکانیاندا ، ئەگەر درێژە بە گەمارۆکە بدەیت دەیگریت ، ئەگەر وازیان لێ بهێنیت زیانێکی ئەو تۆت پێناگەیەنن، ئیدی پێغەمبەر ﷺ نیازی کرد کە وازیان لێ بهێنێت و بڕوات، فەرمانیدایە (عمر)ی کوڕی (خطاب) کەبڵێت بەخەڵك: ئێمە سبەینێ خوا یاربێت دەگەڕێینەوە . ئەو بڕیارە لەسەر دڵی موسڵمانەکان زۆر قورس بوو ، وتیان : بگەڕێینەوەو قەڵاکە فەتح نەکەین؟ ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : کەواتە سبەینێ پەلامارێکیتر بدەن . کە پەلاماریاندا برینداریێکی زۆریان هەبوو، ئەنجا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (انشاء الله) سبەینێ دەگەڕێینەوە. پێیان خۆش بوو ملیانداو گەڕانەوە ، پێغەمبەریش ﷺ پێدەکەنی. .

کە بارو بارگەیان پێچایەوەو کەوتنە ڕێ ، فەرمووی: بڵێن ( آیبون تائبون عابدون ، لربنا حامدون ) ، واتە (ئێمە سەر لە نوێ گەڕاینەوەو تەوبەمان کردو خواپەریستیمان کردو سوپاسی خوا دەکەین).

کۆمەڵێك وتیان: پێغەمبەر ﷺ دۆعا بکە لە (ثقيف) . فەرمووی : خوایە ڕێنومایی (ثقيف) بکەیت و بیانهێنیت بۆ لامان .

---

[1] / صحيح البخاري ٢/٦٢٠.

## دابەشکردنی غەنیمەت لە (جعرانە)

پاش هەڵگرتنی گەمارۆکە ، پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە چەند شەوێك لە (جعرانة) مایەوە ، غەنیمەتەکەی دابەش نەدەکرد دەستی پێدەکرد ، سا بەڵکو وەفدی (هوازن) تەوبە بکەن و بێنەوە بەدەم ماڵ و سامانەکەیانەوەو وەری بگرنەوە ، بەلاّم کەس نەهات ، ئەنجا دەستی کرد بە دابەش کردنی ماڵ و سامانەکە ، بەمەبەستی بێدەنگ کردنی سەرۆك خێڵ و گەورەکانی مەککە ، بۆیە دڵە ڕاگیرکراوەکان پشکی هەرە گەورەیان بەرکەوت لەو دەست کەوتەدا. (أبو سفیان) چل هۆقەو سەد وشتری پێدرا .

وتی: ئەی یەزیدی کوڕم؟ ئەوەندەشی دا بە یەزیدی کوڕی ،

وتی: ئەی معاویە کوڕم؟ ئەوەندەشی دا بە (معاویە) ،

سەد وشتریشی دا بە (حکیم)ی کوڕی (حزام) ، پاشان (حزام) داوای سەد وشتری تری لێکرد پێیدا .

پاشان دووسەد وشتری دا بە (صفوان)ی کوڕی (أمية) بەم شێوەیە لە کتێبی (الشفاء)دا هاتووە[1]

سەد وشتریشی دا بە (حارث)ی کوڕی (کلدة) ،

بەهەمان شێوە سەرکردەکانی قوڕەیش و گەورەی خێڵەکانی تریش هەریەکەو سەد وشتری پێدان ،

بەخەڵکانی تریش پەنجاو چل چلی دەبەخشی تا بلاّو بووەوە لەناو خەڵکیدا کە موحەممەد ﷺ ئەوەندە دەبەخشێت لە هەژاری ناترسێت ، عەرەبی دەشتەکی بە سەریدا دابارین و داوای موڵكو سامانیان دەکرد ، تا ناچاریان کرد بڕواتە ژێر درەختێکەوە لەوێشدا بوردەکەی سەرشانی پیرۆزی کەوتە خوارەوە ،

فەرمووی : خەڵکینە بوردەکەم بدەنەوە ، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، ئەگەر بەئەندازەی دارو درەختی هەموو (تهامة) وشترم هەبێت ، دابەشی دەکەم بەسەرتاندا ، پاشان دەشبینن کە من نە چروکم و نە ترسنۆك و نە درۆزن .

پاشان چووە پاڵ وشترەکەی چەند تاڵەموویەکی لەپشت ملی وشترەکەی کردەوەو خستیە نێو پەنجەکانیو بەرزی کردەوەو فەرمووی : خەڵکینە من چیمە بەسەر دەستکەوتی ئێوەو بەسەر ئەم تاڵە موانەوە جگە لە پێنجیەك ، ئەوە پێنجیەکەشم دایەوە بە ئێوە.

---

[1] (الشفاء تعريف حقوق المصطفى) نوسینی قازی (عیاض) ١/ ٨٦.

پاش پێدانی پشکی دڵە ڕاگیرکراوەکان ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌دا بە (زید)ی کوڕی (ثابت) کە دەسکەوتەکان و خەڵك کۆبکاتەوە ، ئەنجا دابەشی کردن بەسەر خەڵکیدا ، پشکەکانیان وابوو کە هەر پیاوێك چوار وشترو چل سەر مەڕی پێ ببڕێت ، ئەگەر ئەسپ سواریش بوو دوانزە وشترو سەد سەر مەڕی پێ ببڕێت.

ئەم دابەشکردنە لەسەر سیاسەتێکی ژیرانە داڕێژرا بوو ، چونکە لە دونیادا چەندین کەس هەن بە ورگیان بەرەو ڕاستی دەهێنرێن ، نەك بە عەقڵیان . هەروەکو چۆن ئاژەڵ چەپکێك سێپەرەی بۆ دەگری تا دەیکەیت بە تەویلەکەی خۆیدا ، بۆیە لەم جۆرە کەسانە پێویستیان بەجۆرێك لە شێوازی چاوچنۆکی خستنەبەر هەیە ، تا هۆگری ئیمان و بیروباوەڕ ببن و لە دەوری خڕببنەوە.[1]

## ئەنسارەکان دەڕۆنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ

ئەم سیاسەتە لە سەرەتادا لای هەندێك کەس ڕوون نەبوو ، بۆیە لە زۆرلاوە گلەیی‌و قسەو باس دروست بوو ، ئەنسارەکان لەو کەسانە بوون کە ئەم حاڵەتە کاری تێ کردبوون و بێتاقەت بوون ، چونکە هیچ کەسێکیان غەنیمەی (حنین)یان بەرنەکەوت ، هەر ئەمانیش بوون کە لە کاتی ناڕەحەتی و لێقەوماندا هاواریان لێ کراو هاتن بەدەم پێغەمبەر ﷺوەو هاوکێشەی هەموو شەڕەکەیان لە هەڵاتنەوە گۆڕی بۆ سەرکەوتن ، ئەوە ئێستا دەبینن مشتی هەڵاتوان پڕەو ئەمانیش دەستیان بەتاڵەو هیچیان پێ نەبڕاوە.[2]

(ابن اسحاق) لە (ابو سعید)ی (خدری)یەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت: کە پێغەمبەر ﷺ ئەو هەموو دیاری‌و بەخشیشەی دا بەقورەیش و خێڵەعەرەبەکان و هیچ بەرئەنصارەکان نەکەوت ، لەناو ئەنصارەکاندا مقۆمقۆو دڵگرانی دروست بوو تا ئاستی دەنگە دەنگیش بەرزبووەوە ، تا یەکێکیان وتی: وەڵڵاهی ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ بە کەس و کارەکەی خۆی گەیشتەوەو ئیتر لا بە لای ئێمەدا ناکاتەوە. (سعد)ی کوڕی (عبادە) چووە خزمەتی‌و عەرزی کرد: پێغەمبەری خوا ئەنصارەکان لەبەردڵیان گرانە کەتۆ لەو دەستکەوتە تەنها بەشی خزمانی خۆتت داو بەخشیشێکی زۆریشتدا بەخێڵە عەرەبەکان و لەوە هیچ بەر ئەنصارەکان نەکەوت .

---

[1] ئەمە وتەیەکی شێخ موحەممەدی غەزالیە لە ( فقه السیرة)دا هاتووە ل٢٩٨/٢٩٩.

[2] وتەیەکی (الغزالی)یە لە (فقه السیرة) داهاتووە ل٢٩٨/٢٩٩.

فەرمووی : ئەی (سعد) ئەوە تۆ قسەی وەها دەکەیت؟

(سعد) وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ منیش مرۆڤمو یەکێکم لەخێڵەکەم.

فەرمووی : ئادەی خزمو خێڵەکەتم بۆ کۆبکەرەوە لەشوێنێکدا.

(سعد) چووە دەرەوە هەموو ئەنسارەکانی لەو شوێنەدا کۆکردەوە ، چەند پیاوێکی کۆچەر هاتن ڕێگەیدان بێنەناو ئەنصارەکانەوە ، چەند کەسێکی دیکە هاتن ڕێگەی نەدان ، کە کۆبونەوە (سعد) هات بۆ خزمەتیو وتی: ئەوە خەڵکی ئەنصارەکانت بۆ کۆبۆتەوە ، بفەرموو.

پێغەمبەر ﷺ هاتەلایان ، سوپاسی خودای کردو وەسفو سەنای کرد ، پاشان فەرمووی:

( ئەی کۆمەڵی ئەنصار ، شتێکم لەبارەی ئێوەوە پێگەیشتوە ، کە ئێوە بەرامبەر بە من شتێکتان لەدڵدا بۆ دروست بووە ، وانیە؟

ئایا کە من هاتم ئێوە سەر لێ تێکچوو نەبوون و خوا هیدایەتیدان ؟

هەژار نەبوون و خوا دەوڵەمەندی کردن ؟

دوژمنی یەك نەبوون بەڵام خوا هەمووتانی کردە براو دۆستی یەکتر؟

وتیان : بەڵێ ، خواو پێغەمبەرەکەی خاوەن فەزڵی زیاترو چاکترن.

پاشان فەرمووی: ئەرێ خەڵکی ئەنسار وەڵامم نادەنەوە؟

وتیان : بەچی وەڵامت بدەینەوە؟

وتمان : منەتو ڕێز بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی.

فەرمووی : وەڵڵاهی ئەگەر بتانەوێت دەڵێن و ڕاستیش دەکەن ، کە دەڵێن : پێغەمبەر ﷺ تۆ کەهاتیت دوورخرابویتەوە ئێمە متمانەمان پێدایتو باوەڕمان پێهێنایت ، لاوازو زەبوون بویت ، ئێمە سەرمان خستیت ، پەڕاگەندە بویت ئێمە جێمان کردیتەوە ، هەژار بویت دڵمان دایتەوە .

ئەی خەڵکی ئەنسار ئێوە لە دڵتاندا خەفەت بۆماڵی دونیا دروست بووە ، ماڵێك کە خەڵك بەدوایدا ڕادەکەن ، تاموسڵمان بن ئەی چۆنە ئێوە بدەمەوە دەست ئیسلامەکەتان ؟

ئەی خەڵکی ئەنسار ئایا ڕازی دەبن کە ئەوان بە وشترو مەڕوماڵاتەوە بڕۆنەوە بۆ ماڵەوەو ئێوەش بە پێغەمبەرەوە بڕۆنەوە بۆ ماڵو حاڵی خۆتان؟

سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، ئەگەر هیجرەت نەبوایە حەزم دەکرد یەکێك بم لە ئەنصارەکان ئەگەر هەموو خەڵك ڕوو لە شوێنێك بکەن‌و ئەنصاریش ڕوو لە شوێنێکی تر بکات ، سوێند بێت کە ڕێگەکەی ئەنصارم هەڵدەبژارد ، خوا ڕەحم بکەیت بە ئەنصارەکان ، بە ڕۆڵەکانیان ، بە ڕۆڵەی ڕۆڵەکانیان).

بە بیستنی ئەم وتە شیرینانە هەموویان دەستیان کرد بەگریان تا فرمێسك ڕیشی شۆردنەوەو وتیان: ئێمە پشکی پێغەمبەرمان دەوێت.

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ هەستاو ئەوانیش بلاوەیان لێ کرد.[1]

## هاتنەوەی وەفدی (هوازن)

پاش دابەشکردنی غەنیمەتەکان وەفدی (هوازن) بەموسڵمانی هاتن ، دوانزە پیاو بوون ، (زەهد)ی کوڕی (ابن صرد) سەرۆکیان بوو ، (أبو برقان)یش کە مامی شیری پێغەمبەر بوو ﷺ لەگەڵیاندا بوو. داوایان لێ کرد کە ژن‌و منالّ‌و مالّ‌و سامانەکەیان بداتەوە ، هەندێك قسەی نەرم‌و دڵتەزێنیان بۆ کرد ،

فەرمووی: ئێوە دەزانن چی لای منە ، باشترین قسە لای من ڕاسترینیانە ، ئایا حەز دەکەن ژن‌و منالەکانتان وەربگرنەوە یان مالّ‌و سامانەکانتان؟

وتیان: لای ئێمە هیچ شتێك بەئەندازەی ژن‌و منالّ خۆشەویست نیە.

فەرمووی: کە نوێژی نیوەڕۆ کرا هەستن‌و بڵێن: خەڵکینە ئێمە پێغەمبەر ﷺ دەکەینە تکاکاری لای ئیمانداران ، ئیماندارانیش دەکەینە تکاکار لای پێغەمبەر ﷺ کە ژن و منالەکانمان بدەنەوە ، کە نوێژی نیوەڕۆ کرا ، وەفدەکە قسەکانی پێغەمبەریان ﷺ کرد ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ئەوەی پشکی من و (بني عبدالمطلب)ە بۆ ئێوە ، بۆ خەڵکیش من داوایان لێ دەکەم ، کۆچکەران و ئەنصارەکان وتیان : ئەوەش هی ئێمەیە بۆ پێغەمبەری خوا دەبێت ﷺ ،

بەلاّم (اقرع)ی کوڕی (حابس) وتی: من و (بنو تميم) نایدەینەوە.

(عیینە)ی کوڕی (حصن)یش وتی: من‌و (بنو خزارة)ش نایدەینەوە.

(عباس)ی کوڕی (مرداس)یش وتی: من و (بنو سليم)یش نایدەینەوە.

---

[1]/ ابن هاشم ٢/ ٤٤٩،٥٠٠ . (بخاری)یش لەوشێوەیەی ڕیوایەتی کردوە ٢/٦٢٠و٦٢١.

بەلاَم (بنو سليم) وتيان: ئەوەی هی ئێمەیە دەیدەین بە پێغەمبەر ﷺ.

(عباس)ی کوڕی (مرداس) پێی وتن: بەڕاستی ڕووی منتان زەرد کرد.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵکینە ئەمانەی هاتوون بەموسڵمانی هاتوون ، من لە کاتی خۆیدا زۆر لەسەر ژن و منالەکانیان وەستامو چاوەڕێم کردن ، ئیختیارم دایە دەست خۆیان کە ئایا مالیان دەوێت یان ژنو منالەکانیان وتیان: هیچ شتێك ناگۆڕینەوە بە ژنو منالەکانمان ، هەرکەسێك لە ئێوە کەسێکی ئەمانی لەلایە با بەڕەزامەندی دلی خۆی بیداتەوە ، هەرکەسێکیش دەست دەگرێت بەمافی خۆیەوەو نایداتەوە ئەوا با بیداتەوە ، بۆ هەرکەسێکیان شەش پشك دادەنێم بۆ ئەو کەسەی دەیداتەوە لەو ماڵ و دەستکەوتەی لەداهاتودا دەستمان دەکەوێت ،

خەلك وتیان: بەڕاستی دلی پێغەمبەر ﷺ ڕازی دەکەین .

فەرمووی: من نازانم کێ لە ئێوە ڕازیەو کێ ناڕازیە ، بگەڕێنەوە تا میرەکانتان ڕاوبۆچونەکانی ئێوەمان بۆ دەهێننەوە ، هەموویان بڕیاریاندا ژنو منالەکان بدەنەوە ، جگە لە (عیینە)ی کوڕی (حصن) کە پیرەژنێکی لەلابوو نەیدەدایەوە ، ئەویش لەدواییدا دایەوە ، پێغەمبەریش ﷺ دەستێك جلی کەتانی بۆ کردو ناردیەوە.

## عومره کردن و گەڕانەوە بۆ مەدینە

کە پێغەمبەر ﷺ لە دابەشکردنی غەنیمەتی (جعرانة) بوەوە خۆی سازدا بۆ عومرە کردن ، عومرەی ئەنجامدا ، دوای ئەوە تەشریفی چوەوە بۆ مەدینە پاش ئەوەی (عتاب)ی کوڕی (أسید)ی دانا بەسەر مەککەوە ، کە گەڕایەوە بۆ مەدینە مانگی (ذي القعدة) شەش ڕۆژی مابوو ، لە ساڵی (٨)ی کۆچیدا.

(محمد الغزالی) دەڵێت:خوایە ، ماوەی نێوان ئەو چەندە ساتە چەندە زۆرە کە تیایدا خودا سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانەکان و تاجی سەرکەوتنی نایەسەر سەری پیرۆزی ، لەگەڵ ئەو کاتەدا کە پێش هەشت ساڵ تەشریفی بردە ناو ئەو شارە شکۆدارەوە؟

بەڕاستی کە تەشریفی برد بۆ مەدینە جێی نەدەبوەوە بەدوای ئارامیدا دەگەڕا ، بێ کەس و قەلەندەر بەدوای ماڵێکی ئارام و هۆگرێکی دڵسۆزدا دەگەڕا ، لەو شوێنەدا ڕێز لە خۆی و کەسوکاری گیرا ، پشتیوانیان کرد ، شوێن ئەو نووری هیدایەتەی ئەو کەوتن ، لەو پێناوەدا دوژمنایەتی هەموو دونیایان بەهیچ نەزانی، ئەوەتا دوای هەشت ساڵی ڕەبەق لەمەوبەر کە بەترس و لەرزەوە خۆی کرد بەو شارەدا ئێستاکە پێشوازی لێ دەکەن ، سەری بەرزەو شاری مەککەش نوچی داوە لەبەردەمیدا و سەریان لەبەردەم قاچەکانیدا شۆڕ کردوەو جاهیلیەتیان فڕێداوە ، بۆ ئەوەی بە بانگەوازی ئیسلامەتی بەرزو بڵند بێتەوە ، لە بەرامبەر ئەوەدا ئەویش لە سەرە ڕۆییەکانیان خۆشبوو ﴿ إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ یوسف/٩٠.[1]

[1] / فقه السيرة ل ٣٠٢ . بۆ درێژەی ئەم غەزایە (فەتحی مەککە و حنین و طائف)و هەرچیەك ڕوی داوە تیایدا ، بڕوانە : زاد المعاد ج٢ ل ١٦٠ تا(٢٠) هەروەها (ابن هشام) و(وطاوس و الطائق و هیتریش ج٢ ل ٦١٢ تا ٦٢٢ ، هەروەها فتح الباری ج ٨ ل ٣ تا ٥٨ .

## ناردنی سریەکان دوای گەڕانەوەی لە غەزای فەتحی مەککە

پاش گەڕانەوە لەو سەفەرە دوورو درێژە سەرکەوتوە ، پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا دانیشت ، پێشوازی لە شاندەکان دەکردو سەرکارەکانی خۆی دەنارد بە چواردەورداو بانگخوازنی دەنارد بۆ بلاٌوکردنەوەی ئیسلامەتی و بێدەنگ کردنی ئەو کەسانەی کە هێشتا سەرسەختی و خۆبەزلزانی نەیدەهێشت ملکەچی دینی خودا بن و تەسلیم بن بەو واقعی حالەی عەرەبی تێدا دەژی ، ئەوەش نمونەیەکی بچوکە:

## بـــڕواداران

پێشتر وتمان کە پێغەمبەر ﷺ لەکۆتای ڕۆژانی سالٌی هەشتەمی کۆچیدا گەڕایەوە بۆ مەدینە ، لەگەلٌ دەست پێکردنی مانگی (محرەم)ی سالٌی (٩)ی کۆچی‌دا ، پێغەمبەر ﷺ بڕوادارانی نارد بۆ لای خێلٌ و تیرەکان ، ئەمەش لیستی ناوەکانیانە:

(عیینة)ی کوڕی (حصن) بۆ (بنی تمیم)

(یزید)ی کوڕی (حصین) بۆ (أسلم) و (غفار)

(عباد)ی کوڕی (بشیر)ی (الأشهلي) بۆ (سلیم) و (مزینة)

(رافع)ی کوڕی (مکیث) بۆ (جهینة)

(عمرو)ی کوڕی (عاص) بۆ (بنی خزارة)

(ضحاك)ی کوڕی (سفیان) بۆ (کلاب)

(بشیر)ی کوڕی (سفیان) بۆ (بەنی کعب)

(ابن اللتبیة)ی (أزدی) بۆ (بنی ذبیان)

(مهاجر)ی کوڕی (أبی أمیة) بۆ (صنعاء) لەوێدا (أسود)ی (عنسی) بۆ دەرچوو کە ئەم لەوێ بوو

(زیاد)ی کوڕی (لبید) بۆ (حضرموت)

(عدی)ی کوڕی (حاتم) بۆ (طيء) و (بنی أسد)

(مالك)ی کوڕی (نویرة) بۆ ( بنی حنظلة)

(زبرقان)ی کوڕی (بدر) بۆ (بنی سعد) بۆ هەندێکیان

(قیس)ی کوڕی (عاصم) بۆ (بنی سعد) بۆ هەندێکی تریان

(علاء)ی کوڕی (حضرمی) بۆ (بحرین)

(علی) کوڕی (أبی طالب) بۆ (نجران)(بەمەبەستی کۆکردنەوەی (صدقة) و (جزیة)

هەموو ئەو سەرکارانە لەمانگی (محرم)ی ساڵی(٩)ی کۆچیدا نەنێرراون، بەڵکو هەندێکیان کەوتونەتە دوای موسڵمان بوونی ئەو خێڵانە ، بەڵێ سەرەتای گەرماوگەرمی ناردنەکە لەمانگی (محرم)ی ساڵی(٩)ی کۆچی‌دا بووە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنی بانگەوازی ئیسلامیی لەدوای سوڵحی حودەیبییەوە ، بەڵام دوای فەتحی مەککە پۆل پۆل خەڵکی دەهاتنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

## سـریەکان

لەگەڵ ناردنی بڕواداراندا بۆ ئەو شوێنانە ، زۆر پێویست بوو کەچەند سریەیەکی ئیسلامی بەمەبەستی بەرقەرارکردنی هێمنی و ئاسایش لەو شوێنەدا بنێرێت ، ئەمەش لیستی ناردنی سریەکانە:

١. سریەی (عیینە)ی کوڕی (حصن)ی (خزاری) لە مانگی (موحەرەم)ی ساڵی (٩)ی کۆچی‌دا ، بۆ (بنی تمیم) لەگەڵ پەنجا ئەسپ سواردا ، هیچ کەسێکی کۆچەرو ئەنساریان لەگەڵدا نەبوو ، هۆیەکەشی ئەوە بوو (بنی تمیم) تیرەو خێڵە عەرەبەکانیان فریودا بوو کە (جزیە) نەدەن.

(عیینە) کە دەرچو شەوڕەوی دەکردو بەڕۆژ خۆی حەشاردەدا تا لەسارادا دای بەسەریاندا ، هەموویان هەڵاتن یانزە پیاوو بیست و یەك ژن و سی منداڵیان لێ بەجێما ، (عیینە) هەموویانی هێنا بۆ مەدینە ، لەماڵی (رملة)ی کچی (حارث) دایبەزاندن.

دە پیاوی سەرکردەیان هاتن بۆ مەدینەو چونە بەردەرکی پێغەمبەر ﷺو هاواریان کرد: ئەی موحەممەد وەرە دەرەوە بۆ لامان ، کەهاتە دەرەوە لێی نەدەبونەوە ، قسەیان لەگەڵدا دەکرد ، لەگەڵیاندا وەستا ، پاشان چوو هەتا نوێژی نیوەڕۆی کرد پاشان لەناو مزگەوتدا دانیشت ، ئەوان ئامادەیی خۆیان پیشاندا لە خۆهەڵکێشان و شانازی کردن بەخودا ، ئەنجا (عطارد)ی کوڕی (حاصب)ی گوتارخوێنی خۆیان خستە پێشەوە دەستی کرد بە قسەکردن ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌دا بە (قیس)ی کوڕی (شماس) کە گوتار خوێنی ئیسلام بوو. وەڵامی دایەوە ، پاشان شاعیرێکی تریان پێش خست کە ناوی (زبرقان)ی کوڕی (بدر) بوو دەستی کرد بەخوێندنەوەی شیعری شانازی ، ئەنجا شاعیری ئیسلام (حسان)ی کوڕی (ثابت) دەم و دەست وەڵامی دایەوە.

که هەردوو گوتارخوێن و شاعیرەکە لێبونەوە (أقرع)ی کوڕی (حابس) وتی: گوتارخوێنەکەی ئەوان لە گوتار خوێنەکەی ئێمە کارامەتر بوو ، شاعیرەکەشیان لە شاعیرەکەی ئێمە شاعیرتر بوو ، دەنگیشیان لەدەنگی ئێمە دلێرتر بوو ، وتەیان لە وتەی ئێمە بەرزترە ، پاشان هەموویان موسڵمان بوون پێغەمبەر ﷺ خەڵاتی بەنرخی پێدان و ژن و منداڵەکانیشی پێدانەوە.[1]

٢. سریەی (قطبة)ی کوڕی (عامر) بۆ تیرەیەکی (خثعم) لە ناوچەی (تبالة) لە نزیك (تربة)وە ، (لە مانگی (صفر)ی ساڵی (٩)ی کۆچی)دا. (قطبة) لەگەڵ بیست پیاودا دەرچوون بە دە وشترەوە بە نۆرە سواریان دەبوون ، هێرشیان بردە سەریان ، شەڕێکی سەختیان کرد لەگەڵیاندا تا لە هەردوولا کوژراو بریندارێکی زۆر کەوتن ، (قطبة) خۆی یەکێك بوو لە کوژراوەکان ، موسڵمانەکان وشترو مەڕو ماڵاتەکەیان دایە بەرو هێنایانەوە بۆ مەدینە.

٣. سریەی (ضحاك)ی کوڕی (سفیان) بۆلای (بني کلاب) لەمانگی (رەبیعی یەکەم)ی ساڵی (٩)ی کۆچیدا بۆ ئەوەی ئەو خێڵە بانگ بکەن بۆ ئایینی ئیسلام ، ملیان نەداو شەڕ ڕوویدا ، موسڵمانەکان ڕاویان نان و پیاوێکیان لێ کوشتن.

٤. سریەی (علقمة)ی کوڕی (مجزز)ی (مدلجی) بۆ کەنارەکانی (جدة) لەمانگی (ڕەبیعی دووەم)ی ساڵی (٩)ی کۆچیدا بە سێسەد سوارەوە ، پێغەمبەر ﷺ ناردنی بۆسەر کۆمەڵێك پیاوی حەبەشی کە لەنزیك کەنارەکانی (جدة) کۆ بوو بونەوە بۆ چەتەگەری و ڕێگری دژ بەخەڵکی مەککە ، (علقمە) بۆیان چووە ناوەوە ، تاگەیشتە (جزیرة) کە ئەحباشەکان هەواڵی هاتنی موسڵمانەکانیان بیست ، خێرا ڕایان کرد بوو.[2]

٥. سریەی (علی) کوڕی (أبو طالب) بۆ شکاندنی پەیکەرێکی بتی خێڵی (طیء) ، کە ناوی (قلس) بوو ، لەمانگی (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی (٩)ی کۆچی ، پێغەمبەر ﷺ بە سەدو پەنجا کەسەوە ناردی بەسواری سەد وشترو

---

[1] / بەو شێوەیە (سیرەت) نووسەکان دەڵێن: ئەو سریەی لە مانگی موحەرەمی ساڵی (٩)ی کۆچیدا بوە ، ئەمەش بەڕونی قسەی لەسەرە ، ڕەوتی ڕووداوە ئەوە دەچرپێنێت بەگوێدا کە (اقرع)ی کوڕی (حابس) پێشئەوە لەناراداا نەبووە ، بەتایبەتی کەباسی ئەوەیان کردوە (اقرع)ی کوڕی (حابس) ئەوکەسەبوو لەکاتی پێدانەوەی دیلە ژنەکانی (هوازن)دا وتی: من و(بنوتمیم) نایدەینەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە موسڵمان بوونی (اقرع) لە پێش ناردنی ئەم سریەیەدا بووە.

[2] / فتح الباری ٨/٥٩.

پەنجا ئەسپەوە ، ئالآیەکی (سپی) و ئالآیەکی (ڕەش)ی پیّ بوو ، لەگەڵ بەرەبەیاندا دای بەسەر ماڵ و حاڵی (حاتەم)داو ڕووخاندیانو ماڵو سامانیّکی زۆریان دەستکەوت ، لەناو دیلەکاندا خوشکیّکی (عدی) کوڕی (حاتم)یان تیّدابوو ، (عدی)یش بەرەو شام ڕایکرد ، موسڵمانەکان لە خەزیّنەی (قلس)دا سیّهەزار شمشیّرو سیّهەزار قەڵغانیان دۆزیەوە ، لەسەر ڕیّگە غەنیمەتەکانیان دابەشکرد، پیّنج یەکەکەی پیّغەمبەریان جیاکردەوەو بەشەکەی ئالوبەیتی حاتەمیشیان دابەش نەکرد.

که هاتنەوە بۆ مەدینە خوشکەکەی (عدی) کوڕی (حاتم) داوای کرد لە پیّغەمبەر ﷺ و وتی : پیّغەمبەری خوا ﷺ کەسم دیارنیە هەواڵیّك نازانم ، منیش پیرەژنیّکی بە تەمەنم ناتوانم خزمەتی کەس بکەم ، ڕزگارم بکە ، خوای گەورە ڕزگارت بکات . پیّغەمبەر ﷺ فەرمووی : کەسەکانت کیّن؟

وتی: (عدی) کوڕی (حاتم)ە .

فەرمووی : ئەو کەسەیە کە لەخوداو پیّغەمبەرەکەی هەلآتوە؟

پاشان ڕۆشت ، بۆ سبەینیّ هاتەوەو هەمان شتی وتەوە ، پیّغەمبەر ﷺ هەمان وەلآمی دایەوە ، بۆ ڕۆژی سیّیەم هاتەوە هەمان شتی وتەوە ، پیّغەمبەر ﷺ ئازادی کرد ، لە تەنیشتیەوە پیاویّك وەستابوو ، ژنەکە زانی کە (علی)یە ، (علی) پیّی وت : دووبارە داوای وشترەکەی لیّ بکە ، ژنەکە داوای کردو پیّغەمبەر ﷺ فەرمانیدا پیّی بدەنەوە.

خوشکەکەی (عدی) کوڕی (حاتم) گەڕایەوە بۆلای براکەی لە شام ، کە بەرەو پیری چوو لەبارەی پیّغەمبەرەوە ﷺ پرسیاری لیّکرد، ژنەکە وتی: کاریّکی لەگەڵدا کردوم باوکیشت بوایە شتی وای نەدەکرد بەخۆشی خۆت بیّ یان ناحەزی دڵ برۆ بۆ خزمەتی . (عدی)یش بە بیّ پەناو بیّ نوسراو چوو بۆ خزمەت پیّغەمبەر ﷺ

هیّنایان بۆ ماڵەکەی پیّغەمبەر ﷺ کە لەبەردەمیدا دانیشت ، پیّغەمبەر ﷺ سوپاسو وەسفو سەنای خوای کرد ، پاشان فەرمووی : چیە پاڵت پیّوە دەنیّت هەڵبیّیت ؟

لەوە هەڵدیّیت کە بڵیّیت : لااله الا الله ؟

ئایا تۆ خوایەکی دیکە جگە لەخوا دەناسیت؟

وتی: نەخێر.

کەمێکی کە قسەی کرد ، پاشان فەرمووی : لەوە ڕادەکەیت کە دەوترێت (الله اکبر) ؟

ئایا هیچ هێزێك هەیە لەخوا گەورەتر بێت؟

وتی: نەخێر.

فەرمووی : جولەکە تورەیی خوایان بەسەرەوەیە نەسرانیەکانیش گومڕان ، وتی: من موسڵمانێکی حەنیفیم ، ڕووی پێغەمبەر ﷺ گەشایەوە فەرمانی‌دا لای پیاوێکی ئەنساری دابەزێت ، ئەنجا ڕۆژانە بەیانی و ئێوارە دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ.[1]

لە ڕیوایەتەکەی (ابن اسحاق)یشدا لە (عدی)ەوە هاتووە : پێغەمبەر ﷺ کاتێك لەبەردەم خۆیدا داینا لە ماڵەکەی خۆیدا پێی فەرموو: ئەی (عدی) کوڕی (حاتەم) ئایا تۆ ڕەکوسی نەبویت؟

عدی دەڵێت : وتم بەریّ وەڵلا ،

فەرمووی : ئایا تۆ چواریەکی غەنیمەت وەرنەدەگرت ؟

دەڵێت : وتم : بەڵێ .

فەرمووی : لەکاتێکدا کە ئەوە لەئایینەکەی تۆشدا حەڵاڵ نەبوو .

دەڵێت : وتم ئەریّ وەڵلا . ئەنجا دەڵێت : ئیتر زانیم کە ئەمە پێغەمبەرە چونکە هەر چیەك ئێمە نایزانین ئەو دەیزانێ .[2]

لە ڕیوایەتەکەی (احمد)یشدا هاتووە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی (عدی) موسڵمانبە سەلامەت دەبیت ،

وتم : من شوێنکەوتوی ئایینم ،

فەرمووی : من لە تۆ باشتر لە ئایینەکەت شارەزایم هەیە ،

وتم: تۆ لە من شارەزاتری لە ئایینەکەمدا ؟

وتم : بەڵێ ،

---

[1] / زاد المعاد ٢/٢٠٥.

[2] / ابن هاشم ٢/٥٨١.

فەرمووی: ئەوە لە ئایینەکەتدا حەلاڵ نیە ، کە ئەمەی وت چارم نەما ملم کەچ کرد بۆی .[1]

(بخار)یش لە (عدی)ەوە دەگەڕێتەوە دەڵێت : (عدی) وتی: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا دانیشتبووم کابرایەك هاتە خزمەتی سکاڵای هەژاری کرد ، یەکێکی‌تر هات سکاڵای ڕێگرو چەتەی کرد ،

فەرمووی : ئەی (عدی) ، ئایا تۆ هەرگیز (حیرە)ت دیوە؟

ئەگەر خوا تەمەنت درێژ بکات دەیبینی سوار کە لەوێوە دێت تەوافی کابە دەکات و جگە لەخوا لەهیچ شتێك ناترسێت ، خۆ ئەگەر تەمەنت درێژتربێت ، دەبینیت کە گەنجینەکانی کیسرا دەکەیتەوە ، ئەگەر تەمەنت درێژبێت مرۆڤ دەگاتە ئاستێك مشتی پڕ لە ئاڵتون یان زیوی خۆی دەکاتەوەو داوا دەکات کێ هەژارە؟

کەچی کەسێك نیە لێی وەربگرێت ... لەکۆتایی فەرموودەکەدا (عدی) دەڵێت : سوارم دەبینی لە حیرەوە دەهات و دەچوو تەوافی کابەی دەکرد جگە لەخوا لەهیچ کەسێك نەدەترسا ، هەروەها یەکێك بووم لەو کەسانەی گەنجینەکانی کیسرامان کردەوە ، خۆ ئەگەر تەمەنتان درێژبێت ئەوەش دەبینن کە پێغەمبەر ﷺ (أبو القاسم) فەرمووی : پڕ بە مشتی زێڕو زیو هەڵدەگرێت .[2]

---

[1] مسند الامام احمد.
[2] صحیح البخاری ، بروان (شكاه المصابیح) ٢/٥٢٤.

## غەزای تەبوك

## لە ( ڕەجەب )ی ساڵی ( ٩ ) ی کۆچیدا

غەزای ڕزگارکردنی مەککە بریتی بوو لەغەزای یەکلاکەرەوەی هەق و ناهەق:
ئیدی دوای ئەوە هیچ بوارێکی گومانکردنی عەرەب نەما بۆ پەیامەکەی موحەممەد ﷺ ، لەبەرئەوە ڕەوتی ڕووداوەکان بەتەواوی گۆڕان و خەڵك پۆل پۆل دەهاتن و موسڵمان دەبوون ، هەروەکو لەباسی (شاندەکان)دا ئەم ڕاستیە دەردەکەوێت . هەروەها لەو ژمارەیەشدا دیارە کە بەو زۆریە لە حەجی ماڵ ئاواییدا ئامادە دەبن ، بۆیە دوای ئەو ڕووداوە موسڵمانان ڕزگاریان بوو لەدەست کێشە ناوەکیەکان و یەکلابونەوە بۆ ناساندنی شەریعەتی خودا بەخەڵك و بلاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی.

## هـۆی غـەزاکـە

بەڵام هێزێك هەبوو بێ هیچ بەهانەیەك شەڕی دەفرۆشت بە موسڵمانەکان، ئەوەش هێزی ڕۆمەکان بوو، بریتی بوو لەگەورەترین هێزی ئەوکاتەی دونیا. پێشتریش زانیمان کە سەرەتای شەڕ فرۆشتنەکە لە کوشتنی فروستادەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەستی پێکرد، کە ناوی (حارث)ی کوڕی (عمیر)ی (ازدی) بوو بەدەستی (شرحبیل)ی کوڕی (عمرو)ی (غسانی)، لەو کاتەدا کە فروستادەکە نامەیەکی پێغەمبەری پێ بوو ﷺ بۆ گەورەی (بصری)و بەدوای ئەو ڕووداوەدا پێغەمبەر ﷺ سریەکەی (زید)ی کوڕی (حارثة)ی ناردو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی خوێناویان کرد لەگەڵ سوپای ڕۆمەکاندا لە (مؤتة) و نەیانتوانی ئەو تۆڵەیە لەو زاڵمە ملهوڕانە بکەنەوە. هەرچەندە گەورەترین کاریگەری بەجێهێشت لە دڵ ودەروونی عەرەبدا لە دورو نزیکەوە.

(قیصر)یش چاوپۆشی نەدەکرد لەو کاریگەریەی جەنگی (مؤتة) بەجێی هێشت بۆ بەرژەوەندی موسڵمانەکان و ئەو خەون و ئاواتەی خێڵە عەرەبەکان هەیان بوو بۆ جیابونەوە لەدەسەلاتی (قیصر)و ڕێکەوتن لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، چونکە ئەو مەترسیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەسنوورەکانی نزیکدەبوەوەو هەڕەشەی دەکرد لەو سنوورانەی شام ، کەهاوسنوری عەرەب بوون، بۆیە (قیصر) پێی وابوو دەبێ موسڵمانەکان سەرکوت بکرێن پێش ئەوەی گۆبەنگ‌و ئاشوبێك دروست بکەن لە ناوچە عەرەبیە هاوسنورەکانی ڕۆمدا.

بەرەچاوکردنی ئەو بەرژەوەندیانە (قیصر) یەك ساڵی پێنەچوو ، دوای شەڕی (مؤتة) دەستی کرد بەسازدانی سوپای ڕۆم و عەرەبە شوێنکەوتوەکانی لە (آل غسان)و چەندینی تریش و ، خۆی ئامادە دەکرد بۆ شەڕێکی خوێناوی یەکلاکەرەوە.

# هەواڵی خۆسازدانی ڕۆم و (غسان)یەکان

هەواڵی یەك لەدوای یەك دەهات لەبارەی خۆ ئامادەکردنی ڕۆمەکانەوە بۆ ئەنجامدانی شەڕێکی یەکلاکەرەوە دژ بەموسڵمانەکان. بەشێوەیەك دڵەڕاوکێیەکی هەمیشەیی بۆ دروست کردبوون ، هەردەنگێکی نائاساییان بەرگوێ دەکەوت وایاندەزانی ڕۆمەکانەو دایان بەسەریاندا ، ئەو ڕووداوەش بەسەر (عمر)ی کوڕی (خطاب)دا هات ، ئەم ڕاستیە نیشان دەدات. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بۆماوەی یەك مانگ لە ساڵی (٩)ی کۆچیدا جێگەی جیاکردەوە لەخێزانەکانیو نان و ئاوی لەگەڵدا نە دەخواردن ، هاوەڵان وایاندەزانی کە ژنەکانی تەڵاقداوەو لەڕاستی مەسەلەکە حاڵی نەدەبون ، بۆیە خەمو خەفەت هەموویانی داگرتبوو. (عمر)ی کوڕی (خطاب) ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: هاوەڵێکی ئەنصارییم هەبوو ئەگەر من دیار نەبوومایە ئەو هەواڵەکانی دەهێنا بۆ من ، ئەگەر ئەو دیارنەبوایە من هەواڵ و دەنگ و باسم بۆ دەبرد ـ ئەم دووانەماڵەکانیان لەبەشی سەرووی مەدینەوە بوو ـ بەنۆبە دەچوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ. (عمر) دەڵێت: باسی مەلیکێکی غەسانیمان بۆ دەکرا کە دەیەوێت لەناکاودا هێرش بهێنێتە سەر شاری مەدینە ، بەتەواوی ڕقمان لێی هەستابوو لێی پڕ بووبووین ، جارێکیان لەپڕێکدا هاوڕێ ئەنصاریەکەم دای لە دەرگا ، وتی: بیکەرەوە، وتم ئەوەچیە مەلیکی غەسانیەکان هاتە سەرمان؟ وتی: کورە خراپتر لەوە ڕووی داوە ، پێغەمبەر ﷺ وازی هێناوە لە ژنەکانی. (فەرموودەکە)[1].

لەدەربڕینێکی تردا هاتووە ، فەرموویەتی: جارێکیان باسی (آل غسان)مان دەکردو دەمانوت ئەم مەلیکە هەرچی پێپەتی هەیە دەیهێنێتە سەرمان، شەوێ سەرەی هاوڕێکەم بوو بێت بەڵام ئەو شەوە لەپڕێکدا زۆر بەتوندی دای لە دەرگاو وتی: (عمر) نوستوە؟ زەندەقم چوو، خێرا چوومە دەرەوە بەدەمیەوە وتی: شتێکی زۆر خراپ ڕووی داوە ، وتم: چی ڕووی داوە؟ غەسانیەکان هاتوون؟ وتی: نەخێر . شتێکی لەوە گەورەترو خراپتر ڕووی داوە، پێغەمبەر ﷺ وازی لەهاوسەرەکانی هێناوە (فەرموودەکە)[2].

---

[1] صحيح البخاري ٢/ ٧٣٠.

[2] / هەمان سەرچاوە ١ / ٣٣٤.

ئەم گێڕانەوەیە بەڵگەیە لەسەر ترسناکێتی ئەو قۆناغەی موسڵمانەکانی پێدا تێدەپەڕین ، سەبارەت بە ڕۆمەکان ، ئەوەی زیاتر ئەم حاڵەتەی قورستر دەکرد هەواڵی خۆئامادە کردنی ڕۆمەکان بوو بۆ هەڵکوتانە سەر مەدینە کە لەلایەن دووڕووەکانەوە بڵاو دەکرایەوە. لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەدا کە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو بوارەکاندا بەدەستی هێنابوو ، بڕواشیان بەوەی کە دەسەڵاتێك نیە لە دونیا دەرەقەتی بێت بەڵکو هەموو شتێك لەبەردەمیدا دەتوێتەوەو هەرەس دەهێنێت ، لەگەڵ ئەوانەشدا دووڕوان ئومێدیان وابوو کە ئەوەی لە دڵە نەخۆشەکانیاندایە دێتەدی و نیازە شەڕەنگێزیەکان جێبەجێ دەبێت دژ بە ئیسلامو موسڵمانان ، لەبەرئەوەی بەلێکدانەوەی خۆیان هاتنەدی ئەو خەونە نزیك بۆتەوە تۆڕێکی نەخشەو پیلانو سیخوڕیان دروست کرد بوو لە شێوەی مزگەوتێکدا ئەویش مزگەوتی (ضرار) بوو، بۆ ئەوە بنیاتیان نابوو کە جوداوازیو ڕقەبەرێتی بخەنە نێو ڕیزی موسڵمانەکانەوەو پێگەیەك بێ بۆ دوژمنانی خوداو پێغەمبەر ﷺ.

داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە نوێژی تێدا بکات ، مەبەستیان چەواشە کردنی موسڵمانان بوو کە هەست نەکەن بەو پیلانو دەسیسە خراپانەی لەو مزگەوتەدا دژیان دەکێشرێت و ئاگایان نەبێت کەچی لەو مزگەوتەدا دەکرێت و ببێتە پەیکەی کۆبونەوەی دووڕووەکان لە هەموو شوێنێکەوە ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نوێژکردنی لەو مزگەوتەدا دواخست بۆ دوای گەڕانەوەی لەم شەڕە لەبەر سەرقاڵی بەخۆئامادە کردنەوە بۆیە دووڕوان لەم پیلانە شکستیان هێناو ئابڕوویان چوو ، تائەوە بوو دوای گەڕانەوەشی لەجیاتی ئەوەی نوێژی تێدا بکات ڕووخاندی.

## هەواڵە تایبەتیەکان

## لەبارەی خۆ ئامادەکردنی ڕۆم و غەسانیەکانەوە

هەواڵەکان بەو شێوەیە دەگەیشتنە موسڵمانەکان ، لەو کەسانەشەوە کە زەیتیان دەهێنا لەشامەوە بۆ مەدینە هەواڵیان پێگەیشت کە (هەرقل) سوپایەکی گەورەی ئامادە کردووە چل هەزار کەس دەبنو سەرکردایەتی داوەتە دەست گەورەیەکی ڕۆمی ، لەگەڵ خۆشیدا خێڵەکانی (لخم)و (جزام) ئەو تیرەو خێڵانەی هێناوە کە بوون بە نەصرانی لەگەڵیدا ، سەرەتای سوپاکە گەیشتۆتە (بلقاء) بەم شێوەیە قەوارەی تەواوی مەترسیەکە لەبەرچاوی موسڵمانەکاندا بەرجەستە بوو.

## زیاتربوونی مەترسی هەڵوێستەکە

ئەوەی کە بارودۆخەکەی مەترسیدارتر کردبوو هاتنی وەرزی گەرما بوو ، خەڵك لەحاڵەتێکی ووشکە ساڵی بێئاویدا بوون ، میوەو بەروبومی باغو بێستان تازە پێدەگەیشت . خەڵکی حەزی لەژێر سێبەری درەخت و باخە بەردارەکانی دەکرد ، پێیان ناخۆش بوو بێنە دەرەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا ماوەکە زۆر دوور بوو ، ڕێگاکەش سەخت و پڕ لە کۆسپ بوو.

## پێغەمبەر ﷺ بڕیارێکی یەکلاکەرەوە دەدات

بەڵام پێغەمبەر ﷺ وردتر سەیری بارودۆخ و گۆڕانکاریەکانی ناوچەکەی دەکرد ، پێی وابوو کە ئەگەر بێت لەم قۆناغەدا سستی بکات لە غەزاکردنی ڕۆمەکان ، وازیان لێ بهێنێت ڕۆمەکان بەئارەزووی خۆیان بێن و بچن لەو ناوچانەدا ، کە لەژێر سایەی هەژموونی ئیسلامیدا بوون ، ئەوا هەڵدەکشێن بەرەو مەدینەو ئەوجا خراپترین کاریگەری دەبێت لەسەر بانگەوازی ئیسلامی و ناوبانگی سەربازی موسڵمانانی پێ بچوك دەبێتەوە . لەوانەشە جاهیلیەت ، کە لەغەزای (حنین)دا دواهەناسەیدا جارێکیتر ئاهی بێتەوە بەبەرداو لەم لاشەوە دووڕووەکان ئاوات دەخوازن بەلێدانی موسڵمانەکان و لەڕێگەی (أبو عامری فاسق)ەوە پەیوەندی دەکەن بە ڕۆمەکانەوە ، لەوانەیە لە پشتەوە خەنجەری ژاراوی بدەن لە پشتی موسڵمانەکان ، لەو کاتەدا کە ڕۆمەکان لە پێشەوە هێرشە گەورەکەی خۆیان دەهێنن ، بەو شێوەیە هەرچی هەوڵ و کۆششی خۆی و هاوەڵەکانی هەیە شکست دەهێنێت کە لەبڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامدا بەکاریان هێناوەو هەموو ئەو دەسکەوتانەشیان لەکیس دەچێت کە لەچەندین شەڕی خوێناوی هەڵوێستی سەربازی و بەدواداچونی سریەکان و سەربازەکاندا بەدەستیان هێناوەو هەمووی دەبێت بە پرزۆڵ .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی زۆرچاك دەزانی ، لەبەرئەوە لەگەڵ ئەو هەموو زەحمەتو ناڕەحتییەی تێیدا دەژیا، بڕیاریدا هەستێت بەغەزایەکی یەکلاکەرەوە کە موسڵمانەکان لەسەر سنووری ڕۆمەکان ئەنجامی بدەن و بواریان نەدەنێ ئەوان هەڵکشێن بەرەو ماڵ و حاڵی موسڵمانەکان.

## ڕاگەیاندنی خۆسازدان
## بۆ شەڕی ڕۆم

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا لەسەر غەزاکە لەناو هاوەڵاندا ڕای گەیاند کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕ ، ناردی بەشوێن خێڵە عەرەبەکان و خەڵکی مەککەدا ، بۆ هەر شەڕێك بچوایە کەمجار هەواڵی پێشتری دەدا کە بۆ کوێ دەچێت ، بەڵام ئەمجارە لەبەر ترسناکێتی بارودۆخەکەو سەختی هەلومەرجەکە ، ڕای گەیاند کە دەیەوێت بڕوا بۆ شەڕی ڕۆمەکان و بەڕوونی خەڵکی تێگەیاند ، بۆ ئەوەی بەتەواوی خۆیان ئامادەبکەن‌و هانی دان بۆ جیهاد کردن ، بەشێکیش لە سورەتی (براءة) دابەزی بۆ هاندانیان و خۆڕاگرتن لە جەنگدا. پێغەمبەری خوا ﷺ هانیدان کە خێرو صەدەقە بکەن و باشترین ماڵ وسامان خەرج بکەن بۆ ئامادە کردنی سوپاکە.

## موسڵمانان پێشبڕکێ دەکەن لە خۆئامادەکردندا

هەرکە موسڵمانەکان گوێیان لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی جیهادی لێدا ، دەستبەجێ چوونە خزمەتی بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ، بەخێراییەکی سەیر دەستیان کرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ ، لە هەموولایەکەوە خێڵ و تیرەکان دادەبارین بەسەر مەدینەدا ، هیچ موسڵمانێك ڕازی نەبوو لەم شەڕە دوابکەوێت جگە لە دڵ نەخۆشەکان‌و سێ هاوەڵ، تاڕادەیەك هەژارەکان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو داوایان لێدەکرد لەسەر ولاخێك هەڵیان بگرێت بۆ شەڕی ڕۆمەکان ، ئەویش دەیفەرموو ﴿ لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنْ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلاَّ يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ ﴾ التوبة/٩٢. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هیچ نیە ئێوەی پێ بگوازمەوە بۆ ئەو شەڕە ، ئەوانیش بەچاوی فرمێسکاویەوە دەگەڕانەوە لە خەفەتدا ، چونکە هیچیان نەبوو لە پێناوی خوادا بیبەخشن.

هەروەها لەبواری خەرجکردن و سەدەقەو خێریشدا ، موسڵمانەکان پێشبڕکێیان دەکرد ، (عثمان)ی کوڕی (عفان) کاروانێکی لە شامەوە گەڕابوەوە بریتی بوو لە دوو سەد وشتر بەهەموو بارەکانیانەوەو دووسەد ئۆقیە ، هەمووی کرد بەخێرو ئەنجا وشتری بەبارو بارگەیانەوە کرد بەخێر ، پاشان هەزاردیناری هێنا خستیە کۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵی دەدایەوەو

دەیفەرموو: (عثمان) لەمەودوا هەرچیەك بكات زیانی پێ ناگات[1] پاشان سەدەقەو خێری تری كردوو بەردەوام بوو تائەندازەی سەدەقەكەی گەیشتە نۆسەد وشترو سەد ئەسپ ، جگە لە پارە . (عبد الرحمن)ی كوڕی (عوف)یش دووسەد ئۆقیە زیوی هێنا ، (ابوبكر)یش هەموو ماڵ و سامانەكەی هێناو جگە لە مافی خوداو پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی نەهێشتەوە بۆ ماڵی خۆی. سامانەكەی چوارهەزار درهەم بوو. (ابوبكر) یەكەم كەس بوو كە سەدەقەكەی خۆی هێنا ، (عمر)یش نیوەی ماڵەكەی خۆی هێنا ، (عباس)یش ماڵ و سامانێكی زۆری هێنا ، (طلحة) و (سعد)ی كوڕی (عبادة) و (محمد)ی كوڕی (مسلمة) ، هەموویان ماڵ و سامانیان هێنا ، (عاصم)ی كوڕی (عمر)یش نەوەد وەسەق خورمای هێنا ، خەڵك كەوتنە بەخشین و خێركردن لەزۆر زۆرو لەكەمیش كەم ، كەسی واهەبوو جگە لە مشتێك یان دوومشت گەنم ، هیچی نەبوو ، ئەوەی دەبەخشی ، ژنانیش هەرچیەكیان هەبوو لە بازن و ملوانكەو گوارەو خرخاڵ و پارچەی ئاڵتون و زیو بەپێی توانا بەخشیان .

كەس دەستی نەگرتەوە ، جگە لەدووڕوان كەس لەو ڕۆژەدا چروك نەبوو: ﴿ الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ﴾ التوبة/٧٩. واتە: ئەو دووڕوانە لاقرتێ دەكەن بەئیمانداران ، لەو سەدەقەو خێرانەدا كە دەیبەخشن و گاڵتە دەكەن بەوانەی ، كە جگە لەتوانای خۆیان چیدیان نیە بیبەخشن لە پێناوی خوادا.

## سوپای ئیسلام بەرەو تەبوك دەڕوات

بەو شێوەیە سوپاكە ئامادەو سازكرا، پێغەمبەری خوا ﷺ (محمد)ی كوڕی (مسلمە)ی بەسەر مەدینەوە بەجێهێشت ، دەڵێن (سباع)ی كوڕی (عرفطە) بووە ، (علی)یشی بەلای ماڵ و منداڵەكەی خۆیەوە بەجێهێشتو فەرمانی پێدا لەناویاندا بێت ، دووڕوان كردیانە قسەوباس ، بۆیە (علی) كەوتەڕێ ، تابگاتەوە بەپێغەمبەر ﷺ ئەویش گێڕایەوە بۆ مەدینەو پێی فەرموو: ئەی (علی) ، ئایا تۆ ڕازی نابیت بەوەی لە پلەی (هارون)دا بی بۆ (موسی)؟ بەڵام بزانە كە دوای من پێغەمبەری تر نابێت.

---

[1] / جامع الترمزی ، مكاتب عثمان بن عفان ٢/٢١١.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بەرەو باکووری تەبوك کەوتە ڕێ ، سوپاکە زۆر گەورە بوو سی هەزار شەڕکەر ، هەرگیز پێشتر موسڵمانان بە ژمارەی وەها نەچوونەتە دەرەوە ، لەگەڵ ئەو هەموو سەدەقەو بەخشینەشدا نەیانتوانی بە تێرو تەواوی سوپاکە ساز بکەن ، لەناو سوپاکەدا کێشەی کەمی لەتوێش‌و ئازوقەو ئەسپ‌و ولاّخ سواریدا هەبوو ، هەژدە کەس بەنۆرە سواری یەك وشتر دەبون ، لەڕێگە گەلاّی دارودرەختیان دەخواردو لێوەکانیان وشك هەلاّتبوو ، ناچاربوون بکەونە سەربڕینی وشترەکانیان لەگەڵ کەمییاندا بۆ ئەوەی ئاوی ناو سکیان بخۆنەوە ، لەبەرئەوە ئەو سوپایە ناونرا بە سوپای تەنگانە (جیش العسرة).

سوپای ئیسلام لە ڕێگەدا بەلای ئاسەواری (حجر)دا گوزەران ، کە شوێنەواری کەلاوەی خەڵکی (ثمود)ە ﴿ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴾ واتە (وادی القری) ، خەڵکی لە بیرەکەی ئاویان هەڵگۆزی ، کە ڕۆشتن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەو ئاوە مەخۆنەوەو دەست نوێژیشی لێ هەڵمەگرن ، ئەوەشی تێکەلاّوی هەویرتان کردوە بیدەن بەوشترەکانتان و هیچی لێ مەخۆن ، بۆیە فەرمانی پێدان لەو بیرە بخۆنەوە ، کە وشترەکەی (صالح) لێی دەخواردەوە.

لە (صحیحین)یشدا هاتوە ، لە (ابن عمر)ەوە فەرموویەتی: کە پێغەمبەر ﷺ بەلای (حجر)دا تێپەڕی ، فەرمووی: هەرگیز مەچنە ناو ماڵ و حاڵی کەسانێك زوڵمیان لەخۆیان کردوە ، نەبادا تووشی سزای ئەوان بن ، مەگەر بەگریانەوە بڕۆن ، پاشان سەری خۆی داپۆشی و بەپەلە ڕۆیی تا لە شیوەکە دەرباز بوون.[1]

لە ڕیگادا تینوێتی زۆری بۆ خەڵکەکە هێنا ، سکالاّیان بردە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەستی کرد بەپاڕانەوە ، پاش کەمێك خوای مەزن هەورێکی نارد ، باران باری و خەڵکەکە فێنك بونەوەو تێراو بوون‌و هەموو شتەکانیان پڕکرد لە ئاو.

کە لە تەبوك نزیکبوەوە ، فەرمووی: خوا یاربێت سبەینێ دەچینە سەر ئاوی تەبوك ، ئێوە ناچنە سەری تا چێشتەنگاو دەبێت و هەرکەسێك گەیشتە سەری بادەست نەخاتە ناوی تاخۆم دێم.

(معاذ) دەڵێت : کەچووین پێش ئێمە دووپیاو چوونەسەر ئاوەکە ڕێچکەیەکی زۆر بچوك ئاوی لێ دەهات . پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کردن ئایا دەستان داوە لەو ئاوە؟

وتیان: بەڵێ .

---

[1] صحیح البخاری. باب نزول النبی (ﷺ) بالحجر ٢/٦٣٧.

پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی خواویستی سەرزەنشتی کردن ، پاشان مشت بە مشت ئاوەکەی کۆکردەوە تاگۆماوێکی بچوکی لەبەردەم کانیاوەکەدا دروست کرد ، ئەنجا دەمو چاوو دەستی شت ، پاشان ئاوەکەی گێڕایەوە کانیەکە لەپڕێکدا تەقیو ئاوێکی زۆری لێ هاتە دەرەوە خەڵکی ئاویان دەرهێنا ،

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە (معاذ) ، ئەگەر تەمەنت درێژبێت خەریکە بڵێم دەبینیت باخو بێستانێکی زۆر لێرەدا سەوز دەبێتو ئەم ناوە پڕ دەبێت لە سەوزایی.[1]

لەڕێگەدا یان کە گەیشتە (تبوك) ـ بەپێی جیاوازی ڕیوایەتەکان ـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەمشەو ڕەشەبایەکی سەخت هەڵدەکات ، با کەس لەئێوە هەڵنەستێت ، هەرکەسێکتان وشتری پێیە بەتوندی بیبەستێتەوە . هەروا بوو شەو ڕەشەبایەکی زۆر توند هەڵی کرد پیاوێك هەستایەوە ڕەشەباکە بردی و لە شاخی (طیء)دا فڕێیدابوو.[2]

نەریتی پێغەمبەر ﷺ لەو سەفەرەدا وابوو کە نوێژی نیوەڕۆو عەسر پێکەوە ، هەروەها نوێژی مەغریبو عیشای پێکەوە کورتو کۆدەکردەوە ، بەپێشو پاش خستن دەیکردن.

## سوپای ئیسلام لەناو تەبوکدا

سوپای ئیسلام لە تەبوك دابەزی ، لەوێدا سەربازگەی دامەزراندو خۆی ئامادە کرد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن ، پێغەمبەر ﷺ وتارێکی کاریگەری بۆ خوێندنەوە ، کورتو کرمانج بوو ، هانیدان بۆ خێرو بێری دونیاو قیامەت ، مژدەو ئاگاداری پێدان ، ورەی بەرز کردنەوە ، هەرچی کەلێن و کەم و کووڕیان هەبوو ، پڕی کردەوە لە ڕووی ئازووقەو توێشووەوە. لەولاشەوە کە ڕۆمەکان هەواڵی هاتنی سوپاکەی پێغەمبەریان بیستن ﷺ زەندەقیان چوو زاتیان نەکرد بێنە پێشەوە بۆ شەڕ کشانەوە دواوە بەناوچەکانی سنووری خۆیاندا بڵاوەیان لێ کرد ، ئەمەش بۆ بەرز کردنەوەی ناوبانگی سەربازی موسڵمانەکان لەناو دورگەی عەرەب و دەورو بەریدا ڕۆڵی گەورەی هەبوو ، بەو شێوەیە موسڵمانان چەندین دەسکەوتی سیاسی گەورەیان دەستکەوت ، کە ئەگەر شەڕ ببوایە لەوانە بوو دەستیان نەکەوتایە.

---

[1] مسلم / ریوایەتی کردوە لە ( معاذ)ی کوڕی (جبل)ەوە ٢/٢٤٦.

[2] هەرهەمان سەرچاوە.

(يحنة)ى كوڕى (روبة) هاوەڵى (ايلة) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سوڵحى لەگەڵدا كردو جزيەى‌دا بەپێغەمبەر ﷺ ، دواى ئەو خەڵكى (جرباء) و (أزرح)يش هاتن‌و جزيەيان دا . پێغەمبەر ﷺ نووسراوێكى پێدان لايان مايەوە ، هەروەها نوسراوێكى نووسى بۆ هاوەڵەكەى (ايلة) دەڵێت:

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴾

ئەمە نامەى دڵنياكەرەوەيە لەخوداى مەزن و محەممەدى پێغەمبەريەوە بۆ (يحنة)ى كوڕى (روبة)و كەس و كارى (أيلة) ، كاروان و هاتوچۆو كەشتيەكانيان لە وشكانى و ئاودا لە ژێر پاراستنى خوداو پێغەمبەرەكەيدايە ، ئەم پاراستنە هەموو ئەو كەسانەى شام و كەنارى دەرياش دەگرێتەوە كە لەگەڵيدان ، هەركەسێكيان لابدەن ئەوا ماڵەكەى فرياى ناكەوێت ، ماڵەكەيان حەلاڵ دەبێت بۆ خەڵك ، هەروەها نابێت ڕێگەيان لێبگيرێت ئەگەر بيانەوێت بچنە سەر هەرئاوێك يان هيچ ڕێگەيەكيان لێ ناگيرێت بيانباتە سەر وشكاييەك يان دەرياييەك.

پێغەمبەر ﷺ (خالد)ى كوڕى (وليد)ى لەگەڵ چوارسەدو بيست كەسدا نارد بۆ لاى (اكيدر) لە (دومة الجندل) و پێى فەرموو: لەكاتێكدا پێى دەگەيت ، گاكێوى ڕاو دەكات . (خالد) چوەلاى كە بەدووريى ديتنى چاو لەقەلاْكە نزيكبوەوە ، مانگايەك هاتە دەرەوە ، بەشاخەكانى قۆچى دەدا لە دەرگاى قەلاْكە ، (أكيد) بۆى هاتە دەرەوە بۆ ڕاوكردنى ـ شەوێكى مانگە شەو بوو ـ لە پەنايەكدا (خالد) گرتى ، هێنايە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سوڵحى لەگەڵدا كرد لەسەر دووهەزار وشترو هەشت سەد سەر مەڕو چوارسەد قەڵغان و چوارسەد ڕم ، دانيشى نا بەپێدانى (جزيە) ، سەبارەت بە كێشەى (دوحة) و (تبوك) و (ايلة) و (يماء) يش لەگەڵ (يحنة) سوڵحى پێكردن.

ئيتر خێڵ و تيرەكان بەتەواوى دڵنيابوون ، كەپشت بەستن بەدەسەلاْتە كۆنەكان كاتى بەسەرچوو باوى نەما ، بۆيە بايان دايەوە بەلاى موسڵمانەكاندا ، بەو شێوەيە سنوورەكانى دەوڵەتى ئيسلامى زياديان كردو پاڵيان‌دا بە سنوورەكانى ڕۆمەكانەوە تا ڕادەيەكى زۆر كۆتاى هات بە چالاكى سيخوڕەكانى ڕۆم.

## گەڕانەوە بۆ مەدینە

سوپای ئیسلام بەسەری بەرزو بڵندەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە ، بێئەوەی تووشی شەڕ ببێت ، لە ڕێگەی گەڕانەوەدا لە ناوچەی (عقبة) دوانزە کەسی دووڕوو ویستیان زەفەرێك بەپێغەمبەر ﷺ ببەن ، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ بەسواری وشترەکەیەوە بوو (عمار) جڵەوی وشترەکەی بۆ گرتبوو ، (حذیفة)ی کوڕی (یمان)یش دابویە بەرخۆی ، گەیشتنە (عقبة) خەڵکەکەش گەیشتنە ناو شیوەکە ، دووڕوان ئەمەیان بەهەلزانی، لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺو دوو هاوەڵەکەی بەڕێگەدا دەڕۆیشتن گوێیان لەدەنگە دەنگی خەڵك بوو لە پشتیانەوە دەهاتن و دەم وچاویان هەڵبەستبوو ، (حذیفة) بەگۆچانەکەی دەستی کێشای بە دەم و چاوی ولاخەکانیداو ترساندنی و بەرەولای خەڵکەکە ڕاوی نان وەگەرنا پێغەمبەریان ﷺ دەشێلا ، پێغەمبەر ﷺ ناوی هەردوانزە کەسەکەی‌دا بە (حذیفة)و ئاگاداریشی کرد کە نیازیان چی بووە ، بۆیە بە (حذیفة) دەوترا نهێنی پارزگری نهێنیەکانی پێغەمبەر ﷺ. لەو بارەیەوە خوای مەزن فەرمووی ﴿وَهَمّوا بِما لَم يَنالوا﴾ واتە: دووڕوان بەنیازی کارێك بوون بۆیان نەچووە سەر.

کە لەدورەوە سیمای شاری مەدینە لە پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت فەرمووی: ئای ئەوە (طابة)یەو ئەوەش ئوحودە ، ئەو شاخەیە کە ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت. کەخەڵك بیستیان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ژن و مناڵو کوڕوکاڵ لەشار هاتنە دەرەوەو بەجارێك پێشوازیان دەکردو شیعریان دەخوێندەوە دەیانوت:[1]

طلع البدر علينـــا من ثنيـــات الوداع

وجب الشكـــر علينـــا مادعى لله داع

پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەجەبدا دەرچو بۆ تەبوك‌و لەمانگی ڕەمەزاندا گەڕایەوە. ئەم غەزایە پەنجا ڕۆژی پێچوو بیست ڕۆژیان لە تەبوك مایەوە ، باقی ڕۆژەکانیش لە ڕۆشتن و هاتنەوەدا بەسەری برد ، ئەم غەزایە دوایین غەزای پێغەمبەر بوو ﷺ.

---

[1] / ئەمە ڕای (ابن قیم)ەو پێشتریش باسمان لێوە کرد.

## دواکەوتوەکان

ئەم غەزایە بەهۆی هەلومەرجی تایبەتی خۆیەوە تاقی کردنەوەیەکی سەخت بوو بۆ موسڵمانان ، ئیماندارانی لە بێ باوەڕان جیا دەکردەوە ، هەروەکو خوای مەزن هەمیشە مرۆڤی واڕاهێناوە ، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ ﴾ آل عمران /١٧٩. واتە: هەرگیز نەبووەو ناشبێت ، خودا وازتان لێ بهێنێت بێ جیاکردنەوەی خراپ لە باش. ئەوەی بۆ ئەم شەڕە دەرچوو تەنها ئیمانداره ڕاستگۆکان بوون ، تاڕادەیەك دەرنەچوون بوو بەنیشانەی دووڕوویی ، هەرکەسێك لەدواکەوتوەکان بوایە باسیان دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرەکەدا ئەویش دەیفەرموو: وازی لێ بهێنن ئەگەر خێری تێدابێت خوا پێیانی دەگەیەنێت ، ئەگەر بێخێریش بێت ئەوە خوا ڕزگاری کردون لەدەستی. جگە لەبەهانە بەدەستەکان کەس دوانەکەوت یان ئەوانەی دووڕوو بوون ، ئەوانە بەدرۆوە داوای مۆڵەتیان کرد کە دەرفەتیان بداتێ دانیشن و نەڕۆن ، هەندێکیشیان باکیان نەبوو ، مۆڵەتیشیان وەرنەگرت و دانیشتن لە مەدینەو نەچوون بۆ ئەو غەزایە ، سێکەسی ئیمانداریش کە مرۆڤی ڕاستگۆبوون ، بەشداریان نەکردو بێ هیچ هۆیەك دواکەوتن ، ئەم سیانەش ئەو کەسانە بوون کە خودا تاقی کردنەوەو پاشان تەوبەی لێ وەرگرتن و لێیان خۆش بوو.

کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە تەشریفی بردە مزگەوت ، دوو ڕکات نوێژی کرد ، ئەنجا دانیشت و خەڵك دەورەیان دا ، دووڕووەکان کە ژمارەیان هەشتاو ئەوەندە کەس بوو[1] هاتن و بەچەندین جۆر بەهانەیان دەهێنایەوەو سوێندی درۆیان دەخواردو پاکانەیان دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش بەڕو قسەکانی لێ وەردەگرتن و بەیعەتی دەدانێ و داوای لێ بوردنی بۆ دەکردن و نهێنی دڵەکانیشی دەدایە دەست خودا.

بەڵام لە سێکەسە ئیمانداره ڕاستگۆکە کە بریتی بوون لە (کعب)ی کوڕی (مالك)و (مرارە)ی کوڕی (ربیع) و (هلال)ی کوڕی (أمیە) بڕیاریاندا ڕاستگۆبن و

---

[1] (واقدی) دەڵێت: ئەوانە کۆمەڵێك دووڕوی ئەنساری بوون ، بەهانە بەدەستەکانی ئەعرابی خێڵی (بنی غفار)و ئەوانی تریش ژمارەیان (٨٢) کەس بوو، (عبداللە)ی کوڕی (ابی) و شوێنکەوتوەکانی لەوانەدا نین ، کە لێرە دا باسیان دەکرێت (بڕوانە فتح الباری) ١١٩/٨.

هیچ بەهانەیەکی درۆ هەڵنەبەستن ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدایە یارانی کەس قسەیان لەگەڵدا نەکات ، قسە دابڕینێکی زۆر توندیان لەگەڵدا کراو خەڵکی مامەڵەیان نەدەکرد لەگەڵیاندا . بەرچاویان تەسك بوبوەوەو لەزەویدا جێگەیان بەخۆیان نەدەگرت و بەتەواوی هەناسەیان سوار بوو بوو ، بێ تاقەتیەکەیان زیاتری کرد کاتێك کە چل ڕۆژ بەسەر قسە دابڕینەکەدا تێپەڕی فەرمانیان پێ درا کە لەگەڵ ژنەکانیاندا جێگە جیابکەنەوە ، تا دابڕانەکە پەنجا ڕۆژی تەواوی خایاند پاشان خودای مەزن لێیان خۆش بوو بەئایەتی ﴿وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لاَ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ التوبة/١١٨. واتە: خودا لەو سێ کەسەش خۆش بوو کە دواکەوتن تاوایان لێ هات زەویان لەبەرچاودا بەرتەسك بوەوەو تەواو تەنگە نەفەس بوون ، زانیان کە هیچ پەنایەك نیە جگە لە پەنای خوا ، پاشان خودا تەوبەی لێ وەرگرتن ، بەڕاستی خودا تەوبە لە بەندەکانی وەردەگرێت و بەبەزەییە.

موسڵمانان دڵیان خۆشبوو بەو لێخۆشبونە ، سیانەکەش ئەوەندە دڵخۆش بوون ، پێیان نەدەکەوتە زەوی ، مژدەیان دەداو ڕوویان خۆشیی لێ دەباری و دەستیان کرد بەخێرکردن و دیاری بەخشینەوە ، ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی ژیانیان بوو.

ئەوانەش کە لەبەر بەهانەیەك نەهاتبوون خوای مەزن لەبارەیانەوە فەرموی ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ هەردوو ئایەتی سورەتی التوبة/٩١، ٩٢. واتە: لاوازەکان و نەخۆشەکان و ئەوانەی هیچیان نیە لەپێناوی خوادا خەرجی بکەن گوناهیان لەسەرنیە، بەمەرجێك ئەگەر لەبەر خوداو پێغەمبەرەکەی ئامۆژگار بن. کە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە نزیك بوەوە لە بارەیانەوە فەرمووی: لەناو شاری مەدینەدا کۆمەڵێك پیاوهەن چەند هەنگاو ڕۆشتبن ، چەند شیوو دۆڵتان کردبێت بەدڵ لەگەڵتان بوون، بەلام ئەوان بەهانەیان هەبوو نەیانتوانی بێن . وتیان : ئەوان لە مەدینەشدان؟ فەرمووی: بەڵێ لەو کاتەدا کە لە مەدینە بوون .

## ئاسەواری غەزاکە

ئەم غەزایە گەورەترین کاریگەریی هەبوو لەسەر بەر والآکردن و بەهێز کردنی هەژمونی موسڵمانەکان لە دورگەی عەرەبیدا ، ئیدی بۆ خەڵك دەرکەوت کە لەدورگەی عەرەبدا جگە لە هێزی ئیسلام هیچ هێزێکی‌تر نیەو ئەو کەمە ئومێدەش کە لەناخی نەفامو دووڕووەکاندا مابوو چاوەڕوانیان دەکرد بێتەدی ئەویش کوژایەوەو بۆ هەتا هەتایی نائومێد بوون ، چونکە هەموو خەونێکی خۆیان بەهاتنی ڕۆمەکانەوە هەڵواسی بوو ، بەڵام دوای ئەم غەزایە سەریان شۆڕ کرد ، ملکەچی ئەمری واقیع بوون و هیچ چارەیەکیان نەما.

بۆیە ئیتر ئەوەش نەما کە موسڵمانەکان بە نەرم ونیانی مامەڵە لەگەڵ دوو ڕووەکاندا بکەن ، خوای مەزن فەرمانی‌دا دەستیان لێ توند بکرێتەوە ، تا ئەوەی سەدەقەیان لێ وەرنەدەگیراو نوێژیان لەسەر نەدەکراو لەسەر گۆڕیان کەس نەدەوەستاو نزایان بۆ نەدەکرا ، فەرمانیش درا بەڕووخاندنی شوێنی پیلان و نەخشە گلاوەکانیان کە مزگەوتی کوێرەوەری بوو ، دروستیان کردبوو بۆ سەر لێ تێکدانی موسڵمانان ، چەند ئایەتێك لەبارەیانەوە دابەزی و بەتەواوی ئابڕووی تکاندن و لەدوای ئەوەوە هیچ شتێکیان بەنهێنی نەمایەوە ، خەریکبوو کە ئایەتەکان ناویشیان بهێنێت.

دەکرێت لەوەشدا کاریگەری ئەم غەزایە تێبگەین ، کە عەرەب هەرچەندە پۆل پۆل دەهاتن و لە هەموولایەکەوە موسڵمان دەبوون بەڵام دوای ئەم غەزایە ، بەدوای یەکدا هاتنی وەفدی خێڵە عەرەبەکان گەیشتە چڵە پۆپە.[1]

## دابەزینی قورئان لەبارەی ناوەڕۆکی غەزاکەوە

ژمارەیەکی زۆر ئایەتی سورەتی (براءة) لەبارەی ناوەڕۆکی غەزاکەوە هاتە خوارەوە ، هەندێکیان پێش دەرچونەکە هاتنە خوارەوە ، هەندێکی تریشیان پاش دەرچوونەکە ، لەو کاتەدا کە لە سەفەردا بوو هەندێکی تریشیان دوای گەڕانەوە بۆ مەدینە ، سورەتەکە باس لە بارودۆخی غەزاکە دەکات و ئابڕووی دووڕووەکان

---

[1] / درێژی ئەم غەزایەمان وەرگرتوە لە (ابن هاشم)٢/٥١٥ ـ ٥٣٧، (زادالمعاد)٣/٢ (صحيح البخاری)٢/ ٦٣٢. ٦٣٤. ٦٣٦. ٦٣٦ ٦٣٧ ١/٢٥٢`٤١٤ هیتریش، هەروەها (صحيح المسلم) لەگەڵ شەرحی نەوەوی ٢/٢٤٦ ، (فتح الباری) ٨/١١٠ تا ١٢٦، هەروەها( مختصر سيره) نوسینی شیخ عبدوڵڵای نەجدی لە لاپەڕە ٣٩١ تا ٤٠٧.

دەبات و ڕێزو قەدری موجاهیدان و دڵسۆزان باس دەكات و تیشك دەخاتە سەر وەرگرتنی تەوبە لە ئیمانداره ڕاستگۆكان ، ئەوانەش كە دەرچون و ئەوانەش كە دواكەوتن ، لەگەڵ چەندین باسی تر.

## هەندێ لە ڕووداوە گرنگەكانی ئەو ساڵە

لەو ساڵەدا چەندین ڕووداوی مێژویی ڕوویاندا كە گرنگی خۆیان هەیە:

١. پاش هاتنەوەی پێغەمبەر ﷺ لە تەبوك (لعان) لەنێوان (عویمر)ی (عجلانی) و ژنەكەیدا ڕوویدا.

٢. ژنە غامدیەكە ڕەجم كرا پاش ئەوەی هاتوودانی نا بەزیناكەیدا ، كاتێك ڕەجم كرا كە كوڕەكەی لە شیر بڕی بوەوە.

٣. (اصحمە)ی (نجاشی) مەلیكی حەبەشە وەفاتی كرد ، پێغەمبەر ﷺ نوێژی غائبی لەسەر كرد.

٤. (أم كلثوم)ی كچی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد ، زۆر خەفەتی پێ خواردو فەرمووی بە (عثمان): ئەگەر سێ كچیشم هەبوایە بەدوای یەكدا مارەم دەكردن لێت.

٥. سەرۆكی دووڕوان (عبدالله)ی كوری (ابی) كوڕی (سلول) دوابەدوای هاتنەوەی پێغەمبەر ﷺ لە تەبوك مرد ، پێغەمبەر ﷺ داوای لێ خۆشبونی بۆ كردو نوێژی لەسەركرد پاش ئەوەی كە (عمر) زۆر هەوڵیدا كەنوێژی لەسەر نەكات ، دوایش قورئان هاتە خوارەوە پشتیوانی ڕایەكەی (عمر)ی كرد.

## حەج كردنی ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێ بێت)

لەمانگی (ذي القعدة) یان (ذي الحجة)ی هەمان ساڵی (٩)ی كۆچیدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبوبەكری صدیق)ی نارد ﵁ وەك میرێك بۆ حەج . بۆ ئەوەی (مناسك) بۆ موسوڵمانان دابنێت .

پاشان سەرەتاكانی سورەتی (براءة) دابەزی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەكان ، پێغەمبەر ﷺ (علی) كوڕی (ابو طالب)ی نارد ئەوەی بۆ بكات ، ئەمەش بۆ هاوڕایی كردن بوو لەگەڵ نەریتێكی كۆنی عەرەبدا سەبارەت بە ماڵو خوێن ڕژان ، (علی) لە (عرج) یان (جینان) گەیشت بە (ئەبوبەكر).

(ئەبوبەکر) وتی: یان میر بە یان گوێڕایەڵ ،

علی وتی: نەخێر من گوێڕایەڵ دەبم پاشان دەرچوون .

(ئەبوبەکر) حەجی کرد بۆ موسوڵمانان ، تا ڕۆژی قوربانی هات ، ئەنجا (علی) کوڕی (ابوطالب) لە (حجرة) وەستا ، بانگی کرد لەناو خەڵکیدا بەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدابوو ، وادەو پەیمانی پەیماندەرانی دایەوە ، ماوەی چوارمانگ مۆڵەتی پێدان ، چوار مانگیش مۆڵەتی‌دا بەوانەی بەڵێن‌و پەیمانیان لەگەردندا نەبوو ، مۆڵەتی ئەوانەش کە هیچ زیانێکیان لە موسوڵمانەکان نەدا بوو کەسیشیان هان نەدابوو دژ بە موسوڵمانەکان ، وەکو خۆیان هێشتەوە.

(ئەبوبەکر)یش ﷺ چەند پیاوێکی نارد بەناو خەڵکیدا جاڕ بدەن: کە ئیتر لە ساڵی داهاتوودا هیچ موشریك و کەسێك بەڕووتی تەواف ناکەن بەدەوری کابەدا.

ئەم بانگەوازە کۆتایی و مەرگی بتپەرستی بوو لەناو دورگەی عەرەبیداو ، نابێت ئیدی لەساڵی داهاتوەوە بوونیان هەبێت [1].

[1] / (صحیح البخاری) ١/٢٢٠، ٤٥١، ٢/٦٢٦، ٦٧١، (زاد المعاد) ٣/٢٥، ٢٦، (ابن هشام) ٢/٥٤٣، ٥٤٤، ٥٤٥، ٥٤٦.

## سەربوردێك بەسەر غەزاكاندا

کاتێك سەیرێکی غەزاو ناردەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، نە ئێمەو نە هیچ کەسێکی دیکە کە سەیری بارودۆخی شەڕو ئاسەوارەکانی دەکات ناتوانێت نەڵێت: کە پێغەمبەر ﷺ مەزنترین سەرکردەی سەربازی بوەو ، لە هەموویان ژیر ترو قوڵترو وورياتر بووە ، بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ لەم ڕووەوە بلیمەتێکی جەنگ بووە ، هەروەکو لە نبوەت و پەیامداریدا سەرکردەی پێغەمبەرانە (علیهم السلام). هەمیشە لەو جێگەیەوە جەنگی کردووە کە عەقڵیەت و لێکدانەوەو بەرنامەی سەربازی مەحکەم بیخوازێت ، لەبەرئەوە لە هیچ جەنگێکدا بەهۆی نەخشەی مەیدانی جەنگەوە نەیدۆڕاندووە ، یان بەهۆی نەخشەیەکی ستراتیژییەوە شکستی نەهێناوە ، بەڵکو لەهەموو ئەوانەدا جۆرێکی تر لە سەرکردەیی پیشانی دونیادا ، کە نەدونیاو نەسەرکردە سەربازیەکان نەیاندیبێت . ئەوەش کە لە (حنین)دا ڕوویدا لاوازی هەندێك کەس بوو، ئەوەی (أحد)یش بەهۆی شکاندنی فەرمانەکانیەوە بوو ، کە تیرئەندازەکان شوێنی خۆیان بەجێ هێشت و لە ڕووی سەربازیەوە کەلێنیان کردە سوپاکەوە.

لەهەردوو جەنگەکەشدا (أحد) و (حنین) ، لەکاتی شکستەکەدا بلیمەتی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت ، ڕووی لە دوژمن وەرنەگێڕا ، بەحیکمەت و دانایی خۆی توانی بێئومێدیان بکات و ڕەوتی شەڕەکە بگۆڕێت بۆ سەرکەوتن ، هەروەکو لە (حنین)دا ڕوویدا ، سەرباری ئەو شکستەی کە لەسەرەتادا هات بەسەریاندا ، کە مەحاڵە هیچ سەرکردەیەکی سەربازیی لەبەردەم شکستی وەهادا نەڕوخێت و هەڵنەیەت.

ئەمە پێغەمبەرە ﷺ لە ڕووی سەربازیەوە لە ڕووەکانی تریشەوە پێغەمبەر ﷺ بەو غەزایانە هێمنی و ئاشتی چەسپاند لەناوچەکەداو ، ئاگری ئاشووبی کوژاندەوە ، لووتی دوژمنانی شکاند ، ناچاری سوڵحی کردن و ڕێگەی خۆشکرد بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازیی ئیسلامیی ، هەروەها توانی هاوەڵە دڵسۆزو بە وەفاکانی خۆی بناسێت و جیایان بکاتەوە لەوانەی بەڕوو موسوڵمانن و بەدڵیش دووڕووو بێوەفان و هەرخەریکی پەیمانشکێنیی و خیانەتکارین.

لەدوای خۆیشی کۆمەڵێك سەرکردەی چاك و شارەزای پێگەیاند کە لە دواییدا لەناوچەی عێراق و فارس ڕۆمەکانیان لەو خاك و ئاوە دەرپەڕاندو بە نەخشەو پلانی سەربازی پتەو هەڵیانکەندن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەم غەزایانەوە توانی شوێن و جێگەو زەوی و کاروپیشە بۆ موسوڵمانەکان بدۆزێتەوە ، تا ڕزگاریان بێت لەگیروگرفتێکی زۆر کە ماڵ و حاڵ و شوێنیان نەبوو بۆ نیشتەجێ بوون ، چەك و جبەخانەو تفاقێکی زۆری بۆ دابین کردن ، ئەمانەی هەموو دەستکەوت بێ‌ئەوەی بەئەندازەی تۆزێك زوڵم و ستەم بکات لە بەندەکانی خوا.

بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ ئامانجی لە هەموو شەڕەکاندا گۆڕی ، جەنگ لە جاهیلیەتدا بریتی بوو لە تالانی و کوشت و بڕو هەڵکوتانە سەر زوڵم و دەستدرێژیی و ستەمکردن و تۆڵەسەندنەوەو خۆسەپاندن و تاساندنی لاوازو ماڵ وێران کردن و بینا ڕووخاندن و حورمەت شکێنی و وێرانکردنی کێڵگەو مەزراو چەوساندنەوەی ژن و منداڵ و پەککەوتەکان ، لە ئیسلامدا ئەو جەنگانە بوونە جیهاد کردن لەپێناو چەندین ئامانجی شکۆدارو ، مەبەستی بەرزو ڕێزداری وەهادا کە مرۆڤایەتی لە هەموو کات و شوێنێکدا شانازی پێوە بکات. جەنگ بوو بەو جیهادەی کە مەبەستی رزگارکردنی مرۆڤ بوو لە ستەم و دەستدرێژیی، بۆ سیستمی دادپەروەری و ویژدان ، لە سیستمێکەوە کە بەهێزبێت هێزی ژێرپێ دەخست بۆ سیستمێك کە بەهێز تیایدا لاوازبوو تا مافی وەردەگیرێت ، بوو بەجیهادێك لەپێناو رزگارکردنی پیاوان و ژنان و منالانی ژێردەست ئەوانەی دەڵێن: خوای ئێمە لەم شارە پڕ لەجەورو ستەمە دەرمان بهێنەو فریاد ڕەسێکمان بۆ بنێرەو ، پشتیوانمان بۆ پەیداکە. ئەو جەنگانە بوون بەجیهادێك بۆ پاککردنەوەی زەوی لە پەیمان شکێنی و خیانەتکاریی و گوناهو دەستدرێژیی ، بۆ بەرقەرار کردنی ئاسایش و ئاشتی و بەزەیی و ڕەچاو کردنی ماف و پیاوەتی.

هەروەها چەندین بنەمای شکۆداری دانا بۆ شەڕ ، کە دەبێت سەرکردەو سەرباز پابەندی بن و لێی دەرنەچن . (سلیمان)ی کوڕی (بریدە) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵێت: هەرکەسێکی بکردایە بەمیری هەر سوپایەك یا سریەیەك بە تایبەتی ئامۆژگاری دەکرد کە لە خوا بترسێت ، خاتری موسوڵمانەکانی برای بگرێت و پاشان دەیفەرموو: بەناوی خواوە غەزا بکەن ، لەپێناوی خوادا ، شەڕ لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەن کە باوەڕی بەخودا نی‌یە ، غەزا بکەن ، زیادەڕەوی مەکەن ، پەیمانشکێنی مەکەن ، مردوو مەشێوێنن ، منداڵ مەکوژن ، ... (فەرموودەکە).

ئەنجا فەرمانی دەدا بە ئاسانكاریی و دەیفەرموو: ئاسانكار بن قورسكار مەبن ، هێوركەرەوە بن ، ڕەتێنەر مەبن[1]. كە شەو بچوایەتە سەر هەرخێڵێك دەوەستا تا ڕۆژ دەبووەوە ئەنجا هێرشی بۆ دەبردن ، بەتوندی نەهی دەكرد لە (سوتاندن و ، كوشتنی بێچەك و كوشتنی ژنان و لێدانیان و تاڵان كردن) ، تا فەرمووی: (ماڵی تاڵانی حەڵاڵ تر نییە لە گۆشتی مردوو) ، هەروەها نەهی دەكرد لە وێران كردنی مەزراو كێڵگەو ڕەزو بڕینی درەخت ، مەگەر لە زۆر پێویستیدا كە هیچ ڕێگەیەكی تر نەبێت. هەروەها لە ڕۆژی فەتحی مەككەدا فەرمووی: مەدەن بەسەر بریندارەكانیاندا ، كەسێك ڕایكرد شوێنی مەكەون ، هیچ دیلێك مەكوژن ، سوننەتی واداهێنا كە نابێت فروستادەو نێرراوەكان بكوژرێن .. نەهی كرد لەكوشتنی هاوپەیمانەكان و فەرمووی: هەركەسێك هاوپەیمانێك بكوژێت هەرگیز بۆنی بەهەشت ناكات ، لەكاتێكدا كە بۆنی بەهەشت تا چل ساڵ پێ دەڕوات.

ئەمانەو چەندین بنەمای گەورەی تر ، كەمنێوەندی شەڕەكانی لە ئاسەوارە جاهیلیەكان پاك كردەوەو كردی بە جیهادێكی پیرۆز !

[1] / بڕوانە بۆ درێژی ئەم باسە (زاد المعاد) ٢/٦٤، ٦٥، ٦٦، ٦٧، ٦٨ ، هەروەها (الجهاد في الإسلام) نووسینی (أبو الأعلى المودودي) ل٢١٦ تا ٢٦٢.

## خەڵك بە كۆمەڵ دێنە ناو ئاینی خوداوە

هەروەكو وتمان غەزای فەتحی مەككە شەڕی یەكلاكەرەوە بوو ، بەتەواوی بت پەرستی لەناوبرد ، بەهۆی ئەو فەتحەوە ئیتر عەرەب حەقی لە ناحەق جیا كردەوە ، گومان و دڵەڕاوكێی نەما ، بەخێرایی هاتنە ناوئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە. (عمرو)ی كوڕی (سلمة) دەڵێت: لەسەر ئاوێك بووین شوێنی هاتوچۆی خەڵك بوو ، ئەسپ سوارەكان بەلاماندا تێدەپەڕین و پرسیارمان لێدەكردن: ئەوە خەڵكی چیانە؟ ئەو پیاوە كێیە؟ - واتە پێغەمبەر ﷺ - ئەوانیش دەیانوت: كابرایەكە دەڵێت من خودا ناردوومیو وەحی بۆ هێناوم. خودا ئەوی ناردووە ، ئەم قسەیەم لە زەینی خۆمدا لەبەردەكرد ، هەروەكو لەسەر سنگم بخوێنرێتەوە ، عەرەب بە فەتح موسوڵمان بوون ، دەیانوت: وازی لێبهێنن بزانن خۆی و گەلەكەی چیدەكەن، ئەگەر سەركەوت بە سەریاندا ئەوە پێغەمبەرێكی راستگۆیە ، كە فەتحی مەككە كرا هەموویان هاتنو موسوڵمان بوون ، باوكم پێش خزمەكانم موسوڵمان بوو ، كە لەوێ هاتەوە وتی: وەڵڵاهی بەڕاستی لای پێغەمبەر بووم ﷺ ، فەرمووی: نوێژەكانتان لەو كاتەو ئەوكاتەدا بكەن ، نوێژی فلان لەكاتی فلاندا ، كە كاتی نوێژ هات با یەكێكتان بانگ بدات ، ئەوەتان كە زۆرترین قورئانی لەبەرە پێش بكەوێت.. - فەرموودەكە -.[1]

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەتحی مەككە چەندە كاریگەریی هەبووە لەسەر پێشخستنی بارودۆخەكە لە بەرژەوەندی موسوڵمانان و بەهێزكردنی ئیسلام و بواردان بە عەرەب بۆ دیاریكردنی هەڵوێستی خۆیانو ملكەچ كردنیان بۆ ئیسلام ، لەدوای جەنگی (تەبوك)یش ئەم خاڵە جەختی زیاتری لەسەر كرایەوە.. بۆیە دەبینین لەو دوو ساڵەدا وەفدەكان بەكۆمەڵ ڕوویان دەكردە مەدینەو خەڵك بەكۆمەڵ كۆمەڵ موسوڵمان دەبوون ، تاڕادەیەك سوپای ئیسلامیی لە غەزای فەتحدا (١٠) هەزار كەس بوو ، لە غەزای تەبوكدا گەیشتە (٣٠) هەزار كەس ، پێش ئەوەی ساڵێك بگوزەرێت بەسەر ئەو فەتحەدا ، پاشان دەبینین لە حەجی ماڵئاواییدا یەك عەشاماتی گەورەی بەئەندازەی دەریایەك خەڵك كە دەگەنە (١٠٠) هەزار یان (١٤٠) هەزار موسوڵمان لە دەوری كۆدەبنەوەو لەخزمەتیدا دەوەستن و تەلبیەو تەكبیرو تەسبیحات و حەمدی خوا دەكەن و هەموو دونیا بەجوڵەیان شەپۆل دەدات و ، دەنگو سەدایان دەگاتە ئاسۆگەكان .

---

[1] / صحيح البخاري ٢/٦١٥، ٦١٦.

## وەفدەکـــان

ژمارەی ئەو شاندانەی (سیرەت)ناسان باسی دەکەن لە حەفتا وەفد تێ دەپەڕن ، ئێمەش ناتوانین بەدرێژی باسیان لێوە بکەین ، درێژەپێدانیشی سوودێکی ئەوتۆی نی‌یە ، بەلام بەسەرجەمی ئەوەی پێویستەو گرنگیەکی مێژوویی هەیە باسی دەکەین ، بۆ ئەوەی لە زەینی خوێنەراندا ئەو ڕاستیە تۆمار بکەین ، دەبێت بلێین کە بەشی زۆری وەفدەکان لە دوای فەتحدا هاتوونەتە مەدینە ، بەلام چەندین تیرەی تریش هەیە پێش فەتح هاتوون لەوانە:

١. **وەفدی (عبدالقیس)** ـ ئەم تیرەیە دوو وەفدی هەبوو: یەکەمیان ساڵی پێنجەمی کۆچی یان پێشتر ، پیاوێکیان تێدابوو ناوی (منقذ)ی کوڕی (حیّان) بوو ، بۆ بازرگانی دەهاتە مەدینە ، دوای گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ مەدینە، ئیسلامی ناسی‌و موسوڵمان بوو، نووسراوێکی پێغەمبەری برد بۆ خزم‌و خێڵەکەی ئەوانیش موسوڵمان بوون ، لە مانگی حەرامدا بەسیانزە یان چواردە پیاوەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، لەو سەردانەدا پرسیاریان لەبارەی ئیمان‌و خواردنەوەکانەوە کرد ، گەورەکەیان (أشجعی عصری) بوو کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرمووی: (ئەی (أشجع) بەڕاستی تۆ دوو خەسڵەتی جوانت تێدایە بەئارام‌و لەسەرخۆیت). شاندی دووەمیشیان لەساڵی وەفدەکاندا بوو، ژمارەیان لەو کاتەدا چل پیاو بوو، (جارود)ی کوڕی (علاء)ی (عبیدی) یان تێدابوو ، پیاوێکی نەسرانی بوو موسوڵمان بوو موسوڵمانێکی باشی لێدەرچوو.[1]

٢. **وەفدی (دوس)** ـ هاتنی ئەم وەفدە لە سەرەتای ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو ، ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو ، پێشتریش باسی موسوڵمان بوونی (طفیل) ی کوڕی (عمرو)ی (دوسی)مان کرد کە هێشتا پێغەمبەر ﷺ لە مەککەدا بوو ئەم پیاوە چووە خزمەتی و موسوڵمان بوو، پاشان گەڕایەوە بۆ ناو کەس‌و کاری‌و بانگی دەکردن بۆ موسڵمان بوون ئەوانیش دەستی دەستیان پێدەکردن ، تا لێیان نائومێد بوو ، گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای لێکرد نزا بکات لە (دوسی)یەکان ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (خوایە هیدایەتی دوسیەکان بدەیت) ، پاشان ئەوانە هەموویان موسوڵمان بوون ، ئەنجا (طفیل) لەگەڵ هەشتا کەسی بنەماڵەی خێڵەکەیدا ، لە سەرەتای ساڵی حەوتەمی کۆچیدا هاتنە مەدینەو چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر.

---

[1] / شرح صحيح مسلم . نووسينى النووى ٣٢/١، فتح البارى ٨٥/٨ ، ٨٦.

٣. **فروستادەی (فروە)ی کوڕی (عمرو)ی (جزامی)** ، ئەم پیاوە سەرکردەیەکی عەرەبی سەر بە ڕۆمەکان بوو ، سەرکاری ئەوان بوو بەسەر هەندێك خێڵی عەرەبەوە ، مەنزڵگای لە (معان)و ناوچەکانی دەوروبەری بوو لەخاکی شامدا ، پاش ئەوەی ئازایەتیو نەبەردییو ڕاستگۆیی موسوڵمانەکانی بینی لە جەنگی (مؤتة)دا ، ساڵی (٨)ی کۆچی موسوڵمان بوو ، کە موسوڵمانیش بوو نێرراوێکی خۆی نارده خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ هەواڵی موسوڵمانبونەکەی و لەگەڵیدا بە دیاری هێسترێکی سپی بۆ نارد ، کە ڕۆمەکان زانیان موسوڵمان بووە گرتیانو بەندیان کرد ، پاشان بڕیاری هەڵگەڕانەوە یان مردنیان دایە دەستی ، بڕیاری دا بمرێت و پەشیمان نەبێتەوە ، بۆیە لە (فلسطین)دا لەسەر ئاوێك پێی دەڵێن (عفراء) لە خاچیانداو سەریان پەڕاند.[1]

٤. **وەفدی (صداء)** ـ ئەم وەفدە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە (جعفرانة) هاتنە خزمەتی لەساڵی (٨)ی کۆچیدا ، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی چوار سەد کەسی بۆ ناردنو ، فەرمانی پێدان بچنە شوێنێکەوە لە (یەمەن) ناوی (صداء)ە ، لەکاتێکدا کە ئەو سریەیە ئۆردوی دامەزراند بوو لە سەرەدەمی (قناة)دا ، (زیاد)ی کوڕی (حارث)ی (صدائی) خێرا خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ و عەرزی کرد: من نوێنەری هەموو خێڵەکەمم ، ئەو سوپایە بگێڕەوە من خێڵەکەم دەهێنمەوە خزمەتت. پێغەمبەریش ﷺ سوپاکەی لە (قناة) گێڕایەوە. کابرای (صدائي)یش چوو هانی خێڵەکەیدا کە بچنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، پانزە پیاویان چوونە خزمەتیو بەیعەتی ئیسلامەتیان پێدا ، پاشان گەڕانەوە بۆناو خێڵەکەیانو بانگیان کردن بۆ ئایینی ئیسلامو ئیسلامەتیان تێدا بڵاوبووەوە. لە حەجیماڵئاواییشدا سەد پیاویان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ.

٥. **هاتنەوەی (کعب)ی کوڕی (زهیر)ی کوڕی (أبی سلمی)** ـ کە یەکێك بوو لە بنەماڵەی شاعیرانو هۆنەرترین کەسی عەرەب بوو ، هەجوی پێغەمبەری دەکرد ﷺ ، کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای (طائف) گەڕایەوە ساڵی (٨)ی کۆچیدا ، (بجیر)ی برای نامەیەکی نووسی بۆ (کعب)و تیایدا وتبوی: پێغەمبەر ﷺ هەندێك پیاوی کوشتوە لەو کەسانەی هەجویان کردووەو ئازاریانداوە ، ئەو شاعیرانەی تریش

[1] زاد المعاد ٤٥/٣ ، تفهيم القرآن ١٦٩/٢.

که ماون بەچوارلادا ڕایانکردووە ، ئەگەر لەدڵتدا شتێك هەیە بگەڕێرەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، چونکە هەر کەسێك بەپەشیمانی بگەڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ نایکوژێت ، وەگەرنا بڕۆ سەری خۆت هەڵبگرە . دوای ئەوەش چەندین جار نامەیان بۆ یەکتری نوسی تاوای لێهات (کعب) دونیای لەبەر چاودا تەنگ بوەوە ، بەزەیی بەخۆیدا هاتەوە ، گەڕایەوە بۆ مەدینە ، لای کابرایەکی خەڵکی (جهنیة) دابەزی ، نوێژی بەیانی کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ، کە نوێژ تەواوبوو، کابرای (جهنی) ئیشارەتی دایەو وتی: هەستە بڕۆ بۆ خزمەتی ، (کعب) هەستاو لەبەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دانیشت ، دەستی خستە ناودەستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەناسی ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (کعب)ی کوڕی (زهیر)ە هاتۆتە خزمەتت تا بەپەشیمانیو موسوڵمانەتی پەنای بدەیت ، ئەگەر بێتە خزمەتت ئەو پەشیمانیەی لێ قبوڵ دەکەیت ؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: من (کعب)ی کوڕی (زهیر)م. کابرایەکی ئەنساری ئامبازی بوو تا مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرێت و بیکوژێت ، فەرمووی: وازی لێبهێنە ، ئەوە بە پەشیمانی هاتوەو وازی لە هەموو ئەو قسانەی پێشوو هێناوە.

ئیتر لەوێدا (کعب) هۆنراوە بەناوبانگەکەی خوێندەوە کە سەرەتاکەی دەڵێت:

بانَتْ سعادُ فقلبي اليومَ متبولُ    مُتَيمٌ إثْرَها ، لم يُفْدَ ، مكبولُ

لەهۆنراوەکەیدا پۆزش‌و عوزرخواهی دەهێنێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و مەدحی دەکات‌و دەڵێت:

نُبِّئتُ أنَّ رسولَ اللهِ أوعـــدَنــيْ    والعفوُ عِنْدَ رَسولِ اللهِ مَأمولُ
مهلاً هداك الذي أعْطاك نافلة الـــ    قرآن فيها مَواعيظٌ وتفصيلُ
لا تأخُذَنِّ بأقوالِ الوُشاة ولـــم    أُذْنِبْ ، ولو كَثُرَتْ فِيَّ الأقاويلُ
لَقَـــدْ أقـــومُ مقاماً لو يقومُ به    أرى وأسمعُ ما لو يسمع الفيلُ
لظلَّ يُرْعدُ ، إلاّ أن يكون لـــهُ    منَ الرسولِ بـــإذنِ اللهِ تنويلُ
حتى وضَعْتُ يمِيــني ما أنازعـــه    في كَفِّ ذي نقماتٍ قيلُه القيلُ
فلهو أخوفُ عندي إذْ أكلّمــــه    وقيلَ: إنَّكَ منسوبٌ و مسؤولُ
من ضَيْغَمٍ بضَراءِ الأرضِ مخدَرهُ    في بطنِ عثَّرَ غيلٌ دونَهُ غيـــلُ
إنَّ الرسولَ لنورٌ يُسْتضـــاءُ به    مهنَّدٌ منْ سيوفِ اللهِ مسلـــولُ

پاشان کەوتە پیاهەڵدانی کۆچەرانی قورەیش ، چونکە لەکاتی هاتنیدا ئەمان هیچیان نەوت بەرامبەری ، لە میانەی پیاهەڵدانی کۆچەرەکانیشدا ئاماژە دەکات بۆ ئەنساریەکان و هەڵوێستی ئەوەیان کەداوای مۆڵەتی کرد بۆ کوشتنی و ، وتی:

يَمشونَ مَشيَ الجمالِ الزُّهْرِ يعصِمُهُم     ضربٌ إذا عَرَّدَ السودُ التنابيلُ

کە موسڵمان بوو موسوڵمانێکی باشی لێ دەرچوو لە قەسیدەیەکی خۆیدا هەڵیدا بە ئەنسارەکانداو، دەرکی بەو کەم لوتفیەی خۆی کردبوو ، کە لەبارەیانەوە لێی دەرچوو بوو ، لە قەسیدەکەدا دەڵێت:

مَنْ سَرَّهُ كرمُ الحياة فلا يــزلْ     في مقنب من صالحي الأنصارِ

ورثوا المكارم كابراً عن كابرٍ     إن الخِيــارَ هم بنــو الأخيارِ

٦. وەفدی (غدرە) ـ لە مانگی (صفر)ی ساڵی (٩)ی کۆچیدا هاتن ، دوانزە پیاو بوون (حمزە)ی کوڕی (نعمان) یشیان تێدا بوو ، کاتێك کە پرسیاریان لێکرا ئێوە کێن ، قسەکەرەکەیان وتی: ئێمە خێڵی (بنو غدرة)ین ، برای (قصی) ین لەسەری دایکیەوە ، ئێمە ئەو کەسانەین کەپشتی (قصی)مان گرت و لەناو مەککەدا (خزاعة)و (بنی بکر)مان دەرکرد ، خزمایەتیمان هەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ پێشوازی لێکردن و مژدەی ڕزگارکردنی شامی پێدان و، نەهی لێکردن داوای کەهانەت بکەن و ئەو قوربانیانە بکەنەوە کە لەسەردەمی جاهیلیدا دەیانکرد. هەموویان موسوڵمان بوون و ماوەیك مانەوەو پاشان گەڕانەوە.

٧. وەفدی (بلی) ـ لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٩) کۆچیدا بوو ، هاتنە مەدینەو موسوڵمان بوون و سێ ڕۆژ مانەوە ، (أبو الضبيب)ی سەرکردەیان پرسیاری کرد ، ئایا میوانداری کردن پاداشتی تێدایە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ ، هەروەها چاکەیەك بکەیت لەگەڵ هەژارێك یان دەوڵەمەندێك سەدەقەیە. لەبارەی کاتی میوانداریشەوە پرسیاری کرد ، فەرمووی: میوانداری سێ ڕۆژە. پرسیاری لەبارەی مەڕومالاتی وێڵەوە کرد. فەرمووی: یان بۆ تۆیە یان بۆ براکەت یان بۆ گورگ. لەبارەی وشتری وێڵیشەوە پرسیاری کرد. فەرمووی چیتە بەسەر وشترەوە؟ وازی لێبهێنە تا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە.

٨. وەفدی (ثقيف) ـ هاتنیان لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی (٩)ی کۆچیدا بوو، پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر بوو ﷺ لە جەنگی (تبوك) . بەسەرهاتی موسوڵمان

بوونەکەشیان بەم شێوەیە بووە: (عروة)ی کوڕی (مسعود)ی (ثقفي) سەرۆکیان پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای (طائف) لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا هاتە خزمەتی پێش ئەوەی بگاتە مەدینە ، (عروة) موسوڵمان بوو ، گەڕایەوە بۆلای کەسوکاری ، بانگی کردن بۆ ئیسلامەتی ، وایدەزانی گوێڕایەڵی دەبن ، چونکە پیاوماقوڵێکی قسە بیسراوبوو لەناویاندا ، لە ڕۆڵەکانیان خۆشەویستتر بوو لەدڵیاندا ، کەچی کەبانگی کردن بۆ ئیسلام، لە هەموولایەکەوە تیربارانیان کرد تا شەهیدبوو، پاش کوشتنی بەمانگێك مانەوە ، دوایی کۆبونەوەیەکیان کرد لەناو خۆیاندا ، بینیان کە تواناو وزەی ئەوەیان نیە شەڕ بکەن لەگەڵ هەموو عەرەبدا ـ بەتایبەتی ئەوانەی کە بەیعەتیان داوەو موسوڵمان بوون ـ بڕیارەیاندا پیاوێك بنێرن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ، بۆ ئەو مەبەستە قسەیان کرد لەگەڵ (عبد یالیل)ی کوڕی (عمرو)دا ، پێیان وت کە ئەو بچێت ، وتی: من ناچم. چونکە دەترسا ئەگەر گەڕایەوە چیان کرد بە (عروة) بەمیشی بکەن ، وتی: شتی واناکەم تاچەند پیاوێکم لەگەڵدا نەنێرن ، دوو پیاویان لە (أحلاف)و سیانیش لە (بني مالك) لەگەڵدا نارد ، بوون بە شەش کەس و (عثمان)ی کوڕی (أبی العاص)ی (ثقفي)یان لەگەڵدا بوو ، لە هەموویان گەنجتر بوو.

کە گەیشتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کەپرێکی بۆ دروست کردن لەلایەکی مزگەوتەکەوە تا کەمێك گوێیان لە قورئان خوێندن بێت و چاویان لەخەڵکی بێت کە نوێژ دەکەن ، مانەوەو گفتوگۆیان بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ، جیاوازیان بوو لەگەڵیدا ئەویش بانگی دەکردن بۆ ئیسلام ، تا سەرۆکەکەیان داوای کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە نوسراوێکیان بۆ بنوسێت بۆ سوڵحی نێوان خۆی و (ثقیف). لەسەرئەوەی مۆڵەتیان بداتێ زینا بکەن و مەی بخۆنەوەو ریبا بخۆن و پەیکەرەکەی (لات)یان بۆ بهێڵێتەوەو نەیشکێنێت ، نوێژیان لەسەر لابات ، بەدەستی خۆیان بتەکانیان نەشکێنن. پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ یەکێك لەو داوایانەی قەبوڵ نەکرد. چوونەوە کەوتنەوە راوێژکردن بەیەکتر ، جگە لە ملکەچ بوون بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چارەیەکی تریان نەبوو ، ملیانداو موسوڵمان بوون ، مەرجیان دانا کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی پەیکەری (لات) بشکێنێت و (ثقیف) خۆیان ئەوکارە نەکەن. پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لێ وەرگرتن ، نووسراوێکی بۆ نووسین ، (عثمان)ی کوڕی (أبی العاص)ی (ثقفي) کرد بەسەرۆکیان ، چونکە لە هەموویان زیاتر

هەوڵی فێربوون لە ئیسلامو ئاییندارییو قورئانی ئەداو، هەموو جارێك وەفدەكە ، كە بەیانیان ئەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ (عثمان)یان لەلای كەلوپەلو كاروانەكە بەجێ ئەهێشت ، كە ئەگەڕانەوە لە نیوەڕۆدا (عثمان)ی كوڕی (أبی العاص) ئەچووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، فێری قورئان ئەبوو، پرسیاری لەسەر ئایین لێ ئەكرد ، ئەگەر بیزانیایە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی نووستوە ، ئەچووە خزمەت (أبوبكر) بۆ هەمان مەبەست . (ئەم پیاوە (عثمان)ی كوڕی (أبی العاص) لە ڕۆژگارەكانی هەڵگەڕانەوەی عەرەبە ئەشتەكیەكاندا زۆر بەبەرەكەت بوو ، كە خێڵی (ثقیف) ویستی هەڵگەڕێنەوە لە ئیسلام پێی وتن: ئەی خێڵی (ثقیف) ئێوە دوایین كەس بوون كە موسوڵمان بوون ، تكاتان لێئەكەم یەكەم كەس مەبن بۆ هەڵگەڕانەوە لە ئایین ، ئەم قسانە كاری تێكردن و هەڵنەگەڕانەوەو ، لەسەر ئیسلامەتی خۆیان مانەوە).

وەفدەكە گەڕایەوە بۆلای خێڵەكەیان و ڕاستی مەسەلەكەیان ڕانەگەیاند ، بە شەڕی هاتو ئەمات زەندەقیان بردن ، خەمو پەژارەیان نیشاندا ، وتیان پێغەمبەر ﷺ داوای لێ كردوین واز لە زیناو مەی خواردنەوەو ریباو چەندین شتی تر بهێنین وەگەرنا شەڕیان لەگەڵدا ئەكات ، غیرەتی جاهیلیان تێدا زیندوو بوەوە ، چەند ڕۆژێك مانەوە بە تەمای شەڕ بوون ، پاشان ترس كەوتە دڵیانەوە ، وتیان بە وەفدەكە: بڕۆنەوە بۆلای موحەممەد چی ئەوێت بۆی بكەن ، ئیدی وەفدەكە ڕاستی مەسەلەكەیان تێگەیاندن و پێیان وتن ، كە لەسەرچی ڕێكەوتوون لەگەڵیداو خێڵی (ثقیف)یش موسوڵمان بوو.

پێغەمبەریش ﷺ چەند پیاوێكی نارد بۆ شكاندنی پەیكەری (لات)و (خالد)ی كرد بە فەرماندەیان ، (مغیرة)ی كوڕی (شعبة) تەورێكی گرت بەدەستیەوەو وتی: بە هاوەڵەكانی: وەڵڵاهی ئەمڕۆ ئەتانخەمە پێكەنین بەدەست (ثقیف)ە وە ، بە تەورەكە دای لە پەیكەرەكە ، ئەنجا خۆی خستە خوارەوەو وەك شێت ڕای كرد ـ گوایە بتەكە ئەستی لێوەشاندوە ـ هەموو خەڵكی (طائف) ورووژانو وتیان: خوا (مغیرة) بكوژێت ، ئەرێ وەڵڵا ئەستی لێوەشاندو كوشتی . ئەنجا (مغیرة) بازێكیداو قنج هەستایەوەو كەوتە لاقرتێ پێكردنیانو وتی: خوا لەناوتان بەرێت ، ئەمە جگە لە قوڕو بەرد هیچی تر نیە ، ئەنجا دای لەدەرگای ژووری پەیكەرەكەو شكاندی ، چووە سەر دیوارەكەی ، پیاوەكانی تریش لەگەڵیدا سەركەوتنو پەیكەرەكەو دارو دیواری بتخانەكەیان لەگەڵ زەویەكەدا تەخت كرد ، بەردی بناغەكەشیان لەبن ئەرهێناو هەرچی خشڵو زێڕو زیوو كاڵا هەیە هێنایانە

دەرەوە ، (ثقیف)یەکان ئەبڵەق بوو بوون. (خالد)و مەفرەزەکەی گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە خشڵ و زێڕو زیوی بتخانەکەوە ، هەر ئەو ڕۆژە دابەشی کرد ، سوپاسی خوای کرد لە سەرخستنی پێغەمبەرەکەی و سەرخستنی ئایینەکەی.[1]

٩. نامەکانی پادشاکانی یەمەن ـ پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە تەبوك نامە هەڵگری پادشاکانی (حمیر) گەیشتن ، بریتی بوون لە (حارث)ی کوڕی (هلال)و (نعیم)ی کوڕی (عبد الکلال)و (نعمان)ی کوڕی (ذی رعین) و (همدان)و (معافر)و فروستادەکەی ئەوان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە بریتی بوو لە (مالك)ی کوڕی (مرة)ی (رهاوی) ، بە موسوڵمانی و وازهێنان لە کوفرەوە ناردبوونیان ، پێغەمبەریش ﷺ نامەیەکی بۆ نووسین تیایدا مافو ئەرکی ئیماندارانی ڕوون کردبووەوە، بەڵێنی پاراستنی دابوو بەهاوپەیمانان ئەگەر جزیە بدەن ، چەند پیاوێکی هاوەڵی خۆیشی بۆ ناردن کە (معاذ)ی کوڕی (جبل) میریان بوو.

١٠.وەفدی (همدان) ـ ساڵی (٩)ی کۆچی هاتن پاشگەڕانەوە ﷺ لە تەبوك ، نامەیەکی بۆ نووسین بە ڕوونی ماف و ئەرکەکانی بۆ ڕوون کردنەوە ، (مالك)ی کوڕی (نمط)ی کردە سەرۆکیانو کردی بەسەروکاری هەموو ئەوانەی موسوڵمان بوون ، بۆ ئەوانی تریش (خالد)ی کوڕی (ولید)ی نارد تابانگیان بکات بۆ ئایینی ئیسلام ، شەش مانگ لەناویاندا مایەوەو بانگی کردن وەڵامیان نەدایەوە ، پاشان (علی) کوڕی (أبو طالب)ی نارد ، فەرمانی پێدا کە (خالد)ی بۆ بنێرێتەوە ، (علی) چوو بۆ لای (همدان) ، نووسراوێکی پێغەمبەری خوا ﷺ ی بۆ خوێندنەوە ، بانگی کردن بۆ ئایینی ئیسلام هەموویان موسوڵمان بوون ، (علی) نامەیەکی مژدە ئامێزی نووسی لەبارەی موسوڵمان بوونی (همدان)ەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، کە خوێندیەوە سوجدەی برد بۆ خوداو فەرمووی: سڵاو لە (همدان) ، سڵاو لە (همدان).

١١.وەفدی (بنی فزاره) ـ ئەم وەفدە دوای ساڵی (٩)ی کۆچیو پاشگەڕانەوەی پێغەمبەر بوو ﷺ لە تەبوك ، چەند کەسێك بوون هاتن شایەتومانیان هێناو موسوڵمان بوون ، سکاڵای وشکیی و بێ ئاوی وڵاتەکەیان کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەر ، هەردوو دەستی بەرزکردەوەو دوعای باران بارینی

---

[1] زاد المعاد ٣/٢٦، ٢٧، ٢٨ . ابن هشام ٣/٥٣٧ تا ٥٤٢.

خوێندو فەرمووی: خوایە وڵاتو خاکی خۆت ئاوبدە ، ڕەحمەتی خۆت ببارێنە، خاکی مردووەکە ببوژێنەرەوە ، خوایەگیان بەباران فریامانکەوە ، ڕزگارکەر بێت ، حەوێنەر بێت ، سەوزایی بهێنێت ، دەم دەمی بێت ، بەر فراوان بێت ، بەپەلە بێت ، دوانەکەوێت ، سوودبەخش بێت و زیان نەدات ، خوایە داوای ئاوی ڕەحمەتت لێ دەکەین ، نەك ئاوی سزاو وێران کردن و نغرۆ کردن و لەناو بردن ، خوایە بارانمان دەوێت ، سەرمان بخەیت بەسەر دوژمناندا.[1]

١٢. وەفدی (نجران) ـ نەجران ناوچەیەکی بەرفراوانەو بەلای ڕاستدا حەوت قۆناغ لەمەککەوە دوورە ، حەفتاوسێ گوندی تێدایە ، بۆ ئەسپ سوارێکی خێرا ماوەکەی یەك ڕۆژە ڕێیە[2]. سەدهەزار چەکداری هەبوو لەسەر ئاایینی گاور بوون.

هاتنی وەفدی (نجران) لەساڵی (٩)ی کۆچیدا بوو ، وەفدەکە لە شەست پیاو پێکهاتبوو ، بیستو چواریان پیاو ماقوڵ بوون ، سیانیان سەرکردایەتی خەڵکی نەجرانیان لەئەستۆدا بوو ، یەکێکیان (عاقب) بوو ، میرنشینایەتی و حکومەتداری بەدەستەوە بوو ناوی (عبد المسیح) بوو ، دووەمیان (سید) بوو، مەسەلە فەرهەنگیو سیاسیەکانی لە ئەستۆدا بوو ناوی (أیهم) یان (شرحبیل) بوو ، سێیەمیان (أسقف) بوو سەرۆکایەتی کاروباری ئاایینیو ڕۆحانی بە دەستەوە بوو، ناوی (أبو حارثة)ی کوڕی (علقمة) بوو.

کە وەفدەکە لە مەدینە دابەزین ، گەیشت بەپێغەمبەرﷺ ، پرسیاری لێ کرد ، پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری لەوان کرد ، پاشان بانگی کردن بۆ ئاایینی ئیسلام ، قورئانی بەسەردا خوێندنەوە ملیان نەدا ، پرسیاریان لێکرد کە لەبارەی (عیسی)وە چی دەڵێیت؟ ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدانەوە تا ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ، الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلاَ تَكُنْ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ، فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ ﴾ آل عمران ٥٩.

کە ڕۆژ بووەوە پێغەمبەر ﷺ باسی عیسای بۆ کردن لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزانەداو، ئەو ڕۆژە وازی لێ هێنان بۆ ئەوەی بیر لە مەسەلەکە بکەنەوە ، دانیان نەنا بەوەدا کە لەبارەی عیساوە فەرمووی. بۆ سبەینێ کە ڕۆژ بووەوە پاش ئەوەی ئەو

---

[1] / زاد المعاد ٣/٤٨.

[2] / فتح الباری ٨/٩٤.

قسانەیان لەبارەی عیساوە ڕەتکردەوە ، باوەڕیان نەهێنا بەئاییـنی ئیسلامیش ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن بۆ (مباهلة) و (حسن) و (حسین)ی خستە ئامێزی خۆیی و (فاطمة)ش لەپشتیەوە بوو ، کە بینیان پێغەمبەر ﷺ مەسەلەکەی بەهەند وەرگرتووە ، بۆ خۆیان پێکەوە کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد ، (عاقب) و (سید) کە بە یەکتریان وت: شتی وانەکەن سوێند بێت ئەگەر پێغەمبەر بێت و نەفرەتکاری بکەین سەرناکەوین و تارۆژی دوایی ئەو نەفرەتە بەر نەوەکانیشمان دەکەوێت ، پاشان ڕایان هاتە سەر ناوبژیوانی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە کارەکەیاندا ، هاتنەوەو وتیان: ئێمە ئەوەت دەدەینێ کە داوات کردووە ، پێغەمبەر ﷺ جزیەی لێ قەبوڵ کردن ، سوڵحی لەگەڵدا کردن لەسەر دوو هەزار پارچە چەك ، هەزاریان لە ڕەجەبدا ، هەزاریشیان لە (صفر)دا ، لەگەڵ هەر پارچە چەکێکدا یەك هۆقەو، لەسەر ئەوانە ئەستۆباریی خوداو پێغەمبەرەکەی پێدان‌و، بەتەواوی‌و ئازادانە لەسەر ئایینەکەی خۆیان ئازادی کردن ، لەوبارەیەشەوە نامەیەکی بۆ نووسین ، داوایان لێ کردن پیاوێکی دەستپاکیان لەگەڵدا بنێرێت ، ئەویش ئەمینداری ئوممەتی لەگەڵدا ناردن کە (أبو عبیدە)ی کوڕی (جراح)ە ، بۆ وەرگرتنی پارەی سوڵحەکە.

پاشان وردە وردە ئیسلامەتیان تێدا بلاوبوەوە ، دەڵێن: کە (سید) و (عاقب) پاش ئەوەی گەڕاونەتەوە بۆ (نجران) موسوڵمان بوون ، پێغەمبەریش ﷺ (علی) بۆ ناردون ، بۆ ئەوەی سەدەقەو خێرەکانیان بهێنێت ، دیاریشە کە سەدەقەو خێر تەنها لە موسوڵمانان وەردەگیرێت.[1]

١٣.وەفدی (بنی حنیفە) ـ لەساڵی (٩)ی کۆچیدا ، حەڤدە کەس بوون (مسیلمة)ی درۆزنیشیان لەگەڵدا بوو ـ (مسیلمة)[2] ناوی (مسیلمة)ی کوڕی (ثمامة)ی کوڕی (کبیر)ی کوڕی (حبش)ی کوڕی (حارثی) کوڕی (بني حنيفة)یە ـ ، ئەم وەفدە لە ماڵێکی ئەنساری دابەزین ، پاشان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمان بوون ، ڕیوایەتەکان لەبارەی (مسیلمة)ی درۆزنەوە جیاوازن. پاش تێڕامان لە هەموویان ، وادەردەکەوێت کە (مسیلمة) ئەو ملهوڕی و گوێ پێنەدانەی لێی دەرکەوتووە هۆیەکەی کورسی و دەسەلات بوەو، لەگەڵ وەفدەکانی تردا نەهاتووە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ هەوڵی داوە لەسەرەتاوە بە

---

[1] / فتح الباري ٨/ ٩٤، ٩٥ ، زاد المعاد ٣/ ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١ ، ریوایەتەکانیش لەبارەی وەفدی نەجرانەوە بەیەکدا چوون ، تا ئەوەی هەندێ لێکۆڵەر پێیان وایە هاتنی وەفدی نەجران دووجار بووە ئێمەش چیمان بە پەسەند زانیوە ئەو ڕایەمان داناوە.

[2] / فتح الباري ٨/٨٧.

نەرمو نیانی و بەگوفتارو کردار ڕایکێشێت کەزانی هیچ سوودێکی نیەو بێ خێرەو چاوەڕوانی کرد گوێبەنێکی لێ بکەوێتەوە.

پێشتریش پێغەمبەر ﷺ لەخەودا نیشانی درابوو، کە خەزێنەکانی دونیای دراوەتێ ، دووبازنەی ئاڵتونی دەکەوێتە بەردەست ، بەدەستی گەورەبوون، نیگای بۆهات فوویان پێدا بکات ، فووی پێداکردن، نەمان ، والێکی دایەوە کە دوو کەسی درۆزن لەدوای خۆی دەردەکەون، کەئەو هەڵوێستە ناشیرینە لە (مسیلمة) دەرکەوت ، دەیوت: ئەگەر موحەممەد دەسەڵاتو پایەی خۆی بدا بەمن دوای خۆی شوێنی دەکەوم. پێغەمبەر ﷺ پارچە پێستەیەکی گرت بەدەستیەوەو ڕۆشت بۆلای (مسیلمة) لەگەڵ وتار بێژەکەیدا کە ناوی (ثابت)ی کوڕی (قیس)ی (شماس) بوو ، ڕۆشت تا بینی لەناو هاوەڵەکانیدایە بەسەر سەریەوە وەستاو قسەی لەگەڵدا کرد. (مسیلمة) وتی: ئەگەر بتەوێت ئێمە ڕێگریت ناکەین ، بەمەرجێك ئەم کارە دوای خۆت بدەیتە دەستی ئێمە. فەرمووی: ئەگەر داوای ئەم پارچە پێستەیەشم لێبکەیت ناتدەمێ ، هەرگیز فەرمانی خوداش نادرێتە دەست تۆ ، ئەگەر پشت هەڵبکەیت خوا لەناوت دەبات، وەڵڵاهی لەبەرچاوی من تۆ هەرئەوەیت کە بینیومیت، ئەمەش (ثابت)ە لەجیاتی من وەڵامت دەداتەوە ، پاشان تەشریفی ڕۆشت.[1]

لەدواییشدا ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێشبینی کردبوو هاتە دی ، کە (مسیلمە) گەڕایەوە بۆ یەمامە بیری لەخۆی دەکردەوە ، پڕوپاگەندەیەکی بڵاوکردەوە ، گوایە هاوبەشی پێغەمبەرە ﷺ لە پێغەمبەرایەتیدا ، بۆیە بانگەشەی پێغەمبەرێتی کرد، دەستی کرد بەهۆنینەوەی قسەی سەروادار ، مەی خواردنەوەو زینای حەڵاڵ کرد ، لەگەڵ ئەوەشدا شایەتی دەدا کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەرە. خەڵکانی کەسوکاری کەوتنە ژێر کاریگەری قسەکانیو شوێنی کەوتن ، تا مەسەلەکە گەورە بوو ، وای لێ هات پێیان دەوت (ڕەحمانی یەمامە) لەبەر گەورەیی دەسەڵاتی لەناویاندا. نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ و تێیدا وتبووی: من کراوم بەهاوبەشی تۆ ، نیوەی کاری پێغەمبەرێتی بۆ منە ، قورەیشیش نیوەی دەبات. پێغەمبەریش ﷺ بەنامەیەك وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ﴿ إِنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾[2] واتە: زەمین موڵکی خودایە بەخواستی خۆی دەیدا بەو بەندەیەی خۆی دەیەوێت ، سەرکەوتنی دوارۆژیش بۆ لەخوا ترسەکانە.

---

[1] بڕوانە (صحيح البخاري): (وفد بني حنيفة)، باب (قصة الأسود العنسي) ٢/٦٢٧، ٦٢٨ و فتح الباري ٨/٨٧ تا ٩٣.
[2] / زاد المعاد ٣/ ٣١، ٣٢.

له (إبن مسعود)ەوە ، دەڵێت: (إبن نواحة) و (إبن أثال) هەردوو پەیامنێری (مسیلمة) هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، پێی فەرموون: ئایا ئێوە شایەتی دەدەن کە من پێغەمبەری خودام؟ وتیان: شایەتی دەدەین کە (مسیلمە) پێغەمبەری خوایە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باوەڕم هێنا بەخوداو پێغەمبەرەکەی ، ئەگەر پەیامنێرم بکوشتایە ئێستا هەردووکتانم دەکوشت.[1]

لەساڵی (١٠)ی کۆچیدا بوو (مسیلمة) ، داوای پێغەمبەرێتی دەکرد ، لە جەنگی یەمامەدا لەسەر دەستی (أبوبکر الصدیق)دا کوژرا ، لەمانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی دوانزەی کۆچی ، وەحشی بکوژی (حمزة) کوشتی. پێغەمبەرە درۆزنەکەی دووەم بریتی بوو لە (الأسود العنسي) ، کە لە یەمەن دەرکەوت ، (فیروز) کوشتی ، سەری لەلاشەی کردەوەو پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بە شەوو ڕۆژێك ، وەحی بۆ هات و هەواڵەکەیدا بە هاوەڵان ، پاشان هەواڵەکە هات بۆ (ابوبکر) لە یەمەنەوە.[2]

١٤. **وەفدی ( عامر )ی کوڕی ( صعصعە )** ـ دوژمنی خوا (عامر)ی کوڕی (طفیل)یان تێدا بوو لەگەڵ (أربد)ی کوڕی (قیس) ـ کە برای (لبید)ە لە دایکیەوە ـ هەروەها (خالد)ی کوڕی (جعفر)و (جبار)ی کوڕی (مسلم) ، ئەمانە ژیرمەندو فێڵبازی خێڵەکەیان بوون ، (عامر) ئەو کەسە بوو پەیمانشکێنی کرد لەگەڵ هاوەڵانی بیری (معونة)دا ، کە ئەو وەفدە ویستیان بێنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، (عامر) و (أربد) ڕێکەوتن لەسەر شەهید کردنی پێغەمبەر ﷺ ، کە هاتن (عامر) قسەی کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ. (اربد)یش لەپشتیەوە بوو، هەندەی بستێك شمشێرەکەی دەرکێشا ، وەستاو نەهاتە دەرەوە هەرچیەکی کرد شمشێرکەی بۆ دەرنەکێشرا ، خوا پێغەمبەرەکەی پاراست ﷺ ، پێغەمبەری خوا ﷺ نزای شەڕی لێکردن ، کە گەڕانەوە بەسواری وشترەکەیەوە هەورە بروسکەیەك لێیداو سوتاندی ، (عامر) یش بۆ داوێن پیسی لای ژنێکی (سلولي) لای‌دا ، تووشی غوودە بوو مرد ، لە سەرەمەرگدا هاواری دەکردو دەیوت: ئەی هاوار ، من چۆن دەبێت تووشی غوودەی وشتر ببم‌و لە ماڵی ژنە سەلولیەکیشدا بمرم.

لە (صحیح)ی بوخاریشدا هاتووە دەڵێت: (عامر) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی بە پێغەمبەر: سەرپشکت دەکەم لەم سێ شتەدا یەکێکیان هەڵبژێرە ، یان

[1] / ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە، مشکاة المصابیح ٢/ ٣٢٧.
[2] / فتح الباري ٩٣/٨.

ئەوەیە ناوچەی (سهل) بۆ تۆو ناوچەی (مدر) بۆ من ، یان ببمە جێنشینی تۆ ، یان ئەوەیە بە (غطفان)ەوە دێمە سەرت بە دووو هەزار وشتر سوارەوە . پاشان دەرچوو لەماڵی ژنێکدا درایەبەر خەنجەر ، وتی: ئەی هاوار دەبێت من تووشی غودەی وشتر ببم و لەماڵی ژنێکی خێڵی فلاندا بمرم ، ئادەی ولاخەکەم بۆ بهێنن ، سوار بوو ، بەسەر ئەسپەکەیەوە مرد.

١٥. وەفدی ( تجيب ) ـ ئەم وەفدە بەسەدەقەی خێڵەکەیانەوە هاتبوون ، ئەو بەشەی کە لەپشکی هەژارانیش زیاتربوو، وەفدەکە سیانزە پیاو بوون ، پرسیاری قورئان و سوونەتەکانیان دەکردو داوایان دەکرد فێر بکرێن. چەند شتێکی تریان داواکرد لە پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش بۆی نووسین ، زۆر نەمانەوە ، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدان بگەڕێنەوە ، غولامێکیان لای کاروانەکە بوو ناردیانە خزمەتی و وتی: وەڵلاهی من هیچ نازانم ئەوەندە نەبێت داوات لێ دەکەم کە نزام لای خوا بۆ بکەیت تا لێم خۆش ببێت و بەزەیی بێتەوە پێمداو دڵم دەوڵەمەند بکات ، پێغەمبەر ﷺ دوعای خێری بۆ کرد ، بە قەناعەتترین مرۆڤی لێ دەرچوو ، لەکاتی هەڵگەڕانەوەکەشدا دامەزراو بوو ، هانی کەس و کارەکەشی دەدا کە باوەڕ دامەزراو بن و هەڵنەگەڕێنەوە ، خەڵکی ئەم وەفدە لە ساڵی (١٠)ی کۆچیدا ، جارێکی‌تر گەیشتنەوە بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا .

١٦. وەفدی ( طيء ) ـ کە ئەم وەفدە هات (زيد الخيل)یان لەگەڵدا بوو ، کە قسەیان کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ باسی ئیسلامی بۆ کردن موسوڵمان بوون و موسوڵمانیەتیەکەشیان باش دەرچوو ، پێغەمبەر ﷺ لە بارەی (زيد)ەوە فەرمووی: باسی چاکەی هیچ پیاوێکی عەرەبم لەلادا نەکراوە ئیلا کە بینیومە هەستم کردووە کەمترە لەوەی بیستوومە ، جگە لە (زيد) کە هەرچی لەبارەوە وتراوە کەمتر بووە لە (زيد) ، بۆیە ناوی نا (زيد الخير) ، زەیدی خێرو بەرەکەت.

١٧. بەو شێوەیە بەبەردەوامی وەفدەکان لەساڵی (٩) و (١٠)ی کۆچیدا دەهاتنە مەدینە ، (غەزا) نووسان و (سیرەت) ناسان لەو وەفدانەدا باسی وەفدی (يمن) یشیان کردووە لەگەڵ (ازد) و (بنى سعد هذيم)ی سەر بە (قضاعة) و (بني عامر)ی کوڕی (قيس) و (بنى أسد) و (بهراء) و (خولان) و (محارب) و (بني حارث)ی کوڕی (كعب) و (غامد) و (بنى المنتفق) و (سلامان) و (بنى عبس) و (مزينة) و (مراد) و (زبيد) و (كندة) و (ذي مرة) و (غسان) و (بنى عيش) و

(نخع) كه دوايەمین وەفد بوون ، لە ناوەڕاستی مانگی موحەڕەمی ساڵی (١١)ی کۆچیدا بە دووسەد پیاوەوە هاتن ـ هاتنی زۆربەی ئەو وەفدانە لەساڵی (٩) و (١٠)ی کۆچیدا بوو ، هەندێکی تریشیان تاساڵی (١١)ی کۆچیی دواکەوتن.

هاتنی هەموو ئەو وەفدانە بەڵگەیە لەسەر قەبوڵ کردنی بانگەوازی ئیسلامیی بەشێوەیەکی تەواو ، بالادەست بوون بەسەر هەموو دورگەی عەرەبیو دەوروبەریدا ، عەرەب لە هەمووڵایەکەوە بەچاوی ڕێزەوە سەیری مەدینەیان دەکرد . بەشێوەیەك ناچاردەبوو ملی بۆ بداتو شوێنی بکەوێت ، مەدینە بوو بەپایتەختی دورگەی عەرەبو نەدەکرا پشتگوێ بخرێت ، بەڵام ناکرێت بڵێین کە ئایینداری بەتەواوی لەدەروونی هەموو ئەوانەدا چەسپاو بوو، چونکە چەندین عەرەبی دەشتەکی دڵڕەقو عەقڵ تەسکیان تێدابوو ، کە بەهۆی گەورەکانیانەوە موسوڵمان بووبوون ، دڵیان بەتەواوی دانەمەزرابوو هێشتا نەفس و حەزەکانیان بەلای هەڵکوتانە سەرو تالانیدا دەڕۆیشتو فەرمایشتە مەزنەکانی ئیسلامیش هێشتا لە دڵەکانیان تەواو سەقامگیر نەبووبوو. قورئانی پیرۆزیش باسی هەندێکیان دەکات لە سورەتی تەوبەداو دەفەرموێت: ﴿ الأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلاَّ يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٩٧) وَمِنْ الأَعْرَابِ مَنْ يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمْ الدَّوَائِرَ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ التوبة/٩٧، ٩٨. باسی هەندێکیشیان بەچاکە دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ الأَعْرَابِ مَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَاتٍ عِنْدَ اللَّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ أَلاَ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَهُمْ سَيُدْخِلُهُمْ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ التوبة/ ٩٩.

بەڵام شارنشینەکان لەخەڵکی مەککەو مەدینە و ثقیف و بەشێکی زۆری یەمەن و بەحرەین ، ئیسلامەتی لەناویاندا زۆر بەهێز بوو ، گەورە هاوەڵان و پیاو ماقوڵانی موسوڵمانان لەواندا هەڵکەوتن[1] .

[1] / وتەیەکی (خضري بگ) و لە (محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية)دا هاتووە، ١٤٤/١.
بۆ درێژەی باسی ئەو وەفدانە، بڕوانە ( صحيح البخارى ٣١/١، ٦٢٦/٣، ٦٢٧، ٦٢٨، ٦٢٩، ٦٣٠) هەروەها (إبن هشام٢/ ٥٠١ ، ٥٠٢ ، ٥٠٣ ، ٥١٠ ، ٥١١ ، ٥١٢ ، ٥١٣ ، ٥١٤ ، ٥٣٧ ، ٥٣٨ ، ٥٣٩ ، ٥٤٠ ، ٥٤١ ، ٥٤٢ ، ٥٦٠ تا ٥٦١)،(زاد المعاد٣/ ٢٦ تا ٦٠)،(فتح البارى ٨/ ٨٣ تا ١٠٣)،(رحمة للعالمين١/١٨٤ تا ٢١٧).

## سەرکەوتن و کاریگەرێتی بانگەوازی ئیسلامیی

پێش ئەوەی باسی دواڕۆژەکانی ژیانی پێغەمبەری مەزن ﷺ بکەین ، پێویستە سەرلەبەر ، سەیرێکی ئەوکارە گەورەیەی بکەین کە کرۆکی ژیانی پێکهێنا بوو ، جیای دەکردەوە لە پێغەمبەرانی تر (علیهم السلام) ، تا خودای گەورە سەری بەرزو بڵند کرد بە تاجی سەروەرێتی سەرەتا و کۆتایی مرۆڤایەتی.

پێغەمبەر ﷺ لەلایەن پەروەردگارەوە فەرمانی پێدرا: ﴿ یاأیّها المزّمّل ، قُمْ اللیل إلا قَلیلا ﴾ هەروەها پێی وترا کە ﴿یاأیّها المُدّثر، قُمْ فأنْذر﴾ هەستا ، بەلام هەستانێك تا بیست ساڵی ڕەبەق نەحەسایەوە، باری گرانی ئەم پەیامە گەورەیەی هەڵگرت، خەمی ڕێنوێنی مرۆڤایەتی و چەسپاندنی بیروباوەڕو ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە دڵی پیرۆزیدا بوو.

ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی نغرۆکراوی نێو جاهیلیەتی لەئەستۆدا بوو ، ئەو جاهیلیەتەی دەست و قاچی ئەڵقە بەند کردبوون ، پێغەمبەر ﷺ ناخی پاککردنەوە لەو جاهیلیەتە ، ئەنجا دەستیدایە شەڕی بەرەی شیرك ، ئەوان دەیانویست ئەو بانگەوازە سەرکوت بکەن ، پێش ئەوەی ڕەگ دابکوتێت و لق و پۆپەکانی بالاّ بکەن ، هێشتا لە شەڕی ناودورگەی عەرەبی نەبووبوونەوە لەباکورەوە هەڕەشەیەکی گەورەتر پەیدابوو.

لەملاشەوە هێشتا شەڕی نێو دەروونەکان هێشتا تەواو نەبوو بوو ، ئەو شەڕەی تا ڕۆژی دوایی شەیتان درێژەی پێدەدات ، سەرمەشقەی خوداناسی و دەروون پاکیی موحەممەدی پێغەمبەرە ﷺ ، سەرۆکایەتی بەرەی جەنگ لەگەڵ شەیتان و بەرەی باکوورو بەرەی دەروندا دەکات ، بەئامۆژگاریە جوانەکانی دڵیان ئیمان پڕژێن دەکات ، بەهێزیان دەکات ، ڕایان دەگرێت .

لەنێوەندی نیوە شەودا هەڵدەستا ، خواپەرستی بۆ خوای خۆی دەکرد ، قورئانەکەی دەخوێند ، لەگەڵیدا دەشنایەوە هەروەکو پەروەردگارە مەزنەکەی فەرمانی پێدا بوو.[1]

بەو شێوەیە پێغەمبەری مەزن ﷺ بۆماوەی بیست ساڵ لەجەنگێکی بەردەوامی سەختدا ، بێ ئەوەی هیچ شتێك لەو ماوەیەدا بتوانێت چاوی پێکەلا بخات لەکارەکەی ، تا ئەوەبوو بانگەوازی ئیسلامیی سەرکەوتنێکی وەهای بە دەست هێنا عەقڵی مرۆڤەکانی سەرسام کرد ، هەموو دورگەی عەرەب سەریان بۆ نەوی کرد ، تەپوتۆزی جاهیلیەتی بەسەرەوە نەما ، عەقڵە نەخۆشەکان چاك

---

[1] / فی ظلال القرآن ٢٩/١٦٨،١٦٩

بوونەوەو وازیان لە بت پەرستی هێنا ، وایلێهات دەنگی یەکخواپەرستی لە هەمووولایەکدا دەنگی دەدایەوە ، بانگی یەکتاپەرستیو نوێژ خوێنی بەناو پانتایی بەرفراوانی بیاباندا پەخش بوەوەو ئەم باوەڕە نوێیە سەرلەنوێ زیندووی کردەوە ، قورئان خوێنان بڵاوەیان کرد بە سەرو خوارداو قورئانیان دەخوێندو خەڵکیان فێری ئەحکامەکانی ئایینی ئیسلام دەکرد.

خێڵ و تیرە جیاکان جارێکیتر یەکیان گرتەوە ، مرۆڤ لەجیاتی بت دەستی کرد بەخواپەرستی ، ئیدی بەهێزو بێهێز نەما ، ئاغاو کۆیلە نەما ، سەردەستی حاکم و ژێر دەستی مەحکوم نەما ، ستەمکارو ستەملێکراو نەما ، خەڵکی هەموویان بوونە بەندەی خوداوەند ، بوونە برای خۆشەویستی یەکتری و گوێڕایەڵی ئەحکامەکانی ئایینی خوا . خوای مەزن لەکەو خراپەی لە کۆڵ کردنەوەو فەخرو شانازی نەهێشت ، کەس شکۆیەتیی نەما بەسەر کەسێکی ترەوە ، هیچ عەرەبێك ڕێزی نیە بەسەر عەجەمێکداو هیچ عەجەمێك ڕێزی نییە بەسەر عەرەبێکدا ، سوور پێست ڕێزی نیە بەسەر ڕەش پێستدا مەگەر بە لەخواترسان ، خەڵك هەموویان ڕۆڵەی ئادەمن ، ئادەمیش خۆی لەگڵ دروست بووە.

بەو شێوەیە بەهۆی ئەم بانگەوازەوە یەکێتی عەرەبیو مرۆڤایەتی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی دروست بوو ، ئاسوودەیی مرۆڤایەتی لە کاروباری دونیاو ئاخیرەتدا هاتە کایەوە ، چەرخی ڕۆژگار گۆڕا ، چەرخانی زەویش گۆڕا ، ئاڕاستەی مێژوو ڕاست بوەوە ، عەقڵیەتی مرۆڤەکان گۆڕانی بەسەردا هات.

پێش بانگەواز گیانی نەفامی و ویژدانی بۆگەن دەسەڵاتیان پاوان کردبوو ، دڵ و دەروون ژەنگاویی بوو بوو ، هەموو بەهاکان پێوەرەکانیان تێك چوو بوو ، زوڵم و بێدادی بەر واڵا بوو ، شەپۆلێکی دونیاپەرستی و رابواردن لەسەر مافی خەڵك دونیای داگیر کردبوو، تاریکستانی کوفرو بێباوەڕی باڵی بەسەر هەموو جێیەکدا کێشابوو ، لەگەڵ بوونی ئایینە ئاسمانیەکانی تریشدا کە تووشی دەستکاری و دەست تێوەردان بوو بوون ، شکستیو لاوازیی سەری تێ کردبوون و توانای ئاڕاستەکردنی مرۆڤەکانیان نەمابوو ، بووبوونە کۆمەڵێك سروتی وشکی بێگیانو جوڵە.

کە ئەم بانگەوازە مەزنە هاتە کایەوەو بەڕۆڵی خۆی هەستا لەژیانی مرۆڤایەتیدا ، گیانی مرۆڤایەتی لە وەهمو ئەفسانەو کۆیلایەتی و فەسادو لادان و

پیسی و بەد رەوشتی رزگارکرد ، کۆمەڵگای مرۆڤایەتیشی لەستەمو دەست درێژی و لێکهەڵوەشان و هەرەس‌و چینایەتی‌و تاکرەوی‌و فەرمانڕەواو ملکەچی بۆ کاهینەکان رزگارکرد ، هەستا بە بنیاتنانەوەی دونیا لەسەر کۆمەڵێك بنەمای پاك‌و بێگەردو بەسوودو ئازادی‌و نوێ بوونەوەو مەعریفەو باوەڕو متمانەو ئیمان‌و دادپەروەری‌و رێزو کاری بەردەوام‌و دارشتنەوە بۆ گەشەپێدان‌و پێشخستنی ژیان و پێدانی ماف بە هەموو کەسێکی خاوەن ماف .[1]

بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە، دوورگەی عەرەبی ڕاچەنینێکی پیرۆزی وای بە خۆوە بینی ، کە لەسەرەتای دروست بوونیەوە شتی وای بەخۆوە نەبینیبوو ، هەرگیز ئەو بڵند بوونەوەو سەرکەوتنە مێژووییەی لە تەمەنی خۆیدا تۆمار نەکردبوو.

---

[1] / وتەیەکی (سید قطب)ە لە پێشەکی کتێبی (ماذا خسر العالم بإنحطاط المسلمین)دا هاتووە ، لاپەڕە/ ١٤.

# حەجیماڵئاوایی

هەموو کارەکانی بانگەوازو گەیاندنی پەیامی خودایی و بنیاتنانی کۆمەڵگای نوێ لەسەر چەسپاندنی یەکخوایەتی خواو نەفی بت پەرستیو پەیامداری محمد ﷺ تێرو تەواو بوو ، هەروەکو دەنگی نهێنی بێتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ و تێی بگەیەنێت کە ئیتر کاری لەم دونیایەدا تەواو بووە ، تا ڕادەیەك کە (معاذ)ی نارد بۆ یەمەن لەساڵی (١٠)ی کۆچیدا ، پێی فەرموو: ( ئەی معاذ ، لەوانەیە تۆ ساڵێکی تر من نەبینیتەوە ، لەوانەیە کە هاتیتەوە بێیتەوە ناو ئەم مزگەوتەی من و بەلای گۆڕەکەمدا ڕاگوزەر بکەیت). کە ( معاذ ) گوێی لەم وتەیە بوو، دەستی کرد بە گریان.

خوای مەزن ویستی وابوو کە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەرهەمی بانگەوازەکەی ببینێت ، ئەو بانگەوازەی لەپێناویدا بۆ ماوەی بیست ساڵ زەحمەتو دەردەسەری بینی ، ئێستا لە چواردەوری مەککەدا مەجلیسی گرتووەو چاوی بە وەفدی خێڵو تیرە عەرەبەکان دەکەوێت ، تا ئەحکامی حەڵاڵو حەرامەکانی ئایینی لێ وەربگرنو شایەتی ئەوەیان لێ وەربگرێت کە بەڕاستی سپاردەکەی گەیاندو ، پەیامەکەی ڕاگەیاندو ، ئامۆژگاری ئوممەتی کرد.

پێغەمبەر ﷺ مەبەستی هەبوو ، کە ڕایگەیاند دەیەوێت ئەو حەجە گەورەیە بکات ، خەڵکێکی زۆر ڕوویان کردە مەدینە ، هەموویان خوا خوایان بوو بگەن بە پێغەمبەر ﷺ و بەدوایدا بڕۆن.[1] ڕۆژی شەممە مانگی (ذی العقدة) هێشتا چوار ڕۆژی مابوو پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە کرد بۆ سەفەر[2]، قژی پیرۆزی شانە کردو چەوریی‌دا لەسەری و کراسو شەڕواڵی لەبەرکردو وشتەرەکەی ئامادەکرد بۆ قوربانی ، پاش نیوەڕۆ دەرچوو. پێش ئەوەی نوێژی عەسر بکات گەیشتە (ذا الحلیفة) ، لەوێدا بەدوو ڕکاتی کورتکراوە نوێژی عەسری کرد ، مایەوە تا بەیانی بۆ سبەینێ کە ڕۆژ بوەوە فەرموی بەهاوەڵەکانی: ئەمشەو یەکێك لای پەروەردگارمەوە تەشریفی هێناو فەرمووی: لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بکەو بڵێ: ئەمە عومرەیە لە حەجدا.[3]

---

[1] / (مسلم) ئەوەی لە (جابر)ەوە گێڕاوەتەوە. باب حجة النبيّ ١/٣٩٤.
[2] / (ابن حجر) بەشێوەیەکی چاك لێکۆڵینەوەی لەوەدا کردووە، لەگەڵ ڕاست کردنەوەی ئەوەی کە هاتووە گوایە مانگی (ذی القعدة) هێشتا پێنج ڕۆژی مابوو پێغەمبەر ﷺ، بڕوانە (فتح الباری) ٨/١٠٤.
[3] / (بخاری) ڕیوایەتی کردووە لە (عمر)ەوە ١/٢٠٧.

پێش ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ بکات ، خۆی شۆرد بۆ ئیحرام بەستن ، پاشان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) بەدەستی خۆی بۆنی خۆشی کرد بەجلەکانیداو بە بۆنی میسك پڕبۆنی کرد ، بەڕادەیەك پریشکی بۆنەکە بەدەمو چاوو ریشی پیرۆزەیەوە دیاربوو ، هەر پێوەی بوو نەیشۆرد ، پاشان کراس و بوردەکەی لەبەر کردو دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد ، ئەنجا لە نوێژگەکەی خۆیدا ئیهلالی عومرەو حەجی هاوجوتی کردو چووە دەرەوە ، سواری (قصواء) بوو، جارێکی تر ئیهلالی کرد . دەنگی بەرز کردەوە . کە لە (بیداء)یش سەقامگیر بوو جارێکی‌تر ئیهلالی کرد.

پاشان لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو تاگەیشتە نزیکی مەککە. لە (ذی طوی) مایەوە ، پاشان چووە ناو مەککەوە ، دوای ئەوەی کە نوێژی بەیانی کردو بۆ ڕۆژی یەك شەممە خۆی شۆرد ، چوار شەو لە (ذی الحجة)ی ساڵی (١٠)ی کۆچی تێپەڕی بوو. لە ڕێگە هەشت شەوی پێ چوو ، ئەمەش ماوە بڕینێکی مامناوەندی‌یە ، کە چووە ناو مزگەوتی حەرامەوە تەوافی کرد بەدەوری (بیت)داو سەفاو مەروەی کردو ئیحرامی نەکردەوە چونکە هەردووکیانی پێکەوە گرێدا بوو ، (هدی)یەکانیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو ، لە بەشی هەرە سەرەوەی مەککە لە (حجون) دابەزی ، لەوێ نیشتەجێ بوو، جگە لە تەوافی حەج هیچ تەوافێکی تری نەکرد.

فەرمانی‌دا بەوانەی کە (هدی)یان پێ نی‌یە ئیحرامەکەیان بکەن بە عومرە. تەوافی بەیت بکەن‌و سەفاو مەروە تەواو بکەن‌و، پاشان بەتەواوی ئیحرام بشکێنن ، دوودڵ بوون ، فەرمووی: ئەگەر بمزانیایە ئەم مەسەلەیە دەبێت (هدی)م نەدەکرد ، ئەگەر (هدی)یشم پێ نەبوایە ئیحرامم دەشکاند. ئەنجا ئەوانەی (هدی)یان پێ‌نەبوو ئیحرامیان شکاندو ، گوێڕایەڵیان کرد.

لە ڕۆژی هەشتی مانگی (ذي الحجة)دا . کە ڕۆژی تەرویەیە . ڕووی کردە (منی) لەوێ نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب‌و عیشاو بەیانیشی کرد . پێنج نوێژەکە . پاشان کەمێك مایەوەو تا خۆرهەڵهات. مۆڵەتی‌دا هەتا چوونە عەرەفە ، بینی گومەزیەکەی لە (نمرة) بۆ دانراوە ، لەوێ دابەزی ، کە لەنێوەڕاستی ئاسمان لاچوو فەرمانی‌دا (قصواء)ی بۆ ڕێکخرا ، هاتە ناو شیوەکەوە ، سەدو بیست‌و چوار هەزار یان سەدو چل‌و چوار هەزار کەسی بەدەوردا خڕ بوەوە ، گوتارێکی بۆدان ، ئەم وتە بەنرخەی بۆ خوێندنەوە:

( خەڵکینە ، بە گوێم بکەن ، چونکە نازانم لەوانەیە ساڵێکیتر لەم شوێنە پیرۆزەدا هەرگیز نەتانبینمەوە )[1]

( خوێن و ماڵ و سامانتان لە یەکتری حەرامە وەکو حەرامی ئەم ڕۆژەتان ، لەم مانگەتانداو لەم شوێنەتاندا ، هەموو کارێکی جاهیلیەت دەخەمە ژێر پێمەوە ، خوێنە ڕژاوەکانی سەردەمی جاهیلیەت مافی داواکردنیان نییە ، یەکەم خوێنێك کە ئەو مافەی لێ دەسەنمەوە ، خوێنی ( ابن ربیعة )ی کوڕی ( حارث )ە ـ کە شیرەخۆری ( بنی سعد ) بوو ( هذیل ) کوشتی ، سووی جاهیلیەت ناهەقە ، یەکەم سوویەکیش کە بەناهەقی دادەنێم سووی ( عباس )ی کوڕی ( عبد المطلب )ە ، ئەمانە هەمووی ناهەقن ).

( ئاگاتان لە ژنان بێت و لە خوا بترسن ، ئێوە بە پەنادانی خودایی ئەوانتان کردووە بە حەلاڵی خۆتان ، بە وتەیەکی خوایی داوێنیانتان ڕەوا کردووە ، مافی ئێوەیە بەسەریانەوە کەسێك نەهێننە سەرجێگەیان ، ئێوە پێتان ناخۆش بێت ، ئەگەر وایانکرد بەلێدانێك برینداری نەکات لێیان بدەن ، مافی ئەوانە بەسەر ئێوەوە کە ڕۆزی و کالاّیان بۆ دابین بکەن ).

( شتێکم لەناوتاندا بەجێهێشتووە ئەگەر دەستی پێوە بگرن سەرتان لێ ناشێوێت ، ئەویش پەڕاوی خوایە ).[2]

( خەڵکینە ، دوای من پێغەمبەری تر نایەت ، دوای ئێوەش ئوممەتێکیتر نییە ، پەروەردگاری خۆتان بپەرستن ، پێنج نوێژەکەتان بکەن ، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن ، زەکاتی ماڵ و سامان بدەن ، بەخۆڕایی خۆتان و حەزی دڵتان بیدەن، حەجی ماڵی خوا بکەن ، بەگوێی فەرمانڕەواکانتان بکەن ، ئەوسا دەڕۆنە بەهەشتی پەروەردگارتانەوە ).[3]

( ئێوەش لەبارەی منەوە پرسیارتان لێ دەکرێت ، چی دەڵێن ؟

وتیان : دەڵێین شایەتی دەدەین کە تۆ پەیامت گەیاندو بەئەرکی خۆت هەستاویت و ئامۆژگاریت کردین ).

ئەنجا پەنجەی شایەتومانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و نزمی کردەوە بۆ زەوی و فەرمووی : خوایە شایەتی بفەرموو . ئەمەی سێ جار وتەوە .[4]

---

[1] / ابن هشام ٢/٦٠٣.

[2] / صحیح مسلم، باب حجة النبي ﷺ، ١/٣٩٧.

[3] / معدن الاعمال، (ابن ماجه) و (ابن عساکر) ریوایەتیان کردووە، (رحمة للعالمین) ١/٢٦٢.

[4] / مسلم ١/٣٩٧.

ئەو کەسەی لە عەرەفەدا بەدەنگی وتەکانی پێغەمبەری ﷺ ، بۆ خەڵکەکە دەوتەوە ، ( ربیعە )ی کوڕی ( أمیە )ی کوڕی ( خلف ) بوو.[1]

پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە خوتبەکەی بوەوە ، ئایەت هاتە خوارەوە ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ﴾ المائدة/٣. کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) گوێی لەخوێندنەوەی ئەم ئایەتە بوو ، دەستی کرد بە گریان ، پێیان وت بۆ دەگریت؟

وتی: دوای تێرو تەواو بوون ئیتر ناتەواوی دێت.[2]

دوای خوتبەکە بیلال بانگیداو قامەتی کرد ، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکەکە کرد ، پاشان قامەتی کردو نوێژی عەسریشی بۆ کردن ، لەو نێوەندەدا هیچ نوێژێکی نەکرد ، پاشان سواری وشترەکەی بوو تاچووە (موقف) ، سکی وشترەکەی لە ڕووی بەردەڵانەکەوە بوو ، شاخی (مشاة)یش لەبەردەمیەوەو خۆیشی ڕووی کردە قیبلە ، بەو شێوەیە وەستا هەتا خۆرئاوا بوو ، میلی خۆر نەماو زەردەپەڕیش تاریك بوو، (اسامة)ی خستە دوای خۆیەوە ، ڕۆیشت تاگەیشتە (مزدلفة) ، بەیەك بانگو دوو قامەت نوێژی مەغریبو عیشای بەکورتی کرد ، لە نێوانیاندا تەسبیحاتی نەکرد ، پاشان پاڵکەوت هەتا بەرەبەیان ، بەرەبەیان نوێژی کرد تا بەبانگو قامەتەکەدا نوێژی بەیانیش کاتی هات ، پاشان سواری (قصواء) بوو ، هەتا گەیشتە (المشعر الحرام) ، ڕووی کردە قیبلە ، پاڕایەوەو تەکبیری کردو ( لا إله إلا الله )ی کرد ، هەروا مایەوە تا بەتەواوی ماندو شەکەت بوو.

لە (مزدلفة)ەوە هات بۆ (منی) پێش ئەوەی خۆرهەڵبێت ، ئەنجا (فضل)ی کوڕی (عباس)ی خستە پشتەوەی خۆی تا گەیشتە ناو (محسر) ، کەمێك جوڵا، پاشان ئەو ڕێگە ناوەڕاستەی گرت کە دەچێتەوە سەر (الجمرة الكبری) ، تا هاتە ئەو (جمرة)یەی لای درەختەکەدایە . کە بریتیە لەخودی (الجمرة الكبری) ، لەوکاتەدا درەختێکی لەپاڵدا بووە ، ناویشی (جمرة العقبة) و (الجمرة الأولی)یە . بەحەوت زیخە بەرد ڕەجمی کرد، لەگەڵ هەڵدانی هەریەك لە دەنکە زیخەکە (الله اكبر)ی دەکرد ، لەناو شیوەکەوە ڕەجمی کرد، پاشان چوو بۆ قوربانیگەکە ،

[1] / ابن هشام ٦٠٥/٢.
[2] / بوخاری ریوایەتی کردووە لە (ابن عمر)ەوە، بڕوانە (رحمة للعالمین) ٢٦٥/١.

بەدەستی خۆی (٦٣) وشتری کرد بەقوربانی ، پاشان ئەوی تری دایە دەست (علی) کە (٣٧) وشتر بوو، سەد دانەی تەواوکردو لە (هدی) یەکەشدا کردیە هاوبەش، پاشان فەرمانیدا کە لە هەر وشترێك پارچەیەکی لێ بکرێتەوەو لە مەنجەڵدا بکوڵێنرێت ، هەردووکیان لێیان خواردو لە شلەکەشیان خواردەوە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ سواربوو تەوافی (إفاضة)ی کرد ، لە مەککە نوێژی نیوەڕۆی کرد ، چوە لای (بنی عبدالمطلب) لەسەر ئاوی زەمزەم ئاویان هەڵدەگۆزی ، فەرمووی: بنو (عبد المطلب) دەربهێنن ، منیش ئەگەر خەمی ئەوەم نەبوایە کە زێوانیەکەتان لە دەست بچێت ئەوا لەگەڵ ئێوەدا دەردەچووم . شەربەیەك ئاویان بۆ گرت و لێی خواردەوە.[1]

لەرۆژی قوربانیشدا پێغەمبەر ﷺ رۆژی (١٠)ی ذي الحجة . کە چێشتەنگاو بەرز بووەوە گوتاریدا، لەسەر هێسترێکی سپیبوو (علی)یش دەیوتەوە ، خەڵکەکەش هەندێکیان بەپێوە ڕاوەستابوون و هەندێکیشیان دانیشتبوون ، لەو گوتارەیدا هەندێك شتی گوتارەکەی دوێنێی دووبارە کردەوە ، هەردوو شێخەکە لە (ابی بکرە)ەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی نەحر گوتاری بۆ داین ،

فەرمووی: ڕۆژگار وەرچەرخاوەتەوە وەکو ئەو ڕۆژەی خودای مەزن ئاسمان و زەمینی بەدی هێنا ، ساڵ دوانزە مانگە چواریان حەرامن ، سیان لەو چوارە بەدوای یەکدا دێن (ذو القعدة) و (ذو الحجة) و (محرم) ، (رجب)یش کە دەکەوێتە نێوان (جمادی دووەم) و (شعبان)ەوە.

ئەنجا فەرمووی: (ئەمە چ مانگێکە؟

وتمان: خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن .

بێدەنگ بوو تا وامانزانی ناوێکی تری لێدەنێت ، فەرمووی: ئەمە مانگی (ذي الحجة) نییە؟

وتمان: بەڵێ .

فەرمووی: ئەی ئەم شوێنە کوێیە؟

وتمان: خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن. بێدەنگ بوو، وامانزانی ناوێکی تری لێدەنێت.

فەرمووی : ئەمە (بلد الحرام) نییە؟

---

[1] (مسلم) ریوایەتی کردووە لە (جابر)ەوە، باب حجة النبي ( ﷺ ) ١/٢٩٧، ٢٩٨، ٢٩٩، ٤٠٠.

وتمان: بەڵێ.

فەرمووی: ئەمە چ ڕۆژێکە؟

وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. بێدەنگ بوو تا وامانزانی ناوەکەی دەگۆڕێت.

فەرمووی : ئەمە ڕۆژی قوربانی نییە؟

وتمان: بەڵێ .

فەرمووی: ئێوە خوێن و ماڵ و سامان و شەرەف و ناموستان لەسەر یەکتری حەرامە وەکو حەرامی ئەو ڕۆژەتان ، لەم بەلەدەتان و لەم مانگە حەرامەتاندا).

**( ڕۆژێك دەگەنەوە بە پەروەردگاری خۆتان ، لەبارەی کردەوەکانتانەوە پرسیارتان لێ دەکات ، نەکەن لە دوای من گومڕا ببنەوەو بدەن لە ملی یەکتر ).**[1]

ئەرێ بانگەوازم گەیاند؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: خوایە خۆت شاهید بە . خەڵکینە بائەو کەسەی ئامادەیە بیگەیەنی بەو کەسەی لێرە نییە ، لەوانەیە پێڕاگەیەنراوێك هۆشیارتر بێت لە گوێگرێك.[2]

لەگێڕانەوەیەکدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ لەو وتارەدا فەرموویەتی: (هەر تاوانبارێك ئەگەر تاوانی کرد با دەرهەقی خۆی بیکات ، با کەس گوناه دەرهەقی ڕۆڵەکەی نەکات ، ڕۆڵەیەکیش بەرامبەر باوکی نەیکات ، بزانن کە شەیتان نائومێد بووە لەوەی ئەم بتانە لە وڵاتی ئێوەدا بپەرسترێن ، بەڵام دەشێت کە ئێوە لە هەندێك کاردا کە بەکەمی دەزانن بەگوێی ئەو بکەن ، ئەویش پێی ڕازی دەبێت).[3]

ڕۆژانی (تەشریق)یش لە (مینا) مایەوە بۆ ئەنجامدانی مەناسیکەکان و فێرکردنی شەریعەت و یادخستنەوە بە ترسی خوایی ، سوننەتەکانی (هدی) میللەتی ئیبراهیمی بەرقەرار دەکرد ، ئاسەوارو دروشمەکانی بتپەرستی دەسڕیەوە ، لەچەند ڕۆژێکی (تەشریق)یشدا وتاری خوێندەوە، (ابو داود) بەئیسنادێکی باش

---

[1] / (ابو داود) ئەوەی ریوایەت کردووە، باب (اي وقت يخطب يوم النحر) ١/ ٢٧٠.

[2] / صحيح البخاري، باب الخطبة أيام منى ١/ ٢٣٤.

[3] / ترمذي ریوایەتی کردووە ٢/ ٣٨، ١٣٥، (ابن ماجة) لە (الحج)دا، (مشكاة المصابيح) ١/ ٢٣٤.

دەگێڕێتەوە لە (اسراء)ی کچی (نبهان)ەوە دەڵێت: لە ڕۆژی قوربانیەکەدا پێغەمبەر ﷺ گوتارێکی بۆ داین، فەرمووی: ئەمە ناوەڕاستی ڕۆژانی (تەشریق) نىیە؟[1] گوتارەکەشی لەو ڕۆژەدا لە گوتاری ڕۆژی (نحر) دەچوو ، ئەو گوتارە کەوتە دوای دابەزینی سورەتی (النصر).

لە ڕۆژی (نحر)ی دووەمدا . سیانزەی مانگی (ذي الحجة) . پێغەمبەر ﷺ مینای بەجێهێشت ، لە (خیف)ی (بني كنانة)ی (أبطح) دابەزی ، ڕۆژەکەی لەوێ بەسەر بردو شەوەکەش مایەوە ، هەرلەوێ نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشای کرد ، پاشان ڕاکشا ، ئەنجا سواربوو بەرەو (بيت) هاتەوە، تەوافی خوا حافیزی کرد.

کە لە مەناسیکەکانی بوەوە ، داوای لەخەڵکی کرد کە بارگە بپێچنەوە بەرەو مەدینەی منەوەرە ، نەك بۆ ئەوەی کەمێك بحەوێتەوە ، بەڵکو بۆ ئەوەی سەر لەنوێ خەبات و زەحمەتکێشان دەست پێبکاتەوە لەپێناوی خوادا.[2]

---

[1] / ابو داود، (باب اي يوم يخطب بمنى) ٢٦٩/١.

[2] / بڕوانە بۆ درێژی حەج کردنی پێغەمبەر ﷺ (صحیح البخاری) (کتاب المناسك) ج١و٢/ ٦٣. هەروەها (صحيح مسلم) باب حجه النبی ﷺ وفتح الباری ج٣ لە شەرحی (کتاب المناسك) ج٨/١٠٢ تا ١١٠ و، (ابن هشام) ٢/ ٦٠١ تا ٦٠٥و، (زاد المعاد) ١٩٦/١ تا ٢٤٠.

## دواین نێرراو

ئەو ملهوڕیەی دەوڵەتی ڕۆم هەیبوو ماکی مانەوەی لەژیاندا پێ نەمابوو ، هەر شوێنکەوتوویەکی باوەڕی بهێنایە بە ئیسلام بەردەوامی ژیانی بۆ نەدەنوسراو دەیانکوشت ، هەروەکو (فروة)ی کوڕی (عمرو)ی (جذامی)یان شەهید کرد کە والی ڕۆمەکان بوو بەسەر (معان)ەوە.

بەهۆی ئەو زات کردن و ملهوڕیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی گەورەی ڕێکخست لەمانگی (صفر)ی ساڵی ۱۱ی کۆچیدا)و (اسامە)ی کوڕی (زید)ی کردە سەرکردەی سوپاکە ، فەرمانی پێدان کە سمی وڵاخەکانیان بگەیەننە سنوورەکانی (بلقاء) و (داروم) لە فەلەستین ، بەمەبەستی گێڕانەوەی متمانە بۆ دڵی ئەو عەرەبانەی سەر سنووری ڕۆم کە باوەڕیان هێنابوو بەئاینی ئیسلام ، تاکەس وانەزانێت تۆقاندنو ئەشکەنجەدانی کڵێسا هیچ لێپرسینەوەیەکی نیە ، واتێنەگەن کە هەرکەسێك باوەڕی بە ئیسلام هێنا چارەنووسی لەناوچونە.

خەڵکی بوو بەمقۆمقۆیان لەمەسەلەی کەم تەمەنی (اسامە)دا بۆ سەرکردایەتی سوپاکەو دەستی دەستیان کرد لە ناردنیدا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر تانە دەدەن لە میرایەتی ئەو ، پێشتریش تانەتان دەدا لە میرایەتی باوکی ، سوێندم بەخودای مەزن ئەو پیاوە شایستە بوو بۆ میرایەتی ئێوە ، خۆشەویسترین کەسیش بوو لەدڵی مندا، ئەم کوڕەش لەدوای باوکی لە هەموو کەس خۆشەویسترە لەلام.[1]

ئەنجا خەڵك لەدەوری (أسامە) کۆبوونەوە ، لەریزی سوپاکەیدا خۆیان ڕێکخست ، تادەرچوون و گەیشتنە ناوچەی (جرف) کە فرسەخێ لەمەدینەوە دوورە ، بەڵام هەواڵی نەخۆش کەوتنی پێغەمبەر ﷺ ناچاری کردن چاوەڕوان بن تابزانن خوای مەزن چی دەکات" ، ویستی خواوەندیش وەهابوو کە ئەم سوپایە یەکەم نێرراوی سەردەمی جێنشینایەتی (ابوبکر)ی (صدیق) بێت.[2]

---

[1] / صحيح البخاري، باب بعث النبي ( ﷺ ) اسامه، ٦١٢/٢.

[2] / هەمان سەرچاوەی پێشوو، (ابن هشام)، ٦٠٦/٢، ٦٥٠.

# گەڕانەوە بەرەو لای خوداوەند

## پێشهاتەکانیماڵئاوایی

که بانگەواز تێروتەواو بوو ، ئیسلام بەتەواوی باڵادەست بوو ، وردە وردە پێشهاتەکانی ماڵئاوایی کردن لە ژیانو مرۆڤ لە هەستو نەستی پیرۆزیدا دەردەکەوت ﷺ ، لە وشەو گوفتارەکانیدا ڕەنگی دەدایەوە.

لەمانگی (ڕەمەزان)ی ساڵی (١٠)ی کۆچیدا بۆ ماوەی بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد ، لەکاتێکدا پێشتر تەنها دە ڕۆژ ئیعتیکافی دەکرد ، جبریل عليه السلام دووجار قورئانی لەگەڵ دەخوێندەوە ،

لەحەجی ماڵئاواییشدا فەرمووی : لەوانەیە ساڵێکیتر من لەم شوێنەدا نەتانبینمەوە ،

لەکاتی (جمرة العقبة)شدا فەرمووی : مەناسیکی حەجی خۆتان لە منەوە وەربگرن ، چونکە لەوانەیە ساڵێکی تر من حەج نەکەم.

لە ڕۆژەکانی تەشریقدا بوو کە سورەتی (نصر)ی بۆ هاتە خوارەوە ، ئیتر زانرا کە ئەوە ماڵئاواییەو هەواڵی خواحافیزی پێدراوە.

لە سەرەتای مانگی (صفر)ی ساڵی ١١ی کۆچیدا) پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چووە دەرەوە بۆ کێوی ئوحود ، نوێژی لەسەر شەهیدەکان کرد وەکو خواحافیزی زیندووان بۆ مردووان ، پاشان چووە سەر مینبەرو فەرمووی:

خەڵکینە ، من پێشڕەفتی ئێوەم ، شایەتیتان بۆ دەدەم ، سوێند دەخۆم بەخوای گەورە ئێستا (حوض) دەبینم ، من کلیلی خەزێنەکانی زەویم پێدراوە ، یان فەرمووی کلیلی زەویم پێدراوە ، وەڵلاهی من لەوە ناترسم کە دوای من هاوەڵ بۆ خوا پەیدا بکەن ، بەڵام لەوە دەترسم کێبڕکێ بکەن لەگەڵ یەکتریدا.[1]

لەنیوە شەوێکیشدا تەشریفی چووە دەرەوە بۆ لای گۆڕستانی (بقیع) ، پێی فەرموون: سلاوتان لێ بێت ئەی خەڵکی گۆڕستان ، ئەوەی ئێوەی تێدان گەلێ خۆشترە لەوەی خەڵکی تێدایە ، ئەوا ئاشووب ڕووی کردۆتە دونیا وەکو تارمایی شەوی دەیجور ، بەدوای یەکدا دێن ، ئاشووبی دوایین لە یەکەمین خراپترە . ئەنجا مژدەی پێدان و فەرمووی : ئێمەش بەدوای ئێوەدا دێین.

---

[1] / متفق علیە، صحیح البخاري، ٢/٥٨٥.

## سەرەتای نەخۆشکەوتن

لە ڕۆژی بیست و نۆی مانگی (صفر)ی ساڵی ١١ی کۆچیدا ـ ڕۆژی دوو شەممە بوو ـ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جەنازەی مردوویەکدا لەگۆڕستانی (بقیع) بوو، کە گەڕایەوە ـ لە ڕێگەدا ـ تووشی سەر ئێشە بوو، تایەکی قورس گرتی ، بە شێوەیەك تەڕایی جواناوی نێوچەوانی بەسەر پەڕۆکەی سەریشیەوە دیار بوو.

پێغەمبەر ﷺ بەنەخۆشیەکەی (١١) ڕۆژ نوێژی کرد بۆ موسوڵمانان ، لەکاتێکدا کە هەموو ڕۆژەکانی نەخۆشیەکەی (١٣) یان (١٤) ڕۆژ بوو.

## دوا هەفتە

نەخۆشی زۆری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا ، وای لێ هات دەیپرسی لە ژنەکانی: ئەرێ من سبەینێ لەکوێ دەبم؟ من سبەینێ لەکوێ دەبم؟ ژنەکان لەقسەکانی تێگەیشتن ، مۆڵەتیان دایە کوێی پێخۆشە لەوێ بێت ، چووە ماڵی (عائیشە) ، (فضل)ی کوڕی (عباس) و (علی) کوڕی (أبو طالب) چوونە ژێرباڵی ، سەری بەستبوو قاچەکانی بەحاڵ دەجولا تاگەیشتە ماڵی (عائیشە) ، دوایین هەفتەی ژیانی لە ماڵەکەی عائیشەدا بەسەر برد.

عائیشە ئەو دوعاو ویردانەی دەخوێند کە کاتی خۆی لە پێغەمبەرەوە ﷺ فێری بوو بوو لەبەری کردبوو ، فووی دەکرد بەخۆیداو ، بەمەبەستی بەرەکەت دەستیشی دەهێنا بەسەر پێغەمبەر ﷺ.

## پێنج ڕۆژ پێش وەفات کردنی پێغەمبەر ﷺ

ڕۆژی چوارشەممە پێنج ڕۆژ پێش وەفاتکردنی پێغەمبەر ﷺ ، تاکەی پێغەمبەر ﷺ زیادی کردو ئازارەکەی زۆربوو لەهۆش خۆی چوو ، فەرمووی: حەوت شەربە ئاوم بەسەردا بکەن لەچەند بیرێکی جیاواز بن ، تا بڕۆمە دەرەوە لەگەڵیاندا دانیشم. لەسەر شۆرگەکە دایان نیشاند ، ئاوەکەیان کرد بەجەستەیدا ، تا فەرموی: بەسە ، بەسە.

لەوێدا هەستی کرد بەچاك بوون ، تەشریفی چووە مزگەوت - سەری بەستبوو - تا لەسەر مینبەر دانیشت ، گوتاری خوێندەوە - خەڵك لە خزمەتیدا دانیشتبوون - فەرمووی: (نەفرەتی خوا لەجولەکەو نەسرانی، چونکە گۆڕی

پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت) ، لەریوایەتێکیشدا هاتووە (خوا جولەکەو نەسرانی بکوژێت چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت)[1]، هەروەها فەرمووی: (گۆڕەکەی منیش مەکەنە بتێك بۆ پەرستن)[2].

ئەنجا ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ هەر مافێکی تۆڵەسەندنەوە ئەگەر هەبێت و فەرمووی: (هەرکەسێك دارم دابێت لە پشتی ، فەرموو ئەوە پشتی منە با تۆڵەی خۆی بکاتەوە).

پاشان دابەزی و نوێژی نیوەڕۆی کرد ، ئەنجا گەڕایەوەو لەسەر مینبەر دانیشت و گەڕایەوە سەر ئەو وتارەی کە لەبارەی دووبەرکیەوە فەرموو بووی ، کابرایەك وتی: من سێ درهەمم لەلای تۆیە. فەرمووی: ئادەی (فضل) بیدەرەوە.

پاشان وەسێتی کرد بەچاك مامەڵەکردن لەگەل ئەنسارداو فەرمووی:

( وەسێتتان بۆ دەکەم چاك بن لەگەل ئەنسار ، چونکە ئەوە پشتو پەنای منن ، ئەوەی لەسەریان بوو کردیان ، ماوەتەوە ئەوەی کە پێویستە پێیان بدرێت ، چاکەی چاکەکاریان قەبوڵ بکەن ، چاوپۆشی بکەن لەخراپەی خراپەکاریان) ، لە ریوایەتێکی تریشدا هاتووە ، کە فەرموویەتی (خەڵك زۆر دەبن ، ئەنسارەکان کەم دەبنەوە ، تاوەکو خوێی چێشتیان لێ دێت ، هەرکەسێك لەئێوە کارێکی کەوتە دەست زیانی تێدا بێت بۆ کەسێك یان قازانجێکی پێبگەیەنێت ئەوا لە چاکەکارەکەیان قەبوڵ بکات و چاوپۆشی لە خراپە کارەکانیان بکات )[3].

پاشان فەرمووی: (بەندەیەك ، خوای گەورە ڕای داوەتە دەست خۆی لەوەدا کە گوڵێکی ماڵی دونیا بەخواستی خۆی هەڵگرێت ، لەگەڵ ئەو نازو نیعمەتەدا کەلای خۆی هەیە ، بێگومان ئەوەیانی هەڵبژاردووە کەلای خوایە).

(أبو سعید)ی (خدری) دەڵێت: (ابوبکر) گریا ، وتی: باوك و دایکمان دەکەینە قوربانی تۆ ، ئێمە سەرمان سوڕماوە لەوە ، خەڵك وتیان ، سەیری ئەو ریش سپیە بکەن. پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بەندەیەك دەدا کە خوا ڕای داوەتە دەستی لەوەدا کە گوڵێکی دونیای پێداوەو ، لەنێوان ئەوەدا کەلای خوایە ! ئەوە دەڵێت:

---

[1] / صحيح البخاري ٦٢/١ ، موطأ الإمام مالك ص٣٦٠.
[2] / موطأ الإمام مالك ص٦٥.
[3] / صحيح البخاري ، ٥٣٦/١.

باوك‌و دایكمان به‌قوربانت بێت له‌ڕاستیدا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌و كه‌سه‌ بوو كه‌ ڕاكه‌ی درابووه‌ ده‌ست و ئامادەبوو بۆ كۆچی دوایی پێغه‌مبه‌ر ﷺ . ئه‌بوبه‌كر هه‌واڵی پێدابن.[1]

پاشان فه‌رمووی: متمانه‌ پێكراوترین كه‌سێك لای من له‌ هاوه‌ڵێتی‌و ماڵ‌و ساماندا (أبوبكر)ه‌ ، خۆ ئه‌گه‌ر من جگه‌ له‌خوا خۆشه‌ویستێكی ترم هه‌ڵبژاردایه‌ (ابوبكر)م هه‌ڵده‌بژارد ، به‌ڵام ئه‌مه‌ ته‌نها برایه‌تی‌و خۆشه‌ویستیی ئیسلامه‌ ، هه‌موو ئه‌و ده‌رگایانه‌ش دێنه‌ سه‌ر مزگه‌وت دایخه‌ن ، جگه‌ له‌ ده‌رگای (ابوبكر).[2]

## پێش چوار ڕۆژ

ڕۆژی پێنج شه‌ممه‌ چوار ڕۆژ پێش وه‌فاتی فه‌رمووی ـ له‌و كاته‌دا ئازار زۆری بۆ هێنابوو ـ وه‌رن با نوسراوێكتان بۆ بنوسم كه‌ له‌دوای ئه‌وه‌ تووشی سه‌رلێشێواوی نه‌بن ـ له‌ناو ماڵه‌كه‌دا (عمر)و چه‌ند پیاوێكی‌تر دانیشتبوون ـ عمر وتی: به‌خوا ئازاره‌كه‌ زۆری بۆ هێناوه‌ ، ئێوه‌ قورئانتان له‌لایه‌ ، په‌ڕاوی خوا به‌سه‌ . ئال‌و به‌یت جیاوازیان بۆ دروست بوو ، بوو به‌ قسه‌و باسیان ، هه‌ندێكیان وتیان: نزیك ببنه‌وه‌ با پێغه‌مبه‌ر ﷺ بۆتان بنوسێت . هه‌ندێكیشیان ئه‌وه‌ی (عمر)یان ده‌وته‌وه‌. كه‌ بوو به‌ ده‌نگه‌ ده‌نگیان ، فه‌رمووی: هه‌ستن بڕۆنه‌ ده‌ره‌وه‌.[3]

له‌و ڕۆژه‌دا وه‌سیه‌تی به‌ سێ شت كرد: وه‌سیه‌تی كرد جوله‌كه‌و نه‌سرانی‌و موشریكان له‌ دورگه‌ی عه‌ره‌بدا بكرێنه‌ ده‌ره‌وه‌ ، وه‌سیه‌تیشی كرد به‌مۆڵه‌تدانی سه‌ردانی وه‌فده‌كان هه‌روه‌كو خۆی مۆڵه‌تی دابوو، بۆ وه‌سێتی سێیه‌میش ڕاوی فه‌رمووده‌كه‌ له‌بیری چوو ، له‌وانه‌یه‌ وه‌سیه‌ت بێت ده‌ست گرتن به‌ قورئان و سوننه‌ته‌وه‌ ، یان به‌ڕێكردنی سوپاكه‌ی ئوسامه‌ ، یان وتی نوێژو پاراستنی مافی موڵكی یه‌مین.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌گه‌ڵ ئه‌و ئازاره‌ زۆره‌دا كه‌ هه‌یبو هه‌موو نوێژه‌كانی ده‌كرد بۆ خه‌ڵك تا ئه‌و ڕۆژه‌ ـ واته‌ ڕۆژی پێنج شه‌ممه‌ پێش چوار ڕۆژ پێش وه‌فاتی ـ ئه‌و ڕۆژه‌ نوێژی مه‌غریبی بۆ كردن‌و ، سوره‌تی (المرسلات)ی تێدا خوێند.[4]

---

[1] / متفق عليه، مشكاة المصابيح ٥٤٦/٢.

[2] / متفق عليه، مشكاة المصابيح ٥٤٨/٢ ، صحيح البخاري ٢٢/١، ٤٢٩، ٤٤٩ ، ٦٣٨/٢.

[3] / بوخاری ریوایه‌تی كردووه‌ له‌ (أم فضل)ه‌وه‌، باب مرض النبي ( ﷺ ) ٦٣٧/٢.

[4] / متفق عليه، مشكاة المصابيح ١٠٢/١.

له عيشادا سەختی نەخۆشیەکەی زیاتری کرد ، بەشێوەیەك نەیتوانی لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە ، عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە خەڵك نوێژیان کرد؟

وتمان: نەخێر پێغەمبەری خوا ، ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن.

فەرمووی: ئاوم لەسەر شۆرگەکە بۆ دابنێن ، ئاومان بۆ دانا ، خۆی شۆردو ، ئەنجا گوڕی دایە خۆی هەستێتەوە کەوتو لەهۆش خۆی چوو ، پاشان هۆشی هاتەوە ، فەرمووی: خەڵك نوێژیان کرد؟

ئەنجا بۆ جاری دووەمو سێیەم وەکو جاری یەکەم کەوتەوە ، هەر کە دەیویست گوڕ بدا بەخۆی و هەستێت لە هۆش خۆی دەچوو ناردی بەشوێن (ابوبکر)دا کە نوێژ بۆ خەڵکی بکات ، (أبوبکر) نوێژی هەموو ئەو ڕۆژانەی کرد بۆ خەڵك[1] ، حەڤدە نوێژی لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ بۆ موسوڵمانان کرد.

عائیشە سێ یان چوار جار چووەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، بۆ ئەوەی (ابوبکر) پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە نەکات ، تا خەڵك بەو هۆیەوە ڕەشبین نەبن ، ڕازی نەبوو ، فەرمووی: ئێوەش دەستە خوشکی ژنەکانی سەردەمی (یوسف)ن ؟ بڵێن با (ابوبکر) پێش نوێژی بۆ خەڵك بکات.

## پێش ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ

ڕۆژی شەممە بوو یان یەك شەممە پێغەمبەر ﷺ هەستی بە بارسووکی کرد ، دوو پیاو چوونە ژێر باڵی و چوو بۆ نوێژی نیوەڕۆ ، (ابوبکر) پێش نوێژی دەکرد بۆ خەڵك ، کە پێغەمبەر ﷺ ی بینی ویستی بکشێتە دواوە ، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە بەردەوام بێت . فەرمووی: لە پاڵ (ابوبکر)دا دامنیشێنن ، لای دەستی چەپی (ابوبکر)ەوە دایانیشاند ، (ابوبکر) وەکو پێغەمبەر ﷺ نوێژی بۆ کردن ، خەڵکی گوێیان لە تەکبیرەکانی بوو.[2]

## پێش ڕۆژێك

ڕۆژێك پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ - ڕۆژی یەك شەممە - غولامەکانی ئازاد کرد ، حەوت دیناری هەبوو هەمووی کرد بەخێر ، چەکەکانیشی کرد بەسەدەقە بۆ موسوڵمانان ، لە شەوەکەیدا (عائیشە) زەیتی لە دراوسێکەی خواست بۆ چرا هەڵکردن ، قەڵغانەکەشی بارمتە بوو لای جولەکەیەك بە سێ مشت جۆ.

---

[1] / صحيح البخاري ٥٦/١.

[2] / صحيح البخاري ٩٨/١، ٩٩.

## دوا ڕۆژەکانی تەمەنی پێغەمبەر ﷺ

(أنس) لە (مالك)ەوە دەگێڕێتەوە:

ڕۆژی دووشەممە لەکاتێکدا کە موسوڵمانان لە نوێژی بەیانیدا بوون – (ابوبکر) پێش نوێژی بۆ دەکردن – لەپڕێکدا پێغەمبەر ﷺ پەردەی ژوورەکەی (عائیشە)ی لادا کە دەیڕوانیە ناو حەرەمی مزگەوت سەیرێکی کردن ، لەکاتێکدا ئەوان نوێژیان دەکرد ، پاشان زەردەخەنەیەکی جوانی بۆ کردن ، ئەبوبەکر هەنگاوی نا بێتە دواوە بۆ ناو ریزی نوێژکەرەکان ، وایزانی پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت بێت بۆ نوێژ .

(أنس) دەڵێت: خەریکبوو موسوڵمانان نوێژەکەیان ببڕن لەخۆشی هاتنی پێغەمبەر ﷺ ، بەدەستی پیرۆزی ئیشارەتی کرد کە نوێژەکەتان تەواو بکەن ، ئەنجا پەردەکەی دادایەوەو چووەوە ژوورەوە[1]. دوای ئەوە ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئامادەی نوێژی تر نەبوو.

کە خۆری چێشتەنگاو بەرزبوەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ (فاطمة)ی بانگ کردو شتێکی چرپاند بەگوێیدا ، دەستی کرد بەگریان . پاشان بانگی کردەوەو شتێکی تری چرپاندەوە بەگوێیدا ، دەستی کرد بەپێکەنین ، عائیشە دەڵێت: پرسیارمان کرد لەوە – واتە لەدواییدا – (فاطمة) وتی: پێغەمبەر ﷺ چرپاندی بە گوێمداو فەرمووی ، کە لەم نەخۆشیەدا دەمرم ، منیش بەوە گریام ، پاشان چرپاندی بەگوێمداو فەرمووی: کە من دوای خۆی یەکەم کەس دەبم پێی دەگەم ، بەم هەواڵەش دڵخۆش بووم.[2]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ مژدەی دا بە (فاطمة) کە خانمی هەموو ژنانی دونیایە[3]. کاتێك کە (فاطمة) ئەو نارەحەتیو ئێش و ئازارەی بە پێغەمبەری خواوە بینی ﷺ وتی: ئەی هاوار بۆ باوکم ، پێی فەرموو: فاطمة ، کچم ئیتر لەمەودوا باوکت ئێش و ئازاری نامێنێت.[4]

---

[1] / هەمان سەرچاوە، باب مرض النبي ﷺ ٢/٦٤٠.

[2] / صحيح البخاري ٢/٦٣٨.

[3] / هەندێ لە ریوایەتەکان دەڵێن : ئەو گفتوگۆو مژدەدانە لە دوا ڕۆژەکانی ژیانیدا نەبووە ، بەڵکو لە دوا هەفتەدا بووە ، بڕوانە (رحمة للعالمين) ١/٢٨٢.

[4] / صحيح البخاري ٢/٦٤١.

ئەنجا (حسن) و (حسين)ی بانگ کردو ماچی کردن ، وەسیەتی فەرموو ، کە باش بن لەگەڵیاندا ، پاشان هاوسەرەکانی بانگ کردو یادی خودای وەبیر هێنانەوەو ئامۆژگاری کردن.

بەڵام ئێش و ئازار توندبوو زیاتری کرد تائاسەواری ئەو ژەهرە دەرکەوت ، کە لە (خيبر)دا دەرخواردی دراو بوو ، دەیفەرموو: عائیشە" هەتا ئێستا هەست بە تاڵاوی ئەو ژەهرە دەکەم کە لە ڕۆژی خەیبەردا خواردم ، ئێستا دەبینم هەناومی گڕ تێبەرداوە.[1]

ئەنجا ئامۆژگاری کرد بۆ خەڵك و فەرمووی: ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێت ، بەزەییتان بێتەوە بە کەنیزەکەکاندا ، ئەمەی چەند جارێك وتەوە.[2]

## گیانەڵڵای سەرەمەرگ

ئیتر گیانەڵڵای سەرەمەرگ دەستی پێکرد سەری لەسەر ڕانی عائیشە بوو ، (عائیشە) دەیوت: یەکێك لە نازو نیعمەتەکانی خوا ئەوەبوو کە پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەی من و لە ژووری خۆمداو لەکۆشی خۆمدا وەفاتی کرد ، خوای گەورە هەناسەی ئەوی تێکەڵاو بەهەناسەم کرد لەکاتی وەفاتیدا.

(عبدالرحمن)ی کوڕی (ابوبکر) هاتە ژوورەوە سیواکێکی بەدەستەوە بوو ، من پشتی پێغەمبەرم گرتبوو ﷺ ، بینیم سەیری دەکات ، زانیم کە حەزی لە سیواك کردنە ، وتم: بۆت وەربگرم؟

بەئیشارەتی سەری فەرمووی: بەڵێ.

سیواکم بۆ کرد ، کەمێك زبر بوو وتم: بۆت نەرم بکەمەوە؟

بەسەر ئیشارەتی کردو فەرمووی: بەڵێ.

بۆم نەرم کردەوە. ـ لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە بەجوانترین شێوە سیواکی کرد ـ ، لەبەردەستیدا کوندەیەکی ئاو دانرابوو، دەستی تێدەخست و دەموچاوی پیرۆزی پێ تەڕدەکردو ، دەیفەرموو: ( لا أله إلا الله ) ئای خوایە کە مردن ساتەوساتی سەختی هەیە – فەرموودەکە –[3].

کە لە سیواك کردنەکەی بوەوە دەستی یان پەنجەی بەرز کردەوە ، چاوی ڕوانیە بنمیچی ماڵەکە ، لێوەکانی دەجولا ، (عائیشە) گوێی بۆ هەڵخست گوێی لێ

---

[1] / هەمان سەرچاوە ٢/٦٣٧.
[2] / هەمان سەرچاوە ٢/٦٣٧.
[3] / صحيح البخاري، باب مرض النبي ﷺ ٢/٦٤٠.

**بوو دەیفەرموو:** ( مع الذين أنعمت عليهم من النبيين والصديقين والشهداء والصالحين ، اللهم اغفر لي ، وارحمني ، وألحقني بالرفيق الأعلى )[1].

**واتە : خوایە بمخەیتە ڕیزی ئەوانەی نازو نیعمەتت بەسەردا ڕشتن لە پێغەمبەران و شەهیدان وساڵحان ، خوایە لێم ببورەو ڕەحمم پێ بکە ، خوایە بە ڕەفیقی ئەعلا ، خوایە ، ڕەفیقی ئەعلا.**

**ئەم وتەیەی دوایی سێ جار وتەوە ، دەستی شل بوو گیانی پاك و پیرۆزی سپاردو گەیشت بە ڕەفیقی ئەعلا** ( إنا لله وإنا إليه راجعون ).

**ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە لەکاتێکدا ڕوویدا کە چێشتەنگاوێکی گەرم بوو ، لە ڕۆژی دووشەممە ١٢ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١١ی کۆچی ، تەمەنی پیرۆزی (٦٣) ساڵ و چوار ڕۆژ بوو.**

## دابارینی خەمەکان بەسەر هاوەڵانیدا

**هەواڵی کۆچی پێغەمبەر ﷺ خێرا بڵاوبووەوە ، دونیا لەپێش چاو تاریك بوو ، (انس) دەڵێت: هەرگیز ڕۆژێکم نەدیوە ڕوناکترو جوانتر لەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ ی تێدا مرد.**[2]

**کە وەفاتی کرد (فاطمة) وتی: بابە گیان ، وەڵامی پەروەردگارت دایەوە کە بانگی کردی ، بابە گیان ، جەننەتی فیردەوس جێگاتە ، بابە گیان ، پرسەو سەرەخۆشی بۆ لای جبریل دەبەین**[3].

## هەڵوێستی عمر

**کە عمر هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری بیست ﷺ سەرگەردان بوو هۆشی لای خۆی نەما ، هاواری دەکرد: دووڕووەکان دەڵێن پێغەمبەری خوا مردووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە بەڵکو چووە بۆ لای پەروەردگاری خۆی ، هەروەکو (موسا)ی کوڕی (عمران) ڕۆشت و بۆ ماوەی چل شەو نەگەڕایەوە ، تا پاش ئەوەی وتیان مرد ئەنجا گەڕایەوە. وەڵڵاهی پێغەمبەریش دەگەڕێتەوە ، ئەوجا دەست و قاچی ئەوانە دەبڕێت کە وتویانە مردووە.**

---

[1] / هەمان سەرچاوەو (باب)، دوا گوتەی پێغەمبەر ﷺ، ٢/٦٣٨، ٦٣٢، ٦٤٠، ٦٤١.
[2] / (دارمي) ریوایەتی کردووە، (مشكاة المصابيح) ٢/٥٤٧.
[3] / صحيح البخاري، باب مرض النبي ( ﷺ )، ٢/٦٤١.

# هەڵوێستی ابوبکر

ابوبکر بەسواری ئەسپەکەی خێرا هاتو دابەزی چووە ناو مزگەوت قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد ، تا چووە ژوورەکەی (عائیشە)و ڕووی کردە تەرمەکەی پێغەمبەر ﷺ کە بەبوردەیەك داپۆشرابوو ، پەردەی لەسەری پیرۆزی هەڵدایەوە ، خۆیدا بەسەریداو ، ماچی کردو دەستی کرد بەگریان ،

پاشان فەرمووی: دایكو بابم بەقوربانت بن ، هەرگیز نابێت تۆ دووجار بمریت ، تەنها جارێکەو ئەوا نۆشیت.

پاشان (ابوبکر) چووە دەرەوە ، هێشتا (عمر) قسەی دەکرد بۆ خەڵك ، ڕووی تێ کردو وتی: عمر دانیشە .

(عمر) دانەنیشت ، ئیتر خەڵك هاتن بەرەو لای (ابوبکر) و (عمر)یان بەجێهێشت ، ئەنجا (ابوبکر) فەرمووی: (أما بعد) هەرکەسێك لە ئێوە موحەممەدی دەپەرست ﷺ ئەوە موحەممەد ﷺ وەفاتی کرد ، هەرکەسێکیش لە ئێوە خودای پەرستووە ، ئەوا خوا زیندووەو هەرگیز نامرێت ، خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِيْن مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ آل عمران/١٤٤.

واتە: (موحەممەد شتێکیتر نیە جگە لە پێغەمبەرێك و پێش ئەمیش چەندین پێغەمبەری تر هەبوون ، ئایا دەکرێت کە مرد یان کوژرا ئێوەش بە ڕوودا هەڵگەڕێنەوە؟ هەرکەسێکیش هەڵگەڕێتەوەو لابدات هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنێت ، خودای مەزنیش پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە). (ابن عباس) وتی: وەڵڵاهی وادەهاتە بەرگوێی خەڵك کە ئەم ئایەتە هێشتا نەهاتۆتە خوارەوە ، تا (ابوبکر) خوێندیەوە. ئەنجا خەڵکی لێیان وەرگرت ، هەرچیەکم گوێ لێ دەبوو ئەم ئایەتەی دەوتەوە.

(ابن المسیب) دەڵێت: عمر فەرمووی: وەڵڵاهی هەر ئەوەندە گوێم لەم ئایەتە بوو کە (ابوبکر) خوێندیەوە ، ئیتر قەڵەمی ئەژنۆم شکاو کەوتمە سەر زەوی ، ئیدی زانیم کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە.[1]

---

[1] / صحيح البخاري ٢/٦٤٠، ٦٤١.

## شۆردن و کفن کردن و
## ماڵئاوایی لە جەستەی پیرۆزی بەرەو خاك

دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کفن و دفنی بکەن لەمەسەلەی جێنشینیدا جیاوازی دروست بوو ، لە (سقیفة)ی (بنی ساعدة)دا چەندین گفتوگۆو قسەو باس بەرپابوو لەنێوان کۆچکەران و ئەنساردا. لەکۆتاییدا ڕێککەوتن لەسەر جێنشینایەتی (ابوبکر) ، ئەمە تاکۆتایی ڕۆژی دووشەممە بەردەوام بوو تا شەو داهات و ئاگایان لە ئەسپەردەکردنی تەرمی پێغەمبەر ﷺ نەما ، تاکۆتایی شەوی سێ شەممە لەگەڵ سپێدەدا ، جەستەی پیرۆزی لەسەر جێگەکەی خۆی بوو ، بوردەکەی بە سەرەوە بوو ، دەرگای لەسەر داخرابوو.

ڕۆژی سێشەممە پێغەمبەریان شۆرد ﷺ بێ ئەوەی جلەکانی لەبەر داکەنن ، (عباس) و (علی) دەیانشۆرد لەگەڵ (فضل) و (قثم) هەردوو کوڕەکەی (عباس) و (شقران)ی غولامەکەی پێغەمبەر ﷺ ، هەروەها (أسامە)ی کوڕی (زید)و (أوس)ی کوڕی (خولی). (عباس) و (فضل) و (قثم) ئەمدیوو و ئەودیویان پێدەکرد. (اسامە) و (شقران)یش ئاویان پێدا دەکرد ، (علی)یش دەیشۆری ، (أوس)یش لەئامێزی گرتبوو.

پاشان کفن پۆشیان کرد لە سێ بەرگی سپی خامدا ، نە کراس و نە مێزەری تێدا نەبوو[1]. یەك بەدوای یەك ئاڵاندبوویان لە جەستەی پیرۆزی.

سەبارەت بەشوێنی ئەسپەردە کردنەکەشی جیاوازی دروست بوو ، (ابوبکر) وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرپێغەمبەرێك لەکوێدا وەفاتی کردبێت لەوێدا نێژراوە ، ئەنجا (ابو طلحة) جێگەکەی پێغەمبەری ﷺ بەرز کردەوەو ، لە شوێنەکەیدا گۆڕیان بۆ هەڵکەندو ، کردیانە گۆڕیچە.

خەڵکی دە کەس دە کەس دەهاتنە ژوورەوە نوێژیان لەسەری دەکرد ﷺ بێ ئەوەی کەس پێش نوێژیان بۆ بکات ، سەرەتا کەسوکاری نوێژیان کرد لەسەری ، پاشان کۆچکەران ، پاشان ئەنسارەکان ، ژنانیش دوای پیاوان نوێژیان کرد لەسەری ، پاشان مێرد منالان نوێژیان کرد لەسەری.

---

[1] / متفق علیه، صحیح البخاري ١٦٩/١، صحیح مسلم ٣٠٦/١.

ئەوکارە هەموو ڕۆژی سێشەممەی خایاند ، تا شەوی چوارشەممە هات ، (عائیشە) وتی: بە ئەسپەردەکردنی پێغەمبەرمان نەزانی ﷺ تا لە نیوەی شەودا گوێمان لە دەنگی گۆڕ هەڵکەنەکان بوو.[1]

## ماڵی پێغەمبەر ﷺ

١. ماڵی پێغەمبەر ﷺ لەمەککەدا پێش کۆچکردن بۆ مەدینە پێکهاتبوو لەخۆی و (خدیجة)ی هاوسەری ، لە تەمەنی بیست و پێنجساڵیدا مارەی کرد ، (خدیجة) لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو ، ئەم ئافرەتە یەکەم ژنی پێغەمبەر بوو ﷺ ، ژنی بەسەردا نەهێنا ، چەند کوڕو کچێکی لێ بوو ، کوڕەکان هیچیان نەمان ، کچەکانیش بریتی بوون لە:

(زینب) و (رقیة) و (أم کلثوم) و (فاطمة) ، سەبارەت بە (زینب) لەپێش کۆچدا کوڕی پورەکەی خۆی (ابو العاص)ی کوڕی (ربیع) مارەی کرد. (رقیة) و (ام کلثوم)یش بەدوای یەکدا هاوسەری (عثمان)ی کوڕی (عفان) بوون. (فاطمة)ش (علی) کوڕی (ابو طالب) لەنێوان شەڕی (بەدر) و (ئوحود)دا مارەی کرد . (حسن) و (حسین) و (زینب) و (أم کلثوم) لە (فاطمة)ن.

دیارە کە بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕەوا بووە زیاتر لە چوار ژن بهێنێت بۆ چەندین مەبەستی گرنگ. ئەو ژنانەی عەقدی هاوسەرێتی لەگەڵدا بەستوون سیانزە ژن بوون ، نۆیان کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد مابوون . دووانیشیان لە ژیانی خۆیدا وەفاتیان کردووە ، یەکێکیان (خدیجە)یەو ئەویتریشیان دایکی هەژاران (زینب)ی کچی (خزیمە)یە ، دووانیشیانی نەگواستوەتەوە ، ئەمەش ناوی هەموویانە:

٢. (سودة)ی کچی (زمعة) ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە (مانگی (شەوال)ی ساڵی ١٠ی پێغەمبەرایەتی)دا مارەی کرد ، پاش وەفاتی خەدیجە بەچەند ڕۆژێك ، (سودة) پێش ئەوەی ببێتە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ خێزانی ئامۆزایەکی خۆی بوو بەناوی (سکران)ی کوڕی (عمرو). وەفاتی کرد.

---

[1] / (مختصر سیرة الرسول) نووسینی (شێخ عەبدوڵڵای نەجدی ل ٤٧١)، بۆ درێژەی باسی گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بەرەفیقی ئەعلا، بڕوانە: (صحیح البخاری) ، باب مرض النبي ﷺ و چەند (باب)ێکی تری دوایی، لەگەڵ (فتح الباری) و (صحیح مسلم) و (مشکاة المصابیح)ی باب (وفاة النبي ﷺ)، (ابن هشام) ٦٤٩/٢ تا ٦٦٥، هەروەها (تلقیح فهوم اهل الاثر) ل ٣٨و٣٩. هەروەها (رحمة للعالمین) ٢٧٧/١ تا ٢٨٦و دیاری کردنی سەرجەم کاتەکان لەسەرچاوەی دوایین.

٣. (عائیشه)ی کچی (ابوبکر)ی (صدیق) ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەمانگی (شەوال) ی ساڵی ١١ی پێغەمبەرایەتیدا ، واتە یەك ساڵ دوای مارەکردنی (سودە)و ، دوو ساڵو پێنج مانگ پێش کۆچکردن بۆ مەدینە ، لە مانگی (شەوال)دا و حەوت مانگ دوای کۆچکردنی بۆ مەدینە ، لەخێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ تەنها عائیشە کچ بوو ، خۆشەویسترین مرۆڤ بوو لەدڵیداو ، ژیرترین ژنی ئوممەتی ئیسلامەو ، بە ڕەهایی زاناترین ئافرەتە تا ئێستا هەڵکەوتبێت.

٤. (حفصه)ی کچی (عمر)ی کوڕی (خطاب) ، مێردەکەی لەنێوان جەنگی (بەدر) و (ئوحود)دا وەفاتی کرد ، پێغەمبەر ﷺ لە (ساڵی ٣ی کۆچی)دا مارەی کرد.

٥. (زینب)ی کچی (خزیمه) لەخێڵی (بنی هلال)ی کوڕی (عامر)ی کوڕی (صعصعه) ، ناونرا بوو بەدایکی هەژاران ، لەبەر ئەوەی زۆر بەزەیی بەهەژاراندا دەهاتەوە ، هاوسەری (عبدالله)ی کوڕی (جحش) بوو، لەجەنگی (أحد)دا شەهید کرا ، پێغەمبەریش ﷺ لە (ساڵی ٤ی کۆچی)دا خواستی ، پاش شووکردنی بە پێغەمبەر ﷺ بە دوو مانگ یان سێ مانگ وەفاتی کرد.

٦. (أم سلمة) (هند)ی کچی (أبي امية) ، ژنی (ابو سلمة) بوو ، لەمانگی (جەمادی دووەم)ی ساڵی ٤ی کۆچیدا (ابو سلمه) وەفاتی کرد. لە (مانگی (شەوال)ی هەمان ساڵدا پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد.

٧. (زینب)ی کچی (جحش)ی کوڕی (رباب)ی خێڵی (بنی أسد)ی کوڕی (خزیمه) ، پوورزای پێغەمبەرە ﷺ ، لە پێشدا خێزانی (زید)ی کوڕی (حارثة) بوو، کە لەکاتی سەردەمی جاهیلیدا بە کوڕی موحەممەد ﷺ بانگی لێدەکرا ، تەڵاقیدا ، خوای مەزن ئایەتی نارده خوارەوە گوتار ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ دەکات ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا﴾. هەر لەبارەی (زینب)ەوە چەند ئایەتێك دابەزیە خوارەوە ، کە مەسەلەی بەکوڕ کردن (تبنی) یەکلادەکاتەوە ـ پاشتریش باسی دەکەین ـ ، پاشان پێغەمبەر ﷺ لە (مانگی (ذی القعدة)ی ساڵی ٥ی کۆچیدا مارەی کرد.

٨. (جویریه)ی کچی (حارث) گەورەی (بنی المصطلق)ی خێڵی (خزاعه) ، لەناو کەنیزەکەکانی (بنی المصطلق)دەبوو کەوتە بەر پشکی (ثابت)ی کوڕی (قیس)ی کوڕی (شماس) ، (شماس) عەقدی موکاتەبەی لەگەڵدا بەست ، پێغەمبەر ﷺ پارەی موکاتەبەکەیداو لە(مانگی (شعبان)ی ساڵی ٦ی کۆچیدا مارەی کرد.

٩. (أم حبيبه) (رملة)ی كچی (ابو سفيان) ژنی (عبيدالله)ی كوڕی (جحش) بوو ، لەگەڵیدا كۆچی كرد بۆ حەبەشە لەوێ (عبيدالله) لەئاینی ئیسلام هەڵگەڕایەوەو بوو بەگاورو هەر لەوێش مرد ، بەڵام (أم حبيبه) لەسەر ئاینی خۆی بەدامەزراوی مایەوە. كە پێغەمبەر ﷺ (عمرو)ی كوڕی (امية)ی (ضمری) نارد بەنامەكەیدا بۆ نەجاشی ، لەمانگی (موحەڕەم)ی ساڵی (٧)ی كۆچیدا ، داوای (أم حبيبه)ی كرد بۆ پێغەمبەر ﷺ و نەجاشی لەگەڵ (شرحبيل)ی كوڕی (حسنه)دا ناردیەوە.

١٠.(صفيه)ی كچی (حيی) كوڕی (أخطب) لە (بنو إسرائيل) ، یەكێك بوو لە دیلە ژنەكانی خەیبەرو پێغەمبەر ﷺ هەڵیبژارد ، ئازادی كردو مارەی كرد ، لە دوای فەتحی خەیبەرەوە لە (ساڵی ٧ی كۆچی)دا.

١١.(ميمونة)ی كچی (حارث) خوشكی (أم الفضل) (لبابة)ی كچی (حارث) ، لە (مانگی (ذی القعدة)ی ساڵی٧ی كۆچی)دا لەكاتی عومرەی قەزادا خواستی ، پاش ئەوەی لە ئیحرام بوەوە.

ئەوانە (١١) ژن بوون ، پێغەمبەر ﷺ خواستبووی و هاوسەری بوون و گواستونیەتەوە ، دووانیان لە ژیانی خۆیدا وەفاتیان كردووە (خديجة) و (زينب)ی دایكی هەژاران ، لە ژیانی نۆ ژنەكەی تریدا خۆی وەفاتی كردووە. ئەو دووانەش كە نەیگواستوونەتەوە ، یەكێكیان لە (بنی كلاب) بوو ، ئەوی تریشیان لە (كندة) ئەمەیان ناسراوە بە (جونية) ، ئەم مەسەلەیە ڕاجیاوازیی لەسەرە پێویست بە باسكردن ناكات.

كەنیزەكانیشی كە بۆی نێرابوون دووان بوون ، یەكێكیان (مارية)ی (قبطية) بوو كە (مقوقس) بۆی نارد ، لە (ماريه) (ابراهيم)ی بوو ، كە لە منداڵیدا لە شاری مەدینە لە ژیانی خۆیدا ﷺ وەفاتی كرد. لەبەرواری (٢٨ یان ٢٩ی مانگی شەوالی ساڵی ١٠ كۆچی) ـ بەرامبەر بە (٢٧)ی یەنایەری ساڵی ٦٣٢ی زاینی).

كەنیزەكی دووەمیش (ڕەیحانە)ی كچی (زەید)ی (نضرية) یان (قرظية) بوو ، یەكێك بوو لە كەنیزەكەكانی (بنو قريظة) هەڵیبژارد ، ڕایەكیش دەڵێت: یەكێك بووە لەو ژنانەی كە ئازادی كردووەو مارەی كرد. (ابن قيم) گوتەی یەكەمی پەسەند كردووە ، (ابو عبيد) دووانی تریشی بۆ زیاد كردووە یەكەم (جميلة) دووەمیشیان كەنیزەكێك بووە (زەینەب) پێی بەخشیوە.[1]

---

[1] / بڕوانە (زاد المعاد) ١/٢٩.

ئەو کەسەی سەیری ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەکات ، دەزانێت کە مارەکردنی ئەو ژمارە ژنە لەکۆتایی تەمەنیداو پاش ئەوەی کە سی‌ساڵی تەمەنی گەنجی خۆی لەگەڵ ژنێکدا بەسەر بردووە کە نیمچە پیربووە - (خدیجە) پاشان (سودە) - پاش دەزانێت کە ئەو جۆرە ژنهێنانە لەبەر ئارەزووی سێکس و شەهوەت دامرکاندنەوە نەبووە ، بەڵکو کۆمەڵێك هۆی گەورەترو مەزنتر لەئارادا هەبوون ، کە ئامانجی سەرەکی ئەو ژنهێنانە بوون.

خواستنی کچی (ابوبکر) و (عمر) ، هەروەها مارەکردنی (فاطمة)ی کچی خۆی لە (علی) و مارەکردنی (رقیە) و پاشان (ام کلثوم)یش لە (عثمان)ی کوڕی (عفان) ئاماژەیەکی تێدایە بۆ پتەوکردنی پەیوەندی بەو چوار کەسەوە کە گیانفیدایی و لێبڕانیان بۆ ئیسلام لەکاتی ناڕەحەتیەکاندا ماوە.

نەریتی عەرەب وابوو زۆر ڕێزیان لە ژن‌و ژنخوازی‌و خزمایەتی دەگرت ، خزمایەتی پێگەیەکی گرنگ بوو بۆ نزیکبوونەوە لە تیرەو خێڵە جیاوازەکان ، عەرەب دژایەتی کردنی خزمی بە لەکەیەکی گەورە دەزانی، پێغەمبەر ﷺ بە مارەکردنی ژمارەیەك لە ژنانی (دایکی ئیمانداران) ویستی دوژمنایەتی خێڵەکان بۆ ئیسلام کز بکات‌و ئاگری ڕق و کینەیان بکوژێنێتەوە ، (ام سلمە) لە خێڵی (بنی مخزوم) بوو ، کە تیرەکەی (ابو جهل) و (خالد)ە ، کە پێغەمبەر ﷺ خواستی ئیتر (خالد) ئەو هەڵوێستە توندوتیژەی ڕۆژی (أحد)ی نەما ، ئەوەبوو بەخواست‌و حەزی خۆی هات‌و موسوڵمان بوو، هەروەها (ابو سفیان) پاش شووکردنی کچەکەی بە پێغەمبەر ﷺ ئەو توندوتیژیەی نەما. هەروەها دەبینین (بني المصطلق) و (بني النضير) شەڕ فرۆشتن‌و دوژمنایەتیان نەما کە پێغەمبەر ﷺ (جويرية)و (صفية)ی مارەکرد. بگرە (جويرية) گەورەترین بەرەکەت‌و خێری هەبوو بۆ ڕۆڵەکانی خێڵەکەی‌و خزم‌و خۆیشانی ، چونکە لەگەڵ مارەکردنیدا لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هاوەڵانیش سەد بنەماڵەی خزم‌و کەسوکاری (جويرية)یان ئازاد کرد . وتیان چۆن دەبێت خزمانی پێغەمبەر ﷺ کۆیلە بن ، روونیشە ئەو ئازاد کردنە لەسەر ناخ‌و دڵ‌و دەروون چ کاریگەریەکی هەیە.

لەمانەش هەموو زیاتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدرابوو کە دەبێت خەڵکانێك پاك بکاتەوەو هۆشیارو بەئاگا بهێنێتەوە لەبارەی فەرهەنگ‌و ژیارو شارستانی هیچیان نەدەزانی و هیچ بەشداریەکیان نەبوو لە بنیاتنان‌و پشتیوانی کردنی کۆمەڵگادا.

یەکێك لەو بنەما سەرەکیانەی بوونە بەردی بناغەی بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامیی ئەوە بوو ، ڕێگەی نەداوە بە پیاوان تێکەڵاو بن لەگەل ژناندا ، نەدەکرا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هۆشیار بکرێنەوەو ، ڕەچاوی ئەو بنەمایانەش بکرێت . لەگەل ئەوەشدا کە ئاگا کردنەوەی ئەوان بەئەندازەی پیاوان پێویست بوو ، بگرە زیاتریش بوو.

بۆ ئەو مەبەستە دەبوایە پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی جیاجیا ژن هەڵبژێرێت بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستەو پەروەردەیەکی پتەوی چاکیان بکات و فێری ئەحکامەکانی شەریعەتیان بکات ، بە ڕۆشنبیریی ئیسلامیی جۆشیان بدات تا بتوانن ببنە مامۆستا فێرکاری ژنە دەشتەکی و شارنشینەکان و پیرەژنان و کچانی گەنج ، بەم پێیە لەجیاتی پیاوان ئەم ژنانە بەو کارە هەستن.

دایکانی ئیمانداران ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لەگواستنەوەی بارو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵك بەتایبەتی ئەوانەیان کە تەمەنێکی درێژتریان بۆ نوسرا ، وەکو (عائیشە) ، (عائیشە) ژمارەیەکی زۆر لەفەرموودە گوفتاریی و ڕەفتاریەکانی پێغەمبەری باسکردووە ، یەکێك لەو حاڵەتی ژنهێنانەی پێغەمبەر ﷺ پەیوەستە بەنەریتێکی جاهیلی ڕەگو ڕیشەدارەوە ، ئەویش مەسەلەی (تبنی) بە کوڕ کردنە ، لەناو عەرەبدا ئەو کەسەی منالێکی بکردایە بەڕۆڵەی خۆی ئەوا ئەو کوڕە هەموو کەسە حەرامکراوەکانی وەکو کوڕێکی ڕاستەقینە لێی حەرام دەکرا. ئەم ڕێسایە لەناو کۆمەڵگاو ناخی تاکەکانی عەرەبدا چەسپاو بوو ، بەشێوەیەك لە ڕەگ دەرهێنانی مەحاڵ بوو ، بەلام لەهەمان کاتیشدا ئەم ڕێسا جاهیلیە دژەوانە بوو لەگەڵ ئەو بنەڕەت و پرنسیپانەدا کە ئیسلام دانی پێدا نابوو لە مەسەلەی هاوسەرێتیی و تەلاق و میرات و مامەڵەکانی تریدا ، سەرباری ئەوە ئەم ڕێسایە چەندین ئاسەواری خراپ و بەدڕەوشتی لێدەکەوێتەوە ، لەوانەی کە ئیسلام هاتبوو بۆ سڕینەوەیان.

بۆ تێکشکاندنی ئەم ڕێسایە خوای مەزن فەرمانیدا بەپێغەمبەرەکەی ﷺ کە داخوازی (زینب)ی کچی (جحش)ی پورزای بکات ، ئەو کاتە خێزانی (زید) بوو ناکۆکی هەبوو لەنێوانیاندا ، تاگەیشتە ئەوەی زەید ویستی تەلاقی بدات لەوکاتەدا کە ئەحزاب هاتبوونە سەر مەدینەو موسوڵمانان. پێغەمبەریش ﷺ لەپڕوپاگەندەی دووڕووان و موشریکان و جولەکە دەترساو سڵی دەکردەوە لەو دڵەڕاوکێ و گومان و

شتە پڕپوچانەی بڵاویان دەکردەوە دژ بە پێغەمبەر ﷺ ، دەشی زانی ئەمە چەندە کاریگەری هەیە لەسەر دەروونی موسوڵمانە لاوازەکان ، بۆیە حەزی دەکرد (زید) (زینب) تەلاق نەدات ، تا نەکەوێتە بەردەم ئەو تاقیکردنەوە گەورەیە.

گومانیشی تێدا نی‌یە ئەو دڵەڕاوکێ‌و دوو دڵی‌یە لەگەڵ ئەو ئامانجە سەرەکیەدا رێك نەدەکەوت کە پێغەمبەری بۆ نێرراوە ﷺ ، بۆیە خوای مەزن رەخنەی لێگرت‌و فەرمووی: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ ﴾ الأحزاب/٣٧. واتە: (تۆ دەتوت بە (زید) ژنەکەت ڕاگرەو لەخوا بترسە ، لەناختدا ئەوەشت حەشار دابوو کە خودا دەری دەخات ، تۆ لەقسەی خەڵك دەترسیت ، لەکاتێکدا کە پێویستە لەخودا بترسیت).

لەکۆتاییدا (زید) تەلاقی‌دا ، پێغەمبەریش ﷺ لە ڕۆژانی سەپاندنی ئابلۆقەی سەر (بني قريظة)دا مارەی کرد پاش ئەوەی عیددەی بەسەر چوو. خوای مەزن ئەو زەواجەی بەسەردا سەپاندو ، هیچ بوارێکی بۆ نەهێشتەوە کە ڕایەکی تر پەسەند بکات ، تا ئەوەبوو خودای مەزن خۆی ئەوەی ئاشکرا کرد ، ﴿ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لاَ يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ﴾ الأحزاب/٣٧. واتە: (کە زەید دەستی لە زەینەبی ژنی بوەوەو تەلاقی‌دا ئێمە ـ خواوەند ـ لەتۆمان مارەکرد تائیمانداراانیش تووشی تەنگەتاوی و بێتاقەتی نەبن سەبارەت بە هاوسەری بەکوڕکراوەکانیان ئەگەر هاتوو ویستیان مارەیان بکەن). بۆ ئەوەی ڕێسای (تبنی) بەکرداری بڕوخێنێت هەروەکو بەگوفتار پێشتریش روخاندبووی ﴿ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ ﴾ الأحزاب/٥. واتە: بەناوی باوکیانەوە (بە کوڕ کراوەکانتان) بانگ بکەن ، چونکە ئەوە دادپەروەرانە ترە لەلای خوا. ﴿ مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ﴾ واتە: (بەڕاستی موحەممەد ﷺ باوکی هیچ یەکێك لەئێوە نەبووە ، بەڵام پێغەمبەری خواو دواهینی پێغەمبەرانە).

چەندەها نەریت‌و خوی ڕەگ‌و ڕیشە داکوتاو هەن کە هەرگیز بە وشە ناسڕێتەوە ، بەڵکو پێویستی بەکرداری خاوەنی بانگەوازەکە هەیە ، ئەمەش لەو هەڵوێستەدا دەردەکەوێت کە موسوڵمانان پیشانیاندا لە سوڵحی حودەیبیەدا (عروە)ی کوڕی (مسعود)ی (ثقفي) هەندێك لەو موسوڵمانانەی بینی کە تفی دەمی

پێغەمبەریان دەگرتەوەو ، شەڕیان دەکرد لەسەر ئاوی دەست نوێژی. بەڵێ ، ئەوانە ئەو کەسانە بوون کە پێشبڕکێی چوون بەرەو مەرگیان کرد لەژێر درەختەکەدا. ئەوانە کە هاوچەشنی (ابوبکر) و (عمر)یان تێدا بوو کە ئەوەش هەڵوێستیان بوو ، کەچی دوای تەواو بوونی سوڵحی حودەیبیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەو هاوەڵە گیانبازانە هەریەکەو قوربانی خۆی سەربڕێت کەچی یەك کەسیان هەڵنەستا لەشوێنی خۆیدا. تا پێغەمبەر شپرزە بوو توشی دڵەراوکێ هات ، تا (أم سلمه)ی خێزانی عەرزی کرد تۆ بۆخۆت قوربانیەکەت سەر ببڕە بێئەوەی قسە لەگەل کەسدا بکەیت ، وای کرد ، ئەنجا هاوەڵان بەگوێیان کردو خێرا دەستو برديان کردو قوربانیەکانیان سەربڕی. بەم ڕوداوەدا جیاوازی کاریگەرێتی قسەو کردار دەردەکەوێت لە ڕووخاندنی بیروبڕوا چەسپاوەکاندا.

دووڕووان خوت خوتەی زۆریان وروژاند ، چەندین جۆری پڕوپاگەندەو درۆیان تەنیەوە بۆ ئەم نیکاحە ، هەندێك لەو پڕوپاگەندانە کاریگەریان هەبوو لەسەر دڵی باوەڕ لاوازەکان ، بەتایبەتی کە (زینب) پێنجەم ژنی پێغەمبەر بوو ﷺ ، موسوڵمانەکانیش نەیاندەزانی کە پێغەمبەر ﷺ بۆی هەیە زیاتر لە چوار ژن بهێنێت و، زیدیشیان بە کوڕی پێغەمبەر ﷺ دەزانی و مارەکردنی ژنی بەکوڕکراویش گەورەترین فاحیشە بووە لەکاتی خۆیدا ، خوای گەورە لە سورەتی (الأحزاب)دا بۆ ئارامیی ئاوی دڵ ئایەتی ناردە خوارەوە. ئەنجا هاوەڵان زانیان کە سیستمی تەبەنی هیچ بایەخێکی نیە لە ئیسلامدا ، خوای گەورە دەرفەتی زیاتری داوە بە پێغەمبەر ﷺ کە لەو ژمارەیە زیاتر ژن بهێنێت لەپێناو بەدی هێنانی ئامانجە بەرزو ڕەواکاندا.

پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا لەبەرزترین پلەی ڕێزو شکۆداریی‌و چاکیدا بوو، هەروەکو ژنەکانیشی لە بەرزترین پلەی ڕێزو حورمەت و قەناعەت و ئارامیی و بێفیزیی و خزمەتگوزرایدا بوون ، لەهەستانیاندا بەئەرکی هاوسەرێتی پێغەمبەر ﷺ. لەکاتێکدا کە بەکولەمەرگیەکی وەها دەژیان بەکەس تاقەت نەدەبرا. (انس) دەڵێت: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەر ﷺ نانێکی نەرم‌و ناسك بخوا تا گەیشتەوە بەخوای خۆی ، وە هەرگیز تامی گۆشتێکی مەڕی قەڵەوو بەپێزی نەکردووە[1]. عائیشە دەڵێت: ئێمە لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ لەماوەی دوو

[1] / صحيح البخاري ٩٥٦/٢.

مانگدا سێجار مانگمان بەشێوەی دەمەداس دەبینی هێشتا لەماڵەکانی پێغەمبەردا ئاگر نەکرابووەوە. ئەنجا (عروة) پرسیاری کرد لە (عائیشە): باشە ئەگەر ماڵتان بەو شێوەیە بوو ئەی بە چی دەژیان؟

عائیشە دەیوت : بە دوو شتە ڕەشەکە دەژیاین " (ئاوو خورما).[1]

لەگەڵ ئەو ژیانی کولە مەرگی و تەنگەتاویەدا جگە لەیەك جار هیچ کاتێك ژنەکان بێتاقەتیان دەر نەبڕیوە ـ ئەوەش وەکو هەستێکی مرۆڤیی حاڵەتێکی ئاسایی بوو ـ بۆ ئەوەش ببێتە هۆیەك بۆ دانانی ئەحکامی نوێ. خوای مەزن ئایەتی ڕا هەڵبژێری بەدوایدا ناردە خوارەوە: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً ، وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب/٢٩،٢٨.
واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ بە هاوسەرانت ئەگەر زینەتو جوانی ماڵی دونیاتان دەوێت وەرن با بتاندەمێ و بەجوانی ئازادتان بکەم ، خۆ ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی و ماڵی ئاخیرەتیشتان دەوێت ئەوا خوای گەورە پاداشتی زۆر گەورەی ئامادە کردووە بۆ چاکەکارانتان). لەبەردەم ئەم دوو هەڵوێستەدا دایکانی ئیمانداران لەبەر زۆر ڕێزی و حورمەتداری خۆیان ، خواو پێغەمبەریان هەڵبژارد ، هیچ کامیان مەیلیان بەلای ماڵی دونیادا نەبوو.

هەروەها لەگەڵ ئەوەدا کە هەوێنی یەکتر بوون چەند حاڵەتێکی کەم نەبێت وەکو پێویستی مرۆڤیی شتێکی وەها نەچوو بە بەینیاندا ، بۆ ئەو شتە بچوکەش خوای مەزن سەرزەنشتی کردن و ئیتر نەگەڕانەوە سەر ئەو حاڵەتە ئەمەش ئەو حاڵەتە بوو کە خوای مەزن لە سورەتی (تحریم)دا باسی کرد ﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ ﴾ تا کۆتایی ئایەتی پێنجەم.

لەکۆتاییدا بەپێویستی نازانم کە قسەو باس لە مەسەلەی چەند ژنە بکەم ، هەرکەسێك سەیری ژیانی دانیشتوانی ئەورووپا بکات ، ئەوانەی دژی ئەم مەسەلەیە دەوەستن و سەیری ئەو حاڵەتە پڕ لە نەهامەتیەی ئەوان دەکاتو ئەو هەموو ئابڕوو چوونو کارەساتانە دەبینێتو ئەو بەلاو دڵەڕاوکێو لادانەیان دەبینێت پێویستی بە گەڕان و بەڵگەسازی زۆر نابێت ، چونکە ژیانیان ڕاستگۆترین شایەتە لەسەر ڕاستی و ناڕاستی بۆچوونەکانیان.

---

[1] / هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

## شێوازو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جوانی ڕەوشتیدا ، خوای گەورە جوانی شێوازە پەیکەریشی پێبەخشیبوو ، بەشێوەیەك زمان كۆڵە لە وەسفكردنیدا ، بەبینیی دڵ پڕ دەبوو لە قوڵپی هەنسك. پیاوان خۆیان دەكردە قوربانی ، بەشێوەیەك هیچ پیاوێكی دونیا شتی وای بەخۆوە نەبینیوە ، ئەوانەی لەگەڵیدا بوون تائاستی بۆ توانەوە خۆشیان ویستووە ، باكیان نەبووە لە تیاچوون ، بەمەرجێك نینۆكێكی ئەو ئازاری پێ نەگات. ئەو خۆشەویستیەش بەرەنجامی سەوداسەری ئەو عیشقە پیرۆزە بوو كە لەحاڵەتی ئاساییدا هیچ مرۆڤێك نایگاتێ. لەم چەند باسەشدا ئاماژە بۆ ئەو ریوایەتانە دەكەین كە وەسفی جوانی و تێرو تەواوی پێغەمبەر ﷺ دەكەن .

## جوانیی پەیكەرو شێواز

(أم معبد)ی (خزاعیە) لەبارەی پێغەمبەرەوە دەڵێت ـ لەكاتێكدا كە وەسفی دەكات بۆ مێردەكەی لەوكاتەدا كە بەلای خێوەتەكەیدا گوزەراوە: (دەمو چاوێكی گەش‌و كراوە ، بە ڕەوشت ، كەڵەگەت ، سەرێكی بچوك ، جوانخاس ، چاوڕەش ، مووی برۆكانی درێژ بوون، دەنگێكی گڕی هەبوو ، گەردنی بەرز بوو، سپێنەی چاوی زۆر بوو ، برژانگی چاوەكانی درێژ بوون ، برۆكانی باریك و درێژبوون و بە یەك گەیشتبوون ، مووەكانی قژی سەری زۆر ڕەش بوون ، كە بێدەنگ دەبوو سام و هەیبەتی هەبوو ، كە قسەی دەكرد گەورەیی و مەزنیی تێدا بەدی دەكرا، كە لە دوورەوە دەهات جوانترین و بەڕەونەقترین بەژن و باڵای هەبوو ، كە نزیك دەكەوتەوە زۆر جوان خاس و ڕەفتارشیرین بوو، گوتەی جوان بوو ، ڕێزدار بوو ، میانەڕەو بوو ، وتە شیرینەكانی وەكو دانەی تەزبیح دەهۆنیەوەو ڕێكی دەخستن ، باڵای مامناوەندی بوو ، لەبەرچاو ئەوەندە كورتە باڵا نەبوو بچوك دەربكەوێت ئەوەندەش بەرزەباڵا نەبوو درێژ دەربكەوێت ، لەنێوان دوو لقی درەختێكدا ناوەنجیەكەیان بوو ، لە هەر سێ لقەكە قەشەنگ تر بوو ، لە هەموویان شكۆدارتر بوو ، چەند كەسێكی هاوەڵی دڵسۆزی لەگەڵدا بوو چوار دەوریان دابوو ، كە قسەی دەكرد هاوەڵەكانی بەوریاییەوە گوێیان لێدەگرت ، كە فەرمانی دەدا خێرا جێبەجێیان دەكرد ، لەلایەن هاوەڵانیەوە گەورەو بەگوێكراوو دەور قەرەباڵغ بوو ، گرژو مۆن نەبوو ، بەرامبەرەكەی نەدەشكاندو تەریقی نەدەكردەوە)[1] .

---

[1] / زاد المعاد ٢/٥٤.

(علی) کوڕی (أبو طالب)یش وەسفی پێغەمبەر دەکات ﷺ و دەڵێت: (درێژێکی ناقۆڵا نەبوو ، کورتە باڵایەکی گرگن نەبوو ، ناوەندی ناو هاوڕێکانی بوو ، قژی لول و ئاڵۆسکاو نەبوو ، هەروەها خاویش نەبوو ، دەموچاو ئاوساوو ، پیر دیار نەبوو ، ڕەقەڵەو وشکیش نەبوو ، دەموچاوی خڕ هەڵکەوتبوو ، سپیکەلەو چاوڕەش بوو ، برژانگی پێڵوی چاوەکانی درێژ بوون ، پارچە ئێسقانەکانی لەشی وەکو پارچەی جومگەو شانو ئەژنۆ دەرچوو بوو ، مووی سەرسنگی وورد بوو ، توکن نەبوو ، پەنجەکانی دەستو قاچی قەڵەوو خڕن بوون ، کە دەڕۆیشت واتدەزانی ئاوی ناو ڕێژگەیەکی لێژە ، کەلای دەکردەوە هەموو جەستەی پیرۆزی وەردەگێڕا ، لەناوشانیدا مۆرکی نبوەت هەڵکەنرا بوو ، خاوەنی بەخشندەترین دەست بوو ، خاوەنی ئازاترین دڵ بوو ، خاوەنی راستگۆترین گفت بوو ، لە هەموو کەس زیاتر بەوەفا بوو بۆ وادەو پەیمان ، لەهەموو کەس نەرمو نیانتر بوو ، لە هەموو کەس خۆشخوانتر بوو ، کەسێك یەکەم جار بینیبایە سامی لێ دەنیشت ، کە مامەڵەشی لەگەڵدا دەکرد خێرا خۆشی دەویست). (علی) دەڵێت: (هەرگیز لەپێش و لەپاش ئەو ، کەسم وەك گەورەیی ئەو مرۆڤە مەزنە نەدیوە ﷺ ).[١]

لەریواتێکی تری (علی)دا هاتووە دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ سەری گەورە بوو ، ناوشانی قایم بوو ، مووی سەرسنگی تا سەر ناوکی بەخەتێك درێژ بوون ، کە دەڕۆشت وەکو ئاوی سەر ڕێژگەیەکی لێژ دەڕۆیشت).[٢]

(جابر)ی کوڕی (سمرە) دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ دەمی گەورە بوو ، چاوی درێژکۆلە بوو ، کەم گۆشت بوو).[٣]

(أبو طفیل)یش دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی سپیکەلەی گەشی مامناوەندی بوو لە هەموو ڕوویەکەوە).[٤]

(أنس)ی کوڕی (مالك) دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ لەپی دەستی گەورە بوو ، پێستی دەموچاوی سوورو سپی بوو، سپیەکی تەواوو ئەسمەری تەواویش نەبوو بەمانا گەنم ڕەنگ بوو ، کە وەفاتی کرد هێشتا مووی سەرو ڕیشی پیرۆزی بیست تاڵە مووی سپی تێنەکەوتبوو).[٥]

---

[١] / ابن هشام ٤٠١/١، ٤٠٢.
[٢] / هەمان سەرچاوەی کۆتایی ٤٠١/١، ٤٠٢.
[٣] / صحیح مسلم ٢٥٨/٢.
[٤] / هەمان سەرچاوە.
[٥] / صحیح البخاري ٥٠٢/١.

هەروەها دەڵێت: (چەند تاڵەموویەکی سپی لەریشی پیرۆزیدا دەرکەوتبوو) . لە ریوایەتێکی تریشدا هاتووە کە لەسەری پیرۆزیدا چەند تاڵە موویەکی سپی هەبوو.[1]

(ابو جحیفة)ش دەڵێت: (لە ژێر لێویداو بەشی سەرەوەی چەناگەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ چەند تاڵە موویەکی سپیم بینی).[2]

(عبدالله)ی کوڕی (بسر) دەڵێت: ( لە سەرو چەناگەی پێغەمبەرەوە ﷺ چەند تاڵە موویەکی سپی تێدا بوو).[3]

(براء)یش دەڵێت: (نێو شانەکانی بەرفراوان بوو ، قژی سەری دەگەیشتە سەر نەرمەی گوێچکەی ، لەناو بوردەیەکی درێژ دامانەی سوردا بینیم هەرگیز هیچ کەسێکم نەدیوە لەو جوانخاس تر بێت).[4]

لە سەرەتادا بۆ هاوڕایی کردنی ئەهلی کیتاب قژی بەردەدایەوە ، پاشان پرچی گرتەوە.[5]

(براء) دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ جوانترین ڕوو ، بەرزترین ڕەوشتی هەبوو).[6]

هەروەها پرسیاری لێ کرا ئایا ڕاستە ڕووی گەشی پێغەمبەر ﷺ وەك شمشێر بریسکەی دەهات؟ وتی: نەخێر ، بەڵکو وەکو مانگ وەها بوو. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: دەمو چاوی پێغەمبەر ﷺ خڕ هەڵکەوتبوو.[7]

(ربیع)ی کچی (معوذ) دەڵێ: کە دەتبینی دەتوت ئەمە خۆرەو هەڵهاتووە.[8]

(جابر)ی کوڕی (سمره) دەڵێت: لە شەوێکی مانگە شەودا سەیری ڕەنگ‌و ڕووی پێغەمبەرم دەکرد ﷺ لەگەڵ ڕووی مانگدا ، ـ لەو کاتەدا بوردەیەکی سوری بەسەر شانەوە بوو ـ بەلامەوە لە مانگ جوانتر بوو.[9]

(ابو هریرة)یش دەڵێت: هیچ کەسێکم نەدیتوە لە پێغەمبەر ﷺ جوانتر بێت ، دەتوت ڕۆژ لە دەمو چاویدا درەوشاوەتەوە ، کەسیشم نەدیوە لە ڕۆشتندا لەو

---

[1] / هەمان سەرچاوە ، (صحیح مسلم) ٢/٢٥٩.
[2] /صحیح البخاري ١/٥٠١، ٥٠٢.
[3] / هەمان سەرچاوە، ١/٥٠٢.
[4] / هەمان سەرچاوە.
[5] / (صحیح البخاري) ١/٥٠٣.
[6] / هەمان سەرچاوە ١/٥٠٢ ، صحیح مسلم ٢/٢٥٨.
[7] / صحیح البخاري ١/٥٠٢ ، صحیح مسلم ٢/٢٥٩.
[8] / (دارمي) ریوایەتی کردووە ، مشكاة المصابیح ٢/٥١٧.
[9] / (ترمذي لە (شمائل)دا ریوایەتی کردووە ل٢، هەروەها (دارمي). مشكاة المصابیح ٢/٥١٨.

خێراتر بڕوات ، واتدەزانی زەوی لەژێر پێیدا لول دەخوات ، ئێمە زۆرمان لەخۆمان دەکرد ، بەڵام ئەو باکی نەبوو.[1]

(کعب)ی کوڕی (مالك)یش دەڵێت: کە دڵی خۆشبوایە دەمو چاوی دادەگیرسا ، وەکو پارچەیەکی مانگی تابانی لێدەهات.[2]

جارێکیان لای (عائیشە) بوو جواناوی دەرکرد ، ئارەقەی نێوچەوانی دەمو چاوی دەبریسکاندەوە ، منیش (کعب) شیعرێکی (ابی کبیر)ی (الهندلی)م بیرکەوتەوە کە دەڵێت:

وإذا نظرت إلى أسرة وجهه　　برقت كبرق العارض المتهلل.[3]

کە (ابوبکر)یش دەیبینی ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

أمين مصطفى بالخير يدعو　　كضوء البدر زايله الظلام[4]

(عمر)یش ئەم شیعرەی دەخوێندەوە کە (زهیر) لە بارەی (هرم)ی کوڕی (سنان)ەوە وتبوی:

لو كنت من شيء سوى البشر　　كنت المضيء ليلـــة البدر

پاشان دەیوت: پێغەمبەریش ﷺ ئاوابوو.[5]

کە پێغەمبەر ﷺ تووڕە دەبوو دەموچاوی سوور دەبووەوە ، وەکو دەنکی هەنار لەسەر ڕوومەتی دەرچووبێت.[6]

(جابر)ی کوڕی (سمره) دەڵێت: قاچەکانی پێغەمبەر ﷺ گونجاو بوو لەگەڵ جەستەیدا ، تەنها بەزەردەخەنە پێدەکەنی ، کە سەیرت دەکرد ، دەتوت ئەمە کلی لەچاو کردووە کلیشی لەچاودا نەبوو.[7]

(ابن عباس) دەڵێت: دانەکانی پێشەوەی بەینیان هەبوو ، کە دەکەوتە قسەکردن دەتوت نوور لە نێو ددانەکانیەوە دێتە دەرەوە.[8]

گەردنیشی وەك بلوری زیو وەها بوو ، برژانگ درێژ ، ریش چڕوپڕ ، نێوچەوان پان و برۆکانی بەیەك گەیشتبوون بێتێکەڵاو بوون ، ئێسکی سەر لوتی بەرز بوو ،

---

[1] / (جامع الترمذي) لەگەڵ شەرحی (تحفة الأحوذي) ٣٠٦/٤، مشكاة المصابيح ٥١٨/٢.
[2] / صحيح البخاري ٥٠٢/١.
[3] / رحمة للعالمين ١٧٢/٢.
[4] / (خلاصة السير) ل٢٠.
[5] / (خلاصة السير) ل٢٠.
[6] / مشكاة المصابيح ٢٢/١، هەروەها (مشكاة المصابيح) لە (أبواب القدر): (باب ما جاء في التشديد في الخوض في القدر) ٥٣/٢.
[7] / (جامع الترمذي) لەگەڵ شەرحی (تحفة الأحوذي) ٣٠٦/٤.
[8] / (دارمي) ریوایەتی کردووە، مشكاة المصابيح ٥١٨/٢.

ڕوومەت سفت و جوان بوو ، لەسەر سنگی پیرۆزیەوە تاڵە مووی وردو باریك بەیەك خەت درێژ بوو بوموە تاسەر ناوکی ، جگە لەوە مووی تر بەسنگ‌و سکیەوە نەبوو ، شان و دەستی تووکاوی بوو، جگە لە سنگ و سکی ، سنگی فراوان بوو ، ئێسکی سەر سنگی درێژ بوو ، قاچەکانی ڕێك‌و بێ گرێ بوون ، بۆشایی ژێر قاچی زۆر بەرزبوو، کە هەڵدەستا گوڕی دەدایە خۆی ، هەنگاوی لەسەر خۆی دەناو لە ڕۆشتندا هێمن بوو.[1]

(أنس) دەڵێت: دەستم نەداوە لە هیچ کوتاڵێکی ئاوریشم ناسکترو نەرمتر بێت لەناو لەپی پێغەمبەر ﷺ ، بۆنی هیچ بۆنێکی خۆشم نەکردووە (لەڕیوایەتێکی تردا) بۆنی هیچ عەنبەرو مسکێکم نەکردووە لە بۆنی پێغەمبەر ﷺ خۆشتر بێت.[2]

(ابو جحیفة) دەڵێت: دەستی پێغەمبەرم گرت ﷺ ، خستمە سەر نێوچەوانم ، لە بەفر ساردتر بوو ، لە بۆنی میسك خۆشتر بوو.[3]

(جابر)ی کوڕی (سمره) ـ ئەوکاتە منداڵ بوو ـ دەڵێت: دەستی خستە سەر ڕوومەتم هەستم کرد بە ساردی و بۆنی خۆشی دەستی وەك ئەوەی تازە لە جەوەنەی عەتر فرۆشێکەوە دەری هێنابێت.[4]

(أنس) وتی: جواناوی پێغەمبەر ﷺ وەك مرواری وەها بوو. (أم سلمه) دەڵێت: لە هەموو بۆنێك ، بۆنی خۆشتر بوو.[5]

(جابر) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەهەر ڕێگەیەکدا بڕۆشتایەو لەدواییدا کەسێکی دیکە بەوێدا بگوزەرایە بەبۆنە خۆشەکەیدا دەیزانی پێغەمبەر ﷺ بەوێدا تێپەڕیوە.[6]

لەناو دەفەی شانیدا مۆرکی نبوەت بەئەندازەی هێلکەی کۆترێك بەدەستی پەروەردگار هەڵکەنرابوو ، لە ڕەنگی جەستەی بوو ، لەسەر شانی چەپیەوە بوو بەخاڵی ورد ورد دیاری کرابوو.[7]

---

[1] / خلاصة السير ل١٩، ٢٠.
[2] / صحيح البخاري ٥٠٣/١ ، صحيح مسلم ٢٥٧/٢.
[3] / صحيح البخاري ٥٠٢/١.
[4] / صحيح مسلم ٢٥٦/٢.
[5] / هەمان سەرچاوە.
[6] / (دارمی) ڕیوایەتی کردووە .. مشكاة المصابيح ٥١٧/٢.
[7] / صحيح مسلم ٢٥٩/٢، ٢٦٠.

## تەواویی دڵ و دەروون و بەها ڕەوشتیەکانی

پێغەمبەری خوا ﷺ زمان پاراوو ڕەوانبێژ بوو ، لە شوێنی خۆیدا چاك بێژو سروشت ئاسان و قسە ڕۆشن و كورتو كرمانجو نەستەق بوو ، بیٚخۆ سەغڵەتكردن ، لەقسەدا كورتبڕو مانابەخشو پەندئامێزو زانای فۆنەتیكەكانی عەرەب بوو ، هەرخێڵێكی بەشێوە ئاخاوتنی خۆی بانگ دەكردو بە لەهجەی خۆی گفتوگۆی لەگەڵدا دەكردن ، بیر تیژیی و سەلیقەی بیابانی تێدا بوو ، وشەو ڕستە جوان و بە ڕەونەقەكانی پشتیوانێكی چاك بوون بۆ ئەو نیگایەی بۆی دەهات.

ئارامییو دان بەخۆداگرتنو لێبوردن لەكاتی دەسەڵاتداو دان بەخۆداگرتن لەكاتی ناخۆشیدا ئەو ئەدەبە بوو ، كەخوای مەزن فێری كردبوو ، هەموو ژیرمەندو ئارامێكی دونیا هەڵەیەكی بووە ، یان كەوتنێكی بووە ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ زۆریی ئازارەكانیشیدا ئارام بوو، سەرباری هەموو ئەو جەهالەتو نەفامیە هەردانی بەخۆدا گرتبوو.

(عائیشە) دەڵێت: هەرگیز پێغەمبەر ﷺ دوو هەڵوێستی نەخراوەتە بەردەمو ئاسانەكەی هەڵنەبژاردبێت بەمەرجێك گوناه نەبووبێت ، ئەگەر گوناه بوایە لەهەموو كەس زیاتر دوور دەبوو لێی ، هەرگیز بۆ نەفسی خۆی تووڕە نەبووە مەگەر لەبەر شكاندنی سنوورێكی خوایی تووڕە ببوایەو تۆڵەی بسەندایە ،[1] لە هەمووكەس خۆش مەشرەب ترو لە هەموو كەسێك درەنگتر تووڕە دەبوو.

ئەوەندە دەست بەخشندەو خاوەن كەرەم بوو ، كەسی پێنەدەگەیشت ، بەخششێكی وەهای دەدا كە هەرگیز ترسی هەژار كەوتنی نەبێت ، (ابن عباس) دەڵێت: بەخشندەترین كەس بوو، لەمانگی ڕەمەزاندا بەخشندەیەتیەكەی دەگەیشتە چڵەپۆپە ئەوكاتەی (جبریل) دەهاتەلای ، (جبریل) هەموو شەوێكی ڕەمەزان دەهات بۆلای ، قورئانی پێدەوتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەشا لە ڕەشەبای خێرا ، دەستی خێراتر بوو بۆ فێركردن[2] ، (جابر) دەڵێت: داوای هیچ شتێكی لێ نەكراوەو بڵێ: نا.[3]

ئەوەندە ئازاو نەبەردو قارەمان بوو باس ناكرێت ، لە هەموو كەس بەغیرەتتر بوو ، ئامادەی هەڵوێستە قورسەكان بوو ، زیاتر لە جارێك لەكاتی شەڕدا تەنها خۆی

---

[1] / صحيح البخاري ٥٠٣/١.
[2] / هەمان سەرچاوە ٥٠٢/١.
[3] / هەمان سەرچاوە ٥٠٢/١.

ماوەتەوەو پاڵەوانان دەوریان چۆڵ کردووە ، هیچ ئازایەك نىیە لە دونیادا راکردنێکی نەبێت ، تەنها ئەم نەبێت خوا پاراستویەتی . (علی) دەڵێت: کە زۆرمان بۆ دەهات و دەکەوتینە لەرزەوە پەنامان دەبرد بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، کەس نەبوو بەئەندازەی ئەو لە دوژمنەوە نزیك بێت[1]، (انس) دەڵێت: شەوێکیان لە پڕێکدا خەڵکی مەدینە بەدەنگێك راچڵەکین ، خەڵك چوون بەرەو ڕووی دەنگەکە ، کە چوون پێغەمبەر ﷺ لەو سەرەوە دەگەڕایەوە ، پێش ئەمان چوو بووە شوێنی دەنگەکە ، بەسەر ئەسپە پشت ڕووتەکەی (ابو طلحة)ەوە بوو ، شمشێرەکەی کردبووە گەردنی و دەیفەرموو: هیچ نەبووە.. هیچ نەبووە.[2]

لە هەمووکەس زیاتر بەشەرمو حەیا بوو ، (ابو سعید)ی (خدری) دەڵێت: لە کچێکی سەرو عوزرشۆری ناوکەژاوە بە شەرمتر بوو، هەرشتێکی پێناخۆش بوایە بە دەموچاویدا دەردەکەوت[3]. چاوی نەدەبڕیە چاوی کەس ، چاوی دادەخست زۆربەی کات سەیری زەوی دەکرد تا ئاسمان ، زۆربەی سەیرکردنی تێڕامان بوو ، هیچ کەسێك ساتە وەختێکی وەهای لێ نەدەبینی دڵی ئازار بدات ، باسی خراپەی هەرکەسێکی بۆ بهاتایە ناوی نەدەبرد ، بەڵکو دەیفەرموو: ئەرێ ئەوە چىیە هەندێك کەس ئاواو ئاوا دەکەن ، باشترین کەس بوو ئەم شیعرەی (فرزدق) بیگرێتەوە:

یغضـــي حیـــاء ویغضـــی من مهـــابته فلا یکلـــم الا حین یبتسم

گورجو گۆلترین کەسو پاکترین کەسو راستگۆترین کەسو سپاردە ناسترین کەس بوو، رکابەرو ئەو کەسانەی گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکرد دانیان ناوە بەو ڕاستیەدا ، پێش بەپێغەمبەر بوونی ، پێیان دەوت (موحەممەدی دەست پاك) ، لە سەردەمی جاهیلیەتیشدا ناوبژیوانی پێدەکرا. (ترمذي) دەگێڕێتەوە لە (علی) یەوە کە (ابو جهل) جارێکیان وتویەتی بەپێغەمبەر ﷺ: ئێمە ناڵێین تۆ درۆزنیت ، بەڵکو دەڵێین ئەوەی هێناوتە درۆیەو ڕاست نىیە. خوای مەزنیش ئایەتی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ ﴾[4] الأنعام/٣٣. واتە: (ئەوانە تۆ بەدرۆ ناخەنەوە بەڵکو زاڵمان بەئایاتی خوا نکوڵی دەکەن).

---

[1] / بڕوانە (الشفاء)ی (قاضي عیاف) ٨٩/١، بەهەمان شێوە (اصحاب السنن)و (صحاح) گێڕاویانەتەوە.
[2] / صحیح مسلم ٢٥٢/٢، صحیح البخاری ٤٠٧/١.
[3] / صحیح البخاری ٥٠٤/١.
[4] / مشکاة المصابیح ٥٢١/٢.

هەروەها (هرقل) پرسیاری کرد لە (ابو سفیان) و وتی: ئایا تۆمەتی درۆتان دەخستە شوێنی پێش ئەوەی ئەم بانگەشەیە بکات ؟

وتی: نەخێر.

پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەسێك زیاتر بێ فیزبوو ، لەخۆ بەزلزانینەوە زۆر بەدوور بوو ، حەزی نەدەکرد وەکو پادشاهان خەڵك لەبەری هەستێت ، سەردانی هەژارانی دەکرد ، لەگەڵ هەژاران دادەنیشت ، بەدەم بانگهێشتی کۆیلەکانەوە دەچوو ، لەناو هاوەڵەکانیدا وەکو یەکێك لەوان دادەنیشت.

(عائیشە) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی نەعلەکانی پاکدەکردەوە جلەکانی خۆی دەدوریەوە ، بەدەستی خۆی لەماڵەکەدا کارەکانی دەکرد ، وەکو هەرکەسێکی ئاسایی جلەکانی خۆی چاك دەکردو شیری دەدۆشی و خۆی خزمەتی خۆی دەکرد.[1]

لە هەموو کەس زیاتر بەوەفا بوو لەگەڵ پەیمانەکانیداو ، زیاتر بوو لە سیلەی رەحمدا ، گەورەتر بوو لە بەزەیی هاتنەوەدا بەخەڵکیدا ، لە هەموو کەس زیاتر خۆشخوان بوو ، لە هەموو کەس زیاتر دوور بوو لە بەدخوییەوە ، دەم پیس و هەرزە گۆو نەفرەتکەر نەبوو ، لە بازاڕدا دەنگی بەرز نەدەکردەوە ، لە پاداشتی خراپەدا چاکەی دەکرد ، لێبوردەو چاوپۆشیکەر بوو ، ڕێگەی نەدەدا کەس لە دوایەوە بڕوات ، لەکاتی خواردن و دانشتندا فیزی نەدەکرد بەسەر خزمەتگوزارو غولامەکانیدا ، هەرکەسێك خزمەتی بکردایە زۆر خزمەتی دەکرد ، هەرگیز بە خزمەتگوزارەکەی نەوتووە ئۆف لە دەستت ، هەرگیز سەرزەنشتی خزمەتگوزارەکەی نەکردووە لەسەر کردن یان نەکردنی کارێك ، حەزی بەدانیشتن بوو لەگەڵ هەژاراندا ، شوێن تەرمەکانیان دەکەوت ، بەچاوی کەمەوە سەیری هیچ نەدارێکی نەدەکرد لەبەر هەژاریی.

لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا فەرمانیدا بە سەربڕینی مەڕێك ، پیاوێك وتی: من سەری دەبڕم. یەکێکی تر وتی: من کەوڵی دەکەم. یەکێکی تریش وتی: من لێی دەنێم.

ئەویش فەرمووی: منیش چیلکەو دارتان بۆ کۆدەکەمەوە. وتیان: نەخێر پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە کارەکەی تۆ دەکەین. فەرمووی: دەزانم کە ئێوە کاری من

---

[1] / هەمان سەرچاوە ٢/٥٢٠.

دەکەن ، بەلام پێم ناخۆشە خۆم لە ئێوە جیا بکەمەوە ، خوای مەزن پێی ناخۆشە یەکێك لەبەندەکانی خۆی لەهاوەڵەکانی جیا بکاتەوە . بۆیە هەستاو دارو چیلکەی کۆکردەوە.[1]

با بزانین (هند)ی کچی (أبی هاله) چۆن وەسفی پێغەمبەرمان بۆ دەکات ﷺ ، (هند) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە حاڵەتی خەمێکی قوڵدا بوو ، بیرکردنەوەی بەردەوامی هەبوو ، حەوانەوەی نەبوو ، بەپێی پێویست قسەی دەکرد ، بێ دەنگی زۆر بوو ، بە گەرووی کۆتایی بەرستە دەهێنا ، نەك بەئەملاولای دەمی ، کورت و کرمانج قسەی دەکرد ، ڕستە ڕستە قسەی دەدوا بێکەم‌و کورتی‌و زیادەڕەوی ، ڕەوشت بەرز بوو ، نە ڕەق‌و نە شل ڕەوبوو ، بەهەموو نیعمەتێکی دەزانی ، باکەمیش بوایە ، باسی هیچی بە خراپە نەدەکرد ، بەخراپ باسی هیچ خواردنێکی بەچاك‌و خراپ نەدەکرد، لەتووڕەییدا نەدەمرکایەوە تامافی ئەوشتەی وەرنەگرتایە کە بۆی تووڕە بووە. هەرگیز بۆ نەفسی خۆی تورە نەدەبوو ، کە ئاماژەی دەکرد بەهەموو دەستی ئیشارەتی دەدا ، ئەگەر سەری سووڕبمایە لە شتێك ، دەستی ئەم دیوو ئەو دیوو دەکرد ، ئەگەر بێزار بوایە پشتی هەڵدەکرد ، ئەگەر دڵی خۆشبوایە ڕووی دەکرایەوە ، زۆرترین حاڵەتی پێکەنینی زەردەخەنە بوو.

زمانی دەگرت مەگەر لەشتێك خۆی مەبەستی بوایە ، هۆگری هاوەڵانی بوو ، لێیان جیانەدەبوەوە ، ڕێزی لەگەورەی هەموو خێڵێك دەگرت‌و دەیکردەوە بە سەرۆکی خێڵەکەی خۆی ، پێش ئەوەی ڕووبەڕووی هەرکەسێك بێتەوە ئاگاداری دەکردەوە.

هەواڵی هاوەڵانی دەپرسی ، هەواڵی کەسانێکی لە کەسانی تر دەپرسی ، ئافەرینی چاکەی دەکرد ، سەرزەنشتی خراپەشی دەکرد ، میانجیگەر بوو ، ڕاجیاواز نەبوو ، ئەوەندە گوێی نەدەخەواند بێزاریی و بێتاقەتی دروست کات ، ئامادەگی بۆ هەموو حاڵەتێك هەبوو ، لە هەقدا کەم‌وکووڕ نەبوو ، لەوە تێنەدەپەڕی ، ئەوانەی لێیەوە نزیك بوون باشترین کەسی ناو خەڵك بوون ، باشترینیان لای ئەو ئەوانە بوون کە زۆرتر ئامۆژگاری دەکرد ، گەورەترین کەسیان بەلایەوە ئەوەیان بوو کە بەباشترین شێوە بەدەمەوە چوون‌و پشتیوانی خەڵکیان دەکرد.

---

[1] / خلاصة السير ل٢٢.

هەستان و دانیشتنی بەیادی خواوە بوو ، شوێنی تایبەتی نەبوو بۆ دانیشتن ، بۆ هەر مەجلیسێك بچوایە گەیشتە کوێ لەوێدا دادەنیشت ، هەر بەوەش فەرمانی دەدا ، مافی بەهاونشینانی خۆی دەدا ، تاهیچ یەکێکیان هەست بەوە نەکات کە ڕێزی یەکێکیان دەدا بەسەر یەکێکی تردا ، هەرکەسێك بۆ پێویستیەك بهاتایە خزمەتی ، لەگەڵیدا دەچوو هەتا ئەو بێتاقەت دەبوو دەڕۆیشت. هەر کەسێکیش داوای شتێکی لێ بکردایە بەوتەیەکی جوان یان کارئاسانیەك وەڵامی دەدایەوە، ڕەوشت بەرزی و ڕووخۆشیەکەی بەشی هەموو کەسێکی دەکرد ، بوو بوو بەباوکی خەڵك ، لەخزمەتیدا ئەوانیش بووبوونە دۆستو نزیك ، بەتەقواو بوون و ڕێزو قەدریان هەبوو ، مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ هەمووی ئارامیی‌و شەرم‌و دان بەخۆداگرتن و سپاردەناسی بوو، دەنگی تێدا بەرز نەدەکرایەوە ، زیادەڕەوی تێدا نەدەکرا ، سۆزدارییان لەگەڵ یەکتردا بە لە خواترسان دەکرد ، ڕێزیان لەگەورە دەگرت ، بەزەییان بە بچوکدا دەهاتەوەو ، پێداویستی خەڵکیان دابین دەکردو هۆگریی خەڵکی غەریبەیان دەکرد.

هەمیشە پێغەمبەر ﷺ ڕووخۆش ، ئاسانگیر، دڵنەرم بوو، توندو ڕەق و دەنگە دەنگکەرو هەرزەگۆو ڕەخنەگرو بۆڵە بۆڵکەر نەبوو ، شایەر پیاهەڵدەر نەبوو ، هەرشتێکی بەدڵ نەبوایە پشتگوێی دەخست‌و لێی نائومێد نەدەبوو ، وازی لە سێ شت هێنا بوو: ریابازی ، زۆر وتن ، خۆخستنە ناو باسی خەڵك. سێ شتی خەڵکیشی واز لێ هێنابوو: باس نەکردنی خراپەی خەڵك ، عەیبە نەوتنی خەڵك. بەدوای عەیبە گەڕانیاندا ، لەشتێکدا قسەی دەکرد کە ئومێدی پاداشتی پێی هەبوایە. کە قسەی دەکرد هاوخوانانی بێدەنگ دەبوون و گوێیان دەگرت ، کە بێدەنگ دەبوو ئەنجا قسەیان دەکرد ، لەحزوریدا شەڕە قسەیان نەدەکرد ، لەخزمەتیدا هەرکەسێك قسەی بکردایە بێدەنگ دەبوون تا لێ دەبوەوە ، قسەیان قسەی یەکەمیانە ، بەشتێك پێدەکەنی کە ئەوانیش پێی پێ‌بکەنن ، بەشتێك سەری سوڕدەما کە ئەوانیش وابوونایە ، کەسی غەریبە کە دەهات‌و قسەی ڕەقی دەکرد ، ئارامی لەسەر دەگرت‌و ئازاری نەدەداو دەیفەرموو: ئەگەر کەسێکتان دی پێویستی پێتان هەبوو بۆی جێبەجی بکەن. سوپاسی ئەو کەسەی دەکرد چاکەیەکی لەگەڵدا بکردایە.[1]

---

[1] / بڕوانە (شفاء) نووسینی (القاضي عياض) ١/١٢١، ١٢٢، ١٢٤، ١٢٥، ١٢٦. هەروەها بڕوانە (شمائل الترمذي).

(خارجه)ی کوڕی (زید) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەجلیسدا بەرێزترین کەس بوو، زۆرکەم قسەی دەکرد ، پێویست نەبوایە قسەی نەدەکرد ، هەرکەسێك بەناشیرینی قسەی لەگەڵدا بکردایە تەنها پشتی تێدەکرد ، پێکەنینی تەنها زەردەخەنە بوو ، قسەکانی ڕستە ڕستەو بەپێز بوو ، زیادەڕەوی و کەمو کورتی تێدا نەبوو ، هاوەڵانیشی لە خزمەتیدا تەنها بە زەردەخەنە پێدەکەنین ، وەکو ڕێزدانان و قەدر زانینێك بۆ پێغەمبەر ﷺ .[1]

پێغەمبەر ﷺ سەرجەم سیفاتی مرۆڤی تێروتەواوی تێدا بوو، خودا پەروەردەی کردبوو، باش پەروەردەی کردبوو، تاوەکو وەسفو سەنایەك بانگی دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم/٤. ئەم سیفەتە جوانانە بوو خەڵکی ئاشوفتەی ئەو زاتە پیرۆزە کردبوو ، لەدڵاندا شیرینی کردبوو ، کردبوویە سەرکردەیەك دڵانی بۆلای خۆی کەمەند کێش دەکرد ، ملهوڕیی خێڵەکەی نەرم کردو وای لێ کردن پۆل پۆل بێنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

ئەو سیفەتانەش کە باسمان کرد چەند باسێکی کەم بوون لە دیمەنە کامڵ و تێرو تەواوەکانی پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام زاتی ئەو حەقیقەتە ئەوە شتێکە بەهیچ دەرك ناکرێت ، کێ دەتوانێت لەناخی کەسێك تێبگات کە لەتەواویدا گەیشتبێتە چڵە پۆپەو ، بە نووری پەروەردگاری ڕۆشن بووبێتەوە ، وای لێ هاتبێت ڕەوشتی ببێتە یەك پارچە قورئان ؟

اللَّهُم صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد .

اللَّهُم بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد .

١٣٩٦/١١/١٣ کۆچی

١٩٧٦/١١/٦ زایینی

صَفِيّ الرَّحْمَن المُبَارَكْفُورِي

زانکۆی سەلەفی (بنارس) / هیندستان

[1] / هەمان سەرچاوە ١/١٠٧.

# سەرچاوەکان

## گرنگرتین مەرجەعەکان:

(١)اخبار الكرام بأخبار المسجد الحرام، شهاب الدين احمد بن محمد الأسدي المكى، (١٠٦٦)ى کۆچی، چاپی سەلەفی، بنارس/ هیندستان، ١٣٩٦/ ١٩٧٦ز.

(٢)الأدب المفرد، محمد بن اسماعيل البخاري (٢٥٦ك)، چاپی ئەستەنبوڵ، ١٣٠٤ك.

(٣)الإعلام، خيرالدين الزركلي، چاپی دووەم. قاهيره، ١٩٥٤ز.

(٤)البدايه والنهايه، اسماعيل بن كثير الدمشقى، چاپخانەی (السعادة)، میسر، ١٩٣٢ز.

(٥)بلوغ المرام من أدلة الأحكام، احمد بن حجر العسقلاني، (٧٧٣ ـ ٧٨٤ك)، چاپخانەی (القيومى)، كانفور/ هيندستان، ١٣٢٣ك.

(٦)تاريخ أرض القرآن، السيد سليمان الندوي، ١٣٧٣ك، معارف، بريس أعظم كده/ هيندستان، ١٩٥٥ز، چاپی چوارەم.

(٧)تاريخ الإسلام، شاە ئەكبەر خان نەجيب ئابادى، كتێبخانەی رەحمەت ديوبەند يۆپى/ هيندستان.

(٨)تاريخ الأمم والملوك.

(٩)تاريخ عمر بن الخطاب، أبو الفرج عبدالرحمن بن الجوزي.

(١٠) تحفة الأحوذي، أبو العلي عبدالرحمن المباركفورى (١٣٥٣ ك ـ ١٩٢٥ز) ، (جيد برقى برسى) ، دەهلى/ هيندستان ، ١٣٤٦ ـ ١٣٥٣ ك.

(١١) تفسير إبن كثير ، اسماعيل بن كثير الدمشقى.

(١٢) تفهم القرآن، پرۆفيسۆر (ابو الأعلى المودودي) ، مركزى مكتبه جماعت اسلامى/ هيندستان.

(١٣) تلقيح مفهوم أهل الأثر، أبو الفرج عبدالرحمن بن الجوزي ، (٥٩٧ك)، (جيد برقى برسى)، دەهلى/ هيندستان.

(١٤) جامع الترمذي ، أبو عيسى محمد بن عيسى الترمذي ، (٢٠٩ك ـ ٢٧٩ك)، كتێبخانەی رەشيديه لە دەهلى/ هيندستان.

(١٥) الجهاد في الإسلام، (اوردو)، پرۆفيسۆر (أبو الأعلى المودودى)، اسلامك ببليكشنز لميد لاهور (پاكستان)، چاپی چوارەم، ١٩٦٧ز.

(١٦) خلاصة السير، رحب الدين أبو جعفر أحمد بن عبدالله الطبري ٦٧٤ك، (دلى برنئيك برسى دەهلى)، هيندستان، ١٣٤٣ك.

(١٧) رحمة للعالمين، محمد سليمان سلمان المنصورفوري، (١٩٣٠ز)، حنيف/ بكديودلى.

(١٨) رسول اكرم كى سياسى زيندگى، دكتور حميد الله، باريس (سالم كمبينى) ديبنديوبى/ هيندستان/ ١٩٦٣ك.

(١٩) الروض الأنف، أبوالقاسم عبدالرحمن بن عبدالله الهيلي (٥٠٨ ـ ٥٨١ك)، چاپخانەی جمالى، میسر، ١٣٣٢ك، ١٩١٤ز.

(٢٠) زاد المعاد، شمس الدين ابوعبدالله محمد بن بكر بن أيوب المعروف بابن القيم، (٦٩١ ـ ٧٥١ ك) .

(٢١) سفر التكوين.

(٢٢) سنن ابن ماجة، ابو عبدالله محمد بن يزيد ابن ماجة القزويني (٢٠٩ ـ ٢٧٣ك).
(٢٣) سنن أبي داود، أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني (٢٠٢ ـ ٢٧٥ك)، ج١، چاپخانەی مەجیدی، کانفور/ هیندستان، ١٣٧٥ك، کتێبخانەی رەحیمی (دیوبندیوبی)/ هیندستان.
(٢٤) سنن النسائي، ابو عبدالرحمن احمد بن شعيب النسائي (٢١٥ ـ ٣٠٣ك)، کتێبخانەی سەلەفی، لاهور/ پاکستان.
(٢٥) السيرة الحلبية، ابن برهان الدين.
(٢٦) السيرة النبوية، ابو محمد عبدالملك بن هشام بن أيوب الحميري (٢١٣ یان ٢١٨ك)، ١٩٥٥ز.
(٢٧) شرح شذور الذهب، أبومحمد عبدالله جمال الدين بن يوسف المعروف بابن هشام الأنصاري (٧٠٨ـ٧٦١).
(٢٨) شرح صحيح مسلم، ابوزكريا محىالدين بن شرف النووي (٦٧٦ك)، کتێبخانەی رەشیدیە، دەهلی/ هیندستان، ١٣٧٦ك.
(٢٩) شرح المواهب الدنيه، الزرقاني، نوسخەیەکی کۆنە، سەرەتاکانی داخوراوە.
(٣٠) الشفا بتعريف حقوق المصطفى، القاضي عياض، .چاپخانەی عوسمانی، ئەستەمبوڵ، ١٣١٢ك.
(٣١) صحيح البخاري، محمد بن اسماعيل البخاري (٢٥٦ك)، کتێبخانەی رەحیمی، دیوبند/ الهند، ١٣٨٤ ـ ١٣٨٧ك.
(٣٢) صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج القثيري، کتێبخانەی رەشیدیە، دەهلی/ هیندستان، ١٣٧٦ك.
(٣٣) صحيفة حبقوق.
(٣٤) صلح الحديبية، محمد بن أحمد باشميل، چاپی دووەم/ دار الفكر، ١٣٩١ك ـ ١٩٧١ز.
(٣٥) الطبقات الكبرى، محمد بن سعيد، چاپخانەی بریل/ لیدن، ١٣٢٢ز.
(٣٦) عون المعبود شرح أبي داود، أبو الطيب شمس الحق العظيم آبادي، چاپی یەکەم، هیندستان.
(٣٧) غزوة أحد، محمد احمد باشميل، چاپی دووەم.
(٣٨) غزوة بدر الكبرى، محمد أحمد باشميل، چاپی سێیەم، ١٣٧٦ك ـ ١٩٧٦ز.
(٣٩) غزوة خيبر، محمد أحمد باشميل، چاپی دووەم، دار الفكر، ١٣٩١ك ـ ١٩٧١ز.
(٤٠) غزوة بني قريظة، محمد احمد باشميل، چاپی یەکەم، ١٢٧٦ك ـ ١٩٦٦ز.
(٤١) فتح الباري، احمد بن على بن حجر العسقلاني (٧٧٣ ـ ٨٥٢ك).
(٤٢) فقه السيرة، محمد الغزالي، دارالكتاب العربي، میسر، چاپی دووەم، ١٣٧٥ك ـ ١٩٥٥ز.
(٤٣) في ظلال القرآن، سيد قطب.
(٤٤) القرآن الكريم.
(٤٥) قلب جزيرة العرب، فؤاد حمزة.
(٤٦) ماذا خسر العالم بإنحطاط المسلمين، سەیید ئەبولحەسنی نەدەوی، قاهیرە، ١٣٨١ك ـ ١٩٦١ز.
(٤٧) محاظرات تأريخ الأمم الإسلامية، شیخ موحەممەد خضری بەگ، ١٣٨٢ك.
(٤٨) مختصر سيرة الرسول، شيخ الإسلام محمد بن عبدالوهاب التميمي النجدي، (م/ ١٢٠٦).

(٤٩) مختصر سيرة الرسول، الشيخ عبدالله بن محمد النجدي آل الشيخ، (م/ ميسر)، ١٢٤٢ك.
(٥٠) مدارك التنزيل، تفسير النسفي، النسفي.
(٥١) مرقاة المصابيح، ج٢، الشيخ ابو الحسن عبيدالله الرحمانى المباركفورى ، نامى بريس لكنؤ/ هيندستان ، ١٣٧٨ك ـ ١٩٥٨ز.
(٥٢) مروج الذهب ، أبو الحسن علي المسعودي، چاپخانەى (الشرق الإسلاميه)، قاهيره.
(٥٣) المستدرك، ابوعبدالله محمدالحاكم النيسابورى، (دائرة المعارف العثمانية)، حيدر آباد/ هيندستان.
(٥٤) مسند أحمد، الإمام أحمد بن حنبل الشيبانى، ٢٦٤ك.
(٥٥) مسند الدارمي، أبو محمد عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي، ١٨١ ـ ٢٥٥ك.
(٥٦) مشكاة المصابيح، ولي الدين محمد بن عبيدالله التبريزي، كتێبخانەى رەحيميه، ديوبنديوبى/ هيندستان.
(٥٧) معجم البلدان، ياقوت الحموي.
(٥٨) المواهب الدينية، قسطلاني.
(٥٩) موطأ الإمام مالك، الإمام مالك بن أنس الأصبحي (م ١٦٩ك)، كتێبخانەى رەحيميه، ديوبنديوبى/ هيندستان.
(٦٠) وفاء الوفاء، على بن أحمد السمهودى .

# فەرهەنگۆکی کتێبەکە

## قۆناغی یەکەم:

## جیهـادی بانگـەواز

## سێ ساڵ بەسەر بانگـەوازی نهێنیدا



## قۆنـاغـی دووەم:

## بـانگـەواز بەئـاشکـرا

## یەکەم فەرمانی .. ئاشکرا کردنی بانگەواز

## ساڵی ماتەمینی



## قۆناغی سێیەم :

## بانگەوازی ئیسلام لە دەرەوەی مەككە

## ژیان لەناو مەدینەدا

## قۆناغی یەکەم:



## غەزای گەورەی بەدر

## (یەکەم جەنگی یەکلاکەرەوەی ئیسلام)

## چالاکی سەربازی دوای ئەو جەنگە



## ڕووداوی حودەیبیە



## قۆناغی دووەم :

## چالاکی سەربازیی پاش پەیمانی حودەیبیە



## پاشماوەی سریە و غەزاکانی ساڵی حەوتەم

## قۆناغی سێیەم